پرۆژەی ١٠٠ کتێبی کوردی ٤٧

# ژیانامەی پێغەمبەران






نووسەر: ابن کثیر
وەرگێر : کاروان محمد

ابن کثیر
ژیاننامەی پیغەمبەران. / ابن کثیر / ترجمه کاروان محمد
تهران: احسان، ۱۳۸۷.
فیپا.
کردی.
۱ـ زندگی نامه -- زندگی‌نامه پیامبر اسلام(ص)
۷س۸۵خ /۱۰۲ BP ۲۹۷/۱۰۰
کتابخانه ملی ایران ۱۰۶۰۲۱

## ژیاننامەی پێغەمبەران

● نوسەر: ابن کثیر
● وەرگیر: کاروان محمد
● بلاوکار: نەشری ئیحسان
● تیراژ: ۵۰۰۰ دانە
● چاپی: دووەم ـ ۲۰۰۸
● چاپخانە: مەهارەت



(بسم الله الرحمن الرحيم)

## پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس و ستایشی نەبڕاوەو بێ‌پایان بۆ پەروەردگاری میهرەبان،پەنا بەو دەگرین لەخراپەی خۆمان و کردەوەی خوارمان، دیارە هەرکەسێ خوای گەورە ڕێنومایی بکات کەس ناتوانێت گومڕای بکات، ئەوەی گومڕایشی بکات،کەس ڕێنوێنی ناکات، شایەتی دەدەم کە جگە لە (الله) هیچ پەروەردگار و خوایەکی ترنیە، وەشایەتی دەدەم کە (محمد) (ﷺ) بەندەو پێغەمبەر و ڕەوانەکراوی خوایە.

زانینی چیرۆکی ژیانی پێغەمبەران(علیهم السلام) گوڵزارێکی پڕ لەبۆن و بەرامەی ناوازەیە و پیرۆزی دەبەخشێ بەدڵ و دەرون و ڕوخساری خوێنەران و بیسەرانی، بە تایبەتیش بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێ دڵیان نورانی و دەرونیان بێ‌گەردو چاویان ڕۆشن بێ و سوپاسگوزاری خوای گەورە بن، ئەمانە ئەو چیرۆکانەیە کە لە قورئانی پیرۆز و فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) و پیاو چاکانەوە هەڵگۆزراون و چەوتی ولارو لەوێری و ناڕاستیان تێدانیە، داڕێژراوی دەست و هەست و نەستی مرۆڤ نین، بەڵکو پەروەردگارێك بۆمان دەگێڕێتەوە کە خۆی بەدیهێنەری هەمووومان و هەموو (مان)ێکە و گێڕانەوەکانی دروست و بێگومانن و سەرچاوەی بێگەردی مێژوویین و تاکە فێرگەی حیکمەت و پەندن بۆ ئێمە،ئەمانە لە بنەڕەتدا بەوەحی ڕەوانەکراون بۆ پێغەمبەرمان محمد(ﷺ) تاکو دڵ و دەرونی چەسپاوتربێ لەکارو پەیامەکەی و درێژەی دەستپێکی ئەم ئایینەو هاوەڵانی خۆی بناسێت و بزانێت کە پێش ئەویش زنجیرەی ڕوانەکراوان لەئارادا بوە و ئەرك و ڕەنجیان کێشاوە... ئازاردراون... شەهید کراون... تاکو چڵەپۆپەی ئەم ئایینە لە (ئیسلام)دا کامڵ بوو، کەدواهەمین پەیامی خواییە بۆ بەرەی ئادەمیزاد لەسە رزەویدا و گونجاوی هەموو سەردەم و خاك و وڵات و گەلانێکە کەتینووی ئاشتی و تەبایی ئەم جیهانەن بەگشتی.

بەو ئومێدەوە دەست بەم پرۆژەیە دەکەین و دەخوازین ڕۆڵەکانی ئێمەی کوردیش لەژیاننامەی ئەو سەروەرانە بەهرەوەر بن و هاونشینی پێغەمبەران بن (علیهم السلام) لەبەر بارەگای خواییدا لەپانتایی بەهەشت و لەنازگەی نەبڕاوەی هەتاییدا.

ئەم کتێبەش کە لەلایەن (پێشەوا ابن کثیرەوە نوسراوە و (سید بن رجب) تەحقیقی کردووەو بەندەش وەریگێڕاوە، ژیانی چەندین پێغەمبەری ڕەوانەکراوی خوای گەورەی تێدا باس کراوە، جگە لە قورئانی پیرۆزیش سوودێکی زۆر لەفەرمایشتەکانی پێغەمبەری نازدارمان محمد(ﷺ) وەرگیراوە ئەو فەرمودانەی کەهێناومانە لەپەراوێزی خوارەوەدا ئاماژە بە جۆری وەرگرتن و چەشن و پلەو (اسناد)یان کراوە و سەرچاوەو بەش و لاپەڕکەشیان نووسراوە، تەنانەت (موضع)ە کانیش، هەوڵدراوە ئەو جۆری گێڕانەوەو

تەفسیرانەی تێدا نەبێ کە درون لە لۆژیك و ژیریەکی سروشتیەوە، وەئەگەر پێوست بە هێنانیان کرابێ، هێناومانەو باری سەرنجی خۆمان بەرانبەری ڕوون کرگووتەوە.
(ابن کثیر ) لە زۆبەی تەفسیری ئایەتەکاندا خوێنەر دەگەڕێنێتەوە بۆ تەفسیرەکەی خۆی (تفسیر القران العظیم)، بەڵام ئەمڕۆ گەلێك تەفسیری ترمان هەیەکە بەزمانی خۆمانە و دەکرێت خوێنەری کورد سوودیان لێ وەربگرێت، بەتایبەتیش (تەفسیری ئاسان).
(ابو انس سید بن رجب)یش، خوای گەورە پاداشتی بداتەوە هەوڵی زۆری لەگەڵ (تەحقیق کردن)ەکەی داوەو زۆر بەباشی پاکنووسی کردوەو ساخی کردەوەتەوە، گەرچی تائێستاش هەندێ شتی تێدایە کە جێگەی گومانی تێدا دەبێتەوە و ڕەنگە یەکلاکردنەوەیشی هەروا ئاسان نەبێت.
خوای گەورە لەگەشت لایەکمان وەری بگرێت و ببێتە مایەی ڕەزامەندی ئەو پەروەردگارە میهرەبانە لەهەموو لایەکمان. امین.

## پێشەوا( ابن کثیر )کێ یە؟

ناوی تەواوەتی (اسماعیل کوڕی عورمەری کوڕی کثیر کوڕی ضۆ کوڕی درع الحافظ عماد الدین ابو الفداء )ە، لەگوندێکی خۆر هەڵاتی (بوصری) دەوروبەری دیمەشق لەدایك بوە لەساڵێ حەوت سەدویەکدا، لەسەردەمی خۆیدا پێشەنگی زانایان و ئەو کەسانە بوە کو قورئان و فەرموودەیان لەبەربووە، وەك ڕاگر و کۆڵەکەی زاراوەزان و زمانەوان و شارەزایانی و اتاناسی بووەو ئیجازەی خوێندنی لەسەر دەستی هەردوو مامۆستاکەی (شیخ برهان الدین الفزاری) و (کمال الدین بن قاضي شهبه)وەگرتووە پاشان کچی (ابا الحجاج المرزی) خواستوەو جگە لەوەی کەزاوای بوە هاودەمی و هاونشینی کردوەو گەلێك زانست و زانیاری لێوەی فێربووە بەتایبەتیش فەرمودەزانی (علوم الحدیث).
بیستومە مەتنی زۆربەی دەقەکانی لەبەرکردووە و فێری (اسناد)ەکان و هۆیەکان بووەو گەلێك لەگێڕەروانی فەرموردەو مێژووی ناسیوە، بەڕادەیەك هەر لەلاویدا بوو بەکەسێکی زۆر شارەزاو ناوازە لەو بوارانەدا.
دانراوەکانیشی کە گەیشتونەتە دەستمان ئەمانەن:

١- الاحکام علی ابوب التسبیه، لەتەمەنی منداڵیدا نوسیویەتی.
٢- البدایه النهایه.
٣- تفسیر القران العظیم
٤- گەلێك کتێبی تریشی نووسیوە و دەتوانیت بۆ زانیاری بروانیتە (طبقات المفسران) .
٥- لەڕۆژی پێنج شەممەی بیست و شەشی شەعبانی ساڵی حەوت سەدو حەفتا و چواری کۆچیدا، کۆچی دوایی کردوە لەتەنیشتی پێشەوا (ابن تیمیه) بە خاك سپێردراوە، خوای گەورە پاداشتی بەخێزی بداتەوە و بەبەهەشتی بەرینی شاد بکات.

## ﴿پێغەمبەری خوا حەزرەتی ئادەم (درووود و سەلامی خوای لەسەر بێت)﴾

### بەدیهێنانی ئادەم (علیه السلام)

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿پەروەردەگارت بە فریشتەکانی فەرموو: من دەمەوێت لە زەویدا جێنشینێك دابنێم بۆ ئاوەدانی و دینداری، فریشتەکان ووتیان: ئایا کەسێکی تێدا دەکەیتە جێنشین کە خراپە و تاوانی تێدا بچێنێت و خوێنرێژی تێدا ئەنجام بدات؟! لەکاتێکدا ئێمە تەسبیحات و سوپاس و ستایشت دەکەین و بەدوورت دەگرین لەو شتانەی شایستەی تۆ نین، خوای گەورە لە وەلاٚمیاندا فەرمووی: ئەوەی ئێوە نایزانن من دەیزانم﴾ [1]، ﴿ئینجا ئادەمی دروست کرد و یستی توانایی و لێهاتوویی ئەو بە فریشتەکان ڕوون بکاتەوە﴾ ناوی هەموو شتێکی پێویستی فێرکرد، لەوەودوا بە فریشتەکانی ڕانواند و پێی فەرموون: ئادەی ئێوە ناوی ئەو شتانەم پێ بڵێن ئەگەر ڕاست دەکەن ﴿وتواناى ئاوەدان کردنەوەی زەویتان هەیە ؟﴾ [2]، ﴿فریشتەکان وتیان پاکی و بێگەردی و ستایش هەر شایستەی تۆیە ، ئێمە هیچ زانستێکمان نیە تەنها ئەوە دەزانین کە تۆ فێرت کردوین، بە ڕاستی تۆ پەروەردگارێکی زاناو دانایت﴾ [3]، ﴿ئەوسا خوا فەرمووی ئەی ئادەم، ئادەی تۆ ئاگاداریان بکە بە ناوەکانیان، جا کاتێك ئادەم هەواڵی ناوەکانی پێدان، خوای گەورە فەرمووی ئەی پێم نەوتن: بەڕاستی من خۆم ئاگادارم بە نهێنی ئاسمانەکان و زەوی، دەشزانم ئێوە چی دەردەخەن و چی دەشارنەوە ؟!﴾ [4] .

﴿کاتێکیش بە فریشتەکانمان گوت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم (سوژدەی ڕێز) سوژدەیان برد ئبلیس نەبێت کە سەرپێچی کرد و خۆی بەگەورە زانی و چوە ڕیزی کافرانەوە﴾ [5]، ﴿ئینجا وتمان بە ئادەم خۆت و هاوسەرت لەم بەهەشتەدا ژیان بەرنەسەر نیشتەجێبن لەهەر کوێ حەزدەکەن بخۆن و بخۆنەوە بەتێروتەسەلی، بەلاٚم نزیکی ئەم درەختە مەکەون، ئەگینا دەچنە ڕیزی ستەمکارانەوە﴾ [6]،

---

[1] البقرة / ئایەتی ( ٣٠) .

[2] البقرة / ئایەتی (٣١) .

[3] البقرة / ئایەتی (٣٢) .

[4] البقرة / ئایەتی (٣٣) .

[5] البقرة / ئایەتی (٣٤) .

[6] البقرة / ئایەتی (٣٥) .

﴿شەیتان فرسەتی لێهێنان و لەخشتەی بردن (وای لێکردن لەبەروبومی درەختەکەیان خوارد) لەو شوێنە بە دەرکردنی دان، ئەوسا پێمان وتن دابەزنە خوارەوە (جا لەوێ هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن، تا ماوەیەکی دیاریکراو نیشتەجێ دەبن لە زەویداو لەناز و نیعمەتەکان سوود وەردەگرن﴾[1]، ﴿پاشان ئادەم لەلایەن پەروەردەگاریەوە چەند وشە و نزایەکی وەرگرت (بەدڵ و بەکوڵ پاڕایەوەو خوای گەورەش) نزاکەی وەرگرت و لێی خۆش بوو، چونکە بە ڕاستی تەنها ئەو زاتێکی ئێجگار میهرەبان و تۆبە وەرگرە (نزاکە لەئایەتی/ ٢٣ی سورەتی الاعراف دایە)﴾[2]. ﴿ئینجا وتمان هەمووتان دەبێ دابەزن (بۆ سەرزەوی) جا هەر کاتێك لەلایەن منەوە ڕێنوماییتان بۆهات (شوێنی بکەون) هەرکەس شوێنی ڕێنومایی من بکەوێت ئەوە نەترس و بیمیان لەسەر دەبێت، نەغەمگین و دڵتەنگ دەبن﴾[3]. ﴿ئەوانەش کە بێباوەڕبوون و باوەڕیان بە ئایەتەکانی ئێمە نەبوو، ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن و بۆ هەتا هەتایی تیایدا دەمێننەوە﴾[4]. هەروەها لەچەند شوێنێکی تری قورئانی پیرۆزدا باسی دروستکردن و بەسەرهاتی ئادەم (علیه السلام) کراوە، ئەگەر ویستت زیاتر ئایەتە قورئانیەکانت لەبەردەستدا بێت لەخوارەوە ناوی سورەت و ئایەتەکان دەخەینە ڕوو، بۆ واتای ئایەتەکانیش دەتوانیت سوود لە تەفسیری ئاسان چاپی پێنجەم وەربگریت کە لاپەڕەکەی بەرانبەر بە ئایەتەکانی دەنووسین:

| ناوی سوورەت | ژمارەی ئایەت | ژمارەی لاپەڕەکەی لە تەفسیری ئاساندا |
|---|---|---|
| آل عمران | ٥٩ | ٥٧ |
| النساء | ١ | ٧٧ |
| الحجرات | ١٣ | ٥١٧ |
| الاعراف | ١٨٩ | ١٧٥ |
| الاعراف | ١١– ٢٥ | ١٥١ – ١٥٣ |
| طه | ٥٥ | ٣١٥ |
| الحجر | ٢٦ – ٤٤ | ٢٦٣ |

[1] البقرة / ئایەتی (٣٦) .

[2] البقرة / ئایەتی (٣٧) .

[3] البقرة / (٣٨) .

[4] البقرة / (٣٩) .

| الاسراء | ٦١ ٦٥ | ٢٢٨ |
| --- | --- | --- |
| الكهف | ٥٠ | ٢٢٩ |
| طه | ١١٥– ١٢٦ | ٣٢١ ٣٢٠. |
| ص | ٦٧ – ٨٨ | |

**بەم جۆرە لە قورئانی پیرۆزدا و لەچەند شوێنێکی جیاجیادا بە شێوازی جۆراوجۆر چیرۆك و بەسەرهاتی ئادەم پێغەمبەر (علیه السلام)هاتووە، هەموو شیانمان لە تەفسیرەکەدا بەدرێژی باس کردووە، بەڵام جارێکی تر لێرەدا بەکورتی ئاماژە بەچەمك و واتای ناوەڕۆکی ئەو ئایەتە پیرۆزانە دەکەینەوە، لەگەڵ هێنانی ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر (ﷺ) کە پەیوەستن بەوەوە، خوای گەورە بە فریشتەکانی فەرموو** ﴿إني جاعلٌ في الأرضِ خليفةً﴾ [1]، ﴿ويـجعلكُم خُلَفاء الأرض﴾ [2]، **بزانە خوای گەورە دەیەوێت بە بەدیهێنانی ئادەم و بەروبەرەچەکانی سەر زەوی ئاوەدان بکاتەوە، کە دوابەدوای یەکتری دەبنە جێنشین، هەروەك دەفەرمووێت :**﴿وَهوَ الذي جَعلَكُم خلائفالأرض﴾ [3]، **یان دەفەرمووێت:** ﴿ويجعَلَكُم خلفاء الأرض﴾ [4]. **بەم جۆرە خوای گەورە لە ڕووی دەست بەکاربوونیەوە هەواڵی بەدیهێنانی ئادەم و ئادەمیزادەکانی بە فریشتەکان ڕاگەیاند، کە لە ڕاستیدا هەواڵ ڕاگەیاندنە بە گەورەیی کارێکی فرە مەزن، بەر لە ئەنجامدانی** [5]، **فریشتەکانیش لە ڕووی پرسیارکردن دەربارەی چاکتر شارەزابوونیان بۆ ئەو بەدیهێنراوە تازەیەی کە پەروەردگار دەیەوێت بیهێنێتە بوون، وەك پرسیار کردنێك بەمەبەستی ڕوون کردنەوەی زیاتر دەربارەی حیکمەتی خوایی پرسیاریان لەخوای گەورە کرد، نەك وەك هەندێك کەس وا بۆی چوون کە گوایە لە ڕووی ڕەخنەو بەرهەڵستیکردنەوە بووبێت ! یان ئێرەییان بە ئادەم (علیه السلام)بردبێت !! . پرسییان:**

---

[1] سوورەتی (البقرة) / ئایەتی (٣٠)، واتا (دەمەوێ لەسەر زەویدا جێنشین دابنێم) .

[2] سوورەتی (الانعام) / ئایەتی (١٦٥) .

[3] سوورەتی (الانعام) / ئایەتی (٦٢) .

[4] النمل (٦٢) .

[5] کەواتە خوای گەورە ڕێزی زۆری لە مرۆڤ ناوە، ئەوەتە بەر لە دروستکردنی هەواڵەکەی ڕادەگەیەنێت .

﴿لجعلُ فيها مَن يُفسِدُ فيها ويسفك الدماء﴾ [1] . وتراوە: فریشتەکان بەدێهێنراوێکی لەو جۆرەیان لەناو جنۆکەکاندا پێشتر بینیوە [2]، عبداللە ی کوری عومەریش دەفەرموێت:

دوو هەزار ساڵ پێش ئادەم (علیە السلام)جنوکەکان لەسەر زەویدا بوون، خوێن ڕێژبوون، خوای گەورە فریشتەی بۆ ناردن و هەموو جنۆکەکانیان دەرکرد بۆ دورگەکانی کەنار دەریاکان وتراوە: ئەوان (فریشتەکان) ئادەمیان (علیە السلام)نیشاندراوە کاتێ لە

(لوح المحفوظ)دا بووە، یان خوای گەورە تەنها نیشانی (هاروت و ماروت)ی داوە لە ڕێگەی فریشتەیەکی سەروو خۆیانەوە کە ناوی (السجل)ە [3]، وتراوە: فریشتەکان بۆیە وا وەڵامیان دایەوە، چونکە زانیویانە کە زۆربەی گیاندارانی سەر زەوی سروشتیان خوێن ڕشتەنە، بە پێوانە لەسەر (جنوکەکان) .

﴿وَنحنُ نُسبحُ بحَمدِكَ وَنقدس لَك﴾ [4]، واتا: بەهەمیشەیی تۆ دەپەرستین و هیچ کامێکمان لێت یاخی نابین، ئەگەر خواستت لە بەدیهێنانی ئادەم ئەوەیە کە بەندایەتیت بکات ؟ ئەوەتە ئێمە شەووڕۆژ بەرفەرمانیت دەکەین ئەی پەروەردگار ! ﴿قالَ إني أعلَمُ مالا تَعلَمون﴾ [5]، واتا ئەوەی من دەربارەی بەدیهێنانی ئادەم و نەوەکانی دەیزانم ئێوە نایزانن، ئەوان پێغەمبەران و ڕەوانەکراوان و ڕاستگۆیان و شەهیدان و چاکەکارانیان لێ دەکەوێتەوە .

جا خوای گەورە دێتەسەر باسکردنی توانای زانستی ئادەم (علیە السلام)بەسەر فریشتەکاندا و دەفەرموێت ﴿وَعَلمَ آدَمَ الأسماءَ كُلَها﴾ [6]، واتا خوای گەورە هەموو ناوەکانی فێری ئادەم کرد، مەبەست لەناوی هەموو شتێکە، (ابن عباس) دەفەرموێت: سەرجەم ئەو ناوانەی بەسەر زاری ئێمەی مرۆڤ دا دێن، وەك (مرۆڤ، ئاژەڵ، زەوی،

---

[1] سوورەتی (البقرة) / ئایەتی (٣٠)

[2] قتادە (خ. ل) وا دەفەرموێت، هەروەها (ابن عباس)یش (خ. ل)، بەلام (الحسن) خ. ل دەفەرموێت: خوای گەورە خۆی نیگای ئەو وەڵامەی بە فریشتەکان داوە .

[3] واتا: فریشتەی (السجل) لەسەروو (هاروت و ماروت)ەوەیە لە پلەدا. ئەوەش لە فەرمایشتێکدا هاتووە کە (ابن ابی حاتم) لە (ابی جعفر الباقر)ەوە گێڕاویەتەوە .

[4] البقرە / ٣٠

[5] البقرە / ٣٠

[6] البقرة / ٣٢

دەشت، دەریا، شاخ، . هتد) لەگەڵ هەموو شتێکی تری هاوشێوەی ئەوانەدا [1] ڕاست ئەوەیە کە خوای گەورە هەموو ناوێکی فێری ئادەم کرد بەفەرمان و داتاشراوەکانیانەوە بە هەموو خەسڵەتەکانیانەوە

پێشەوا (بوخاری ومسلم) بەچەند گێڕینەوەیەك فەرموویانە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی (باوەڕداران لە ڕۆژی دواییدا کۆ دەبنەوە و دەڵێن: با سکالأمان بەرینە بەردەم بارەگای خوا، ئینجا دێنە خزمەت ئادەم و پێی دەڵێن: تۆ باوکی ئادەمیزادەکانی، خوای گەورە بە دەستی خۆی دروستی کردیت، فریشتەکانی کڕنوشی ڕێزیان لێنایت، ناوی هەموو شتەکانی فێرکردیت ... هتد [2]، ﴿ثُم عَرَضَهُم علي الملائِكَة فقَال أنبئوني بأسماءِ هؤلاءِ إن كُنتم صادقين﴾

[3]، واتا: (خوای گەورە ئەو ناوانەی کە فێری ئادەمی کردبوو، خستیە بەردەم فریشتەکانی و فەرمووی: دە ناوی ئەو شتانەم پێ بڵێن ! ئەگەر دڵنیا و گومانتان لە ئادەم هەیە !)، حەسەنی بصری دەفەرموێت: کاکاتێك خوای گەورە ویستی ئادەم (علیه السلام)بەدیبهێنێ فریشتەکان گوتیان: (پەروەردگارمان هیچ بەدیهێنراوێك دروست ناکات مەگەر هەر ئێمە لەو زاناتر دەبین)، لەسەر ئەوە خوای گەورە بەوە بێدەنگی کردن کە دەفەرموێت: ﴿إن كُنتم صادقين﴾ . فریشتەکان گوتیان ﴿قَالُوا سُبْحَانَكَ لا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ [4] واتا: (بێگەردی بۆ تۆیە پەروەردگار، ئێمە هیچ زانست و زانیاریەکمان نیە، مەگەر ئەوەی کە خۆت فێرت کردووین، بەڕاستی تۆ زانا و کار بەجێی) .

خودا فەرمووی: (ئەی ئادەم ناوی ئەو شتانە بە فریشتەکان بڵێ، کاتێك فێریکردن خوای گەورە بە فریشتەکانی فەرموو، ئەدی پێم نەگوتن کە من نهێنییەکانی ئاسمانەکان و زەوی دەزانم، وە دەشزانم ئێوە چیدەکەن بە پەنهان و ئاشکرا) [5]، مەبەست لەوەیە کە دیار و نادیار، پەنهان و ئاشکرا، لای خوای گەورە وەك یەك وایە،

---

[1] هەموو زانست و زانیاریەك زمانێکی تایبەتی خۆی هەیە لەگەڵ زاراوەی سەربەخۆدا، ئەوانەش هەموو ناون، فێرکردنی هەموو ناوەکان کرۆکی فێربوونی هەموو زانستێکە / وەرگێر .

[2] بخاری ئەو فەرمودەیەی گێڕاوەتەوە (٧٤١٠/١٩/٩٧ فتح)، هەروەها مسلم گێڕاویەتەوە (٣٢٢/٨٤/١) .

[3] البقرة (٣١) .

[4] البقرة / ٣٢

[5] البقرة / ٣٤ .

ئەگەر چی لەلای مەخلوقاتەکانی دوو ڕووی جیاوازن .وتراوە فەرمودەی ﴿أعلمُ ما تُبدُونَ﴾، وەڵامێکی خوای گەورەیە بۆ فەرمودەی فریشتەکان کە بەشەرمەوە گوتیان بە خوای گەورە ﴿أتجعَلُ فيها مَن يفسدُ﴾، هەروەها ﴿وَمَا كُنتُم تكتمون﴾وەڵامێکە بۆ ئەوان، لە وە بیرهێنانەوەی هەڵوێستی شەیتان کە فیزو هەوای خۆی دەرنەخستبوو لە بەرانبەر ئادەم (عليه السلام)کاتێك خوای گەورە فەرمانی کرد بە هەموو فریشتەکان (بە شەیتانیشەوە، کە ئەوسا یاخی نەببوو) تاکو کڕنووشی ڕێز بنوێنن بۆ ئادەم(عليه السلام)

﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ لِآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلَّا إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾، واتا: فەرمانمان بە فریشتەکان کرد تاکو کڕنووشی ڕێز بۆ ئادەم بەرن، ئەوەبوو هەموویان کڕنووشیان نواند، جگە لە (ابلیس) کە ملی نە دا و خۆی بەگەورە نواند .

دیارە ئەوە ڕێز و شکۆیەکی گەورەیە کە خودا بە ئادەمی بەخشیوە، بەتایبەتیش لەکاتێکدا بەدەستی توانای خۆی دروستی کرد، لەگیانی خۆی تێی فرۆسماند، هەروەك دەفەرموێت: (کاتێك پەیکەری ئادەمم ڕێك کرد، لەگیانی خۆمم وەبەردا کرد، ئیدی فریشتەکانیش کڕنوشی ڕێزیان بۆ نواند) [1]، لێرەدا چوار شکۆمەندی بە ئادەم (عليه السلام)دراوە: بەدەستی تەوانایی خۆی پەروەردگار بەدیهێنا، لەگیانی خۆی وەبەریدا کرد، فەرمانی بە فریشتەکان کرد کڕنووشی ڕێزی بۆ بنوێنن، ناوی هەموو شتەکانی فێرکرد (واتا: زانستی فێرکرد) .

لەکاتی گفتوگۆ کردنیشدا لەگەڵ موسی پێغەمبەر (عليه السلام)لە (ملأ الأعلي)دا موسی (عليه السلام)پێی فەرموو: (تۆ، ئادەمیت باوکی هەموو مرۆڤەکانیت، خوای گەورە بەدەستی توانایی خۆی تۆی بەدی هێنا، لەگیانی خۆی وەبەریداکردیت، فریشتەکانی بۆ بەکڕنووش داخستیت، ناوی هەموو شتێکی فێرکردیت..)، هەر بەهەمان شێوە خەڵکی لە ڕۆژی دواییدا دەچنە خزمەتی ئادەم و (عليه السلام)هەمان گوتە دەڵێنەوە، کە دواتر پشت بەخوا باسی دەکەین . لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: (بەدیمان هێنان، ئەوجا وێنەمان بۆ بڕیاردان، پاشان بە فریشتەکانمان فەرمان کرد کە کڕنووشی ڕێز بۆ ئادەم بنوێنن، هەموویان کڕنووشیان نواند جگە لە ئیبلیس، ئەو نەچووە ڕیزی کڕنووشبەرانەوە، خوای گەورە فەرمووی: بۆچی کڕنووشت نەبرد

[1] الحجر / ٢٩ .

لەکاتێکدا فەرمانم پێکردویت ؟ ئیبلیس گوتی: من لەئادەم باشترم، منت لە ئاگر دروست کردووەو ئەویشت لە قوڕ دروست کردووە) [1] .

حەسەنی بەصری دەفەرموێت: (ئیبلیس) پێوانە و بەراوردکاری کرد، یەکەم کەسیشە کە بەراوردکاری داهێنا، (محمدی کوری سیرین)یش دەفەرموێت: (یەکەم کەسێك کە پێوانە و بەراوردی بەکارهێنا (ئیبلیس)بوو، مانگ و خۆریش لەسەر بنەمای پێوانە و بەراود پەرستراون) [2]. واتا (ئیبلیس) خۆی و ئادەمی بەراورد کرد، لە ڕووی پێکهاتنیانەوە، سەرەنجام خۆی پێ باشتر هاتە بەرچاو لەئادەم و بەخۆی نەبینی بۆ کڕنووشی ڕێی بۆبەرێت ئەگەر چی خوایش فەرمانی بەکڕنوشی بردنەکەدابوو سەرجەم فریشتەکان (بە ئیبلیسیشەوە) ئەگەر چی لەبەرامبەر دەقی فەرمانی خواییدا بەراووردکردن هیچ نرخێکی نامێنێ پەشان ئیبلیس هەر بۆ خۆیشی خراپەکاربوو، چونکە لەڕاستیدا (قوڕ) لەئاگر بەسوودترە سەنگینی و گەشەو خۆگری و ڕەگی ژیانی تێدایە، بەلاّم ئاگر ماشینەوەو هەڵپروکان و ترس و هەڵەشەیی و سوتانی لیّ دەوەشێتەوە .

جگە لەمانە ئادەم لەلایەن خوای گەورەوە شەرەفمەند کراوە بەوەی کە بەدەستی تەوەنایی خۆی بەدی هێناوە و لەگیانی خۆی وەبەرداکردووە، لەبەر ئەمانەیشە کە فەرمانی بە فریشتەکان کرد کڕنووشی ڕێزی بۆ بنوێنن، وەك دەفەرموێت: (سوێند بەخوا ئێمە سەرەتا مرۆڤمان لە قوڕێکی وشك دروستکردنە پێشر قوڕێکی ڕەش باوو ترشاو بوو دروستکرد، پەریشمان پێشتر لە ئاگرێکی بەتین دروست کرد کە بەوردیلە کونەکاندا تێپەڕ بێت، یادی ئەوە بکەرەوە کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی گوت: بەڕاستی من دروستکاری بەشەرێکم لە قوڕێکی ووشك کە پێشتر قوڕێکی ڕەشباو وترشاو . بوو جا کاتێك ڕێك و پێك تەواوم کرد لەو ڕۆحە تایبەتییەی کەمن (بەدیهێنەری ئەوم) وەبەرمداکرد، هەمووتان کڕنووشی(ڕێزی)بۆبەرن، ئینجا فریشتەکان هەموویان کڕنووشیان نواند، جگە لە ئیبلیس کە سەرپێچی کرد لەناو کڕنووشبەراندا بێت) [3] تاکۆتایی ئایەتی(٤٤)(ابلیس)شایستەی ئەو سزایە بوو، چونکە ئادەمی لەخۆی بە کەمتر زانی و گاڵتەی پێکرد،خوای گەورەش بەسەرئەودا بەرزی

---

[1] الأعراف / ١١، ١٢ .

[2] هەروەك گێرانەوەکە لە (ابن جرير)ەوەیە .

[3] الحجر / ٢٥ - ٤٤

کردەوە، لەبەرئەوەی فەرمانی خودای شکاند و کەللەڕەقی و سەرسەختی نواند لەبەرانبەر هەق و دەقی فەرمانی خوایی بەتایبەتیش بۆ کڕنووشی ڕێز نواندنەکە بۆ ئادەم .

دێینە باسی پۆزشت هێنانەوەکەی کە هیچ سوودی نەبوو، بگرە پۆزشتەکەی لە تاوانەکەی خراپتربوو، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (کاتێك بە فریشتەکانمان گوت: ئادەی سوجدە بەرن بۆ ئادەم (سوژدەی ڕێز) هەموو سوژدەیان برد جگە لە (ئیبلیس) کە گوتی: چۆن سوژدە دەبەم بۆ ئەو کەسەی کە لەقوڕ دروستت کردووە ؟ پاشان (بێ شەرمانە) گوتی: پێم بڵێ ئائەوەیە کە ڕێزت داوە بەسەر مندا ؟ سوێند بەخوا ئەگەر دوامبخەیت تا ڕۆژی قیامەت، ئەوە بێگومان هەموو نەوەکانی گومڕا و سەرگەردان دەکەم جگە لەکەمێکیان کە دەسەڵاتم بەسەریاندا نیە، خوای پەروەردگار فەرمووی: بڕۆ ئەوەی شوێنی تۆ بکەوێت لەوان، ئەوە بێگومان دۆزەخ پاداشتی هەمووانتانە کە پاداشتێکی مسۆگەرە و جێگەی هەمووتانی تێدا دەبێتەوە، بڕۆ چیت لەدەست دێت درێغی مەکە، هەرکەس کە توانیت (لەو بەدبەختانە) بە بانگ کردن و هاندانیان بۆ تاوانکاری، دایانبڕە، بە هۆی لەشکری سوار و پیادەی خۆتەوە هێرشیان بۆبەرەو هاوبەشیان بکە لەماڵ و سامان و منداڵ و نەوەیاندا (بە سامانی حەرام و منداڵی زۆڵ و. هتد)ئەوەندەش بەڵێن و ئۆمێدیان پێبدەسەریان لێبشێوێنە، هەرچەندە بەڵێن و هاندانی شەیتان جگە لە فریودان و فێڵ کردن و ساختە، شتێکی ترینە، بەڕاستی بەندەکانی من (ئەی شەیتانی نەفرەتی) هیچ دەسەڵاتی تۆیان لەسەر نابێت و هەوڵ و کۆششی تۆ کاریان تێناکات، پەروەردگاری تۆ (ئەی ئیمااندار) بەسە بۆ پارێزگاری و پاراستنت) [1] .

هەروەها لە سورەتی (الكهف)دا دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِي وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا﴾[2]، واتا: (ئیبلیس٨) بەخواست و ویستی خۆی و بەدەستی ئەنقەست و هەر بە کەللەشێتی خۆی لە فرمانی خوا دەرچوو، فیزی نواند، دیارە فێڵی لەسروشتی خۆی کرد لەگەڵ ئەو ماددە سوتێنەرەی لێی دروست کراوە، (عائشە) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)

---

[1] الاسراء / ٦١ ـ ٦٥ .

[2] الكهف / ٥٠ .

دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (فریشتەکان لە ڕۆشنایی دروست کراون، جنۆکەکانیش لە بڵێسەی ئاگر و ئادەمیش لەوە دروست کراوە کە بۆتان ڕوون کراوەتەوە) [1] .

حەسەنی بەصری دەفەرموێت: هەرگیز ئیبلیس بۆ ماوەی چاو تروکانێکیش فریشتە نەبووە، (شهر بن حشب)یش دەفەرموێت: بەڵکو جنۆکە بووە، هەر کە دەستیان دایە خراپەکاری لەسەر زەویدا، خوای گەورە فریشتەکانی نارده سەریان، تەفروتونایان کردن و شاربەدەری دورگەکانی کەنار دەریایان کردن، (ابليس) لەوانەبوو کە بە (دیل)گیرا، لەگەڵ خۆیان بردیان بۆ ئاسمان و لەویّ هێشتیانەوە، جا کاتێك خوای گەورە فەرمانی بە فریشتەکان کرد تا کڕنووشی ڕێز بۆ ئادەم بنوێنن، ئەو ڕازی نەبوو ملینەدا .ابن مسعود و ابن عباس و کۆمەڵێك لە هاوەڵانی دەفەرموون: (ئیبلیس) سەرۆکی فریشتەکان بوو لە ئاسمانی دونیادا، ناوی (عەزازيل) یان (حارث)بوو کونیەکەی (أبو کردوس)بوو، لە نێو گرۆیەك فریشتەدابوو کە پێیان دەگوترا (جنۆکە) و خەزنەداری باخان بون، ئەو لە هەموویان زیاتر شکۆمەند و زاناتر و خواپەرست تر بوو، چوار باڵی هەبوو، خوای گەورە کردیە ئەو شەیتانە نەفرەتیە . خوای گەورە لە سوورەتی (ص)دا دەفەرموێت: (من دەمەوێت بەشەرێك لە قوڕ دەروست بکەم، جا کاتێك دروستم کرد و لەوگیانەم بەبەرداکرد (کە من خاوەنیم) فووم پێداکرد و گیان و ژیانم و پێبەخشی، ئێوەی فریشتە هەمووتان سوژدەی ڕێزی بۆ بەرن، هەموو فریشتەکان بە فەرمانی خوا سوژدەیان برد، جگە لە ابليس نەبیّ کە خۆی بەگەورە زانی و چووە ڕیزی کافرانەوە، خوا فەرمووی: ئەی ئیبلیس ئەوە چی نەیهێشت و ناهێڵێت سوژدە بەریت ؟ بۆ ئەو کەسەی کە بە دوو دەستی توانایی خۆم دروستم کردووە، ئایا خۆتت بەگەورە زانی، یان هەر لە زووەوە خۆتت بەشت زانیوە و خۆتت بەبەرز و گەورە دیوە ؟ شەیتان گوتی من لەو چاکترم، چونکە تۆ منت لەئاگر دروست کردووە و ئەوت لە قوڕ بەدیهێناوە، خوا فەرمووی: مادەم وایە دەرچۆ لەبەهەشت و بەجێی بهێڵە، چونکە ئیتر تۆ نەفرەت لێکراوی و دورخراوەیت لە ڕەحمەتی من، بە ڕاستی نەفرەتی منت لەسەرە تا ڕۆژی قیامەت، شەیتان گوتی: پەروەردگارا ، کەواتە مۆڵەتم بدە و بمهێڵەوە تا ئەو ڕۆژەی نەوەکانی ئادەم زیندو دەکرێنەوە، خوای گەورە گەورەفەرمووی: باشە تۆ لە مۆڵەت دراوانیت، تا ڕۆژ و کاتی

---

[1] صحيح المسلم (٥٣/١٠/٢٩٩٦) .

دیاریکراو، ئینجا شەیتان گوتی: سوێند بە دەسەڵاتی بێ سنوورت،شەرت بێ هەرهەموویان گومڕاو سەرگردان بکەم جگە لە بەندە دڵسۆزەکانت کە هەڵبژاردەی خۆتن، خوای گەورە فەرمووی: من خۆم هەق و ڕاستیم و هەر هەق و ڕاستیش دەڵێم، سوێند بەزاتی خۆم دەبێت دۆزەخ پڕبکەم لەتۆ و ئەوانەی شوێنی تۆ دەکەون) [1] .

لە سوورەتی(الاعراف)یشدا خوای گەورە دەفەرموێت: (بەهۆی ئەوەی کە تۆ منت گومڕاو سەرگردان کرد، ئەوە سوێندبێت منیش لە ڕێگە ڕاستەکەتدا بۆیان دادەنیشم تا لایانبدەم، پاشان سوێند بەخوا لەبەردەمیانەوە، لە پشتیانەوە، لەلای ڕاستیانەوە، لەلای چەپیانەوە بۆیان دێم (دنیایان لەلا خۆشەویست دەکەم و گومانیان دەربارەی قیامەت لا دروست دەکەم) دەستت ناکەوێت زۆربەیان سوپاس گوزەران بن) [2]

کەواتە شەیتان بۆ سەدا خۆی حەشارداوە بۆ مرۆۆ و هەموو ڕێگەکانی و ئەملاولاکانی گرتووە، جگە لەلای ئاسمان دڵخۆش کەسێکە سەرپێچی داخوازیەکانی شەیتان دەکات و بەدبەختیش ئەو کەسەیە کە وەدوی دەکەوێ، پێشەوا احمد دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (شەیتان لەسەر هەموو ڕێگەکانی مرۆۆ بۆیان دانیشتووە) [3] . ئەو زانایانەی ڕاڤەی قورئانیان کردووە، چەند لێکدانەوەیەکی جیاوازیان هەیە دەربارەی ئەو فریشتانەی فەرمانیان پێکرا تا کڕنووشی ڕێز بنوێنن بۆ ئادەم، ئایا هەموو فریشتەکان دەگرێتەوە کە زۆربەی ئایەتەکان وا باس دەکەن و ئەوەش بۆچوونی جمهوری زانایانە، یان تەنها مەبەست لە فریشتەکانی زەوی بووە، هەروەك (ابن جریر) وا دەگێرێتەوە ؟ لە ڕەوشی گشتی ئایەتەکانەوە وا دەردەکەوێ و فەرمودە پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت: (واسجد لە ملائکتە)، کە ئەمەشیان هەر شێوەیەکی گشتی هەیە، خوا دەزانێت،هەروەها فەرمودەی خوایە ﴿اهبط مِنها﴾[4]، واتا: ئەی (ئیبلیس) دابەزە خوارەوە لەبەهەشت، یان ﴿أخرُج مِنها﴾ [5] واتا: بچۆرە دەرەوە لە بەهەشتدا، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەئاسماندا بوە، بۆیە دەفەرموێت: دابەزە ئەوەش

---

[1] ص / ٧١ - ٨٥ .

[2] الاعراف / ١٦ — ١٧ .

[3] نسائی (خ. ل) لە (المجتبی)دا گێڕاویەتەوە (٢١/٦، ٢٢ التجاریە)، پێشەوا (احمد)یش (خ. ل) لە (مسند)ەکەیدا (٤٨٣/٣ حلبی) هێناویەتی .

[4] الاعراف / ٣٧ .

[5] الاعراف / ١٨ .

پاش دابەزینی شکۆو پلەی مەعنەوی کەسێتی یەکەی بوە ، ئیتر بەکەساسی و ڕیسوایی دابەزیە سەر زەوی .

خوای گەورە فەرمانی کرد بە ئادەم و ژنەکەی تا لەبەهەشت دا نیشتەجیێ بن، وەك دەفەرمویێت ﴿وَقُلْنَا يَا آدَمُ اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ وَكُلا مِنْهَا رَغَداً حَيْثُ شِئْتُمَا وَلا تَقْرَبَا هَذِهِ الشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ [1] الاية، واتا ئەی ئادەم خۆت و هاوسەرەکەت لەم بەهەشتەدا ژیان بەرنەسەر و لەهەرکویێ حەزدەکەن بخۆن و بخۆنەوە بەتێر و تەسەلی، بەلاَم نزیکی ئەم درەختە مەکەون (درەختێکی دیاریکراو بۆ تاقیکردنەوە لێیان قەدەغەکرا) ئەگینە دەچنە ڕیزی ستەمکارانەوە. هەروەها لە سوورەتی (الاعراف)دا دەفەرمویێت: ﴿قَالَ اخْرُجْ مِنْهَا﴾[2] الاية، واتا:خوای گەورە فەرمووی (ئەی ئیبلیس) لەبەهەشت بچۆرە دەرەوە بەسەرشۆڕی و ڕیسوایی و دەرکراوی، سوێند بەخوا ئەو کەسەی شوێنت کەوت لەوان، ئەوە بێگومان دۆزەختان لیێ پڕ دەکەم، لەئێوەو ئەوان . وە دەفەرمویێت الاية ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلائِكَةِ اسْجُدُوا لآدَمَ﴾ [3] الاية، واتا: بە فریشتەکانمان گوت:(سوژدەی ڕیێز) بەرن بۆ ئادەم، هەموو سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس کە لەخۆبایی و سەرسەخت بوو، بە ئادەممان وت: ئەم ئیبلیسە دوژمنی خۆت و هاوسەرەکەتە، وریابن لەبەهەشت بەردەرکردنتان نەدات بەو هۆیەوە تووشی ناخۆشی و دەربەدەری بن .

دڕەوشی گشتی ئەم ئایەتانە بەسە بۆئەوەی لەلامان ڕون بێت، کە: بەدیهێنانی (حواء) پێش چوونی ئادەم بوە بۆ بەهەشت، بەپێی ئەو فەرمودەیەی خوای گەورە کە دەفەرمویێت: ﴿يَاآدَمُ اسْكُنْ أَنْتَ وَزَوْجُكَ الجَنة ...﴾ [4] هەروەها لە (ابن عباس) و (ابن مسعود) و کۆمەلیێ هاوەلی ترەوە هاتووە کە فەرمویانە: (ئیبلیس) لەبەهەشت دەرکرا و ئادەم تیایدا نیشتەجیێ کرا، بەتەنها لە بەهەشتدا دەگەڕا و ژنی نەبوو، جارێکیان خەوی لێکەوت، کە لەخەو ڕابوو بینی وا ژنێك لە ژوورسەریەوە دانیشتووە، کە خوای گەورە هەر لە پەراسووی خۆی بۆی دروست کردبوو، لێی پرسی: تۆ چیت ؟ گوتی: من ئافرەتم، لێی پرسی: بۆچی بەدیهێنراویت؟ گوتی: تا تۆ هاوژیانم بیت و سوکناییت پێم بێت، فریشتەکان بەسەرسامییەوە بۆ زانست و زانیاریەکەی پێیان

---

[1] البقرة / ٣٥ .

[2] الأعراف / ١٨ — ١٩ .

[3] طه / ١١٦ — ١١٩ .

[4] الاعراف / ١٨ — ١٩ .

گوت: ئەو ناوی چییە؟ ئادەم فەرمووی: ناوی (حواء)ە، فریشتەکان لێیان پرسی: بۆچی (حواء)؟ فەرمووی: چونکە لە شتێکی زیندووە بەدی هێنراوە . محمدی کوری ئیسحاق لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە: (حواء) لە پەراسوە کورتەکەی لای چەپی ئادەم دروست کرا، لەکاتێکدا کە ئادەم لەخەودا بوو، شوێنی پەراسووەکەش گۆشت پڕی کردەوە، بۆ ڕاستی ئەم گێڕانەوەیەش ئەو فەرموودەیەی خوای گەورە پشتی پێدەبەستین کە دەفەرموێت: ﴿يأيها الناسُ اتقوا رَبَّكم الذي خَلَقَكُم مِن نفسٍ واحدةٍ ...﴾ [1] الاية واتا: ئەی خەڵکینە لە خەشم و قینی ئەو پەروەردەگارەتان بترسن و خۆتان بپارێزن، ئەو پەروەردگارەی ئێوەی لەتاقە نەفسێك بەدیهێناوە و پاشان ژن و پیاوێکی زۆری لێخستونەتەوە . هەروەها دەفەرموێت: ﴿هوَ الذي خَلَقَكُم مِن نفسٍ واحدةٍ ...﴾ [2] واتا: (خوای ئێوە، ئەی ئادەمیزاد ئەو خوایەیە کە ئێوەی لەتاقە نەفسێکەوە بەدی هێناوە و لەو کەوتوونەتەوە)

پشت بەخوای گەورە لە داواییدا باسی دەکەین، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (باش چاودێری و مۆژیاری ژنان بکەن، چونکە ئافرەت لە پەراسوو بەدیهێنراوە، خوارترین (لارترین) بەشیش لەپەراسوودا بەشی سەرەوەیەتی، ئەگەر بتەوێت چەماوەکەی ڕاست بکەیتەوە دەشکێت، وازیشی لێبهێنی هەر بەخواری دەمێنێتەوە، لەبەرئەوە باش وریاداری و مۆژگارییان بکەن) [3] .

**ڕاڤەرەکارانی قورئانی پیرۆز، ڕاو ڕاڤەی جیاجیایان هەیە دەربارەی ئایەتی**

﴿وَلا تَقرَبا هذِهِ الشَجرة ...﴾ [4]، واتە: توخنی ئەو دارە مەکەون، تیانا هەیە دەڵێت: ئەو دارە مێوە، جولەکەکان وا باسی دەکەن کە (گەنم)ە، وتراوە دەنکەکانی لە ڕۆنەکەرە ناسکتر و نیان تر بوون و تامەکەیشی لە هەنگوین خۆشتر بووە، وتراوە (خورمایە)، هەنجیرە، (ابو العالیە)ش دەفەرموێت: درەختێك بوە هەرکەسێك لێی بخواردایە تاوانێکی دەکرد، تاوانکردنیش لەناو بەهەشتدا ناگونجێ، ئەوەش حیکمەتی خوایە کە خوای گەورە جۆری درەختەکەی بۆ دیاری نەکردوین، خۆ ئەگەر خێر و بەرژەوەندی بۆ ئێمە تێدابوایە ئەوا بە شاراوەیی نەدەمایەوە، ئەمەیان

---

[1] النساء / ١ .

[2] الأعراف / ١٨٩ .

[3] رواه البخاري (٦٠/٣٣٣١، ٥١٨٤، ٥١٨٦ فتح الباري) ورواه مسلم في صحيحه من نفس طريق البخاري (١٤٦٨/١٨/١/١٧).

[4] البقرة / ٣٥ .

کێشەیەکی ئەو تۆنیە، بەڵام دیسانەوە ڕا و بۆچوونی جیاواز لەنێوان زانایانی تەفسیردا هەیە دەربارەی ئەو بەهەشتەی کە ئادەمی تێدا بووە، ئایا لە ئاسماندا بوو، یان لەسەر زەوی؟!

جمهوری زانایان لەگەڵ ئەوەدان کە لەئاسماندا بووە کە بەبەهەشتی (مەئوا) ناسراوە ئەویش بەپێی ڕوکاری ئایەتەکان و فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿یاآدَم اسکُن أنتَ وَزَوجُكَ الجَنة﴾[1]، ئەو (ئەلف و لامە)ی لەسەر (الجنە)یە بۆ (معلوم)کردن و پەیمان پێدراوی بێژەیی نیە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ پەیمان پێدانێکی زەینی، کە بەدوا شوێنی حەوانەوە ناسراوە و مەبەست لە (جنة المأوي)یە، هەروەکو (موسی) پێغەمبەر (علیه السلام)لە ئادەمی پرسی: لەسەر چی ئێمە و خۆشت لە بەهەشت بە دەرکردندا ؟!) .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (کاتێ لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە خەڵکی کۆ دەکاتەوە، باوەڕداران ئەو دەمەی بەهەشتیان بۆ دەڕازێتەوە دێنە لای ئادەم و پێی دەڵێن: ئەی باوکی هەموومان دەرگای بەهەشت تۆ بیکەرەوە، ئادەم وەڵامیان دەداتەوەو دەڵێت: من دەرگا بکەمەوە لەکاتێکدا بەهۆی تاوانی منی باوکتانەوە ئێوەش لەبەهەشت دەرکران)[2]، ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ پشتگیری لەوەی کە ئەو بەهەشتە (جنە المأوی)یە و ناکرێ چاوی لێ بپۆشرێ.

هەندێکی تر دەڵێن: ئەو بەهەشتەی ئادەم و حەوای تێدا نیشتەجێبوون بەهەشتی نەمری (جنە الخلد) نیە، چونکە فەرمانیان پێکرا کە لەو درەختە نەخۆن،

هەروەها ئادەم تیایدا خەوتبوو، پاشان دەرکران تیایدا، بەڵکو شەیتانیش چووەتە ناویەوە، ئەم سیفەتانەش لەگەڵ _جنە الخلد)دا ناگونجێن[3] .

گەلێك جیاوازی هەیە لەسەر هەردوو لێکدانەوەکە، کە بەشێوەیەکی گشتی زانایان و فەرمووده ناسان و ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز دوو بەشن: بەشێکیان باوەڕیان وایە ئەو بەهەشتە (جنةالمأوي)یە و بەشەکەی تریان باوەڕیان وایە کە ئەو بەهەشتەی ئادەم و حەوای تێدا نیشتەجێکرا بەهەشتێکی تایبەتی بووە، خوای گەورە تەنها بۆ تاقیکردنەوەی ئەوان دروستی کردووەو خانەی تاقیکردنەوە بووە نەك

---

[1] البقرة / ٣٥ .

[2] مسلم لە (صحیح)دکەمیدا (١/٨٤/١٩٥) ئەو فەرموودەی هێناوە بە درێژی .

[3] بڕوانە (قصص الانبیاء)ی شێخ النجار .

خانەی نەمریی . دیسان ئەمانیش دەبنەوە بە دوو بەشی تر، بەشێکیان پێیان وایە، ئەو بەهەشتە لە ئاسماندایە، چونکە خوای گەورە کاتێك دەریکردن فەرمووی ﴿اهبطوا منها﴾، واتە: دابەزنە خوارەوە لەو بەهەشتەدا، بەڵام بەشی دووەمیان پێیان وایە ئەو بەهەشتە لە زەویدا بووە، چونکە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە تەنها لەبەری ئەو درەختە نەخۆن و ئەوانی تر هەمووی حەلاڵە، ناکرێت لەوێ هەندێ شت حەلاڵ و هەندێ شتی تر حەرام بێت، کەواتە ئەو شوێنە دنیایە، دیارە ئەوەش پاش فەرمانی دەرکردنەکە بوو بۆ ئیبلیس کە کڕنووشی ڕێز بنوێنێ، خوای گەورە خۆی زانایە ئاخۆ کامیان ڕاستە لەو بۆچوونانە، زۆرینەی بۆچوونەکان یەکلایی نەکراوەتەوە لەو بارەیەوە ئەگەر چی باوەڕ وایە ئەو بەهەشتە لەئاسمانیشدایە و (جنة المأوى)ش نیە .

ئەوانەی لەگەڵ بۆچوونی دووەمدان، پرسیارێکیان هەیە و پێویستە وەڵامیان بدرێتەوە، ئەوان ئەڵێن: بێگومان خوای گەورە کاتێك ئیبلیسی دەرکرد کە کڕنووشی ڕێزی نەنواند لە خزمەتی پەروەردگاردا، ئینجا فەرمانیدا بە چوونە دەرەوەی لە بەهەشت و دابەزینی ئەم جۆرە فەرمانەش لەو جۆرە فەرمانە شەرعیانە نیە کە بتوانرێ نەکرێت، بەڵکو فەرمانی خوایە و نەکردنی نیە، لەبەرئەوە خوای گەورە فەرمووی: ﴿قَالَ اخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُوماً مَدْحُوراً﴾[1]، واتا بە ڕیسوایی و سەرگەردانی لە بەهەشت بچۆرە دەرەوە (ئەی ئیبلیس)، هەروەها فەرموویەتی (لە بەهەشت دابەزە خوارەوە، بۆت نیە فیزو خۆبەزلزانی لە بەهەشتدا بنوێنی، ﴿اخرُج منها فَإنكَ رجيم﴾[2]، بڕۆ دەرەوە تۆ نەفرەت لێکراویت، (منها) ڕاناوێکە دەگەڕێتەوە بۆ (بەهەشت یان ئاسمان یان پلەوپایە)، جا ئیتر مەبەست هەرکامیان بێت، گرنگ ئەوەیە تازە شەیتان ناتوانێ بگەڕێتەوە ئەو بار و شوێنەی کە پێش دەرکردنەکەی تێیدابوو . ئەوەش نەبەشێوەی بەردەوام و نەبەشێوەی کاتیش .لە ڕوکاری واتای ئاشکرای ئایەتەکانەوە دەردەکەوێ کە شەیتان وەسوەسەی خستوەتە دڵی ئادەمەوە و گفتوگۆی لەگەڵدا کردووە، پێی گوت: ﴿هَل أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الخُلد وَمُلكٍ لايَبلى﴾[3] واتا: ئەی ئادەم ئایا دەتەوێ درەختی نەمری و ماڵ و سامانێکی نەبڕاوەت نیشان بدەم ؟ هەروەها پێی گوت: (پەروەردگارتان ئەم درەختەی لێ قەدەغە نەکردوون تەنها لەبەرئەوەیە نەوەکو ببنە

---

[1] الأعراف / ١٨ .

[2] ص / ٧٧ .

[3] طه / ١٢٠ .

فریشتە،یاخود بۆ ئەوەیە ئەوەکو لە ئەمران بن،سوێندی بۆ خواردن کە من ئامۆژکارتانم و دڵسۆزتانم،ئیتر فریوی دان)[1] ئەمەش ڕوکاری ئاشکرای ئەو ئایەتانەیە کە باسی کۆبوونەوەو گفتوگۆی شەیتانە لەگەڵ ئادەم و حەوادا لەو بەهەشتەدا کە تێیدابوون، زانایان وا وەڵامی ئەو پرسیارەیان داوەتەوە کە شەیتان بۆی هەبووە بەخێرایی و ڕێبواری بەلایاندا گوزەر بکات و قسەیان بۆ بکات، نەك لە بەهەشت دا بمێنێتەوە،لەوە دەچێ هەر دووربەدوور لە دەرگای بەهەشتەوە گومانی خستوەتە دڵیانەوە، یان لەژێر ئاسماندا، هەریەکیشیان هەڵوێست و لێکدانەوەی خۆی هەیە

لە ئوبەی کوڕی کەعبەو دەگێڕێتەوە کە ئادەم لە سەرەمەرگدا زۆر ئارەزووی هێشوویەك ترێی بەهەشتی دەکرد، کوڕەکانی ڕۆشتن تاکو بۆی پەیدا بکەن لە ڕێگەدا چەند فریشتەیەکیان دیت، فریشتەکان پرسییان ئەی کوڕانی ئادەم بۆ کوێ دەچن؟ گوتیان: باوکمان حەزی لە هێشوویەك ترێی بەهەشتە، فریشتەکان پێیان گوتن: بگەڕێنەوە . ئەوەی بەسە، ئەوانیش گەڕانەوە، بینیان باوکیان گیانی کێشاوە، ئیتر شۆردیان و کفنیان کرد، جوبرائیل (علیە السلام)نوێژی لەسەر کرد و فریشتەکانی تریش لەدوایەوە نوێژیان لەسەر کرد، ئینجا ئەسپەردەی خاکیان کرد، فریشتەکان بە کوڕانی ئادەمیان گوت: ئەمە سوننەتی ئێوەیە دەبێ لەگەڵ مردوەکانتان (واتا بەو شێوازە مردووەکانتان دەشۆن و نوێژیان لەسەر دەکەن و ئەسپەردەی خاکیان دەکەن) . زانایان دەڵێن: مادام گەیشتن بەو بەهەشتەی ئادەم تیایدا حەزی لە ترێ کرد شیاوە ئەگەر وانەبوایە کوڕەکانی نەدەچوون بۆی پەیدا بکەن، کەواتە ئەو بەهەشتە لە زەوی بووە، خوا زاناترە .

هەروەها دەڵێن: ئەو ئەلف و لامەی لەسەر ووشەی (الجنه)یە لەم ئایەتەدا ﴿اسكُن أنتَ وَزَوجُكَ الجَنة﴾ [2] پەیمانێك لە پێشییەوە نیە تا بۆی بگەڕێتەوە، لەبەرئەوە پەیمان پێدراوەکە شتێکی زەینییە، بەڵام ڕەوشی قسەکە وا دەردەکەوێ، ئەگینا ئادەم لە زەوی هەر لەسەر زەویش دروست کرا، باسی ئەوەش نەکراوە کە گوایە بەرزکرابێتەوە بۆ ئاسمان، لە بنەڕەتیشدا بۆ ئەوە دروست کرا کە لەسەر زەویدا بژی، هەروەکو خوای گەورە بەر لە دروست کردنی ئاوای بە فریشتەکان ڕاگەیاند: کە دەیەوێت لەسەر

---

[1] الاعراف / ٢٠ —٢٢ .

[2] الأعراف / ١٩ .

زەویدا نیشتەجێیەك دروست بكات ﴿إني جاعلٌ في الأرض خليفة﴾[1] دەڵێن: ئەوەش هەروەكو ئەو فەرمودەیەی خوای گەورە وایە، كە دەفەرموێت (ئێمە تاقیمانكردنەوە هەروەكو هاوەڵانی بەهەشتمان تاقیكردەوە)[2]، لەم ئایەتەشدا ئەلفولامی سەر (الجنة) بۆ دیاریكردن (مبنی للمعلوم) نیە، پەیمان پێدراوێكی بێژەریشی لە پێشەوە نیە، بەڵكو پەیمان پێدراوێكی زەینییە كە بریتیە لە (بێستان)ەكە . گوتویانە: كە باس لە دابەزینی ئادەم كراوە لە بەهەشتدا، ئەوە ناگەیەنێ كە دابەزینەكە لە ئاسمانەوە بووە، هەروەكو خوای گەورە ووشەی (إهبط: دابەزە)ی بەكارهێناوە، بۆ فەرمانكردن بە (نوح)ی پێغەمبەر (علیە السلام)تا لە كەشتێكە دابەزێت، دەفەرموێت:

﴿قيلَ يانوح إهبط بسلام منا وبركات عليك﴾[3] الاية، لە ئایەتێكی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إهبطوا مصراً فإن لكم ماسألتم﴾[4] لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) و گەلێ ڕشتەی زمانەوانی و ئەدەبیدا (اهبط) و (هبوط) بە مەبەستی دابەزینی ئاسایی بەكار هێنراوە، ئەوەیان دەشێت كە بوترێ: ئەو بەهەشتەی كە ئادەم و حەوای تێدابوون لە بەرزترین شوێنی زەویدا بوویێت و پڕ لەداری بەردارو سایە و سێبەر و میوە بوبێت، هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەی ئادەم لەو بەهەشتەدا برسیت نابێت و بێبەرگ نابێت)[5]، مەبەست لەوەیە كە دەروون و گەدەت برسی نابێت و ڕوكاری لەشیشت بێبەرگ و ڕەجاڵ نابێت، هەروەها دەفەرموێت:

(تۆ تینووت نابێت و گەرمات نابێت)[6]، واتا: دەروون و گەدەت تینووی نابێت و لەشیشت تیشكی خۆر گەرمی داناهێنێت جا خۆت هەردووكیان بەراورد بكە و ڕادەی گونجانیان بزانە، بە كورتی ئەو سیفەتانە سیفەتی شوێنێكی خۆشن لەسەر زەویدا، نەك ئەو بەهەشتەی كە موسوڵمانان دوای ژیانی دنیا تێی دەچن. ئەگەر ئەو بەهەشتە، بەهەشتی (مەئوا)بوایە. ئەبوایە ئادەم و حەوا لەبەری ئەو دارەیان نەخواردایە كە لێیان قەدەغە كرابوو، كەواتە لە تۆڵەی ئەو فەرمانشكاندنەدا فەرموون

---

[1] البقرة / ٣٠ .

[2] القلم / ١٧ .

[3] هود / ٤٨ .

[4] البقرة / ٦١ .

[5] طه / ١١٨ .

[6] طه / ١١٩ .

دابەزنە سەر زەوی پڕ لەماندوویی و شەکەتی، ڕەنج و کۆشش، ئەزمون و تاقیکردنەوە، جیاوازی خەڵکەکەی لەئاین و ڕەوشت و کاروباردا؛ لە مەبەست و خواستدا، لەگوتار و کرداردا، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (بۆ ئێوە هەیە لە زەویدا شوێنی نیشتەجێبوونتان و پێویستیەکانتان هەتا کاتی دیاریکراو) [1]، واتا: تا کاتی مەرگتان دێت، ئەوەش ئەوە ناسەلمێنێ کە لەئاسماندا بووبێتن، گوتویانە: ئەوەش مانای ئەوە ناگەیەنێ نکولی لەوە بکرێت کە ئێستا بەهەشت و دۆزەخ هەنە، ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) جەخت لەسەر بوونی ئەو بەهەشتە و دۆزەخە دەکەنەوە، خوای گەورە خۆی زاناترە .

دەربارەی ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ وَقُلْنَا اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ﴾[2]، واتا: (شەیتان ئادەم و حەوای فریودا بە دەرکردنیدان لەو بەهەشتە پڕ لەناز و خۆشیانەی تێیدابوون) بۆ سەر زەویەکی پڕ لە شەکەتی و ماندوویی، لەڕێگەی دروستکردنی وەسوەسە، دنیای لەدڵدا شیرین کردن و (بێبەرگی و ڕەجاڵییان بەسەر هات وپێی گوتن: ئەو دارەی کە خوا نەهی لێکردون بۆ ئەوەیە نەبادا بیخۆن و ببنە دوو فریشتە یان دوو کەسی نەمر) [3] . (سوێندیشی بۆ خواردن کە ئەو (واتا شەیتان) خەمخۆر و ئامۆژگاریانە)[4]، لەئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: (شەیتان وەسوەسەی خستە دڵی ئادەمەوەو پێی گوت: ئەی ئادەم دەتەوێ درەختی نەمری و سامان وماڵێکی نەبڕاوەت پێنیشان بدەم ؟)[5]، ئەوەش فێڵێکی شەیتان بوو بۆ فریودان و دەستخەڕۆ کردنی ئادەم، ئەگینا ئەو قسانە پێچەوانەی ڕاستین و دوورن لە واقعەوە . مەبەست لەو قسەیە ئەو درەختەی بەهەشتە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (لە بەهەشتدا درەختێك هەیە، سوار ماوەی سەد ساڵ لەبن سێبەرەکەیدا دەڕوات هێشتا سێبەرەکەی تەواو ناکات، ئەویش درەختی نەمرییە) [6] .

---

[1] البقرة / ٣٦ .

[2] البقرة / ٣٦ .

[3] الأعراف / ٢٠ .

[4] الأعراف / ٢١ .

[5] طه / ١٢٠ .

[6] بخاری گێڕاویەتەوە لە (صحیح)ەکەیدا (٣٢٥١/٨/٥٩)، هەروەها مسلم لە (صحیح)ەکەیدا (٢٨٢٦/١/٥١) .

(غندر) دەڵێت: پرسیارم لە (شعبە) کرد، ئایا ئەوە درەختی نەمری بووە ؟ گوتی: ئەوەی تێدا نیە، خوای گەورە دەفەرموێت: (شەیتان فریویدان، کاتێك لەبەری درەختەکەیان چەشت، بەرگەکانیان لیّ داکەوت و عەیب و عاریان دەرکەوت، تا بەپەلە بە گەڵای دارەکانی بەهەشت خۆیان پۆشتەکردەوە) [1] . (حەوا) لەپێش ئادەمدا لەبەری دارەکەی خوارد، هەر ئەویش هانی ئادەمیدا بۆ خواردنی، خوا بۆ خۆی زاناترە . بۆ دڵنیایی لە دەست پێشخەری کردنی حەوا بۆ چەشتنی بەری دارەکە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (لولا بنو اسرائیل لم یخنز اللحم، ولولا حواء لم تخن انثي زوجها) [2]، واتا: ئەگەر نەوەی ئیسرائیل بۆگەنیان نەخواردایە، کەس نەیدەخوارد، ئەگەر حەواش نەبوایە کەس پێش دەستی فێڵکردنی نەدەکرد لە هاوسەرەکەی خۆی) . لەو تەوراتەی کە بەدەستی خاوەن کتێبەکانەوەیە وا باس دەکات کە ئەو شتەی کە حەوای دنەدا بۆ خواردنی بەری دارەکە مارێك بوو، زۆر گەورەش بوو، پاشان حەوا لەبەری ئەو دارە دەرخواردی ئادەمیشدا، بەم جۆرە باسی کردووە ناوی (ئیبلیس) نەهاتووە، ئیتر لەوەوە چاویان کرایەوەو بە خۆیان زانی کە ڕووتن، خۆیان گەیاندە گەڵای دار هەنجیر و خۆیان پێداپۆشی . (وهب)ی کوری (منبە) دەڵێت: ئەوەی عەورەتی داپۆشیبوون بریتیبوو لە (نور)ێك، دیارە ئەو تەوراتە وێرای ئەوەی کە بەهەڵە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هاوکات گەلیّ دەستکاری ناوەڕۆکەکەیشی کراوە، وابزانم ئێمە کە قورئانی ڕاست و ڕەوانمان یێت پێویستمان بە سەرچاوەی گوماناوی نیە، قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْآتِهِمَا﴾[3]، خوای گەورە بۆ خۆی زاناترە .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (خوای گەورە کاتێك ئادەمی دروستکرد، پیاوێکی باڵابەرزی قژچڕ و پڕبوو، جا کە لەبەری دارەکەی چەشت، پۆشاکەکەی لێداکەوت، ئیتر هەر لەڕێیەوە عەورەتی دەرکەوت کاتێك عەورەتی خۆی بەو جۆرە بینی، لە بەهەشتدا کەوتە پەلەقاژە، تا قژی لە لقە دارێك گیرا، خوای گەورە بانگی کرد فەرمووی: (ئەی ئادەم ئەوە دەتەویّ لە دەستی من ڕابکەیت؟ کە ئادەم گوێی لەو

---

[1] الأعراف / ٢٢ .

[2] بوخاری (خ. ل) گ ێراویەتوە (٣٣٠/١/٦٠) فتح، مسلم (١٤٧٠/١٩/١٧) .

[3] (الأعراف) / ٢٧ .

بانگەوازەی خوای گەورە بوو، گوتی: پەروەردگارەکەم. نەخێر ڕاناکەم بەڵکو شەرم دەکەم)[1] .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (ئادەمی باوکتان وەك دار خورمایەکی بەرز و بڵند، شەست باڵ، قژی چڕوپڕ، عەورەت داپۆشراو بووە، جا کاتێ لە بەهەشتدا ئەو هەڵەیەی کرد، بەرگەکەی لیداکەوت، لە بەهەشت هاتە دەرێ، لقە دارێکی دیت، گرتی بە ناوچەوانیەوە، پەروەردگار بانگی لێکرد: ئەی ئادەم ئەوە لەدەست من ڕادەکەی؟ ئادەم گوتی: بەڵکو شەرمت لێدەکەم ئەی پەروەردگارم لەو بارەی کە بەسەرمندا هێناوتە)[2] . (پەروەردگاریان) بانگیکردن: ئایا من قەدەغەی ئەو درەختەم لێنەکردن و پێم نەگوتن کە بە ڕاستی شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە؟ هەردووکیان گوتیان: پەروەردگارمان ئێمە ستەممان لەخۆمانکرد، جا ئەگەر تۆش لێمان نەبوریت و بەزەییت پێماندا نەیەتەوە، ئەوە بە ڕاستی ئێمە لە ڕەنجەڕۆیان دەبین!)[3] . ئەوەش دانپیانان و پەشیمان بوونەوەیە بەرەو تەوبەکردن، خۆ بە زەلیل نیشاندان و مل کەچی و هانابردنە بۆ پەروەردگار، خۆ بەهەژار زانینە لە بەرانبەر تەواناى بێ سنووری پەروەردگاردا، لەکاتی سەخلەتی و پەشێویدا، جا هەر کەسێك لە ئادەمیزادەکان بە ڕاستی تەوبە بکات، ئەوە چارەنووسی دنیاو دواڕۆژی خێرو چاکەیە (خوای گەورە فەرمووی: دابەزن ئیتر هەندێکتان دوژمنی هەندێکتان دەبن، مانەوەتان بۆ هەیە لە زەویدا بە پێویستیەکانتانەوە تا کاتێکی دیاریکراو)[4]، ئەم فەرمودەیەی خوای پەروەردگار ڕووی ئادەم و حەواوشەیتان دەگرێتەوە،وتراوە مارەکەشیان لەگەڵدایە.پێغەمبەر(ﷺ)فەرمانی داوە بە موسوڵمانان بۆ کوشتنی مار،وەك فەرموویەتی:

(لە دەستیان بێوەی نەبوین لەو کاتەوە کە جەنگمان لەگەڵدا کردون)[5]

واتا:لەدەست مارەکان، هەروەهاخوای گەورە لە سوورەتی (طه)دا دەفەرموێت:﴿قَالَ اهبطا مِنهاجَميعاً بَعضُكم لِبَعضٍ عَدو﴾[6] ئەگەر مەبەست تەنها لە ئادەم وحەواو شەیتان بوایە ئەوا وشەی (بعضکم) بە ڕشتەی (کۆ) دەرنەدەبڕا، لە گەلێ شوێنی تری قورئاندا

---

[1] (ابن سعد) هێناویەتی لە (الطبقات الکبری)دا (٩/١/١ جریر) .

[2] (طبري) لە (مێژووەکەیدا) باسی کردووە لەگەڵ (ابن سعد)، ئەوانی تر بە لاوازیان داناوە .

[3] الأعراف / ٢٢ - ٢٣ .

[4] الأعراف / ٢٤ .

[5] بخاری (خ. ل) لە (صحيح)ەکەیدا (٣٢٥٧/١٤/٥٩ فتح)، هەروەها مسلم (٢٢٣٣/٣٦/٢٩) .

[6] طه / ١٢٣ .

هاوشێوەی ئەم ڕەشتەیەمان هەیە، بۆ نموونە:دەفەرمویت:﴿وداود وسليمن إذ يحكمان في الحرث إذ نفشت فيه غنم القوم وكنا لحكمهم شاهدين﴾[1] ئەگەر مەبەستەکە تەنها (داود) و (سليمان) بوایە ئەوا پێویستی نەدەکرد ڕشتەی (حكمهم) بە (کۆ) بێت، بەلاّم لە ڕاستیدا هەرگیز حاکم حوکم ناکات مەگەر لەنێوان دواندا نەبێت، شکاتکار و شکات لێکراو . لەبەرئەوە ئادەم شوێنکەوتەی (حواء) بووە و شەیتانیش شوێنکەوتەی (مار)ەکە بوە، بەمەش دەبنە دوولایەن کە هەریەکەیان دوانن و تێکڕا دەبنەوە بەکۆ، یاخود مەبەست لەکۆی گشتی ئادەمیزادەکانە کە بەفیتی شەیتان دەبنە دوژمنی یەکتری، بەلاّم دووبارە کردنەوەی ووشەی (اهبطوا) واتە: دابەزن، لە سوورەتی (بقرە)ەدا و لەئایەتی (٣٦-٣٩) ئاشکرایە . هەندێ لە زانایانی تەفسیر فەرموویانە: دابەزینی یەکەمیان مەبەست دابەزینیانە لە بەهەشتەوە بۆ ئاسمانی دنیا، وە دابەزینی دووەمیان مەبەست لە دابەزینیانە لە ئاسمانی دنیاوە بۆ سەر زەوی. بەلاّم ئەوە تەفسیرێکی لاوازە بە بەڵگەی ئەوەی کە هەر لەیەکەم جاردا خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وقلنا اهبطوا بعضكم لبعض عدو ولكم في الارض مستقر ومتاع إلي حين﴾، واتا هەر لەیەکەم دابەزیندا فەرمانیان پێکراوە کە دابەزنە سەر زەوی، خوای گەورە خۆی دەزانێت .

ڕاستتر ئەوەیە بڵێین: ئەوە تەنها دووبارەکردنەوەی بێژەییە (لفظي) ئەگەینە کردارەکە هەر یەك جار بووە، بەڵکو لەگەڵ هەریەکە لە جارەکانی باسکردنی دابەزینەکەدا حوکمێك دێت، لە یەکەمیاندا ئەوەیە کە دوژمنایەتیتان لێدەکەوێتەوە لەنێوان خۆتاندا، حوکمی دووەمیان ئەوەیە کە هەر کەسێك شوێنکەوتەی ئەو پەیام و ڕێنومایيا نەبێت کە خوای گورە ناردویەتی ئەوا سەرگەردان نابێت و بەختەوەر دەبێت، ئەگینا ئەوەی سەرپێچی بکات ئەوە نادان و بەدبەختە، شێوازی لەم جۆرەش لە قورئاندا زۆرە .

(حافظ) لە (ابن عساكر)ەوە ئەویش لە (مجاهد)ەوە دەگێڕێتەوە کە خوای گەورە دوو فریشتەی نارد تاکو ئادەم و حەوا لەبەهەشت بکەنە دەرەوە، ئیتر (جبريل) (عليه السلام)تاجەکەی لەسەری داگرت و (ميكائيل)یش (عليه السلام)لاوانەی سەرتەوێڵی داگرت و لقە دارێکی پێوەکرد، ئادەمیش وایزانی کە سزاکەی بۆ پێش خراوە، سەری خۆی داگرت و دەیگوت: بمبورە ... بمبورە !! خوای گەورە فەرمووی: ئەوە لەدەستم

---

[1] الانبياء / ٧٨ . الانبياء / ٧٨ .

ڕادەکەیت ئەی ئادەم ؟! ئادەمیش گوتی: بەڵکو شەرمت لێدەکەم ئەی گەورەم .
(ئەوزاعی)یش لە (ابن عطیە)ەوە دەگێڕێتەوە کە ئادەم سەد ساڵ لە بەهەشت دا مایەوە، لە گێڕانەوەیەکی تردا شەشت ساڵ مایەوە. حەفتا ساڵ گریا بۆ بەهەشت، حەفتا ساڵیش گریا بۆ ئەو هەڵەیەی کەکردی، چل ساڵیش گریا بۆ کوڕەکەی کاتێك کە کوژرا . لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ئادەم دابەزێنرایە سەرزەوی بۆ شوێنێك کە پێی دەگوترا (دحنا) و کەوتووەتە نێوان (مەککە) و (طائف)ەوە .
(حەسەن)یش دەڵێت: ئادەم لەخاکی (هندستان) دابەزێنرا و (حەوا)ش لە (جدە) و شەیتان لە (دستمیان)ی (بصرە) و (مار)ەکەش لە (اصبهان)، (سدی) دەڵێت: ئادەم لەخاکی هندستان دابەزێنراو بەردە ڕەشەکەو چەپکێ گەڵای بەهەشتی لەگەڵ دابەزێنرا، کە لە هندستان وەریچاند و بوو بە درەختێکی چاك، بەڵام (ابن عمر) دەڵێت: ئادەم لە (صفا) و (حەوا)ش لە (مروە) دابەزێنران، (ابن ابی حاتم)یش هەروا گێڕاویەتیەوە .

لە (ابی موسی الاشعری)یەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: (کاتێ خوای گەورە ئادەمی لە بەهەشت دابەزندە زەوی هەموو شتێکی فێرکرد و بەروبوومی بەهەشتیش باربوی کرد، جا ئەم بەروبومەی کە ئێوە لەبەردەستتاندایە لە بنەڕەتدا هی بەهەشتە، مەگەر ئەوە نەبێت ئەمیان تێك دەچێ و دەڕزێ، بەڵام ئەویان گۆڕانی بەسەردا نایات .

لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ئادەم تەنها ئەوەندە لە بەهەشتدا مایەوە کە هێندەی کاتی نێوان نوێژی عەسر تا خۆراوابوون دەبێت . پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (باشترین ڕۆژێك کە خۆری تێدا هەڵبێت، ڕۆژی هەینییە لەو ڕۆژەدا ئادەم دروستکرا، هەر لەو ڕۆژەدا خرایە بەهەشتەوە، هەر لەو ڕۆژەشدا لە بەهەشت وە دەرنرا) [1]. لە گێڕانەوەیەکی تردا ئەمەشی لەگەڵدایە (هەر لەو ڕۆژەشدا دنیا تەواو دەبێ) . پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئادەم و حەوا) بەبێ بەرگی دابەزێنرانە خوارەوە، گەڵاداری بەهەشتیان لە خۆیان ئاڵاندبوو، ئادەم گەرماتیینی بۆ هێنا و دانیشت و دەستیکرد بە گریان، بەحەوای گوت:

ئەی حەوا ... گەرما ئازارم دەدات . لەم کاتەدا (جبریل) (علیە السلام)هەندێ پەمووی بۆ هێنان و فەرمانی بە حوا کرد کە بیڕێسێت و فێریشی کرد، وە فەرمانی بە

---

[1] صحیح مسلم (٨٥٤/٥/٧)

ئادەم کرد کە بیچنێت و فێریشی کرد) [1]، ئەوەش زیاتر لە قسەی هەندێ لە پێشینەکان دەچێت، نەك فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەکو (ابن کثیر) وا دەفەرموێت دەربارەی تەوبە کردنەکەی ئادەمیش (علیه السلام)خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَتَلَقَّى آدَمُ مِنْ رَبِّهِ كَلِمَاتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ [2]، واتا: ئادەم چەند وشەیەکی لە پەروەردگاریەوە پێگەیشت، ئیتر خوای گەورە تەوبەی لێوەرگرت، بە ڕاستی هەر ئەو تەوبە وەرگر و بە بەزەییە . وتراوە ئەو وشەیەی کە ئادەم و حەوا گوتیان بریتیبووە لەم ئایەتە: ﴿قَالا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنْفُسَنَا وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ [3]، واتا: پەروەردگارمان ئێمە ستەممان لەنەفسی خۆمان کرد، جا ئەگەر تۆش لێمان نەبوریت و بەزەییت پێماندا نەیەتەوە ئەوا ڕەنجە ڕۆدەبین . فەرمووی: ئەی پەروەردگار ! ئەگەر تەوبە بکەم و پەشیمان ببمەوە و بگەڕێمەوە، ئایا تۆش دەمگەڕێنیتەوە بۆ بەهەشت؟ خوای گەورە فەرمووی: بەڵێ .

مجاهد دەفەرموێت: وشەکانی ئادەم (علیه السلام)ئەمەبوو: (خوایە هەر تۆ خوایت و هیچ خوایەکی تر جگە لەخۆت نیە، پاکی و ستایش هەر بۆ تۆیە، پەروەردگار من ستەمم لەنەفسی خۆم کرد، دەسا تۆش لێم ببورە، تۆ باشترین بە بەزەییەکانی، خوایە هەر تۆ خوایت و جگە لەتۆ هیچ خوایەکی تر نیە، پاکی و ستایش هەر بۆ تۆیە، پەروەردگارا من ستەمم لەنەفسی خۆم کرد، دەسا تۆش تەوبەم لێوەربگرە، هەر تۆی تەوبە وەرگر و خاوەن بەزەیی . لە (ابن عباس)ەوە، دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ئادەم (علیه السلام)فەرموی: ئەی پەروەردگارا ئەی بەدەستی توانایی خۆت منت دروست نەکرد؟ پێی گوترا: بەڵی، وەلێ لەو گیانەت بەبەردا نەکردم کە خۆت بەدیت هێناوە؟ پێی گوترا: بەڵێ، پژمیم و پێت فەرمووم: خوا ڕەحمت پێبکات، وە بەزەیی خۆتت خستوەتە پێش غەزەبتەوە، پێی گوترا: بەڵێ، وە خۆت لەچارەت نووسیم کە ئاوا بکەم ؟ پێی گوترا: بەڵێ، سائەگەر تەوبە بکەم تایا تۆش دەمگەڕێنیتەوە بۆ بەهەشت؟ خوای گەورە فەرمووی: بەڵێ . (عومەری کوری خطاب) فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێك ئادەم ئەو هەڵەیەی کرد، وتی:

---

[1] ابن عساكر (٢/٣٥٢ / تهذيب)

[2] البقرة / ٣٧

[3] الأعراف / ٢٣

پەروەردگارا . . لێت دەپاڕێمەوە لەبەر خاتری موحەمەد لێم ببورە! خوای گەورە فەرمووی چۆن موحەمەدت ناسیوە کە هێشتا دروستم نەکردووە؟ وتی: پەروەردگارا ... کاتێك بەدەستی تەوانایی خۆت منت دروست کرد، لەو گیانەت وەبەرداکردم کە خۆت بەدیت هێناوە، ئەو دەمەی سەرمت بەرزکردەوە، بینیم لەسەر قایمەی عەرش نووسرابوو ﴿لا إلهَ إلا الله مُحَمَّد رَسولُ الله﴾ ئیتر زانیم کە تۆ هیچ ناوێك ناخەیتە لای ناوی خۆت، مەگەر خۆشەویستترین مەخلوقت بێت، خوای گەورە فەرمووی: ڕاست دەکەیت ئادەم، محمد خۆشەویسترین مەخلوقە، ئەگەر لەبەر خاتری ئەو داوای لێبوردنم لێبکەیت، ئەوا لێت خۆش دەبم، لەبەر خاتری محمد نەبوایە تۆم دروست نەدەکرد [1] .

## گفتوگۆی ئادەم و موسی / درود و سەلامی خوایان لیٚ بیٚت

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (موسا لەئادەمی پرسی (ل): تۆ ئەو کەسەی کە بەهۆی تاوانتەوە خەڵکت لە بەهەشت بە دەرکردن دا و بویتە سەرمەشقی خراپ بوونیان، ئادەم بە موسای گوت: تۆ ئەو کەسەیت کە خوای گەورە بە پەیام و گفتاری خۆی جیای کردیتەوە و بەرزی کردیتەوە، ئایا سەرزەنشیتم دەکەیت لەسەر کارێك کە خوا لە چارەی نووسیبووم پێش ئەوەی دروستم بکات؟ ئاوا ئادەم موسای بیٚ دەنگ کرد (علیه السلام). لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئادەم موسای بێدەنگ کرد، کاتێك موسا فەرمووی: ئەی ئادەم تۆ ئەو کەسەی کە خوای گەورە بەدەستی توانایی خۆی دروستی کردیت، لەو گیانەی خۆی خۆی (دروستی کردووە) بە بەریدا کردیت، کەچی تۆ خەڵکت سەرگەردان کرد و بە دەرکردنت دان لە بەهەشدا ؟ ئادەم فەرمووی: تۆ ئەو موسایەی کە خوای گەورە بەپەیام و گفتاری خۆی جیای کردیتەوە و بەرزی کردیتەوە، کەچی سەرزەنشتیم دەکەی لەسەر کارێك کە کردوومە و خوای گەورە لە چارەی نووسیبووم پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات ؟ بەو جۆرە ئادەم موسای بێدەنگ کرد [2] .

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئادەم موسای بێدەنگ کرد، کاتیٚ موسا (علیه السلام)بە ئادەمی فەرموو: ئەی ئادەم تۆی باوکمان ئێمەت نائۆمێد کرد و لە بەهەشت بە دەرکردنت داین؟ ئادەم فەرمووی ئەی موسا . . !

---

[1] ئەم فەرمودە لاوازە، تەنها (الطبراني) لە (معجم الصغير)دا (٨٣/٨٢/٢ ط، معسر) هێناویەتی .

[2] أحمد لە (مسند)مكەیدا هێناویەتی (٣٩٨/٢/حلبي) .

خوای گەورە بە گفتوگۆی خۆی جیای کردیتەوە (لەناو پێغەمبەرانی تردا) بە دەستی توانایی خۆی ڕەنگڕێژی تۆی کرد، ئایا سەرزەنشتیم دەکەیت لەسەر کارێك کە کردوومە و چل ساڵ پێش دروست کردنم خوای گەورە لەچارەی نووسیبووم !! ئاوا ئادەم موسای بێدەنگ کرد . لە گێڕانەوەیەکدا لە(عومەری کوڕی خەتاب)ەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: موسا (علیه السلام)فەرمووی: ئەی پەروەردگارا ئەو ئادەمەمان نیشان بدە کە خۆی و ئێمەیشی لە بەهەشت بە دەرکردندا، خوای گەورەش ئادەمی نیشان دا(علیه السلام)، موسا فەرمووی: تۆ ئادەمیت؟ فەرمووی بەڵێ، فەرمووی: تۆ ئەو کەسەی کە خوای گەورە لەو گیانەی بە بەردا کردیت کە خۆی دروستی کردووەو فریشتەکانی بۆ بە کڕنووشی ڕێزدا خستیت و ناوی هەموو شتێکی فێرکردیت؟ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی ئەی چیت کرد ئاوا خۆت و ئێمەشت لە بەهەشت بە دەرکردن دا؟ ئادەم (علیه السلام)فەرمووی: تۆ کێێت؟ فەرمووی: من موسام، فەرمووی: تۆ ئەو موسایەی کە خوا ناردیتی بۆسەر بەنی ئیسرائیلیەکان؟ کە خوای گەورە لەودیو پەردەوە قسەی لەگەڵ کردیت بەبێ ناوەندیار و نێردراوێك لە دروست کراوەکانی خۆی ؟ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: ئەی سەرزەنشتیم بۆ دەکەیت لەسەر کارێك کە پێشتر خوایە گەورە وای لەسەر داناوم؟ ئاوا ئادەم موسای بێ دەنگ کرد (علیه السلام). ئادەم بە موسا گەیشت، موسا (علیه السلام)لە ئادەمی پرسی: تۆ باوکی هەموو ئادەمیزادەکانیت، خوای گەورەش لەبەهەشت نیشتەجێی کردیت فریشتەکانیش لابۆخستیت بە کڕنووشی ڕێزدا ؟! ئادەم فەرمووی ئەی موسا ئایا لەو پەیامەدا کە خوای گەورە بۆی ناردویت پێت ڕانەگەیەنراوە کە من ئەوەم لەچارە نووسرابوو؟ !، بەم جۆرە ئادەم موسای بێدەنگ کرد . ئادەم موسای بێ دەنگ کرد)؛ خوای گەورە خۆی زاناترە .

خەڵکی و زانایان گەلێ لێکدانەوەی جیاجیایان هەیە دەربارەی ئەو فەرموودانە، (قەدەریەکان) هێناویانەتەوە بۆ سەلماندنی ئەو بۆچوونەیان کە هەموو شتێك پێشتر لەچارەی مرۆڤ نووسراوە، بەڵام (جەبریەکان) بە پێچەوانەوە، هەندێکیش دەڵێن: ئادەم بۆیە توانی موسا بێدەنگ بکات چونکە موسا لەسەر تاوانێك سەرزەنشتی ئادەمی کرد، کە ئادەم تەوبەی لەو تاوانە کردبوو، ئەو کەسەی تەوبەش لەتاوان بکات وەك ئەوە وایە کە تاوانی نەکردبێت . وتراوە: ئادەم (علیه السلام)بۆیە توانی موسا (علیه السلام)بێدەنگ بکات چونکە لە ئەو کۆنترە و گەورەترە، یان چونکە باوکیەتی،

یاخود چونکە هەردووکیان دوو شەریعەتی جیاوازیان هەبووە، هێندێکیش دەڵێن: چونکە هەردووکیان لە بەرزەخ دا بوون، بەو جۆرە هەر کەسێك گەیشتە ئەویٚ ئیتر هیچ داخوازیەکی لەسەر شان نامێنیٚ.

**لێکدانەوە :**

ئەم فەرموودانە بە چەند گێڕانەوەیەکی بێژە جیاجیا هاتوون و زۆربەشیان لە هەردوو (صحیح)ی مسلم و بخاری دان، تەوەرەی سەرەکی گفتوگۆکەیان لەسەر لە بەهەشت دەرکردنی ئادەم و نەوەکانیەتی و زۆربەی وەڵامەکانیش ئەوەیە کە ئادەم(علیه السلام)فەرموویەتی: من بە دەرکردنم نەداون، بەڵکو ئەو کەسە بە دەرکردنی داوین کە دەرکردنی ئێمەی بەستەوە بە خواردنی بەری دارێکەوە، ئەوەشی بە شێوەیەکی رێك و پێك و پڕ حیکمەت دابین کردووە بەرلەوەی کە من دروست بکات ئەویش ئیشی خوای گەورەیە، تۆش گلەیی و سەرزەنشتی لە من دەکەیت لەکاتێکدا من تا ئەو شوێنە سنوورم هەبوو کە پێم گوترا توخنی ئەو دارە مەکەوە، بەڵام من لەبەری دارەکەم خوارد، ئیتر دەرکردنەکەیشم بەوەوە بەسترابووەو ئەوەش کاری من نیە، من نەخۆم و نەئێوەم لە بەهەشت دەرنەکردووە، بەڵکو ئەوە تەواناو ویستی پەروەردگار بووە، هەڵبەت ئەویش حیکمەتی خۆی هەیە ، لەبەرئەوە بوو کە ئادەم توانیویەتی موسا (علیه السلام)بێدەنگ بکات ، هەر کەسێك نکولی لەو فەرموودەیە بکات، بە هەڵەدا چووە، چونکە بە ووردی لەلایەن (ابو هریرە) و چەند هاوەڵێکی تری پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئاوا گێڕاویانەتەوە. هێشتا لەچەند ڕوویەکەوە جێی لێکدانەوەیە:

**یەکەم:** موسا (علیه السلام)سەرزەنشتی کەسێك ناکات لەسەر تاوانێك کە بکەرەکەی تەوبەی لەو کارە کردووە .

**دووەم:** ئەو نەفسێکی کوشتوە، کە فەرمانی کوشتنی ئەو نەفسەی پێنەدراوە، هەروەکو لەخوای گەورە پاڕایەوە تا لێی ببورێت ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾[1]، واتا: پەروەردگارا من ستەمم لەنەفسی خۆم کرد، تۆش لێم ببورە، خواش لێی بورد .

**سێهەم:** ئەگەر وەڵامەکەی ئادەم (علیه السلام)بۆ سەرزەنشتی کردنەکەی موسا (علیه السلام)بە ڕووکاری ئەو بارەدابیٚ کە هەموو کەسێك پێشتر ئەوەی لەسەر نووسراوە کە

---

[1] سورەتی القصص / ١٦ .

دەبیّ بیکات و ئیتر ئەم کەسە هیچ خواست و دەسەلاَتێکی خۆی تێیدا نیە، ئەوە دەکرێتە نموونەیەکی بەهێز بەدەستی ئەوە کەسانەی کە بە ئارەزووی خۆیان هەموو جۆرە کاروبارێکی خراپ و تاوان دەکەن و دەشیدەنە پالّ قەدەر و چارەنووس !! ئیتر هیچ بوارێك نامێنێتەوە بۆ تۆلّە و سنورەکان و کەسیش تاوانبار ناکرێت بەهیچ جۆرە تاوانێك!! بە ڕاستی ئەو لێکدانەوەیەکی هەلّە و بیّ سەرەوبەرەیە. چونکە بەلّگە هێنانەوەکەی ئادەم (علیه السلام)بۆ موسا (علیه السلام)بەلّگە هێنانەوە بوو لەسەر قەدەری موصیبەت نەك قەدەری مەعصیەت و تاوان، خوای گەورە بۆ خۆی باشتر دەیزانیّ .

## ئەو فەرموودانەی باسی دروست کردنی ئادەم دەکەن( علیه السلام )

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (خوای گەورە ئادەمی دروست کرد لەو چنگە گلّەی کە لەسەراپای زەوی هەلّیگرت، لەوەوە خەلّکانی سپی و سوور و ڕەش و نێوانی ئەو ڕەنگانەشیان لێکەتەوە، هەروەها چاك و خراپ و ڕووخۆش و مۆن و نێوانی ئەوانەشیان لێکەوتەوە) [1] . (ابن عباس) لە (مرة)ەوە ئەویش لە (ابن مسعود)ەوە و لەکۆمەلّیّ هاوەلّی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە کە: خوای گەورە جوبرائیلی ناردە سەر زەوی تاکو قوڕی زەوی بەرێت بۆ خزمەتی پەروەردگار، کاتیّ هاتە سەرزەوی، زەوی پێی گوت: پەنا دەگرم بەخوا لەتۆ کە خاکم لیّ کەم بکەیتەوە و لەکەدارم بکەیت، ئیتر جوبرائیل (علیه السلام)هیچی نەبرد و گەڕایەوە فەرمووی: ئەی پەروەردگارا زەوی پەنای بەتۆ گرت و منیش پەنامدا.

ئەوجا خوای گەورە میکائیلی نارد (علیه السلام)زەوی ئەویش پەنای بەخوادا، ئەویش پەنایدا و هەروەکو جوبرائیلگەڕایەوە و هەمان وەلاّمی هێنایەوە لە خزمەتی پەروەردگاردا، ئینجا خوای گەورە فریشتەی گیان کێشانی ناردە سەرزەوی، زەوی داوای پەنای کرد، فریشتەکەش فەرمووی: منیش هەر پەنا بەخوا دەدەم کە بگەڕێمەوە فەرمانەکەی جێبەجیّ نەکەم (واتا: هەردەبیّ جێبەجێی بکەم) ئیتر نموونەی لە هەموو شوێنەکانی زەوی وەرگرت و تێکەلاّوی کردن، لەخاکی سپی و سوور و ڕەش، لەبەرئەوە شێوەی ئادەمیزادەکانیش جیاجیایە، ئیدی بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان، گلّەکەش تەڕبوو تاکو بوو بە قوڕێکی بە جەرگ [2]، ئینجا خوای گەورە

---

[1] سنن البیهقی (٣/٩ حیدر اباد)، (تاریخ الطبری)، (٩٢/٩١/١ معارف) .

[2] قوڕی بە جەرگ: طین لازب .

فەرمووی بە فریشتەکان (من ئادەمیزاد لە قوڕ دروست دەکەم، جا کەرێکم خست و لەگیانی خۆم، واتا: ئەو گیانەی کە خۆم دروستم کردووە بە بەرداکرد،ئێوەش بکەون بە کڕنووش دا بۆی،واتا: کڕنووشی ڕێزلێنان) [1].

خوای گەورە بەدەستی توانایی خۆی ئادەمی دروست کرد، تاکو (ئیبلیس) فیزی بەسەردا نەکات، بەشێوەی مرۆڤ دروستی کرد ماوەی (چل) ساڵ تەنها جەستەیەکی قوڕین بوو، ئەو (چل)ساڵە هێندەی ماوەی ڕۆژی هەینی بوو، فریشتەکان بە بەردەوامییدا هاتووچۆیان دەکرد، کاتێ دەیانبینی دەترسان، بەتایبەتیش (ئیبلیس) کە بەلایدا دەڕۆیشت پێیدا دەکێشا و دەنگی لێدەکات، هەروەکو چۆن ئەگەر بەدەست بکێشێت بە گۆزەو دیزەدا دنگەیەکی لێدێت، یان زرنگەیەکی لێدەردەچێ، بەو شتەفو خاریانەی لە قوڕ دروست دەکرێن و وشك دەکرێنەوە پێیان دەگوترێ (صلصال)، لەبەرئەوە خوای گەورە فەرموویەتی ﴿مِن صَلصالٍ كالفخار﴾ [2]، شەیتان دەیگوت: ئەمە بۆ مەبەستێك دروست کراوە، ئیتر لەدەمییەوە دەچووە ناو لەشیەوەو لە کونی دواوەی دەهاتە دەرەوە، بە فریشتەکانی گوت:مەترسن لەمە، پەروەردگارتان بەتین و هێزە، بەڵام ئەمە کلۆرەو ناوەکەی بۆشە، مەگەر من زاڵ بکات بەسەریاندا (واتا بەسەر ئادەمیزاددا) سەرگەردانیان دەکەم و لەناویان دەبەم .

جا کە کاتی ئەوە هات خوای گەورە گیانی بە بەردا بکات بە فریشتەکانی فەرموو: کە لەگیانم بە بەرداکرد ئێوەش کڕنووشی (ڕێزلێنانی) بۆ بنوێنن، ئیتر کە گیانی بەبەرداکرد و گیان گەیشتە ناو کەللەی سەری (ئادەم (علیه السلام)پژمی، فریشتەکان بە ئادەمیان گوت: بڵێ: سوپاس بۆ خوا، خوای گەورەش پێی فەرموو: پەروەردگارت بەزەیی پێتدا بێتەوە، کاتێ گیان گەیشتە چاوەکانی ڕوانی بۆ بەروبومی درەختەکانی بەهەشت، کەگیان گەیشتە هەناوی ئارەزووی جوڵا بۆ خواردن، ئیتر خۆی کوتا بۆ خواردنەکە و بەپەلە بازیدا بەرلەوەی گیان گەیشتبێتە قاچەکانی، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت ﴿خُلِقَ الْإِنسَانُ مِنْ عَجَلٍ سَأُرِيكُمْ آيَاتِي فَلا تَسْتَعْجِلُونِ﴾ [3]، واتا: ئادەمیزاد پەلەکردنی تێدا دروست کراوە، ئیتر (هەموو فریشتەکان تێکڕا بەگشتی

---

[1] سورەتی (ص) / ٧١ – ٧٢ .

[2] سورەتی الرحمن / ١٤، وشەی (صلصال)، واتا: قوڕی وشك کراوە یان قوڕی سورەوەکراو بە ئاگر، وەك گۆزە و دیزەو گلێنە.

[3] سورەتی الانبیاء / ٣٧

کڕنووشیان نواند، تەنها ئیبلیس نەبێ، ڕازی نەبوو کە لە کڕنووشبەران بێت) [1]، چۆنیەتی گێڕانەوەی چیرۆکەکە بە تەواوەتی باس کراوە [2] . هەندێ لەوانە فەرموودەی پێغەمبەرن لەسەرە (ﷺ) بەڵام هەندێکی تریان دەست هەڵبەستی جوولەکەکانە، پێشەوا (أحمد) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێ خوای گەورە ئادەمی دروست کرد ئەوەندەی خوا ویستی لەو بارەی تێیدابوو هێشتیەوە، ئیبلیس بەدەوریدا دەگەڕا، کاتێ بینی ناوەکەی بۆش و کلۆرە زانی کە ئەو دروست کراوە خۆی خاوەنی خۆی نابێت)، واتا: بە ئاسانی فریو دەخوات .

لە (ئەنەسی کوڕی مالك)ەوە دەفەرموێت: پێغەمبەر فەرمووی (ﷺ) (کاتێ فوو کرا بە ئادەمدا، گیان گەیشتە سەری و پژمی، ئیتر گوتی: ﴿الحَمدُ لِله رَب العالَمين﴾ خوای گەورەش پێی فەرموو، ﴿يَرحَمُكَ اللهُ﴾ . لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە خوای گەورە گیانی بە بەرداکرد، یەکەم شوێنی لەشی کەگیانی پێدا کرا چاوەکانی و لووتی بوو، ئیتر پژمی، خوای گەورە ڕەحمەتی خۆی پێ ڕاگەیاند و فەرمووی: پەروەردگارت بەزەیی پێتدا بێتەوە، ئینجا خوا فەرمووی: ئەی ئادەم بڕۆ بۆلای ئەو خەڵکانە و بزانە چیت پێدەڵێن؟ ئەویش چوو، سڵاوی لێکردن و ئەوانیش وەڵامیان دایەوەو فەرموویان (وعليك السلام ورحمة الله وبركاته)، خوای گەورە فەرمووی: ئەی ئادەم ئیتر خۆت و نەوەکانت بەم جۆرە سڵاو لەیەکتری دەکەن، ئادەم فەرمووی ئەی پەروەردگارم کامەیە نەوەی من؟ خوای گەورە فەرمووی: یەکێ لەم دوو دەستەی من هەڵبژێرە ئادەم فەرمووی: دەستی ڕاستی پەروەردگارم مەبەستە و هەردوو دەستی پەروەردگارم هەر ڕاستە، خوای گەورە لەپی دەستی خۆی بۆ ئادەم کردەوە،

هەموو بەرەو وەچەو نەوەی ئادەم لەسەر دەستی بوو، پیاوی وای تێدابوو دەم و زمانیان لە نور بوو، ئادەم بە نوری یەکێك لەو پیاوانە سەرسامبوو، ئادەم (عليه السلام)فەرمووی: پەروەردگارا ئەمە کێیە؟ خوای گەورە فەرمووی: ئەوە داودی کوڕتە، ئادەم فەرمووی: ئەی پەروەردگارا ، ئایا ئەو چەندت تەمەن پێبەخشیوە ؟ خوای گەورە فەرمووی: شەست ساڵ، ئادەم فەرمووی: لەتەمەنی من سەد ساڵی بۆ تەواو بکە، خوای گەورە داواکەی جێبەجێ کرد و شایەتیشی لەسەردا . کە ئادەم بەتەمەندا

[1] سورەتی الحجر / ٣٠ — ٣١

[2] ئەو (اثر)ە و (ابن عساکر) لە (تاريخ)ەکەیدا هێناویەتی (٢/٣٤١،٣٤٢ / تهذيب)، هەروەها (الطبري) لە (تاريخ)ەکەیدا هێناویەتی (١/٩٤/معارف) .

چوو، خوای گەورە فریشتەی گیان کێشانی ناردەسەری، ئادەم فەرمووی ئایا چڵ ساڵ لە تەمەنم نەماوە؟ فریشتەکە پێی فەرموو: ئەی نەتبەخشی بە داودی کوڕت؟ ئادەم نکولی لەوە کرد،

منالّ و نەوەکانیشی نکوڵییان کرد، ئەو پەیمانەکەی خۆی لەبیر چووەوە، لەبەرئەوە منالّ و نەوەکانیشی لەبیریان چووەوە [1] . لە گێڕانەوەیەکی تردا هاوشێوەی‌ئەو فەرموودەیە هاتووەکە(ابوهریرە)لە پێغەمبەر(ﷺ)گێڕاویەتەوە،بڕوانە(سنن‌الترمذي،٤٨/٨/٣٠٧٦)و(تأریابن عساكر٣٤٧/٣٤١/٢/تهذيب.

لە گێڕانەوەیەکی تری (ابو هريرە)دا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ( پاشان خوای گەورە نەوەکانی ئادەمی نیشانی ئادەمدا و فەرمووی ئەمانە بەرو بەرەچەی تۆن، کە گول و کەڕ و کوێر و جۆرەها دەردەداریان تێدابوو، ئادەم (علیه السلام)پرسی: ئەی پەروەردگار بۆچی ئاوات بەسەر نەوەکانی مندا هێناوە؟ خوای گەورە فەرمووی: تاکو سوپاسم بکەیت لەسەر ئەو نیعمەتانەی پێم داون،پاشان چیرۆکی داودی گێڕایەوە(علیه السلام).

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی خوای گەورە ئادەمی دروست کرد، ئەو دەمەی کە ویستی، خوای گەورە کێشای بەلای شانی ڕاستیدا، نەوەکانی وەك دوڕڕی سپی هاتنە دەرەوە لەئادەم، ئینجا کێشای بەلای شانی چەپیدا و نەوەکانی وەك خەڵوز هاتنە دەرەوە لەئادەم، خوای گەورە بەوانەی فەرموو کە لەلای ڕاستیەوە بوون بچنە بەهەشت و گوێی نادەمیّ، بەوانیشی فەرموو کە لەلای چەپیەوە بوون بچنە دۆزەخەوە و گوێی نادەمیّ . چەند گێڕانەوەیەکی تری هاوشێوەی ئەم فەرموودانە هەیە دەربارەی ئەو تەمەنەی کە خوای گەورە لە هی ئادەم (علیه السلام)هەڵێگرت و بەخشی بە داودی پێغەمبەر(علیه السلام)، لەگەڵ چۆنیەتی دروستکردنی نەوەکانی ئادەم (علیه السلام)و شێوازی سلاّوکردن . لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە، کە ئادەم (علیه السلام)نکولی لەوە کرد کە هەندێ لەتەمەنی خۆی بە داود (علیه السلام)بەخشیوە، ئیتر نەوەکانی ئادەمیش فێری نکولیکردن بوون، ئادەم ئەوەی لەبیر چووبووەوە مە ئەو هەندە تەمەنەی خۆی بەخشیوە، نەوەکانیشی هەرفێری شت لەبیرچوونەوە بوون لەوەوە، لەو ڕۆژەوە فەرمان درا بە نووسین و شایەت دانان (لەسەر

---

[1] فەرمودەکە لاوازە، (ابن سعد) لە (الطبقات الكبري)دا (٩/١/١ تحرير)، هەروەها (الذهبی) و (الدارقطني)یش بە لاواز و (متروك) هێناویانە

پەیمان و ڕاسپاردن) . لە (ابو هريرە)ەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە ئادەمی دروست کرد و درێژییەکەی شەست باڵ بوو، . . هتد، ئینجا فەرموویەتی: هەرکەسێك کە دەچێتە بەهەشتەوە لەسەر شێوەی ئادەمە(علیه السلام)، ئیتر لەو کاتەوە تائێستا خەڵکی بالآیان هەر لەکورت بوونەوەدایە) [1] .

هەر لە گێڕانەوەیەکی تری (ابو هريرە)دا هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (درێژی ئادەم (علیه السلام)شەست باڵ و پانیەکەی حەوت باڵ بووە) [2] .

لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (یەکەم کەس کە نکولی کرد ئادەم بوو، یەکەم کەس کە نکولی کرد ئادەم بوو، یەکەم کەس کە نکولی کرد ئادەم بوو، خوای گەورە ئادەمی دروست کرد کێشای بە پشتیدا، ئیتر ئەو کەسانەی کە بڕیاری خوا وابوە لەو بکەنەوە لەپشتیەوە هاتنە دەرەوە، خوای گەورە هەموو بن و بەرەچەکانی ئادەمی نیشانی ئادەم دا کە تا ڕۆژی دوایی لەدایك دەبن، ئادەم (علیه السلام)پیاوێکی تێدا بەدیکردن کە دەبریسکایەوە (لە جوانیدا)، ئادەم فەرمووی ئەی پەروەردگارا!! ئەوە کێیە؟ خوای گەورە فەرمووی: ئەوە داودی کوڕتە، فەرمووی: ئەی پەروەردگار . !! تەمەنی داود چەندە؟! فەرمووی: شەست ساڵە، فەرمووی: پەروەردگارا تەمەنی زیاتر بکە، فەرمووی نا (زیاتری ناکەم) مەگەر لە تەمەنی تۆ هەڵبگرم و بیخەمە سەر تەمەنی ئەو، ئەوسا تەمەنی ئادەم هەزار ساڵی بۆ نووسرابوو، خوای گەورە چل ساڵی تری بۆ تەمەنی زیادکرد و ئەمەیشی بە نووسراوێك لەسەر (ئادەم)ماڵ کرد و فریشتەکانی لەسەر کردن بە شایەت، جا کاتێ فریشتەی گیان کێشان هاتنە سەر ئادەم (علیه السلام)بۆ گیان کێشانی، ئادەم (علیه السلام)فەرمووی: خۆ هێشتا چل ساڵم ماوە؟! فریشتەکان پێیان فەرموو: ئەدی تۆ ئەو تەمەنەت بەخشیوە بە داودی کوڕت! ئادەم فەرمووی: کاری وام نەکردووە، ئیتر خوای گەورە پەیمانە نووسراوەکەی بۆ ئاشکرا کرد و فریشتەکانیش شایەتیان لەسەردا [3] .

لە (الحسن)ەوە دەگێڕنەوە کە کاتێك ئایەتی (الدین) هاتە خوارەوە، پێغەمبەر (ﷺ) سێ جار لەسەر یەك فەرمووی (یەکەم کەس کە نکولی کرد ئادەم بوو) .

---

[1] صحيح البخاري (٦٢٢٧/١/٧٩ فتح) .

[2] فەرمودەیەکی لاوازە، أحمد لە (مسند)ەکەیدا (٥٢٥/٢ حلبی) .

[3] فەرموودەیەکی لاوازە، أحمد لە (مسند)ەکەیدا هێناویەتی (٣٧١/٢٩٩/٢٥٢/١ حلبی) (طبرانی)ش لە (تأريخ)ەکەیدا (١٥٦/١/معارف) هێناویەتی .

پێشەوا مالك لە (الموطأ)ەکەیدا هێناویەتی کە (عومەری کوری خطاب) پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ئەم ئایەتە؛ کە دەفەرموێت ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ﴾ الایه [1]، واتا: یادی ئەو کاتە بکەرەوە کە پەروەردگارت پشتاوپشتی نەوەی ئادەمی کۆ کردەوە لەجیهانی پەنهان وشاراوەدا پەیمانی لێوەرگرتن وکردنی بەشایەت بەسەر خۆیانەوە پێی فەرموون ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم ؟! هەموو وتیان نابێ تۆ خوای ئێمە نەبیت، بەڵێ شایەتمان داوە کە تۆ پەروەردگارمانی . . )

تاکوتایی ئایەتەکە . ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە ئادەمی دروست کرد(علیه السلام)، پاشان خوای گەورە دەستی ڕاستی بەپشتی ئادەم دا کێشا، ئیتر لە ئادەمەوە بەروبەرەچەکانی هاتنە دەرەوە، خوای گەورە فەرمووی: ئەمانە بۆ بەهەشت دروست کردووە و بە ڕەفتاری بەهەشتیەکانیش ڕەفتار دەکەن، ئینجا جارێکی تر کێشایەوە بەپشتیدا و بەروبەرەچەی تری لێهاتە دەرەوە و فەرمووی: ئەمانەم بۆ دۆزەخ دروست کردووەو بە ڕەفتاری دۆزەخیەکانیش ڕەفتا دەکەن، پیاوێك پرسی:ئەی پێغەمبەری خوا ڕەفتار و کارەکە لەچیدایە ؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر خوای گەورە کەسێکی بۆ بەهەشت دروست کردبێ ڕەفتار و کاری وای پێدەکات کە بەهەشتیانە بێت، تاکو بەکردارو ڕەفتاری بەهشتیانەوە دەمرێت و بەوەش خوا دەیخاتە بەهەشتەوە، خۆ ئەگەر خوای گەورە کەسێکیشی بۆ دۆزەخ دروست کردبێ ڕەفتار و کاری وای پێدەکات کە دۆزەخیانەبێت، تاکو بە کردارو ڕەفتاری دۆزەخیانەوە دەمرێت و بەوەش خوا دەیخاتە دۆزەخەوە) [2] .

هەموو فەرموودەکان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە هەموو خەڵکی لەپشتی ئادەم خستوەتەوە و دەشبن بە دوو بەش، خەڵکی ڕاست و خەڵکی چەپ، مەبەست لەخەڵکی چاك و خەڵکی خراپە، خوای گەورە بە چاکەکان دەفەرموێ: (ئەمانە بۆ بەهەشت و گوێی نادەمێ)، وە بەخراپەکان دەفەرمووێ: (ئەمانە بۆ دۆزەخ و گوێی نادەمێ)، بەڵام کە خوای گەورە کە شایەتی لەزاری هەموویان وەرگرتبێ و دانیان بەوەدا نابێ کە تەنها خوای گەورەی تاك و تەنها پەروەردەگاریانە ئەوەیان هیچ فەرموودەیەکی پێغەمبەری (ﷺ) لەسەر نیە. تەفسیری ئەو ئایەتەی سورەتی

---

[1] سورەتی الاعراف / ١٧٢ .

[2] سنن الترمذي / ٢٠٧٥/٨/٤٨، موطأ (٢/١/٤٦) هەروەها (أحمد) لە (مسند)ەکەیدا (١/٤٥/حلبی)

(الاعراف)یش چەند تێروانینێکی لەسەرەو پێشتر باسمان کرد و فەرموودەکانیشمان بە تەواوەتی لەو بارەیەوە هێناوەو هەرکەسێك دەیەوێت ئەو مەسەلەیەی لەلا یەکلابێتەوە، با جارێکی تر بچێتەوە خزمەتی تەفسیری ئایەتەکەی و مانای فەرموودەکانی پێغەمبەری نازدار (ﷺ)، خوای گەورە زاناترە .

پێشەوا (أحمد) لە (مسند)ەکەیدا [1] فەرمودەیەکی پێغەمبەری ئازیزی هێناوە (ﷺ) کە لە (ابن عباس)ەوە گێڕراوەتەوەو دەفەرموێت: (خوای گەورە پەیمانی وەرگرت لە مرۆڤەکان کاتێك کە لەپشتی ئادەمدابوون (علیه السلام)هێندەی ڕاوەستانی ڕۆژی عەرەفە خوای گەورە لەپشتی ئادەم هەموو ئەو مرۆڤانەی دەرهێنا کە (بڕیاری بووە) لەئادەم بکەنەوە، هەموویانی لەنێوان دوو دەستی (پیرۆزی) خۆیدا ڕاگرتن و قسەی لەگەڵدا کردن و پێی فەرموون: (ئایا من پەروەردگارتان نیم؟ گوتیان: ناکرێت تۆ پەروەردگارمان نەبیت،واتا هەر تۆ پەروەردگارمانی ، ولەسەر ئەو ڕاستیەش شایەتی دەدەین، نەبادا لە ڕۆژی قیامەتدا بڵێن: ئێمە لەوە بێئاگاین، یان بڵێن: خۆ باوانمان پێ ئێمە هاوەڵیان بۆ خوا دانابوو، ئێمەش لەوان کەوتوینەوە، واتا: دوای ئەوان هاتوین و شوێن پێشینەکانمان کەوتین و ئشەوان تاوانبارن نەك ئێمە ئایا (ئەی خوایە) تۆ ئێمە سزا دەدەیت لەسەر کارێك کە پووچخوازان کردوویانە؟)[2]. جمهوری زانایان ئەو فەرموودەیان بە هەند وەرگرتووە کە پێشەوا (أحمد) هێناویەتی و (انس)ی کوری مالك لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (لە ڕۆژی قیامەتدا بە پیاوێکی دۆزەخی دەگوترێت: ئەگەر پڕ بەزەوی شتت هەبوایە ئایا ئەو شتەت دەکرە قوربانی لەپێناو ڕزگاربوونی خۆت لە دۆزەخ؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ خوای گەورەش دەفەرموێت: من شتێکی زۆر لەوە ئاسانترم لێت ویستوە، لەپشتی ئادەم دا پەیمانم لێوەرگرتیت کە هیچ شتێك نەکەیتە هاوەڵم، تۆش ڕەتت کردەوە، واتا: پەیمانەکەت شکاند و هاوەڵت بۆ بڕیاردام [3] .

---

[1] پێشەوا (أحمد) لە (مسند)ەکەیدا (١/٢٧/حلبی) هێناویەتی، هەروەها (طبري) لە (تأريخ)ەکەیدا (١/٣٤/معارف)دا هێناویەتی.

[2] سورەتی الاعراف / ١٧٢ — ١٧٣

[3] فەرموودەکە بخاری (خ. ل) گێڕاوەیەتیەوە (٦٠/١/٣٣٣٤/فتح) هەروەها مسلم (خ. ل) لە (صحیح)ەکەیدا (٥٠/١٠/٥٢) هێناویەتی .

(ابو جعفر الرازی) له (الربیع بن انس) ئەویش له (ابی العالیه) ئەویش له (ابی بن کعب) ەوە، خوا لەهەموویان ڕازی بێت، دربارەی ئەم ئایەتە پیرۆزە ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى﴾ الایة، وە ئایەتەکانی دواتری دەفەرموێت: خوای گەورە هەموو ئادەمیزادەکانی کۆکردەوە (کە ویستی وابوو لەپشتی ئادەم بکەونەوە) تا ڕۆژی قیامەت، هەموویانی دروست کرد، پاشان وێنەی کێشان (واتا: شکل و شێوەی بۆ دروست کردن) وهێنانیە قسەکردن و ئەوانیش قسەیان کرد، ئیتر پەیمانی لێوەرگرتن، خۆشیانی کرد بەشایەت بەسەر خۆیانەوە: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾ الایة . خوای گەورە فەرمووی: من هەر حەوت ئاسمانەکان و هەر حەوت زەویەکەم کردووە بە شایەت بەسەرتانەوە، هەروەها ئادەمی باوکیشتانم کرد کرد بەشایەت بەسەرتانەوە، نەبادا ڕۆژی دوایی بڵێن: ئەوەمان نەزانیوە (یان پێمان نەگوتراوە، ئەوا پێتا دەڵێم و بزانن کە) هیچ خوایەك جگە لەمن نیە و هیچ پەروەردگارێك جگە لەمن نیە ئیتر هیچ شتێك نەکەنە هاوەڵی من، منیش پێغەمبەرانی خۆم دەنێرمە سەرتان و لە شکاندنی ئەم پەیمانە بتانترسێنن، هەروەها پەیامی خۆمتان بۆ دادەبەزێنم، ئەوانیش گوتیان: هەموومان شایەتی دەدەین کە تۆ خواو و پەروەردگارمانی، جگە لەتۆ پەروەردگاری دیکەمان نیە، وەهیچ خوایەکمان نیە، هەر ئەو ڕۆژە دانیان بەوەدا ناوە کە گوێڕایەڵی خوای گەورە بکەن، وە ئادەمیشی بەرزکردەوە تا بۆ هەموویانی ڕوانی، ئیدی دەوڵەمەند و هەژاری تێدا بینین، شێوە جوان و ناشرینی تێدا بینین، ئیتر ئادەم (علیه السلام)فەرمووی: پەروەردگارا ... ئەگەر بەندەکانت وەکو یەك بوونایە؟ [٢] خوای گەورە فەرمووی: حەزدەکەم سوپاس بکرێم.ئادەم (علیه السلام)پێغەمبەرەکانی وەك چرای نورانی دیتن (لەناو نەوەکانیدا) و کە ئەوان پەیمانێکی جیاوازیان لێوەرگیراوە و پەیوەندی بە پەیام و پێغەمبەرایەتیەوە هەبووە، ئەوەیە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنْكَ وَمِنْ نُوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَأَخَذْنَا مِنْهُمْ مِيثَاقًا غَلِيظًا﴾[١]، وە دەفەرموێت: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾[٢]، وە دەفەرموێت ﴿هَذَا نَذِيرٌ مِنَ النُّذُرِ الْأُولَى﴾[٣]،وە فەرمویەتی:

---

[١] الاحزاب / ٧ .

[٢] الروم / ٣٠ .

[٣] النجم / ٥٦ .

﴿وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِمْ مِنْ عَهْدٍ وَإِنْ وَجَدْنَا أَكْثَرَهُمْ لَفَاسِقِينَ﴾[1] .

**کورتەیەکی چیرۆکی ژیانی ئادەم(علیه السلام)تائێرە بەم جۆرە بوو، خوای گەورە فەرمانی کرد بە فریشتەکان تاکو کڕنووش (ڕێز) بنوێنن بۆ ئادەم، هەموو فریشتەکان فەرمانی خوایان بەجێ هێنا، بەڵام (ابلیس) بەهۆی ئێرەیی بردنی و دوژمنایەتیەوە دژ بەئادەم کڕنووشی نەبرد، ئیتر خوای گەورە دەریکرد و لە بەزەیی خۆی دووری خستەوەو بە ریسوایی و نەفرەت لێکراوی وەك شەیتانی نەفرەتی دابەزێنرایە سەر زەوی**

**لە(ابو هریرە)وە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویی: (ئەگەر ئادەمیزاد گەیشتە ئایەتی کڕنووش و کڕنووشی برد، شەیتان دور دەکەوێتەوەو بە گریانەوە ئەڵێ: فەرمان بە ئادەمیزاد کرا کە کڕنووش بەرێ، کڕنووشی برد و بەهەشتی بۆ خۆی پچڕی، فەرمانی بەمنیش کرا، کە کڕنووش بەرم، بەڵام من یاخی بووم و پشتم هەڵکرد و دۆزەخم پێ برا)[2] .**

**پاشان ئادەم نیشتەجێی بەهەشت کرا، جا ئایا ئەو بەهەشتە لەئاسمان بوو بێت یان لەسەر زەوی، ئەوەش چەند ڕاوبۆچوونێکی جیاجیای لەسەرەو پێشتر ئاماژەمان پێدان، ئیتر خۆی و حەوای هاوسەری چیان بویستایە دەیانکرد و دەیانخوارد، کاتێکیش لەبەری ئەو دارەیان خوارد کە لێیان قەدەغە کرابوو پۆشاکەکەیان لێداکەوت و خۆشیان دابەزێنرانە سەرزەوی .**

**زانایان ڕای جیاجیان هەیە لەسەر ماوەی مانەوەی ئادەم (علیه السلام)لە بەهەشتدا، وتویانە هێندەی ماوەی چەند ڕۆژێکی دنیا بووە، (ابو هریرە) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەفەرموێت: (ئادەم لەدوا ساتەکانی ڕۆژی هەینیدا دروست کرا)، هەر لە ڕۆژی هەینیدا لە بەهەشت وە دەرنرا . جا ئەگەر هەمان ڕۆژ کە تیایدا دروستکرا، لەبەهەشت وەدەرنرابێ ئاوا مانای چەند ڕۆژێکی خۆمان لەبەهەشت دا ماوەتەوە، ئەوەش قسە و باسی لەسەرە، یان ڕەنگە وەدەرنانی لە ڕۆژێکی تردا بووبێت وتمان کە ئەو ڕۆژانە بەرانبەر (شەش هەزار ساڵ)ی خۆمانن، کە ئەوەش ماوەیەکی دوورودرێژە .**

**(ابن جریر) دەفەرموێ: ئەوە ڕوون و ئاشکرایە کە ئادەم (علیه السلام)لەدوا ساتەکانی ڕۆژی هەینیدا دروست کراوە، سەعاتێکی ئەویش بەرانبەر بەهەشتا و سێ ساڵ و چوار مانگە، بە پەیکەرێکی لەقوڕ دروستکراو مایەوە تا ماوەی (چل) ساڵ و**

---

[1] الاعراف / ١٠٢، دەتوانیت بۆ تەفسیری ئەو ئایەتانە سوود وەربگری لە تەفسیری ئاسان بەزمانی کوردی.

[2] صحیح المسلم / (١/٣٥/١٣٣) .

**پاشان گیانی بەبەرداکرا، ماوەی چل و سێ ساڵ و چوار مانگ لەبەهەشتدا مایەوە، بەرلەوەی وەدەربنرێ بۆ سەر زەوی، خوای گەورە خۆی باشتر دەزانێ .**

**دەگێڕنەوە کەکاتێ ئادەم** (علیه السلام)**ڕەوانەی سەر زەوی کرا، قاچەکانی لەسەر زەوی و سەری لەئاسمان بوو، خوای گەورە بالآی کورت کردەوە بۆ (شەست باڵ) لە (ابن عباس)یشەوە هەمان گێرانەوە هاتووە، ئەمەش تێڕوانینی خۆی لەسەرە، بەلآم فەرموودەی تری پێغەمبەر (ﷺ) هەیە کە لە (أبو هریرە)وە گێرراوەتەوەو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (خوای گەورە کە ئادەمی دوست کرد درێژیەکەی شەست باڵ بوو، تائێستاش خەڵکی بالآیان هەر کورت تر دەبێتەوە)** [1]**، ئیتر ئەم فەرمودەیە بەسە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە دەرێژی بالآی ئادەم** (علیه السلام)**لەشەست باڵ زیاتر یان کەمتر نەبووە . لە (ابن عباس)ەوە ئەگێرنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (خوای گەورە فەرمووی: ئەی ئادەم شوێنێکم لەپاڵ عەرشەکەمدا هەیە، برۆ لەوێدا خانویەکم بۆ دروست بکە ئیتر بەدەوریدا بگەرێ هەروەکو چۆن فریشتەکانم بە دەوری عەرشەکەمدا دەگەرێن، خوای گەورە فریشتەی بۆ نارد تاکو شوێنەکەی پێبڵێن و فێری پارانەوەیان بکەن)، باس کراوە کە هەموو جێ هەنگاوێکی ئادەم بوەتە شوێنیکی گرنگ و پیرۆز .**

**هەر لەوەوە دەگێڕنەوە کە یەکەم خۆراکێك کە ئادەم لەسەر زەویدا خواردویەتی ئەو حەوت دەنکە گەنمەبووە کە جبریل** (علیه السلام)**بۆی هێنا، ئادەم پرسی ئەمە چییە؟ جبریل فەرمووی: ئەمە بەری ئەو دارەیە کە لێت قەدەغە کرابوو بیخۆیت، بەلآم تۆ خواردت، پرسیاری لێکرد چی لەمە بکەم؟ فەرمووی لە زەویدا بیچێنە، ئیتر دایچاند، هەر دەنکە گەنمێك سەد هەزاری لێکەوتەوە، پێگەیشت، دوورییەوە، گێرەیکرد، پاکی کرد، هاڕیی، کردیە هەویر، ئینجا کردی بە نان، پاش ماندووبونێکی زۆر، بۆیە گوتراوە ژیانی دنیا ڕەنج و ماندووبوونە، خوای گەورەش دەفەرموێت:** ﴿فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰ﴾ . **یەکەم بەرگی دنیایان لەخوری مەڕ بووە، بەشەیان کردووە و ئینجا ڕێساویانە، پاشان ئادەم** (علیه السلام)**جبەیەکی لێچنیوە بۆ خۆی زرێ و سنگ پۆشیش بۆ حەوای خێزانی، ڕای جیاواز هەیە دەربارەی ئەوەی ئاخۆ لە بەهەشت دا منالیان بووە یان نا؟ وتراوە تەنها لەسەر زەوی منداڵیان بووە، لەلایەکی ترەوە گوتراوە بەڵێ**

---

[1] تأريخ ابن عساكر / (٢/٣٤٥/تهذيب) .

له بهههشت دا منالّیان بووه، (قابیل) و خوشكهكهی له بهههشت دا لهدایك بوون، خوای گهوره زاناتره .

وا باس دهكهن كه بهههموو سكێك كوڕێك و كچێكی بووه و فهرمانی وا پێكراوه كه ههموو كوڕێك ئهو كچه ماره بكات كه لهگهڵ براكهی سكی دوایی خۆی لهدایك بووه، تهنها دروست نهبووه كه برایهك ئهو خۆشكهی ماره بكات كه لهگهڵ خۆیدا لهدایك بووه . له (ابن مسعود)هوه ئهویش له ههندێ له هاوهڵانی پێغهمبهرهوه (ﷺ) دهگێڕنهوه كه ئادهم (علیه السلام)ههموو كوڕێكی خۆی كچی سكی دوای ئهوهی لێ ماره دهكرد، (هابیل) دهیویست كه خوشكی (قابیل) لهخۆی ماره بكرێ، بهلاّم (قابیل) له (هابیل) گهورهتربوو، خوشكی (هابیل)یش باشتر بوو، (قابیل) ویستی كه خۆشهویستی خۆی بخاته دڵی خوشكهكهیهوه بهسهر براكهیدا، ئادهم (علیه السلام)فهرمانی پێكرد كه ئهویان ماره بكات، بهلاّم ئهو قبوڵی نهكرد، لهبهر ئهو گوێڕایهڵی نهكردنهیان فهرمانی پێكردن كه ههریهكهیان قوربانیهك بكهن، ئادهم ڕۆیشت بۆ مهككه به مهبهستی حهج كردن.

كاتێ ئادهم (علیه السلام)ڕۆیشت ئهوانیش دهستیان كرد به ئهنجامدانی قوربانیهكانیان، (هابیل) كه مهڕدار بوو مهڕێكی قهڵهوی كرد به قوربانی، بهلاّم (قابیل) چهپكهیهك كشتوكاڵی خراپی كرد به قوربانی، ئاگرێك داكهوت و قوربانیهكهی (هابیل)ی خوارد و قوربانیهكهی (قابیل)ی وهلاناو گوێی پێنهدا، لێرهدا (قابیل) توڕهبوو، گوتی دهتكوژم بۆئهوهی خوشكهكهم ماره نهكهیت ئهویش گوتی: خوای گهوره قوربانی له كهسانێ خۆپارێز وهردهگرێ، واتا ئهوانهی لهخراپه خۆ دهبوێرن خوا دهیزانێ لهوانهیه كوژراوهكه له بكوژهكه بههێزتربوبێ .

بهلاّم ئهو ئازاترهبووه كه ئاماده نهبووه دهست درێژی بكاته سهر براكهی و بیكوژێ ، دهگێڕنهوه كه قوربانیكردنهكهیاندا ئادهم خۆی (علیه السلام)لهلایان بووه، (قابیل) به ئادهمی گوت: بۆیه قوربانی له ئهو وهرگیراوه چونكه تۆ نزات بۆكردووه، بهلاّم بۆ منت نهكردووهو لهگهڵ براكهمدا كهین و بهینی خۆتان ههیه .

شهوێكیان (هابیل) دهرنگی بهسهردا هات كاتیك كه شوان بوو، ئادهم (علیه السلام)(قابیل)ی نارد تاكو سۆراخی بزانێت، كاتێك ڕۆیشت، دۆزیهوهو پێی گوت: قوربانیهكهی تۆ وهرگیراوهو هی من وهرنهگیراوه؟ ئهویش گوتی: خوای گهوره قوربانی له پارێزكاران وهردهگرێت، بهوهش (قابیل) تووڕه بوو ئهو ئاسنهی كه پێی بوو

کێشای بەسەریدا و کوشتی، گوتراوە بە بەردێك کوشتویەتی کە بۆی فڕێداوە و کێشاویەتی بە سەریدا لەکاتێکدا کە ئەو لە خەودابوو، هەروەها گوتراوە: زۆر بە توندی خنکاندویەتیو پاشان بەگاز لێگرتن (وەك شێر) هەموو لەشی ونجڕونجڕ کردووە و بەوەش مردووە، خوای گەورە زاناترە . هەڕەشەی کوشتنەکەی لە قورئان دا هاتووە: ﴿لَئِنْ بَسَطْتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَا بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ﴾[1]، واتا: ئەگەر تۆ دەستت درێژ بکەیت بۆ کوشتنی من، ئەوا من دەست درێژ ناکەم بۆ کوشتنی تۆ، من لەو خوایە دەترسم کە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە .

ئەو دەقە جوانە کە لە قورئاندا خوای گەورە هێناویەتی بەڵگەیە لەسەر ڕەوشت جوانی و ترس لەخواو خۆپاراستن لەو تاوانانەی کە خەڵکی دەیەوێت بەرانبەرت بیکات

لەبەرئەوە لە هەردوو (صحیح)ەکەیدا هاتووە کە پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر دوو موسوڵمان بەنیازی کوشتنی یەکتری بەرانبەری یەك ڕاوەستان ئەوا بکوژ و کوژراو دەچنە دۆزەخەوە، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوا بکوژەکەیان دیارە،}واتە ماف خۆیەتی بچێتە دۆزەخ{ ئەی کوژراوەکەیان بۆچی ؟ فەرمووی: ئاخر ئەویش سوور بوو لەسەر کوشتنی بەرانبەرەکەی)[2] . هەروەها خوای گەورە وتەیەکی تری ئەویشی هێناوەو دەفەرموێت: ﴿إِنِّي أُرِيدُ أَنْ تَبُوءَ بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ وَذَلِكَ جَزَاءُ الظَّالِمِينَ﴾[3]، واتا: من دەمەوێ واز لە کوشتنی تۆ بهێنم، ئەگەر چی لەتۆش بەهێزتر و ئازاترم، بەڵکو من ئارامم گرتووە، ئەگەر تۆش وەکو من نەکەیت ئەوا تاوانی کوشتنی منیشت دەکەوێتە ئەستۆ لەپاڵ گوناه و تاوانەکانی پێشووترتدا . لێرەدا مەبەست لەوە نییە کە گوایە گوناهەکانی هەموو کوژراوێك دەچێتە ئەستۆی بکوژەکە، وەك هەندێ کەس گومانیان وایە، بەڵکو کوشتنەکەش یەکێکە لەتاوانە گەورەکان کەدەچێتە پاڵ تاوانەکانی تری بکوژەکە.

لە (ان مسعود)ەوە گێڕراوەتەوە کە پێغەمبەری نازدارمان (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ کەسێك نیە کە بەناهەق بکوژرێ و کەفالەتی خوێنەکەی نەکەوێتە ئەستۆی کورەکەی ئادەم، چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کە کوشتنی داهێنا)[4] .

---

[1] المائدە / ٢٨

[2] صحیح البخاری / (٢/٨٧، ٦٨٧٥/فتح)، (صحیح المسلم ٣٢/٢٨، ٣٣) (١٦/٦٤/٥٢) .

[3] المائدە / ٢٨ .

[4] بخاری (٣٢/٢٣)، (١/٦٠)، (١٥/٩٦). هەروەها (صحیح المسلم) ٣٧/٢٨ .

وتراوه كه لەشاخی (قاسیون)ی باكوری دیمەشق ئەشكەوتێك هەیە، پێی دەگوترێ (ئەشكەوتی خوێن) گوایە ئەو شوێنەیە كە (قابیل) تیایدا (هابیل)ی برای كوشتووە، بەڵام ئەو قسەیە هیچ بناغەیەكی ئەوتۆی نیە كە جێی متمانەبێ، خوای گەورە خۆی زاناترە .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَبَعَثَ اللَّهُ غُرَاباً يَبْحَثُ فِي الْأَرْضِ لِيُرِيَهُ كَيْفَ يُوَارِي سَوْءَةَ أَخِيهِ قَالَ يَا وَيْلَتَى أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَذَا الْغُرَابِ فَأُوَارِيَ سَوْءَةَ أَخِي فَأَصْبَحَ مِنَ النَّادِمِينَ﴾[1]، هەندێ لە زانایان وا دەگێڕنەوە كەكاتێك (قابیل) (هابیل)ی برای كوشت، ماوەی ساڵێك لەسەر پشتی خۆی گێڕای، هەندێكی تر دەڵێن ماوەی (دە) ساڵ تەرمی براكەی هەڵگرت، نەیدەزانی چی لە تەرمەكەی بكات،

تا خوای گەورە (دوو قەلەڕەشكەی برای یەكتری) ناردە بەردەم (قابیل)، دوو قەلەكە بەشەڕ هاتن و یەكێكیان ئەوەی تریانی كوشت و ئیتر یكوژەكە دابەزیە سەر زەوی و چاڵێكی هەڵكەند و تەرمی قەلە كوژراوەكەی خستە ناوی و ئینجا خۆڵی بەسەردا كرد و داپیۆشیەوە، كاتێ (قابیل) ئەم دیمەنەی بینی، بەخۆی گوت: ئەك داماو خۆم، باشە بۆچی هێندە نەزان بووم و بەقەی ئەو قەلەشم پێنەكرا تاكو تەرمی براكەم داپۆشم، ئیتر وەكو قەلەكەی كرد و تەرمی براكەی بەخاك سپارد .

مێژوو نووسەكان دەڵێن: ئادەم تەواو دڵتەنگ و پەرێشان بوو، مجاهد دەفەرموێت: (قابیل) هەر زوو سزای لەلایەن خواوە بۆ دابەزی و هەر ڕۆژی كوشتارەكە قاچی نووسا بە شانیەوەو دەموچاوی وەك سەلكی گوڵەبەڕۆژەی لێهات، (خۆر) لەكوێ بوایە ئەویش ڕووی لەوێ بوو، لەگەڵ خۆرەكەدا ڕووخساری وەردەچەرخا .

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ تاوانێك نیە هێندە شایستەی ئەوەبێ كە خوای گەورە هەر لەدنیادا سزای بدات (جگە لە سزای ڕۆژی دواییشی) هێندەی تاوانی زوڵم و بڕینی پەیوەندی ڕەحم شایستەن)[2] .

پێشەوا (ابو جعفر بن جریر) لە مێژووەكەیدا نووسیویەتی: لە هەندێكەوە بیستومە كە: كە (حەوا) بیست سكی كردووەو چل منداڵی بووە، (ابن اسحاق) دەڵێت: هەمووشیانی ناو لێناون، خوای گەورە باشتر دەزانێت، وە وتراوە: سەد و بیست سكی كردووە، هەموو جارێكیش كوڕێك و كچێكی بووە و یەكەم منداڵی ناوی

---

[1] المائدە / ٣١ .

[2] سنن ابو داود (٢/٥٧٤) .

**(قابیل)بووه و خوشكەكەیشی (قیلما)بووه، دواین كوریشی ناوی (عبدالمغیث)بووه و خوشكەكەیشی ناوی (ام المغیث)بووه، ئیتر لەوانەوه خەڵكی زۆر بوون،بە زەویدا بڵاوبوونەتەوەو گەشەیان كرد هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت:**﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾[1] **الایە، واتا: (خەڵكینە تەقوای ئەو پەروەردگارەتان بكەن كە ئێوەی لەیەك نەفس دروست كردووەو لەویش هاوسەرەكەی دروست كردو پاشان لەو دوانەوە پیاو و ژنی زۆر كەوتنەوە) .**

**مێژوونووسان وا باس ئەكەن كە ئادەم (علیه السلام)مایەوەو نەمرد هەتا منداڵی خۆی و منداڵی مناڵەكانی و نەوەكانی خۆی بینی تا ژمارەیان گەیشتبووە چوار سەد هەزار كەس . . ! خوای گەورە چاكتر دەزانێت.**

**ئادەم** (علیه السلام)**جگە لەوەی كە باوكی هەموو مرۆڤەكانە هاوكات پێغەمبەری خواش بووە، شێوەو ڕوخسارو باڵایشی گەلێ شیرین و جوان بووە، دەڵێن: گوایە (حەوا)ی خێزانی منداڵی بۆ نەژیاوە لەسەرەتادا، بەڵام ئەو گوتەیە هیچ بناغەیەكی متمانە پێكراوی لەسەر نیە، خوای گەورە ئادەم و حەوای بۆ ئەوە بەدی هێنا تاكو ببنە مایەی زۆربوون و بڵاوبوونەوەی ئادەمیزاد لەسەر زەویدا، هەروەكو لە (ابن عباس)ەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئایا ئاگادارتان بكەمەوە بەوەی كە گەورەترین فریشتە (جبریل)ە و گەورەترین پێغەمبەر ئادەمە و گەورەترین ڕۆژەكان هەینییە و گەورەترین مانگەكان ڕەمەزانە و گەورەترین شەوان قەدرە و گەورەترینی ژنان مەریەمی كچی عمرانە) . (كعب الاحبار) دەڵێت: جگە لەئادەم هیچ كەسێك لە بەهەشت دا ڕیشی نیە، بەڵام ئەو ڕیشێكی ڕەشی هەیە كە دەگاتە سەر ئاستی ناوكی، هیچ كەسێك نییە كە كونیەی هەبێت جگە لەئادەم لە بەهەشتدا، ئەویش لەدنیادا نازناوی (باوكی مرۆڤەكانە) و لە بەهەشت دا نازناوی (باوكی محمدە)، هەروەها دەگێڕنەوە كە خەڵكی بەهەشت هەموویان بەناوی خۆیانەوە بانگ دەكرێن بێجگە لە ئادەم كە بە (باوكی محمد) بانگ دەكرێت، ئەم فەرموودانەش لە هەموو ڕوویەكەوە لاوازن . . خوای گەورە زاناترە . لە (الحسن)ەوە گێڕراوەتەوە كە فەرموویەتی: عەقڵی ئادەم هێندەی عەقڵی هەموو مناڵەكانی بووە، پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەی**

[1] النساء / ١ .

(الاسراء)دا فەرموویەتی: (بە لای یوسف دا ڕۆشتم کە کەرتێك جوانی پێدراوە)، زانایان لەو بارەیەوە دەڵێن، ئەو فەرمودەیە مانای ئەوەیە کە بەشەکەی تری جوانێتی مرۆیی لە ئادەمدا بووە(علیە السلام)، چونکە خوای گەورە بەدەستی تەوانایی خۆی وێنەی کێشاوە و گیانی بەبەردا کردووە، دیارە ئەوەی کە خوا خۆی دروستی کردبێت دەبێت باشترین بێت . لە (عمر) و (ابن عمر)ەوە دەگێڕنەوە کە کاتێك خوای گەورە بەهەشتی دروست کرد فریشتەکان گوتیان: ئەی پەروەردگارمان، ئەو بەهەشتە بۆ ئێمە دابنێ، تۆ دنیات بۆ ئادەمیزادەکان دروست کردووە کەتیایدا دەخۆن و دەخۆنەوە، خوای گەورە فەرمووی: سوێند بەعیزەت و جەلالی خۆم باشترین نەوەی ئەوەی کە بەدەستی خۆم دروستم کردووە وەك ئەوە لێناکەم کە پێم گوتووە (ببە) خێرا (بووە)ە [1].

## کۆچی دوایی ئادەم ( دروود و سەلامی خوای لەسەر بێت )

(شیث) واتا: دیاریی خوا، ئادەم (علیە السلام)بۆیە کوڕەکەی خۆی بە (شیث) ناو زەردکرد، چونکە خوای گەورە کاتێك (شیث)ی پێدان کە (هابیل)ی کوڕیان کوژرابوو، لەدایك بوونی ئەم کوڕەیان لەو کاتەدا وەك دیاریی خوای گەورە وابوو بۆیان .

(ابو ذر) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: (خوای گەورە سەد و چوار پەڕە پەیامی خۆی دابەزاندووە، لەوەش پەنجا پەڕەیان بۆ سەر (شیث) بووە)، (محمدی کوری اسحاق) دەگێڕێتەوە کەکاتێك ئادەم (علیە السلام)لە سەرەمەرگ دابوو پەیمانی بە (شیث)ی کوڕی ڕاسپارد و کاتەکانی شەو و ڕۆژی تەرخان کرد بۆ فێرکردنی پەیامەکەی بۆ ئەو و چۆنیەتی بەندایەتی کردن بۆ خوای گەورە، هەروەها هەواڵی ڕوودانی لافاوە گەورەکەی پێ ڕاگەیاند (واتا لافاوی نوح(علیە السلام).

هەر ئەو دەفەرموێت: گوتراوە کە: پشتی هەموو ئادەمیزادەکانی ئەمڕۆ و بن و بنەچەیان دەچێتەوە سەر (شیث) و جگە لەوانەی کە دەچنەوە سەر ئەو ئەوانی تر هەموویان لەناوچوون، خوا زاناترە . ڕۆژی هەینی بوو کە ئادەم (علیە السلام)کۆچی دوایی کرد، فریشتەکان کفن و بۆن و بەرامەیان لەلایەن خوای گەورەوە بۆ هێنابوو، لە بەهەشتەوە، دڵنەوایی (شیث)ی کوڕییان دایەوەو ڕێگەیاندا تاکو وەصیەتی خۆی بە کوڕەکەی ڕابگەیەنێت، (ابن اسحاق) دەفەرموێت: ئیتر ماوەی حەوت شەو و حەوت

---

[1] واتا ئەوانەی کەهەرگیز فەرمانی خوا ناشکێنن، ڕەنگە مەبەست لە فریشتەکان بێت خوای گەورە زاناترە (وەرگێر).

ڕۆژ مانگ و خۆر گیران، (یەحیا) دەڵێت: پیاوێکی پیرم لە مەدینە بینی کە قسەی بۆ خەڵکی دەکرد . پرسیم ئەوە کێیە ؟ گوتیان: ئەوە (أبي کوڕی کعب)ە، ئەو فەرمووی: ئادەم (علیه السلام)کاتێك لە سەرەمەرگدابوو، بە کوڕەکانی فەرموو: ڕۆڵەکانم حەزم لە بەروبومی بەهەشتە، ئەوانیش ڕۆیشتن بۆی پەیدا بکەن، لە ڕێگەدا فریشتەکانیان پێگەیشت کە کفن و بۆن و بەرامە و پاکەرەو مەکتەلیان پێبوو، فریشتەکان پرسیاریان لێکردن: کوڕانی ئادەم ئەوە بۆچی دەگەڕێن و چیتان دەوێ؟ بۆ کوێ دەچن؟ گوتیان باوکمان نەخۆشە و ئارەزووی چۆتە سەر میوەو بەروبومی بەهەشت، پێیان گوتن: بگەڕێنەوە باوکتان تەواو بووە، ئیتر گەڕانەوە .

کاتێ (حەوا) فریشتەکانی بینی ناسینیەوەو خۆیدا بەپاڵ ئادەم، ئادەمیش فەرمووی: لەپێش تۆدا بۆ لای من هاتوون، فەرموو ڕێگە چۆڵ بکە لە نێوان من و فریشتەکانی پەروەردگارمدا، ئیتر فریشتەکان گیانیان کێشا، شۆردیان، کفنیان کرد و بۆن خۆشیان کرد گۆڕ و گۆڕیچکەیان بۆ هەڵکەند، نوێژیان لەسەر کرد، دوایی فەرموویان: ئەی ئادەمیزادەکان بەم جۆرە ڕەفتار لەگەڵ مردووەکانتاندا بکەن .

ئەی ئادەمی باوکمان خوای گەورە لێت خۆش بێت و بە بەهەشتی بەرینت شاد بکات، پاداشتت چەند هێند بکات، ئێمە بە تۆ و تۆش بە ئێمە شاد بکاتەوە، بە ڕاستی کڵۆڵی و نارەحەتی و زەحمەتت بینی بەدەست نەفس و شەیتان و دنیاوە . . کوێرەوەری و ماندویی و جەرگبڕانت بینی، خوای گەورە لە تۆی پێغەمبەر و ئێمەی ئادەمیزاد و نەوەی خۆت ببورێت و ئایندەمان شادبوون بێت بە پەروەردگاری میهرەبان و بە بەزەیی .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: فریشتەکان چوار جار (الله اکبر)یان لەسەر ئادەم خوێند، ابوبکریش چوارجار (الله اکبر)ی لەسەر (فاطمة) خوێند،

صوهەیب چوارجار (الله اکبر)ی لەسەر عمر خوێند [1] . ڕای جیاواز هەیە دەربارەی شوێنی بەخاك سپاردنی ئادەم(علیه السلام)، وا باوە لەو کێوەی ئەسپەردەی خاك کراوە کەکاتی خۆی بۆ ئەو کێوە لە بەهەشتەوە دابەزێنرا کە لە هندستانە، گوتراوە: نەخێر لەکێوی (ابی قبیس)ی مەککەیە، دەشڵێن کاتێك کە لافاوە سەرتاسەریەکە ڕویدا نوح پێغەمبەر (علیه السلام)تەرمی ئادەم و حەوای لە تابوتێکدا

[1] واتا ئەوانەی کەهەرگیز فەرمانی خوا ناشکێنن، ڕەنگە مەبەست لە فریشتەکان بێت خوای گەورە زاناترە (وەرگێڕ).

هەڵگرتەوەو لە (بيت المقدس) ئەسپەردەی خاکی کردنەوە، هەندێکی تر دەڵێن: سەری ئادەم (عليه السلام)لە شوێنی (مزگەوتی ابراهيم)ە (عليه السلام)وە قاچەکانیشی لەئاستی بەردی (بيت المقدس)ە، ساڵێك پاش کۆچی دوایی ئادەم ئیتر (حەوا)ش کۆچی دوایی کرد، جیاڕایی دەربارەی ماوەی تەمەنی ئادەم (عليه السلام)هەیە و زۆربەی ڕایەکان دەفەرموون کە تەمەنی لە (لوح المحفوظ)دا هەزار ساڵە، تەنانەت لەگەڵ ئەو دەقەی (تەوڕات)یش دا زۆر لەیەك جیاواز نین دەربارەی تەمەنەکەی، ئەگەر ئەو دەقەی (تەوڕات) وەك خۆی مابێت و دەستکاری نەکرابێ، چونکە ئەو باس لەتەمەنی دەکات هێندەی کە لەسەر زەویدا بووە کە بریتیە لە نۆسەد و سی ساڵ، بە قەمەری دەگاتە نۆسەد و پەنجاو حەوت ساڵ ئینجا چل و سێ ساڵی تریشی دەخرێتە سەر کە ماوەی مانەوەیەتی لە بەهەشتدا بەرلەوەی دابەزێنرێتە سەرزەوی، هەروەك (ابن جرير)و هەندێکی تر وایان لێك داوەتەوە، بەمەش کۆی گشتی دەکاتە هەزار ساڵ، (عطاء الخراسانی) دەفەرموێت: کاتێك ئادەم کۆچی دوایی کرد هەموو مەخلوقات حەوت ڕۆژ گریان بۆی . ئیتر کاروباری سپارد بە (شیث)ی کوڕی (عليه السلام)کە بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەرمان (ﷺ) (شیث)یش هەر پێغەمبەر بووە و پەنجا پەڕەی پەیامی خوای بۆ دابەزیوە.

کە (شیث)یش (عليه السلام)کۆچی دوایی کرد کاروبار و مۆرگاری و پەیامەکەی سپارد بە (ئەنوش) و ئەویش دوای خۆی سپاردی بە (قینن)ی کوڕی و ئەویش بە (مەهلایل) کە فارسەکان بە (پاشای حەوت هەرێمەکە) ناویان بردووەو یەکەم کەسیش بووە کە داری بڕیوەتەوەو شارەکانی دروست کردووەو قەڵای قایمی دامەزراندووە، هەر ئەویش شاری (بابل) وشاری (سوس)ی دروست کرد و قینی خۆی بە (ئیبلیس) و دەست و پێوەندەکانی ڕشت و لە وشکاییەکانی زەوی وەدەریان نان بەرەو کەنارەکان و پەنا کێوەکان و چەند خێوو درنجێکی خراپکاری لەبەرەی جنۆکەکان کوشت، تاجێکی گەورەی هەبوو وتاری بۆ خەڵکی دەدا چل ساڵ دەسەڵات و دەوڵەتەکەی درێژەی هەبووە کاتێك کۆچی دوایی کرد کاروباری درایە دەست (یەرد)ی کوڕی و ئەویش لە سەرەمەرگدا سپاردەی خۆی بە (خەنوخ)ی [1]، کوڕی ڕاگەیاند، کە ناوی(ادريس)وەپێغەمبەرێکیخوابووە(عليه السلام)

---

[1] (ادريس) (د. خ) لە ڕاستیدا ناوی (خەنوخ) یان (ئەخنوخ) بووە

## ﴿ پێغەمبەری خوا ( ئیدریس ) ( درووود و سەلامی خوای لەسەر بێت )﴾

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِدْرِيسَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقاً نَبِيّاً، وَرَفَعْنَاهُ مَكَاناً عَلِيّاً﴾[1]، واتا: لە قورئاندا باسی ئیدریس بکە، چونکە ئەویش پێغەمبەرێکی ڕاستکار و ڕاستگۆ، بۆیە ڕێزی زۆرمان لێگرت و پایەدار و بەرز بڵندمان کرد لەجێگە و ڕێگەی تایبەتدا .

(ئیدریس) (علیه السلام)ئەو پێغەمبەرەیە کە خوایە گەورە سوپاسی لەسەر دەکات و بە نموونەی پێغەمبەرایەتی ڕاستگۆیانە وەسفی دەکات، لەڕاستیدا ناوی (خانوخ) یان (ئەخنوخ)بووە و لە زنجیرەی پشتی پێغەمبەری خۆمانە (ﷺ)، سێهەم کەسە لە ئادەمیزادەکان کە خوای گەورە کردویەتی بە پێغەمبەر لەدوای (ئادەم) و (شیث) (علیه السلام). ابن اسحاق وا باس دەکات کە (ادریس) (علیه السلام)یەکەم کەس بووە کە بەقەڵەم نووسیویەتی و سێسەد و هەشتساڵ لە تەمەنی ئادەمی بینیوە، هەندێ کەس گوتویانە پێغەمبەر (ﷺ) لەم فەرموودەیەدا مەبەستی لە (ئیدرس)ە، کە دەفەرموێت: (ئەو پێغەمبەرێك بوو، لەسەر لم دەینووسی) . زۆربەی زانایانی ڕاڤەی قورئان و ئەحکامەکان پێیان وایە کە یەکەم کەسێك کە لەو بوارانەدا قسەی کردووە ئەو بووە، هورمسییەکان بە هورموسی ناویان بردووە و گەلێك درۆو دەلەسەیان خستوەتە پاڵی، هەروەکو چۆن خستویانەتە پاڵ پێغەمبەرانی تر و زانایان و حەکیم و پیاوچاکان .

لە فەرموودەی (الاسراء)ی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە کە پێغەمبەر بەلای ئیدریس دا ڕۆیشتووە لەئاسمانی چوارەم دا، پرسیار کرا لە (کعب) دەربارەی واتای ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت ﴿وَرَفَعْنَاهُ مَكَاناً عَلِيّاً﴾، لە وەڵامدا فەرمووی: خوای گەورە وەحی بۆ ئیدریس کرد و فەرمووی: من هەموو ڕۆژێك وەك کردەوەی چاکی هەموو ئادەمیزادەکان هی تۆش (دەنووسم) و بەرزی دەکەمەوە و حەز دەکەم کردەوەی زیاتری هەبێ . یاوەرێکی فریشتە هاتە لای و پێی فەرمووی: خوای گەورە ئەوەو ئەوەی بە وەحی بۆ ناردوم (واتا: وەحی بۆ ناردووم کە کردوەی زیاتر بکەم)، ئەی فریشتەی یاوەرم تۆش بە فریشتەی گیان کێشان بڵێ (مەرگم دوابخات) تا کردەوەی زیاتر بکەم،، فریشتەکەش (ئیدریس)ی خستە بن باڵی خۆی و لەگەڵ خۆیدا بۆ ئاسمان بەرزیکردەوە، تا گەیشتە ئاسمانی چوارەم، لەوێدا فریشتەی گیان کێشانی بینیو باس و خواسەکەی ئیدریسی پێڕاگەیاند، فریشتەی گیان کێشانیش فەرمووی: ئەی ئیدریس لە کوێیە؟ فریشتەکەش فەرمووی:

---

[1] سورەتی مریم / ( ٥٦ — ٥٧ ) .

ئەوەتا لەسەر پشتمە، فریشتەی گیان کێشان فەرمووی بە ڕاستی من سەرم سوڕماوە، من لەلایەن خواوە ڕەوانە کراوم و پێم گوتراوە کە لەئاسمانی چوارەم دا گیانی ئیدریس بکێشم، خۆم بەخۆم دەگوت جاباشە من چۆن لەئاسمانی چوارەم گیانی بکێشم کە ئیدریس لەسەر زەوییە؟ ئیتر فریشتەکە لەوێ گیانی کێشا (واتا لەئاسمانی چوارەم) لەبەرئەوەیە خوای گەورە فەرموویەتی (بلّندمان کردەوە بۆ شوێنێکی بەرز) [1] .

لە (مجاهد)ەوە دەگێڕنەوە کە دەربارەی ئەو ئایەتەی پێشوو فەرموویەتی: (ئیدریس) (علیه السلام)بەرزکراوەتەوە و هەروەکو (عیسی) (علیه السلام)بە زیندوویی لەئاسمانە و نەمردووە، یاخود بەرزکراوەتەوە لەئاسمان گیانی کێشاوە، خوای گەورە دەزانێت چۆنە ! .

لە (ابن عباس)یشەوە دەگێڕنەوە کە دەربارەی ئایەتەکە فەرموویەتی: بۆ ئاسمانی شەشەم بەرزکراوەتەوەو هەر لەوێ گیانی گێشراوە، بەلاّم ئەو فەرموودەیەی کە هەموو زانایان لەسەر یەك دەنگن ئەوەیە کە بۆ ئاسمانی چوارەم بەرزکراوەتەوە (حسن البصری) دەفەرموێت: بەرزکردنەوەی (ئیدریس) (علیه السلام)بۆ بەهەشت بووە، هێندێکی دیکە فەرموویانە: هەر لە سەردەمی ژیانی (یەردی کوڕی مەهلایل)ی باوکیدا بەرزکراوەتەوە، خوای گەورە زاناترە، هێندێك پێیان وایە کە (ئیدریس) (علیه السلام)لەپێش (نوح)دا (علیه السلام)نەبووە، بەلّکو لە سەردەمی (بنی اسرائیل)دا بووە .

پێشەوا بوخاری لە (ابن مسعود)و (ابن عباس)ەوە وا باس دەکات کە (ئیلیاس) (علیه السلام)لە ڕاستیدا هەر (ئیدریس)ە(علیه السلام). ئەوەش لەسەر بنەمای ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) کە بە فەرموودەی (ئیسراء) ناسراوە دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەرمان (ﷺ) لەشەوی ئیسرادا بەلای (ئیدریس)دا ڕەت بوو (ئیدریس) (علیه السلام)بە پێغەمبەری خۆمانی فەرموو: (مەرحەبا لەبرای چاك و پێغەمبەری چاك، وەکو ئادەم و ئیبراهیم (علیه السلام)فەرموویان مەرحەبا لە پێغەمبەری چاك و کوڕی چاك،جا ئەگەر لەهەمان پشتی پێغەمبەری خۆمان بوایە ئەوا وەکو ئادەم و ئیبراهیم(علیه السلام)مەرحەبایان لە پێغەمبەرمان دەکرد) [2]، واتا: (کوڕی چاك)یان بەکار دەهێنا، چونکە پێغەمبەرمان (ﷺ) دەبووە کوڕی ئەویش .

---

[1] سورەتی مریم / ( ٥٦ – ٥٧ ) .

[2] ابن عساکر / لە (تأریخ)ەکەیدا (١/٢٨٢/تهذیب) هێناویەتی .

هەرچەندە ئەوەش نابێتە بەڵگەیەك بۆ كارپێكردن، چونكە ناكرێت دەقی وتەی مەرحەبا و پێشوازی كردنی (ئیدریس)یش (علیه السلام)بۆ پێغەمبەرمان (ﷺ) هەروەكو دەقی مەرحەبای ئادەم و ئیبراهیم بێت لە پێشوازی پێغەمبەرمان (ﷺ)، چونكە ئادەم باوكی هەموو مرۆڤەكانە و (ئیبراهیم)یش لەدوای محمد (ﷺ) گەورەترین پێغەمبەری (ئولول عەزمە)، ئیتر نابێت دەقی پێشوازی ئەوانی دیكەش لە پێغەمبەران وەكو هی ئەو دوو پێغەمبەرە بێت .

## ﴿ پێغەمبەری خوا ( نوح ) ( درووود و سەلامی خوای لەسەر بێت )﴾

(نوح) (علیه السلام)کوڕی (لامك)ی کوڕی (متوشلخ)ی کوڕی (خەنوخ)ە، واتا: (ئیدریس)ی کوڕی (یەرد)ی کوڕی (مەهلایل)ی کوڕی (قەینەن)ی کوڕی (ئەنوش)ی کوڕی (شیث)ی کوڕی (ئادەم)ە (علیه السلام). وەك (ابن جریر) و هەندێکی تر گێڕاویانەتەوە حەزەتی (نوح) (علیه السلام)سەد و بیست و شەش ساڵ دوای کۆچی دوایی حەزرەتی ئادەم لەدایك بووە . بەپێی مێژووی نووسراوی (أهل الکتاب) ماوەی نێوان لەدایك بوونی نوح تاکو کۆچی دوایی ئادەم سەد و چل و شەش ساڵە و هەروەك (ابن حبان) فەرموویەتی: دە چاخیان لە نێوانیاندایە و فەرموودەیەکی پێغەمبەرمانی(ﷺ)گەیاندۆتەوە سەر (ابا امامە) کە فەرموویەتی: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا (ئادەم) پێغەمبەر بووە؟ فەرمووی: بەڵێ، پرسی: ماوەی نێوان ئەوو نوح چەند بووە؟ فەرمووی: دە چاخ .

ابن عباس لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (ماوەی نێوان ئادەم و نوح دە چاخ بووە، هەمووشیان لەسەر ئیسلام بوون)، جا ئەگەر مەبەست لە (چاخ) سەد ساڵ بێ هەروەکو بە زۆری واباوە، ئەوا ماوەکەی نێوانیان دەکاتە هەزاڵ ساڵ، بەڵام مانای ئەوە نیە کە ماوەکە لەوە زیاتر نەبووە، چونکە ماوەی تر لە نێوانیاندا هەبووە، کە خەڵکی لەسەر ئاینی ئیسلام (توحید) نەبوون ئەگەر چی فەرموودەکەی پێغەمبەرمان (ﷺ) ئەوەی یەکلایی کردوەتەوە کە هەموویان لەسەر ئیسلام بوون و هیچ بوارێکی بۆ ئەو کەسانە، نەهێشتوەتەوە کە گوتویانە گوایە (قابیل) و کوڕەکانی ئاگر پەرست بوون، خوای گەورە زاناترە . دەشێت وشەی (قَرن) بەمانای (چاخ)بێت کە مەبەست لە (سەدە)یەو ماوەکەیشی سەد ساڵە،هەروەها دەشێت بەمانای (بەرە)یەك لە خەڵکی بێت، هەروەکو لەم ئایەتانەدا (قَرن) بە مانای (بەرەیەك لە خەڵك) هاتووە:

﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ مِنْ بَعْدِ نُوحٍ﴾ [4] . ﴿ثُمَّ أَنْشَأْنَا مِنْ بَعْدِهِمْ قَرْناً آخَرِينَ﴾ [5] .

﴿وَقُرُوناً بَيْنَ ذَلِكَ كَثِيراً﴾ [6] . ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُمْ مِنْ قَرْنٍ﴾ [7] .

---

[4] سورەتی الاسراء / ١٧ .

[5] سورەتی المؤمنون / ٣١ .

[6] سورەتی الفرقان / ٣٨ .

[7] سورەتی مریم / ٩٧ .

هەروەها پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی: (خیر القرون قرنی)، کە مەبەستی بەرەیەکە لە خەڵکی، دیارە پێش لەدایك بوونی (نوح) چەندین بەرەی خەڵکی لەدایك بوون و ژیاون و مردوون و چەندەها ساڵیان خایاندوە، بەم پێیە دەکرێت بوترێت ماوەی نێوان ئادەم و نوح (علیه السلام)هەزاران ساڵ بووە، خوای گەورە زاناترە .

تێکرا لەسەر ئەوە کۆکن: کاتێك خوای گەورە (نوح)ی ڕەوانە کرد کە خەڵکی کەوتبوونە پەرەستنی بت و ستەمکاران وە نقومی گومڕایی و بێبڕوایی بوون، (نوح)ی وەك ڕەحمەتێك نارد بۆ گرۆی ئادەمیزاد، یەکەم پێغەمبەر بووە کە ڕەوانە کراوە بۆ خەڵکی سەر زەوی هەروەکو خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا وا بانگی دەکەن، وەك (ابن جریر) باس دەکات گەلی نوح ناوی (بنوراسب) بووە . زانایان ڕایان جیاجیایە دەربارەی ئەو تەمەنەی کە (نوح) تیایدا کراوە بە پێغەمبەری خواو پەیامی بۆ هاتووە، وتراوە: لەتەمەنی پەنجا ساڵیدا بووە، یان لەتەمەنی سێسەد و پەنجا ساڵیدا بووە، یاخود لەتەمەنی چوارسەد و هەشتا ساڵیدا بووە .

## باسی نوح( علیه‌السلام )له‌قورئانی پیرۆزدا

له گه‌لێك شوێنی قورئاندا به شێوه‌ی كورت یان درێژ چیرۆك و به‌سه‌رهاتی (نوح) و گه‌له‌كه‌ی و شێوازه‌كانی بانگخوازی و ڕووداوی لافاوه گه‌وره‌كه باس كراوه، له‌وانه‌ش یه‌ك سوره‌ت به‌تایبه‌تی به‌ناوی (نوح) (علیه السلام)له قورئاندا هه‌یه و له سوره‌ته‌كانی تریشدا باس كراوه وه‌كو سوره‌ته‌كانی (الاعراف، یونس، هود، الانبیاء، المؤمنون، الشعراء، العنكبوت، الصافات) . خوێنه‌ری ئازیز ئه‌گه‌ر ده‌ته‌وێت گشت ئه‌و ئایه‌تانه‌ت له به‌رده‌ست دا بێت كه په‌یوه‌ندی ڕاسته‌وخۆ یان ناڕاسته‌وخۆیان به به‌سه‌رهات و ژیانی (نوح)ه‌وه هه‌یه، ئه‌وا ده‌توانیت سوود وه‌ربگریت له (ته‌فسیری ئاسان) كه به‌زمانی شیرینی كوردی به ووردی ته‌فسیری هه‌موو قورئانی پیرۆزی تێدایه و جه‌نابی مامۆستا برهان محمد أمین نووسیویه‌تی، خوای گه‌وره پاداشتی به‌خێری ئه‌نجامده‌رانی ئه‌و پڕۆژه پیرۆزه بداته‌وه به‌گشتی . ئێمه‌ش لێره‌دا ته‌نها ناوی ئه‌و سوره‌تانه و ژماره‌ی ئایه‌ته‌كانت بۆ ده‌نووسین، تاكو به‌و پێیه بچیته خزمه‌تی ئه‌و ته‌فسیره پیرۆزه به مه‌به‌ستی وه‌رگرتنی زانیاری زیاتر ده‌رباره‌ی حه‌زره‌تی (نوح)(علیه السلام)، كه ئه‌مانه‌ن له‌م خشته‌یه‌دا:

| ناوی سوره‌ت | ژماره‌ی ئایه‌ت |
|---|---|
| سوره‌تی الاعراف | (٥٩) بۆ (٦٤) |
| سوره‌تی یونس | (٧١) بۆ (٧٣) |
| سوره‌تی هود | (٢٥) بۆ (٤٩) |
| سوره‌تی الانبیاء | (٧٦) بۆ (٧٧) |
| سوره‌تی المؤمنون | (٢٣) بۆ (٣٠) |
| سوره‌تی الشعراء | (١٠٥) بۆ (١٢٢) |
| سوره‌تی العنكبوت | (١٤) بۆ (١٥) |
| سوره‌تی الصافات | (٧٥) بۆ (٨٢) |
| سوره‌تی القمر | (٩) بۆ (١٧) |
| سوره‌تی غافر | (٥) بۆ (٦) |
| سوره‌تی الشوری | (١٣) |
| سوره‌تی ق | (١٢) بۆ (١٤) |
| سوره‌تی التحریم | (١٠) |

| ناوی سوره‌ت | ژماره‌ی ئایه‌ت |
|---|---|
| سوره‌تی نوح | (١)بۆ كۆتایی |
| سوره‌تی النساء | (١٦٣) بۆ (١٦٥) |
| سوره‌تی الانعام | (٨٣) بۆ (٨٧) |
| سوره‌تی التوبه | (٧٠) |
| سوره‌تی ابراهیم | (٩) |
| سوره‌تی الاسراء | (٣) |
| سوره‌تی الاسراء | (١٧) |
| سوره‌تی الاحزاب | (٧) |
| سوره‌تی ص | (١٢) بۆ (١٤) |
| سوره‌تی الذاریات | (٤٦) |
| سوره‌تی النجم | (٥٢) |
| سوره‌تی الحدید | (٢٦) |

هه‌ریه‌كه له‌و ئایه‌تانه‌ی سه‌ره‌وه له باسه‌كه‌ماندا ده‌رباره‌ی حه‌زره‌تی (نوح) (علیه السلام)به‌پێی پێویستی له جێی خۆیدا سوودیان لێوه‌رده‌گرین .

## ((بت پەرستی))

پاش چەند بەرەیەكی چاك و خواپەرست، چەند شتێكی تر هاتنە ئاراوە، جۆرە بارێك بەسەر خەڵكەكەدا هات كە وردەوردە دەستیان كرد بە بت پەرستی، هۆی ئەوەش لە فەرموودەیەكی پێغەمبەری نازدارماندا (ﷺ) ڕوون كراوەتەوە كە (ابن عباس) گێڕاویەتەوە، دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزە ﴿وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾[٨]، فەرموویەتی: (ود) و (سواع) و (یغوث) و (یعوق) و (نسر) لە ڕاستیدا ناوی چەند كەسێكی خواناس و پیاوچاكی گەلی (نوح) بوون، كاتێ كە كۆچی دواییان كرد، شەیتان چووە بن كلێشە و ناو عەقڵی خەڵكەكەوە كە پەیكەریان بۆ دروست بكەن و لەناو كۆڕ و دانیشتنی خۆیاندا بەنەمر و بەرز ناویان بەرن، هەریەكە لەو پەیكەرانەش بەناوی خودی ئەو كەسانەوە بوو، ئەوانیش بەفیتی شەیتانیان كرد و فریویان خوارد، واشیان دەزانی ئەوە ئیشێكی باشە و بەوە دەتوانن پیاو چاكەكانیان بەنەمری لە مێژووی خۆیاندا تۆمار بكەن، ئەوانیش وایان كرد وردە وردە ئەو بارە درێژەی كێشا و گەیشتە ئەو ئاستەی كە ئەو پەیكەرانە وەك بتی پیرۆز سەیر دەكران و دەپەرستران لەلایەن خەڵكییەوە .

(ابن عباس) دەفەرموێ هەر ئەو بت پەرستییەش بوو كە گەلی (نوح) (علیه السلام)دایان هێناو پاشان گواسترایەوە بۆ ناو عەرەبەكانیش، لە (محمدی كوڕی قیس)ەوە دەگێڕنەوە كە فەرموویەتی: چەند گەلێكی موسوڵمان و خواناس لەنێوان ئادەم و (نوح)دا هەبوون، بگرە ئەوانیش چەندین پاشەبەرە و شوێنكەوتەی چاك و خواناس هەبوون، بەڵام كاتێك كۆچی دواییان كرد، ئەوانەی شوێنكەوتەی ئەو پیاوچاكانەبوون وتیان: لەوانەیە ئەگەر وێنە و پەیكەر بۆ ئەو پیاوچاكە كۆچكردووانەی پێشوومان بكەین چاكتربێ و هاندەرێكی باشتربێ بۆمان تاكو زیاتر بیر لەئەوان و خواپەرستیەكەیان بكەینەوە و باشتر شوێنیان بكەوین، ئیتر ئەوان وێنەیان كێشان و پەیكەریان بۆ كردن، ئەو بەرەیەش مردن و ئەوانەی لەدوای ئەوان هاتنە ژیانەوە بەئاسانی لەلایەن شەیتانەوە فریودران، شەیتان وا بەگوێیدا چرپاند كەگوایە بەرەی پێشوو، واتا: باو و باپیرانی ئەمان ئەو پەیكەرانەیان پەرستووە و بەهۆی ئەوانیشەوە بارانیان بۆ باریوە، ئیتر ئەم بەرەیە كەوتنە پەرستنی ئەو پەیكەرە و

---

[٨] سورەتی نوح / ٢٣ .

وێنانەو ئەوەش بوو بە نەریتێکی پاشماوەیی کەلتوری بۆ نەوەکانی دوای خۆیان و درێژەی کێشا .

لە (عروە)ی کوڕی (زبیر)ەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: (ود) و (یعوق) و (نسر) کوڕی ئادەم بوون، (ود) برا گەورەی ئەوانی تربووەو لە هەمووشیان خواپەرستر بووە و یەکەم کەسیش بووە کە لەسەر زەویدا شەهید کراوە لەخاکێکدا کە بتی تێدا دەپەرسترا، هەروەها (ود) پیاوێکی باش و خۆشەویست بووە لەناو گەلەکەیدا، کاتێك کە مرد گەلەکەی بەدەوری گۆڕەکەیدا لە (بابل) تەوافیان دەکرد و بەگەورە و پیرۆز ناویان دەبرد، کاتێك شەیتان ئەمەی لەو گەلە بینی، خۆی خستە سەر شێوەی مرۆڤێك و هاتە ناویان پێی گوتن: من دەزانم کەئێوە ئەو پیاوە زۆر بەگەورە دەگرن و شێوەیشی ناناسن، ئایا حەزدەکەن وێنەی ئەو پیاوە پیرۆزەتان بۆ دروست بکەم تاکو لە شوێنە گشتیەکان دایبنێن و چاکتر یادی بکەنەوە ؟ وتیان بەڵێ: ئیتر لە شێوەی ئەو پیاو چاکە وێنەیەکی بۆ دروست کردن (یان پەیکەرێك) ئەوانیش دایاننا و کەوتنە باس کردن بەسەرا گوتنی و باش ناوبردنی جا کەشەیتان زانی ئەو خەڵکە هێندە بە پەرۆشەوە سەرگەرمی یادکردنەوەی ئەو پیاوەن، هاتەوە بۆلایان و پێی گوتن: ئایا حەزدەکەن بۆ هەرماڵێکتان پەیکەرێکی تایبەتی بۆ دروست بکەم بۆ ئەو پیاوە، تاکو هەریەکە لە ماڵەکەی خۆیدا پەریکەرێکی ئەو پیاوچاکەی هەبێت و هەمیشە لەبەر چاوتان بێت و یاری بکەنەوە؟ وتیان: بەڵێ ئیتر بۆ هەر ماڵێك لەماڵەکانی ئەو خەڵکە پەیکەرێکی دروست کرد، ئەوانیش لێیان وەرگرت و دایاننا و کەوتنە یادکردن و بەرێزگرتنی پەیکەرەکە، ئیتر ئەو منالأنەی کە لەو بەرەیە کەوتنەوەو زۆربوون هەر زیاتر توندبوون لەسەر بە گەورەگرتنی ئەو پەیکەرانە و بە تێپەڕبوونی کات کەوتنە پەرستنیان، یەکەم کەسیش کە پەرسترابێ لەسەر زەویدا بریتیبوو لە پەیکەری (ود) کە ناسراوە بەبتی (ود) لەناویاندا .

بە کورتی هەر هۆز و بەرەیەك (بت)ێکی تایبەت بە خۆیان هەبوو بۆ پەرستن، پەرستنەکەش گەلێك شێوەو شێوازی جیاجیای هەبوو، بگرە مەسەلەکە بوو بە مەراسیمێکی تایبەتی و بەڵگە هێنانەوە بۆ بەرگریکردنیان لەو بیرو باوەڕیان و تا ئەمرۆش لەسەر زەویدا خەڵکانێك هەن کە بەشێوەیەك لە شێوەکان (بت) دەپەرستن و بەرگریش لەو کارە ئالۆژیکیانە یکیەیان و بەڵگەی بۆ دەهێننەوە .

لە هەردووك (صحیح)ی (مسلم و بخاری)دا هاتووە کە کاتێك (ام سلمە) و (ام حبیبە) لە خزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) باسی ئەو (کەنیسە)یان کرد کە لەخاکی (حەبەشە)دا

بینیبوویان و پێی دەگوترا: (کەنیسەی ماریە) و وا باسیان دەکرد کە زۆر جوان دروست کراوە و وێنە و کلێشەی جوان جوانیشی تێدایە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی:

((ئەوان کە پیاو چاکێکیان لێ دەمرد، لەسەر گۆڕەکەی مزگەوتێکیان دروست دەکرد، پاشان ئەو وێنانەشیان لەسەر دروست دەکرد (یان لەناودا دروست دەکردن) ئەوانیش خراپترین مەخلوقن بەلای خوای گەورەوە)) [٩] .

## نوح بانگەواز دەکات بۆ خوا پەرستی

کاتێك شەوەزەنگی بت پەرستی پەرەیسەند و سەرزەوی گرتەوە، خوای گەورەش بەندەیەکی خۆی کردە پێغەمبەرێکی زرنگ و کار بەجێ بۆ ئەو گەلە، ئەو پیاوە چاکەش حەزرەتی (نوح) بووە(علیه السلام)، تاکو خەڵکی بە خۆیاندا بچنەوە و واز لە بت پەرەستی بهێنن و ڕووبکەنە خوای تاك و تەنها و بێهاوەڵ.

(نوح) یەکەم پێغەمبەر بووە کە ڕوانەکراوە بۆ خەڵکی سەرزەوی بەگشتی، هەروەکو لە فەرموودەی (الشفاعە)ی پێغەمبەری ئازیزماندا هاتووە کە دەفەرموێت: ((لە ڕۆژی دوایی و لەکاتی سەغڵەتی و نارەحەتیدا خەڵکەکە پەنا دەبەن بۆ ئادەم و دەڵێن: ئەی ئادەم تۆ باوکی هەموو مرۆڤەکانیت، خوای گەورە بەدەستی توانایی خۆی دروستی کردیت و گیانی بە بەریدا کردیت فەرمانی بە فریشتەکان کرد کە کڕنووشی (ڕێزیان) بۆت برد و خوای گەورە لە بەهەشت دا نیشتەجێی کردیت، ئایا تکامان لەخوای گەورە بۆ ناکەیت کە لەم نارەحەتیە ڕزگارمان بکات؟ ئایا نابینی ئێمە لەچ حاڵێکی پەرێشانیداین ؟ ئادەم دەفەرموێت پەروەردگارم ئەمڕۆ زۆر تووڕەیە، تووڕەبوونێکی ئەو تۆ کە نەپێش ئێستا و نەدوای ئێستا وا تووڕە نەبووەو نابێت، خوای گەورە (کاتێ خۆی لە بەهەشتدا) پێی ڕاگەیاندم کە توخنی درەختەکە نەکەوم، بەڵام من یاخی بووم، خۆم .. خۆم ! بڕۆنە لای کەسێکی تر، بڕۆنە لای (نوح)، ئیتر خەڵکەکە دێنە خزمەتی (نوح) و پێی دەڵێن: ئەی نوح تۆ یەکەمین پێغەمبەر بوویت کە ڕەوانە کرایت بۆ سەر زەوی و خوای گەورە بە بەندەیەکی سوپاسگوزار ناوی بردویت، ئایا نابینی ئێمە لەچ حاڵێکی پەرێشانی داین؟ ئایا لای خوای گەورە تکامان بۆ ناکەیت؟ ئەویش لە وەڵامیاندا دەفەرموێت: پەروەردگارم ئەمڕۆ زۆر تووڕەیە تووڕەبوونێکی ئەوتۆ کە نەپێش ئێستا و نەدوای ئێستا وا تووڕە نەبووەو

---

[٩] صحیح البخاری / (٤٢٧/٤٨/٨)، (٤٢٤/فتح)، هەروەها (صحیح المسلم ١٦/٣/٥) . صحیح البخاری / (٤٢٧/٤٨/٨)، (٤٢٤/فتح)، هەروەها (صحیح المسلم ١٦/٢/٥) .

**نابێت، خۆم . خۆم !)[10]، تا کۆتایی فەرموودەکە . کاتێك خوای گەورە (نوح)ی ڕەوانە فەرموو بۆ سەر ئەو گەلە، (نوحیش) بانگی کردن بۆ یەکتا پەرستی خوای گەورە و وەلانانی هاوەڵ و بت و پەرەستراوەکانی تر، وە ئەوەش لەلایەن خوای گەورەوە بۆ خودی (نوح)و نەوەو بەرەکانی دواتریش بووە، ئەویش بانگەوازکردنی خەڵکی بووە بۆ دوورکەوتنەوەی لە پەرستنی شتی تر و تەنها و تەنها خوای گەورە بپەرستریٚ هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ الْبَاقِينَ﴾[11]. **وە دەربارەی (نوح) و (ابراهیم)یش (علیه السلام)خوای گەورە دەفەرموێت**﴿وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ﴾[12]، **واتا: هەموو پێغەمبەرانی تر کە لەدوای (نوح)ەوە هاتوون دەچنەوە سەر بن و بەرەچەی (نوح)، هەروەها (ابراهیم)یش (علیه السلام).**

**بەم جۆرە تەوەرەی سەرەکی پەیامە ئاسمانیەکان و مەبەستی سەرەکی لە ناردنی پێغەمبەران بۆ سەر بەرەی ئادەمیزاد لەکات و شوێنە جیاجیاکاندا بریتی بووە لەوەی کە خەڵکی بێنە سەر شارێگەی خوا پەرەستی و دور بکەونەوە لە پەرستنی شتی تر، ئەگینا چارەنووسێکی خراپ و ئایندەیەکی ترسناکیان دێتەڕیٚ، دروشمی سەرەکی هەموو پێغەمبەران (ﷺ) ئەوە بووە کە خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا بە ڕوونی فەرموویەتی:**
﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُمْ مَنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُمْ مَنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلالَةُ فَسِيرُوا فِي الأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾[13]، **واتا: لەناو هەموو گەل و نەتەوەکاندا پێغەمبەرێکمان ناردووە بۆ سەر خۆیان و گەلەکەیان تاکو ئەو خەڵکە تێبگەیەنن کە خوای گەورە بپەرستن و لەطاغوتەکان دوور بکەنەوە . ئەوەبوو کە (نوح)یش (علیه السلام)بەخەڵکەکەی فەرموو:** ﴿يا قومِ اعبُدوا اللهَ ما لَكُم مِن إلهٍ غيرُهُ، أفلا تَتقُون﴾[14] .

**حەزرەتی (نوح) پیاوێکی داناو حەکیم بووە لە هونەر و شێوازی ڕوون کردنەوەی ڕاستی و گەیاندنی هەق و بانگەواز کردنی خەڵکی بۆ شارێگەی خواپەرستی و دادپەروەری، چەندین شێوە و شێواز و کاتی جیاجیای بەکار دەهێنا بۆ بانگ کردنی**

---

[10] لە صحیح المسلم (١/٨٤/٣٢٢)، هەروەها لە صحیح البخاریدا (٣/٦٠)، ٦٥-/١٧)، (٥)دا هاتووە، مەبەست لە (خۆم ...خۆم)، واتە هەرکەس بەلەی حاڵی خۆیەتی لەو ڕۆژە سەختەدا .

[11] سورەتی الصافات / ٧٧ .

[12] سورەتی الدخان / ٣٦ .

[13] سورەتی النحل / ٣٦ .

[14] سورەتی الاعراف / ٦٥ .

خەڵکەکە بەشەو، بە ڕۆژ، بە نهێنی، بە ئاشکرا و بەهاندان و دڵخۆش کردنیان، بە ترساندنیان بە هەڕەشەی خوایی و ... هتد، بەڵام تاریکایی بت پەرستی بە جۆرێك ڕەگی داکوتابوو لە ناخیاندا، کە گوێیان بۆ هیچ شتێك نەدەگرت، لەبەرئەوە بانك خوازیە پڕ لەداناییەکەی (نوح) (علیه السلام)بێهودە بووبۆیان بەچاك وەڵامیان نەدەدایەوە و سووربوون لەسەر نادادی و کەللە ڕەقیەکەی خۆیان وبگرە کەوتنە بەربەرەکانیٚ کردن و دوژمنایەتی (نوح) و بەکەم باسی خۆی و ئەوانەیان دەکرد کە شوێنی کەوتبوون، سەرەڕای ئەوەش هەڕەشەی ئەوەیان لێکرد کە بەرد بارانی دەکەن و شاربەدەری دەکەن ئەگەر وازنەهێنیٚ لەو بانگەوازە تازەیە، ئەمەش نەك هەر قسە و قسەلۆکی کەسانی نەزان و کەم فامیان بووبێت، بەڵکو (نوح) (علیه السلام)دەستی کرد بە گۆڕانکاری لەشێوازی بانگەوازیەکەیدا بەو ئومێدەی وەڵامێکی باش لە خەڵکەوە وەربگرێت،بەڵام بۆی دەرکەوت کە ئەوەشیان بێسوودە و ئەوان ئەوەی دەیانگوت نەیاندەگوتەوە وەڵامەکەشیان ئەمە بوو، کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:﴿فَقَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ مَا نَرَاكَ إِلَّا بَشَراً مِثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلَّا الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ وَمَا نَرَى لَكُمْ عَلَيْنَا مِنْ فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَاذِبِينَ﴾[15]،واتا: تۆ مەگەر کەسێکی هەروەکو ئێمە مرۆڤێکی وا دەبینین ئەوانەی وەدوشت کەتوون کەسانێکن کە لەناو ئێمەدا هیچ بایەخێکیان نیە و نزمترین ڕایان هەیە و ئێوەش وێکڕا چ شتێکتان لەئێمە زیاتر نیە و بگرە بە ناڕاست دەزانین و گومانمان وایە .

بە ڕاستی ئەوە قسەیەکی سەیرە و وەڵامێکی کەللە ڕەقانەیە، چونکە ئەوان سەرسامن بەوەی کە مرۆڤێکی وەکو خۆیان بکرێتە پێغەمبەر لەلای خوای گەورە، بگرە ئەو و شوێنکەوتوە باوەڕدارەکانیشیان بە کەم و ریسوا و نزم ناو برد و دەیانگوت ئەوانەی وەدووت کەوتوون لاوازترین کەسی ناو ئێمەن، کاتی خۆی (هرقل)یش گوتویەتی: (هەمیشە لاوازەکان شوێنکەوتەی پێغەمبەران بوون لەسەرەتادا)، مەسەلەکەش پەیوەندی نیە بە هێزەوە، بەڵکو پەیوەندی بە ڕەوابینینی هەق و شوێنکەوتنیەتی . (بادی الرأی) بەلای ئەوانەوە ئەوە دەگەیەنیٚ کە ئەو کەسانەی شوێن (نوح)کەوتوون هەر یەکسەر بە قسەی نوحیان کردووە و هیچ پێودانێکی پێوانەکاری و وردبوونەوەی عەقڵییان نەبووەو ڕای خۆیان دەرنەبڕیوە و گوێشیان نەداوەتە نەریتی باوباپیرانی خۆیان، کە بت پەرست بوون، بەم جۆرە قسانە لەناو خۆیاندا سوکایەتیان

---

[15] سورەتی سورەتی هود / ٢٧ .

پێدەکردن، ئەوان (واتە سەرکردە و سەرەك هۆز و دەم ڕاستەکانیان) هەستیان بەلای ئەوەدا نەدەچوو کە شتی هەق ، ڕوون و ئاشکرایە، پێویست بە هەڵوێستەکردن و ڕامان و بیر لێکردنەوە ناکات دەبێت لەگەڵ وتنیدا وەریبگریت و نکوڵی لیّ نەکەیت، هەر لەبەر ئەم خاڵە گرنگەش بووە کە

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) بە نموونەی هەق خوازی باسی چۆنیەتی باوەڕهێنانی (ابوبکری صدیق)ی کردووە و دەربارەی ئەو دەفەرموێت: هیچ کەسێك نیە کە بانگم کردبێت بۆ سەر ئاینی ئیسلام هەڵوێستەیەکینەکرد بێت بەڵام (أبوبکر) یەکسەر ڕەزامەندی دەربڕی و دوای نەخست، هەر لەبەرئەوەش بوو کاتێك (ابوبکر) ویستی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) نووسراوێکی بۆ بنووسرێت ئینجا خەلافەت وەربگرێت، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی نەنووسی و فەرمووی: (خودا و موسوڵمانان کەسیان پێقبوڵ نیە بکرێتە خەلیفەی موسوڵمان أبوبکر نەبێت)، واتا هەردەبێ (ابوبکر) بێت [١٦] . ئەوان بە (نوح)یان دەگوت: ئەوانەی شوێنت کەوتوون هیچ شتێکیان لەئێمە زیاتر دەست نەکەوتووە و لەئێمەش بەڕێزتر نین، مەبەستیان لەوەبووە کە ئیمانەکەیان نەبووەتە مایەی دەسکەوتێکی ئاشکرا !! بەڵام حەزرەتی (نوح) (علیه السلام)ئەوەی تێگەیاندن کە خوای گەورە بە چاوڕوونی بە ئەوان داوەو بەزەیی و سۆزی خۆی بەسەردا ڕژاندوون و لەگێژاوەی نەزانی ڕزگاری کردوون ئەگەرچی ئەوان نکوڵییان لەوە دەکرد .

دیارە ئەم جۆرە فەرموودانەی (نوح)(علیه السلام)وەك وتارێکی پڕ لەبەزەیی و میهرەبانی بووە بۆیان تاکو شوێن هەق بکەون، کڕوزانەوەو پاڕانەوەو تکا نەبووە، بۆ نموونە خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کە دوو پێغەمبەری خۆی ڕەوانەکرد بۆسەر بێبڕوایەکی کەللە ڕەق و بەدەسەڵات، بەڵام وا فەرمانی پێکردن کە بەنەرم و نیانی گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن تا بەڵکو بەخۆیدا بچێتەوەو بیرێك بکاتەوە و لەخوای خۆی بترسێت، وەك دەفەرموێت ﴿فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ﴾ [١٧]،خوای گەورە بە پێغەمبەری خۆشمان هەر وا فەرمانی کردووە کە بەوپەڕی حیکمەت پەیامی خوا ڕابگەیەنێت و بەشێوەیەکی چاك گفتوگۆ لەگەڵ بەرانبەرەکانیدا بکات، هەروەك ئەوە

[١٦] صحیح المسلم (١١/١/٤٤) .

[١٧] سورەتی طه / ٤٤ .

**خەسڵەتی هەموو هەقخوازان و بانگەوازکارانە، دەفەرموێت:** ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾[١٨].

**(نوح) (علیه السلام)بەئەوان دەفەرموێت: (ئەدی نابینن کە من لەسەر بەرچاوڕوونیم کە لەلایەن پەروەردگارمەوە بۆم ڕەوانەکراوە و بەزەیی و میهرەبانیشم هەر لەوەوە بۆ هاتووە)؟ کە مەبەستی لەپەیام و پێغەمبەرایەتیە، بەڵام ئێوە لێی تێناگەن نایەنە سەر ئەو ڕێگە ڕاستە، ئایا منیش بەزۆر ئێوەی پێوە پابەند بکەم؟ لەکاتێکدا ئێوە نکوڵی لێدەکەن، خۆ من هیچ فێڵ و تەڵەکەو چاوبەستێکم نیە تاکو هەڵتاندێرم و فریوتان بدەم، بەڵکو هیچ پاداش و کرێیەکیشم لێتان ناوێت ئەیگەلەکەم، چونکە پاداشتی من لای خوای گەورەیە و پاداشتی ئەو لەهی ئێوە بۆ من باشتر و نەمرو نەبڕاوەترە)،هەروەها فەرموویەتی:**

﴿وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّهُمْ مُلَاقُوا رَبِّهِمْ وَلَكِنِّي أَرَاكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ﴾[١٩]، **واتا: من ئەوانە پەرتەوازە ناکەم لەخۆم کە باوەڕیان هێناوە ئەوانە ڕێگەی خواناسییان دۆزیوەتەوەو بە پەروەردگاری خۆیان گەیشتوون، بەڵام هەرچی ئێوەیە وا دەتانبینم کە نەوەو گەلێکی خۆگەورجکارن) ئەمەش وەك وەڵامێکە بۆ ئەوان کە لەوانەیە بە (نوح)یان گوتبێت ئەو هەژار و کەم دەستانەی لەدەورت کۆبوونەوە لایانبەرەو پەرتەوازەیان بکە، ئێمە لەگەڵتدا گفتوگۆیەك دەکەین، ئەویش ئەو داخوازیەی ڕەت کردبێتەوەو پێی گوتوون: من چۆن ئەوان پەرتەوازە دەکەم کە ئەوان لەگەڵ خوادان و منیش لەخوا دەترسم، ئەرێ ئێوە بیر لەهیچ ناکەنەوە؟! هەروەکو کاتی خۆیشی قوڕەیشییەکان بەپێغەمبەری خۆمانیان گوت: ئەو هەژار و نابووتانەی لەدەورت کۆبوونەوە، پەرتەوازەیان بکە، کە کاسانێکی وەکو (عەمار) و (صوهەیب) و (بیلال) و (خەباب)بوون، بەڵام خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەر (ﷺ) کرد کە شتی وا نەکات . ئەوان دەیانگوت بە (نوح) خۆ ئەو کەسانەی باوەڕیان پێت هێناوە هیچیان دەست نەکەوتووە، وایان دەزانی باوەڕهێنان دەسکەوتی ماددیشی لەگەڵدایە، بەڵام (نوح) (علیه السلام)فەرمووی:**

﴿وَلَا أَقُولُ لَكُمْ عِنْدِي خَزَائِنُ اللَّهِ وَلَا أَعْلَمُ الْغَيْبَ وَلَا أَقُولُ إِنِّي مَلَكٌ﴾[٢٠]، **واتا: پێتان ناڵێم من خەزێنەی خوام لەبەر دەستایە، من نە نهێنی دەزانم و نەفریشتەشم، بەڵکو وەك ئێوە مرۆڤم و بەندەیەکم خوای گەورە ڕەوانەی کردووم و ئەو زانیاریانەی خوا خۆی فێرم**

---

[١٨] سورەتی النحل / ١٢٥ .

[١٩] سورەتی هود / ٢٩ .

[٢٠] سورەتی هود / ٣١ .

**نەکات سەربەخۆ هیچ نازانم و توانام بەسەر هیچ دا نیە کە خوای گەورە خۆی تواناداروم نەکات بەسەریدا، ناتوانم هیچ سوودێك یان زیانێك بە خۆیشم بگەیەنم بەبێ ویستی خوا)، وە فەرمووی: من ناتوانم بەوانەی کە لەگەڵمدان بڵێم هیچ خێرێکتان لەلایەن خواوە دەست ناکەوێت لەڕۆژی دواییدا، خوای گەورە بۆخۆی چاکتر دەیانناسێت، ئەگەر چاك بن چاکە دەدرێنەوەو ئەگەر خراپیشبن سزا وەردەگرن . گفتوگۆی نێوان(نوح) (علیه السلام)و گەلەکەی زۆر درێژەی کێشاو کەم بەرهەمی هەبوو، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحاً إِلَى قَوْمِهِ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَاماً فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ﴾[21]، واتا: هەزار ساڵ پەنجا کەم (نوح) لە ناویاندا مایەوە، ئیتر لافاو نقومیکردن، چونکە ستەمکاربوون . هەر کە بەرەیەك لە خەڵکەکە پیردەبوون و ئەچوون بەساڵا، ئیتر بە منداڵەکانیان ڕادەگەیاند کە هەرگیز باوەڕ بە (نوح) نەکەن و شوێنی نەکەون، بگرە بەربەرەکانیشی بکەن، تەنانەت باوك هەستی دەکرد منداڵەکەی پێگەیشتووەو قسە وەردەگرێت بانگی دەکرد لای خۆی و وەسێتی بۆ دەکرد کە هەتاماوە باوەڕ بە (نوح) نەکات، لەبەرئەوە هەرچەندە چەندین بەرەیان پێگەیشتن و پیربوون و مردن، بەڵام باوەڕیان نەهێنا هەر بۆیەیش بوو ژمارەی شوێنکەوتووانی (نوح) زۆر کەم بوون ئەگەر چی تەمەنی بانگخوازیی (نوح) زۆریش بوو، بەواتایەکی تر ئەو بێبڕوایانە تەنها کەسانی بێ بڕواشیان لێدەکەوتوە، هەروەکو خوای گەورە لەباسیاندا دەفەرموێت: ﴿إِنَّكَ إِنْ تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِراً كَفَّاراً﴾ [22].**

**قسەی کەسی یەکەم و کەسی کۆتاییان هەریەك قسەی کۆن بوو، هیچ شتێکی تازەیان پێنەبوو، بگرە هێشتا ئەوان گلەیی گازەندەیان لە (نوح) دەکرد و پێیان دەگوت: ﴿قَالُوا يَا نُوحُ قَدْ جَادَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَالَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ [23]،**

**واتا: ئەی نوح بە ڕاستی موجادەلەکردنت لەگەڵ ئێمەدا زۆر دەمێکە درێژەی هەیە واتا:ئێمە بڕوات پێناکەین و ئیتر چ چارەنووسێکی ترسناکت بۆ داناوین و چیت لەدەست دێت، فەرموو بەرانبەرمان بێکە ئەگەر خۆت بە ڕاستگۆ دەزانیت.(نوح)(علیه السلام)فەرمووی: ﴿قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُمْ بِهِ اللَّهُ إِنْ شَاءَ وَمَا أَنْتُمْ بِمُعْجِزِينَ﴾[24]، واتا: ئەوەی بەسەرتان**

[21] سورەتی العنکبوت ١٤ .

[22] سورەتی نوح / ٢٧ .

[23] سورەتی هود / ٣٢ .

[24] سورەتی هود / ٣٣ .

دێت خوای گەورە خۆی دەینێرێت ئەگەر بیەوێت ئیشی خوای گەورەش کەس ناتوانێت کۆسپی بخاتە ڕێ، چونکە بە هەرشتێ فەرمان بکات دەفەرموێت (ببە) و خێرا ئەو شتە دەبێت، وە فەرمووی: ﴿وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِي إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ اللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾[٢٥]، واتا: ئامۆژگاریەکانی من چ سوودێکتان پێ ناگەیەنێ کە بمەوێت ئامۆژکاریتان بکەم، ئەگەر خوای گەورە خۆی بیەوێ سەرگەردانتان بکات، ئەو پەروەردگاری ئێوەیە و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە، مەبەست لەوەیە کە ڕێنومایی کردن بەدەست هیچ کەسێك نیە، ئەوەی خوای گەورە خۆی دەیزانێ کێ دێتە سەر ڕێی ڕاست و کێ بەگومڕایی دەمرێت، ئیشەکانی خوای گەورەش بێحیکمەت نیە . ڕۆژگار هات و ڕۆیشت، کات درەنگ بوو حەزرەتی (نوح) (علیه السلام)بەو زمانە شیرین و عەقڵ پڕ لەحیکمەت و تەمەنی پڕ لە بەرەکەتەیەوە بێماندووبوون شەوو ڕۆژی خستبووە سەر یەك بەجۆرەها شێواز بانگەوازی دەکردن بۆ ڕێگەی یەکتا پەرستی و دوورکەوتنەوە لە نادانی و سەرگەردانی و بت پەرستی و خراپەکاری، بەڵام ئەوان گاڵتەیان پێدەهات و ئومێدی چاکبوونیان لێنەدەکرا، دیارە کە (نوح)یش زۆر خەمی خواردووەو پەرێشان بووە بەو هەڵوێستە نالەبارەی ئەوان کە بەگفتار و بەکردار لەبەر بەرەکانی کردن و دوژمنایەتی کردنی (نوح) و شوێنکەوتوانی هەق دابوون .

لەم بارە ناسکەدا حەزرەتی (نوح) (علیه السلام)زۆر دڵی لەخۆی دادەمێنێ و گەلێك پێویستی بەوە دەبێت کەکەسێکی بەتوانا و بەدەسەڵات بەوپەڕی میهرەبانیەوە دڵنەوایی بکات و چارەنووسی دواساتەکانی ئاکامی ئەو خەڵکە کەللە ڕەقەی پێڕابگەیەنێت ئیتر خوای گەورە دڵنەوایی پێغەمبەرە نازدارەکەی دەکات و پێشی ڕادەگەیەنێت کە جگە لەوانەی تائێستا بڕوایان هێناوە کەسی تر بڕوا ناهێنێ و تۆش سپاردەی سەرشانی خۆت بەتەواوەتی ڕاگەیاند و هیچ بەڵگەیەکت بۆ نەهێشتنەوە کە شانازی پێوە بکەن و لەپاڵیدا پاکانە بۆ باوەڕ نەهێنانیان بکەن، ئەم ڕاگەیاندنە گەورەیەی خوای مەزن چەند ئاماژەیەکی تێدایە، لەوانەش پێدانی هەواڵی ئایندە بەنوح و نزیکبوونەوەی دواهەمین چارەنووسی ئەو گەلە و دڵنەوایی کردنی (نوح) و قەدرگرتنی کۆششە نەبڕاوەکەی لە بانگەوازخوازیدا بۆ ڕێگەی یەکخواناسی و دادپەروەری و هەقگیری، وێڕای ئەوەش فەرمانێکی گەورە تێدایە بۆ دروستکردنی کەشتیەك کە تەنها پانتایی ڕووبەری ئەو

---

[٢٥] سورەتی هود / ٣٤ .

کەشتیە بە وشکی دەمێنێتەوە لەسەر زەویدا و ئیتر کاتی ئەوە هاتووە ئێوەش گاڵتە بەو کەسانە بکەنەوە کە چەند سەدەیەکە خۆیان و باوك و باپیریان گاڵتەیان بە تۆ و باوەڕداران دەکرد، بەڵام ئەم جارەیان گاڵتە پێکردنی یەکجارییە و دواساتەکانی تیاچوونی ئەوانە، پەشیمان بوونەوەو باوەڕهێنان بێ سوودە پەناتان بۆ دەهێنن تا ڕزگاریان بکەن، بەڵام ڕۆژەکە ڕۆژی باوەڕدارانە و ئەوانی تر ئاکامیان شەرمەزاری و ڕیسوایی و تیاچوونە ، ئیتر خوای گەورە فەرمووی:

﴿وَأُوحِيَ إِلَى نُوحٍ أَنَّهُ لَنْ يُؤْمِنَ مِنْ قَوْمِكَ إِلَّا مَنْ قَدْ آمَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا يَفْعَلُونَ ، وَاصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلَا تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُوا إِنَّهُمْ مُغْرَقُونَ﴾[٢٦]، واتە: سروشمان کرد بۆ نوح و پێمان گوت کە جگە لەوانەی پێشووتر باوەڕیان پێت هێناوە تیتر کەسیی دی باوەڕت پێناهێنێ و خەمیش مەخۆ لەو کارانەی کە بێباوەڕان دەیکەن، کەشتییەك دروست بکە بە فەرمانی ئێمە و بەو شێوەیەی ئێمە لە وەحیدا پێت ڕادەگەیەنین (کە چۆن بێت) دەربارەی ستەمکارانیش، لەگەڵماندا مەدوێ واتا سکاڵا و تکایان بۆ مەکە چونکە ئەوان نقوم دەکرێن، هەروەکو لە دەریای نەزانیدا نقوم ببوون . ئیتر دەروازەکانی ڕزگاری بەڕووی (نوح) (علیە السلام)و باوەڕداراندا کرایەوە، کە مژدەتان لێبێت هیچی تر ماندوونابن، بەڕاستی ئەوان جگە لە هەڵوێستی دژوارانەی ئەندێشەیی و دەروونی کەوتنە دژایەتی کردنی ڕاستەقینە و بە کردەوەش ئەنجامیاندا، ئەمەش دواهەمین بارە کە مرۆڤ دەتوانێت خۆی لە بەرانبەردا ڕابگرێت و وا پێویست دەکات لەمەولا هەڵوێستی تر وەربگرێت و بارودۆخەکە بە لایەکی تردا بسوڕێ . لێرەدا (نوح) بە کڕنووشەوە ڕوودەکاتە بارەگای پەروەردگاری میهرەبان و نزا دەکات تاکو خۆی (واتا خوای گەورە) چارەنووسی ئەو گەلە یەك لایی بکاتەوە، جا ئەگەر بڕیاری وایە کە سزایان بدات (نوح) داوا دەکات کە باوەڕداران لەو سزایە پارێزراو بن، دیارە خوای گەورە نزای پێغەمبەران ڕەت ناکاتەوە، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا لەو بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ نَادَانَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ الْمُجِيبُونَ﴾[٢٧]، واتا نوح بانگی لێ کردین و لێمان پاڕایەوە، ئێمەش باشترین وەڵامدەرەوەین بۆی ئیتر خۆی و شوێن کەوتوانیمان لەو کارەسات و تەنگانە گەورەیە ڕزگار کرد . هەروەها لەچەند سورەتێکی تری قورئاندا بەشێوەی تر باسی نزاکەی (نوح) هاتووە، وەك

---

[٢٦] سورەتی هود / ٣٦ – ٣٧ .

[٢٧] سورەتی الصافات / ٧٥ .

دەفەرموێت: (((نوح)یش پێشتر بانگی لێکردین و وەڵامی داخوازیەکەیمان دایەوەو خۆی و شوێنکەوتوانیمان لەو تەنگانە گەورەیە ڕزگار کرد)) [٢٨]، هەروەها فەرمووی: (گەلەکەم بەدرۆم دەکەنەوە، خوایە لەنێوان من و ئەواندا سەرکەوتنێك ئەنجام بدە و تیایدا من و ئەو باوەڕدارانەی لەگەڵمدان ڕزگار بکە) [٢٩]، (نوح لە پەروەردگاری خۆی پاڕایەوەو فەرمووی من ژێرکەوتەم و خۆت سەرکەوتوم بکە) [٣٠]، خوای گەورەش وەڵامیدایەوە و فەرمووی: ﴿مِمَّا خَطِيئَاتِهِمْ أُغْرِقُوا فَأُدْخِلُوا نَاراً فَلَمْ يَجِدُوا لَهُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْصَاراً﴾[٣١]، واتە: بەهۆی هەڵە و تاوانەکانیانەوە نقوم بوون لەدنیادا لەئاودا و پاشان لەقیامەتدا خرانە دۆزەخەوەو جگە لەخوای گەورەش کەسی تر بەهانایانەوە نایات و پشتیوانیان لێناکات لە هەردوو دنیادا .

## دروست کردنی کەشتییەکە

کاتێك ئەوان تاوان و گوناهیان لەسەر خۆیان کەڵەکە کرد، ئیترخوای گەورە فەرمانی بە (نوح) کرد کەشتیەك دروست بکات، کەشتیەك کە زۆر گەورە بێت و نموونەی نەبووبێت نەلەوەوپێش و نەلەوەوپاش، خوا ئاگاداری (نوح)یشی کردەوە کە سزایەکی گەورە بۆ ئەو گەلە ستەمکارە بەڕێوەیە و ڕەت بوونەوەشی نیە، لەوانەیە خەڵکەکەش لەکاتی ڕوودانی سزاو تەنگانەکەدا پەنا و هاناتان بۆ بهێنن، بەڵام نابێت وەڵامیان بدەنەوە و داڵدەیان بدەن وچارەنووسیان نقوم بوونە بەگشتی هەروەکو فەرمووی:
﴿وَلَا تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُوا إِنَّهُمْ مُغْرَقُونَ﴾[٣٢]. (نوح) و باوەڕداران دەستیان کرد بە جێبەجێ کردنی فەرمانی خوای گەورە لە دروست کردنی کەشتیەکەدا، هەروەکو پێشووتریش هەموو فەرمانەکانی خوایان جێبەجێ کردووە، لەو دەمانەدا ئەوان سەرقاڵی دروست کردنی کەشتێکەبوون، گروپ گروپ بێبڕوایان بەلایاندا تێپەڕ دەبوون و بەگاڵتە جاڕیەوە تەوسیان لێدەدان و پێیان پێدەکەنین ﴿وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِنْ قَوْمِهِ سَخِرُوا مِنْهُ﴾، بەڵام (نوح)یش بەوانی فەرموو:﴿فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَنْ يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُقِيمٌ﴾ [٣٣]، واتا: کە ئێوە

---

[٢٨] سورەتی الانبیاء / ٧٦ .
[٢٩] سورەتی الشعراء / ١١٧ .
[٣٠] سورەتی القمر / ١٠ .
[٣١] سورەتی نوح / ٢٥ .
[٣٢] سورەتی هود / ٣٧ .
[٣٣] سورەتی هود / ٣٨ .

پێکەنینتان پێمان دەهات و گاڵتەتان پێدەکردین، ئێمەش گاڵتەمان پێتان دێت، و بەگەوجتان دەزانین، بگرە ئێمە زیاتر گاڵتەمان بە عەقڵتان دێت کە هێندە کەللەڕەق و ئینکارن بەرانبەر بەپەیامی خواو ئەو سزایەی کە بەڕێوەیە بۆتان ﴿فَسَوفَ تَعلَمُونَ مَن يَأتِيهِ عَذَابٌ يُخزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيهِ عَذَابٌ مُقِيمٌ﴾[34]، واتا لەمەولا دەزانن سزای ریسواکەر بۆ کێیە و کێ ئەو سزایەی بەسەردا دەچەسپێ !! .

نکوڵی و کەللەڕەقی ئەو گەلە بێسنوور بووە، تەنانەت لە سنووری دنیاش تێپەڕی کردووە بۆ سنووری قیامەت، چونکە ئەوان لە ڕۆژی دواییشدا هەروەکو دنیا کەللە ڕەقی و نکوڵی و سەرسەختی دەنوێنن و دان بەوەدا نانێن کە پێغەمبەریان لەلایەن خواوە بۆ ڕەوانەکراوە لەدنیادا، هەروەکو (أبی سعید) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (لە ڕۆژی قیامەتدا نوح و گەلەکەی دەهێنرێن و خوای گەورە دەفەرموێت: ئەی نوح ئایا ئەوەی پێم ڕاسپاردیت لەدانیادا گەیاندت؟ (نوح)یش دەفەرموێت: بەڵێ پەروەردگارم، ئینجا خوای گەورە بە گەلەکەی دەفەرموێت: ئایا پەیامی منت پێ گەیاندن (لەدنیادا)؟ دەڵێن: نا، هیچ پێغەمبەرێك نەهاتوەتە سەرمان !! دەفەرموێ: کێ شایەتیت بۆمنی دەدات؟ نوح دەفەرموێت: موحەمەد و گەلەکەی، ئیتر ئێمە لەوێدا شایەتی دەدەین کە بەڵێ پەیامی خوای بەباشی گەیاندوەتە گەلەکەی [35]، ئەوەیە کە خوای گەورە دەربارەی گەل و ئوممەتی موحەمەد (ﷺ) دەفەرموێت:

﴿وَكَذَلِكَ جَعَلنَاكُم أُمَّةً وَسَطاً لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيكُم شَهِيداً﴾[36]، واتا: ئاوا ئێوەمان کردۆتە نەوەیەکی ناوەندخواز تاکو ببنە شایەت بەسەر خەڵکیەوە، پێغەمبەریش بەسەر خۆتانەوە شایەتە .

میانگیری ناوەندیاری دادپەروەرانە خەسڵەتی ئومەتی ئیسلامە، ئەم ئومەتەی خۆمان شایەتی لەسەر ئەوە دەدات کە پێغەمبەرەکەی خۆمان ڕاستگۆ و ڕەوانەکراوە لەلایەن خواوە و هەروەها شایەتی لەسەر پێغەمبەرێتی (نوح)یش دەدات و شایەتی لەسەر ئەوەش دەدات کە نوح لەسەر هەق بووە هەروا بەو هەقخوازەیەش فەرمانی ڕاگەیاندووەو بەباشترین شێوەو بەبێ کەموکوڕی پەیامی خوای بە گەلەکەی ڕاگەیاندووە، تەنانەت هیچ شتێکی فەرامۆش نەکردووە کە بەسوود بوبێت بۆ گەلەکەی وهیچ شتێکی

---

[34] سورەتی هود / ٣٩ .

[35] صحيح البخاري (٦٠/٢/٣٣٣٩ فتح) .

[36] سورەتی البقرە / ١٤٣ .

فەرامۆش نەكردووە بۆ گەلەكەی مەترسیدار بووبێ و ئەوانی لێ ئاگادار نەكردبێتەوە .
ئەوەش سروشتی كاری هەموو پێغەمبەران بووە، تەنانەت (نوح) (علیه السلام)گەلەكەی خۆی لەمەترسی (دەججال)یش ئاگادار كردۆتەوە ئەگەر چی چاوەڕوانی ئەوە نەكراوە لە سەردەمی ئەودا بێت . (ابن عمر) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) لەناو خەڵكەكەدا هەستایە سەرپێ و ستایشی پەروەردگاری كرد و ئینجا باسی (دەجال)ی كرد و فەرمووی: (من ئێوە هۆشیار دەكەمەوە لەهاتنی دەجال و هیچ پێغەمبەرێكیش نەبووە كە گەلەكەی خۆی لەوە هۆشیار نەكردبێتەوە) (نوح)یش گەلەكەی خۆی لێ هۆشیار كردنەوە، بەڵام من شتێك دەربارەی دەجال بە ئێوە ڕادەگەیەنم كە هیچ پێغەمبەرێك پێش من بە گەلەكەی خۆی ڕانەگەیاندووە، دەجال یەك چاوی هەیە، خوای گەورە وانیەو یەك چاو نیە) [٣٧] .
هەندێ لە زانا پێشینەكان فەرموویانە: كاتێك خوای گەورە وەڵامی نزاكەی (نوح)ی دایەوەو لێی وەرگرت، ئینجا فەرمانیشی پێكرد كە درەختێك بنێژێت تاكو ئەو دارە پێبگات و لەتەختەكەی كەشتی دروست بكات، ئیتر دارەكەی ڕواند و سەد ساڵ چاوەڕوانی كرد تاكو پێگەیشت، ئینجا لەماوەی سەد ساڵی تردا یان چل ساڵی تردا كردی بەتەختە، وا باس دەكرێت دارەكە داری ساج یان سنەوبەر بووە، وەك لەتەورات دا هاتووە، (ثوري) دەفەرموێت: وا فەرمان بەنوح كرا كە پارچە تەختەكان بەدرێژی هەشتا باڵ ببڕێت و پشت و ڕووی تەختەكان بەقیر ڕوپۆش بكات و سنگی كەشتیەكە تیژو قۆقزی دروست بكات تاكو بتوانێت ئاوەكە ببڕێت .

قتادە دەفەرموێت: درێژی كەشتیەكە سێسەد باڵ بووە وەك لە تەوراتدا بینراوە، حەسەنی بەصریش فەرموویەتی: شەش سەد باڵ و پانیەكەیشی سێ سەد باڵ بووە، بەڵام (ابن عباس) فەرموویەتی: هەزار و دووسەد باڵ درێژی و شەش سەد باڵ پان بووە، هەروەها ووتراوە: درێژیەكەی دووهەزار باڵ و پانیەكەی سەد باڵ بووە، هەمووشیان فەرموویانە: كە بەرزییەكەی سی باڵ بووەو سێ نهۆم بووە كە هەریەكە لەو نهۆمانە دە باڵ بەرز بووە، نهۆمی خوارەوە بۆ ئاژەڵ و دڕندەكان بوە، نهۆمی ناوەڕاست بۆ مرۆڤەكان و نهۆمی سەرەوەش بۆ باڵندەكان بووە، دەرگاكەیشی لەسەر باری پانیەكەی بووە، كە سەرقەپاخێكی هەبووەو پاشكۆڵیشی هەبووە، هەرچۆنێك بووبێت دروست كردنی كەشتیەكە بەفەرمانی و ڕێنومایی و چاودێری پەروەردگار بووە، كەواتە بەشێوەیەك بووە

---

[٣٧] صحیح البخاری (٧١٢٧/٢٦/٩٢ فتح) .

که زۆر چاك شیاو بووه لەگەڵ بەرگەگرتنی ئەو لافاوە جیهانیە گەورەیە کە ئاو لە زەوییەوەو لەئاسمانەوە باریوە، گیانداران و دڕندەو باڵندەو مرۆڤەکانیش پێویستیان بە چەندین پێداویستی و سنورو پاراستن و ڕاهێنان هەبووە، بەکورتی کەشتیەکە شارێکی تەواوبووە، بە هەموو پێداویستیەکانیەوە .

ئینجا خوای گەورە فەرمووی ﴿فَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِ أَنِ اصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَاءَ أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ فَاسْلُكْ فِيهَا مِنْ كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَنْ سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ مِنْهُمْ وَلَا تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُوا إِنَّهُمْ مُغْرَقُونَ﴾ [٣٨]، واتا: کاتێك فەرمانی ئێمە دەکرێت بۆ سزادانی ئەو گەلە و تەنوریان کڵپەدرا (واتا دەست کرا بە سزادانیان بە داباریني ئاو بەسەریانادا و لەژێر پێیانەوە فوارەی کرد) ئەوسا تۆش لەهەر گیانەوەرێك جووتێکی نێرومێ بکەرە ناو کەشتیەکەتەوە لەگەڵ خێزانەکەتدا مەگەر ئەوانەیان نەبێ کەسزا دەیانگرێتەوە، دەربارەی ستەم کارانیش لەگەڵم مەدوێ، واتا: تکایان بۆ مەکە و بەزەییت بۆیان نەجوڵێ، چونکە ئەوانە ستەمکارن و دەبێ نقوم ببن . ووشەی (التنور) لەو ئایەتەدا چەند مانایەك هەڵدەگرێت، جمهوری زانایان لەگەڵ ئەوەدان کە مانای (ڕووی زەوی) دەگرێتەوە، واتا ڕووی زەوی بەگشتی والێدەکەین کە بۆ ئەوان وەك ئەوە وابێت بکەونە ناو تەنوری ئاگرەوە ئەگەر چی بەڕووکار لەئاودا دەخنکێن، بەلاّم لە ڕاستیدا چارەنووسیان بۆ ناو ئاگری دۆزەخە کە وەك تەنور وایە، بەلاّم (ابن عباس) دەفەرموێت:

(التنور) ناوی سەرچاوە ئاوێکی هەمیشە هەڵقوڵاّوە لە هندستان، کەواتە خوای گەورە هەموو زەوییان لێدەکات بە سەرچاوە ئاوی هەمیشە هەڵقوڵاّوی، وەك سەرچاوەی (التنور)ی هیندستان، (شیعەبی) دەفەرموێت: ئەو سەرچاوە ئاوەی کە ناوی (التنور)ە لە (کوفە)یە، (قتادە)ش پێی وایە لە (جزیرە)یە، لەهەمووی زیاتر جێگای سەرسامییە کە (عەلی کوڕی أبی طالب) لێکدانەوەیەکی تایبەتی بۆی هەیە و فەرموویەتی: (التنور) واتا: (فلق الصبح وتنویر الفجر)، دەرکەوتنی بەرەبەیان و ڕۆشن بوونەوەی سپێدە، مەبەستی لەدەرکەوتن و پەخشان بوونی خۆرەتاوە، واتا: ئەی نوح سپێدەزوو لەگەڵ خۆرهەلاّتن و تاریك و ڕوونی بەرەبەیاندا ئەو شتانەی کە پێمان گوتویت سواری کەشتیەکەت بکە، کورتیەکەی ئەوەیە حەزرەتی نوح (علیه السلام)لەوە بەباشی تێگەیشتووەو جێبەجێی کردووە .

---

[٣٨] سورەتی المؤمنون / ٢٦ — ٢٧ .

## ناوەڕۆکی کەشتیەکە

بە پێی ئایەتەکەی پێشووتر، وا فەرمان بە (نوح) (علیه السلام)کراوە کە لەهەر جووتە گیاندارێك جوتێکی (نێر و مێ) بکاتە کەشتیەکەوە، واتا نێرەیەك و مێیەیەك، بەلاَم (اهل الکتاب) دەڵێن: وا فەرمانی پێکراوە کە حەوت جووت لەو گیاندارانەی تێبکات کە گۆشتیان دەخورێت و یەك جووت لەوانەی کە گۆشتیان ناخورێت . دیارە ئەوەی ئەوان ناگونجێ لەگەڵ وشەی (اثنین) کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە و بەمانای (دوو) یان (یەك جووت) دێت، ئیتر لەئایەتەکەدا (اثنین) بریتی بێ لە (مفعول به) یان (تأکید) بێت بۆ (زوجین)، جیاوازی هەیە .

هەندێك لە (ابن عباس)ەوە گێڕاویانەتەوە کە یەکەم گیاندار کە خرایە کەشتیەکەوە جۆرە باڵندەیەکی تووتی دەنگ خۆش بووە کە ناوی (درە)یە و دوایین گیانداریش گوێدەرێژ بووە، شەیتانیش خۆی بەکلکی گوێدرێژەکەوە هەڵواسیبوو، زانایان دەربارەی ژمارەی ئەو کەسانەی لە گەشتیەکەدابوون و ڕزگاربوون رای جیاوازیان هەیە بەلاَم ئەوە شتێکی بەڵگە نەویستە کە ژمارەی مرۆڤەکان کەم بووە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلَّا قَلِيلٌ﴾، (نوح) (علیه السلام)دەبوایە تەنها باوەڕداران سوار کەشتیەکە بکات و خزم و ناسیاوان مافی ئەوەیان نەبووە، ئەگەر باوەڕدار نەبووبێتن، تەنانەت (یام)ی کوڕی (نوح)یش چونکە باوەڕدار نەبوو، نقوم بوو و خنکا .

دەربارەی ژمارەکە گەلێ ڕاوبۆچوون هەیە، (ابن عباس) فەرموویەتی کە بە ژن و پیاوەوە هەشتا کەس بوون، بەلاَم (کعب الاحبار) دەڵێت: حەوفتاو دوو کەس بوون،

گوتراوە (دە) کەس بوون، یان بریتیبوون لە (نوح)و سێ کوڕەکەی و چوار کوڕەزاکەی بوون کە لە (یام)ی کوڕیبوون و باوکیان لەبەر بێ بڕوایەکەی مافی سەرکەوتنی نەبوو، خنکا دووبارە گوتراوە هەموو کەسەکان تەنها حەوت کەس بوون .

ژنەکەی نوح کە چەند کوڕێکی هەبوو خنکاو لە بێباوەڕان بوو، کوڕانی نوحیش بریتیبوون لە حام و سام و یافث و یام کە لەلای (اهل الکتاب) بە (کەنعان) ناسراوە ونقوم بووەو (عابر)ی کوری (نوح)یش پێش لافاوەکە کۆچی دوایی کردووە . (اهل الکتاب) پێیان وایە کە ژنەکەی نوحیش لەگەڵیاندا سواری کەشتیەکە کراوە و ڕەنگە دواتر بێبڕوایی خۆی دەربڕیبێت، یاخود سزاکەی دواخراوە بۆ ڕۆژی قیامەت، بەلاَم خۆی ڕوکاری ئاشکرای ئایەتەکە دەری دەخات کەهیچ بێباوەڕێك دەرباز نەبووە، چونکە خوای

گەورە نزاکەی (نوح)ی بە تەواوی وەرگرت کە فەرمووی ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا﴾[٣٩]، واتا: خوایەگیان هیچ کەسێك لە بێباوەڕان لەسەر زەویدا مەهێڵەوە و بن بڕیان بکە، ئیتر چۆن (نوح) ژنەکەی خۆی سواری کەشتیەکە دەکات لەکاتێکدا خۆی چاکتر ناسیویەتی کە بێبڕوابوو ؟ ئەمە وێڕای ئەوەی کە خوای گەورە نوحی ئاگادار کردوەتەوە کە بەهیچ جۆرێ نابێت بەزەییت بەهیچ کەسێکی بێ بڕوادا بێتەوە لەکاتی دابەزینی سزاکەدا . ئینجا کاتی ئەوە هات کە سزاکە نزیك بێتەوە، لەبەرئەوە خوای گەورە ئەدەبی سواربوونی کەشتیەکەی فێری (نوح) کرد لەگەڵ چەند دوعا و نزایەکی جوان دا فەرمووی: ﴿فَإِذَا اسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى الْفُلْكِ فَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي نَجَّانَا مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ، وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِي مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ الْمُنزِلِينَ﴾[٤٠]، واتا: کاتێك خۆت و هاوەڵانت لەسەر کەشتیەکە نیشتەجێبوون، بڵێ سوپاس بۆ ئەو خوایەی لەدەست ستەمکاران ڕزگاری کردین، وە پەروەردگارم لەشوێنێکی پیرۆزدا بمگیرسێنەوەو دامبەزێنە، بەڕاستی هەرتۆی کە لە باشترین شوێندا دامانددەبەزێنی .

خوای گەورە فەرمانی پێکرد کە سوپاسی خوا بکات لەسەر پێدانی ئەو ژیریيەی کەکەشتی دروست بکات، و کەشتیەکە لەسەر ئاو سەراوبێت و نقوم نەبێت و زاڵی بکات و سەربخات بەسەر ستەمکاران و بێبڕوایاندا و وردبوونەوەیەك بکات لە بەراوردی خۆی و چارەنووسی خراپکاراندا، کە چۆن خوای گەورە بەزەیی بە ئەماندا هاتووەتەوەو بێبڕوایانیشی ڕیسواکردو لەناوی بردن ﴿إِذَا اسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ﴾[٤١]، وە فەرمانی پێکردن کە بەناوی خواوە سەربکەونە سەر کەشتیەکە و دابەزنەوە، واتا بەناوی خواوە و بەپشت بەستن بە ئەو سەربکەون و هەمیشە ناوی ئەو خوایە بەرن تەنانەت لەدابەزینیشدا، چونکە هەر ئەو خاوەن لێبوردن و بەزەییە و ئەگەر بیەوێ سزاش بنێرێ سزای زۆر توند هەر لەلای ئەوە و گەڕانەوەی سزاش لەسەر ستەمکاران نیە ئەگەر خۆی بیەوێت درێژەی هەبێت ﴿وَقَالَ ارْكَبُوا فِيهَا بِسْمِ اللَّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ [٤٢] .

---

[٣٩] سورەتی نوح / ٢٦ .

[٤٠] سورەتی المؤمنون / ٢٨ .

[٤١] سورەتی الزخرف / ١٣ .

[٤٢] سورەتی هود / ٤١ .

ئیتر خوای گەورە دەرك و دەروازەكانی ئاسمانی والآ كرد وەكو مەشكەی سەروبن باران و دادەباری، بارانێكی درێژخایەنی چڕوپڕ و ترسناك تەنانەت نەك زەوی باراناوەكەی هەڵنەدەمژی بەڵكو زەویش هەر ئاوی لیّ هەڵدەقولآ، كەواتە زەوی ببووە چینێكی وشك لەسەرەوەو خوارەوە ئاو دایدەپۆشی و گەیشتە ئەو ئاستەی كە ئاوو لافاوەكە هەموو زەوی گرتەوەو گۆی زەوی بوو بەیەك دەریای زۆر گەورە. شەپۆلەكانی هێندەی شاخ و كێوەكان بەرزبوون هیچ زیندەوەرێك نەما، هەموویان خنكان جگە لەوانەی كە لەناو كەشتیەكەدا بوون، كەشتیەكەش هەر خوای گەورە خۆی چاودێری دەكرد و لەم دەریا بەرین و بێبن و قوڕاوەدا دەیهێناو دەیبرد، بەبێئەوەی وەربگەڕێت و نقوم بێت، هەروەكو خوای گەورە بەم جۆرە ڕووداوەكە لە قورئاندا باس دەكات و دەفەرموێت: ﴿فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاءِ بِمَاءٍ مُنْهَمِرٍ وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا فَالْتَقَى الْمَاءُ عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ وَحَمَلْنَاهُ عَلَى ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ﴾[٤٣].

## لافاوە گەورەكە

(ابن جریر) و هەندێكی تر وا باس دەكەن كە لافاوەكە لە ڕۆژی سیازدەهەمی مانگی ئاب دا دەستی پێكرد، واتا سەرەتای باران بارینەكە، هەندێك لە ڕاڤەكارانی قورئان فەرموویانە: ئاو بە بەرزایی پازدە باڵ لەسەرووی بەرزترین لوتكە شاخی سەر زەویەوە بوو، (أهل الكتاب)یش هەروا دەڵێن، گوتراوە هەشتا باڵ بووە لە سەروو بەرزترین لوتكە شاخی سەرزەوییەوە، بەدرێژی و پانی هەموو زەوی گرتوەتەوە، بەشاخ و دەشت ووشكانی و دەریا و لم و خۆڵ و دارستانیەوە، ئیتر زیندەوەر لەسەر زەویدا نەما كە نقوم نەبووبێت بەگەورەو بچوكەوە . لە (زیدی كوری ئەسلەم)ەوە دەگێڕنەوە كە خەڵكی ئەو كاتە ژمارەیان زۆر زۆر بووە، دەشت و دەری زەوی پڕبووە لەخەڵك و پەڵەیەك لەزەویدا نەبووە كە خاوەنی خۆی نەبووبێت . لەگەڵ بەرزبوونەوەی ئاستی ئاودا زیاتر مەترسی خەڵكی زیادی كرد و هەوڵی خۆ دەربازكردنیان دەدا و بەرەو بەرزاییەكانی زەوی و شاخەكان دەچوون و ڕایان دەكرد، بەلآم لەگەڵ خێرایی ئەواندا ئاوەكەش زیاتر لێیان نزیك دەبووەوە، ئیتر بەتكا و پاڕانەوە هانایان دەهێنا بۆ كەشتیەكەی نوح، ئەو كەشتیە كە ئەوان گاڵتەیان بەنوح دەكرد كە خەریكی دروستكردنی بوو لە وشكاییدا .

---

[٤٣] سورەتی القمر /

﴿وَنَادَي نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يا بُنَيَّ ارْكَبْ مَعَنَا وَلا تَكُنْ مَعَ الْكَافِرِينَ ، قَالَ سَآوِي إِلي جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاءِ قَالَ لا عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِلَّا مَنْ رَحِم وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ﴾[44] **واتا: ئەو دەمەی کە هێشتا لافاوەکە بەتەواوی مەترسی پەیدا نەکردبوو، نوح بانگی کوڕەکەی خۆی کرد کە لە پەنایەکدا بوو کوڕم لەگەڵماندا سەربکەوە واتا: باوەڕ بێنە و سەربکەوە لەگەڵ بێباوەڕان مەبە، کوڕەکەی گوتی: دەچمە سەر کێوێك و لەلافاو ڕزگارم دەبێت، باوکی فەرمووی: ئەمڕۆ ڕزگاربوون نیە لەو سزایەی کەخوا دایناوە مەگەر بۆ کەسێك کە خۆی بەزەیی پێدابێتەوە، ئیتر شەپۆلێکی ئاو کەوتە نێوانیانەوەو لەیەك دابڕان و سەرەنجام کوڕەکەیشی نقوم بوو . ئەو کوڕەش کەپاش گفتوگۆ لەگەڵ باوکیدا شەپۆلی لافاوەکە بردی و خنکا ناوی (یام)بوو کە برای (سام) و (حام) و (یافث) بوو، گوتراوە ناوی (کنعان)بووە، بەهەرحاڵ ئەم کوڕەی بێباوەڕ بووەو کاری چاکی نەکرد، بەرهەڵستی باوکی دەکرد لە ئاینیەکەیدا، لەبەرئەوە خنکا، لەکاتێکدا کوڕی (نوح)یش بوو، بەڵام خەڵکانێکی تر ئەگەر چی بێگانەش بوون بەڵام ڕزگاریان بوو، کەواتە سزا و پاداشتی خوایی پەیوەندی بە باوەڕو کردار و گفتاری خودی مرۆڤ خۆیەوە هەیە و کوڕی فلأن و کچی فلأن حسابی بۆ ناکرێت، پێوەری هەڵسەنگاندن لەلای خوای گەورە تەنها باوەڕ و کرداری ناو دڵی خۆتە و (هەمزە و هەباس) لای خوای گەورە ناخوێنرێتەوە [45] .**

## کۆتایی لافاوەکە

**لافاوەکە جگە لەخەڵکی ناو کەشتیەکە هەموویانی لەناو برد، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە کە کۆتایی بێت، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ وَيَا سَمَاءُ أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاءُ وَقُضِيَ الْأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَي الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْداً لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾[46].

**واتا: وترا ئەی زەوی ئاوەکەت هەڵبمژەرەوە، ئەی ئاسمان تۆش لەباران بارین بوەستەو ئاوەکە دابەزیەوە بۆ ئاستی سروشتی خۆی و کارەکە لێرەدا تەواوبوو، کەشتیەکەش لەسەر جودی ئارامی گرت و وترا: دووربن لە بەزەیی خوا ئەی گەلێك کە ستەمکارن .**

---

[44] سورەتی هود / ٤٢ .

[45] هەروەکو لە عەرەبیدا دەگوترێ (زەید و عەمر) لە کوردیش دا گوتراوە (هەمزەو هەباس) / وەرگێر.

[46] سورەتی هود / ٤٣ .

واتا: بەزمانی تەوانایی خواوە بانگەواز بەسەر ئەو گەلە لەناوچووەدا ڕاگەیەنرا وەك نزایەکی وەرگیراو کە بگوترێ دەك دووربن لەمیهر و بەزەیی خوایی ئەو گەل و خەڵکە کەللەڕەقەی کە ملیان بۆ خواناسی و بەندایەتی نەداو ستەمیان لەخودی خۆیان کرد و دۆزەخیان بەخۆیان ڕەوابینی . هەروەها لەم چەند شوێنەی تریشدا خوای گەورە باسی نقوم بوونی ئەو خەڵکە دەکات و لەهەمووشیاندا هۆیەکەی گەڕاوەتەوە بۆ سەرکەشی و نادانی و بێبڕواییان بەخوای گەورە و بە درۆخستنەوەی (نوح)ی پێغەمبەریان و ئازاردانی ستەمکارانەیان .

| ناوی سورەت | ژمارەی ئایەت |
| --- | --- |
| سورەتی الاعراف | ٦٤ |
| سورەتی یونس | ٧٣ |
| سورەتی الانبیاو | ٧٧ |
| سورەتی الشعراو | ١١٩ بۆ ١٢٢، |
| سورەتی العنکبوت | ١٥ |
| سورەتی القمر | ١٥ — ١٧ |

بۆ واتای ئەم ئایەتانەت بەزمانی شیرینی کوردی دەتوانیت سوود وەربگریت لە (تەفسیری ئاسان) نووسینی: مامۆستا برهان محمد أمین .

لە (عائشە)ەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر خوای گەورە بەزەیی بەتەنها یەك کەسی لەگەلی نوح دا بهایەتایەوە، ئەوا ئەو کەسە دایکی منالە ساواکە دەبوو) . هەروەها پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) فەرموویەتی: (نوح) هەزا ساڵ پەنجا کەم لەناو گەلەکەیدا مایەوە، ماوەی سەد ساڵ داری ناشت، دارەکان گەورەبوون و پەل و پۆیان بە هەموولادا هاویشت، ئینجا دارەکانی بڕی و کەشتی لێدروست کرد، ئەوان (بێ باوەڕانی گەلەکەی) بەلایدا ڕەت دەبوون و گاڵتەیان پێدەکرد و دەیانگوت: ئەوە کەشتی لە وشکاییەدا دروست دەکەیت، واتا: بۆ وشکایی بەکاری دەهێنیت؟ ئەی چۆن دەڕوات؟ ئەویش دەیفەرموو: لەداهاتوودا دەزانن! کاتێك ئاو لەزەویشەوە دەستی بە هەڵقولآن کرد دایکی منالەکە، کە مندالەکەی زۆر خۆش دەویست بەرزی کردەوە بۆسەر شاخێك، تا ئاوەکە گەیشتە سێیەکی لەشی، دیسان لەئاوەکە دەریهێنایەوە و گەیاندیە سەر لوتکەی شاخەکە، ئیتر لەسەر سنگی داینا، دیسان ئاوەکە زیاتر بەرزبوەوە ئیتر دایکە خۆی لەئاوەکەدا نقوم ببوو، بەلآم هەردوو دەستی بەرزکردبوە و منالەکەی بەرزکردبوەوە،

ئاوەکە زیاتر بەرزبوەوەو منالّەکەش خنکا، جا ئەگەر خوای گەورە لەو ڕووداوەدا بەزەیی بەتەنها کەسێکدا بهاتایەتەوە ئەوا ئەو کەسە دایکی ئەو منالّە دەبوو، واتا خۆی و منالّەکەی ڕزگار دەکرد .

لەمەوە تێدەگەین کە بڕیاری خوای گەورە وابووە دەبێ هەموو بێبڕواکان لەناو بچن، ئیتر نازانم چۆن هەندێ کەس گومانیان وایە کە (عوج)ی کوڕی (عەنق)[٤٧] لەو لافاوە ڕزگاری بووە، کەگوایە بێ بڕواش بووە و لە سەردەمی پێش (نوح)ەوە ژیاوە تا سەردەمی موسا، لەکاتێکدا واباوە کە ئەو عەوجە زۆڵ بوە، بەلاّم بالاّی بە ڕادەیەك درێژ بووە کە لە دەریا ماسی دەرهێناوە هەر بەدەستی خۆی، هێندە درێژ بووە سێبەرەکەی بەری خۆری گرتووە، دەڵێن گوایە بە نوحی گوتوە: ئەوە چ چیرۆکێکت بەسەردا هاتووە، واتا: بەسەرت هات بگرە گاڵتەی بە نوح کردووە! دەڵێن: درێژیەکەی سێهەزار و سێسەد و سی و سێ باڵ و سێیەکی باڵێك بووە، بەلاّم ئەمە تەنها ئەفسانەیەکی دروست کراوە وشتی وا لەگەڵ عەقڵ و دەق دا ناگونجێ، خوای گەورە جگە لە باوەڕداران و سەرنشینەکانی کەشتیەکە نەك هەر بێ بڕواکان بەڵکو هەموو گیانداریشی لەناو برد، خوای گەورە کوڕی (نوح)یشی خنکاند چونکە بێباوەڕ بوو، ئیتر بێژیەکی بێباوەڕ و گاڵتەجاڕ چۆن ڕزگار دەکات ؟! .

خوای گەورە نزا وەرگیراوەکەی (نوح)ی لە قورئاندا بەدەق هێناوەتەوە کە فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَبِّ لا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّاراً﴾[٤٨]، واتا: پەروەردگارا داوات لێدەکەم کە هیچ کەسێك لە بێبڕوایان لەسەر زەویدا مەهێڵەوە و بن بڕیان بکە، جگە لەمەش لە هەردووك (صحیح)ی (مسلم و بخاری)دا هاتووە کە پێغەمبەرمان حەزرەتی (محمد) فەرموویەتی: (کاتێك خوای گەورە ئادەمی دروست کرد، درێژی ئادەم شەست باڵ بوو، لەو کاتەوە تا ئێستا درێژی ئادەمیزادەکان هەر لە کەم بوونەوەدا بووە . کەواتە: درێژترین مرۆڤ ئادەم بووە (علیه السلام)و هیچ کەسێکی تر نەبووە کە لەو درێژتر بووبێت، پێم وایە ئەو ئەفسانە هەڵبەستراوەی دەربارەی عەوجی کوڕی عەناق لە ئارادابووە و هەڵبەستراوو دەستکردی بێبڕوایانە . بەسەرهاتنەکەی (نوح) و لافاوە گەورەکە لەچەند سورەتێکی قورئانی پیرۆزدا باس کراوە، هەروەها باسی گفتوگۆی نێوان (نوح) و

---

[٤٧] لەناو کوردەواریدا وا باوە کە ئەگەر کەسێك زۆر باریك ودرێژبێ پێی دەڵێن: فلان کەس دەڵێی عوجی بنی عەلەقە/وەرگێر.

[٤٨] سورەتی نوح / ٢٦ .

کوڕەکەی کراوە کە سەرئجام کوڕەکەی نقوم بوو، پرسینەوەی (نوح) (علیه السلام)لە کوڕەکەی و هۆکاری نقومبوونەکەی لەخوای گەورە لە ڕووی هۆزانینەوە بووە نەك لەڕووی ناڕەزایی بوون بەبەشی خوای گەورە، وەك ئەوە وایە کە (نوح) پرسیاری کردبێت لە خوای گەورە کە: ئەی خوایە تۆ پەیمانت پێدام کە خێزانەکەم ڕزگار بکەیت، کەچی کوڕەکەم نقوم بوو؟ خوای گەورە وەڵامی دایەوەو فەرمووی: ئەو کوڕە لە کەس و کاری تۆ نیە، ئەگەر لەکەس و کاری تۆ بێت، ئەوا ئێمە پێمان وتوویت کە ﴿إِلَّا مَنْ سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ مِنْهُمْ﴾[49]، واتا: ئەوانەی خێزانەکەت نایانگرێتەوە کەپێشتر لەگەڵتانەبوون و باوەڕیان نەهێنابوو . پاش وەستانەوەی باران و لافاوەکە کە خوای گەورە فەرمووی بەنوح:

﴿قِيلَ يَا نُوحُ اهْبِطْ بِسَلَامٍ مِنَّا وَبَرَكَاتٍ عَلَيْكَ وَعَلَى أُمَمٍ مِمَّنْ مَعَكَ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُمْ مِنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[50]، ئەم ئایەتەی خوای گەورە باس لە فەرمانی خوای گەورە دەکات بۆئەوەی کە (نوح) و سەرنشینەکانی لەسەر زەوی دابەزن لەسەر شاخی جودی، کە ناسراوە بەشاخی ﴿سَلَامٍ مِنَّا وَبَرَكَاتٍ﴾[51]، واتا: بە سەلامەتی دابەزن و پیرۆزتان بێت ئەو سەرکەوتنەتان بەسەر ستەمکاران و بێبڕوایاندا، لەخۆت پیرۆزبێ لەگەڵ ئەو منداڵ و بەروبەرەچەو گەلانەی کە لەمەودوا لەتۆ دەکەونەوە . لەناو هەموو پێغەمبەراندا (ﷺ) تەنها حەزرەتی (نوح) ئەو بەخشیشەی پێ بەخشی کە ببێتە باوکی دووەمی ئادەمیزادەکان و مرۆڤەکان لەسەر زەوی، تەنها بەروبەرەچەی ئەویش لەلایەن خواوە پارێزران و هێشترانەوە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ الْبَاقِينَ﴾، سەرجەم ئادەمیزادەکانی بن و بنەچەیان دەگەڕێنەوە بۆ کوڕەکانی (نوح) (علیه السلام)کە بریتین لە (سام) و (حام) و (یافث) . پێشەوا أحمد فەرموودەیەکی پێغەمبەری (ﷺ) هێناوە کە دەفەرموێت: (سام باوکی عەرەبە،حام باوکی حەبەشیەکانە، یافث باوکی ڕۆمەکانە)[52]،مەبەست لە ڕۆمە بەراییەکانە کە یۆنانیە دێرینەکان دەگرێتەوە و دەچنەوە سەر ڕۆمی کوڕی (لبطي) کوڕی (یۆنان)ی کوڕی (یافث)ی کوڕی (نوح)(علیه السلام).

لە (سعید)ی کوڕی (مسیب)ەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: (نوح سێ کوڕی هەبووە، سام و یافث و حام، هەریەکە لەم سێ کوڕەش سێ کوڕیان

---

[49] سورەتی المؤمنون / ٣٧ .

[50] سورەتی هود / ٤٨ .

[51] سورەتی الصافات / ٧٧ .

[52] مسند الامام احمد (٨/٥/حلبی) وە تأریخ الطبري (٢٠٩/١/معارف) .

**هەبووە، (سام) عەرەب و فارس و ڕۆمی لێ کەوتووە، (یافث) تورك و سەقالبیەکان و یاجوج و ماجوجی لێکەوتووە، (حام)یش قبتیەکان و سودانیەکان و بەربەرییەکانی لێکەوتەوە) [٥٣]، وتراویشە کە ئەو سێ کوڕەی (نوح) (علیه السلام)پاش لافاوەکە لەدایك بوون، بەڵکو تەنها (کنعان) پێش لافاو لەدایك بووە ئەویش خنکا و (عابر)یش هەر پێش لافاوەکە مردووە، بەڵام ڕاستتر ئەوەیە کە سێ کوڕەکەی و ژنەکانیان و دایکی کوڕەکان (واتە: ژنەکەی نوح) لەگەڵ سەرنشینەکانی کەشتیەکەبوون، دەقی تەوراتیش هەروایە، واباس دەکەن کە (حام) لەناو کەشتیەکەدا سەرجێی ژنەکەی خۆی کرد، لەسەر ئەوە (نوح) (علیه السلام)نزای لێکرد کە خوای گەورە سپێرمی بشێوێنێ، واتا: هەر منداڵێکی ببێت ناتەواوبێت، ئیتر کوڕێکی ڕەشیان بوو ئەویش (کنعان)ی کوڕیەتی کە بوەتە باپیرە گەورەی سودانیەکان، وە وتراوە نەخێر (حام) باوکی بینی کە خەوی لێکەوتبوو، بەرگەکەی لەسەر لاچوبوو، عەورەتی دەرکەوتبوو، بەڵام (حام) داینەپۆشیبوەوە بەڵکو براکەی تری داییپۆشیەوە؛ لەمەوە (نوح) (علیه السلام)نزای لە (حام)ی کوڕی کرد کە پسێرمی بشێوێت (واتا: خوای گەورە تۆوی بشێوێنێ) و منداڵەکانی ببنە کۆیلەی براکانی تری . لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: هەشتا کەس لەگەڵ نوح لە کەشتیەکەدابوون، ئەوانیش کەس و کارو خێزانیان لەگەڵدابوو، ماوەی سەد و پەنجا ڕۆژ لەناو کەشتیەکەدابوون؛ خوای گەورە ڕووی کەشتیەکەی بەرەو شاری مەککە وەرچەرخاند و ماوەی (چل) ڕۆژ بەدەوری کەعبەدا سووڕانەوە لە کەشتیەکەیاندا، ئینجا ڕووی کەشتیەکەی بەرەو شاخی جودی [٥٤] گەڕاند و لەوێ ئارامی گرت و گیرسایەوە .**

**(نوح) قەلە ڕەشەی نارد تا هەواڵی سەر زەوی بۆ بهێنێتەوە، قەلەکە فڕی، بەڵام بەسەر کەلاکێکدا کەوتبوو درەنگ گەڕایەوە ئیتر (نوح) (علیه السلام)کۆترێکی نارد بۆ زانینی هەواڵ دەربارەی زەوی، گوتراوە گەڕایەوە، قاچەکانی قوڕاوی بوون و گەڵا زەیتونێکی هێنابوەوە بە دەنوکی؛ لەمەوە (نوح) (علیه السلام)دڵنیابوو کە لافاوەکە نیشتۆتەوە ئیتر دابەزیەوە سەر شاخی جودی و گوندێکی دروست کرد و ناوی لێنا گوندی (هەشتا)[٥٥]، گوندەکە گەورەبوو، دانیشتوانەکەی بە هەشتا زمانی جیاجیا قسەیان دەکرد، تەنانەت هەندێکیان لەهەندێکی تر تێنەدەگەیشتن، لەبەرئەوە (نوح) بە ژمارە بۆی ڕوون**

---

[٥٣] الطبقات الكبرى (١/١/١٨/ التحرير) وە تأريخ الطبري (١/٢١٠ معارف) .

[٥٤] شاخی جودی لە کوردستانی تورکیایە و بە شاخێکی پیرۆز ناسراوە .

[٥٥] وەك بڵێن گوندی (هەشتاناوا) یان (هەشتاوا) / وەرگێڕ .

دەكردنەوەو حاڵی دەكردن . قەتادە و هەندێكی تر فەرموویانە: ڕۆژی دەی مانگی ڕەجەب سواری كەشتیەكەبوون و سەد و پەنجا ڕۆژ تیایدا مانەوەو ئەو ماوە دورو درێژە كە كەشتیەكە بەسەر هەموو جێهاندا دەگەڕا، كە هەموو جیهان ببوە یەك دەریای قووڵ و پان و بەرین، پاشان ماوەی مانگێك لەسەر شاخی جودی مایەوە، هاتنە خوارەوەو دابەزینیشیان لەكەشتیەكە هاوكات بوو لەگەڵ ڕۆژی دەی مانگی موحەڕەم و واتا: (عاشورا) و ئیتر ئەو ڕۆژە بەڕۆژووبوون .

(أبی هریرە) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) بەلای كۆمەڵێ یەهودیدا ڕەت بوو كە ڕۆژی موحەڕەم تیایدا بەڕۆژوو بوون، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەوە ڕۆژووی چییە؟ ئەوانیش وتیان: ئەمە ئەو ڕۆژەیە كە تیایدا خوای گەورە موسی و بەنی ئیسرائیلییەكانی لەنقوم بوون ڕزگار كرد، وهەمان ڕۆژ (فیرعەون) نقوم بوو، هەمان ڕۆژیش بوو كە كەشتیەكە لەسەر ساخی جودی گیرسایەوە و ئارامی گرت، ئیتر نوح و موسا (علیە السلام)لەو ڕۆژەدا بەڕۆژووبوون وەك سوپاسێك بۆ خوای گەورە، لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: من زیاتر لە ئێوە نزیكترم لەموسا و زیاتر ماڨ منە لەم ڕۆژەدا بەڕۆژوو بم، ئینجا ڕوی كردە هاوەڵەكانی و فەرمووی (هەر كام لەئێوە هیچی نەخواردووە با بەڕۆژووبێت . . ) [٥٦] تا كۆتایی فەرموودەكە . محمدی كوڕی ئیسحاق دەڵێت: كاتێك خوای گەورە ویستی كۆتایی بە لافاوەكە بهێنێت، بایەكی ناردە سەرزەوی ئیتر زەویەكەی كزران كردەوەو بەری كانیاوە هەڵقولاوەكانی گرت و وردە . . وردە . . بڕی ئاوەكە كەم بوەوەو كەشتیەكە لەسەر شاخی جودی گیرسایەوە لەشەوی حەڤدەی ئەو مانگەدا و تەنها یەك شەو لەو مانگەدا ڕۆیشتبوو، لەیەكەم ڕۆژی مانگی دەدا سەرلەوتكەی شاخەكان دەركەوت چل ڕۆژ دوای ئەوەش (نوح) بەری كەلاو ڕۆژنەی كەشتیەكەی لادا و ئینجا قەلە ڕەشەكەی نارد تابزانێت ئاو لەچ ئاستێدایە، بەڵام قەلەكە نەگەڕایەوە، ئیتر كۆترێكی نارد و پاش ماوەیەك گەڕایەوە بەڵام هیچ شوێنەوارێك بە قاچیەوە نەبوو، ئیتر دەستی درێژكرد و كۆترەكەی لەكلاو ڕۆژنەكەوە هێنایەوە بۆ ناو ژووری كەشتیەكە، پاش حەوت ڕۆژی تر جارێكی تر كۆترەكەی بەرەلاّ كرد ئەم جارەش كۆترەكە نەگەڕایەوە تا ئێوارەیەكی درەنگ (نوح) بینی كە كۆترەكە گەڵای زەیتونی لەدەمدایە و ئیتر (نوح) (علیە السلام)بەوەدا زانی كەئاستی ئاوەكە لەئاستی ڕووی زەوی دابەزیوە، حەوت ڕۆژی تر

---

[٥٦] مسند الامام احمد (٢/٣٥٩، ٣٦٠) .

لەکەشتیەکەدا مانەوەو پاشان کۆترەکەی بەڕەڵاکرد، بەڵام ئەم جارەیان کۆترەکە نەگەڕایەوە، لەمەوە (نوح) تێگەیشت کە زەوی تا ڕادەیەك دەرکەوتوەتەوە، ساڵی یەکەمیان لە کەشتیەکەدا تەواوکرد کەدەکاتە سەرەتای دەست پێکردنی لافاوەکە تا ئەو کاتەی کە (نوح) کۆترەکەی کردە دەرەوە، چوونە ڕۆژی یەکەمی مانگی یەکەمی ساڵی دوومیانەوە کە زەوی دەرکەوتەوە و وشکایی دیارکەوت، (نوح)یش سەری کەشتیەکەی لابرد، ابن اسحاق بەو شێوەیە باسیکردووە کە بەهەمان شێوەش و بەهەمان دەق تەوراتیش باسی کردووە، ئەو تەوراتەی کە ئێستا بەدەستی (اهل الکتاب)ەوەیە، هەروەها ابن ئیسحاق دەفەرموێت: لەمانگی دووەمی ساڵی دووەمی چوونە ناو کەشتیەکەدا و لەماوەی بیست و شەش شەودا لەکەشتیەکە دابەزین و چۆڵیان کرد، (اهل الکتاب) وا باس دەکەن کە خوای گەورە بە (نوح)ی فەرموو: لە کەشتیەکە وەرە دەرەوە خۆت و هاوسەرەکەت و کوڕەکانت و ژنی کوڕەکانت، لەگەڵ هەموو ئەو ئاژەڵانەی لەگەڵتان، تاکو زاوزێ بکەن و بەسەر زەویدا بڵاوببنەوە و گەشە بکەن، ئیتر دابەزین و (نوح)یش قەسابخانەیەکی دروست کرد بۆ قوربانی کردن و لە هەریەکە لەو ئاژەڵ و باڵندانەی کە گۆشتان حەڵاڵە دانەیەکی گرت و کردنی بە قوربانی بۆ خوای گەورە، خوای گەورەش پەیمانی پێدا کە هەرگیز لافاوی وا بۆ سەر زەوی و خەڵکی سەرزەوی نەنێرێتەوە . هەندێ لە فارسەکان و هیندەکان بڕوایان بە ڕووداوەی لافاوی (نوح) نیە، هەندێکی تریان باوەڕیان پێی هەیە بەڵام دەڵێن: لافاوەکە تەنها لەخاکی بابل بووە و نەگەیوەتە ئەوان، وە ئێمەش لە (کیومرث)ەوە نەکەوتوینەتەوە، کە مەبەستیان لە (ئادەم)ە، ئەمە قسەی ئاگر پەرستە دێرینەکانە ئەگینا پەیامە ئاسمانیەکان و سەرزاری خەڵکی و مێژوو و زەویش شایەتن لەسەر ڕوودانی ئەو لافاوە جیهانیە گەورەیە[٥٧]،

کە زەوی پاك کردەوە لەکاتێك پیسی و شەخەڵی چینەکانی خاکەکەی و پاشەڕۆی و چەندەها بەرەی گیانداران و پیسی مرۆڤە پیس و بێبڕواکانیش، چونکە تاقە یەك کەسی بێبڕوا لەو پاکسازیەدا دەرباز نەبوو، ئاوا خوای گەورە ئارامگرە و ئاواش نزای پێغەمبەران وەردەگرێت .خوای گەورە دەرباری (نوح)(علیه السلام)دەفەرموێت:

---

[٥٧] چەندین بەڵگەی زانستی و جیۆلۆجی نوێ لەبەردستدایە سەبارەت بە وردەکاریەکانی ئەو لافاوە ولێرەدا جێگای باسکردنیان نیە/وەرگێر.

﴿إِنَّهُ كَانَ عَبْداً شَكُوراً﴾[٥٨]، واتا (نوح بەندەیەکی سوپاس گوزار بووە)، بە ڕاستی لەسەر هەموو خواردن و خواردنەوەو پۆشاکێکی سوپاسی خوای کردووە . سوپاس کردنەکەش هەر بەدەم و زمان نەبووە، بەڵکو لەناخی دڵیەوە بوەو بە کردەوەش سوپاسی خوای کردووە، پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) فەرمویەتی: خوای گەورە لەو کەسە ڕازی دەبێت کە ئەگەر خواردنێکی خوارد سوپاسی خوای لەسەر دەکات، یان کە خواردنەوەیەکی خواردەوە سوپاسی خوای لەسەر دەکات .

(عبدالله)ی کوڕی عومەر دەڵێت: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا دەیفەرموو (نوح هەموو ڕۆژێك بەڕۆژوو بووە، جگە لە ڕۆژانی جەژنی ڕەمەزان و قوربان) [٥٩]، لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك گەیشتە دۆڵی (عسفان) فەرمووی: ئەبوبەکر ئەم دۆڵە کوێیە؟ فەرمووی:ئەمە دۆڵی (عسفان)ە، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:(نوح و هود و ئیبراهیم بەئێرەدا ڕەت بوون لەسەر پشتی فەریکە وشتر حەجیماڵی خوایان کرد) [٦٠] .

کاتێك حەزرەتی نوح (علیه السلام)لە سەرەمەرگدابوو، کوڕەکەی خۆی بانگ کردە ژوورسەری و ئامۆژگاری کرد، پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) دەفەرموێت: (نوح بە کوڕەکەی خۆی گوت: دەمەوێت وەسێتی خۆمت پێ ڕابگەیەنم، فەرمانت پێدەکەم بە کردنی دوو شت و فەرمانت پێدەکەم بە نەکردنی دوو شتی تر: فەرمانت پێدەکەم کە هیچ خوایەك نەپەرستی جگە لە (الله)، خۆ ئەگەر هەر حەوت ئاسمانەکە و هەر حەوت زەوییەکەش لەلەپی دەستێکیانت دابێ و (لا إلة إلا الله)ش لەلەپی دەستەکەی ترت دابێت ئەوا بیکە ئەڵقەو بیکەرە گەردنت کە (لا إلة إلا الله، سبحان الله وبحمده) لەکام دەستەیانت دابێت ئەوەیان قورستر دەبێت، نوێژی هەموو شتەکان بەئەوانەیە، هەر بەوانەش هەموو مەخلوقاتەکان ڕۆزی دەدرێن (ئەمە دووشتەکە بوو)، وە فەرمانت پێدەکەم بە نەکردنی دوو شتی تر: یەکەم هاوەڵ بۆ خوا دامەنێ و دووەمیشیان خۆت بەزل مەزانە واتا: فیزت نەبێ . پێغەمبەری نازدارمان دەفەرموێت: (خۆ بەزل زانین ئەوەیە کە گاڵتە بەهەق بکەیت و خەڵکت لەلا کەم و بچووك بێ)[٦١]، قورئانی پیرۆز دەفەرموێت نوح پاش ئەوەی کرا

---

[٥٨] سورەتی الاسراء / ١ .

[٥٩] سنن ابن ماجه (٥٣٤/١)، بەڵام (الالبانی) لە فەرموودا لاوازەکاندا هێناویەتی .

[٦٠] فەریکەوشتر وشەی تازەیە پێگەیشتووی جالاك و نازا .

[٦١] الادب المفرد للبخاری (٢/٢٥١/٥٤٨/فضل الله) .

بەپێغەمبەر و بەرلەوەی لافاوەکە ڕوویدات نۆسەد و پەنجا ساڵ لەناو گەلەکەیدا ژیاوە، ئینجا لافاوەکە ڕوویدا، خوای گەورە خۆی دەزانێت پاش ئەوە چەند ساڵی تر ژیاوە . ئەگەر ئەو گێڕانەوەیەی لە ابن عباس باس دەکرێت بە تەواوەتی گەیشتبێتە دەستمان و سەلامەت بێت ئەوا چوارسەد و هەشتا ساڵ پێش لافاوەکە کراوە بەپێغەمبەر و سێسەد و پەنجا ساڵیش دوای لافاوەکە بەردەوام بووە، کەواتە تەنها تەمەنی پێغەمبەرایەتیەکەی هەشت سەد و سی ساڵ لەناو گەلەکەیدا بانگەوازی کردووە و خۆیشی نۆسەد و پەنجا ساڵ بووە، بەمەش تێکڕای تەمەنی هەزارو حەوت سەدو هەشتا ساڵ ژیاوە . گۆڕی پیرۆزیشی لە (مسجد الحرام)ە و ئەمەش بۆچوونێکی ڕاست ترە لەوەی کە فەرموویانە گوایە لە شاروچکەی (بقاع)ە کە ئەمڕۆ بە (کرك نوح) ناسراوەو لەخۆشی ئەویش مزگەوتێکی بەو ناوەوە تێدا دروست کراوە، خوای گەورە خۆی دەزانێت . خوای گەورە پاداشتی چاکەت بداتەوە ئەی پیری سەروسیما سپی ئەی ئەو کەسە پاکەی کەزۆربەی ژیانت لەگەڵ سوپاسگوزاری و بەڕۆژووبووندا بەسەر برد، ئەی ئەو کەسە بەڕێزەی کەبوویتە باوکی دووەمی ئادەمیزاد و یەکەم داهێنەری کەشتی، ئەی نموونەی خۆڕاگری و نزاگیرابوون و دڵ پاکی، ئەی پیری دەست ڕەنگین، زمان شیرین، ڕەفتار سەنگین، ئەی (نوح)ی پێغەمبەر و بەندە و ڕەوانەکراوی پەروەردگاری جیهانیان، پیرۆزبێت ئەو هەموو پایەو شکۆداری و سەرفرازیەی دنیاو قیامەت، خوای گەورە باشترین پاداشتت بداتەوە لەگەڵ هەموو پێغەمبەرانی تردا بەگشتی و حەزرەتی محمد (ﷺ) بەتایبەتی .

## ﴿ پێغەمبەری خوا هود ( درووود و سەلامی خوای لەسەر بێت ) ﴾

ناوی هودی کوڕی شالخی کوڕی ئەرفەخشذی کوڕی سامی کوڕی نوحە(علیە السلام)، دەشڵێن گوایە هود (عابر)ی کوڕی شالخە، یان هودی کوڕی عبدالله ی کوڕی (رباح)ی (جارود)ی کوڕی (عاد) کوڕی (عوص)ی کوڕی (ئیرم) کوڕی (سام)ی کوڕی (نوح)ە (علیە السلام)وەك (ابن جریر) فەرموویەتی: لە هۆزی (عاد) بووە، واتا (عاد) کوڕی (عوص)ی کوڕی (سام)ی کوڕی (نوح) (علیە السلام)ئەم هۆزە عەرەب بوون و لە (ئەحقاف)، واتا: (چیاکانی لم)ی یەمەن لە نێوان (عمان) و (حضرموت)دا دەژیان،کە ئەم خاکە لەکەناری دەریا بووەو پێی دەگوترا (شەحرا) لە دۆڵی (مغیث)، زۆربەیان لە چادرگەی ئەوتۆدا دەژیان کە کۆڵەکەی گەورە گەورەیان لەژێردا بوو، هەروەکو خوای گەورە دەربارەی ئەو هۆزو و گەلە فەرموویەتی:﴿أَلَم تَرَ كَيفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعاد، إرَمَ ذاتِ العماد، التي لَم يُخلَق مِثلُها في البِلاد﴾[1]،واتا: ئایا دەزانیت کە پەروەردگارت (ئەی محمد) چی بەسەر گەلی عاد هێنا،ئەو ئیرەمەی کە کۆڵەکەرێژبوو،بە چەشنێك لەو ولأتانەدا هاوشێوەی ئەو نەبوو.

زانایانی تەفسیر فەرموویانە نموونەی ئەوان وەك هۆز، یان وەك کۆڵەکەکانیان بێهاوتا بووەو ئایەتەکە مەبەستی یەکێك لەوانەیە، بەلأم (ئیرەم) شارێك نەبووە، وەك هەندێ کەس پێیان وایە شارێك بووە لەشام یان لەیەمەن یان لەحجاز یان لەشوێنێکی تر.

وتراوە گوایە هود (علیە السلام)یەکەم کەس بووە کە بەزمانی عەرەبی قسەی کردووە، بەلأم (وهب)ی کوڕی (منبە) پاگەندەی ئەوەی کرد کە باوکی ئەو یەکەم کەس بووە کە بەعەرەبی قسەی کردووە، هەندێکی تر وتویانە (نوح) یەکەم کەس بووە، یان (ئادەم)، خوای گەورە باشتر دەزانێت . ئەو عەرەبانەی کە لەپێش (ئیسماعیل)دا (علیە السلام)هەبوون پێیان دەوترا (عەرەبی عاربە) و چەندین هۆزوتیرەش بوون، لەوانە تیرەی عاد، ثمود، جورهەم، جەدیس، ئەمیم، مەدین، عملاق، جاسم، قحطان، بنویقطن، هی تریش، بەلأم عەرەبی موستەعرەبە ئەوانەن کە دەچنەوە سەر (ئیسماعیل)ی کوڕی (ئیبراهیم)(علیە السلام)، (ئیسماعیل) یەکەم کەس بووە کە بەزمانی عەربیەکی ڕەوان قسەی کردووە پاش ئەوەی لەتیرەی (جورهەم)ەوە فێربوو، چونکە ئەو تیرەیە کاتی خۆی هاتنە لای (هاجەر)ی دایکی (ئیسماعیل) لەدەوری کەعبە دابەزین و نیشتەجێبوون،

---

[1] سورەتی الفجر / ٦ ٨ .

بەڵام (ئیسماعیل) (علیه السلام)بەچاکی لەوانەوە فێری زمانی عەرەبی بوو، زۆر بە ڕەوانیش پێی دەدوا، هەروەها پێغەمبەری خۆشمان (ﷺ) هەر بەزمانی شیرینی عەرەبی دەدوا . (عاد) مەبەست لە (عاد)ی دێرین و سەرەتاییە و ئەوان یەکەم کەس بوون کە لەدوای لافاوەکە دەستیاندایە بت پەرستی، بتەکانیشیان سێ دانە بوون و ناویان (صمد، صمود، وهر) بوو . باسی (هود) (علیه السلام)و بانگەوازکردنی و چارەنووسی گەلەکەی (عاد) لەچەند سورەتێکی جیاجیادا لە قورئانی پیرۆزدا باس کراوە، ئێمەش لێرەدا خشتەیەکی ناو سورەتەکان و ژمارەی ئایەتەکان دەنووسین کە باسی (هود)یان تێدا هاتووە، بەڕێزیشت دەتوانیت بۆ زانینی ماناکانیان سوود وەربگریت لە (تەفسیری ئاسان) کە بەزمانی شیرینی کوردی تەفسیرکراوە .

| ناوی سورەت | ژمارەی ئایەت |
|---|---|
| سورەتی الاعراف | (٦٥) بۆ (٧٢) |
| سورەتی هود | (٥٠) بۆ (٦٠) |
| سورەتی المؤمنون | (٣١) بۆ (٤١) |
| سورەتی الشعراء | (١٢٣) بۆ (١٤٠) |
| سورەتی فصلت | (١٥) بۆ (١٦) |
| سورەتی الاحقاف | (٢١) بۆ (٢٥) |
| سورەتی الفجر | (٦) بۆ (٨) |

| ناوی سورەت | ژمارەی ئایەت |
|---|---|
| سورەتی الذاريات | (٤١) بۆ (٤٢) |
| سورەتی النجم | (٥٠) بۆ (٥٥) |
| سورەتی القمر | (١٨) بۆ (٢٢) |
| سورەتی الحاقە | (٦) بۆ (٨) |
| سورەتی الفجر | (٦) بۆ (١٤) |
| سورەتی يونس | (١)، (٧١) |
| سورەتی الانعام | (٨٠) – (٨٣) |

هەروەها لەم سورەتانەشدا باسی حەزرەتی هود (علیه السلام)کراوە (براءة، ابراهيم، فرقان، عنكبوت، ص، ق)، هەروەك ئاماژەمان پێدا گەلی هود یەکەم گەلی دوای لافاوەکەی نوح بوون کە دەستیان دایە بت پەرستی، خوای گەورە ئەم گەلەی بە بەهێز و بەتوانا ناوبردووە و بەبێ هاوتای سەردەمی خۆیانی داناون، هەروەك دەفەرموێت:﴿وَاذكُروا إِذ جَعَلَكُم خُلَفاءَ مِن بَعدِ قَومِ نوحٍ وَزادَكُم فِي الخَلقِ بَسطَةً﴾[1] واتا:بیرێك بکەنەوە کە چۆن خوای گەورە ئێوەی کردە جێنشین لەسەر زەویدا لەدوای گەلی نوح وێڕای ئەوەی کە ئێوەی کرد بەبەهێزترین گەلی سەردەمی خۆتان، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت (پاش ئەوان، واتە:پاش گەلی نوح چەند نەتەوەیەکی ترمان هێنایە بوون) [2] کە مەبەست لەگەلی

[1] سورەتی الاعراف / ٦٩ .
[2] سورەتی المؤمنون / ٣١ .

هوده،هەرچەندە هەندێك لەزانایانی تەفسیر پێیان وایە مەبەست لە گەلی(ثمود) ە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ بِالْحَقِّ فَجَعَلْنَاهُمْ غُثَاءً﴾[1]، بەڵام هەندێکی تر دەڵێن ئەوە گەلی (صالح)ە، چونکە گەلی (عاد) خوای گەورە بە بایەکی زۆر بەهێز لەناوی بردن، وەك دەفەرموێت:﴿وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ﴾[2]، لەلایەتی ترەوە زانایان فەرموویانە کە دەشێت هەردوو سزاکە (دەنگێکی بەرز و بایەکی بەهێز) بەیەکەوە بۆ هەمان گەل دابەزیبێت، هەروەکو بۆ خەڵکی مەدین و (أصحاب الایکه) هەموو جۆرە سزایەکیان بەسەردا باری، دوای ئەوە هیچ شتێکی تێدا نیە ئەگەر بوترێت گەلی (عاد) لەپێش گەلی (ثمود)ەوە بوون، مەبەست لەوەیە کە عاد یاخی و بت پەرست بوون لەبەرئەوە خوای گەورە هەر لەخۆیان کەسێکی کردە پێغەمبەر بۆیان تاکو هۆشیاریان بکاتەوە بیان گەڕێنێتەوە بۆسەر شاڕێگەی خواپەرستی، بەڵام ئەوان بەدرۆیان کردەوەو بەکەم سەیریان دەکرد پێچەوانەی خواست و فەرمانی ئەو دەجووڵانەوە، سەرئەنجام خوای گەورە بەسزار سەختی خۆی گرتنی . کاتێك ئەو بانگەوازی بۆدەکردن تا بێنە سەر ڕێگەی خواپەرستی پەشیمان ببنەوە لە ڕابوردویان بەوەش خوای گەورە چاکەی دنیاو دواڕۆژیان بەسەردا دەڕێژی کەچی ئەوان بە پێچەوانەوە گاڵتەیان پێدەکرد و دەیان گوت تۆ کەسێکی کەم فام و نەزانی، ئەویش تەنها قسەی کەسە ساکارەکانیان نەبوو، بەڵکو سەرەك هۆز و کاربەدەستانی گەلەکەی وایان پێدەگوت، چونکە بت پەرستیەکەی خۆیان بەباشتر و پیرۆزتر دەزانی و پێیان وابوو کە ڕۆزی و سەرکەوتنیان بەدەست ئەو بتانەیە وێڕای ئەوەی کە پێیان دەگوت تۆ ڕاست ناکەیت و لەلایەن خواوە ڕەوانە نەکراوێت، بەڵام (هود) دەیفەرموو: (نا ئەی گەلەکەم من گەوج و نەزان نیم بەڵکو پێغەمبەرێکم بۆ سەر ئێوەو لەلایەن خواوە ڕەوانەکراوم و پەیامەکانی پەروەردگارتان پێڕادەگەیەنم و ئامۆژگارێکی ڕاسپێردراوو پاکم)[3]، پەیامی خوا پێویست بەوە دەکات کە درۆی تێدا نەکرێت و کەم و زیادی پێوە نەلکێت، بەزمان و بێژەیەکی ڕەوان و کورت و پوخت و گشتی دەربڕێت و پێچەوانەیی و دژواری و هەڵەشەیی تێدا نەبێت، ئەو لەگەڵ ئەو ڕەوشتە بەرزانەی کە تێیدا هەبوون وەك پێغەمبەرێکی بانگخواز،

---

[1] سورەتی المؤمنون / ٤١ .

[2] سورەتی الحاقة / ٦ .

[3] سورەتی الاعراف / ٦٦ .

هاوكات سووربووه لەسەر ئەوە كە ڕێنوماییان بکات بۆ شارێی خواناسی و دوورکەوتنەوەیان لەلوت بەرزی و نادانی و سەرگەردانی و بت پەرستی، کەسێکی هێمن و دڵسۆز بووە داوای هیچ کرێ و پاداشت و مزەیەکی لەو خەڵکە نەکردووە لە بەرانبەر ئەو بانگەواز کردنەیاندا، بەڵکو تەنها بەنیازی پاداشتی خوایی کاری کردووە،ئەوەش سیفەتی هەموو پێغەمبەران بووە بەگشتی،هەروەکو بە گەلەکەی خۆی گوت:(ئەی گەلەکەم من داوای پاداشت لەئێوە ناکەم،بەڵکو پاداشتم لای ئەو کەسەیە(پەروەردگار) کە دروستی کردووم،ئەرێ ئێوە هیچ ژیریەکتان هەیە؟)[1]،کە ئاوا خراپ بیردەکەنەوەو نازانن بانگەشە بۆلای هەق و بانگەشە بۆ گومڕایی جیا بکەنەوە ئەدی نازانن ئەوەی پێچەوانەی ئەم بانگەوازە خواییە ڕەفتار بکات،ئایندەی مەترسیدارە و خۆی تووشی سزای سەخت دەکات هەروەکو گەلەکانی پێشووتر بەسەریان هات،وەکو گەلی نوح(علیە السلام).

هەر لەبەر هەمان مەبەستیش بوو کە پیاوە خواناسەکە، وەك لە سورەتی (یاسین)دا باسکراوە، فەرمووی: (وەدوی ئەو کەسە بکەون کە ڕێنومایتان دەکات بۆ ڕای ڕاست هیچ داوایەکی لێتان نیەو پاداشتی ناوێ ئەو جۆرە کەسانە کە بانکتان دەکەن بۆ هەق بەڕاستی ڕێگەی ڕێنوماییات مەبەستە، گەر وانەبوایە منیش ئەو خودایەم نەدەپەرست کە دروستی کردووم و پاشە ڕۆژیش هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە) [2]، کەچی گەلی هود (علیە السلام)لەوەڵامدا گوتیان: (ئەی هود تۆ هیچ شتێکی وات بۆ نەهێناوین کە هەق و ناهەق جیابکاتەوە، لەبەرئەوە ئێمە لەو کەسانە نین کە بەقسە بێسەر و بەرەکانی تۆ واز لە بتەکانمان بهێنین و باوەڕت پێبکەین، پێمان وایە کە هەندێ لە خواکانمان تۆیان گرتووەو شێتیان کردویت لە تۆڵەی ئەو قسانەت دا کە دەیانکەیت و بەخراپ ناویان دەبەیت)[3]، بەڵام هود (علیە السلام)فەرمووی: (من خوای گەورە شایتمە و ئێوەش شایەت بن کە من بێبەریم لەو هاوەڵ دانانەتان بۆ خوا، هەمووتان بکەونە سەر فیڵی خۆتان دژ بە من بەخۆتان و بتەکانتانەوەو من زۆر بێخەمم لەوەی کە بتوانن زیانم پێبگەیەنن)[4] . ئەم فەرموودەیەی هود (علیە السلام)بەرەنگاربوونەوەیەکی ئاشکرای ئەوانە و گاڵتەکردنە بە

---

[1] سورەتی هود / ٥١ .

[2] سورەتی یس / ٢١ بۆ ٢٢ .

[3] سورەتی هود / ٥٣ بۆ ٥٤ .

[4] سورەتی هود / ٥٤ بۆ ٥٥ .

بتەکانیان و دەیسەلمێنیٚ کە بتەکانیان توانای سوود و زیان گەیاندنیان بەکەس نیە، بەڵکو بێگیان و مردوون و ئەگەر ئێوەش پێتان وایە ئەو بتانە زیان بە من دەگەیەنن، فەرموو ئەوە من بەئاشکرا بێبەریبوونی خۆم لەو بتانە ڕادەگەیەنم و ئەگەر ڕاست دەکەن بایەك سەعات سزاکەم دوانەخەن، نەك ئەوە بگرە مەمنونتان نیم کە هێندەی چاوتروکانێك زیانم پێبگەیەنن و سزام بدەن من لەئێستە بەدواوە هەر بێریش لەو بتانەتان ناکەمەوە و لاشتان لێناکەمەوە، ئێوەش چیتان لەدەست دێت بەرانبەرم بیکەن (من پشتم بەخوا بەستوە،ئەویش پەروەردگاری من وئێوەیشە هیچ گیاندارێکیش لە زەویدا نیە کە ئەو خوایە ڕاگیری نەکردبێت،پەروەردگاری من خاوەنی ڕێگەی ڕاستە)[1]

کەواتە پەروەردگاری ڕاستەقینە پەروەردگارەکەی منە، کە لەڕاستیدا هی ئێوەیشە، چونکە هەرگیز ئێوە ناتوانن بەنیازی زیان پێگەیاندنی لێی نزیك ببنەوە، ئەو جۆرە وەڵامانە لەلایەن پێغەمبەرانی تریشەوە، پێشووترو دواتر دراوە بەگوێی گەلەکانیاندا، ئەوان بەلایانەوە سەیربوو کە مرۆڤێکی وەکو خۆیان بکرێتە پێغەمبەر و هۆشیاریان بکاتەوە (ئایا لای خەڵکی جێی سەرسامییە کە سروشمان بۆ پیاوێك لەخۆیان ناردووە تاکو خەڵکی ئاگادار بکاتەوە و لەسزای خوانەناسی بیانترسێنێت)[2] بەڵام (هود) دەیزانی چ شتێك بەبیریاندا دێت،فەرمووی:(ئەوە سەرسامن بەوەی کە پەیامی پەروەردگارتان لەڕێگەی پیاوێکی ناو خۆتانەوە بۆ بێت و هۆشیارتان بکاتەوە؟)[3]، ئەوان دەیانگوت: (ئێوە بڕواتان وایە کە مردن و بوون بەخاك و ئێسك و پروسك تازە زیندو دەکرێنەوەو لەزەوی دێنەوە دەرەوە، هەی هوو . . ئەوە چ گفتێکی دوورە . . . ، بەڵکو ژیان هەرئەوەیە کە لەدنیادا هەمانە و ئێمە دەژین و دەمرین (تازە زیندوونابینەوە)، بەڵکو گەلێکی تر و نەوەیەکی تری دوای ئێمە دێنە ژیانەوە، ئەو پیاوەش (واتا: هود) قسە بەناوی خواوە هەڵدەبەستێت و هەرگیز ئێمە بڕوای پێناکەین، هودیش گوتی: خوایە سەرکەوتووم بکە بەسەر ئەوانەدا کە بەدرۆم دەکەنەوەو باوەڕم پێناکەن) [4]،ئەوە بیروباوەڕی (دەهریەکانە) کە پێیان وایە کۆمەڵێك دەمرن و کۆمەڵێکی تر دێنە جێگەیان و

---

[1] سورەتی هود / ٥٦ .

[2] سورەتی یونس / ٢ .

[3] سورەتی الاعراف / ٦١ .

[4] سورەتی المؤمنون / ٣٥ بۆ ٣٩ .

ئەوەی کە مرد تازە زیندوو ناکرێتەوە، هەروەها بیروڕای هەندێ لە بێ بڕواکانیشە .
(هود) (علیه السلام)بە هۆزەکەی گوت: (ئایا کۆشك و خانووی پتەو لەشوێنە بەرزەکاندا دروست دەکەن و پێتان وایە ئەوەتان بەسەو ئیتر پێویستان بە (ئاین و خوا) نیە، ئەمەتان لەبیردایە، چونکە لە بنەڕەتدا چەند هۆزێکی دەوارنشین بوون و ئێستا پێگەیشتوون)[1]،دووبارە خوای گەورە باسی بیناسازی چادرگە قایمەکانی گەلی (عاد) دەکات کە بە (ارم) ناسراون و دەفەرموێت ﴿ألَم تَرَ كَيفَ فَعَلَ رَبُّكَ بعاد، إرَمَ ذات العِماد، التي لَم يُخلق مثلُها في البلاد﴾[2]، (إرم) هەر (عاد)ە بەراییەکانن، کە چادرنشین بوون . ئەوانەی پێیان وابوو (إرم) شارێکی زێڕ و زیوە هەر جارەی دەڵێن لەشوێنێکە، بە هەڵەدا چووبوون و هیچ بەڵگەیان پێ نییە، کە خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَتَتخِذُونَ مَصانِعَ﴾، وتراوە: مەبەست لە کۆشکەکانیانە، یان دوکەڵکێشە بەرزەکانی گەرماوەکانیان، یان سوولی ئاوەکانیان، ﴿لَعَلَّكُم تَخلدون﴾ بەو نیازەی بە نەمری لەو شوێنانەیاندا بمێننەوە .

گەلەکەی هود، هەرهەمان قسەی پواوی پێشینە تیاچووەکانیان دەکردەوەو بەوپەڕی بێشەرمیەوە پێیان گوت: (بۆئەوە هاتویتە ناومانەوە تاکو بەتاقی تەنها خوا بپەرستیت و واز لەو خواوەندانە بهێنیت کە باوباپیرانمان پەرستویانن (واتە: بتەکان) ئەوا ئێمە بەقسەی تۆ ناکەین تۆش چیت لەدەست دێت و پەیمانی چیت پێمان داوە کە بەرانبەرمان بکەیت، بیکە، باﺋەوەمان بەسەر بێت چیت لەدەست دێت بیکە ئەگەر ڕاست دەکەیت [3] .
هەروەك پێشر گوتبوومان: (بە لامانەوە وەکو یەك وایە جا ئامۆژگاریمان بکەیت، یان نەکەیت، ئەو قسانەی دەیکەیت لە پێشینە و کتێبە کۆنەکانی ئەوانەوە داتتاشیوە (بە واتایەکی تر) ئەو ئایینەی ئێمەی لەسەرین ئایینی باوباپیرانمانە و هەرگیز دەست بەرداری نابین) [4]، هەردوو شێوازەکەی خوێندنەوەی ئایەتەکە ﴿إن هَذا إلا خُلُقِ الأولين﴾ یان ﴿إنْ هَذا الا خَلقُ الأولين﴾، واتا:پیتی (خ) بۆری هەبێت، یان (سەر) هەر بەڵگەیە لەسەر کەللەڕەقی و باوەڕ نەهێنان و مەبەستیانە بڵێن: (ئێمە سزانادرێین)، کە ئەوان دەیانگوت:: ﴿وَمَا نَحنُ بِمُعَذَّبين﴾[1]، واتا: ئێمە سزا نادرێن و هیچ سزاو ئازارێك

---

[1] سورەتی الشعراء / ١٢٨ بۆ ١٢٩ .

[2] سورەتی الفجر / ٦ بۆ ٨ .

[3] سورەتی الاعراف / ٧٠ .

[4] سورەتی الشعراء / ١٣٦ .

**نامانگرێتەوە (وەك تۆ وا گومان دەبەیت) بەڵام خوای گەورە ئاگاداری پێغەمبەرەی کردەوە، هەم وەك وەڵامێکی دەمکوتکەرانە بۆ بێباوەڕان و هەم وەك دڵنەوایی کردنەوەی حەزرەتی (هود) و فەرمودی: (لە پەروەردگارتانەوە قین و سزاتان بۆ دانراوە، ئایا (هێشتان) دەم بەدەمەم لەگەڵدا دەکەن سەبارەت بە پەرستنتان بۆ ئەو بتانەی کە خۆتان و باپیرانتان ناوتان لێناون و کردوتانن بە هاوبەشی خوای گەورە لەکاتێکدا خوا خۆی هیچ شتێکی لەو بارەیەوە بەکەس نەداوە، (سزاکە بەڕێوەیە) ئێوە چاوەڕوان بن، منیش هەروەکو ئێوە چاوەڕوان دەبم، چونکە منیش هیچ شتێ دەربارەی ئایندەی ئێوەو چارەنووسی ئێوە نازانم مەگەر خوای گەورە خۆی پێم ڕابگەیەنێت) [1]، واتا: ئێوەو پێشینەکانتان بت و پەرستراوی جگە لەخۆتان ناوزەدکردووە بۆ خۆتان و دەیانپەرستن، ئەگەر هیچ بەڵگەیەکیشتان لەسەر ڕاستی و دروستی ئەو کارە نالەبارەتان پێنیە، جا ئەگەر ئێوەش هەر سووربن لەسەر ئەو پەرشتشە هەڵەیە، ئەوا من هۆشیارتان بکەمەوە یان گوێتان نەدەمێ هەردووبارەکەتان بەلاوەوە وەکو یەك وایە . ئیدی هەقی خۆتانە چاوەڕوانی سزای خوایی بن بۆ سەرتان، دیارە فەرمانی خواش گەڕانەوەو ڕەت کردنەوەی بۆ نیە و کەس ناتوانێ بەری پێبگرێ .**

**خوای گەورە دەفەرمووێ: (هود) فەرمووی: پەروەردگارا سەرکەوتنم پێببەخشە، چونکە ئەوان منیان بە درۆ زانی و بروایان پێنەکردم، خوای گەورە فەرمووی: دڵنیابە بەم زووانە پەشیمان دەبنەوە، بەقیژە دەنگێکی بەهێز لەناومان بردن (دڵمان تەقاندن) و کردنمانن بە پووش و پەڵاشی سەرئاو، دەبا ئەولاترچن ئەو گەلانەی ستەمکارن) [2]، کەواتە: ئەگەر لە ڕاستگۆیانی ئەو هەڕەشانەی لێمان دەکەیت بۆمان پێش بهێنە، هود فەرمووی: ڕودانی ئەو سزایانە و زانینی کاتەکەی تەنها لای خوا خۆیەتی، من ئەوەم لەسەرە چیم بۆ ڕەوانەکراوە پێتان ڕابگەیەنم، بە داخەوە ئێوە بەگەلێکی نەزان و نادان دەبینم، جا ئەودەمەی پەڵە هەورێکیان بینی کە ڕوەو دۆڵ و ناوچەکانیان دەکشا، دڵیان خۆش بوو، گوتیان: ئەوە بارانی پێیە بۆمان، نەخێر وانیە، بەڵکو ئەوە ئەو سزایەیە کە پەلەتانە پێش بخرێ، ڕەشەبایەکی توند، کە سزایەکی بەئازاری پێیە، بە فەرمانی پەروەردگاری هەمووشتێ کاول و وێران ئەکات، ئیتر کەسیان دیار نەمان و لەناوچوون**

---

[1] الاعراف / ٧١ .

[2] سورەتی المؤمنون / ٣٩ .

جگه لەخانوو و ماڵە چۆڵ و هۆڵەکانیان، هەر بەو شێوەیە تۆڵە لەگەلانی تاوانبار دەسێنین (جا لەهەر کات و شوێنێکدا بن)[1] . لە چەند شوێنێکی تری قورئانی پیرۆزدا باسی سزادانی هۆزی (عاد) کراوە لەگەڵ چۆنیەتی ڕزگارکردنی (هود) و باوەڕداران و هۆکارەکانی گەیاندنی بەو چارەنووسە ڕەشە، بۆ زانیاری زیاتر سوود وەربگرە لە (تەفسیری ئاسان) ئایەتی/٧٢، سورەتی (هود) ئایەتی/٥٨ بۆ ٦٠، سورەتی (المؤمنون) ئایەتی/٤١، سورەتی (الشعراء) ئایەتی/١٣٩ .

سەرەتای سزاکەشیان لەو کاتەوە دەستی پێکرد کە پەڵە هەورەکانیان بینی بەرەو ڕوویان دەهات، وایانزانی بارانیان تێدایە، نەیان دەزانی ئەو پەڵە هەورانە هەڵگری مەرگ و کارەساتی کوشندەن بۆیان و ئیتر جارێکی تر هەورەکان بەچاوی خۆیان نابیننەوە کە باران و بەرەکەتیان بۆ دابەزێنێ، ئیتر وشکەساڵی و بێبارانی و قات و قڕی دایگرتن، هەر بۆیە چاوەڕوانی بارانیان دەکرد و واشیان زانی ئەوە بارانە بۆیان، بەڵام سزا باران بوو، هەربۆیە خوای گەورە ئاوا وەڵامیدانەوە کاتێك زۆر بەبێ شەرمانە لەخزمەتی حەزرەتی (هود)دا دەیانگوت: (ئەو سزایەمان بۆ پێش بێنە کە هەڕەشەمان بەوە لێدەکەیت و دەمانترسێنی) .

زانایانی تەفسیر لێرەدا ئەو هەواڵە باس دەکەن کە (پێشەوا محمد بن اسحاق) هێناویەتی و دەفەرموێ:(کە ئەوان تەنها ڕێی بێبڕواییان هەڵبژارد، خوای گەورەش بۆ ماوەی سێ ساڵ بەتەواوەتی بارانی لێگرتنەوە، تا تەواو شەکەت و تینووبوون، ئەوسا وا باوبووە کە خەڵکی تەنگانەیەکی بەسەردا دەهات دەچوو بۆ (کەعبە)و لەخوا دەپاڕایەوە تاکو چارەسەری بکات، ئەو ساکەش (عەمالیقەکان) لە مەککەدا دادەنیشتن، کە بنەچەیان دەگەڕێتەوە بۆ (معلیق)ی کوڕی (لاوذ)ی کوڕی (سام)ی کوڕی (نوح)(علیه السلام)، ئەودەمە سەرەك هۆزەکەیان ناوی (موعاویەی کوڕی بکر)بوو، هۆزی (عاد) نزیکەی (حەفتا) کەسیان بە نوێنەرایەتی هۆزەکەیان چوون بۆ مەککە و نزاکردن لەدەوری (کەعبە) بۆ باران بارین، لەو کاتەدا بەلای (موعاویە)دا ڕەت بوون، ئیتر لایاندایە لای ئەو و (مانگێك) لەلای مانەوە، کەیفیان دەکرد، مەیان دەخواردەوە، دوو کچە کۆیلەش گۆرانیان بۆ دەگوتن، لەبەرئەوەی لەشوێنێکی دوورەوە هاتبوون کە ماوەی یەك مانگ ڕێگەیە، بەلایەوە عەیب بوو دەریان بکات، خەرجی حەفتا کەسیش بۆ ماوەیەکی زۆر هەر وا ئاسان نیە،

---

[1] سورەتی الاحقاف / ٢٢ — ٢٥ .

لەبەرئەوە هات هۆنراوەیەکی ڕێك خست و بەگۆرانی بێژەکانی گوت کە بە گۆرانیەوە ئەو هۆنراوانە بڵێن، ئەوانیش هۆنراوەکانیان بە گۆرانیەوە بۆ نوێنەرەکان گوت کە هۆنراوەکان هەڵدەگرێت بە کوردی ئاوا مانا بکرێن .

| | |
|---|---|
| ئەی پێی نەگوتی : خاکەسار | بڕۆن بەڵکو خوا هەورێکمان بۆ بنێـــــرێ |
| تـــا خـــاکی ( عـــاد ) بگرێتـــەوەو | زەوی و زارمـــان بە تـەواوی بــۆ بـدێــرێ |
| ئێوارەیان لە خۆ هێناو | لەم گفتارەش هەر نەبانن |
| بێ باران کارەساتە و | منداڵ و سەر هۆز دەزانن |
| ژنەکانیان چاوەڕوانن چەند | ڕۆژیان کرد بە ئێوارە |
| ئەی ناترسن لە درندە؟ ( عاد ) | ناسراون کە تیروشیریان بەکارە |
| کەچی ئێوە لەم دەقەرە بێ شەکەتی | شە و ڕۆژتـان بێ ئـازارە |
| چ نوێنەرێکن ( بەد )انی هۆزێکی وا | خۆ سڵاو لە چوونەوەیان دەرکەنارە [1] |

ئیتر نوێنەرەکان تێ گەیشتن کە ئەمە دەرکردنێکی بە ئەدەبانەیە و بەرەو (کەعبە) ڕۆیشتن بۆ نزاکردن، نزاکاری گەورەیان (قەیل)ی کوڕی (عەنز)بوو، ئیتر خوای گەورە سێ ڕەنگە هەوری ناردەسەریان: سپی و سوور و ڕەش، پاشان بانگخوازێك لە ئاسمانەوە بە گوێی (قەیل)دا بانگەوازی ڕاگەیاند کە لەم سێ جۆرە هەورە کامیانت دەوێ؟ (قەیل) دەڵێ: ڕەشەکەم هەڵبژارد، چونکە جۆری ڕەش لە هەموویان زیاتر ئاوی هەڵگرتووە، بانگخوازەکە پێی گوت: ڕەنگێکت هەڵبژارد بە ژیلەمۆتان ناکات، بەخوا چاکت زانی سەرەخۆرەی هەموویانی. ئیتر تەنها ئەو حەفتا کەسە دەربازبوون و بەیەك جارەکی لە مەککەدا نیشتەجێبوون ، بە بابەگەورەی نەوەکانی (عاد) و گەل و هۆزە بنەڕەتیەکەیان هەموویان لەناو چوون .

دەڵێن خوای گەورە هەورەکانی پاڵنا بۆ ئەو شوێنەی کە (قەیل) خۆی داوای کردبوو، کە نیشتەجێی هۆزەکە بوو، لە ڕێگەدا گەیشتە دۆڵێ (باران دایکرد) و دەیانگوت:ئەوا هات ئەو هەورەی چاوەڕوانیان دەکرد،خوای گەورەش دەفەرموێت: (نەخێر، ئەوە ئەو سزایە کە پەلەتان لەهاتنی دەکرد، بایەکە و سزاو ئازارێکی توندی پێیە،بە فەرمانی پەروەردگاری هەموو شتەکان تێك و پێك دەشکێنێ وکاولیان دەکات)[2]

---

[1] هۆنراوەکەش هەر لەلایەن وەرگێڕەوە کراوەتەوە بە هۆنراوە .

[2] سورەتی الاحقاف / ٢٤ .

وا دەگێڕنەوە کە یەکەم کەس زانی ئەوە هەوری باران نیە و بەڵکە سزایە ،ژنێك بوو لە (عاد) و ناوی (مەهد)بوو، کە زانی ئەو بایە چ سەخت و کوشندەیە قیژاندی و بەدەمدا کەوت و بووڕایەوە، کە چاك بوەوە پێیان گوت: ئەی (مەهد) ئەوە چیبوو، بۆ وات بەسەرهات؟ گوتی: (با)یەکم بینی[1]گڕەیەکی شێوەئاگری لەگەڵدابوو، چەند پیاوێك لە پشتییەوە بوون و ڕایاندەکێشا . ئەو (با)یە حەوت شەو و هەشت ڕۆژی دوایەك و بەردەوام هاتە سەریان و هیچ کەسێك لە (عاد) ڕزگاری نەبوو، جگە لە نوێنەرەکانیان لە مەککە، ئیتر حەزرەتی (هود) (علیه السلام) وە دەستەی باوەڕداران ڕزگاریان بوو بەسەر وڵاخەکانیانەوە بێوەی بوون و بەردەوامیش (با)یەکە زەوی و ئاسمانی لە بێ بڕوایان کردبووە چەرمە چۆلەکە، تاکو دواتر لاشە ورد و خاش کراوەکانیشیان بە (خۆڵ و تۆز) (بایەکە) دایپۆشی .

بەڵام وا باس دەکەن کە ئەو بەسەر هات و سزایە بۆ (عاد)ە کۆنەکان نیە، بەڵکو بۆ ئەوانەیە کە لە مەککەدا دادەنیشتن، هەروەکو (ابن اسحاق)یش وا دەفەرموێ، چونکە ئەوان تا دوای نیشتەجێ بوون حەزرەتی (ابراهیم) (علیه السلام)خانووبەرەیان لە مەککەدا نەکردبوو، بەڵکو هەر (کەعبەش) دروست نەکرابوو، ئەوەبوو کە حەزرەتی (ابراهیم) (علیه السلام)(هاجەر)ی هاوسەری و (اسماعیل)ی کوڕی (علیه السلام)لەوێ نیشتەجێ کرد، هۆنراوەکەش کە لە (ئەدەبی نەفاکی)دا هەیە هی سەردەمی دواترە و دەربارەی (عاد)ی دێرین وتراوە، هۆنراوەکەش لەقسەی دێرینەکان ناچێ و تازە دیارە، بەتایبەتیش کەباسی ئەوە ئەکات کە هەورەکە گڕە: واتا بایەکی گەرم پڕشکی ئاگری لەگەڵدا بووە، بەڵام خۆی (عاد)ی دێرین بە (با)یەکی توند لەناوچوون، واتا (با)یەکی سارد وبەتین و گوڕم و بەردەوام، دەربارەی ماوەکەیشی، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَانِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا﴾[2]، ئەڵێن: ڕۆژی یەکەمی هەڵکردنی بایەکە (هیینی) بووەو داوایین ڕۆژیشی (چوارشەممە) بووە .

خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەگەر لەوێ بویتایە دەت بینی چۆن ئەو هۆزە لاڵ و پاڵ بە زەویدا دەردرانەوە، هەروەکو ڕەگ و ڕشیاڵی هەڵکەنراوی دارخورما) [3].

---

[1] (با) نابینرێت، بەڵام مەبەست لە بینینی هەوری تیژڕەوە لەژێر کارکەری و هێزی (با)دا .

[2] سورەتی الحاقە / ٧. (حسوما) واتە: بەردەوام و یەکلاکەرەوە .

[3] سورەتی الحاقە / ٧ .

خوای گەورە ئەوانی وێچواندوە بە ڕەگ و ڕیشاڵی خورمای هەڵکەنراو، چونکە ڕەگی هەڵکەنراوی لەبێخ دەرهاتووی دارخورما خڕك و سەلکی پێوە نیە، (با)یەکەش کاتی ڕووی لەیەکێك لەوان دەکرد هەڵی دەگرت و بەرەو ئاسمان لوولی دەکرد و پاشان بە گوڕم لەسەر سەر ئەیدایەوە بە زەویدا و ملی لێدەکردەوە یان بەناو زەویەکەدا دەیچەقاند، لەبەرئەوە لاشەکانیان بەبێسەر دەردەکەوتن، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي أَيَّامٍ نَحِسَاتٍ﴾ [1]، دیارە ڕۆژی دابارینی ئەو سزایە، بە ڕۆژانی نەگریس و شوم لەسەر ئەوان حسابە، هەروەکو ئەمان خۆشیان وا ناویان بردووە، ئەو ڕۆژەش تەنها یەك ڕۆژی دیاریکراوە وەك (هەینی، چوارشەممە، . هتد) نیە، بەڵکو چونکە هەموو ڕۆژەکانی هەفتە بە شەوەکانیشیانەوە (با)یەکە لەسەریان گڤەی مەرگی بووە، کەواتە هەموو ڕۆژەکان بۆ ئەوان هەر ڕۆژانی نەگریسی بووە، دیارە مانگ و ساڵ و تەمەنەکانیش هەر لە بنەڕەتدا لە ڕۆژەکانی هەفتە پێك دێن .

خوای گەورە دەربارەی ئەوان دەفەرموێت: ﴿وَفِي عَادٍ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ الْعَقِيمَ﴾[2]، واتا: (با)یەکی نەزۆکمان ناردە سەر (عاد)، (نەزۆك) مەبەست لەوەیە کە هیچ خێرو بێر و سوودی نیە، وەك (با)ی ئاسایی کە دەبێتە مایەی پاڵ پێوەنانی هەورە پڕ لە بارانەکان و پیتاندنی گەرم و ساردی هەورەکان و گواستنەوەی تۆوی هەڵاڵەی ڕووەکەکان و . هتد، بگرە (با)یەك بووە بەسەر هەر شتێدا ڕەت ببوبێ هەڵیپڕوکاندوەو وشکی کردوەتەوەو تێکی شکاندووە و وەکو خۆڵەمێشی لێکردووە، هەروەکو خوای گەورە لە پێناسی ئەو (با)یەدا دەفەرموێ: ﴿مَا تَذَرُ مِنْ شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ﴾[3]،واتا:بەسەر هەر شتێکدا ڕەت بووبێ وەکو خۆڵ ورد و خاشی کردووە.لە(ابن عباس)یشەوە دەفەرموێت،کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من لەگەڵ سروەی سەبای بەیانی خوای گەورە سەریخستم و هۆزی عادیشی بە ڕەشەبا لەناو برد) [4]، بەلاّم فەرمودەی خوای گەورە: ﴿وَاذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُ بِالْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ النُّذُرُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾[5]،

---

[1] سورەتی فصلت / ١٦ .

[2] سورەتی الزاريات / ٤١ .

[3] سورەتی الزاريات / ٤٢ .

[4] پێشەوا بخاری (١٥/٢٦/١٠٣٥/فتح)، (٥٩/٥/٣٢٠٥/فتح)، (٦٠/٦/٣٣٤٣/فتح)، هەروەها پێشەوا مسلم (٩/٤/١٧) .

[5] سورەتی الاحقاف / ٢١ .

ڕوكاری ئەم ئایەتە وا نیشان دەدات كە ئەو (عاد)ەی مەبەستە كە (عاد)ی دێرین بوون، شێوازی ڕەوتی ئایەتەكەش لە شێوازی ڕەوتی ئەو ئایەتە دەچێت كە باسی هۆزی (هود)ی دێرین دەكات، دەشگونجێ (عاد)ی دوایی بووبێت، وەك دواتر بەڵگە لەو بارەیەوە باس دەكەین . بەڵام ئەو فەرمودەیەی پەروەردگار كە دەفەرمویێت: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضاً مُسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا﴾[1]، ئەوە دەگەیەنێ كاتێ (عاد) نیشانە و دیاردەی ئەو هەورەیان بینی، وایان گومان برد كە هەوری بارێن ڕێژە كەچی هەوری سزادەربوو، بەپیت و بەرەكەتیان زانی، كەچی تۆڵە و ئازار بوو، ئۆمێدی خێریان پێی هەبوو، كەچی ئەو شەڕی بۆ هێنابوون، خوای گەورە دەفەرموێت: (نەخێر، ئەوە ئەو سزایەیە كە پەلەتان لەهاتنی دەكرد)[2].

پاشان خوای گەورە بە ئایەتی دواتر تەفسیری هەمان ئایەت دەكات و دەفەرموێ: (بایەكە ئازارێكی بەئێشی تێدایە)، دەشێت ئەو بایە سارد و بەتینەی كە هەشت ڕۆژ و حەوت شەو بە بەردەوامی بە سەریاندا دەهات و سەرنجام كەسیان ڕزگاریان نەبوو، تەنانەت بۆیان دەخرایە ناو ئەشكەوت شاخ و دۆڵەكانیشەوەو كەرت و پەرتی دەكردن و خانوو كۆشكە تۆكمەكانیشی بەسەردا دەڕوخاندن، چونكە ئەوان زۆر شانازییان بە تۆكمەیی خانووەكانیان و هێزی ماسولكەی خۆیانەوە دەكرد، تەنانەت دەیانگوت :

﴿مَن أشد مِنا قُوةً﴾، واتا: كێ لە ئێمە بەهێزترە ؟ خوای گەورەش ئاوای بەسەرهێنان، تا بزانن ﴿أن الله الذي خلقهم أشد منهم قوة﴾ ئەو خوایە بەدی هێناون زۆر زۆر لەئەوان بەهێزترە ئەگەر ئەوان شانازی بە هێز و زۆكی[3] خۆیانەوە دەكەن، ئەوا خوای گەورە بە (با)یەكی نەزۆك لەناویان دەبات . دوور نیە كە ئەو (با)یە لەبەشی كۆتایی سزاكەدا هەڵی كردبێت و ئەوانەی كە لەدوایی ماونەتەوە وا گومانیان كردبێت كە ئەوە هەورێكی پڕ بەرەكەتە و بەدەم ئەوانەوە دێت كە ماونەتەوە، بەڵام ئەویش هەر سزایەكی كوشندەتر و جەرگبڕتربوو، دەشبێت هەردوو باری سزاكە پێكەوە لەیەك كاتدا بووبێت، هەروەكو كاتی خۆی خوای گەورە خەڵكی مەدیەنی بە (بای سارد) و (ئاگر) لەناو برد، ئەمەش توندترین

---

[1] سورەتی الاحقاف / ٢٤ .

[2] سورەتی فصلت / ١۶ .

[3] زۆك: فرەزا، بەرەور، بەسك وزا، ئەو كەسەی منالی زۆری لیدەكەوێتەوە .

جۆری سزاکەیە دوو شتی تێدا بەکار بهێنرێت (بای سارد) و (ئاگر)، تەنها خوا خۆی دەزانێت چۆن چۆن بووە ! .

لە (ابن عمر) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) فەرمووی: (ئەو بایەی خوای گەورە ناردیە سەر عاد، جێ موستیلەیەکی لێ نەپەڕاند، یان وەك شوێنەوارێکی کەمی موستێلە لەسەر دەست، بێ شوێنەواری کردن، بەرەو ئاسمان لوولی کردن و کردنی بە تەپوتۆزێکی تاریك و لێڵ، کاتێ شارنشینەکانی (عاد) ئەوەیان لە ئاسماندا بینی، وایانزانی هەورێکی ڕەشی باراناویە و گوتیان: ﴿هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا﴾، ئیتر خەڵکە وردو خاشکراوەکەی لادێکان لە ئاسمانەوە هەڵڕژانە سەر خەڵکی شارەکان و تەفروتوانا و ژێرخاکیان کردن هەردوولایان تێداچوون)، ئەگەر چی ئەم فەرموودەیە جێگەی تێڕامانە لە ڕووی ساخی و ڕاست و دروستیەکەیەوە، ئاخۆ فەرموودەی پێغەمبەرمانە (ﷺ) یان نا !، خوای گەورە باشتر دەزانێ .

لە (عائشە)وە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك (با) هەڵی دەکرد دەیفەرموو: (خوایە من داوات لێ دەکەم لە خێری ئەو بایە و ئەوەی تێیدایە پێمان ببەخشە و پەنات پێ دەگرم لەشەڕ و خراپەی ئەو بایەو ئەوەی تێدایە . هتد) .هەروەها عائشە دەفەرموێت: کاتێك هەور لەئاسماندا دەردەکەوت پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕەنگی دەگۆڕا، ئارامی لێهەڵدەگیرا، دەچووە دەرەوەو دەهاتەوە ژوورەوە، ئیتر کە باران دایدەکرد دەسرەوت و شادمان دەبوو، عائشە هەستی بەوە کرد و هۆی ئەو پشێوی و ترسەی لێپرسی، پێغەمبەریش لە وەڵامدا فەرمووی: (ئەی عائشە جا بەڵکو لەو جۆرە هەورەبێ کە هۆزی عاد کاتێ بینیان پەڵە هەورێك بەرەوشیوو و دۆڵەکانیان دێت گوتیان: ئەوە هەورێکە و بارانی بۆ هێناوین) کەچی سزا و ناڕەحەتی بوو بۆیان و تێداچوون .

هەر لە (عائشە)وە دەفەرموێت: هەرگیز نەمدیوە پێغەمبەری خوا ئەوەندە پێبکەنێت کە مەڵاشووی دەربکەوێت، بەڵکو هەمیشە زەردەخەنەی دەکرد، بەڵام کاتێك هەوری دەبینی یان با هەڵیدەکرد لە ڕوخساریدا شوێنەواری دەردەکەوت، عائشە لێی پرسی: کە خەڵکی هەورە دەبینن دڵشاد دەبن و بە ئۆمێدی بەرەکەتی باراننن، بەڵام لەو کاتانەدا پەشێوی و بێزاری لە ڕووخساری پیرۆزتدا دەبینم، ئەوە بۆچی؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەی عائشە کێ دڵنیام دەکات کە ئەوە سزایەك نیە، ئەوەتا هۆزی هود بە (با) لەناوچوون خەڵکەکە کە سزاکەیان بینی دەیانگوت: ئەوە هەورێکی باراناویە بۆمان) .

بەم جۆرە ئەو بەسەرهاتەی لە سورەتی (الاحقاف)دایە دەربارەی (عاد)ی دواییە و باسەکانی تری لە هەموو شوێنەکانی دیکەدا لە قورئاندا باسی (عاد)ی دێرینە، واتا: (عاد)ی یەکەمینە، خوای گەورە زاناترە .

باسی (حەج کردنەکە)ی (هود)یشمان کرد لەباسی حەج کردنی (نوح)دا (علیه السلام)لە (علی کوڕی ابی طالب)ەوە باس کراوە کە گۆڕە پیرۆزەکەی (هود) لە (یەمەن)ە، هەندێکی تر دەفەرموون لە (دیمەشق)ە، لە مزگەوتەکەی خۆیدا لەدیواری پێشەوەیدا شوێنێك هەیە، هەندێ کەس گومانیان وایە کە گۆڕی حەزرەتی (هود) (علیه السلام)لەوێدایە ... خوای گەورە خۆی دەزانێت .

## ﴿پێغەمبەری خوا صالح (درووود و سەلامی خوای لەسەر بێت)﴾

واتە پێغەمبەری گەلی (ثەمود)، کە هۆزێکی ناسراون و بەناوی باپیرەیانەوە ناونراون کە (ثمود) برای (جدیس)ە و هەردووکیان کوڕی (عاثر)ی کوڕی (إرم)ی کوڕی (سام)ی کوڕی (نوح)ن(علیە السلام)، لە عەرەبی عاریبەن، لەو شێوە بەردداوییەی نێوان حیجاز و تەبوك دا دەژیان، پێغەمبەرمان (ﷺ) لەگەڵ کۆمەڵێ موسوڵمان بە تەبووك دا ڕۆیشتووە، ئەم هۆزەش لەدوای (عاد)بوون و بت پەرست بوون .

خوای گەورە بەندەیەکی کردە پێغەمبەر و ڕەوانەی فەرموو بۆ سەریان کە ناوی (صالح)ی کوڕی (عوبەید)ی کوڕی (ماسح)ی کوڕی (عوبەید)ی کوڕی (حادر)ی کوڕی (ثمود)ی کوڕی (عاثر)ە کوڕی (أرم)ی کوڕی (نوح)ە (علیە السلام)بانگیکردن بۆ یەك خوایی پەرستی و وازهێنان لەبت و هاوەڵەکان، هەندێکیان باوەڕیان پێهێنا، بەڵام زۆربەیان باوەڕیان نەهێنا، کەوتنە هەڕەشە لێکردن و ئازاردانی، بگرە دەیانوویست بیکوژن تەنانەت ئەو وشترەیان کوشت کە خوای گەورە بۆ بەڵگەی پێغەمبەرایەتی (صالح) بۆی ناردبوون، ئیتر خوای گەورەش بەسزای خۆی گرتنی و لەناوی بردن .

بۆ زانینی ئەو ئایەتانەی کە باسی حەزرەتی (صالح) و گەلەکەی و موعجیزەکەی و چارەنووسەکەی دواییان دەکەن بە ووردی تەفسیری ئەم ئایەتانە بخوێنەوە کە لەخوارەوە ناوی سورەتەکان و ژمارەی ئایەتەکانمان نووسیوە:

| ناوی سورەت | ژمارەی ئایەت |
|---|---|
| سورەتی الاعراف | (٧٣) بۆ (٧٩) |
| سورەتی هود | (٦١) بۆ (٦٨) |
| سورەتی الحجر | (٨٠) بۆ (٨٤) |
| سورەتی الإسراء | (٥٩) |

| ناوی سورەت | ژمارەی ئایەت |
|---|---|
| سورەتیا لشعراء | (١٤١) بۆ (١٥٩) |
| سورەتی النمل | (٤٥) بۆ (٥٣) |
| سورەتی فصلت | (١٧) بۆ (١٨) |
| سورەتی القمر | (٢٣) بۆ (٣٢) |

لە گەلێك شوێنی قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە ناوی (عاد) و (ثمود)ی پێکەوە هێناوە، وەك لە سورەتی (براءة، ابراهیم، الفرقان، ص، ق، النجم، الفجر) .

دەڵێن ئەم دوو گەل و هۆزە (اهل الکتاب) هیچ شتێك دەربارەیان نازانن، تەنانەت لە (تەورات)یش دا باسیان نەکراوە، بەڵام لە قورئاندا ئەو بۆچوونە ڕەت دەکاتەوە تەنانەت بە (موسا)ش ڕاگەیەنراوە، هەروەکو خوای گەورە لەسەر زمانی (موسی) لە قورئاندا دەفەرموێت:

﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ لا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا اللَّهُ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَرَدُّوا أَيْدِيَهُمْ فِي أَفْوَاهِهِمْ وَقَالُوا إِنَّا كَفَرْنَا بِمَا أُرْسِلْتُمْ بِهِ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِمَّا تَدْعُونَنَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ﴾ الآية[1]، **ڕووکاری ئایەتەکە وا نیشان دەدات کە حەزرەتی (موسا) (علیه السلام)بەو جۆرە لەگەڵ گەلەکەی خۆی دواوە، سەبارەت بەوەشیان کە گوایە ئەو دوو گەلە (عاد، ثمود) لەبنەچەدا لە عەرەب بن یان نا، ئەوەیان بەتەواوەتی نەزانراوە، ئەگەر چی هەواڵ و زانیاری دەربارەیان لەسەردەمی (موسی) (علیه السلام)دا باوبووە و زانراوە .**

**هۆزی (صالح) (علیه السلام)عەرەب بوون، لەدوای (عاد) ژیاون، تەنانەت خۆشیان نەیاندەزانی کێ لەپێش خۆیانەوە بووە، بەڵام کەللەڕەق و بێباوەڕ بوون، هەربۆیە حەزرەتی (صالح) (علیه السلام)بە گەلەکەی خۆی فەرموو:**﴿وَاذْكُرُوا إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاءَ مِنْ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي الْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِنْ سُهُولِهَا قُصُوراً وَتَنْحِتُونَ الْجِبَالَ بُيُوتاً فَاذْكُرُوا آلاءَ اللَّهِ وَلا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾[2]، **واتا: بیربکەنەوە کە چۆن خوای گەورە ئێوەی کردە میراتگری (عاد) لەم زەویەدا کە لەدەشتەکاندا کۆشك و تەلار دروست دەکەن و شاخەکانیشتان هەڵکۆڵیوەو خانووتان تێدا دروست کردون، دەبێ لە بەخششەکانی خوا بکەنەوە و سوپاسی بکەن و خراپە و نادانی لەسەر زەویدا بڵاو مەکەنەوە . مەبەست لەوەیە کە سوپاسی خوای گەورە بکەن کە ئەو ژیری و زرنگیەی پێداون هاوەڵی بۆ دامەنێن و بەتەنها ئەو خوایە بپەرستن بە کردەوەش دەریبخەن کە ئێوە سوپاس گوزارن، دەستم دامێنتان لە فەرمانی خوا لامەدەن و هاوەڵی بۆ بڕیار مەدەن ئەگینا چارەنووسێکی خراپ دێتە ڕێتان . لەبەر ڕۆشنایی شێوازی بانگخوازیەکەی و ئەو بڕگە و دەستەواژە ناسکانەی بەکاریی هێناون و لە قورئانی پیرۆزدا بۆ پێغەمبەری ئازیزمان خەڵات کراون، دەردەکەوێت کە حەزرەتی (صالح) جگە لەوەی کە پێغەمبەری خوا بووە، مرۆڤێکی زۆر بەبەزەیی و بەسۆز و نەرم و نیان و بە ئەدەب و مەند و بە حیکمەت بووە .**

**حەزرەتی صالح (علیه السلام)ئامۆژگاری گەلەکەی دەکرد و فەرمووی: (ئەوەتا هەروا بە بەبێوەیی لێرەدا ئەژین، لەناو باخچەی جوان و کانیاوەکان و کشتوکاڵ و خورما پێگەیوەکانتاندا، لەشاخەکان خانووبەرە بۆ خۆتان هەڵدەکۆڵن دەیسا خوا بپەرستن و گوێڕایەڵی بکەن، گوێڕایەڵی زێدەڕەوان مەکەن کە ئەوان خراپە لەسەر زەویدا بڵاو**

---

[1] **سورەتی ابراهیم / ٨ بۆ ٩ .**

[2] **سورەتی الاعراف / ٧٣ بۆ ٧٤ .**

ئەکەنەوەو چاك نابن) [1]، هەروەها پێی فەرمـوون:(گەلەکەم خوا بپەرستن جگە لە ئەو هیچ پەروەردگارێکی تر نیە، هەر ئەو خوایە لەزەویەوە دایڕشتن و ئاوەدانی پێدان، واتا: خۆتان زەوی ئاوەدان بکەنەوە)[2]، (پەشیمان ببنەوە و تەوبە بکەن)[3]،چونکە (پەروەردگاری من نزیکە و وەڵام دەداتەوە)[4]. کەچی ئەوان زۆر بێشەرمانە وەڵامیان دایەوە و پێیان گوت:(ئەی صالح دەمێکە ئێمە پێتمان وتووە کە تکامان بگرە)وبەعەقڵی خۆتدا بچۆرەوە و ئەم جۆرە قسانە واز لێبێنە، مەڵێ واز لەئاینی باو و باپیرانتان بێنن وتەنهاخوا بپەرستن،باشە تۆدەتەوێت(ئەوشتانە نەپەرستین کە باو و باپیرانمان پەرستویانن، لەبەرئەوە دوودڵین لەو قسانەی دەیانکەیت)[5] .

بەڵام هێشتا هەر بەنەرمی وەڵامیدەدانەوە و دەیفەرموو چ گومانێکتان لە قسەی کەسێکدا هەیە کە بانگتان دەکات بۆ ڕێگەی هەق و ڕاست؟! ئێوە چ بیانوویەکتان بەدەستەوەیە بۆلای خوا؟ کاتێك داوام لێدەکەن کە بانگتان نەکەم بۆ ئەو ڕێبازە بەرزەو گوێڕایەڵی خوا، من ناتوانم وا بکەم، چونکە بانگەوازکردنتان ئەرکی سەرشانی منە . . لەبەرئەوە تا خوای گەورە خۆی کێشەی نێوانمان یەك لا دەکاتەوە من هەر بەردەوام دەبم.

هەروەها پێیان گوت: ﴿قَالوا إنّما أنتَ مِنَ المُسَحرِين﴾[6]،واتا: تۆ جادووت لێکراوە، نازانی چی لە نزاکانت دا دەڵێی، ئەگینە چۆن بەئێمە دەڵێی دەبێت تەنها یەك خوا بپەرستن و لەپەرستنی شتی تر دوور بکەونەوە، یاخود واتا: (خۆت جادوگەریت)، واتا: ڕاستە تۆ مرۆڤی، بەڵام مرۆڤێکی جادووگەریت، هەروەکو دەیانگوت: ﴿مَا أنتَ إلا بَشَرٌ مِثْلُنا﴾[7] یان (ئەگەر ڕاست ئەکەیت نیشانەیەکمان بۆبێنە)[8]. بەو جۆرە داوایان لێکرد کە شتێکی دەرئاسا (خوارق العادات)یان بۆ بهێنێ: تا بەڵگەبێ لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی (صالح)( علیە السلام)، خوای گەورەش وشترێکی کرد بە بەڵگەی ئەو پێغەمبەرە و فەرمووی:

---

[1] سورەتی الشعراو / ١٤٩ – ١٥٢ .

[2] سورەتی هود / ٦٢ .

[3] سورەتی هود / ٦٢ .

[4] سورەتی الشعراو / ١٤٩ – ١٥٢ .

[5] سورەتی هود / ٦٣ .

[6] سورەتی الشعراو / ١٥٣ .

[7] سورەتی الشعراو / ١٥٤ .

[8] سورەتی الشعراو / ١٥٥ تا ١٥٦ .

﴿قَالَ هَذِهِ نَاقَةٌ لَهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَعْلُومٍ ، وَلا تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ [1]،
واتا:(ئەوە وشترێکە ڕۆژێك نۆرەی ئەوە بۆ ئاو خواردنەوەو ڕۆژێکیش نۆرەی ئێوەیە، کە هەردوو کاتەکە دیاریکراوە، هەرگیز بەخراپ توخنی مەکەون، ئەگینا سزای گەورەتان دێتە ڕێ)، هەروەها خوای گەورە لەئایەتی (٧٣)ی سورەتی (الاعراف) و ئایەتی (٥٩)ی سورەتی (الاسراء)دا باسی ئەو وشترەی کردووە . ڕاڤەکارانی قورئان وا باس دەکەن کە ڕۆژێك گەلی (ثمود) لەیانەی خۆیان کۆببوونەوە، لەو کاتەدا حەزرەتی (صالح) (علیه السلام)بەلایاندا ڕابورد و بانگیکردن بۆ خواپەرستی و یادی خستنەوەو فەرمانی پێکردن بۆ بەرفەرمانی خوای گەورە، بەڵام ئەوان لە وەڵامدا پێیان گوت: دە تۆ وشترێك لەو بەردە دەر بێن، وشترەکە فلآن و فیسارە سیفەتی تێدابێ، بەرز و تووك درێژ و ئاواو ئاوابێ . . !! حەزرەتی (صالح) (علیه السلام)فەرمووی: ئەگەر خوای گەورە داواکەم بێنێتە دی و چۆنتان داواکردووە، بەو پێیە وشترێك لەو بەردە بێتە دەرەوە، ئایا باوەڕ دەهێنن و موسوڵمان دەبن ؟ گوتیان بەلێ، لەسەرئەوە پێك هاتن و پەیمانیان دا .

ئینجا حەزرەتی صالح (علیه السلام)چووە جێ نوێژەکەی خۆی و ئەوەندەی بۆی دانرابوو نوێژەکەی کرد، ئینجا دەستی کرد بە پاڕانەوە لەخوای گەورە تاکو داواکەیان بێنێتەجێ، ئینجا خوای گەورە نزاکەی وەرگرت و فەرمانی بە بەردەکە کرد کە لەت بێت و وشترێکی لەو جۆرە لێ بێتە دەرەوە کە داوایان کردبوو . کە ئەوەیان بینی واقیان وڕما . . سەرسام بوون لەو موعجزە گەورەیە و لەو بیانوبڕە لەو بەڵگە ئاشکرایەی وەك خۆری ڕوناك دەدرەوشایەوە، بۆیە هەندێکیان باوەڕیان هێنا، بەڵام زۆربەیان لەسەر سەرگەردانی و گومراییو بێ بڕوایی خۆیان مانەوە پەیمانەکەیان شکاند، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَظَلَموا بِهَا﴾، سەرۆکی ئەوانەی کە باوەڕیان هێنا ناوی (جندع کوڕی عەمروی کوڕی محلاتی کوڕی لەبیدی کوڕی جەواس)بوو، پێشتریش هەر ئەو لەکەسانی سەرگەورەی (ثمود)بوو، ئەوانی تریش دڵیان بەلای ئیسلامدا لێی دەدا، بەڵام زەوئابی کوڕی عەمروی کوڕی لەبیدو حیبابی بەتوان و ڕەبابی کوڕی صەعری کوڕی جولمس ڕێگربوون (جندع) هات (شەهابی کوڕی خەلیفە)ی بانگ کرد بۆ باوەڕ هێنان کە ئامۆزای خۆی بوو، سەرەك هۆزیش بوو، ویستی موسوڵمان ببێ، بەڵام هەمان کۆمەڵی پێشوو

---

[1] سورەتی الشعراو / ١٥٥ تا ١٥٦ .

پەشیمانیان کردەوە . حەزرەتی صالح (علیه السلام)فەمووی: ﴿هَٰذِهِ نَاقَةُ اللَّهِ﴾ [1]، واتا: ئەمە وشتری خوایە، بۆ ڕێز لێگرتنی وشترەکە،هەروەکو چۆن دەوترێت (بیت الله)، بۆ بەڕێزگرتنی ئەو خانووە پیرۆزە . هەموویان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتن کە وشترەکە لە ناویاندا هەر وا بمێنێ و لەکام زەوی حەزی لێبوو بلەوەڕێت، سەرچاوەی ئاو خواردنەوەشیان (بیر)ێك بوو، وا ڕێك کەوتن ڕۆژێك ئاوی بیرەکە بۆ وشترەکەبێ و ڕۆژێکیش بۆ ئەوان بێت، ئەوان ئەگەر ئەمڕۆ ئیشیان بەئاو هەبوایە و نۆرەیان نەبوایە، ئەبوایە ئیشەکانیان دوابخستایە بۆ سبەینێ، ئەگەر چی وتراوە بڕی شیرەکەی بەشی هەموویانی کردووە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا مُرْسِلُوا النَّاقَةِ فِتْنَةً لَهُمْ﴾ [2]، واتا: ئێمە ئەو وشترەمان بۆ تاقیکردنەوەی ئەوان نارد، ئاخۆ باوەڕ ئەهێنن یان نا؟! خوای گەورە دەزانێت، بەلاّم تۆ (ئەی صالح): ﴿فَارْتَقِبْهُمْ﴾: چاوەڕوان بە تا بزانیت چییان بەسەردێت! هەروەها ئارام بگرە لەبەرانبەر ئازاردانی ئەوان بۆت. هەواڵی ئەو چارەنووسەت پێدەگات کە دێتە ڕێیان.

کاتێ نۆرە ئاوەکە لەناویاندا درێژەی کێشا، ئیتر زاناکانیان کۆبوونەوەو بڕیاریاندا کە وشترەکە بکوژن، تاکو لەدەستی بحەسێنەوەو ئاوەکەش تەنها بۆ خۆیان بێت، خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرموێ: (وشترەکەیان کوشت، لە فەرمانی پەروەردگاریشیان یاخیبوون و گوتیان: ئەی صالح پەیمانی چ سزایەکت پێداوین بەسەرمان بێنە!) [3]، ئەوەیان کە کوشتنی وشترەکەی گرتە ئەستۆی خۆی (قەداری کوڕی سالفی کوڕی جندع)ی سەرکردەیان بوو کە پیاوێکی سوری شین باوی بەڵەك بوو، وا باوبوو کە بە زۆڵی لە (سالف)ی باوکی کەوتۆتەوە، ئەگینا لەڕاستیدا کوڕی پیاوێکی ترە کەناوی (صبیان) بووە، بەڕای گشتی هەموولایەکیان کوشتنی وشترەکەیان بە ئەو سپارد، لەبەرئەوەش بوو کە کوشتنەکە دراوەتە پاڵ هەموویان .

(ابن جریر) و هەندێ لە ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز دەڵێن: لەناو (ثمود)دا دوو ژن هەبوون کە ناویان (صدوق) و (عنیزە)بوو یەکەمیان ئافرەتێکی زۆر جوان بوو، کاتێك مێردەکەی باوەڕی هێنا بە صالح ئیتر وازی لەمێردەکەی هێنا، بە (مصرع)ی ئامۆزای خۆی گوت: خۆمت پێشکەش دەکەم ئەگەر وشترەکە بکوژیت، دووەمیشیان ژنی

---

[1] سورەتی هود / ٦٤ .

[2] سورەتی القمر / ٢٧ .

[3] سورەتی الاعراف / ٧٧ .

(ذۆاب)ی کوڕی (عەمرو)ی سەرکردەبوو، چوار کچی هەبوو، بە (قدار)ی گوت: لەو چوار کچە کامیانت دەوێ دەتدەمێ بە مەرجێ وشترەکە بکوژیت، بەم جۆرە ئەو دوو لاوە خۆیان گیانفیدا کرد بۆ کوشتنی وشترەکە، پاشان (حەوت) کەسی تریش هاتنە لایان و بوون بە (نۆ)کەسی تەواو، بەم جۆرە لە قورئانی پیرۆزدا باس کراوە .

﴿وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ﴾[1]، ئەمانە هەوڵیان ئەدا کە پشتیوانی تەواو بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن لەناو هۆزەکەیاندا ئەوانیش بەدەمیانەوە هاتن و پشتیوانی خۆیان دەربڕی، ئیتر بڵاوبوونەوەو لە هەموو لایەکەوە چاویان دەگێڕا بۆ دۆزینەوەی وشترەکە، کە دەرکەوت (مصرع)ی کوڕی (مهرج)ی کوڕی (مەحیا) تیرێکی تێگرت و ئێسکی قاچی پێکا، ئیتر ژنان بەگۆرانی و پیاهەڵدانەوە هاتن، تا هانیان بدەن بۆ کوشتنی وشترەکە، (قەداری کوڕی سالف)گوڕوتینی دایە خۆی و بە شمشێرەکەی قورگی هەڵبڕی، وشترەکە کەوت بە زەویدا و نیخەیەکی گەورەو ترسناکی لێهات جارێکی تر پەلاماریدا و سەری لێکردەوە، ئیتر ڕایکردە سەر کێوێکی بەرز و سێ جار هاواری کرد دەگێڕنەوە وشترەکە وتویەتی: ئەی پەروەردگارەکەم کوا دایکم؟ ئیتر چۆتەوە ناو بەردەکە و دیارنەماوە، دووبارە دەڵێن: شوێنی کەوتوون و دۆزیویانەتەوە و کوشتویانە، خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿إِذِ انبَعَثَ أَشْقَاهَا فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ نَاقَةَ اللَّهِ وَسُقْيَاهَا﴾[2] هەروەها دەفەرموێ: ﴿فَنَادَوْا صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَى فَعَقَرَ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾[3]، وە دەفەرموێت: ﴿فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنبِهِمْ فَسَوَّاهَا وَلَا يَخَافُ عُقْبَاهَا﴾[4] .

پێغەمبەر (ﷺ) وتاری دەفەرموو، باسی وشترەکەی کرد و پاشان ناویشی برد، فەرمووی: ﴿إِذِ انبَعَثَ أَشْقَاهَا﴾، واتا پیاوێکی بەجەرگ و سەرۆك خێڵێکیان هەڵبژارد کە خەڵکی گوێیان بۆ فەرمانەکانی دەگرت، تاکو وشترەکە بکوژێت، پیاوێك بوو وەکو (ابی زمعة) وابوو [5] . پێغەمبەر (ﷺ) بە (عەلی) فەرمووی: پێت بڵێم شەقاوەترین کەس کێیە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: دووکەسن: یەکەمیان پیاوە سوور باوەکەی (ثمود)ە کە وشترەکەی

[1] سورەتی النمل / ٤٨ .

[2] سورەتی الشمس / ١٢ — ١٣ .

[3] سورەتی القمر / ٢٩ — ٣٠ .

[4] سورەتی الشمس / ١٤ — ١٥ .

[5] صحیح البخاری (٤٩٤٢/٩١/٦٥) .

کوشت و دووەمیشیان ئەوەیە کە تۆ شەهید دەکات و ریشی بەخوێنی تۆ تەڕدەبێ)، ابن أبی حاتم گێراویەتییەوە .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَعَقَروا الناقة وَعَتَوا عَن أمر رَبهم وَقالوا ياصالِحُ آتِنا بِماتَعِدُنا إن كُنتَ مِنَ المُرسَلين﴾ [1]، ئەم کار و گفتارەیان لەچەند سەرێکەوە بێباوەڕیەکی ئاشکرایە، لەوانەش: فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەیان شکاند بە کوشتنی ئەو وشترەی کە یەکێك بوو لە نیشانەکانی خوای گەورە بۆی ناردن، پەلەیان کرد لەوەی کە خوای گەورە ئەو سزایەیان بدات کە لەسەر زاری حەزرەتی صالح پەیمانی پێداون، ئەوەش مەرجی خوایی تێدایە بۆ سزادانیان لە دوو ڕووەوە: ڕووی یەکەم مەرجێکی پابەندە کە فەرموویەتی ﴿وَلا تَمَسوها بِسوءٍ فَ يَأخُذَكُم عَذابٌ قَريب﴾[2]، لەگەڵ ئایەتی ﴿يَومٍ عَظيم﴾[3] و﴿أليمٌ﴾[4]،لە ڕووی دووەمیشەوە: پەلەیان کرد لەوەی کە سزاکەیان بۆ پێش بخرێ، هەروەها پێغەمبەریان بەدرۆ دەزانی لەکاتێکدا بەڵگەی تەواو و ڕاست و دروستیشی بۆ هێنابوون، بەڵکو ئەوان خۆیان ڕێگەی ئینکاری و سەرکەشی و ناهەقییان گرتەبەر، بەمەش سزای خواییان بۆ خۆیان حەڵاڵ کرد، خوای گەورە فەرمووی: ﴿فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُوا فِي دَارِكُمْ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ ذَلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ﴾ [5] .

دەگێڕنەوە کاتێ ویستیان وشترەکە بکوژن، یەکەم کەس کە دەست پێشخەری کرد (قەداری کوڕی سالف)بوو،خستی بە زەویدا، پاشان ئەوانی تر بە شمشێر تێیکەوتن،کاتێك بەچکەکەی ئەوەی بینی،لەدەستیان ڕایکرد،لەبەرئەوە حەزرەتی(صالح)(عليه السلام)پێی فەرموون: ﴿تَمَتَّعوا في دارِكُم ثَلاثَةَ أيام﴾، واتا: تا سێ ڕۆژی تریش لە ماڵەکانتاندا بمێننەوەو ڕابوێرن، مەبەست لە (سێ) ڕۆژەی داهاتووە، نەك ئەو ڕۆژەی تیایدابوون، دیسان بۆئەوەش هەر گاڵتەیان پێدەهات، بگرە دەمەو ئێوارە پیلانیان دانا بۆ کوشتنی حەزرەتی صالح و گوتیان: ﴿قَالُوا تَقَاسَمُوا بِاللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُ وَأَهْلَهُ﴾ [6]، ئاوا: سوێندیان خوارد بەخوا، کە دەبێت صالح و خێزانەکەی لە ماڵەکەی خۆیدا خانەکوژ

---

[1] سورەتی الاعراف / ٧٧ .

[2] سورەتی هود / ٦٤ .

[3] سورەتی الشعراو / ١٥٦ .

[4] سورەتی الاعراف / ٧٣ .

[5] سورەتی هود / ٦٥ .

[6] سورەتی النمل / ٤٩ .

بکەن و پاشان ئینکاری بکەن کە ئەوان شتی وایان نەکردووە، ئەگەر کەسێك داوای خوێنی تۆڵەی کرد، بۆیە گوتیان: (پاشان دەڵێین بەخوێن گرەکەی ئاگامان لە تیاچوونی ئەو نیە، ئێمە لەڕاست گۆیانین) [1]، خوای گەورە دەفەرموێت: (فێڵیان کرد، چۆن فێڵێك ! فێڵمان لێکردن، چۆن فێڵێك! ئەوان هەستیان پێنەکرد، بڕوانە سەرەنجامی فێڵ و تەڵەکەیان چیبوو، ئێمە ئەوان و هۆز و تیرەیانمان بەگشتی وێران کردن، ئەوەش ماڵە کاولەکانیانە بەهۆی ستەمیانەوە، ئەمانە بەڵگە و نیشانەن بۆ کەسانێك کە بزانن ئەوانەشمان ڕزگار کرد کە باوەڕداربوون و تەقواکاربوون) [2] .

سەرەتا خوای گەورە ئەو چەند کەسەی بەردباران کرد کە نەخشەیان دانابوو بۆ کوشتنی حەزرەتی صالح، لەپێش ئەوانی تردا، ڕۆژی پێنج شەممە بوو بە ڕۆژی یەکەمی چاوەڕوانییان ئەو ڕۆژە ڕوخساریان زەرد هەڵگەڕابوو، کاتێ ڕۆژگار گەیشتە ئێوارە هەموویان بە گاڵتە پێکردن گوتیان: ئەوا ڕۆژی یەکەمی نزیکبوونەوەی سزاکە تەواوبوو، چوونە ڕۆژی هەینییەوە کە دووەم ڕۆژی نزیك بوونەوەی سزاکەیان بوو، ڕەنگی ڕووخساریان سوور هەڵگەڕا، کە ئێوارە داهات دیسان گوتیان: ئەوا ڕۆژی دووەمیش بەسەرچوو، ئیتر پێیان نایە ڕۆژی شەممەوە، کە ڕۆژی چالاکی کاروکاسبییە و ڕۆژی سێهەمیان بوو، ڕووخساریان ڕەش هەڵگەڕابوو، هەر کە ئێوارە هات، بەهەمان شێوازی ڕۆژانی دی، گوتیان ئەوە ماوەکە تێپەڕی ! کەچی هیچ ڕووی نەدا . سەرلەبەیانی ڕۆژی یەك شەممە دانیشتبوون و چاوەڕوانی سزاکەیان دەکرد، نەیاندەزانی چۆن و لەکوێوە سزاکەیان بۆ دێت و چییان بەسەر دێت، لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا دەنگێکی زۆر بەهێز و تیژ لەئاسمانەوە هاتە سەریان و زەوی ژێر پێشیان کەوتە جوڵە و لەرزین، زینۆقیان چوو، زراویان تەقی، مێشکیان تەقی، گیانیان دەرچوو، جم و جوڵیان نەما، هیچ دەنگێگ سەدای نەما، ڕاستیەکان دەرکەوتن، هەموویان بوون بە لاشە و تەرمی بێگیانی ناو خانووەکانیان، کەس ڕزگاری نەبوو، جگە لە جاریەیەکی قاچ بەستراو کە ناوی (کەلبەی کچی سەلەق) بوو، پێیان دەگوت: (ذریعة)، زۆر دژایەتی حەزرەتی صالحی دەکرد، هەر کە سزاکەی بەدیکرد، قاچەکانی بەرەڵا کرد و دەستی بە ڕاکردن کرد، چۆن ڕاکردنێك !خۆی گەیاندە ئاوەدانیەکی عەرەبەکان و هەواڵی کارەساتەکەی پێ ڕاگەیاندن، ئاوی بۆ دەگێڕان کاتێك ئاوەکەی خواردەوە ئەویش مرد، شوێنەوار و شارەکەیان وای

---

[1] سورەتی النمل / ٥٠ – ٥٣ .

لێهات کە دەتگوت هەر هیچ کاتێك ئاوەدانی تێدانەبووە، وەك بەزمانی حاڵ گوترابێ (ثمود بڕوایان بە پەروەردگاری خۆیان نەهێنا دەك ئەولاترچن ثمود) [1] .

کاتێ پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) بە (حجر)دا تێپەڕی، فەرمووی: (داوای بەڵگە و سزامەکەن، گەلی صالح داوایان کرد، واتە: داوایان کرد وشترێك لە بەردێك بێتە دەرەوە لەم دۆڵەدا هاتووچۆی دەکرد، هێشتا فیزیان نواند بەرانبەر فەرمانی خوا و وشترەکەشتیان کوشت، ئەو وشترەی کە ڕۆژێك نۆرەی ئاو خواردنەوەی بوو، ڕۆژی دواییش شیری دەدانێ کە بەشی هەموویانی دەکرد، ئیتر خوای گەورە لەئاسمان و زەوییەوە سزای بۆ ناردن، هەموویانی لەناوبرد، جگە لە پیاوێك نەبێت کە لەو کاتەدا لە کەعبەدا بوو، پرسیان لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو پیاوە کێبوو ؟ فەرمووی ئەبوڕغال بوو، هەر کە لەماڵی خوا هاتە دەرەوە، هەمان سزای گەلەکەی گرتیەوە و کوشتی) [2] .

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) بەلای گۆڕی (ابی ڕوغال)دا تێپەڕی، فەرمووی: ئەزانن ئەمە گۆڕی کێیە؟ گوتیان خوا و پێغەمبەرەکەی دەزانن، فەرمووی ئەوە گۆڕی ئەبی ڕوغالە کە پیاوێکی ثمود بوو، کاتێ خوای گەورە سزایدان، ئەم پیاوە لەماڵی خوادابوو، لەبەرئەوە پارێزراوبوو، هەر کە هاتە دەرەوە، هەمان سزای گەلەکەی بەسەر ئەویش هات، ئیتر لەم شوێنەدا بە خاك سپێردرا، چڵە دارێکی زێڕیش لەگەڵیدا خرایە گۆڕەکەیەوە، ئیتر خەڵکەکە کەوتنە کێڵانەوەی شوێنەکە بە شمشێرەکانیان و لە چڵە زێڕینەکە گەڕان، تا دۆزیانەوە و دەریان هێنا، ئەبو ڕوغال ناوێکی تریشی هەبووە کە (أبو ثقیف)بووە . حەزرەتی صالح(علیه السلام)پاش تیاچوونی گەلەکەی چووە سەر تەرم و شوێنەوارە کاولەکەیان و فەرمووی:

﴿فَتَوَلَّى عَنْهُمْ وَقَالَ يَا قَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَكِنْ لا تُحِبُّونَ النَّاصِحِينَ﴾[3]، واتا: ئەی گەلۆ، ئەمن پەیامی پەروەردگارم پێڕاگەیاندن و ئامۆژگاریم کردن، وەلێ ئێوە ئامۆژگارانتان خۆش ناوێ . بەڵێ، حەزرەتی صالح (علیه السلام)بەوپەڕی هەوڵەوە بە ئارام و خۆگرییەکی زۆرەوە پەیامی حەق و ڕاستی پێڕاگەیاندن، فێڵی لێنەکردن، بەڵام ئەوان گاڵتەیان لێدەهات، تاکو خوای گەورە سزایدان ،هەر بەهەمان جۆر پێغەمبەری خۆیشمان

---

[1] سورەتی هود / ٦٨ .

[2] مسند الامام أحمد (٣/٣٩٦/حلبی)، المغنی فی الچعفاو (٢/٦٣٢، ٦٣٣/٥٩٨٠) .

[3] سورەتی الاعراف / ٧٩ .

حەزرەتی محمد (ﷺ) لەگەڵ خەڵکی (قەلیب)ی [1]، (بەدر) قسەی کرد، پاش تێپەڕبوونی سێ ڕۆژ بەسەر مردنەکەیاندا و پێغەمبەر (ﷺ) بەسواری ولأخەکەیەوە بوو، فەرمووی: ئەی خەڵکی قەلیب، ئایا بە ڕاستی ئەوەتان دی کە پەروەردگارتان پەیمانی پێدابوون، من ئەوەم دەست کەوت کە خوای گەورە بە ڕاستی پەیمانی پێدابووم، شتی تری پێگوتن، فەرمووی: (خراپترین خزم و هۆزی پێغەمبەران ئێوە بوون بۆ پێغەمبەری خۆتان، ئێوە بە درۆتان دەزانیم و خەڵکی تر بە ڕاستیان دەزانیم، ئێوە شاربەدەرتان دەکردم و خەڵکی تر داڵدەیان دەدام، ئێوە دەتان کوشتم و خەڵکی تر سەرکەوتویان دەکردم، خراپترین خزم و تیرەی پێغەمبەران بۆ پێغەمبەرەکەیان ئێوە بوون .

عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا قسە بۆ کەسانێك ئەکەی کە مردوون و لاشەکانیان بۆگەنی کردووە وشك و ڕەق هەڵاتوون؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئێوە لەئەوان باشتر لێم نابیستن، بەڵام توانای وەڵام دانەوەیان نیە .دەڵێن: دوای ئەوە ئیتر حەزرەتی صالح (علیه السلام)ڕۆیشت بۆ کەعبە و لەوێ ژیا هەتا کۆچی دوایی کرد .لە(ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: کاتێك لە ڕێگەی حەج دا پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ)بە دۆڵی عەسفان دا پێپەڕی، بە(ابو بکر)ی فەرموو:ئەی(ئەبی بکر) ئەمە چ دۆڵێکە ؟ ابوبکر فەرمووی: دۆڵی عەسفانە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هود و صالح بەم دۆڵەدا هاتوون بۆ حەج، بەسواری وشتری لاوی کۆپان ڕیشاڵدار، عابایان بەسەر شانەوە بووە و بوردەی چنراویان پێوە بووە، هاتوون بۆ حەجی ماڵی خوا) [2] .

لە (ابن عمر)ەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لەتەبوك دابەزی لە دۆڵی (حجر)ی لای کۆنە ماڵەکانی (ثمود)، خەڵکی لەو بیرانە ئاویان خواردەوە کە گەلی (ثمود) کاتی خۆی لێیان دەخواردەوە، ئیتر دەستیان کرد بە هەویر شێلان و جەوەندە پڕ ئاوکردن، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردن کە جەوەندە ئاوەکان بڕێژن و هەویرەکەش بدەن بە وشترەکان ئینجا ڕۆیشتن تا گەیشتنە ئەو بیرەی کەکاتی خۆی وشترەکەی صالح ئاوی لێدەخواردەوە، لێرەشدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردن کە نەچنە ناو پاردە و شوێنەوارە کاولەکانی (ثمود)ەوە، ئینجا فەرمووی: (دەترسم

---

[1] قلیب: بئر قدیم: بیرێکی کۆن و دێرین .

[2] مسند الامام أحمد (١/٢٣٢/حلبی) .

ئەوەی بەسەر ئەواندا هات بەسەر ئێوەش بێت، لەبەرئەوە مەچنە لایان) [1]، (عبداللە)ی کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەدۆڵی حجردا فەرمووی: (مەچنە لای ئەو سزادراوانە، مەگەر بەگریانەوە، جا ئەگەر گریانتان نایەت مەچن، نەبادا ئەوەی بەسەر ئەواندا هات بەسەر ئێوەش دا بێت) [2].

لە (عامری کوڕی سعد)ەوە دەگێڕنەوە کە لەجەنگی تەبوکدا موسوڵمانان زۆر بە پەلەبوون تا بچنە سەر شوێنەوار و کاولگەکانی خەڵکی (حجر)، ئەو هەواڵەش بە پێغەمبەر گەیشتەوە (ﷺ)، ئیتر پێغەمبەر (ﷺ) بانگیدا و فەرمووی: (الصلاة جامعة)، عامر دەڵێت: هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەستی بە وشترەکەی خۆیەوە بوو، فەرمووی مەچنە سەر شوێنەواری گەلێك کەخوای گەورە قین و خەشمی لێگرتوون و سزایداون، پیاوێك وتی ئەی پێغەمبەری خوا بۆ ئەوە دەچین بۆ سەرسامی خۆمان دەربڕین بەرانبەر تەواناى خواى گەورە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئایا هەواڵی شتی لەوە سەرسامترتان پێڕابگەیەنم؟ پیاوێك لە خۆتان هەواڵی ڕابردوو و داهاتووتان پێدەڵێت (واتا پێغەمبەر خۆی) ...)).

وا باس کراوە کە خەڵکی سەردەمی صالح (علیه السلام)تەمەنیان درێژ بووە، خانوویان دروست دەکرد، خانوەکە لەکۆنیدا دەڕوخا، هێشتا هیچ کام لە ئەندامانی ئەو خێزانە نەمردبوون، ئیتر خانویەکیان لەشاخ بۆ هەڵ دەکەندرا .کاتێك هۆز و گەلەکەی داوایان لە حەزرەتی صالح (علیه السلام)کرد کە بەڵگە و نیشانەیان بۆ بنوێنێ، خوای گەورە وشترەکەی لە بەرد بۆ دەرهێنان، خوای گەورە ئاگاداری کردنەوە کە ئەگەر ئەو وشترە ئازار بدەن سزا دەچێژن، هەروەها ئاگاداریشی کردبوونەوە کە ئەوان وشترەکەش دەکوژن و ئەو کارەشیان ئەبێتە مایەی تیاچوونی خۆیان، تەنانەت سیفەتەکانی ئەو پیاوەشی بۆ باس کردبوو کە وشترەکە دەکوژێت، بەم ڕەنگە کە پیاوێکی سووری شین باوە، ئیتر بەهەموو مامانەکانیان ڕاگەیاند، هەر کاتێك منداڵێکی لەو شێوەیە لەدایك بوو، بیکوژن .

ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو بارودۆخەدا تێپەڕی چەندین بەرەی خەڵکی ژیان و مردن، یەکێك لەسەر هۆزەکانیان کچێکی سەرهۆزی ناوداری بۆ کوڕەکەی خواست، ئەو منالەی لەو دوانەکەوتەوە (قەداری کوڕی سالف)بوو، کە وشتر کوژەکە بوو، مامانەکان نەیانتوانی

---

[1] بخاری (۱۵/۶۵ – ۲/۴۷۰۲/فتح)، صحیح مسلم (۲۹۸۱/۱/۵۳) .

[2] مسند الامام أحمد (۲/۶۶/حلبی) .

که ئەو منالّە بکوژن، چونکە دایك و باوکی ناودار و سەرهۆز و دەست ڕۆیشتوو بوون، کوڕە زۆر بەخێرایی گەورە بوو، یەك هەفتە تەمەنی ئەو بەرانبەر یەك مانگ تەمەنی خەڵکی ئاسایی بوو، تا وای لێهات بوو بە سەرەك هۆزیان، خەڵکی بە فەرمانی ئەو دەجولاّنەوە، یەکەم کەس بوو کە خۆی بەخت کرد بۆ کوشتنی وشترەکە، پاشان هەشت کەسی تری هاوپایەی خۆی هاتنە پاڵی، ئیتر بوون بە نۆ کەس، هەر ئەو نۆ کەسە بەنیازبوون کە دواتر حەزرەتی (صالح)یش شەهید بکەن .

کاتێ هەواڵی کوشتنی وشترەکە گەیشتەوە بە حەزرەتی (صالح)(علیە السلام)، ئیتر بە گریانەوە هاتە ناویان، ئەوانیش دەهاتنە لای و پۆزشتیان دەهێنایەوە و داوای لێبوردنیان لێدەکرد و دەیانگوت: ئەوە کاری پیاوانی ئێمە نیە و ئەو منالّ و مەزنانەمان شتی وایانکردووە!!.

## ﴿پێغەمبەری خوا ( ابراهیم ) ( درووود و سەلامی خوای لەسەر بێت )﴾

ناوی ئیبراهیم کوڕی ناحور کوڕی ساروغ کوڕی ڕاغو کوڕی فالغ کوڕی عابر کوڕی شالح کوڕی ئەرفخشذ کوڕی سام کوڕی نوحە(علیه السلام). بەو پێیەی لە نووسراوی (أهل الکتاب)دا هەیە، لە کتێبیی (المبتدأ)دا هاتووە کە دایکی ئیبراهیم ناوی (ئەمیلە)، بەلاَم (الکلبی) دەڵێت: دایکی ئیبراهیم (علیه السلام)ناوی (بونای کچی کربتای کوڕی کرثی)یە و دەچێتەوە سەر ئەرفەخشەذی کوڕی سام کوڕی نوح (علیه السلام).

لە (ابن عساکر)ەوە دەگێڕنەوە کە نازناوی (ئیبراهیم) بریتیبووە لە (أبا الضیفان)، کاتیێ تارخ تەمەنی حەفتاو پێنج ساڵ بوو کە خوای گەورە ابراهیمی پێبەخشی، لەگەڵ ناحور و هاران، پاشان هارانیش بوو بەباوکی (لوط)(علیه السلام)، بەم جۆرە ئیبراهیم کوڕی ناوەنجی تارخ بووە، هاران هەر لەسەردەمی ژیانی باوکیدا هەر لەو خاکەدا کۆچی دوایی کرد کە تیایدا لەدایك بوو، واتا: (بابل)ی خاکی کلدانیەکان، ئەوەی لای مێژوو نووسەکان باوە بەو جۆرەیە، لە (ابن عباس)ەوە فەرمویەتی: ئیبراهیم لە (غوطە)ی دیمەشق و لەگوندی (بەرزە) لەدایك بووە، لە پەنا کێوی (قاسیون)، بەلاَم ڕاستیەکەیان ئەوەیە کە لە (بابل) لەدایك بوە، بەلاَم لەو شوێنەی دووەمیان نوێژی کردووە کاتیێ هات تا (لوط) لەویێ دامەزرێنیێ . ئیبراهیم سارە خاتوونی مارە کرد، کە منالّی لێی نەبوو، تارخ لەگەڵ ئیبراهیمی کوڕی و سارەی ژنی ئیبراهیم و (لوط)ی کوڕی هارانی برازای خاکی کلدانیان بەجێهێشت و ڕوویان کردە خاکی کەنعانیەکان،لە(حەران) نیشتەجێبوون و لە تەمەنی دووسەد و پەنجا ساڵی دا تارخ لەویێ کۆچی دوایی کرد، ئەمەش ئەوە دەگەیەنیێ کە ئیبراهیم لە (بابل) لەدایك بوە نەك لە (حەران) . کەوتنە ڕیێ بەرەو خاکی کەنعانیەکان، واتە: ولاَتی (بیت المقدس) و لە (حران)ی کلدانیەکان دا مانەوە، هاوکات خاکی شام جزیرەش بوو، خەڵکەکەی حەوت ئەستێرەکەیان دەپەرست، بە جۆرەها شێوە و کردار و گفتار لەبەرئەوە لەسەر هەریەکە لە حەوت دەرگاکەی دیمەشق پەیکەری یەکێك لە حەوت ئەستێرەکان هەبوو، ئەوان جەژنیان بۆ ئەستێرەکان دانابوو و قوربانیشیان بۆ دەکرد . خەڵکی حەران تێکڕا بیێ بڕواو بت پەرست بوون، بگرە خەڵکی سەر زەوی هەر هەمووی بێبڕوابوون، جگە لە ئیبراهیم و سارە و لوط، خوای گەورە بەهۆی ئیبراهیمەوە تاریکایی بێبڕوایی لەسەر زەویدا ڕەواندەوە، هەر بەمناڵی هۆشیاری پێداو لە گەورەییشدا کردی بە (خلیل)، هەروەکو خوای گەورە دەربارەی پێدانی ڕوشد بە ئیبراهیم لە مناڵیدا

دەفەرمویێت: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا إِبْرَاهِيمَ رُشْدَهُ مِنْ قَبْلُ وَكُنَّا بِهِ عَالِمِينَ﴾ [1]، هەروەها خوای گەورە لە سورەتی (العنكبوت)دا لەئایەتی ژمارە (١٦) تا (٢٧) باسی حەزرەتی (ابراهیم) دەکات .
کاتێك خوای گەورە ئیبراهیمی کرد بە پێغەمبەر، یەکەم جار بانگی باوکی کرد بۆسەر ئاینی تاکپەرستی و وازهێنان لە بت پەرستی، لە قورئانی پیرۆزدا بە وردی باسی گفتوگۆی نێوان حەزرەتی ئیبراهیم و ئازەری باوکی کراوە، لە سورەتی (مریم) ئایەتی (٤١) تا (٤٨)، باس لەوە ئەکات کە چۆن ئیبراهیم بەوپەڕی ژیری و حیکمەت و نەرم و نیانەوە لەگەڵ باوکیدا دواوەو تێی گەیاندووە کە ئەو بت و ئەستێرانە توانای بیستن و بینینیان نیە، ئیتر چۆن بۆ پەرستن دەست ئەدەن، بەڵکو بەدیهێنەری ئەستێرەکان و زەوی خۆی زانست و زانیاری بە ئیبراهیم بەخشیوە، ئەگەر چی ئەو لەباوکی منداڵتریشە، پێی گوت: (بابە زانیاریەکم لەخواوە پێدراوە کە بە تۆ نەدراوە، لەبەرئەوە شوێنم بکەوە دەتبەمەوە سەر ڕێیەکی ڕاست) [2] کە بۆ هەردوو دنیات بە سوودە .

جا کە ئیبراهیم (علیه السلام)ویستی ئەم پەیامە بە باوکی ڕابگەیەنێت، باوکی نەك هەر لێی وەرنەگرت، بەڵکو هەڕەشەیشی لێکرد و پێی گوت: ئیبراهیم تۆ دەتەوێ لەسەر خواکانی خۆمان لامان‌دەیت، ئەگەر واز لەو قسانەت نەهێنی ئەوا بەرد بارانت دەکەین، لە کوڕێتی خۆم دەرت دەکەم، بەڵام ئیبراهیم لە وەڵامدا پێی گوت ﴿سَلامٌ عَلَيْكَ﴾، واتا: سەڵاوت لێبێ، دڵنیابە لەمنەوە هیچ ناخۆشی و ئازارێکت پێ ناگات، داوای لێخۆشبوونت لە پەروەردگارم بۆ دەکەم، بەڕاستی ئەو منی زۆر خۆش دەوێت، ئینجا ئیبراهیم فەرمووی: وا من لێتان دوور دەکەومەوە کەنارگیر دەبم لەئێوەی گومڕا و لەو شتانەی کە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن، من تەنها هانا بۆ ئەو دەبەم و ئۆمێدەوارم نائۆمێد و ڕەنجەڕۆم نەکات، نزا و پەرستنشم لێ وەربگرێت .

ئیبراهیم (علیه السلام)هەروەکو پەیمانیدا لە نزاکانیدا بۆ باوکی پاڕایەوە، بەڵام ئەوەش تا ئەو کاتە بەردەوام بوو کە ئیبراهیم زانی باوکی دوژمنی خوایە و هەرگیز باوەڕناهێنێ ئیتر خۆی لەباوکی دابڕی و خۆی بێبەری کرد .

ابو هریرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئیبراهیم لە ڕۆژی قیامەتدا ئازەری باوکی دەبینێ، کە خۆڵ و تەپوتۆز ڕوخساری داپۆشیوە، ئیبراهیم بە باوکی

---

[1] سورەتی الانبیاو / ٥١ .

[2] سورەتی مریم / ٤٣

دەڵێت: ئەی پێم نەگوتی بەقسەم بکە و یاخی مەبە؟! باوکی دەڵێت: دەباشە ئەمڕۆ لێت یاخی نیم، ئینجا ئیبراهیم ڕوو دەکاتە پەروەردگار و دەفەرموێت: تۆ گفتت پێدام کە لە ڕۆژی قیامەت دا ڕیسوام نەکەیت؟ ئەی ئەمە چ ڕیسواییەکە بەسەر باوکمتدا هێناوە ؟، خوای گەورە دەفەرموێت: (من بەهەشتم حەرام کردووە لەسەر بێبڕوایان) [1] . لە سورەتی (الانعام ئایەتی ٧٤)دا جارێکی تر ناوی (ئازەر) هاتووە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە باوکی ئیبراهیم ناوی (ئازەر) بووە، بەڵاّم زۆربەی ڕەگەزناسان پێیان وایە ناوی باوکی ئیبراهیم (تارح) بووە، بەڵاّم (اهل الکتاب) دەڵێن: ناوی (تارخ)بووە، وتراوە (ئازەر) ناوی بتێك بووە کە باوکی پەرستویەتی، (ابن جریر) دەفەرموێت: ناوی ئازەر بووە لەوانەیە دوو ناوی هەبووبێت، یان یەکێك لەو ناوانە نازناوبووە، خوای گەورە باشتر ئەزانێ .

لە سورەتی (الانعام دا ئایەتی ٧٥ تا ٨٣) خوای گەورە باسی ئەستێرەپەرستی و خۆرپەرستی گەلی ئیبراهیم دەکات، هەروەها باسی ئەوە دەفەرموێت کە چۆن حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)بە شێوەیەکی پڕ حیکمەت و زانیاری دەکەوێتە گفتوگۆیەکی ژیرانە لەگەڵیاندا، تێیان دەگەیەنێت کە خۆر و ئەستێرە و هەسارەکان بۆ پەرەستن ناشێن، نابێ بکرێنە هاوەڵی خودا، چونکە ئەوانە خۆیان دروست کراون و بەفەرمانی خوای گەورە، جارێك ڕوناك وجارێك تاریکن، جارێك هەڵدێن وجارێك ئاوا دەبن، ساتێك گەشن وساتێك ڕەشن، نابێ پەروەردگار دیار نەمان وئاوابوونی بەسەردابێت، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: (لە نیشانەکانی خوای گەورە شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگن، کڕنووش مەبەن بۆ خۆر یان مانگ، بەڵکو کڕنووش بەرن بۆ ئەو خوایەی ئەوانی دروست کردووە) [2] .

ئیبراهیم (علیه السلام)بەشێوەیەکی زۆر ژیرانە بەڵگەی دەهێنایەوە، بەشێوەی ئەوان هات گوتی: ئەوە پەروەردگاری منە (کاتێك خۆر هەڵات)، ئەوە لەهەموویان گەورەترە، کاتێك ئاوابوو بە گەلەکەی گوت: من لەگەڵ ئێوەدانیم لەو شتانەی کە دەیانپەرستن و کردوتانن بە هاوەڵ بۆ خوا، من ڕووی ڕووخسارم دەکەمە ئەوەی کە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە، هەرگیز من لە هاوەڵ دانەران نیم، گەلەکەی زۆریان لەگەڵ گوت: ئەویش فەرموی ئایا ئێوە لەسەر خواپەرستی لەگەڵمدا دەدوێن کە ئەو خوایە ڕێنومایی کردوم بۆ سەر ڕێی ڕاست، واتا: من هەرگیز گوێنادەمە ئەو بتانەی ئێوە دەیان پەرستن، ئەوانە هیچ

---

[1] صحیح البخاری (٦٠/٨/٣٣٥٠/فتح) .

[2] سورەتی فصلت / ٣٧ .

سوودێکیان نیە، هیچیش نابیستن و عەقڵیان نیە، بەڵکو ئەوانەش هەروەکو ئەستێرەکان. پێ مل و ژێر دەسەلاتی خوان، یاخود خۆتان ئەو بتانەتان داتاشیوە . بەڕواڵەت ئەم گفتوگۆ و ئاموژگاریانەی حەزرەتی ئیبراهیم بۆ خەڵکی (حەڕان) بووە، چونکە ئەوان ئەستێرە پەرست و بت پەرست بوون . بابلییەکان بت پەرست بوون، ئیبراهیم (علیه السلام)زۆر ئاگاداری کردنەوە کە واز لەو پەرستنە هەڵەیە بهێنن، بێسوود بوو، تاکو بتەکانی شکاندن، هەروەکو خوای گەورە لە سورەتی (العنکبوت ئایەتی ٢٥)دا لەگەڵ سورەتی (الانبیاء ئایەتی ٥١ تا ٧٠)دا باسی فەرمووە لەگەڵ سورەتی (الشعراء ئایەتی ٦٩ تا ٨٣) و سورەتی (الصافات ئایەتی ٨٣ تا ٩٨)، کە لەجێی خۆیدا لەم باسەدا واتەکانیان باس دەکەین .

خوای گەورە باسی ئەوە ئەکات کە حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)نکوڵی کردووە لە بت پەرستیەکەی گەلەکەی و بتەکانی ئەوانی زۆر بەکەم و سوك سەیرکردووە و بەوانیشی گوتووە: ﴿مَا هَذِهِ التَّمَاثِيلُ الَّتِي أَنْتُمْ لَهَا عَاكِفُونَ﴾ [1]، واتە: ئەو بت و پەیکەرانە چین کە ئێوە بە دەوریاندا دەگەڕێن، ئەوانیش دەیانگوت: ﴿قَالُوا وَجَدْنَا آبَاءَنَا لَهَا عَابِدِينَ﴾ [2]، واتا: بینیومانن کە باوباپیرانمان ئەوانەیان پەرستوون، بەو پێیە، ئەمان ڕەویەی پێشینەکانیان زیندوکردۆتەوە و درێژەیان بەبڕوای ئەوان داوە، ئیتر حەزرەتی ئیبراهیم بە ڕاشکاوی پێی دەگوتن: (بە ڕاستی ئێوە و باووباپیرانیشتان لە گومڕاییەکی ئاشکرادان) [3]، دواجار بە ڕاشکاوی پێیان دەڵێت: (دەزانن ئێوە چی دەپەرستن، خۆتان و باپیرانی پێشینتان، هەموویان دوژمنی منن، جگە لە پەروەردگاری جیهانیان) [4] . ئەوان هێشتا گاڵتەیان بە حەزرەتی ئیبراهیم دەهات و وایاندەزانی شۆخییان لەگەڵ دەکات، یان هەر بەئەنقەس وا خۆیان نیشان دەدا، پێیان دەگوت: ﴿قَالُوا أَجِئْتَنَا بِالْحَقِّ أَمْ أَنْتَ مِنَ اللَّاعِبِينَ﴾ [5]، واتە: ئایا ئەوەی تۆ دەیڵێی هەقە و بەڕاستە؟ یان گاڵتەمان پێدەکەیت و لەگاڵتەچییانیت ؟ چۆن بەخۆت ڕەوا دەبینی سوکایەتی بە خواکانمان وباوباپیرانمان بکەیت؟

---

[1] سورەتی الانبیاو / ٥٢ .

[2] سورەتی الانبیاو / ٥٣ .

[3] سورەتی الانبیاو / ٥٤ .

[4] سورەتی الشعراو / ٧٥ تا ٧٧ .

[5] سورەتی الانبیاو / ٥٥ .

ئەرێ ئەوە بەڕاستە؟ ئەویش فەرمووی: (بەڵێ، پەروەردگارتان پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە، هەر ئەویش بەدی هێناون، من لەسەر ئەوە شایەتی دەدەم کەوابوو هەر ئەو شایستەی پەرستنە و نابێ هاوەڵی بۆ بڕیار بدەین منیش دان بەوەدا دەنێم و شایەتی لەسەر دەدەم

حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)سوێندی خوارد کە دەبێت بتەکانیان تێك بشکێنێ، دەڵێن: ئەو سوێند و بڕیارە تەنها لەدڵی خۆیدا بڕیاری داوە و نەیهێشتوە کەس پێی بزانێت، یان ببیسێت، بەڵام هەندێکی تر لەوانەش (ابن مسعود) دەفەرموێت: هەندێ لەو خەڵکە بت پەرستە گوێیان لێبووە، ساڵانە جەژنێکیان هەبووە، هەموویان چوونەتە دەرەوەی شارەکەیان، باوکی ئیبراهیم، ئیبراهیمی کوڕی بانگ کرد تا ئامادەی ئەو جەژنە بێت، بەڵام ئیبراهیم (علیه السلام)فەرمووی: نەخۆشم و ناتوانم، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: (تەماشای ئەستێرەکانی کرد و گوتی: من نەخۆشم) [1] . کاتێك ئەوان شاریان چۆڵ کرد و بۆ جەژن کردن چوونەوە دەرەوە، ئیبراهیم لەشاردا مابوەوە، ﴿فَرَاغَ إِلَى آلِهَتِهِمْ﴾ بە خێرایی و بە نهێنی خۆی گەیاندە بتەکانیان کە لە بت خانەیەکی گەورەدا دایاننابوون، جۆرەها خۆراك و قوربانییان لەپێش دەمی بتەکان ڕیزکردبوو، ئیبراهیم کاتێ ئەم دیمەنەی بینی، گاڵتەی بە عەقڵیان دەهات، هەربۆیە بە گاڵتەپێکردنێکەوە بە بتەکانی گوت: (ئەوە بۆ خواردن ناخۆن؟ چییە بۆ قسە ناکەن؟) ئیتر بەدەستی ڕاستی پیای کێشان و بەتەوەرەکەی دەستی وردو خاشی کردن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَجَعَلَهُمْ جُذَاذاً﴾، واتا: وردوپردی کردن،تەنها بتە گەورەکەیانی هێشتەوە، دەڵێن: گوایە تەورەکەی خستوەتە سەر دەستی بتە گەورەکە پاشان شکاندنی بتەکانی تر، تاکو بەعەقڵی خۆیان وا لێکی بدەنەوە کە ئەمە کاری بتە گەورەکەیە، چونکە پێیناخۆشە ئەو بتە وردیلانەش هەروەکو ئەو گەورەیە بپەرسترێن .

کە لەجەژنەکەیان گەڕانەوە، ئەو کارەساتەیان بینی، گوتیان: ﴿قَالُوا مَنْ فَعَلَ هَذَا بِآلِهَتِنَا إِنَّهُ لَمِنَ الظَّالِمِينَ﴾[2]، ئەوە کێ ئاوای لە خواکانمان کردووە، بە ڕاستی ئەوەی ئەو کارەساتەی کردووە لە ستەمکارانە . !! جا ئەگەر یەك تۆز ژیربوونایە، وایان نەدەگوت،

---

[1] سورەتی الصافات / ٨٨ تا ٨٩ .

[2] سورەتی الانبیاو / ٥٩ .

چونکە ئەگەر ئەوان خوای ڕاستەقینە بن، نەك هەر دەبوو پارێزگاری خۆیان بکردایە، دەبوایە خەڵکەکەشیان بپاراستایە ! (وتیان گوێمان لێبووە کەگەنجێك ناوی خواکانمانی بەخراپ هێناوە، بەو گەنجەش دەڵێن: ئیبراهیم) [1]، (گوتیان: بچن بیهێنن لەپێش چاوی ئەو خەڵکە دایبنێن، بابیبینن و بیناسن) [2]، واتا: با سەرگەورە و سەرکردەکانمان تێکرای خەڵکی ئەو ئیبراهیمە بناسن و گوێیان لە قسەکانی بێت، ئاخۆ چۆن دژایەتی بتەکانیان دەکات و هەر ئەو خەڵکە خۆشیان بڕیار بدەن لەسەر چۆنیەتی سزادان و تۆڵە لێسەندنەوەی، دیارە ئەوەش گەورەترین ئامانجی حەزرەتی ئیبراهیم بووە، کەخەڵکەکە هەمووی کۆبکرێتەوە و حەزرەتی ئیبراهیمیش بە هەلی بزانێت تاکو بەتەواوەتی دەربارەی بتەکانیان قسەیان بۆ بکات و بڕوایان ڕاست بکاتەوە، هەروەکو چۆن کاتی خۆی حەزرەتی موسا (علیه السلام)بە فیرعەونی گوت: (با ڕۆژی خۆڕازاندنەوە، ڕۆژی کۆبوونەوەو گفتوگۆمان بێت کاتێك کە لە چێشتەنگاودا خەڵکی کۆدەبنەوە) [3] .

خەڵکەکە کۆبوونەوە، حەزرەتی ئیبراهیمیان هێنا، پێیان گوت: (ئایا تۆ ئاوات بەسەر خواکانمان هێناوە ئەی ئیبراهیم، فەرمووی: بەڵکو ئەم گەورەیەیان (واتە: بتە گەورەکە) وای لێکردوون، دەپرسیاریشیان لێبکەن، ئەگەر توانای قسە کردنیان هەیە) [4]، حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)مەبەستی ئەوە بوو وایان لێبکات بە خۆیاندا بچنەوە و هەست بەوە بکەن کە بتەکانیان وەکو هەموو شتێکی تری بێگیان، بێهەست و گیانن و توانای هیچیان نیە، ئیتر بە خۆیاندا چوونەوە، بەلاّم بە جۆرێکی تر، ئەوەبوو کەوتنە لۆمە و سەرزەنشتی کردنی خۆیان، هەر لەناو خۆیاندا بە یەکتریان دەگوت: ئێوە ستەمکارن کە ئەو بتانەتان بە تەنها و بەبێ پاسەوان لەم شارەدا بەجێهێشتووە، بەسەری خۆیان کێشا، بەلاّم حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی: نەخێر ئێوە ستەمکارن کە ئەوانە دەپەرستن . گەلەکە ئینجا گەڕانەوە سەر هەمان قەوانی پێشوویان و بە ئیبراهیمیان گوت: ئەتۆ بۆ خۆت چاك دەزانیت کە ئەمانە قسەناکەن، ئیتر بۆچی بە ئێمە دەڵێی: دەی پرسیاریان لێ بکەن ئاخۆ کێ شکاندونی ؟!، لێرەدا حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی:

---

[1] سورەتی الانبیاو / ٦٠ .

[2] سورەتی الانبیاو / ٥٧ .

[3] سورەتی طه / ٥٩ .

[4] سورەتی الانبیاو / ٦٢ — ٦٣ .

﴿قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لا يَنْفَعُكُمْ شَيْئاً وَلا يَضُرُّكُمْ ، أُفٍّ لَكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَفَلا تَعْقِلُونَ﴾[1]،
**واتە: ئایا ئێوە جگە لەخوا شتی دیکە دەپەرستن، کە توانایان نیە هیچ سوودێکتان پێ بگەیەنن، یان هیچ زیانێکتان لێبدەن، ئۆف لە خۆتان و ئەو شتانەی جگە لەخوا دەیانپەرستن، ئەرێ ئێوە بۆ تۆزێ ژیرنابن؟ بە سەرسامییەوە هەموویان لێی چوونە پێشەوە، دیسان فەرمووی: ئایا ئەو شتانە دەپەرستن کە لە بەرد و تەختە خۆتان داتان تاشیوە بە ویستی خۆتان؟ خوای گەورە ئێوەی بەدی هێناوە، لەگەڵ ئەوەی دەیکەن، یاخود ئێوە بەدیهێنەر نین، بە هەردوو واتەکە هەر ئەوە دەردەخات کە ئەو بتانە دەستکردن، ئیتر چۆن دروست کراو دروستراوێکی تر دەپەرستێ؟ بەندایەتی و پەرستنی ڕاستەقینە ئەوەیە کە دروستکراو دروستکارەکەی خۆی بپەرستێ ئەو پەرستراوەش خوای تاك و تەنها و بێهاوەڵە . کاتێك لە ڕێگەی گفتوگۆوە شکستیان خوارد، ئاسایی وەکو هەموو کەسێکی تێکشکاوی ژیری و لۆژێك پەنایان بردە بەر بەکارهێنانی هێز، بەو نیازەی کە لەناوی بەرن و خواکانی خۆیان سەرخەن . سەرەتا بڕیاریاندا خانوویەکی خۆشگرگرتووی بۆ دروست بکەن و پاشان لە ڕێگەی مەنجەنیقەوە بەدەست و قاچی بەستراوەوە فڕێی بدەنە ناوی تا کوڵ و کۆی دادەمرێت، خوای گەورە هەنگاوی نەخشەکەیان لە قورئاندا باس دەکات و دەفەرموێت:** ﴿قَالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْيَاناً فَأَلْقُوهُ فِي الْجَحِيمِ ، فَأَرَادُوا بِهِ كَيْداً فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَسْفَلِينَ﴾ [2] **پاشان گوتیان:** ﴿قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانْصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ فَاعِلِينَ﴾ [3]**، واتا: بیسووتێنن و خواکانتان سەربخەن، ئەگەر ڕاست دەکەن لەوەدا کە خواکانی خۆتان خۆش دەوێ و ڕقتان لە ئیبراهیمە . دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی دار و چیلکە، بەوپەڕی توانایانەوە، ماوەیەکی دیاریکراویان دانا بۆ دار کۆکردنەوە، تەنانەت ئەگەر ژنێك نەخۆش بوایە ئاگادار دەکرایەوە، کە هەر پاش چاك بوونەوەکەی دەبێت کۆڵێك دار بهێنێت بۆ ئەو شوێنەی کە کردبویان بەجێی ئاگرکردنەوەکە، زەوییەکەی تەخت و لووس بوو، ئەملاو ئەولاکانی بە قوڕ و بەرد گیرابوو، دیوار کرابوو، ئاگرەکە کرایەوە، بڵێسەی گڕوکڵپەی گەیشتە ئاسمان بە ڕادەیەك ئاگرەکە گەورە بوو کە هەرگیز پێشتر هاوشێوەی ئەو نەبووە، ئینجا دەست و قاچی ئیبراهیمیان بەست و خستیانە ناو**

---

[1] سورەتی الانبیاو / ٦٦ – ٦٧ .

[2] سورەتی الصافات / ٩٧ تا ٩٨ .

[3] سورەتی الانبیاو / ٦٨ .

مەنجەنیقەوە، کە (مەنجەنیق) بریتیبوو لە شتێکی وەکو دارلاسیك، بەڵام زۆر گەورە بووەو بەکار هێنراوە بۆ هەڵدان و تووڕفڕێدانی بەردی زل، یەکەم کەسیش کە ئەو مەنجەنیقەی داهێنا و دروستی کرد، پیاوێکی کورد بوو، ناوی (هێزن)بوو .

دەگێڕنەوە کە خوای گەورە ئەو پیاوەی بە زەویدا ڕۆچواند و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئازار و سزاکەی سەخت تر دەبێ هەتا ڕۆژی دوایی، حەزرەتی ئیبراهیم لەکاتی گرتنی و قۆڵ بەست کردنی و خستنە ناو مەنجەنیقەکەوە بەردەوام دەیفەرموو: ﴿لا إلهَ إلا أنتَ سُبحانَكَ رب العالَمين، لَكَ الحمدُ وَلَكَ المُلكُ لاشَريكَ لَكَ﴾ . کاتێکیش بەدەست و پێبەستراوی لەناو مەنجەنیقەکەیان هاویشت، فەرمووی: ﴿حَسْبُنا اللهُ وَنعمَ الوَكيل﴾، بەکار هێنانی مەنجەنیق بۆ فڕێدانی حەزرەتی ئیبراهیم (علیە السلام)بۆ ناو ئاگرەکە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئاگرەکە زۆر گەورەو بەتین بووەو کەس نەیوێراوە توخنی بکەوێت، پێغەمبەری خۆیشمان حەزرەتی محمد (ﷺ) کاتێك خەڵکی بێبڕوا گەلەکۆمەکەیان لێکرد و پلانیان دانا بۆ گرتنی و کوشتنی پێغەمبەر و موسوڵمانان، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی:﴿حَسْبُنا اللهُ وَنعمَ الوَكيل﴾هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا باسی ئەو ساتە دەکات و دەفەرموێت: کاتێ بە پێغەمبەر و موسوڵمانان ڕاگەیەنرا کە ﴿الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾[1]. لە (ابو هريره)وە دەگێڕنەوە کە فەرمووی: پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) فەرمووی: کاتێ ئیبراهیم فڕێدرایە ئاگرەکەوە گوتی: خوایە تۆ لەئاسماندا تاك و تەنهایت، منیش لەسەر زەویدا تاکە کەسێکم کە تۆ دەپەرستم) . بەڵام ئەو فێڵ و تەڵەکانە نرخی باڵە مێشوولەیەکیان نیە لە بەرانبەر توانا و دەسەڵاتی بێسنووری پەروەردگاردا، خوای گەورە فەرمانی کرد بە ئاگرەکە کە ساردبێ و بێزیان بێ بەرانبەر بە حەزرەتی ئیبراهیم(علیە السلام)، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْداً وَسَلاماً عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾ . (ابن عباس و ابو العاليه) فەرموویانە ئەگەر خوای گەورە بە ئاگرەکەی نەفەرموویایە (سارد و سەلامەت بە) ئەوا حەزرەتی ئیبراهیم لە ئاگرەکەدا زۆر زۆر سەرمای دەبوو، بەڵام ساردبوونەوەی ئاگرەکە تا ئەو ساتەبوو کە حەزرەتی ئیبراهیم نەسەرمای بێت و نەگەرما .

---

[1] سورەتی ئال عمران / ۱۷۳ .

له (أبو هريره)ەوە دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: باشترین قسە کە باوکی ئیبراهیم وتبێتی، ئەو وتەیەتی کە لەکاتی فڕێدانی ئیبراهیمی کوڕیدا بۆ ناو ئاگرەکە، گوتی: باشترین خوا خوای تۆیە ئەی ئیبراهیم . (ابن عساکر)یش لە (عکرمە)ەوە دەگێڕێتەوە کە دایکی ئیبراهیم (علیه السلام)تەماشایەکی کوڕەکەی کرد و بانگیکرد: کوڕەکەم دەمەوێت بێم بۆلات لەخوا داوا بکە تا لەو ئاگرە بم پارێزێت کە لەدەورتە، ئیبراهیم وتی بەڵێ باش لەخوای گەورە پاڕایەوە و ئیتر دایکی بەبێ مەترسی چوو بۆلای، کە گەیشتە لای ئیبراهیم باوەشی پێداکرد و ماچی کرد و هاتەوە دەرەوە . لە (مونهالی) کوڕی عەمرەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی حەزرەتی ئیبراهیم چل یان پەنجا ڕۆژ لە ئاگرەکەدا مایەوە، پاشان کەهاتوەتە دەرەوە فەرموویەتی: لەهەموو ژیانمدا شەو و ڕۆژی وا خۆشم نەدیوە کە لەناو ئاگرەکەدا بەسەرم دەبرد، دەخوازم هەموو ژیانم وەکو ئەو ژیانەی ناو ئاگرەکە بوایە .

بێباوەڕان ویستیان سەرکەون، بەڵام تێکشکان، ویستیان بەرزببنەوە، بەڵام نەویکرانەوە، ویستیان زاڵ بن، بەڵام ڕیسواکران، خوای گەورە دەفەرموێت: (ویستیان فێڵی لێبکەن، بەڵام ئەوانمان وا لێکرد کە ببنە ڕەنجە ڕۆترین کەس) [1]، ئەم سزایانەیان تەنها لە دنیادا، خۆ لەقیامەتدا ئاگری دۆزەخ لەسەر ئەوان سارد و سەلامەت نابێ، بەڵکو ﴿إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا﴾[2]، واتا: دۆزەخ خراپترین شوێنی نیشتەجێبوونی بێبڕوایانە، (سەعیدی کوڕی موسەیەب) ئەویش لە (ام شریك)ەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر فەرمانی کردووە بە کوشتنی قوم قومۆکە و فەرموویەتی: فووی لە ئاگرەکەی ئیبراهیم دەکرد و خۆشی دەکرد، بینراوە کە (عائشە) قوم قومۆکەی کوشتوە .

لە گێڕانەوەیەکی تردا کە پێشەوا احمد لە ئیسماعیلەوە ئەویش لە أیوبەوە، ئەویش لە نافعەوە کە ژنێك چوو بۆ ماڵی پێغەمبەر (ﷺ)، عائشە لە ماڵەوەبوو، ڕمێك بە ڕووتی چەقێنرابوو، ژنەکە پرسی ئەم ڕمە چییە؟ عائشە فەرمووی: قومقومۆکەی پێ دەکوژین، پاشان فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێ ئیبراهیم فڕێدرایە ئاگرەکەوە، هەموو گیانداران لەهەوڵی کوژاندنەوەی ئاگرەکەدابوون، جگە لە قوم قومۆکە، کە بەتەنها فووی لەئاگرەکە دەکرد) [3] . پاشایەکی ستەمکار و کەللەڕەق و بەدەسەڵات هەبوو، داوای

---

[1] سورەتی الانبیاو / ٧٠ .

[2] سورەتی الفرقان / ٦٦ .

[3] صحیح البخاری (٣٣٥٩/٨/٦٠/فتح)، (صحیح المسلم ٤١/٧/استانبول) .

خوایەتی دەکرد، لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیم دا کەوتە کێشمەکێشم و وتووێژ، تا سەرنجام حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)دەمکوت و بێبەڵگەی کرد، مێژوو نووسەکان دەڵێن: ئەو پیاوە خوانەناسە پاشای بابل بووە کە ناوی (نەمرودی کوڕی کەنعانی کوڕی کوش کوڕی سام کوڕی نوح بووە) [1]، بەلاّم هەندێکی تر گوتویانە ناوی (نەمرودی کوڕی فالح کوڕی عابر کوڕی صالح کوڕی ئەرفەخشذ کوڕی سام کوڕی نوح) بووە، لەناو ئەم هەندەشیاندا هەر (مجاهد) هەیە، گرنگ ئەوەیە پاشایەکی سەرزەوی بووە کە حوکمڕانی هەموو کۆی زەوی کردووە، چوار کەس حوکمڕانی هەموو زەوییان کردووە، ئەو چوار کەسەش دوانیان موسوڵمان و دوانیان بێباوەڕ بوون، دوو موسوڵمانەکە (ذوالقرنین) و (سلیمان)بوون،دوو بێبڕواکەش (نەمرود) و (بەختەنەسر)بوون، وا دەگێڕنەوە دەسەلاّتی پاشایەتی نەمرود چوارسەدساڵی خایاندوە، تا توانیویەتی ستەم و دەست درێژی و زەبرو زەنگ و نادادی کردووە .

کاتێك حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)بانگی کردووە بۆ سەر ڕێگەی خواپەرستی، نەمرود زیاتر هەڵشاخاوە و فیز گرتوویەتی، حەزرەتی ئیبراهیم کەوتووەتە گفتوگۆ لەگەڵیدا، بەلاّم ئەو ستەمکارە داوای خوایەتی دەکرد، دەگێڕنەوە کاتێك حەزرەتی ئیبراهیم پێی فەرموو: ﴿رَبِّي الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾، واتا: (پەروەردگاری من ئەو خوایەیە کە مردوان زیندوو دەکاتەوە و زیندوان دەمرێنێ)، کەچی ئەو گوتی: منیش وادەکەم: ئەگەر دوو کەس بڕیاری کوشتنیان بۆ بدەم، یەکێکیان دەکوژم و ئەوەی تریان ناکوژم، کەواتە مردووم زیندوو کردۆتەوە، بۆیە گوتی: (منیش مردوو زیندوو دەکەمەوە و زیندوش دەمرێنم)، لەوانەیە ئەم گفتوگۆیە تائێرە هەر خۆیان بووبن، واتا پاشاکە و حەزرەتی ئیبراهیم(علیه السلام)، بەلاّم بەڵگە هێنانەوە گەورەکەیان لەوەدەچێ کە خەڵکی تریش ئامادەی بووبن، کاتێك حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)بە تەواوەتی پاشاکەی دەمکوت و بێقسەکرد، کە فەرمووی: (خوای گەورە خۆر لەخۆر هەلاّتەوەوە دەردێنێ، ئەگەر ڕاست دەکەیت تۆ لە خۆر ئاواوە خۆر هەڵبێنە) [2]، ئەمەیان هێنانەوەی بەڵگەیەکی گەردوونی ئاشکرایە و کارێکە تەنها لەتوانای خوادایە و هیچ جۆرە فێڵ و فریودانێکی تێدا ناکرێ، دیارە پاشا ناتوانێ زاڵ بێ بەسەر مێشوولەیەکیشدا، (دوایی بۆت دەردەکەوێت مەبەست

---

[1] مجاهد وای فەرمووە .

[2] سورەتی البقره / ٢٥٨ .

لەو مێشوولەیە چیە !!) ئیتر لێرەدا درۆو بێ دەسەڵاتی پاشا ئاشکرا دەبێت، بۆیە لە دەم گەرمی خۆی دەکەوێت و قسەی نامێنێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ وَاللَّهُ لا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾[1]، واتا: دەمکوت ما ئەو کەسەی بێباوەڕی دەنواند، خواش ڕێنمومایی گەلانی ستەمکار ناکات . (السدی) وا باس دەکات کە ئەم گفتوگۆیە ئەو ڕۆژە لەگەڵ ئیبراهیم دا کرا، کە تازە و هەمان ڕۆژ لەئاگرەکە هاتبووە دەرەوە .

(نەمرود) گەنجینەی خۆراکی پڕبوو، خەڵکی هەژار و برسی بوون، کۆمەڵ کۆمەڵ نوێنەریان دەنارد بۆ لای نەمرود، تاکو خۆراکیان پێبدات، حەزرەتی ئیبراهیمیش (علیه السلام)لەگەڵ دەستەیەك کەسی تردا وەك نوێنەر چوون بۆ دیوانی پاشا بۆ وەرگرتنی دانەوێڵە و خۆراك، تا ئەو کاتەش نەمرود حەزرەتی ئیبراهیمی نەدەناسی، تاکو ئەو ڕۆژە کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵ یەکتریدا، لەبەرئەوە نەمرود وەکو خەڵکانی تر خۆراکی نەدا بە حەزرەتی ئیبراهیم، بگرە هەر هیچی پێنەدا، کاتێ گەڕایەوە بۆ لای کەس و کارەکەی لەپەناوە لایدایە لای کۆمەڵە گڵێك و فەردەکانی پڕکرد لە گڵ و گوتی: بەوە کەسەکانم سەرقاڵ دەکەم تا باسەکەیان بۆ ڕوون دەکەمەوە، کاتێ هاتن بۆ پێشوازی لێکردنی بارەکەی دانا وسەری خستە سەر ئانیشکی و خەوت، سارەی خێزانی هات دوو بارەکەی کردەوە، بینی پڕن لەخۆراکی چاك، کە حەزرەتی ئیبراهیم هەستا و ئەمانەی بینی، پرسی ئەو خۆراکەتان لەکوێ بوو؟ ژنەکەی گوتی: لەو کەسەوە پێمان گەیشتووە کە بەتۆدا بۆی ناردین!! ئینجا حەزرەتی ئیبراهیم زانی ئەو ڕۆزەیە لەلایەن خواوەیە . (زەیدی کوڕی ئەسلم) دەفەرموێت: خوای گەورە پاشایەکی موسوڵمانی نارد بۆ سەر نەمرود، کە فەرمانی پێکرد خوا بۆ بپەرستێ، بەڵام ئەو نکوڵی لێکرد و پەسەندی نەکرد، جاری دووەم و سێهەمیش هەر بانگی کرد بۆ خواناسی، بەڵام هەر وەڵامی نەدایەوە، سەرنجام پێی گوت: جەنگ دەکەین، تۆ هێزی خۆت کۆبکەرەوە و منیش هێزی خۆم کۆدەکەمەوە، نەمرود هێز و سوپای خۆی کۆ کردەوە، کاتەکەش کاتی خۆرهەڵاتنی گزنگی بەیانی بوو، خوای گەورە سوپایەکی بێشوماری لەمێش و مێشوولە ناردە سەرسوپای نەمرود، مێشوولەکان هێندە زۆر و پڕوپڕ بوون، بەری خۆریان گرت و سوپاکەی نەمرود هەتاویان لێنەدرا، مێشوولەکان کەوتنە گیانی سوپاکە، خوێنی لەشیان مژین، گۆشتیان داڕزاندن و تەنها ئێسك و پروسکیان مایەوە. یەکێك لەو مێشوولانە چووە ناو قوڵایی لووت و

مەلاشووی پاشاوە، ماوەیەکی زۆر ئازاریدا، پاشاکە لەتاو ئازار و خوروخۆی لووتی بە پارچە ئاسنێك زوو زوو دەیکێشا بەسەری خۆیدا، تاکو سەرنجام بەو دەردە مرد .

حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)خۆی و ژنە نەزۆکەکەی و لوط ی کوڕی هارانی کوڕی ئازەری برازای کۆچیان کرد، لێرەوە خوای گەورە منالی بە حەزرەتی ئیبراهیمی بەخشی و بەرەوبەرەچەی چاکی لێکەوتووە، هەموو پێغەمبەرانی سەرزەوی لە بنەڕەت دا دەچنەوە بۆ سەر وەچەی حەزرەتی ئیبراهیم، ئەوەش ڕێزێکی تایبەتیە کە خوای گەورە پێی بەخشیوە، چونکە ئەو لەپێناو خواپەرستی و سەرسەختی ئاینی خوادا خزم و گەل و ولات و کەس و کاری خۆی بەجێ هێشت و ڕووی کردە خاکی شام، کە خوای گەورە دەفەرموێت (بۆ ئەو خاکەی کە پیرۆزمان کرد بۆ هەموو جیهانیان) [1]، بەلام (ابن عباس) دەفەرموێت: ئەو خاکە (مەککە)یە، نەك شام، هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە فەرموویەتی: (یەکەم مزگەوتێك (مالێك) کە بۆ خەلکی دروستکرا، ئەوەبوو کە لە (بەککە) [2] دابوو، پیرۆزمان کرد و کردمانە مایەی ڕێنومایی خەلکی) [3]، بەلام (کعب الاحبار) پێشی وایە ئەو خاکە پیرۆزە خاکی حەڕانە .

پێشتر باسمان کرد کە بەپێی گێڕاوەکانی (أهل الكتاب) حەزرەتی ئیبراهیم لە بابل لەگەل (لوط)ی برازای و (ناحور)ی برای و سارەی خێزانی و (ماکا)ی ژنی (ناحور)ی برایدا کۆچیان کرد بۆ خاکی (حەڕان)، (تارخ)ی باوکی ئیبراهیمیش لەوێ مردووە، (السدی) دەلێت: حەزرەتی ئیبراهیم و لوط بەرەو شام چوون، حەزرەتی ئیبراهیم چاوی بە (سارە) کەوتووە کە کچی پاشای حەڕان بووە، کە تەشەریان لە ئاینەکەی داوە، لەبەرئەوە حەزرەتی ئیبراهیم خواستی و بوو بە خێزانی، بەلام ئەوەیان زیاتر باوە کە (سارە) ئامۆزای خۆی بووە، واتە: کچی هەڕانی مامیبووە، کە (حەڕان) بە ناویەوەیە .

لە (ابی سعید)ەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ وشەیەکی نەفەرمووە کە پێچەوانەی ئاینی خوابێت، هەموویانی تەواو بووە کە فەرمووی (من نەخۆشم)، (بتە گەورەکەیان ئەوانی تری شکاندوە)، کاتێکیش بە پیاوانی پاشا ستەمکارەکەی گوت: (سارە خوشکمە)، چونکە لەو کاتەدا تەنها حەزرەتی ئیبراهیم و

---

[1] سورەتی الانبیاو / ٧١ .

[2] بەککە: واتا: شاری مەککە .

[3] سورەتی ال عمران / ٩٦ .

سارەی خێزانی باوەڕداربوون، کەواتە لەئاینی خوادا خوشك و برابوون، لەمەوە تێدەگەین کە هەرسێ فەرموودەکەی لەجێی خۆیدابوون. کاتێك حەزرەتی ئیبراهیم و سارای هاوسەری کە نموونەی چاکی و جوانی بووە چوونە وڵاتێکەوە، هەر پیاوێك ژنەکەی جوانبوایە، پاشای وڵات لێی دەستاند و دەستدرێژی دەکردە سەر، لەبەرئەوە حەزرەتی ئیبراهیم لای پیاوانی پاشا وای نیشان دا کە سارا خۆشکیەتی، وە کاتێك پیاوانی پاشا ساراخانیان برد بۆلای پاشا، سارا خاتوون لەناخی دڵییەوە لەخوا پاڕایەوە و فەرمووی: (خوایە خۆت دەزانی کە من باوەڕم هێناوە بە تۆ و بە پێغەمبەرەکەت، عەورەتم بپارێزە و کەسی بێبڕوا زاڵ مەکە بەسەرمدا)، ئەم نزا گەورەیەی وەرگیرا، لای خوای بەخشندە و پاراستی، هەتا گەڕایەوە بۆلای حەزرەتی ئیبراهیم(علیه السلام)، کە پرسیاری لێکرد؟ خەبەر و باس چییە؟ ساراخان فەرمووی: (خوای گەورە فێڵی ستەمکارانی بۆ خۆیان گەڕاندەوە و پاراستمی) . لەبەر ئەو پاکی و دەرونە خاوێنەی هەندێ لە زانایان سێ ژن لە ژنانی جیهانیان لەئاستی پێغەمبەراندا داناون، ئەوانیش بریتین لە: (سارە خاتوون، دایکی حەزرەتی موسی، مەریەمی دایکی حەزرەتی عیسا)، بەڵام جمهوری زانایان ئەو ژنانە بە (ڕاستگۆیان) لەقەڵەم دەدەن، چونکە هەر زوو پشتیوانی خۆیان بۆ ڕاستی پێغەمبەران (علیه السلام)دەبڕیوە، حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)ساراخانی زۆر خۆش دەویست لەبەر سێ هۆ: وەك خۆی باوەڕدار بوو، خزمیبوو، زۆر جوان بوو، تەنانەت واباوە دەڵێن: جوانترین ژن لەدوای حەزرەتی (حەوا) ئەو بووە تا سەردەمی خۆی . هەندێ لە مێژوونووسەکان دەڵێن: فیرعەونی (مصر) برای ئەو پاشا ستەمکارە بووە کە ناوی (سەنان)ی کوڕی عەلوان بووە، نازناویشی (ضحاك)بووە و ئەو (فرعون)ی لەسەر (مصر) داناوە بە پاشایەتی . پاشان حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)گەڕاوەتەوە بۆ خاکی (تەیمەن) واتا: وڵاتی (مصر) کە خاکی پیرۆزی جارانی بووە، لەگەڵ خۆیدا ئاژەڵ و کوێلە و سامانێکی زۆری هێناوەتەوە، لەوانەش (هاجرە خان)ی قیبتی، ئینجا حەزرەتی (لوط) (علیه السلام)بەخۆی و سامانەکەیەوە بە ڕەزامەندی حەزرەتی ئیبراهیم ڕوویکردە خاکی (غور) کە بە (غوڕزغر) ناسراوە، لەشاری (سەدوم) [1] نیشتەجێبوو، کە بەدایکی شاو دێهاتەکانی ئەو دەڤەرە دەناسرا لەو سەردەمەدا، خەڵکی ئەو وڵات و شارە بێ بڕوا و

---

[1] سەددوم: شارێکی کۆنی فەلەستینە، کە کەوتوەتە سەر کەناری دەریای مردوو، لە ڕاستیدا گوندێکی گەلی الوگـابووە و خوای گەورە بەهۆی خراپی خەڵکەکەیەوە ئاگرbارانی کردوون .

شەڕەنگێز و بێشەرم و بێنامووس بوون، پەلاماری حەزرەتی (لوط)یان دا، بەدیلیان گرت، ماڵ و سامان و ئاژەڵەکانیان تالآن کرد، کاتێك ئەم هەواڵە بە حەزرەتی ئیبراهیم گەیشتەوە، سێسەد و هەژدە کەسی ناردەسەریان، حەزرەتی (لوط)یان ڕزگار کرد، ماڵ و سامانەکەیان بۆ ستاندەوە، ژمارەیەکی زۆریان لەدوژمن کوشت، ڕاویان نان تا باکوری دیمەشق و عەسکەر، پاشان بەسەرکەوتوویی گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی و پاشاکانی دەوروبەری وڵاتی (بيت المقدس) بەخۆشی بوویێت یان بەناخۆشی مل کەچ بوون بۆ دەسەڵاتی حەزرەتی ئیبراهیم (عليه السلام). کاتێ هاجەرەخانی هاوسەری دووەمی حەزرەتی ئیبراهیم کوڕێکی بوو بەناوی (ئیسماعیل) ئیتر سارە خاتوون غیرەی زیاتری پەیداکرد بەرانبەری و داوای لە حەزرەتی ئیبراهیم کرد کە دووری بخاتەوەو لەبەرچاوی نەبێت، لەبەرئەوە هاجەرە و منداڵەکەی بردن بۆ شوێنێکی دوور، کە ئەمڕۆ ئەو شوێنە شاری مەککەیە .وا باس دەکەن کە ئەوساکە مناڵەکەی شیرەخۆر و ساوابوو، بەتەنها بیابانێکی چۆڵ و تۆزاوی و وشك و بێئاو بەجێی هێشتن بە جەوەندەیەك ئاو و هەندێ خورما، کە ماڵاوایی لێکردن، هاجەرەخان دامێنی پۆشاکەکەی حەزرەتی ئیبراهیمی گرت و گوتی: ئەی ئیبراهیم بۆ کوێ دەچیت؟ئەی خۆراکەکەمان بەشمان ناکات؟بەڵام ئیبراهیم (عليه السلام)وەڵامینەدایەوە، پاش چەند جارێك هاوار و پرسیار لێکردن، هەر وەڵامی نەدایەوە، ئینجا وتی: ئایا خوا فەرمانی پێکردویت کە ئاوا بکەیت ؟ حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی: بەڵێ: هاجەرەخان دڵی بەو وەڵامە خۆش بوو، گوتی: دەکەواتە خوای گەورە لێمان بێئاگا نابێت . (ابن عباس) دەفەرموێت: یەکەم ژنێك کەپشتێنی بەستبێ هاجەرەی دایکی ئیسماعیل بووە، کە بۆ ڕێز لێنان لەسارە خاتوون پێشتێنی خزمەتگوزاری بەست .

پاش وەڵامە کورتەکە حەزرەتی ئیبراهیم (عليه السلام)گەیشتە ئەودیو تەپۆڵکە لمەکەوە کە هاجەرەخان نەیدەبینی، ڕوویکردە جێشوێنی کەعبەی ئێستا و دەستەکانی بەرزکردەوەو لەخوای گەورە پاڕایەوە و فەرمووی: ﴿رَبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِنْ ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِنْدَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا الصَّلَاةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُمْ مِنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ﴾[1]، واتا: پەروەردگارا ! من هەندێ لە بەرەچە و خێزانی خۆمم لەو دۆڵە ڕەقەن و بێ کشتوکاڵەدا نیشتەجێ کردووە، بەلای ماڵە ڕێز لێگراوەکەتەوە، پەروەردگارا ! بۆئەوەی کە نوێژ بکەن، تۆش لای خێر و ئاوەدانیان لێبکەرەوە و ڕۆزی و بەروبومیان بۆبنێرە،

---

[1] سورەتی ابراهیم / ٣٧ .

تاكو سوپاس و ستایشت بکەن . دایکی ئیسماعیل لە ئاو و خورماکەی دەخوارد و شیری بە منداڵەکەی دەدا، تا ئاو و خورماکە تەواوبوون، ئیتر خۆی و کوڕەکەی تینویان بوو .

منالەکەی تەپاوتلی دەکرد و قاچی دەکوتا بە زەویدا لە تینواندا، دایکەکەی منالەکەی دانا و بەنیوە ڕاکردن خۆی گەیاندە سەر تەپۆلکەی (صفا) سا بەلکو ئاوێك، دەنگێك، کەسێك بەدی بکات کە فریای بکەوێت بە نائومێدی گەڕایەوە لای کۆرپەکەی ودیسان گەڕایەوەو دابەزیە ناو دۆڵەکەوە و بەوپەڕی وردییەوە دەگەڕا، هەتا دۆڵەکەی بڕی و گەیشتە سەر تەپۆلکەی (مروە) چووەسەر لوتکەکەی و سەیری ئەملاولای کرد، سا بەلکو تەڕاییەك، کانییەك، ئاوەدانیەك بەدی بکات، ئەم کارەی حەوت جار دووبارە کردەوە، کە لەجاری حەوتەمدا گەیشتە سەر تەپۆلکەی(مروە)گوێی لەدەنگێك بوو، بەخۆی گوت:بێدەنگ بە !دیسانەوە گوێی لەو دەنگە بوو،ئیتر گوتی: گوێم لێتە، ئایا هیچ خۆراك و ئاوێکت لەلا دەست دەکەوێ ؟ ئەوەش فریشتەیەك بوو کە بەباڵ، یان بە پاژنەی پێ کێشاویەتی بە زەویەکەدا هەتا ئاو هەڵقولاوە، ئیتر هاجەرەخان گەشایەوە، بەلام دەترسا کە ئاوەکە ووشك بێت، بۆیە حەوزی بۆکرد، ئیتر ئاوەکە وەستا .(ابن عباس) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ڕەحمەتی خوا لەدایکی ئیسماعیل بێت ئەگەر وازی لە زەمزەم بهێنایە، یان حەوزی بۆ نەکردایە ئێستا زەمزەم کانیەکی لەبەر ڕۆیشتوو دەبوو)، فریشتەکە بە هاجەری فەرموو: مەترسە تیاناچن، بەلکو ئێرە دەکرێتە ماڵی خوا، کە ئەم منداڵەی تۆ و باوکی دروستی دەکەن، خوای گەورەش خۆشەویستانی خۆی ڕەنج بەبا ناکات . ئەوساکە جێگەی مزگەوتی کەعبە، گردۆڵەیەك بوو لافاو لەملاوە هەڵی دڕیبوو، هاجەرەخان و منالەکەی بەو جۆرە لەدەوری ئاوەکە مانەوە، هەتا کۆمەڵێك لەهۆزی جورهەم بە ڕێگەیەکی مردەڵەی بێ ڕووەکدا ڕوویان کردە ئەو ناوە، باڵندەیان بینی کە دیاربوو لە دەوری ئاو کۆببوونەوە، گوتیان: ئەم باڵندانە بەدوای ئاودا دەگەڕێن سەیرە، خۆ ئێمە چەندین جار بەئێرەدا هاتووین ئاوی لێنەبووە یەك دوو کەسیان نارد تابزانن چ باسە ! کاتێ گەڕانەوە هەواڵی بوونی ئاویان هێنایەوە، ئیتر هەموویان ڕوویان کردە سەرئاوەکە . دایکی ئیسماعیل لای ئاوەکە بوو پێیان گوت: ئایا ڕێگەمان دەدەیت لێرەدا لابدین و لای تۆ نیشتەجێ بین؟ فەرمووی: بەڵێ، بە مەرجێ ئاوەکە بەدەست خۆمەوەبێت ! گوتیان باشە .

(ابن عباس) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (دایکی ئیسماعیل تێکەڵاویان بوو، چونکە ژنێکی هۆگر بوو)، پێکەوە گوزەرانیان کرد، ساواکانیان پیربوون ئیسماعیلی کوڕی لەناویاندا گەورە بوو، فێری زمانی عەرەبی بوو، کوڕێکی ڕێك و پێك و باشی لێدەرچوو، کاتێك بۆیان دەرکەوت کە کوڕێکی باشە کچێکیان پێدا و بوون بەخزم .

ڕۆژگار هات و چوو، هاجەرەخان کۆچی دوایی کرد، حەزرەتی ئیبراهیم هات بۆ سەردانیان، ماڵەکەیانی دۆزیەوە، بەڵام ئیسماعیلی کوڕی نەبینی لە ژنەکەی هەواڵی پرسی کە ئیسماعیل لەکوێیە ؟ ژنەکەیشی گوتی: چۆتە دەرەوە بۆ کاروکاسپی، پاشان پرسیاری بار و گوزەرانی لێکردن، ژنەکەی وتی: ئێمە مرۆڤین، لەهەژاری و نەداریەکی سەخت دا دەژین، زۆر کرووزایەوە، حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی: کە مێردەکەت هاتەوە سڵاوی منی پێڕاگەیەنە و بڵێ: با لاشیپانی دەرگاکەی بگۆڕێ . کاتێ ئیسماعیل هاتەوە ماڵەوە، هەروەکو هەستی بەشتێك کردبێت لە ژنەکەی پرسی: کەس هاتۆتە ماڵمان؟ ژنەکەی وتی: پیاوێکی پیری ئاوا وئاوا . . هاتە ماڵمان و هەواڵی تۆی پرسی، منیش هەواڵی تۆم پێڕاگەیاند . پاشان پرسیاری ژیان و گوزەرانی لێکردم، منیش پێم گوت کە حاڵ و گوزەرانمان ناخۆشە و زۆر هەژارین! ئیسماعیل فەرمووی:ئەی هیچی ڕانەسپاردیت؟ گوتی: بەڵێ، زۆر سەلامی لێ دەکردیت و گوتی بڵێ: لاشیپانی دەرگاکەی بگۆڕێ ! حەزرەتی ئیسماعیل فەرمووی: ئەوە باوکمە و فەرمانی پێکردووم کە واز لەتۆ بهێنم و دەستت لێهەڵبگرم، ئیتر ئەو ژنەی وازی لێهێنا و ژنێکی تری لەهەمان هۆز هێنا، ماوەیەکی زۆری پێچوو، حەزرەتی ئیبراهیم جارێکی تر هاتەوە بۆ سەردانی ماڵی کوڕەکەی، ئەو جارەشیان هەر ئیسماعیل لەماڵەوە نەبوو، لە ژنەکە پرسی ئیسماعیل لەکوێیە ؟ گوتی: چووەتە دەرەوە ئیش و کاسپی دەکات و پرسیاری ژیانی و گوزەرانی لێکرد، لە وەڵامدا ژنەکەی گوتی: ئێمە زۆر باش و تێرین سوپاس بۆ خوا، پرسیاری کرد خواردنتان چییە؟ گوتی: گۆشت، فەرمووی: ئەی خواردنەوەتان چییە ؟ گوتی: ئاو، حەزرەتی ئیبراهیم نزای کرد و فەرمووی: (خوایە بەرەکەت بخەیتە ئاو و گۆشتەوە بۆیان)

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەو ڕۆژە دانەوێڵەیان نەبوو، خۆ ئەگەر دانەوێڵەیان هەبوایە، ئەوا نزای پیت و فەڕی لەوەش دا بۆ دەکردن، پاشان فەرمووی: هیچ کەسێ نیە لە مەککەدا لەسەر ئەو دوو شتە (ئاو + گۆشت) پەکی بکەوێت، ئینجا فەرمووی: ئەگەر مێردەکەت هاتەوە سەلامی منی پێبگەیەنە و پێی بڵێ: با لاشیپانی دەرگاکەی قایم

بکات، کاتێك ئیسماعیل گەڕایەوە، برسیاری کرد: کەس هاتە ماڵمان؟ ژنەکەی گوتی: بەڵێ، پیاوێکی پیری خوێن شیرین و قسەخۆش هات، منیش بەگەرمی پێشوازیم کرد، پاشان هەواڵی تۆی پرسی و منیش هەواڵ و باسی تۆم پێڕاگەیاند. ئینجا هەواڵی باروگوزەرانی پرسین، پێم گوت: زۆرباشین، گوتی: ئەی هیچی رانەسپاردیت؟ گوتی: بەڵێ، سەلامی لێدەکرێت و وتی: پێی بڵێ با لاشیپانی دەرگاکەی قایم بکات، ئیسماعیل فەرمووی: ئەوە باوکمە و فەرمانی پێکردووم کە دەست لەتۆ هەڵنەگرم و لەگەڵتا بژیم .

ئەم جارەش ڕۆیشتەوە و پاش ماوەیەکی تر هاتەوە، ئەم جارەیان بینی وا ئیسماعیلی کوڕی لەژێر دەوارێکدا لەنزیك زمزم خەریکی تیرتیژ کردنە، زۆر بەگەرمی پێشوازی لەباوکی کرد و پاشان فەرمووی: کوڕی خۆم ئەی ئیسماعیل ! خوای گەورە فەرمانی شتێکی پێکردووم، حەزرەتی ئیسماعیل فەرمووی: بابەگیان خوا فەرمانی چی پێکردویت بیکە! فەرمووی: ئەی تۆش یارمەتیم دەدەیت؟ فەرمووی: یارمەتیت دەدەم! فەرمووی: خوای گەورە فەرمانی پێکردووم کە ئا لێرەدا (ئاماژەیەکی بۆ تەپۆڵکەیەك لم و گڵی بەرزکرد) ماڵێك دروست بکەم . ئیتر دەستیان بە دروست کردنی کرد، ئیبراهیم بەنایی دەکرد و ئیسماعیلیش بەردی کۆدەکردەوە بۆی دەهێنا، تا بناغەیان داڕشت و بەردەوام دەیانفەرموو: (خوایە!! پەروەردگارمان! لێمان وەربگرە تۆ بیسەر و زانای) [1]، هەر بەردەوام بوون تاکو هەر چوار دیواری ئەملاولاکانیان داڕشت و پەیتا پەیتا ئەو نزایەیان دەفەرموو . خوای گەورە لە سورەتی (الصافات) ئایەتی (٩٩ تاکو ١١٣)دا بەووردی باسی ئەوە دەفەرموێت کە حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)لەخوای گەورە پاڕایەوە تاکو منداڵی چاکی پێ بەخشی، ئینجا کاتی ئەوە هات کە تاقیکردنەوەیەکی قورسی بکرێت، هەر وەکو چۆن لەبەر خاتری ڕەزامەندی خوای گەورە ئامادەبوو بخرێتە مەنجەنیقی ئاگرەوە، دەبێ ئامادەش بێ بەدەستی خۆی کوڕە تاقانەکەی بکات بە قوربانی . حەزرەتی ئیبراهیم تەمەنی هەشتا و هەشت ساڵ بوو کە خوای گەورە حەزرەتی ئیسماعیلی پێبەخشی، ئەوەبوو هاجەر و ئیسماعیلی لەو چۆڵ و بیابانە بە تەنها بەجێهێشت، تاکو فێربن پشت بەخوا ببەستن، ئەوسا خوای گەورەش دەروازەی سۆز و بەزەیی لێکردنەوە و بەجۆرێك ڕۆزیدان کە خۆشیان نەیاندەزانی لەکوێوە ئەم خێر و بەرەکەت و ئاوەیان بۆ ڕەوانە کراوە! کاتێك خوای گەورە بەخەو حەزرەتی ئیبراهیمی

---

[1] سورەتی البقرە / ١٢٧ .

ئاگادار کردەوە کە ئەبێ کوڕە تاقانە و نۆبەرەکەی بکاتە قوربانی، لەلایەن خۆیەوە ئامادەیی دەربڕی، بەڵام هات پرس و ڕاوێژی بە کوڕەکەیشی کرد و نەیویست بێ پرس و ڕا بیکوژێتەوە ! (کوڕی شیرینم لەخەودا پێم ڕاگەیەنراوە کە تۆ بکەمە قوربانی، جا تۆش وردبەرەوە و لێکی بدەرەوە) [1]، کوڕەکەش بێ سێ و دووکردن هەر کەزانی فەرمانەکە لەخواوەیە، بە باوکی فەرموو: (بابەگیان خوا چۆن فەرمانی پێکردویت، وا بکە، پشت بەخوا من ئارام گردەبم) [2]، دیارە ئەم وەڵامە ئەوپەری گوێڕایەڵی کردنە بۆ فەرمانی خوا و ڕاگیرکردنی دڵی دایك و باوکەکە، ئیتر لەماوەیەکی زۆر کەمدا خۆیان یەکلا کردەوە بۆ بەجێ هێنانی فەرمانی خوای گەورە .

حەزرەتی ئیبراهیم کوڕەی بەدەمداخست نەبادا چاوی بە ڕووخساری بکەوێت و پەشیمان بێتەوەو فەرمانی خوا بشکێت، حەزرەتی ئیبراهیم ناوی خوا و (الله اکبر)ی کرد کوڕەکەش شایەتمانی کۆتایی هێنا بۆ پێشوازی کردن لەمەرگ لە پێناو خوادا، خوای گەورە فەرمانی بە چەقۆکەی دەستی ئیبراهیم کرد کە کار نەکات وهیچ نەبڕێت، دەڵێن: گوایە خوای گەورە ئەڵقەیەکی مسی خستۆتە نێوان چەقۆکە و ملی ئیسماعیلەوە، خوای گەورە خۆی دەزانێت . لەم کاتەدا بانگ درا بە گوێی حەزرەتی ئیبراهیم دا و لەلایەن خواوە پێی وترا کە (ئەی ئیبراهیم خەونەکەت هێنایە دی) ، واتە: فەرمانەکەت بەجێ هێنا مەبەستی تاقیکردنەوە گەورەکەت پێکا گوێڕایەڵی و ملکەچی خۆت و کوڕەکەت بۆ فەرمانی خوا دەرکەوت، هەروەکو چۆن گیانی خۆت بەخت کرد بۆ چوونە ناو ئاگرەکە، ماڵی خۆشت بەخت کردوە بۆ میوان، کوڕەکەیشت ئامادەبوو بۆئەوەی ببێ بە قوربانی بۆ خوای میهرەبان (بە ڕاستی ئەوە تاقیکردنەوەیەکی زۆر ئاشکرابوو) [3] .

خوای گەورە لەجیاتی ئەوە شتێکی تری بۆ نارد تا بیکاتە قوربانی، جمهوری زانایان دەفەرموون: خوای گەورە بەرانێکی چاو گەورە و ڕەشی شاخ زلی بۆکرد بەدیاری تاکو بیکاتە قوربانی، ئەوەش بەتەواوەتی یەکلانەبوەتەوە ئاخۆ بەران بوو، یان گیسك بوو، یان بەرخ، بەڵام لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە کە (ابن سعيد ابن جبير)یش فەرموویەتی: خوریەکی سووری هەبووە، هەروەها (ابن عباس) دەفەرمویَ: هێشتا هەر

---

[1] سورەتی الصافات / ١٠٢ .

[2] سورەتی الصافات / ( ١٠٣، ١٠٤، ١٠٥، ١٠٦، ١٠٧ ) .

[3] سورەتی الصافات / ١١٢ — ١١٣ .

دەیباڕاند، وە ئەو بەرانە بووە کە کاتی خۆی کوڕەکەی ئاپەم کردی بە قوربانی و خوای گەورەش لێی وەرگرت، لە فەرموودەیەکی پێغەمبەری ئازیزماندا (ﷺ) هەر بە (بەران) ناوی هاتووە .

خوای گەورەش پاداشتی ئەو دوو سەروەر و ڕابەر و پێغەمبەرە گەورانە بداتەوە لەسەر گوێڕایەڵی کردنیان بۆ فەرمانی پەروەردگار .

## پێغەمبەری خوا حەزرەتی (ئیسحاق) (دروود و سەلامی خوای لەسەر بێت)

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيًّا مِنَ الصَّالِحِينَ ، وَبَارَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَى إِسْحَاقَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِنَفْسِهِ مُبِينٌ﴾[1].

**واتا: مژدەمان دا بە حەزرەتی ئیبراهیم کە ئیسحاقی دەبێت، دەشبێتە یەکێك لە پێغەمبەرە چاکەکان، پیرۆزبایمان لە خۆی و ئیسحاق کرد، هەروەها لەبەرەو وەچەشیان چاکەکار و خراپکاریان بە ئاشکرا تێدا هەڵدەکەوێ، مژدەکە لەلایەن فریشتەکانەوە گەیانرایە حەزرەتی ئیبراهیم و سارەی هاوسەری، لەو کاتەدا کە بە لایاندا تێپەڕین کە دەچوون بۆ (مەدائن)ی گەلی (لوط) (علیه السلام)تاکو بە هۆی خراپەکاریەکانیانەوە لەناویان بەرن . خوای گەورە لە سورەتی (هود ئایەتی ٦٩ تا ٧٣) باسی ئەو فریشتانە دەکات کە چوون بۆ ماڵی حەزرەتی ئیبراهیم، واتا ئایەتەکان بەم جۆرەیە: (ڕەوانەکراوی ئێمە بە مژدەوە چوون بۆ لای ئیبراهیم، سلاّویان لێکرد، سەلاّوەکەی وەلاّم دانەوە گوێرەکەیەکی بۆ سەربرین (وای زانی میوانن) کاتێ بینی ئەوان دەست نابەن بۆ خواردنەکە تۆزێ سڵەمییەوە و ترسا، فریشتەکان پێیان گوت: مەترسە، ئێمە ڕەوانەکراوین بۆ گەلی (لوط)، واتا: بۆ (لەناوبردنیان) ژنەکەی ئیبراهیم بەسەر میوانەکانەوە هەڵوێستابوو، کە ئەم هەواڵەی بیست، زەردەخەنە گرتی لە خۆشیاندا، فریشتەکانیش مژدەی ئەوەیان پێدا کە کوڕێکیان دەبێ ناوی ئیسحاق دەبێ، لەوێشەوە یەعقوب دەکەوێتەوە، ژنەکەی ئیبراهیم لە خۆشیاندا کێشای بە ڕووخساری خۆیدا و گوتی: ئەیەڕۆ تازە من بەم تەمەنە منداڵم دەبێ؟! خۆ ئەوە پیاوەکەشم هەر پیرە ! بە ڕاستی ئەوە سەیرە ! فریشتەکان پێیان گوت: چۆن سەیرت لەئیشی خوا دێت ڕەحمەت و بەرەکەتی خو لەسەرتان ئەی خەڵکی خودایی، خۆ خوای گەورە بۆ خۆی سوپاسکراو و بەتوانایە) . . وا باس دەکەن کە فریشتەکان سێ دانە بوون (جبریل، میکائیل، ئیسرافیل)**

**هەروەها حەزرەتی ئیبراهیمیش هەر سەرسام بوو بەم هەواڵ و مژدە خۆشە بۆیە فەرمووی** ﴿أبَشرتموني عَلي أن مَسني الكِبرُ فَبِمَ تُبشرون، قالوا: بشرناكَ بالحق فَلا تَكُن من القانطين﴾[2] **واتا: ئەی فریشتەکە ئایا مژدە دەدەیتێ لەگەڵ ئەوەشدا کە من پیرم،**

---

[1] سورەتی الحجر ٥٤ – ٥٥ .

[2] سورەتی الحجر / ٥٤ – ٥٥ .

باشه مژدەی چیم دەدەنیٚ؟ فەرموویان: بە ڕاستی مژدەمان پێداویت کە دڵنیابە خوای گەورە کوڕێکت دەداتیٚ لەبەرئەوە لە نائومێدان مەبە، ئیتر مژدەیان پێدا (بغلام عليم) کەمناڵێکی زاناتان دەبێت . خوای گەورە وا باسی ئیسحاق دەکات کە کەسێکی زانا و خۆڕاگر دەبیٚ، وە ڕاستگۆ دەبیٚ، لە ئایەتی دواتردا خوای گەورە باسی ئەوە دەفەرموێت کە پاش ئیسحاق یەعقوب لەو دەکەوێتەوە، کەواتە: ئەوەی کە بڕیار بوو بکریٚ بە قوربانی حەزرەتی ئیسماعیل بووە، هەروەکو محمدی کوڕی کەعبی قرظي و هەندێکی تر فەرموویانە: هەرگیز ناگونجیٚ کە ئیسحاق ئەوە بووبێت کە بڕیاربوو بکریٚ بە قوربانی، چونکە خوای گەورە مژدەی لەدایك بوونی داوە بەدایکی و باوکی و لەلایەکی تریشەوە مژدەی پێداون کە (یەعقوب) لە ئیسحاق دەکەوێتەوە کە کرابیٚ بە قوربانی ؟

لە (ابي ذر الغفاري)یەوە دەگێڕنەوە کە فەرمووی: لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیارم کرد، یەکەم جار کام مزگەوت دروست کراوە لەسەر زەویدا ؟ فەرمووی: (مزگەوتی حەرام، پرسیم ئەی پاشان ؟ فەرمووی: مزگەوتی ئەقصا، پرسیم ماوەی نێوان چەند ساڵ بووە؟ فەرمووی: چل ساڵ، پاشان پرسیم ئەی دوای ئەو ؟ فەرمووی: لەکۆیٚ کاتی نوێژ هات لەویٚ نوێژ بکە هەموو ئەوانی تر مزگەوتن) [1].

(اهل الكتاب) پێیان وایە کە حەزرەتی یەعقوب (عليه السلام)مزگەوتی ئەقصای دروست کردووە، کە بە مزگەوتی (ئیلیای بيت المقدس) ناسراوە، دیارە کە نازناوی (یەعقوب)یش بریتیبوو لە (ئیسرائیل)، ئەوەی لە فەرموودەی پێغەمبەرماندا (ﷺ) هاتووە ئەوەیە کە حەزرەتی سولەیمان (بيت المقدس)ی دروست کردووە، وا دەردەکەویٚ حەزرەتی سلێمان تازەی کردوەتەوە، کە بە پشتیوانی خوای گەورە لە ژیانی حەزرەتی سولەیمان دا بە ووردی باسی دەکەین . خوای گەورە دەربارەی دیاری کردنی شوێنی مزگەوتی کەعبە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ بوءنا لابراهيم مَكَانَ البيت أن لا تُشرك بي شيئاً وَطهر بيتيَ للطائفين والقائمين والركع السجود وَأذن في الناس بالحج يَأتوك رِجالاً وَعَلي كل ضامر يَأتينَ مِن كل فَج عَميق﴾ [2]، واتا: شوێنی دروست کردنی ماڵی خوامان بۆ ئیبراهیم دەست نیشان کرد، پێمان ڕاگەیاند کە هاوەڵم بۆ دانەنێن لە هیچ شتیٚ، ماڵەکەم پاك بکەنەوە بۆ ئەوانەی کە بە مەبەستی تەواف و نوێژکردن و کڕنووشی دێنە ئەو ماڵە، خەڵکی بانگ بکە بۆ حەج کردن .

---

[1] متفق عليه، بخاري (٣٣٦٦)، مسلم (١١٦١) .

[2] سورەتی الحج / ٢٦ – ٢٧ .

هەروەهالەسورەتی(آل عمران ئایەتی٩٦-٩٧)وسورەتی(البقرە ئایەتی١٢٤-١٢٩) خوای گەورە باسی مزگەوتی کەعبەی کردووە، وە وا باسی کردووە کە حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)دەبێتە باوك و باوکە گەورەی زنجیرەیەك لە پێغەمبەران و پەیامداران، هەر ئەویش خانوو یان مزگەوتی کەعبە دروست دەکات کە یەکەم مزگەوتی گشتییە بۆ هەموو خەڵکی باوەڕدار، هەر خوا خۆیشی ڕێنومایی کرد و شوێنی مزگەوتەکەی پێ نیشان دا . پێشووتر ئاماژەمان بەوە کرد کە لە (علی کوڕی ابی گالب)ەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی خوای گەورە لە ڕێی وەحییەوە شوێنی کەعبەی بە حەزرەتی ئیبراهیم نیشان داوە، هەروەها شوێنی کەعبە لەئاستی (بێت المعمور)ە کە لە ئاسماندایە، بە ڕادەیەك کە ئەگەر (بیت المعمور) بە ڕێکی بکەوێتە خوارەوە بۆسەر زەوی، ئەوا ڕێك دەکەوێتە سەر کەعبە، هەموو مزگەوتەکانی تر لە هەر حەوت ئاسمانەکەدا لەگەڵ کەعبەدا هاوشوێنن، شوێنی کەعبە لەگەڵ دروست کردنی زەوی و ئاسمانەکاندا دیاریکراوە، هەر وەکو لە فەرموودەی پێغەمبەرماندا (ﷺ) هاتووە کەدەفەرمووێت: (ئەم شارە خوای گەورە پیرۆز وحەرامی کردووە لەو ڕۆژەوە کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، لەبەرئەوە بە حەرام کردن لەلایەن خواوە حەرام کراوە، واتا: ڕێزی لێگیراوە و حەرام کراوە تیایدا کوشتار و گوناهکردن) [1] . هیچ بەڵگەیەکی تەواو و ڕاست نیە دەربارەی ئەوەی کە پێش حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)کەسێکی تر کەعبەی دروست کردبێ، بەڵکو لەلای هەموو پێغەمبەران هەر لە ئادەمەوە تا حەزرەتی محمد کەعبە و شوێنی کەعبە بە ڕێز و پیرۆز گیراوە، پێشووتر باسمان کرد کە حەزرەتی ئادەم (علیه السلام)قوببەیەکی لەو شوێنەدا دروست کردووە، فریشتەکانیش بە ئادەمیان فەرمووە: کە پێش تۆ ئێمە تەواڤی کەعبەمان کردووە وە لەسەردەمی حەزرەتی (نوح)یشدا(علیه السلام)کەشتیێکە(٤٠)ڕۆژ بەدەوری کەعبەدا سوڕاوەتەوە، بەڵام ئەو هەواڵانە هەموویان لە(بنی ئیسرائیل)ەکانەوە وەرگیراون و پێویست ناکات نە بەدرۆیان بکەینەوە و نەباوەڕیشیان پێبکەین، بەڵام ئەوەی کە ئایەتی قورئان یان فەرموودەی(صحیح)بەرپەچی بداتەوە ئەوا بەرپەرچدانەوەکە ڕاستە،خوای گەورە بە دەقی قورئانی پیرۆز فەرموویەتی:﴿إن أولَ بيتٍ وُضِع للناس للذي بِبَكَّةَ مُبارَكاً وَهُدي للعالمين﴾ [2]، واتا: یەکەم مزگەوت و ماڵ کە بۆ پیرۆزی و ڕێنومایی سەرجەم خەڵکی

---

[1] متفق علیه ، بخاری (١٨٣٤) ؛ مسلم (٣٢٨٩) .

[2] سورەتی (ئال عمران) / ٩٦ .

دروست کرا ئەوەبوو لە (بەککە) دروست کرا، واتا: مەککە، یان شوێنی کەعبە ﴿فيه آيات بينات﴾ [1]، واتا: بەڵگە و نیشانەی ئاشکرای تێدایە کە حەزرەتی ئیبراهیم دروستی کردووە، ئەو باوکی گەورەی زنجیرەی پێغەمبەرانە، بگرە باسی ئەو شوێنەش یان ئەو بەردەش کراوە کە حەزرەتی ئیبراهیم چووەتە سەری لە دیوار دانانەکەیدا و ب (مقام ابراهيم) لە قورئاندا باس کراوە کە کاتی خۆی حەزرەتی ئیسماعیلی کوڕی بۆی هێناوە، کاتی خۆی ئەم بەردە بە دیواری کەعبەوە بوو، تاکو سەردەمی حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب (ﷺ)، ئیتر تۆزێك بەردەکەی دواکێشا تاکو نوێژکەران سەرقال نەبن پێوەی یا ڕێ لە تەوافکاران نەگرێ.

بێگومان حەزرەتی عومەر یەکێکە لەو کەسانەی کە خوای گەورە هەندێ لە داخوازیەکانی قبوڵ کرد، بۆ نموونە: کاتی خۆی بە پێغەمبەری فەرموو: خۆزگە (مقام ابراهيم)مان بکردایەتە جێ نوێژ، خوای گەورە داواکەی پەسەند کرد فەرمووی ﴿واتخذوا من مقام ابراهيم مصلي﴾ [2]، تەنانەت شوێن پێی پیرۆزی حەزرەتی ئیبراهیم هەر بە بەردەکەوە مابوو تا سەرەتاکانی هاتنی ئیسلام، تەنانەت حەزرەتی (علی کوڕی ابی طالب) هۆنراوەیەکی بەسەر جێ پێیەکانی حەزرەتی ئیبراهیم دا فەرمووە کە بەسەر بەردەکەوە بوون [3].

حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی بناغەیان داڕشت، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإذ يَرفَعُ ابراهيمُ القواعِدَ مِنَ البَيت وَاسماعيل﴾ [4]، بەردەوام هەردووکیان لەخوا دەپاڕانەوە و بە دەم بینا دروست کردنەوە و نزایان دەکرد و دەیانفەرموو ﴿رَبنا تَقبل منا إنكَ أنتَ السميع العليم﴾، واتا: پەروەردگارا ! لێمان وەربگرە، بە ڕاستی تۆ بیسەر و زانای، واتا: بیسەری و نزا و داواکانی ئێمەیت و زانای بنیات نانەبوون، هەروەها دەیانفەرموو: ﴿رَبنا وَاجعَلنا مُسلمينَ لَكَ وَمِن ذريتنا أُمَةَ مُسلِم لَك وَارنا مناسِكنا وَتُب عَلَينا إنكَ أنتَ التواب الرحيم﴾، واتا: پەروەردگارا ! بمانکەرە دوو کەسی موسوڵمان و باوەڕداری خۆت، لەبەرو بەرەچەشمان

---

[1] سورەتی (آل عمران) / ٩٧ .

[2] سورەتی البقره / ١٢٥ .

[3] هۆنراوەکە لە نوسخەی عەرەبییەکەدا هەیە، لاپەرە/١٦٢ باسی حەزرەتی ئیسحاق و ئیبراهیم .

[4] سورەتی البقره / ١٢٧ — ١٢٨ .

نەوەیەکی باوەڕدار و موسوڵمان بخەرەوە، بەندایەتی و پاڕانەوەمان لێوەربگرە و پێمان ڕەوابببینە، وە لێمان ببورە، بە ڕاستی هەر تۆ تەوبە وەرگر و بەبەزەیی .

جا ئیبراهیمێك كە هێندە بە سۆز و دڵسۆز و لەخۆ خۆبوردوویی بۆ بەجێهێنانی فەرمانی خوایی، هەقی خۆیەتی بنیاتنەری مزگەوتێك بێ كە ببێتە گەورەترین و پیرۆزترین مزگەوتی سەر زەوی بۆ هەموو باوەڕداران و خۆیشی ببێتە باوكە گەورەی زنجیرەیەك لە پێغەمبەران و سەروەران و دواهەمینیشیان ئازاری پێغەمبەران حەزرەتی محمد (ﷺ)، مزگەوتەكەی جێی خۆیەتی شایستەی ئەوەبێ كە هاوش[1] وێنی مزگەوتی (بیت المعمور)ی ئاسمان بێ كە هەموو ڕۆژێ حەفتا هەزار فریشتە نوێژی تێدا دەكەن و ئیتر ئەوانە تا ڕۆژی دوایی جارێكی تر نایەنەوە بۆ ئەو مزگەوتە . لە تەفسیرەكەماندا بە ووردی باسی چۆنیەتی دروستكردنی مزگەوتی كەعبەمان كردووە، لە تەفسیری سورەتی (البقرە)دا . (السدی)دەفەرموێت:كاتێك خوای گەورە فەرمانی كرد بە حەزرەتی ئیبراهیم كە مزگەوتی كەعبە دروست بكات لەگەڵ ئیسماعیلی كوڕیدا،نەیاندەزانی شوێنی مزگەوتەكە كوێیە، هەتا خوای گەورە (با)یەكی نارد كە ناوی (خەجوج) بوو، دوو باڵی هەبوو، سەری بایەكە لە شێوەی سەری مار دا بوو، بایەكە چوار لای زەویەكەی لەجێی ئێستای كەعبەدا گسك دا و پاكی كردەوە، ئەوانیش بە شوێنە پاكراوەكەدا دەستیان كرد بە خەندەیەك لێدان و بناغە دانان، هەروەك خوای گەورە فەرموێ:﴿وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ﴾ [2]، گەیشتە دانانی گۆشەكان، حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی بە ئیسماعیلی كوڕی: بڕۆ بەردێكی باشم بۆ بێنە كە لەم شوێنەدا دایبنێم، فەرمووی: باوكە تەواو شەكەت و ماندووبووم، باوكی فەرمووی قەیناكا تۆ بڕۆ، بەڵام حەزرەتی جبریل (علیە السلام)لە هندستانەوە بەردێكی هێنا، كە ناسراوە بە (بەردە ڕەشە)، كە لە بنەڕەتدا بەردێكی یاقوتی سپی و شووشە شێوە بووە و كاتی خۆی ئادەم (علیە السلام)لەسەر ئەو بەردەوە لە بەهەشتەوە دابەزیوە بۆ سەر زەوی، واتا: بە سواری ئەو بەردە، بەڵام بەهۆی گوناهی خەڵكەوە ڕەنگی ڕەش هەڵگەڕاوە، حەزرەتی ئیسماعیل بەردێكی هێنا، بەڵام كاتێك ئەو بەردەی لەسەر سیلەكە [3] بینی، پرسی: بابەگیان ! ئەوە كێ ئەو بەردەی بۆ هێنای ؟

---

[1] واتە تەفسیری ابن كپیر .

[2] سورەتی الحج / ٢٦ .

[3] سیلە: گۆشە: سووچ

فەرمووی: کەسێك بۆی هێنام کە لە تۆ چالاکترە ! بەدەم نزاو پاڕانەوەوە خەریکی بنیات نان بوون ﴿رَبَّنا تَقَبَّل مِنا إنكَ أنتَ السَّميعُ العَليمُ﴾ [1] .

(ابن أبی حاتم) [2] دەفەرموێت: (ذا القرنین) ئەوساکە پادشای هەرەگەورەی سەر زەوی بوو، کە بەلای حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل دا تێپەڕی کە خەریکی بنیاتنانی مزگەوتی کەعبە بوون، پرسیار لێکردن: کێ فەرمانی پێ کردووەن بەم کارەتان ؟ حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)فەرمووی: خوا فەرمانی پێکردووین، فەرمووی: بەچی دڵنیابم کە خوا فەرمانی پێکردویت ؟ لێرەدا پێنج بەران شایەتیان بۆ دا، کە ئەوە فەرمانی خوایە، ئیتر ئەویش بڕوای کرد، (الأزرقي) وا باس دەکات کە (ذا القرنین) لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیم دا بەدەوری ماڵی کەعبەدا گەڕاوە و تەواف کردووە . ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو دروست کردنەدا تێپەڕی کە سەر لەنوێ قوڕەیشییەکان تازەیان کردەوە، بەڵام بناغەکەیان بچوك کردەوە لەلای باکوریەوە بە ڕووکاری شامدا، لە هەردوو (صحیح)ەکەدا [3] هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئایا نەتزانیوە کە قەومەکەی تۆ کاتێك کەعبەیان بنیاتنایەوە، بناغەکانی حەزرەتی ئیبراهیمیان دواتر کێشا، واتا: بچووکیان کردەوە .

(ابن الزبیر) لە ڕۆژگاری خۆیدا تازەی کردۆتەوە، کاتێك حەجاج لەساڵی حەفتا و سێدا کوشتی بۆ عبدالملکی کوڕی مەروانی نووسی: کە ئەوسا خەلیفە بوو، وایان زانیبوو کە (ابن الزبیر) سەربەخۆ ئەوەی کردووە، لەبەرئەوە فەرمانی کرد کە وەکو خۆی لێبکرێتەوە، دیسان دیوارەکەی لای شامیان هەڵوەشاندەوەو بەردەکەیان دەرهێنایەوە و پاشان دیوارەکەیان بەربەست کرد و بەردەکانیان کردەوە ناو کەعبەوە و بەوەش دەرگای لای خۆرهەڵاتی بەرز بوەوە و دەرگای لای خۆراواشیان بە تەواوەتی گرت، هەروەکو تائێستاش بەو جۆرە ماوەتەوە، ئیتر کاتێك هەواڵیان زانی کە (ابن زبیر) سەربەخۆ ئەوەی نەکردبوو، بەڵکو لەسەر بناغەی فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی کردبوو، کە عائیشە فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە زۆر زۆر پەشیمان بوونەوە لە کارەکانیان، دووبارە لە سەردەمی (مەهدی کوڕی منصور)دا ، پێشەوا (مالك) ڕاوێژی پێکرد ئاخۆ بڕیاری چۆنە کە دیسانەوە دیوارەکە وەکو سەردەمی (ابن زبیر) لێبکەنەوە،

---

[1] سورەتی البقرە / ١٢٧ .

[2] ابن أبی حاتم گێڕاویەتیەوە (١٢٣١) لە قسەکانی عولەبای ئەحمەڕە

[3] متفق علیه، بخاری/١٥٨٣-٣٣٦٨، مسلم / ٣٢٣٠ – ٣٢٣١ .

بەلاّم (مەهدی) فەرمووی: من دەترسم مەلیك و خەلیفەكان لەدوای ئێمەوە كە دێن بیكەنە گەمەویاری و هەریەكەیان بە جۆرێك دەستكاری بكەن، لەبەرئەوە با هەروەكو خۆی بێت . ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرمان (ﷺ) دەربارەی كەعبە و دیوارەكەی بەم جۆرەیە: ئایا نەتزانیوە كە قەومەكەی تۆ كاتێك كەعبەیان دروستكردەوە دەستكاری بناغەكەی حەزرەتی ئیبراهیمیان كرد و كەمیان كردەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا: ئەی نایخەیتەوە هەمان شوێنی بناغەكەی ئیبراهیم ؟ فەرمووی: ئەگەر قەومەكەت نەو كافر نەبوونایە وام لێدەكردەوەو گەنجینەی كەعبەشم لە رێی خوادا خەرج دەكرد و دەرگاكەیشم رێكی زەوی دادەبەزاند و بەردەكەشم دەكردە دیوی ناوەوە . (ابن الزبیر) لەسەر بنچینەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتبوو دەستكاری كەعبەی كرد، بەلاّم (عبدالملك) وایزانی سەربەخۆ وای كردووە و كوشتی، دواتر بۆی دەركەوت و پەشیمانی دواییش بێسوود بوو.

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ﴾ [1]، واتا: حەزرەتی ئیبراهیم بە چەند دەسەواژەیەك لە پەروەردگاری خۆی پاڕایەوە، خوای گەورەش نزاكانی لیّ وەرگرت و فەرمووی: ئەوا من بۆ خەڵكی تۆم كرد بە پێشەوا ، ئیبراهیم فەرمووی: دەباشە لەوانەش كە لێم دەكەونەوە، خوای گەورە فەرمووی: بەڵیّ: ئەوانیش، بەلاّم پەیمانی ستەمكاران ناگرێتەوە .

ئەوەبوو خوای گەورە ئیسحاقی پێبەخشی كە پاشان پەیمان و وەحی بۆ نارد و كردی بە پێغەمبەر (ﷺ)، هەروەها لەویش حەزرەتی یەعقوب كەوتەوە كە ئەویش هەر كرا بە پێغەمبەر (ﷺ)، وە دوو جار پاداشت درایەوە لە دنیاو لە دواڕۆژیشدا لە ڕیزی ئادەمیزاد دەژمێردرێت، تا دەگات بە داود، سلیمان، ئەیوب، یوسف، موسا، هارون، زەكریا، یەحیا، عیسا، ئیلیاس، ئیسماعیل، ئیلیەسەع، یونس، لوط، جگە لەو پیاو چاك و پێغەمبەرانەی كە باوكی ئەمان بوون یان لەوان كەوتوونەتەوە، یاخود برایان بوون، هەموو ئەمانە بەرەیەكی پاك و بەرز و پیرۆز و سەروەربوون، كە لە بنەڕەتدا دەچنەوە سەر حەزرەتی ئیبراهیم(علیه السلام)، ئەوانەش لە سورەتی (العنكبوت ئایەتی/٢٧ و سورەتی (الانعام ئایەتی/٨٤-٨٧دا باس كراون، لەلایەكی ترەوە خوای گەورە دەفەرموێت:

---

[1] سورەتی البقره / ١٢٤ .

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحاً وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ فَمِنْهُمْ مُهْتَدٍ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾[1]، تەنانەت هەر کتێبێك و پەیامێك لە ئاسمانەوە هاتبێت بۆ هەر پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرانی دوای ئیبراهیم لە بنەڕەتدا ئەو پێغەمبەرانە دەچنەوە سەر حەزرەتی ئیبراهیم(علیه السلام)، بەم پێیە لە هاجەرە خاتوون (ئیسماعیل)ی لێکەوتەوە کە بۆتە باپیرە گەورەی سەروەری پێغەمبەران حەزرەتی محمد (ﷺ)، وە لە (ساراخان)یش (ئیسحاق)ی لێکەوتەوە کە بۆتە باوە گەورەی حەرزەتی یەعقوب(علیه السلام)، واتا: (ئیسرائیل) و ئەویش زەنجیرەیەکی گەورە پێغەمبەری لێکەوتەوە کە کەس ژمارەیان نازانێ جگە لە خوای گەورە، دواهەمین پێغەمبەریان حەزرەتی (عیسا)یە (علیه السلام).

لە حەزرەتی (ئیسماعیل)ەوە حەزرەتی محمد (ﷺ) کەوتەوە کە دەفەرموێت: (لە ڕۆژی دواییدا خوای گەورە پلە و پایەیەکم پێ دەبەخشێ کە هەموو خەڵکە خۆزگەم پێبخوازن، تەنانەت ئیبراهیمیش) [2]، لەم فەرموودەیەوە دەردەکەوێ کە لەدوای پێغەمبەری خۆمان حەزرەتی محمد (ﷺ)، حەزرەتی ئیبراهیم باشترین و بەڕێزترین کەسە لەلای خوای گەورە . بوخاری [3] دەفەرموێت: (پێغەمبەر (ﷺ)، پەنای حەسن و حسینی دەدایە خوای گەورە لە دەست شەیتان و دەیفەرموو: باوانتان ئیسماعیل و ئیسحاق(علیه السلام)پەنایان بەخوا دەدا و دەیانفەرموو پەنا بەو ناوانەی خوا دەگرین کە هەموو وشە پاك و بێگەردەکانن، لە هەموو شەیتانێك، وە لە هەموو پیاوێکی پیس) (أهل السنن)یش هەمان فەرموودەیان گێڕاوەتەوە . حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)فەرمووی: هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: (پەروەردگارەکەم ! نیشانم بدە چۆن چۆنی مردوو زیندوو دەکەیتەوە ؟ خوای گەورە فەرمووی: بۆچی باوەڕت نەهێناوە ؟ فەرمووی: بەڵێ باوەڕم هەیە، بەڵام حەزدەکەم چاکتر دڵنیابم، خوای گەورە فەرمووی: حەوت باڵندە بێنە جوان سەرنجیان بدە، پاشان سەریان ببڕە (توك و خوێن و گۆشتیان پێکەوە بشێلە تا دەبنە هەویرێك) . ئەوجا هەر لوتکە شاخێك هەندێك لەو هەویرە دابنێ، ئینجا بانگیان بکەرەوە زۆر بە گورجی دێنەوە لای خۆت، دڵنیابە و فێربە، بزانە کە خوای گەورە بەتوانا و کار

---

[1] سورەتی الحدید / ٢٦ .

[2] صحیح مسلم / ١٩٠١، أبو داود / ١٤٧٨

[3] صحیح، أبو داود / ٤٧٣٧، الترمذي / ٢٠٦٠، ابن ماجه / ٣٥٢٥، النسائي (الكبرى) / ١٠٨٤٤ .

بەجێ یە) [1]، ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆزیش گەلێ لێکدانەوەی جیاجیان هەیە بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە . بە کورتی: خوای گەورە وەڵامی داخوازییەکەی دایەوە، فەرمانی پێکرد چوار باڵندە بگرێت کە زۆربەی ڕاڤەکان پێیان وایە هەریەکە لەو باڵندانە جۆرێکی جیابوون لەوانی تر، پاشان فەرمانی پێکرد، کە توك و خوێنیان ئاوێتە بکات و بیانکاتە یەك هەویر، دوایی بیانکاتە چوار بەش و لەسەر هەر شاخێك بەشێکی دابنێ، ئەوەی کرد، بە فەرمانی خوای گەورە بانگی کرد، لەگەڵ بانگ کردنەکەیدا پارچەکانی هەر دانەیەك بەرەو تەواوکەرەکەیان فڕین، هەموو پارچە پەڕێك، بگرە هەموو توکێکی باڵندەکە چووەوە بۆلای تەواوکەری توك و پەڕی هەمان باڵندە، بەم جۆرە پێکهاتەکانی هەریەکەیان باڵندە بنەڕەتیەکەیان لێ دروست بووەوە، حەزرەتی ئیبراهیمیش (علیه السلام)سەرنجی لە شوێنەواری توانای پەروەردگاری دەدا، کە هەموو کارێکی (کن فیکون)ە، باڵندەکانیش بەپێی، وردە . . وردە بەسەر زەویدا بەرەو ڕووی هاتن، چونکە بەپێ هاتنیان بەسەر زەویدا دیارتر و خاوتر و بەرچاوترە و چاکتر هەستی پێ دەکرێت، تەنانەت وا باس دەکرێت کە حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)بەباڵندەکانی فەرموو: با هەر یەکەیان بێت و سەری خۆی بخاتە ناودەستی حەزرەتی ئیبراهیم، باڵندەکان وایان کرد، وردە . . وردە پارچە تەواوکەرەکانیشیان هاتنەوە لای خۆی، کەواتە جگە لە (الله) هیچ خوایەکی تر نیە

ئیبراهیم (علیه السلام)زۆر چاك دەیزانی کە خوای گەورە گەلێك بە توانایە لە زیندووکردنەوەی مردودا، ئەوەش بەوپەڕی بێگومانیەوە باوەڕی هەبوو، بەڵام حەزی کرد کە بەچاوی خۆی ئەوە ببینێ، تاکو (علم الیقین)ەوە بگاتە (عین الیقین) [2]؛ خوای گەورەش بەوپەڕی دڵنیاییەوە خواستەکەی بۆ هێنایە دی.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەی خاوەن کتێبەکان ئێوە بۆ لە ئیبراهیم دەدوێن ؟ هەریەکەتان وا دادەنێن کە لەسەر ئاینی خۆیەتی خۆ تەورات و ئینجیل لەدوای ئەو ڕەوانە کراون ئەوە بۆ ژیریتان ناخەنە کار و تاکەی بیر ناکەنەوە ؟ ئەوە ئێوەن موجادەلە لەسەر ئەو باس و خواسانە دەکەن کە زانیاریتان دەربارەی هەبوو، کە وابوو بۆچی دەم لەو شتانەوە دەدەن کە هیچ زانیاریتان دەربارەی نیە ؟

---

[1] سورەتی البقرە ٢٦٠

[2] بۆ نموونە: تۆ دڵنیایت کە (٣+١) دەکاتە (٤)، ئەمەش (علم الیقین)ە، بەڵام ئەگەر بە بەرچاوی خۆتەوە (٣) شت و (١)شتی تر کۆبکەیتەوە و هەمان ئامانجی کرداری پێشووت دەست بکەوێت بەمەیان دەگوترێ (عین الیقین) / وەرگێر .

دیاره خوا ئەو شتانە دەزانێت، ئێوە نایزانن . ئیبراهیم نەجولەکە بووە و نەگاوەر بەڵکو مل کەچ و فەرمانبەردار و موسوڵمان بووە و لە دەستەی هاوەڵدانەران نەبووە نزیکترین کەس لە ئیبراهیمەوە ئەو کەسانەن کە لە سەردەمی خۆیدا شوێنی کەوتبوون، هەروەها ئەم پێغەمبەرەش (واتا حەزرەتی محمد) (ﷺ) و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە بە پێغەمبەرایەتی موسا و عیسا و ئیبراهیم و محمد و هەموو پێغەمبەران بە گشتی، بێگومان خوا یاوەری باوەڕدانە [1]، بەم جۆرە خوای گەورە پاکانەی حەزرەتی ئیبراهیم ڕادەگەیەنێ، کە ئەو زاتە نەگاورە و نە جولەکەیە، بگرە نەفامی و کەم ئەقڵی ئەوان نیشان دەدات، چونکە کتێبی گاوەر و جولەکەکان دوای ئیبراهیم دابەزیون، وەك دەفەرموێت: ﴿وَما انزلت التوارة والأنجيل ألا مِن بَعدِهِ﴾، ئیتر پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ئەرێ باشە ئێوە (عەقڵتان نیە) ؟ خوای پەروەردگار دەری دەخات کە ئیبراهیم (علیه السلام)لەسەر ئاینێکی (حەنیف)ە، واتا: پڕ لە دڵسۆزی، بەڵکو لادان لە ڕێگەی ڕاست بەرەو گاورێتی و جولەکایەتی بەدەستی ئەنقەس، کاری حەزرەتی ئیبراهیم نەبووە، جا کەسێکیش بە ئارەزوو ئاینی ئیبراهیم دەستکاری بکات ئەگەر خۆی گەمژە بکات، ئەگینا ئێمە حەزرەتی ئیبراهیمیشمان لە دنیادا دەستەبژێر کردووە و لە دواڕۆژیشدا لە ریزی چاکەکارانیشدایە، کاتێك خوای گەورە فەرمووی ئەی ئیبراهیم موسوڵمان بە، فەرمووی: باوەڕم هێنا بە پەروەردگاری بونەوەرییان [2] سەرەرای ئەمانە خوای گەورە بەهرە و بەخشیش و سەروەریەکی تایبەتی داوە بە حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام)کە نەیداوە بە پێغەمبەرانی تر، هەروە دەفەرموێت: (ئەی محمد (ﷺ) پێیان بڵێ بە ڕاستی من پەروەردگارم هیدایەت و ڕێنەویی کردووم بۆ ڕێگە و ڕێبازی ڕاست و دروست، ئاینێك کە ڕاگری ژیانی خەڵکە، ئەویش ئاینی ئیبراهیمە و دوورە لەهەموو لادان و ناڕێکییەك، خۆیشی هەرگیز لەگەڵ هاوەڵدانەراندا نەبووە، ئەی محمد بڵێ: بەڕاستی نوێژ و حەج و دروشمەکانی (سەرجەم چاکە و بەندایەتیشم هەروەها ژیان و مردنم تایبەتە بە خوای پەروەردگاری جیهانیانەوە) [3]

---

[1] سورەتی ال عمران / ٦٥-٦٨ .

[2] بۆ چاکتر شارەزابوون دەربارەی حەزرەتی ئیبراهیم لە قورئاندا، بڕوانە سورەتی (البقرە) ئایەتی (١٣٠-١٤) لە تەفسیری ئاساندا لاپەرە (٢٠) .

[3] سورتی الانعام / ١٦١ — ١٦٣ .

دووباره خوای گەوره له سورەتی (النحل ئایەتی ١٢٠-١٢٣)دا باسی هەندێك له ڕەوشت و سیفەتە بەرزەكانی حەزرەتی ئیبراهیم دەكات، كە كەسێكی بۆ خوا مل كەچ و خواپەرست بووه و دوور بووه له هاوەڵدانان و هەمیشە سوپاسگوزاری خوا بووه لەسەر نیعمەتەكانی، هەر بۆیە خوای گەوره ڕێنومایی كرد بۆ سەر ڕێی ڕاست و خوای گەورەش لەدنیادا چاكەی دێنێتە ڕێ و له دوا ڕۆژیشدا له چاكەكارانە، كەواتە هەردوو دنیای هەر چاكه و چاكەكارییه (بوخاری) دەیباتەوه سەر گێڕانەوەیەكی (ابن عباس) كە فەرموویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) هەر كات لەماڵێكدا وێنەی بدیایە نەدەچووه ئەو ماڵەوه تاكو وێنەكەیان لانەبردایە، ئیبراهیم و ئیسماعیلی بینیوه كە بتیان بەدەستەوه بووه (واتا: وێنەی بەو جۆرەیان بۆ ئەو دوو پێغەمبەره دروست كردووه، بەخوا ئەوانە هەرگیز سوێندیشیان بەبت نەخواردووه) [1]، له گێڕانەوەیەكی تری (بوخاری)دا هاتووه كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوا بیانكوژێ ! خۆ ئەوانە دەزانن كە گەورەمان واتە:ابراهیم، هەرگیز سوێندی بەو بتانە نەخواردووه) .

خوای گەوره له سورەتی (النساء ئایەتی/١٢٥)دا دیسان باسی سەرەڕیی ئیبراهیم پێغەمبەر دەكات و دەفەرموێت ﴿وَمَن أحسَنُ ديناً ممن أسلَم وَجهَهُ لله وَهوَ مُحسنٌ وَاتّبع ملة ابراهيمَ حَنيفاً واتّخذ الله ابراهيمَ خليلاً﴾، واتا: كێ ئاینێكی باشتر لەئاینی ئەو كەسەی گرتوەتە بەر كەو بە ڕاستی خۆی داوەتە دەست خودا و ڕووی له ئەو خودایە كردووه، ئەو كەسە چاكەكارە و شوێن پێشەنگەكەی خۆی كەتووه كە ئیبراهیمە و كەسێكی زۆر دڵسۆز و بۆ خوا ژیاو بووه، لەبەرئەوەش بووه كە خوای گەوره كردوویەتیە هەڵبژاردەی خۆی له نیو پێغەمبەراندا . لەو ئایەتەدا خوای گەوره، شوێنكەوتنی پەیامی ئیبراهیم برەو پێدەدات و بە ئاینێكی ساخ و دروستی له قەڵەم دەدات و خێری هەردوو دنیای تیادا كۆبوەتەوه، له سورەتی (النجم، ئایەتی ٣٧)دا مەدحی ئیبراهیم دەكات و دەفەرموێت: (وابراهيم الذي وفى)، ئەو ئیبراهیمەی وەفادارانە ڕەفتار و گفتاری بەجێ هێنا و هەر ئەو سیفەتەشی خوای گەوره بە گەوره بۆی ڕوانی و كردی بە (خليل)ی خۆی، كەسێكیش دەكرێتە (خليل) كە زۆر زۆر خۆشەویست بێت، هەروەكو شاعیرێك دەڵێت: ( قَد تخلّلت مَسلك الرّوح مَنيوبذا سُمي الخَليلُ خليلاً ) بەم جۆره پێغەمبەری خۆشەویستمان سەرداری پێغەمبەران (محمد) (ﷺ) ئەو سەروەری و (خليل)یەی پێبەخشراوە،

---

[1] صحيح البخاري (٣٣٥٢)، أبو داود (٢٠٢٧) .

هەروەکو (ابن مسعود) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خەڵکینە ! خوای گەورە منی کردۆتە خەلیلی خۆی، هەروەکو ئیبراهیمیشی کردۆتە خەلیلی خۆی) [1] لە دواهەمین وتاریشیدا پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرمووی: (خەڵکینە ! ئەگەر بکرایە منیش کەسێك لە خەڵکانی سەرزەوی بکەم بە خەلیلی خۆم، ئەوا ابوبکرم هەڵدەبژارد، بەڵام خۆیشم خەلیلی خوای گەورەم) [2] .هەر لە گێڕانەوەیەکی تردا پێشەوا بوخاری هێناویەتی، کاتێك کە (موعاذ) گەیشتە یەمەن، لە نوێژی بەیانیدا کە پێشنوێژی بۆکردین ئەم ئایەتەی خوێند (واتخذ الله ابراهیم خلیلا)، یەکێك لە خەڵکی ئەوێ پاش تەواوبوونی نوێژەکە، بە (موعاذ)ی گوت: چاوی دایکی ئیبراهیمت ڕوون کردەوە . لە گێڕانەوەیەکی (ابن عباس)دا هاتووە کە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبوون و خۆبەخۆ قسە و باسیان دەکرد، ئەویش لەو کاتە هاتە دەرەوە و چوو بۆلایان و گوێی لێبوو، دەیانگوت: سەیرە ! کە خوای گەورە لە نێو دروستکراوەکانی خۆیدا خەلیلی بۆ خۆی هەڵبژاردووە ! ئەوەتا ئیبراهیمی کردۆتە خەلیلی خۆی، یەکێك دەیگوت: بۆچی سەرسام بین لەکاتێکدا خوا خۆی لەگەڵ موسادا قسەی لە نێوان خۆیاندا کردووە، ئەوی دی دەیگوت: خۆ عیساش (روح الله)یە و لەگەڵ خوادا دواوە، تاقمێکی تریان دەیگوت: ئادەم هەڵبژێردراوی خوایە، لەم کاتەدا پێغەمبەرمان (ﷺ) هاتە لایان و سڵاوی لێکردن و فەرمووی: گوێم لەقسە و باوس و سەرسامیەکانتان بوو، ڕاستە (ئیبراهیم) خەلیلی خوایە، موساش خودا قسەی لەگەڵدا کردووە، ئەویش ڕاستە، عیساش (روح الله) یە و خوا قسەی لەگەڵدا کردووە، ئادەمیش خوای گەورە هەڵیبژاردووە ئەویشیان ڕاستە، دەمنیش خۆشەویستی خوام، بێ خۆ نواندن، من یەکەم کەسم کە دەسکی دەرگای بەهەشت دەلەرێنمەوە و خواش دەرگاکە دەکاتەوە، دەچینە ژوورەوە و هەژارە باوەڕدارەکانم لەگەڵدایە، من بەڕێزترینی یەکەم تا دواهەمینتانم هەتا ڕۆژی دوایی، بێ خۆ نواندن) [3] . هەر لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا نکوڵی لەوە دەکەن کە (خەلیلی) بە ئیبراهیم ببڕێت ؟ (کلام) بە موسا و خەون ڕاستی بە

---

[1] متفق علیه، بخاری (٣٦٥٤)، مسلم (١١٨٨) .

[2] متفق علیه، بخاری (٤٦٦)، مسلم (٦١٦٢٠) .

[3] صحیح البخاری (٤٣٤٨) .

محمد(ﷺ)؟[1]. (حاتەم) دەڵێت: لە باوکمەوە ئەویش لە موحەممەدی کوڕی خالیدی سەلماوە، ئەویش لە وەلیدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی بەشارەوە دەگێڕنەوە کە کاتێك خوای گەورە ئیبراهیمی کردە خەلیلی خۆی، خۆشییەك کەوتە دڵی ئیبراهیمەوە، کە تەنانەت لە دووریشەوە دەنگی تریەی دڵی ئیبراهیم دەبسترا؛ هەروەکو چۆن دەنگی فرتەی باڵی باڵدار لە هەوادا دێت .

عەبیدی کوڕی عومەیر دەڵێت: ئیبراهیم زۆر میوانداری خەڵکی دەکرد، ڕۆژێکیان هاتە دەرەوە بەدوای کەسێکدا دەگەڕا تا بیباتەوە لەگەڵ خۆیدا و بیکاتە میوانی خۆی، بەلاّم کەسی دەست نەکەوت، وبەناچاری گەڕایە ماڵەوە، بەبێ میوان، بینی وا پیاوێك لە ماڵەکەیاندا ڕاوەستاوە، لێی پرسی: ئەی بەندەی خوا چۆن بێ پرس چۆیتە ماڵی منەوە ؟ ووتی: بە پرسی پەروەردگارەکەی چوومە ژوورەوە، فەرمووی: ئەدی تۆ کێیت ؟ فەرمووی: ئەمن فریشتەی گیانگێشانم، گوای گەورە ناردوومی تاکو مژدەیەکی خۆش بە یەکێك لە بەندەکانی ڕابگەیەنم، چونکە خوای گەورە ئەوی کردۆتە خەلیلی خۆی ! فەرمووی: ئەو کەسە کێیە؟ بەخوا هەر پێم بڵێیت، ئەگەر لەوسەری دنیاش بێت دەچمە لای و واز لە دراوسێیەتی ئەو ناهێنم، تاکو مەرگ لێکمان جیا دەکاتەوە ! فەرمووی: ئەو کەسە تۆی ! فەرمووی: من ؟! فەرمووی: بەڵێ تۆ، فەرمووی: بەچی خوا گەورە کردوومی بە خەلیلی خۆی ؟ فەرمووی: تۆ بەخشندەی بەرانبەر خەڵکی بەبێ هیچ بەرانبەرێك (ابن ابی حاتم گێڕاویەتیەوە) . لە گەلێك شوێنی تری قورئاندا خوای گەورە باسی سەخاوەت و دەهەندەیی ئەوی کردووە و مەدحی کردووە، وەك دەڵێت: لە (٣٥) شوێن لە قورئاندا باس کراوە و لەوانەش (١٥) جار تەنها لە سورەتی (البقرە)دایە، ئیبراهیم یەکێکە لە پێنج پێغەمبەرە مەزندەکان کە دەقی قورئانی پیرۆز باسیان دەکات، لە سورەتی (الاحزاب) و (شورا)دا، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنْكَ وَمِنْ نُوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَأَخَذْنَا مِنْهُمْ مِيثَاقًا غَلِيظًا﴾ [2]، واتە: (ئێمە پەیمانمان لە پێغەمبەران وەرگرت، هەروەها لە تۆش (ئەی محمد)، وە لە نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسای کوڕی مەریەم، بەڵێ پەیمانێکی توند و تۆکمەمان لێ وەرگرتن)، هەروەها لە سورەتی (شورا)ش

---

[1] صحیح: الحاکم (٢/٤٦٩)، النسائی – الکبری (١١٥٣٩) .

[2] سورەتی الاحزاب / ٧ .

دا ناوی ئەو پێنج پێغەمبەرە هاتووە [1] . ئیبراهیم لە دوای محمد (ﷺ) یەکەمین پێغەمبەری (ئولول عەزم)ە، کەکاتی خۆی لە شەو ڕەویدا پێغەمبەرمان (ﷺ) لە ئاسمانی حەوتەم دا بینیویەتی کە پشتی داوە بە (بیت المعمور)ەوە ئەو (بیت)ەی ڕۆژانە (حەفتا هەزار) فریشتە دەچنە ناویەوە و ئیتر ئەو کۆمەڵە جارێکی تر ناگەڕێنەوە هەمان (بیت)، واتە: تا ڕۆژی قیامەت بەو شێوەیە بەردەوام دەبێت ئەگەر چی فەرموودەی تر دەفەرموێت کە حەزرەتی ئیبراهیم لە ئاسمانی شەشەم دایە و حەزرەتی موسا لە ئاسمانی حەوتەمدایە، خوای گەورە زاناترە .

پێشەوا احمد لە (ابو هریرە)ەوە هێناویەتی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (بەڕێز و کەریم، کوڕی کەریمی کوڕی کەریمی کوڕی کەریمی یوسفی کوڕی یەعقوبیی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی خەلیلی خودایە) [2]، ئەم فەرموودەیەش دەریدەخات کە ئیبراهیمی پێغەمبەر لە موسای پێغەمبەر پایە بڵند ترە، کە فەرموودەکە دەفەرموێت: (وَاخرت الثالثة ليومٍ يَرغَبُ الي الخلق كلهم حتي ابراهيم) .

لە فەرموودەیەکی پێغەمبەرماندا (ﷺ) هاتووە کە فەرمویەتی: (من گەورەترین منداڵی ئادەمم لە ڕۆژی قیامەتدا بێ خۆنواند)، پاشان باسی ئەوە دەکات کە خەڵکەکە پەنا دەبەنەبەر نوح و ئیبراهیم و موسا و عیسا تاکو تکایان بۆ بکەن لای خوای گەورە، بەڵام هیچ کام لەوانە ناتوانن تکا بکەن تا نۆرە دەگاتە سەر محمد (ﷺ) ئینجا ئەو دەفەرموێت: (من تکا دەکەم .... من)، پێشەوا (بخاری)یش [3]، هەر بەو شێوەیە گێڕاویەتەوە [4]، لە جێگەی تریش دا بە ڕێگەی تر موسلم و نەسائی فەرموودەکەیان هێناوە . پێشەوا بخاری [5] لە (ئەبو هریرە)ەوە دەگێڕنەوە گوترا ئەی پێغەمبەری خوا کێ لای خوا بەڕێزترین کەسە ؟ فەرمووی: تەقواترین کەس، گوتیان لەو ڕووەوە ناپرسین، ئینجا فەرمووی: بەڕێزترین کەس یوسف پێغەمبەرە، کە کوڕی پێغەمبەری کوڕی پێغەمبەری کوڕی (خلیل اللە)یە، گوتیان لەوێشەوە ناپرسین، فەرمووی: گەر لەسەر

---

[1] سورەتی الشوری / ١٣ .

[2] متفق علیه: البخاری (٣٣٩٠)، مسلم (٢٣٧٨)، المسند (٣٣٢/٢) .

[3] صحیح البخاری (٣٣٤٠) .

[4] صحیح المسلم (٤٧٩) .

[5] صحیح البخاری (٣٣٥٣) .

توخمی عەرەبەکان لێم دەپرسن: ئەوا باشترینیان لە نەفامیدا هەمان کەسیانە لە ئیسلامدا گەر موسوڵمان بێت . فەرموودی (ان الكريم ابن الكريم ...) الحديث . ەچەند شێواز و ڕشتەیەکی تر هاتووە، لە چەند گێڕانەوەیەکی جیاجیادا، بەڵام هەموویان هەمان چەمك و واتایان هەیە، کە سەروەری و کەریمی پشتاوپشت ئەگەیەنێتەوە بە ئیبراهیم پێغەمبەر(ﷺ)، پێشەوا (احمد) فەرموودەیەکی تری هێناوە کە دەچێتەوە سەر (ابن عباس) و دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (خەڵکی لە ڕۆژی دواییدا زیندو دەکرێنەوەو کۆ دەکرێنەوە، پێپەتی و ڕووت و بێبەرگ، جا یەکەم کەسێك کە بەرگی لەبەر دەکرێت و دادەپۆشرێت ئیبراهیمە(عليه السلام)،پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند ﴿ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْداً عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ﴾ (سورەتی الانبیاء/١٠٤)، وە ئەمەش هیچ لەسەروەری پێغەمبەرمان محمد) کەم ناکاتەوە، چونکە ئەو سەرداری هەموو پێغەمبەران و مرۆڤایەتیە بە گشتی . پێشەوا احمد فەرموودەیەکی تری هێناوە کە دەگاتەوە بە (ئەنەسی کوڕی مالك) کە دەڵێت: پیاوێك بە پێغەمبەری گوت: ئەی (خير البريه)، واتا: ئەی باشترین مەخلوقی خوا، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) لە وەڵامدا فەرمووی: (ئەوەیان ئیبراهیمە)، دەڵێن: فەرموودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) لێرەدا دەچێتە ئەو لایەنەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕووی ڕێزەوە بۆ باپیرە گەورەی (واتا: ابراهيم) وای فەرمووە، واتا: نیشانەی بێ فیزیەتی، هەروەکو فەرموویەتی: (بە گەورەترم دامەنێن بەسەر موسادا، چونکە خەڵکی لە ڕۆژی دواییدا هەورە تریشقە دەیانگرێتەوە، پاش ئەوە من یەکەم کەس دەبم کە چاك دەبمەوە، موسا دەبینم بەلای عەرشەوەیە، ئیتر نازانم ئایا پێش من چاك بوەتەوە یان هەورە تریشقەکەی کێوی (طور)ی بۆ بری خراوە) [1] . خۆ ئەگەر ئیبراهیم پێغەمبەر لە پێنج پێغەمبەرە گەورەکان بێت، ئەوا ئەو نزایەی لە (تەحیات)ی نوێژدا لەسەر ئیبراهیم دەکەین واجبە لەسەر (محمد)ی بکەین، هەروەکو لە [1] (صحيح)ەکەدا هاتووە [2]. ئەوەبوو (کەعبی کوڕی عەجرە) و هەندێکی تریش دەگێڕنەوەو دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا دەزانین چۆن سڵاوت لێ دەکرێت، ئەی چۆن صەڵاواتت لەسەر لێدەدرێت ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: : بڵێن (اللهم صلي علي محمد وعلي آل محمد كما صليت علي نبراهيم وعلي آل ابراهيم، وبارك علي محمد وعلي آل محمد كما باركت علي ابراهيم وعلي آل ابراهيم انك حميد مجيد) .

---

[1] متفق عليه: البخاری (٣٤١٤)، مسلم (٦١٠٢-٦١٠٣) .

[2] متفق عليه: البخاری (٣٣٧٠)، مسلم (٩٠٧) .

ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام)هەموو سیفەتەکانی مرۆڤی باوەڕداری تێدابوو بە (اصل) و (فرع)ەوە، تەنانەت هەرگیز لەبەر شتی گەورە شتی بچووکی فەرامۆش نەکردووە و ئەرکەکانی بە گەورە و بچووکەوە جێبەجێ کردووە، هەر بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ﴾ (سورەتی النجم/٣٧) .

عبدالرزاق [١] دەفەرموێت: پێی ڕاگەیاندین کە (ابن طاوس) ئەویش لەباوکی، ئەویش لە (ابن عباس)ەوە دەربارەی ئەم ئایەتە ﴿وَإِذِ ابْتَلَى ابراهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمهُن﴾ (سورەتی البقرە ئایەتی/١٢٤)دا دەفەرموێت خوای گەورە ئیبراهیمی تاقی کردەوە بە پێدانی پاکو خاوێنی کە پێنج لەوانە لە سەردان و پێنجەکەی تر لە لەشدان، ئەوانەی سەر بریتین لەسەرتاشین و بەر سمێڵ کردن و ئاو لە دەم ڕادان و سیواك کردن و ئاو لەلوت وەردان، پێنجەکەی لەشیش ئەمانەن: نینۆك کردن، بەرتاشین، خەتەنەکردن، هەڵکەندنی بن باڵ، خۆ پاك کردنەوەی دوای چوونە سەرئاو، بەئاو .

(ابن کثیر) دەڵێت: لە هەردوو (صحیح)ەکەدا [٢] هاتووە کە (ابو هریرە) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە، کە فەرمووی: (فطرە پێنج شتە خەتەنەکردن، تاشینی بەر و کورت کردنەوەی سمێڵ و نینۆك کردن و بن باڵ کردن)، لە گێڕانەوەیەکی تردا کە دەچێتەوە سەر (عائشە)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (دە شت لە فطرەتن: کورت کردنەوەی سمێڵ، وە هێشتنەوەی ڕیش، وە سیواك کردن، وئا لە لووت ڕادان و نینوك کردن، وشۆردن و بن باڵ کردن و بەرتاشین، بە ئاو تارەت گرتن، کەواتە ئەو پێغەمبەرە سەروەرە (ئیبراهیم) نەك هەر تەنها دڵسۆز بووە بۆ خوای گەورە، بەڵکو دڵسۆز بووە بۆ یەك بەیەکی ئەندامەکانی لەش خۆیشی و پاك و خاوێنی خۆی فەرامۆش نەکرددوە، لەبەرئەوە شایستەیەتی کە خوای گەورە لە مەدح و وەسفی ئەودا فەرموویەتی: ﴿وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّى﴾ (سورةتي النجم /٣٧) .

---

[١] صحیح الی ابن عباس: عبدالرزاق (١٦) فی التفسیر .

[٢] متفق علیه: البخاری (٥٨٨٩)، مسلم (٥٩٦) .

## کۆشکی ئیبراهیم پێغەمبەر لەبەهەشت دا

ابو هریرەدەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: (لەبەهەشت دا کۆشکێکی لەمرواری دروستکراوی دڵڕفێن هەیە، خوای گەورە ئامادەی کردوە بۆ نیشتە جێ بوونی خەلیلی خۆی ئیبراهیم)[1]

### سیفەتی ئیبراهیم پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)

پێشەوا (أحمد)[2] فەرموودەیەکی لە (ابن عباس)ە وە هێناوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (پێغەمبەران نیشانم دران، موسا وەکو پیاوانی شەنوئە هاتەبەر چاوم، عیسای کوڕی مەریەم شێوەی لە عوروەی کوڕی مەسعود دەچوو، ئیبراهیم لەیاوەری خۆتان – واتە محمد – دەچوو، جبریل لەدحیە دەچوو . هەروەها پێشەوا (احمد) لەگێڕانەوەیەکی تردا کە (ابن عباس)دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (عیسا کوڕی مەریەم وموسا و ئیبراهیمم دی، عیسا سور باوێکی سنگ پان بوو، بەڵام موسا کەسێکی کەڵەگەت و بەخۆوە بوو، گوتیان: ئەی ئیبراهیم ؟ فەرمووی: بڕواننە یاوەری خۆتان واتا:محمد (ﷺ)

### دەربارەی تەمەن و کۆچی دوایی ئیبراهیم (علیه السلام)

(ابن جریر) لەمێژووەکەیدا دەڵێت: لەسەردەمی نەمرودی کوڕی کەنعان دا لەدایك بووە، کەبە (زوحاك) ناسراوەو گوایە هەزار ساڵ حوکمی پاشایەتی کردوە، پاشایەکی یەکجار ستەمکارو بێ دادو خوێن ڕێژ بووە . هەندێکی دەڵێن: سەربە کوڕانی (راسب)ە کەخوای گەورە (نوح)ی بۆ ڕەوانەکردن و ئەویش لەو سەردەمەدا پاشای هەموو دنیا بووە . هێندێکی دیکە دەڵێن: ئەستێرەیەك دەرکەوت، کەشەوقەکەی هێندە بەتین بوو، تیشکی خۆر و مانگی شاردەوە، خەڵکی ئەوسەردەمە زۆر ترسان، بەتایبەتیش نەمرود، ئیتر کاهن و ئەستێرە ناسەکانی کۆکردەوەو لێی پرسین تاکو ئەوەی بۆ لێك بدەنەوە،ئەوانیش گوتیان، لەکەسانی ژێردەسەلاتی خۆت منداڵێك لەدایك دەبێت کە ماڵ و سامانی تۆو دەسەلاتی تۆ لەسەردەستی ئەو کۆتایی پێ دێت، ئیتر فرمانی کرد کە پیاوان نەچنەلای ژنەکانیان و هەر منداڵێکیش لەئەمڕۆ بەدواوە – ئەگەر کوڕبێت – دەکوژرێت، ئیبراهیم پێغەمبەر ﷺ لەوکاتەدا لەدایك بووە و خوای گەورە پاراستویەتی و چاودێری کردوە، تابوو بە لاوێکی پێگەیشتوو، لە (سوس)لەدایك بووە، دەڵێن: نەخێر لە (بابل)، دیسان

---

[1] ضعیف: کشف الأستار (٢٣٤٦)

[2] صحیح: المسند (٣/ ٣٣٤)

گوتراوه له (سواد)ی ناحیەی (کوپی)لەدایك بووه،بەڵام له (ابن عباس)ەوه واباس دەکرێت کەفەرموویەتی له (بەرزه)ی خۆرهەڵاتی دیمەشق لەدایك بووه، پاش ئەوەی خوای گەوره لەسەر دەستی ئەو (نەمرود)ی لەناوبرد ئیتر کۆچی کرد بۆ (حەڕان)و لەوێوه بۆ (شام)و لەوڵاتی (ئیلیا)دا نیشته جێ بووه، (ئسماعیل)و (ئیسحاق)ی بووه (ساره)ی خێزانی لەگوندی (حەبرون)ی خاکی کەنعان لەپێش خۆیدا کۆچی دوایی کردوه لەتەمەنی (١٢٧)ساڵیدا، وەکو (اهل الکتاب)باسی دەکەن، ئیبراهیم زۆر بۆی پەرۆش بوو، بۆی گریا، له(عفرون)ی کوڕی (صخر) ئەشکەوتۆکەیەکی کڕی به (٤٠٠) مسقاڵ و تەرمی ساراخانی تێدا ئەسپەردەی خاك کرد .

گوتراوه:ئیبراهیم ژنی بۆ ئیسحاقی کوڕی هێنا،کەکچەکه ناوی: (ڕفقای کچی بتۆئیلی کوڕی تارح بوو، ئیتر خۆی و ژن و منداڵه شیره خۆرەکەی بەسواری وشتر ڕەوانەکردن).

گوتراوه: ئیبراهیم (علیه السلام)ژنێکی تری هێنا و چەند کەمنداڵێکی لێی بوو، ئەوانیش (زەمڕان و یەقشان و مادان و مەدیەن و وشیاق و وەشوح)بوون، هەرکەسەو بەجۆرێك باسی کۆچی دوایی ئیبراهیم پێغەمبەریان کردوه، هەندێك دەڵێن: لەناکاو کۆچی دوایی کردوه، هەروەکو چۆن داود و سولەیمانیش هەرلەناکاو کۆچی دواییان کردوه، هەندێکی تر دەڵێن: نەخۆش کەوتووەو پاشان لەتەمەنی (١٧٥) ساڵیدا کۆچی دوایی کردوه، دیسان دەڵێن نەخێر تەمەنی (٩٠)ساڵ بووه، هەرله هەمان ئەشکەو تۆکە، لای سارای هاوسەری ئەسپەردەی خاك کرا لەلایەن ئیسماعیل و ئیسحاقی کوڕیەوه،
(ابن الکلبی)دەڵێت: تەمەنی (٢٠٠)ساڵ بووه .

(ابو هریره) دەگێڕێتەوه که پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: (ئیبراهیم لەتەمەنی (١٢٠) ساڵیدا خەتەنەکراوەو پاشان (٨٠)ساڵی تر ژیاوه)[1]. (ابو هریرة) دەفەرموێت: (ئیبراهیم یەکەم کەس بووەکه شه رواڵی لەپێ کردووه، یەکەم کەس بووه کەسنووری قژو سمێڵی دیاری کردوه، ویەکەم کەس بووه که خەتەنه کراوه، لەتەمەنی ١٢٠ساڵیداو پاشان (٨٠) ساڵی تر ژیاوه، یەکەم کەسیش بووه که میوانداری خەڵکی بکات، میوان دۆست بێت، یەکەم کەسه کەپیر بووبێت .

---

[1] صحیح الأسناد: ابن حبان (٦٢٠٤)؛ ابن عساکر – تأریخ دیمشق (٦/ ١٩٨ – ١٩٩ )هەمان فەرمووده گێڕانەوەی تریشی هەیه .

لەگێڕانەوەیەکی تری پێشەوا (مالك)دا هاتووە کە کاتێك ئیبراهیم پیر بووەو ڕیشی سپی بووە، فەرموویەتی:ئەی پەروەردگارم ئەمە چییە؟خوای گەورە فەرمووی ئەوە ویقارە بۆ تۆ، فەرمووی: ئەی خوایە ویقارم زیادبکە . هەندێ دەڵێن: گۆڕی ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوبی کوڕیشی لەو چوارلاییەدایە کە کاتی خۆی سولەیمان پێغەمبەر (علیه‌السلام) دروستی کردوە لەشاری (حبرون) کەئەمڕۆبەشاری (الخلیل) ناسراوەو ئەم زانیاریانەش پشتاوپشت بەم جۆرە هاتوە، بەڵام تائێستاش بەتەواوەتی دڵنیانین، بەڵام پێویستە خاوێن ڕابگیرێن، لەسەر بەردێك لەبەردەکانی سەر گۆڕی ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه‌السلام) بەعەرەبی هۆنراوەیەك نووسراوە، کە ڕەنگە ئەم کوردی کراوەی خوارەوە لێوەی نزیك بێ

خوایە ! هەرچی کەسێ دەگرم، ئاواتی ئەوبێ شومارە [1]

بەڵام خۆ دەبێ هەر بمرێ چی لەڕێی مەرگا ڕێبوارە

دواهەناسەت لێ دێتە پێش، ڕۆژی مەرگە، فێڵ ناکرێ

پاشینە مەحاڵە مانی، کەپێشینەی بازاڕی ژینی هەڵگرێ

هیچ نابێ بەیاوەری تۆ، کاتێك دەتخەنە ناوگۆڕێ

مەگەر کردەوەو گفتارت، ئاراستەی ڕێگەت بگۆڕێ

ئەمەی خوارەوەش دەقی عەرەبیەکەیەتی :

الحي جـهولاً أمله يموت من جاء أجلهُ

ومنْ دنامن حـتفهم تغن عـنه حيــلهُ

وكيف يبقــي أخر من مــات عـنه أولَهُ

والمــرأ لايصــحبه فــي القــبر الا عَمَلُهُ

یەکەم منداڵی ئیبراهیم بریتی بوو لە ئیسماعیل کەلەهاجەری قبطییە، پاشان لە (سارة)ش ئیسحاقی بوو، (علیه‌السلام) وەك دەڵێن: سارە ئامۆزای خۆی بووە، پاشان (قنطورا)ی کچی (یقطن)ی کەنعانی مارەکرد، لەمیش شەش منداڵی بوو،ناویان مەدیەن و زەمران و سرج و یەقشان و نەشق بووە، بەڵام منداڵی شەشەمی بەرلەناو لێنانی کۆچی دوایی کردوە، دواتر (حەجون)ی کچی (أمین)ی مارەکردوەو و پێنج منداڵی لێی بووە: کیسان و سورج و ئەمیم و لوکان و نافس، ئەم باسەش لە کتێبی (التعریف والاعلام)ی ئەبوقاسمی سوهەیلی داهاتووە .

---

[1] وەرگێڕ هۆنراوەکەی بەهۆنراوەیی دارشتۆتەوە .

## ﴿( لوط ) پێغەمبەردرودوسەلامی خوای لەسەربێت﴾

یەکێك لەڕووداوە گرنگانەی لەماوەی ژیانی ئیبراهیم دا (علیه‌السلام) ڕووی دا، بەسەرهاتی گەلی لوط بوو، کەچۆن ئەوگەلە دوچاری سزاو نارەحەتی هاتن، (لوط)کوڕی (هاران)ی کوڕی (تارح)ە، واتا، (لوط)ئامۆزای ئیبراهیم بووە، چونکە ئیبراهیم و هاران و ناحور، برای یەکتری بوون، گوتراوە ئەم (هاران)ە (حەڕان)ی دامەزراندوە، گەرچی ئەوە بۆچوونێکی لاوازە، خوای گەورە چاکتر دەیزانێت .

(لوط)بەفرمانی (ئیبراهیم خەلیل)ی مامی ڕۆیشت بۆ شاری (سەدوم)لەخاکی (غورورزەغەر)دانیشتەجێ بوو، کەوەکو دایکی شوێنەکانی تراوابوو، خاك و زەوی و زارو دێماتێکی زۆری بەدەمەوە بوو، کۆمەڵە خەڵکێك لەوێدا دەژیان کەخراپترین کەس بوون، بێ بڕوابون، خراپکاربون، ڕێگرو جەردە بوون، لەیانەکانیاندا خەریکی بەدکاری و بێ شەرمی بون، فرمانیان بەچاکە نەدەکردو خراپەیان دەکرد، بەدکاری و خراپەکاری وایان داهێنا کە هەرگیز لەبەرەکانی پێشووی خۆیانەوە نەبووەو نەکراوە، ئەویش نێربازی بوو.

خوای گەورە (لوط)ی بۆ ناردن (علیه السلام)وەك پێغەمبەرێك، تاکو هۆشیاریان بکاتەوەو دەست بەرداری ئەوکارە دزێوو چەپەڵ و حەرامەبن، بەڵام ئەوان درێژەیان بە بەدکاری خۆیان داو بایەخیان بەڕێنوینی و فرمانەکانی (لوط) (علیه السلام)نەدا، لەبەرئەوە سزای سەختی خواییان بەخۆیان گەیاند، تاکو ببنە پەندونموونە بۆ هەموو گەلانی سەرزەوی بۆهەتا هەتاییە . . ، ڕووداو بەسەرهاتەکەشیان لەچەند سورەتێکی قورئانی پیرۆزدا هاتووە، هەروەکو لەم خشتەیەدا ناوی سورەت و ئایەتەکان دەنووسین کە دەتوانیت سوود وەربگریت لەتەفسیرە کوردیەکان بۆ واتاکانیان، ئێمەش لەجێی خۆیاندا لەم باسەدا واتاکانیان بەپێی پێویست دەهێنین :

| ناوی سورەت | ژمارەی ئایەت | ناوی سورەت | ژمارەی ئایەت |
|---|---|---|---|
| سورەتی الأعراف | ٨٠-٨٤ | سورەتی النمل | ٥٤-٥٨ |
| سورەتی هود | ٦٩-٨٣ | سورەتی عنکبوت | ٢٨-٣٥ |
| سورەتی الحجر | ٥١-٧٧ | سورەتی الصافات | ١٣٣-١٣٨ |
| سورەتی الشعراء | ١٦٠-١٧٥ | سورەتی الذاریات | ٣١-٣٧ |
| سورەتی القمر | ٣٣-٤٠ | | |

جگە لەمانەش لەگەڵ باسی هۆزی (عاد و ثە مود و نوح)یش دا باس کراون .

کاتێك (لوط) (علیه‌السلام)بانگی کردن بۆ یەکتاناسی خوای پەروەردگارو دورکەوتنەوەیان لەخراپکاری و تاوانباری، ئەوان نەك هەرباوەڕیان پێنەهێناو پشتیان تێکرد، بەڵکو تەنها یەك کەسیش باوەڕی پێ نەهێنا، وێڕای ئەوەش سوور بوون لەسەر درێژە دانیان بەبەدکاریەکانیان و نوقمی گومڕایی و سەرگەردانی ببوون، لەسەرەوو ئەوەیشەوە بیریان لەوە کردەوە کە (لوط)پێغەمبەر (علیه السلام) تاوانباربکەن و پاشان خۆی و ئەوانەی پێشتر باوەڕیان هێنابوو شاربەدەریان بکەە، بەڵی ئەوان (لوط)یان بە چاکەکاری تاوانبار کرد، سەروبنی هەموو قسەکانیان هەرهەمان قسەی بێ بڕوایانی تر بوو، کەلەهەموو کات و شوێنێکدا هەر دەیانگوت: باوباپیرانمان لەسەرکامە ئایین بووبێتن، ئێمەش هەر ئەوەین و لانادەین، ئەوان گوتیان: ﴿أَخْرِجُوا آلَ لُوطٍ مِنْ قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾ (سورەتی:النمل) ئایەتی (٥٦)، واتا: داروودەستەی لوط لەئاوایی و گوندی خۆتان شار بەدەربکەن و وەدەریان بنێن، چونکە ئەوانە خەڵکانێکی پاکژ و پاکژکارن . .!! ئەوان دانویان لەگەڵ چاکەکارو داوێن پاکان و دەرونپاکان نەدەکولا، لەبەرئەوە لەوپەڕی (مەدح)دا (زەم)یان دەکرد، بەرانبەر بەو قسە ڕەق و کەللە ڕەقیەیان، خوای گەورە ئەو شوێنکەوتەکانی بەپاکژی و داوێن پاکی پاراست، جگە لەژنەکەی، بگرە خوای گەورە ئەوانی لەو شارو دێهاتانە دەر بەدەرو پەراگەندە کرد، سزایەکی ئەوتۆی بۆ ناردن کە هەرگیز بیریان بەلای جۆرە سزای وادا دەچوو، خوای گەورە دەریاچەیەکی بۆگەنی کردە لافاوو بەسەریاندا کشاندی، کەوتنە ژێر شەپۆلە پڕ کلە جلێت و لیتەکەیەوە، لەبنەڕەتیشدا ئاگرێکی داگیرساو بوو بۆیان، چونکە تابلێی ئاوەکە گەرم و پڕ لەلیتەو خوێ بوو، گەلێ گڕوێ و ترشاوو بۆگەن بوو، ئەوان وێڕای نێربازی و بێ ناموسی و داوێن پیسی جەردەو ڕێبرشیبوون، تەنانەت خیانەت و ناپاکییان بەرانبەر هاوڕێی خۆشیان دەکرد، یانەی ڕابواردنیان هەبوو، ئەوان بە گفتارو کردار تاپەنا گوێیان بۆ نوقمی فەسادو بەدکاری و فێڵ ونادانی بوون، دەگێڕنەوە تەنانەت لەناو کۆڕو کۆبوونەوەیاندا بەئاشکرا تڕیان لێ دەداو پێیان شەرم و شورەیی نەبوو، لەوەش بێ شەرمانەتر ئەوەبوو کەلە بۆنەو ئاهەنگەکانیاندا بەئاشکرا و لەپێش چاوی یەکتری (وەك هەندێك دەڵێن)سواری یەکتری دەبوون و هیچ قەدرێکیان بۆ ئامۆژگاریەکانی کەس دانەدەنا، ئاژەڵیانەو خوارتر لەوانیش دەژیان، ئەوانەی ئێستایان، دەستەبەرداری خراپەکاریەکانیان نەدەبوون، لەکردەوەی ڕابوردوو پێشینانیشیان پەشیمان نەبوون، بەنیاز نەبوون لەداهاتووشدا بگۆڕێن، لەبەرئەوە

خوای گەورە گرتنی بەسزا . . . چۆن سزایەك . . !! زۆربێ پەردەو بێ شەرمانە دەیانگوت ئەی (لوط): ﴿ائْتِنَا بِعَذَابِ اللَّهِ إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ (سورەتی:العنكبوت/٢٩)، واتا: ئەو ئازارو سزا خواییەمان بەسەر بێنە، ئەگەر ڕاست دەكەیت)، ئەمەش ئەو پەڕی بێ ئەدەبی نواندنە لەبەرانبەر خواو پێغەمبەرە كەیدا، بەڵام دیارە ئەو كەسەی حەیاو ناموسی نەبێ، دزوو ڕێگر و خائنە و ئەوسا زۆر ئاساییەكە هێندرە بێ شەرم و شووریش بێ ! ئەگینا چۆن ئاوا بێ باكانە ڕوودەكەنە ئەوكەسەی كەبە (داوێن پاك)تاوانباریان كردوە و پێی دەڵێن: كوا ئەو سزاو ئازارەی كەئێمەی پێ ی دەترسێنی ؟ لێرەدا هیچ دەروازەیەكی ڕوون نەمایەوە كەئومێدی چاكبوون و گۆڕانیان لێ بكرێ، بۆیە (لوط)پێغەمبەر (علیه السلام) لەخوای گەورە پاڕایەوە، تاكو سەری بخات بەسەر ئەو خەڵكە بێ شەم و ئەدەبەدا، خوای گەورەش دەریای ڕق و قینی هاتە هەژان و داوای پێغەمبەرەكەی وەرگرت و دەستەیەك لەفریشتەكانی ڕەوانەی سەرزەوی كرد، كەسەرەتا چوونە لای ئیبراهیم پێغەمبەرو مژدەیان پێدا كەخوای گەورە منداڵێكی زان و دانای پێ دەبەخشێت، هەروەها هەواڵی ئەوەشیان بە ئیبراهیم ڕاگەیاند كە خوای گەورە چ كارێكی ترسناكی پێ ڕاسپاردون دژی بەدكارانی گەلی (لوط) (علیه السلام)، ﴿قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُون ، قَالُوا إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمٍ مُجْرِمِينَ ، لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِنْ طِينٍ ، مُسَوَّمَةً عِنْدَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ﴾ سورەتی (الذاريات) ئایەتی (٣١- ٣٤) .

واتا: ئیبراهیم پرسی لە فریشتەكانی: بۆچ كارێك ڕەوانەكراون،ئەی نێردراوانی خوا ، گوتیان: ئێمە ڕەوانە كراوینە سەر گەل و خەڵكانێكی تاوانبار، تاكو بەردبارانیان بكەین بەو كوتكە قوڕانەی كە پەروەردگارت دایڕشتوون بۆ زێدە ڕۆیان و لەسنوور دەرچووان: هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (العنكبوت) ئایەتی (٣١-٣٢)دا دەفەرموێت: كاتێك ڕەوانەكراوانی ئێمە بەمژدەوە چوونە لای ئیبراهیم، پێیان گوت: ئێمە خەڵكی ئەو گوندە – ئەو شارە – لەناودەبەین، بەڕاستی خەڵكی ئەوێ زۆرستەمكاران، ئیبراهیم فەرمووی :ئاخر (لوط)یان لەناودایە، گوتیان: ئێمە دەزانین كێی تێدایە، ئەو و شوێنكەوتوانی و خێزانی ڕزگار دەكەین، جگە لەژنەكەی، چونكە ئەویان بەرتیاچووان دەكەوێت – وبێ بڕواو ستەمكارە . جا كاتێك ئیبراهیم ترس و بیمەكەی شكاو مژدەی منداڵێكی زانای پێ درا، كەوتە موجادەلەوە بەشێوەی تكا بۆ كردن و پاڕانەوە بۆ گەلی (لوط)، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُجَادِلُنَا فِي قَوْمِ لُوطٍ﴾ سورەتی (هود ئایەتی/٧٤)، تاكو بەخۆیاندا بچنەوەو پەشیمان ببنەوەو واز لەبەدكاری

بهێنن، بەڕاستی ئیبراهیم پێغەمبەر (عليه السلام) بەئارام و نەرم و نیان بووەو زۆر تەوبەکارو خواپەرست بوە، وەکو قورئان دەفەرموێت:
(إنّ ابراهيم لحليم أوّاهٌ منيب)، بەڵام خوای گەورە فەرمووی بە ئیبراهیم ﴿يَا إِبْرَاهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَذَا إِنَّهُ قَدْ جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَإِنَّهُمْ آتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ﴾ سورەتی (هود) (ئایەتی/٧٦)، واتا: (ئەی ئیبراهیم واز لەمەیان بێنە، چونکە فرمانی پەروەردگارت لەسەری دراوەو یەکلایی بوەتەوە، ئەبێت ئەوان ئەو سزایەیان پێ بگات کە گەڕانەوەی نیە)، دیارە سزاکە مسۆگەرەو ناگەڕێتەوەو ئەوەیان بەخۆیان ڕەوا دیوە، فرمانەکەش خوایەك دەریکردوە کەڕەتکردنەوەی فرمانی نییە، وە دەربەستیش نییە، حوکمی ئەویش بەدوادا چوونی ناوێت، (سەعیدی کوڕی جوبەیر)[1] و (السيد)[2] و (قەتادە)[3] و (محمدی کوڕی (ئیسحاق) [4] دەڵێن: ئیبراهیم(عليه السلام)بەفریشتەکانی گوتووە: ئایا دێهات و شارێك کاول دەکەن کەسێ سەد کەسی باوەڕ داری تێدایە ؟ گوتیان: نا گوتی: دەبا دووسەدو باوەڕداربێ ؟، گوتیان: نا، گوتی: باچل باوەڕداربێ ؟ گوتیان: نا، گوتی: باچواردە باوەڕداربێ ؟ گوتیان: نا، (ابن اسحاق)دەڵێت: ئیبراهیم بەردەوام(عليه السلام)بەردەوام بوو، تا لە کۆتاییدا فەرمووی: دەباتەنها یەك کەسی باوەڕداریان تێدابێ ؟گوتیان: نا، ئینجا فەرمووی: ﴿إنّ فيها لوطاً، قالوا نَحْنُ أعلَمُ بِمَنْ فيها﴾ سورەتی (العنكبوت:ئایەتی/٣٢)، واتا: ئاخر (لوط)یان لەناودایە، گوتیان، ئێمە باشتر دەزانین ئەو گوندە کێی تێدایە . خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَاءَتْ رُسُلُنَا لُوطاً سِيءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعاً وَقَالَ هَذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ﴾ سورەتی (هود:ئایەتی/٧٧)، ڕاڤەکارانی قورئان فەرمویانە: کاتێك فریشتەکان – کە جوبرائیل و میکائیل و ئیسرافیل بوون – ئیبراهیمیان بەجێ هێشت، چوونە ناو خاکی (سەدوم)ەوەلەسەر شێوەی چەند لاوێکی تازە پێگەیشتووی جواندا، وەك تاقیکردنەوەیی خوایی بۆیان و بەڵگە بەستکردنی ئەو گەلە، ئیتر چوونە میوانداری ماڵی (لوط) (عليه السلام)، کاتە کەیشی ئێوارەیەکی دەمەو خۆرئاوابوو، ترسا ئەگەر ئەو داوەتیان نەکات، خەڵکی ترەنگە داوەتیان بکەن و وابزانن ئەمانیش مرۆڤن، لەبەرئەوە (لوط) (عليه السلام) گەلێك خەمی خواردو ترسا ئەم گەلە بەدکارە بێ

---

[1] ضعيف اليه، رواه ابن جرير في تفسيره (٧ / ١٢ / ٧٩)

[2] حسن اليه، رواه كابن جرير (٧ / ١٢ / ٧٩ )

[3] صحيح اليه: رواه ابن جرير (٧ / ١٢ / ٧٩)

[4] ضعيف اليه: رواه ابن جرير (٧/ ١٢ / ٧٩ )

شەرمییان بەرانبەر بکەن، لەبەرئەوە ئەو ڕۆژە بە ڕۆژی تاقیکردنەوە سەختوگرانەکە ناسراوە بەلای (لوط)ەوە، هەروەکو، (ابن عباس)[1] و (مجاهد)[2] و (قتادة)[3] و (محمد بن اسحاق)[4] لەمانای (یوم عصیب)ی ئایەتەکەدا فەرموویانە واتا: ئەو ڕۆژەی کە تاقیکردنەوەکەی ناوی زۆر توندو سەختە، چونکە دەیزانی ئەوشەوە چەندە بەناڕەحەتی دەتوانێت بەرگری لەمیوانەکانی بکات، هەروەکو زانیویەتی چ کارەساتێکیان بەسەر خەڵکیدا هێناوە کەڕوویان لەناو ئەو گەلە کردووە، فریشتەکان کردیانە مەرج بەسەر (لوط)ەوە کەنابێت کەسی تر داوەت بکات لەگەڵ ئەواندا .

(قەتادە)[5] دەڵێت: فریشتەکان چوونە لای کاتێك ئەو لەزەوی و زارەکەی خۆیدا کاری دەکرد،بوونە میوانی،ئەوان شەرمیان لیّ دەکرد، لەبەر ئەوە(لوط)(علیه السلام)لەپێشیانەوە دەڕۆیشت و ڕەخنەی لەقسەکانیان دەکردو بەرەو باسی تر دەیبردن، سابەڵکو نەبنە میوانی ئەوو ڕوونەکەنە ئەو ئاوایییەو بەلایەکی تردا لابدەن، تەنانەت پێی گوت: بەخوا هیچ کەسێك لەم سەرزەوییەدا نیە بەقەدەر ئەمانە (واتە خەڵکی شارەکە) بەدکاربێت، هیچ شارێك دانیشتوانەکەی هێندەی خەڵکی ئەم شارە بەدکارنین و پیس نین، پاشان تۆزێکی تر ڕۆیشتن، دیسانەوە هەمان ڕستەی دوبارە کردەوە، هەتا چوار جاری دوپات کردەوە، دەڵێن: فرمانی خوا وابوە کە فریشتەکان نابیّ دەست بەکاول کردنی شارەکە بکەن، هەتا پێغەمبەرەکەیان جەخت لەسەر ئەو خراپکاریەی گەلەکەی نەکاتەوە .

(السّدی) دەڵێت: فریشتەکان لەلای ئیبراهیم بەڕیّ کەوتن و ڕووەو (لوط)کەوتنە ڕیّ، بۆ نیوەڕۆ گەیشتنە شارەکە، کاتێك گەیشتنە ڕووباری (سدوم)کچەکەی (لوط)یان بینی کەخەریکی ئاوهێنان بوو بۆ ماڵی خۆیان،(لوط) دووکچی هەبوو، کچە گەورەکەی ناوی (ریثا)بوو بچووکەکەیشی ناوی (زەغرتا)بوو، بەکچەکەیان گوت: ئایا ماڵێك هەیە ببینە میوانی ؟ کچە کە گوتی: لەشوێنی خۆتان بمێننەوە هەتاکو دێمەوەلاتان، مەچن بەملاولادا، لەوکاتەدا باوکی هات، کچەکە بەباوکی گوت: بابە چەند گەنجێك

---

[1] ضعیف: ابن کجریر في التفسیر (٧ / ١٢ / ٨٢ ) .

[2] ابن جریر في التفسیر (٧ / ١٢ / ٨٣ ) .

[3] صحیح: ابن جریر في التفسیر (٧ / ١٢/ ٨٢) .

[4] ضعیف: ابن جریر في التفسیر ( ٧ / ١٢ / ٨٣ ) .

[5] ضعیف: رواه ابن جریر (٧ / ١٢/ ٨١) .

لەدەروازەی شاردان، هەرگیز ڕوخساری هیچ گەلێکم نەدیوە پاك بێت وەکو ئەوان نەبادا ئەم خەڵکە (گەلەکەت) بەخراپ ڕووبەڕوویان ببنەوە، بەڵام گەلەکەی بە (لوط)یان گوتبوو، کە هەرگیز نابێ میوانداری پیاوان بکات، ئیتر فریشتەکان گوتیان: وازمان لێ بێنە، دەچین بەمیوانیماڵێك کەپیاوی تێدا بێ (فریشتەکان ئاوا وەڵامی کچەکەی (لوط)یان دایەوە)، بەڵام (لوط)پێغەمبەر (علیه السلام)بەبێ ئەوەی بهێڵێت جگە لەخێزانی خۆی هیچ کەسێك بزانێت، هێنانی بۆ ماڵەوە، بەڵام ژنی (لوط)هەر زوو خەڵکەکەی تێگەیاند کە لەماڵی (لوط)دا (علیه السلام) چەند پیاوێکی گەنج و شێوە جوان وا میوانن، کەهەرگیز لەنمونەی جوانی ئەوان نییە، ئیتر خەڵکەکە بێ شەرمانە هەڵیانکوتایە سەر ماڵی (لوط) (علیه السلام).

دیارە جگە لەو کارەیان گەلێك ڕەفتار و ئاکاری ناشیرینی تریان هەبووە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ قَبْلُ كَانُوا يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ﴾ سورەتی (هود ئایەتی ٧٨)، واتا: پێشووتریش ئەوان کردەوەی بەدو خراپیان دەکرد . ﴿قَالَ يَا قَوْمِ هَؤُلَاءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ﴾ (هود/٧٨) ڕێنومایيان دەکات کەژنەکانیان داپۆشن، کەوەکو کچی (لوط) وان، چونکە لەڕووی شەرعیەوە، پێغەمبەر لەپلەی باوك دایە بۆ گەلەکەی، هەروەکو لەفەرموودەی پێغەمبەردا(ﷺ) هاتووە [1] خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ﴾ (الأحزاب/٦) واتە: پێغەمبەر لەپێشترە بۆ باوەڕداران تاخودی خۆیان، ژنەکانیشی دایکی ئەوانن ، واتا: دایکی باوەڕدارانن . لەهەندێ وتەی یاوەران و پێشینە باشەکاندا پێغەمبەر وەکو باوك وایە بۆ خەڵکی، ئەوەش وەك ئەو وتەیەی (لوط)وایە کە فەرمووی: ﴿أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ ، وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ﴾ (الشعراء/١٦٥) بەهەمان دەق چەندین یاوەری تر هێناو یانە تادەگات بەمحمد کوڕی ئیسحاق . [2] ئەوەشیان ڕاستە، چونکە بۆچوونی دووەم لە (اهل الكتاب)وەرگیراوەو دیارە ئەوانیش هەڵەیان زۆرە، کە هەندێك لەوانە لەگەڵ پلەو شکۆو سروشتی فریشتە داناگونجێن، بۆنموونە: لەهەڵەیەکی گەورەدان کاتێك دەڵێن: فریشتەکان دوودانەبوون و نانی ئێوارەیان لەلای (لوط)پێغەمبەر خواردوە، (بێگومان فریشتەکان بەیادی خوا دەژین و خۆراك ناخۆن). ﴿وَجَاءَهُ قَوْمُهُ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِنْ قَبْلُ كَانُوا

---

[1] حسن: رواه احمد (٢/ ٢٤٧). أبو داود (٨)النسائي (٣٨/١)

[2] ابن جرير (٧/ الجزء ١٢/٨٥/٨٤)

﴿يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ قَالَ يَا قَوْمِ هَؤُلاءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَلا تُخْزُونِ فِي ضَيْفِي أَلَيْسَ مِنْكُمْ رَجُلٌ رَشِيدٌ﴾ (هود/٧٨) واتا:

لەخوا بترسن و لای میوانەکانم ڕیسوام مەکەن، ئەریْ ئەوە پیاوێکی مەردتان تێدانیە ؟ ئەم فەرموودەیەی (لوط) (علیه السلام) داخوازیە لەوەی کەکاری بەدو ناشایستە نەکەن بەرانبەر بە فریشتەکان و بیْ ئەدەبی نەکەن بەرانبەر میوانەکانی، هاوکات شایەتیدانی (لوط)ە لەسەر ئەو گەلە، کە هەموویان تێکڕا بیْ شەرم و بەدکارن، تەنانەت کەسێکیان تێدانیە کە مەردو بەئەدەب بیْ، بەڵکو سەرجەمیان بەهێزو بەدکارن، ناحاڵی و بیْ بڕواو بیْ بارن، دیارە فریشتەکان چاوەڕوانی ئەو جۆرە هەڵوێست و گفتارەی (لوط)یان دەکرد، تابیْ بەبەڵگە بەسەر گەلەکەیەوە، بەلاّم گەلە بیْ شەمەکەی، زۆربیْ ئەدەبانە گوتیان ﴿قَالُوا لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ﴾ (هود/٧٩)، واتا، ئەی لوط !بۆ خۆت دەزانیت کە چ هەقێکمان بەسەر کچەکانتاوە (واتە ژنانی خۆیان، کەوەك کچی لوط وان) نیە، بۆ خۆت چاك دەزانیت ئێمە چیمان دەویْ و چیشمان مەبەستە، بەڕاستی ئەوەش ناشیرینترین قسەو وەلاّمە، بەرانبەر بە پێغەمبەرێکی خوا، ئەوان نەیاندەزانی کەچ پاشەڕۆژێکی ترسناك و چ سزایەکی ڕیسواکەر بەدوای ئەم وەلاّمە خراپەی ئەواندا دێت . ئیتر (لوط) پێغەمبەر فەرمووی: ﴿قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ﴾ (هود/٨٠)، واتا: ئەگەر هێزو دەسەلاّتێکم هەبوایە،ئەوا ڕێگەیەکی توندم دەگرتە بەر بۆ سزادانتان لەبەرانبەر ئەو هەڵوێست و وەلاّمە نالەبارەتان، چونکە ئێوە سزاو ئازارتان بەخۆ ڕەوا دیوە . پێغەمبەرمان (محمد)(ﷺ) دەفەرموێت: (ڕەحمەتی خوا لەسەر لوط بێت، کەپەنای بردە بەرداخوازی هێز، (واتا خوای گەورە)، ئیتر دوای ئەوە خوای گەورە هەرپێغەمبەرێکی ناردبێت خاوەن کەس و سامانێکی باش بووە لەناو گەلەکەیدا)[1].

﴿وَجَاءَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ يَسْتَبْشِرُونَ . . .﴾ الآیة (حجر/٦٧ - ٧١)، (لوط) فرمانی بەگەلەکەی کرد، کەلەژنەکانی خۆیان نزیك ببنەوە، هۆشیاریکردنەوە لەو کارو هەڵوێستە بەدو دزێوانەیان، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان هەرسوور بوون لەسەر ڕەویەی قێزەونی خۆیان، تەنانەت هەر جارێك لەبارەی ڕێزی میوانەکانی بۆیان بدوایە، ئەوان خراپتر و توندتر دەبوون بۆ نواندنی بیْ شەرمی بەرانبەریان، ئەوان چوزانن سبەی بەیانی

[1] صحیح: رواه الترمذي (٣١١٦)، احمد (٢/ ٣٣٢)، بخاري في ادب المفرد.

چییان بەسەر دێت و کام سزای بەکۆمەڵیان بۆ دادەبەزێت، لەبەرئەوە خوای گەورە سوێند بەژیانی (محمد)پێغەمبەر ﷺ دەخوات و دەفەرموێت: ﴿لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ (الحجر/٧٢)، هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ :﴿وَلَقَدْ أَنْذَرَهُمْ بَطْشَتَنَا فَتَمَارَوْا بِالنُّذُرِ ، وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَنْ ضَيْفِهِ فَطَمَسْنَا أَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ ، وَلَقَدْ صَبَّحَهُمْ بُكْرَةً عَذَابٌ مُسْتَقِرٌّ﴾ (القمر/٣٦ – ٣٨).

ڕاڤەکارانی قورئان و هەندێك کەسی تر گوتوویانە: (لوط)پێغەمبەر ؛ بەرگری لەمیوانەکانی دەکردو نەیدەهێشت گەلەکەی هەڵکوتنە سەریان،خۆی لەپاش دەرگاکە وەستابوو،بەڵام خەڵکەکە هەوڵیان دەدا دەرگاکە بکەنەوە، یان بیشکێنن و بچنە ژوورەوە، تەنانەت لوگ لەپشتی دەرگاکەوە ئامۆژگاری دەکردن و تکای لیٚ دەکردن، بەڵام کاروبارەکان هەر دژوارانە دەردەکەوتن و زیاتر سوور بوون لەسەر هاتنە ژورەوە، ئیتر کە لوط بەندی ئارام و خۆگری پسا، لە وزەیدا نەماو بەناچاری ئەو نزایەی کردو لەخوا پاڕایەوە کەفریای بکەوێت، لێرەدا فریشتەکان خۆیان ئاشکرا کردو گوتیان: ﴿إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَنْ يَصِلُوا إِلَيْكَ﴾ (هود:٨١) واتا: ئێمە لەلایەن پەروەردگارتەوە ڕەوانەکراوین، دڵنیاشت دەکەین کە هەرگیز ئەوانە ناتوانن بگەنە تۆ، (یان دەستیان بگاتە تۆ).

وا دەگێڕنەوە کە (جبریل)سەلامی خوای لەسەر بێت، بۆیان هاتە دەرەوەو زۆربەنەرمی باڵەکانی کێشا بەڕوخسارو چڕوچاویاندا، ئیتر چاویان کوێر بوو، تەنانەت هەر شوێنەواری چاویشیان نەما، لەبەرئەوە کوێرانە بەدەست کوتان و گاگۆڵکە پەراکەندە بوون، کەچی لەو بارەشدا دەیانگوت تۆبڵێی سبەینیٚ نەیەتەوەو ئێمەش بیکەین بەرۆژی خۆمان . بەڵام خۆ خوای گەورە سبەینێی داناوە بۆ لەناوبردنی ئەوان، وەك لەئایەتەکانیپێشووترا (القمر- ٣٧)ئاماژەی پێدراوە فریشتەکان بە (لوط)یان ڕاگەیاند کەلەبەشی کۆتایی شەودا خۆی و ئەندامانی خێزانەکەی کۆچ بکەن و ئەو شارە بەجیٚ بهێڵن و هیچ کامێکیان بەو لایەدا لانەکەنەوەو کەستان مەمێننەوە،﴿وَلَا يَلْتَفِتْ مِنْكُمْ أَحَدٌ﴾(هود:٨١)، واتا، هەرکات گوێتان لەدەنگی سزاکەبوو، فرمانیان وا پێکرد کە خۆی لەدوای هەموویان بڕوات، جگە لەژنەکەی ، (إِلَّا امْرَأَتَكَ)کەهەڵاوێردراوە لە (فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ)وەك ئەوەی تێی بگەیەنێت کە ژنەکەیشی ئەو سزایە دەیگرێتەوە، گەرچی ئایەتەکە خوێندنەوەی تریش هەڵدەگرێت، بەڵام (رفع)ەکەی لەهەموویان زیاتر دروستە، خوا دەیزانێت.

(سوهەیلی)دەڵێت: ژنەکەی (لوط)ناوی (والهة)بوو، وەناوی ژنەکەی (نوح)یش بریتی بوو لە (والغە)، فریشتەکان مژدەی تیاچوونی ئەوبێ شەرمانەیان بە (لوط) ڕاگەیاند، کەچۆن خوای گەورە کردنی بەپەندو نموونە بۆ گەلانی دوای خۆیان،

﴿إِنَّ مَوْعِدَهُمُ الصُّبْحُ أَلَيْسَ الصُّبْحُ بِقَرِيبٍ﴾ (هود:٨١) کاتێك (لوط)خێزانەکەی دەکرد لەشار، واتا تەنها دوو کچەکەی یەك کەس لەگەڵیاندا نەبوو، ئەڵێن گوایە ژنەکەیشی لەگەڵیاندا دەرچووە، خوای گەورە باشتر دەیزانێت، هەرکە وڵاتیان بەجێهێشت و ڕۆژبووەوەو خۆر دەرکەوت، هەر لەگەڵ خۆر دەرکەوتندا ئەوسزایەی خوای گەورە بۆی ئامادەکرد بوون، دابەزیە سەریان، سزایەك کە ڕەتکردنەوەی نیەو بەری ناگیرێت .

(أهل الكتاب)دەڵێن، فریشتەکان فرمانیان کرد بە (لوط) تاکو بچێتە سەر لوتکە شاخێکی دوورو لەوێوە بچێت بۆ گوندێکی (یان شارۆچکەیەکی) نزیك لەشارەکەیانەوە، پێیان گوت: تۆ بڕۆ، ئێمەش چاودێری و چاوەڕێت دەکەین، پاشان سزاکە جێ بەجێ دەکەین، واباس دەکەن چوەتە گوندی (صوعر)کەخەڵکی پێی دەڵێن: گوندی (غور زغر)، ئیتر لەگەڵ خۆرهەڵاتندا، سزای توندو سەختی خواییان بۆ دابەزی، وەکو قورئان دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِنْ سِجِّيلٍ مَنْضُودٍ . مُسَوَّمَةً عِنْدَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ﴾ (هود:٨٢) واتا: کاتێك فرمانمان دا، وشارەمان هەڵەو گێڕکرد، پاشان بەردبارانیشمان کردن، بەجۆرە بەردێکی لەقوڕ و لیتە سواخ و سازدراوی وشکەڵاتوو، کەبەتایبەتی لەلایەن خواوە بۆیان دروستکرابوو، ئەوجۆرە سزایانەش لەستەمکاران دوورنیە . دەڵێن: (جبرئیل)سەلامی خوای لەسەر بێ بەسەر باڵەکانی خۆی بەردەکانی هەڵکەندووەو حەوت شارەکەی بەسەردا کاول و بەردباران کردوون و وە دەڵێن: دانیشتوانەکەیان (چوارسەد)کەس بوون، یان (چوار هەزار)کەس بوون، ئیتر بەخۆیان و ئاژەڵەکانیان و زەوی وزاری دەوروبەری شارەکانیانەوە، هەرهەموویان تابەرزاییەکی زۆر لەئاسماندا بڵندکرانەوە، بەڕادەیەك کە فریشتەکان گوێیان لەحەپەی سەگەکانیان و دەنگی کەڵەشێرەکانیان بوو، ئینجا خوای گەورە هەڵەو گێڕو ئاوەژووی کردنەوەو ئەمدیوی کردن بەئەودیوو، بەرزاییەکانی کردن بەنزمایی و بەپێچەوانەیشەوە، (موجاهد)[1] دەڵێت: یەکەم شتێك کە بەسەریاندا تێك ڕوخا، کۆشك و باڵەخانە بەرزەکانیان بوون، ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِنْ

---

[1] حسن: ابن جرير (٧/ الجزء ١٣/ ٩٧)

سجّيل﴾، لێرەدا (سجّیل)وشەیەکی فارسی یەو بەعەرەبی کراوە،واتا زۆر تۆکمەو بەهێزو قایم، (منضود)واتا: بەدوای یەکدا هەلڕژاو لەئاسمانەوە بۆ زەوی، (مُسوّمة): واتا: ناوداربوون، چونکە هەریەکە لەو بەردانە ناوی ئەوکەسەیان لەسەرنووسرابوو کە دەبێت بەسەریا بەربێتەوە .[1] تەنانەت ناوی ئەو کەسانەش لەسەر بەردەکان دیاری کرابوو کە لەوکاتەدا لەشارنەبوون، یان لەگەشت و سەفەردابوون، یان لەشوێنی تایبەتی دابوون، گوتراوە: کەژنەکەی (لوط)یش هەمان چارەنووسی ئەو گەلەی هەبووە، بەلاّم هێندێکی تر دەلێن: لەگەلّ (لوط)و دووکچەکەیدا لەشار دەرچوون، بەلاّم کاتێك دەنگی سزاکەی بیستوە، کەچۆن شارەکە دراوەتەوە بەزەویدا بەهەلّگەڕاوەیی، ئیتر ژنەکەی (لوط)لای کردوەتەوە بەلای شارەکەداو گوتویەتی: ئاخ بۆ گەلەکەم و ئیتر بەردێکیش دراوە بەسەری ئەویش داو کوشتویەتی و چووەتە ناو بازنەی چارەنووسی گەلەکەیەوە، کە پەرۆش بوو بۆیان ، بەپێی دەقی ئایەتی قورئانی پیرۆز، دووژن لەژنانی دووپێغەمبەر u باوەڕیان بەمێردەکانیان نەهێناوە، ئەویش ئایەتی (١٠)ی سورەتی (التحريم)ەو دووژنەکەش، بریتین لەژنی (نوح)و ژنی (لوط)، ئەگینا هەرگیز ئەو دووژنە خەیانەتیان نەکردووە لەمێردەکانیان لەڕووی ئابڕو و ناموسەوە، بەلّکو مەبەست لەوەیە کە نەهاتوونەتە سەرئاینی مێردەکانیان، (ابن عباس)[2] و هەندێ لەپێشینە باشەکان فەرموویانە :

هەرگیز ژنی هیچ کام لەپێغەمبەران بەدکارو داوێن پیس نەبووە، ئەوەی وابزانێت کەوتۆتە هەلّەیەکی گەورەوە، هەرگیز لەگەلّ شان و شکۆی پێغەمبەراندا(عليهم السلام)ئەوبارە دزێوانە ناگونجێ، هەموو کەسێکیش ئازادە لەهەلّبژاردنی بیروباوەڕدا، بازنی پێغەمبەریش بێ، جائەگەر بێ بڕوایی هەلّبژارد، ئەوا سزاکەیشی وەك هاوبڕواکانی خۆی ئەبێت و لەبەر خاتری مێردەکەی فەرامۆش ناکرێت، نەك هەرئەوە بەلّکو خوای گەورە ڕازی نابێت هیچ جۆرە بوختان و دەمەهەلّبەستێك بۆژنەکانی پێغەمبەران دروست بکرێت، خۆئەگەر ئەو هەلّبەستانە لای خەلّکی ساناو ساکار بن، ئەوا لای خوای گەورە گەلێك گەورەن و سزای توندیان بۆ ئامادەکراوە و بۆ نموونە: کاتێك لەڕوداوی (إفك)دا بێ بڕوایان ویستیان سووکایەتی بەخێزانی پێغەمبەرمان

---

[1] مەرج نیە ناوەکان لەسەر بەردەکان بەوشێوە نوسینەبێ کەلەناو ئێمەی مرۆڤ دا باوە .

[2] صحيح: الى ابن عباس، رواه ابن جرير (١٤ / الجزء ٢٨/ ١٧٠ )

(محمد)(ﷺ) بکەن، هاتن سەربەخۆ بۆهتانێکی گەورەیان بۆ (عائشە)ی ژنی پێغەمبەرU هەڵبەست، بەڵام خوای گەورە لەسەروو حەوت ئاسمانەوە دەمکوتی بۆ بروایانی کردو پاکانەی (عائشە)ی دایکی موسڵمانانی ڕاگەیاند . سەبارەت بەواتای ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿مُسَوَّمَةً عِنْدَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ الظَّالِمِينَ بِبَعِيدٍ﴾ (هود:٨٣)، هەندێ لەزانایان لەو ڕوانگەیەوە پێیان وایە کە مرۆڤی (نێربان)دەبێت لەسەر شاخێکی بەرزەوە فڕێ بدرێتە خوارەوە و پاشان بەرد باران بکرێت، لەوانەش پێشەوا شافعی و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، بەڵگەی (پێشەوا)یش ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە (ﷺ)کەلە (ابن عباس) ەوە گێڕاویەتەوە، (هەرکەسێکتان بینی کەکارو ڕەفتاری گەلی لوطي دەکرد ئەوا بکەرو لێکراو بکوژن)، فڕێدانە خوارەوەی تاوانباریش لەسەر لوتکەی شاخێکەوە، ڕاڤەی (أبو حنيفة)یە .

بەڵی خوای گەورە گەلی (لوط)ی لەناو برد، بەسزایەکی پڕ لەڕیسوایی و ناڕەحەت و بێ هاوتا، شوێنی شارو دێهاتەکانیشی کردن بە دەریایەکی بۆگەن کەنەسوودی بۆ زەوی زار هەبێت و نەبۆ گیاندارانی ناو ئاوەکە، سزای خوا ئاوا توندە بەرانبەر بەکەسانی سەرکەش و تاوانبار و یاخی، کە پێغەمبەرانیان بەدرۆ دەکردەوە و دژیان دەوەستانەوە و هەربەو جۆرەش باوەڕداران و خواناسان ڕزگار دەکات . خوای گەورە باسی سزاو کاتەکەیان دەکات و دەفەرموێت ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ مُشْرِقِينَ . فَجَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِنْ سِجِّيلٍ . إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِلْمُتَوَسِّمِينَ . إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ (الحجر:٧٣ - ٧٧) .

هەروەها باسی چۆنیەتی ڕزگارکردنی موسڵمانان و باوەڕداران دەکات لەو ئازارە سەخت و پڕ لە ڕیسواییەی دنیاو چارەنووسی خراپی بەدکاران لەدواڕۆژدا، وەك دەفەرموێت: ﴿فَأَخْرَجْنَا مَنْ كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ . فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ . وَتَرَكْنَا فِيهَا آيَةً لِلَّذِينَ يَخَافُونَ الْعَذَابَ الْأَلِيمَ﴾ (الذاريات:٣٥ - ٣٧) . واتا: ئەوانەمان ڕزگار کرد کەباوەڕدار بوون لەناو ئەو گەلەدا، کەتەنها یەك ماڵمان بینی باوەڕداربوون – ئەویش ماڵی لوط، بوو – ئیتر سزایەکمان دان کەببێ بەبەڵگەو پەند بۆ ئەوانەی وە ك ئەوانن، تاکو لەخواو سزای سەخت بترسن و خۆیان لەبەدکاری لابدەن .

دیارە کاری نێربازی، لەگەڵ نێردا بێ یان لەگەڵ (مێ)، حەلاڵی خۆت بێت یان حەرام، هەر حەرامەو بەدوور نازانرێت کە خوای گەورە بەجۆرێك لەجۆرەکان سزای وەك سزای گەلی (لوط)یان بدات، یاخود هەڵی بگرێت بۆ قیامەت و لەوێ لەگەڵ ئەو

گەلە پیسەدا کۆیان بکاتەوە . هەندێ کەس کە موسڵمانیشە دەیەوێت بەڵگە بۆئەو تاوانە گەورەیە بهێنێتەوە، ئەوانەش ئەگەرچی بەڕاستی سەربەگەلی (لوط) ﷺ نین، بەڵام زۆریش لەوانەوە دوورنین، هەروەکو شاعیرێك دەڵێت:

فأن لم تکونوا قومَ لوط بعينهم

فما قوم لوط منکم ببعيد !

بەپێی ئەو هەواڵانەی لەم سەردەمەدا لەکەناڵە جۆراوجۆرەکانەوە بڵاو دەکرێنەوە، یاخود ئەو سزایانەی لەسەر خەڵکی دادەنرێت لەدادگاکاندا لەسەر کاری نێربازی، (پەنا بەخوا) لەجیهاندا کەم نیەو بەکۆی هەموویان زیاتر لەئەو گەلەیان لێ دروست ئەکرێ کەخوای گەورە بەردباران و ڕیسوای کردن . بەڵام جۆری سزا دنیاییەکە ڕەنگە جیاوازبێت، بڵاوبوونەوەی جۆرەها نەخۆشی سێکسی و ترسناك و نەزۆکی خەڵکی و کەم بوونەوەی بەرەکەت لەسەر زەوی و کورت بوونەوەی تەمەنی خەڵکی و شەکەتی و ماندووبونی بەردەوامی خەڵکی و ئاژاوەی ناو خێزانەکان و جەنگەکانی ناو وڵاتان و کوشتارو دزی و جۆرەها شتی تر ئاسوودەیی و دڵ ئارامییان لەدڵی خەڵکی دا نەهێشتووە ئەم شتانەش نارەحەتیەکی کەم نین ئەگەر چی ناگەن بەبەردباران و ئاوەژوو کردنەوەی زەوی بەسەریاندا .

## ﴿پێغەمبەری خوا حەزرەتی شوعەیب درووود و سەلامی خوای لەسەر بێت﴾

(شوعەیب) (علیه السلام)ئەو پێغەمبەرەیە کە ڕەوانە کرا بۆ سەر گەلی مەدیەن، لە چەندین شوێنی قورئانی پیرۆزدا ناوی خۆی و گەلەکەی و چارەنووسی گەلەکەی هاتووە، جا یان سەربەخۆ، یاخود لەگەڵ باسی گەل و هۆزەکانی تردا لەو سورەت و ئایەتانەش دا کە بە درێژی باسی هاتووە، ئەمانەن:

| ژمارەی ئایەت | ناوی سورەت |
|---|---|
| ٨٥ – ٩٣ | سورەتی الاعراف |
| ٨٤ – ٩٥ | سورەتی هود |
| ١٧٦ – ١٩١ | سورەتی الشعراء |

خوێنەری بەڕێز بۆ زانینی ڕاڤە و تەفسیری ئەو ئایەتانە دەتوانیت سوود وەربگریت لە تەفسیرە کوردیەکان، ئێمەش بەپێی پێویست لەم چیرۆکەی ژیانی (شوعەیب)ی پێغەمبەردا (ﷺ) ڕاڤەو مانایان دەخەینەڕوو: دانیشتوانی شاری (مەدیەن) گەلێکی عەرەب بوون، شارەکەیان ناوی (مەدیەن)بوو، کە یەکێك بووە لەو گوندانەی سەر بە خاکی (مەعان) بووە لە دەوروپشتی (شام)، کە ئەمڕۆ ناحیەیەکە سەر بە وولآتی (حیجاز)ە و نزیکە لەو دەریاچەیەی کە ناسراوە بە دەریاچەی (گەلی لوط)(علیه السلام)، ماوەیەکی کەم دوای گەلی (لوط) ئەمان پەیدابوون و لەو ناوچانەدا نیشتەجێبوون، ئەو هۆزەی لە (مەدیەن)دا دەژیان ناسراون بە کوڕانی (مەدیەن)ی کوڕی (مدیان)ی کوڕی ئیبراهیم پێغەمبەر(علیه السلام)، (شوعەیب) پێغەمبەری ئەمان بووە و ناوی (شوعەیب)ی کوڕی (میکیل)ی کوڕی (یەشجن)ە، هەروەکو (ابن ئیسحاق) باسی کردووە، وە دەڵێت: بەزمانی سریانی پێی دەگوترێ (یەترون)، ئەمەش قسەی تر هەڵدەگرێت، لەلایەکی ترەوە گوتراوە: (شوعەیب) کوڕی (یەشخر)ی کوڕی (لاو)ی کوڕی (یەعقوب)ە، یان (شوعەیب) کوڕی (نوەیب)ی کوڕی (عیفا ثابت)ی کوڕی (مەدیەن)ی کوڕی (ئیبراهیم)ە، هەروەها دەربارەی بن و بنەچەی (شوعەیب)(علیه السلام)بۆچوونی تریش هەیە .

(ابن عساکر) دەڵێت: گوتراوە نەنکی (شوعەیب)(علیه السلام)، یان دایکی کچی (لوط)ە(علیه السلام)، وە لەو کەسانەیە کە بڕوای بە ئیبراهیم هێناوە و شوێنی کەتووە و لەگەڵیدا کۆچی کردووە بۆ دیمەشق، (وەهب)ی کوڕی (منبە) دەڵێت: شوعەیب و مولغەم لەو کەسانە بوون کە ڕۆژی ئاگرەکەی ئیبراهیم باوەڕیان هێناو دوایی هەر لەگەڵ ئیبراهیم

دا (عليه السلام)بەرەو شام کۆچیان کرد و هەردوو کچەکەی (لوط) (عليه السلام)یان خواست، ئەمەش (ابن قتیبە) باسی کردووە، خوا دەیزانێ .

(أبو عمر)ی کوڕی(عبد البر)[1] فەرموودەیەکی پێغەمبەری هێناوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (نعم الحي عنزة، مبغي عليهم، منصورون رهط شعيب واختان موسي)، جا ئەگەر ئەو فەرموودەیە ڕاست بێت و بچێتەوە سەر گفتی شیرینی پێغەمبەرمان (ﷺ)، کەواتە بەڵگەیە لەسەر کە (شوعەیب) زاوای (موسا )بووە(عليه السلام)، وە لە هۆزێکی عەرەبی عاربەن، کە پێیان دەگوترا هۆزی (عەنزە)، نەك ئەو (عنزە)ەیەی کە کوڕی (أسد)ی کوڕی (ربیعە)ی کوڕی (نزار)ی کوڕی (مەعد)ی کوڕی (عدنان)ە، بەڵکو ئەمانە بە ماوەیەکی زۆر دوور لە دوای ئەو هۆزە ژیاون، خوا دەیزانێت . لە فەردوودەیەکی (ابی ذر)دا [2] هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (چوار پێغەمبەر لە عەرەبن، هود و صالح، شوعەیب و پێغەمبەرەکەی تۆ، ئەی ئابا ذە ر)، هەندێ لە پێشینەکان نازناوی (خطیب)یان بەسەر شوعەیب دا بڕیوە، چونکە زۆر زمان ڕەوا بووەو گەلێك شارەزایی ووتاربێژی بووە لە هۆنرەی گەیاندنی پەیامی خواییدا .

(ابن ئیسحاق) فەرموودەیەکی هێناوە کە دەچێتەوە سەر (ابن عباس) کە پێغەمبەر (ﷺ) هەرکات باسی شوعەیبی بکردایە، دەیفەرموو: (ئەو ووتارخوێنی پێغەمبەرانە) [3] .

خەڵکی مەدین بێ بڕوا و جەردە و خەڵگ ترسێن و درەخت پەرست بوون، بە تایبەتی داری (أیك)یان دەپەرستی، کە بەرگێکی ڕەقی تێوە ئاڵاوی هەیە، خراپترین کەس بوون لە کێشانە و پێوانەدا و هەمیشە بە کێشانەی زۆر لە خەڵکیان دەسەند و بە کێشانەی کەم دەیانفرۆشتەوە ئیتر خوای گەورە کەسێکی لەخۆیان کردە پێغەمبەریان، ئەویش (شوعەیب)بوو (عليه السلام)تاکو واز لە بت پەرستی و تەرازووبازی و جەردەیی بهێنن و ئارامی ژیانی خەڵکی نەشێوێنن ، سەرنجام هەندێك لە گەلەکە بڕوایان پێکرد و زۆربەشیان بەبێ بڕوایی و کەللە ڕەقی مانەوە، هەتاکو خوای گەورە ئازار و سزایدان، وەك دەفەرموێت:

---

[1] ضعيف، الاستعاب (٦٤٤/٢)، الطبراني: مسند (٦٣٦٤)، مجمع الهيثمي (٥١/١٠)، اصابة ابن الحجر (٣٣٧٢).

[2] پێشتر (تعريج)مکمیمان باس کردووە .

[3] ضعيف السند، الحاكم (٥٦٨/٢)، ابن جرير (١٩٨/١) .

﴿وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْباً قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءَتْكُمْ بَيِّنَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ .... ﴾ (الاعراف/٨٥)، واته: بۆ سەر گەلی مەدینیش، برای خۆیان شوعەیبمان کردە پێغەمبەریان، پێی گوتن: گەلەکەم خوا بپەرستن، جگە لەو چ پەروەردگارێکی تر نییە، ئەوا لەلایەن پەروەردگاری خۆتانەوە ئاگاداریتان پێگەیشت کە کامەر ڕاستە و کامەیان لارە . ئایەتەکە بەڵگەیەکی تەواوە لەسەر ئەوەی کە شوعەیب پێیان ڕادەگەیەنیَ لە پەروەردگارەوەیە، هەر بۆ ڕاستی ئەوەش خوای گەورە موعجیزەی داوە بە شوعەیب (علیه السلام)ئەگەرچی بەتەواوەتی چۆنیەتی وجۆرایەتی ئەوموعجزەیەمان پێنەگەیشتووە، بەڵام ئامانجی سەرەکی لە ناردنی ئەودا ئەوەبوو کە خوا بپەرستن و واز لە تەرازووبازی بێنن،وەك قورئان دەفەرموێت:﴿فَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا﴾ (الاعراف/٨٥)، ئەم ئایەتە بە ئاشكرا باس لەوە دەكات كە فەرمانی خوایی پیَ ڕاگەیاندون تاكو دادپەروەر بن و واز لە ستەم و جەردەیی بێنن، ئەگینا دووچاری سزای سەخت دەبنەوە، چونكە ﴿ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ ئەوەتان باشترە كە باوەڕ بهێنن، ﴿وَلَا تَقْعُدُوا بِكُلِّ صِرَاطٍ تُوعِدُونَ﴾ لەسەر ڕێی خەڵكی دامەنیشن بۆ ڕوون كردنەوە و گومرگ و سەرانە خستنە سەر ئەو خەڵكەی كە پەیمانتان پێداون لێیان بسەنن و بوونەتە مایای ترس خستنە دڵی ڕێبوارانەوە، و بەترس ڕێگەكانتان گرتوون . (السدی) لە تەفسیرەكەیدا دەڵێت: ئەوان مزەی پارەو ماڵیان لەو ڕێبوارانە دەسەند كە بەو ڕێگایانەدا هاتووچۆ و كاروانیان دەكرد .

(ابن اسحاق) لە (ابن عباس)ەوە هێناویەتی كە فەرموویەتی ئەوان گەلێكی ستەمكاربوون، لەسەر ڕێگاكان دادەنیشتن بۆ نرخ شكاندنی كەل و پەلی خەڵكی و لەبن دەست دەرهێنانیان بە نرخێكی زۆر كەم، ئەوان یەكەم كەسن كە ئەو جۆرە نەیتە خراپەیان داهێنا . پێغەمبەرەكەیان (شوعەیب) (علیه السلام)زۆر ئامۆژگاری دەكردن تاكو واز لەو فێڵ بازیە بهێنن و فێڵ لە خۆیان و خەڵكیش نەكەن، وە بیری دەهێنانەوە كە ئێوە گەلێك بەخشیشی خواییتان پێدراوە، ئێوە كەم بوون و خوای گەورە زۆری كردن و بەهرە و سامانی زۆریشی بەسەرداڕشتن، وەكو دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرُوا إِذْ كُنْتُمْ قَلِيلاً فَكَثَّرَكُمْ وَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ﴾ (الاعراف/٨٦)، خۆ ئەگەر وانەكەن ئەوسا ببینن چارەنوسی خراپكاران چۆن بووە و چۆن دەبیَ .

پێی فەرموون: ﴿وَيَا قَوْمِ أَوْفُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ وَلا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ، بَقِيَّتُ اللَّهِ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ وَمَا أَنَا عَلَيْكُمْ بِحَفِيظٍ﴾ (هود/٨٥-٨٦)، **واتا: گەلەکەم: دادپەروەر بن لە کێشانە و پێوانەدا، شتی خەڵکی بەکەم و کورت مەگرن، خراپکارانە بەسەر زەویدا بڵاوەبنەوە، ئەوی دی کە خوا پێی داون بۆ ئێوە باشترە، گەر باوەڕداربن، ئەمن ناتوانم بتانپارێزم ئەگەر خوای گەورە سزاتان بۆ بنێرێت .**

**(ابن عباس)** [1] **و(حسن البصری)** [2] **فەرموویانە: مانای** (بقيت الله خير) **ئەوەیە کە ئەو ڕۆزی و قازانجە بۆ ئێوە باشترە کە بە حەڵاڵی دەستتان دەکەوێت، وەك لەو باج و سەرانەیەی بە زۆر لە خەڵکی و ڕێبوارانی دەکێشنەوە،** (ابن جرير)**یش فەرموویەتی: واتا: ئەو قازانجە کەمەی بە هاوسەنگەی کێشانە و پێوانە کردن دەستتان دەکەوێت بۆتان باشترە لە کێشانەوەی پارە و پول بە فێڵ و تەڵەکە کردن، وەك (ابن عباس) گێڕاویەتیەوە، ئەوەش هاوشێوەی فەرموودەی پەروەردگارە کە دەفەرموێت:**

﴿قُلْ لا يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ﴾ (المائده/١٠٠)، **واتا: پیس و پاك وەك یەك نین، گەرچی زۆری پیسەکە سەرسامت دەکات . مەبەست لەوەیە کە کەمێکی حەڵاڵ باشترە لە زۆرێکی حەرام، چونکە حەڵاڵ پیرۆزە گەرچی کەمیش بێت، حەرامیش چەپەڵە گەرچی زۆریش بێت . وەك خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿يَمْحَقُ اللَّهُ الرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ﴾، **هەروەها پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) فەرموویەتی: (ڕیبا و زێدە سەندن گەرچی زۆریش بێت چارەنووسی هەر کەمییە)، پێشەوا (احمد) گێڕاویەتەوە** [3] **.**

**لە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (ئەگەر دوو کەس لەسەر کڕین و فرۆشتن پێك هاتن و دانەبڕان و ڕاستگۆ بوون لە ئاشکراکردنی شتە کڕاو و فرۆشتنەکەدا، واتا عەیبەکانیان دەرخست ئەوا مامەڵەکەیان پیرۆزی تێدەکەوێت، بەڵام ئەگەر عەیب و ناتەواویەکانیان لێك شاردەوەو درۆیان لەگەڵ یەکتردا کرد، ئەوا بەرەکەتی کڕین و فرۆشتنەکەیان هەڵدەگیرێ و دەپۆکێتەوە)** [4] **.**

---

[1] **ضعيف اليه: رواه ابن جرير .**

[2] **حسن: رواه ابن أبي حاتم (١١١٣٢) .**

[3] **صحيح احمد (٣٩٥/١) .**

[4] **متفق عليه: البخاري (٢٠٧٩)، مسلم (٢٨٣٦) .**

هەر لەبەر ئەوەش بوو کە (شوعەیب)ی پێغەمبەر (علیه السلام)بە گەلەکەی فەرموو: ﴿بَقِيَّتُ اللَّهِ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ (هود/٨٦)، بەلآم ئەوان گوتیان: ﴿قَالُوا يَا شُعَيْبُ أَصَلَاتُكَ تَأْمُرُكَ أَنْ نَتْرُكَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا أَوْ أَنْ نَفْعَلَ فِي أَمْوَالِنَا مَا نَشَاءُ إِنَّكَ لَأَنْتَ الْحَلِيمُ الرَّشِيدُ﴾ (هود/٨٧)، واتا: ئەی شوعەیب ! ئەوە ئەو کەسەی کە نوێژی بۆ ئەکەیت ئاوات فەرمان پێدەکات کە واز لەو پەرستنە بهێنین کە باووباپیرانمان پێشتر پەرستویانە، یان دەست بخەیتە کاری کڕین و فرۆشتنمانەوە و نەهێڵی بەو جۆرە بین کە خۆمان دەمانەوێت، خۆ تۆ کەسێکی بە ئارام و دانا و پێگەیشتووی ؟ئەو جۆرە قسەیان بە گاڵتە پێکردنەوە پێدەگوت، بە گاڵتەجاڕیەوە پێیان دەگوت: ئەی شوعەیب تۆ دەست دەخەیتە کاری ڕۆژانەمان و پەرستن و ئاینیشمانەوە و دەتەوێت ئێمەش جگە لە خوای تۆ هیچی تر نەپەرستین و ئاینی باووباپیرانمان واز لێ بهێنین و بەو جۆرەش بازرگانی و کڕین و فرۆش بکەین کە تۆ لێی ڕازی بێت ؟ ئیتر واز لە مامەڵەکانی تر بهێنین گەرچی لە نێوان خۆشماندا ڕێك کەوتبین و هەردوو لامان ڕازیبێن![1] ڕازی بوون دوولایەن کڕیار + فرۆشیار لەسەر مامەڵێەکی حەرام مانای حەلآڵ کردنی حەرامەکە نیە . ابن عباس [2]، میمون وابن مهران [3] و ابن جریج [4] و زید ابن أسلم پێیان وایە کە ئەو قسانەیان لە ڕووی گاڵتە پێکردنەوە کردووە

(شوعەیب)ی پێغەمبەر (علیه السلام)فەرمووی ﴿ياقوم أرأيتم ان كُنتُ عَلَى بينة من ربي وَرَزَقَنِي مِنه رزقاً حَسَناً وَما اريدُ أن اخالِفكُم إلي ما أنهاكُم عَنهُ ان اريد إلا الاصلاح ما استطعت وَما تَوفيقي إلا بالله عَلَيهِ تَوكَلتُ وَإلَيهِ انيب﴾ (هود/٨٨)، واتا: ئەی گەلەکەم ئەدی نابینن خوای گەورە منی خستوەتە سەر ڕێی زانیاری، واتا: زانینی هەق و ناهەق، وە ڕۆزی تەواوی پێداوم، ڕۆزی ماددی و مەعنەوی، نامەوێت من شتێك بکەم کە بەئێوەم گوتبێ مەیکەن، ئەمن جگە لەوەی کە چاکسازیم مەبەستە هێندەی بتوانم چی ترم مەبەست نیە، پشتیوانیشم تەنها خودایە، هەر بەو پشت دەبەستم و بۆلای ئەویش تەوبە و پەشیمانیم دەبەمەوە، کەواتە ئەو ویستوویەتی تێیان بگەیەنێت کە نایەوێ فێڵ و تەڵەکەیان لێ بکات، چۆن پێغەمبەران فەرمان بە چاکە دەکەن و خۆیان نایکەن ؟ ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت:

---

[1] ضعيف، رواه ابن ابي حاتم (١١١٤٠) .

[2] صحيح، رواه ابن ابي حاتم (١١١٤١) .

[3] ضعيف: رواه ابن جرير (٧/الجزء ١٢/١٠٣) .

[4] صحيح، رواه ابن جرير (٧/الجزء ١٢/١٠٣)، (١١١٦٣) .

﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ (البقرە/٤٤)، واتا: ئەدی خۆتان فەرمان بە خەڵکی دەکەن کە چاکە بکەن، کەچی خۆتانتان لەبیر چۆتەوە، لەکاتێکدا پەیامی خواتان لە بەردەمدایە و دەیخوێننەوە، واتا/ هەموو پەیامە ئاسمانیەکان دژی ئەوەن، ئەدی ئەقڵتان نیە ؟ هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی (کەسێك دەهێنرێت لە ڕۆژی دواییدا، فڕێی دەدرێتە ناو ئاگرەوە، هەرچی هەناو و ڕیخۆڵەکانی هەیە هەڵدەڕژێنە دەرەوەی گەدەی، ئەوجا ئەو کەسە خۆی بەدەوری ورگ و هەناوە هەڵڕژاوەکەیدا وەردەسوڕێ، هەروەکو چۆن گوێدرێژ بە دەوری هاوسارەکەی خۆیدا (یان ئاخوڕەکەیدا) هەڵدەسوڕێ خەڵکی دۆزەخ لێی کۆ دەبنەوە و دەیناسنەوە، پێی دەڵێن: ئەی فلان کەس بۆچی وات بەسەرهاتووە . ئەی تۆ فەرمانت بە چاکەکردن و لادان لە خراپە ڕانەدەگەیاند. ئەویش دەڵێ: بەڵێ، بەڵام ئەوەی چاکەبوو کە بە خەڵکیم دەگوت، بۆ خۆم وام نەدەکرد، هەروەها بە خەڵکیم دەگوت خراپە مەکەن بۆ خۆم دەمکرد)[1] . ئەو جۆرە ڕەفتار و سیفەتانە زۆر دوورن لە پێغەمبەرانەوە (ﷺ)، جا کاتێك (شوعەیب)ی پێغەمبەری (علیه السلام)ئەو هەموو ڕێگە نەرم و هاندانەی نیشاندان و سەرنجامەکەیشی هەر بێسوود بوو، ئیتر کەوتە نیشاندانی مەترسیەکان و ترس وە بەرنانیان، ڕووی تێکردن و پێی گوتن: ﴿وَيَا قَوْمِ لَا يَجْرِمَنَّكُمْ شِقَاقِي أَن يُصِيبَكُم مِّثْلُ مَا أَصَابَ قَوْمَ نُوحٍ أَوْ قَوْمَ هُودٍ أَوْ قَوْمَ صَالِحٍ وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ﴾ (هود/٨٩)، واتا: ئەی گەلەکەم من گوناهو تاوانی خۆم بەملی ئێوەدا نادەم، من پەیام و ڕاسپاردەی پەروەردگارم پێ ڕاگەیاندوون، ئەگەر گوێڕایەڵی خوای گەورە نەکەن ئەوا دوور نیە ئەو سزایانەتان بەسەربێت کە هات بەسەری گەلی نوح و هود و صالح، خۆ ڕووداوی گەلی (لوط)یش زۆر کۆن نیە، بگرە نزیکە لێتانەوە ، نزیکی گەلی (لوط) لە ڕووی شوێن و کاتیشەوەیە لەوان، بەڵام گوتراوە لە ڕەفتاری کەللە ڕەقی و یاخیبووندا لە ئەوانەوە نزیك بوون، ئیتر شوعەیب پێغەمبەر (علیه السلام)هاندان و ترسناکی تێکەڵ کرد و فەرمووی: ﴿وَاسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ﴾ (هود/٩)، واتا: پەشیمان ببنەوە و ڕوو بکەنەوە پەروەردگارەکەتان و تەوبە بکەن، پەروەردگاری من تەوبەوەرگر و بەبەزەییە، بەڵام ئەوان هەر سووربوون لەسەر بێباوەڕی خۆیان و هەرجارەی جۆرە بیانوویەکیان دەهێنایەوە، ئەوان گوێیان بۆ ووتاری شوعەیب

---

[1] متفق علیه: البخاري (٣٢٦٧)، مسلم (٧٤٠٨) .

پێغەمبەر(علیه السلام)نەدەگرت، دیارە هەرکەسێ بە دڵگوێ بۆ ووتارێك نەگرێت لێشی تێ ناگات، یان لێشی تێبگات خۆی لێ کەڕ دەکات، لەبەرئەوە هەر وەکو ئەوە وایە هیچی نەبیستبێ و نەبای دی بێ و نەباران، بۆیە گەلە کەللە ڕەق و سەرشێتەکەی زۆر گاڵتە جاڕیانە پێیان گوت: ﴿قَالُوا يَا شُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيراً مِمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَاكَ فِينَا ضَعِيفاً وَلَوْلا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَاكَ وَمَا أَنْتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ﴾ (هود/٩١)، واتا: ئەی شوعەیب ئێمە زۆربەی ئەو شتانە تێناگەین کە پێمان دەڵێی، دوای ئەوە تۆ لەناو ئێمەدا کەسێکی لاواز و بێ دەسەڵاتی واتا: هەڕەشەیان لێکرد لە (ابن عباس) [١] و(سعید ابن جبیر) [٢] و(الثوري)[٣] یەوە دەگێڕنەوە کە شوعەیب (علیه السلام)چاوی کز بووە، بەهۆی گریانی لەخوا ترسانیەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەرمان (ﷺ)[٤](لە خۆشەویستی خوادا هێندە گریاوە تا چاوەکانی لەدەست داوە و نابینابووە، خوای گەورە سەر لەنوێ بینایی پێبەخشیوەتەوە، خوای گەورە فەرموویەتی ئەی شوعەیب بۆچی دەگریەی، ئایا لە ترسی ئاگری دۆزەخ یان لە پەرۆشیت بۆ بەهەشت؟ لە وەڵامدا فەرمووی: بەڵکو لەتاو خۆشەویستی تۆ، خۆ ئەگەر بمەوێت بۆ تۆ بڕوانم، ناتوانم، چونکە چاوەکانم لاوازن، ئەی چی بکەم؟ ئیتر خوای گەورە وەحی بۆ نارد و فەرمووی: پیرۆزت بێت کە بەمن دەگەیت . ئەوان هێندە دواکەوتبوون، کە هەموو عەقڵ و کاروبارێکیان بە لێکدانەوەو پێوانەی خێڵەکی بوو، بۆیە پێیان گوت: ﴿وَلَوْلا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَاكَ وَمَا أَنْتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ﴾ (هود/٩١)، واتا:ئەگەر لەبەر خاتری خێڵ و هۆزەکەت نەبوایە بەردبارانمان دەکردیت، خۆ تۆ لە ئێمە زاڵتر نیت، کاتی خۆی قوڕەیشییەکانیش بە پێغەمبەری خۆمانیان دەگوت: ﴿وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنْ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ﴾ (فصلت/٥)، واتا: دڵمان پەردەی بەسەر هەڵکشاوە بەرانبەر ئەو شتانەی کە تۆ ئێمەی بۆ بانگەواز دەکەیت، گوێچکەکەمان ناواخنی تێدایە، لە نێوان ئێمە و تۆدا پەردەیەك هەیە، دیارە ئەم جۆرە قسەیان گاڵتە پێکردنە، یاخود بەهانە هێنانەوەیە بۆ ئەوەی گوێی بۆ نەگرن و بەقسەی نەکەن .

[١] ضعيف الاسناد: ابن أبي حاتم (١١١٦٠)، حاكم (٥٦٨/٢) .

[٢] ضعيف الاسناد: ابن أبي حاتم (١١١٦١)، ابن جرير (٧/الجزو ١٢/١٠٥) .

[٣] صحيح اليه: ابن ابي حاتم (١١١٦٢) .

[٤] منكر: الميزان (٢٣٩/١)، تأريخ ديمشق (٣٦٥/٦)، (٧٢/٦) .

ئەمەش سیفەتی هەموو کەسێکە کە بیەوێت نرخی گوتاری بەرانبەرەکەی کەم بکاتەوە و گوێی لێ نەگرێت، شوعەیب فەرمووی: ﴿یاقوم أرَهطِي أعَز عَلَيكُم مِن الله﴾(مود/٩١-٩٢)، واتا: ئەی گەلەکەم ئایا ئێوە خێڵ و هۆزەکەی منتان بەلاوە گرنگ ترە لە خوا ؟ ئایا ئێوە لە سزا و تۆڵەی هۆزەکەم دەترسن، بەڵام لە سزای خوای گەورە ناترسن ؟ ئەی لەبەرئەوە چاوصۆشی ناکەن کە من پێغەمبەری خوام؟ بەڵام لەبەر خاتری هۆزەکەم چاوپۆشیم لێدەکەن؟ ﴿وَاتَّخذتُمُوهُ وَرَاءَكُم ظهرياً﴾، واتا: لایەنی پەیوەندداریتان بە خواوە خستوەتە پشت خۆتانەوە و وا دەزانن کەس نازانێت کام ڕاز و نیاز لە دڵتانایە؟ ﴿إن رَبي بما تَعمَلُونَ محيط﴾، خوا خوای گەورە و پەروەردگارەکەم زۆر چاك دەزانێت ئێوە چی دەکەن، لەو کاڵتە جاڕی و بێ گوێی و سەرکەشیانەی دەیکەن . ﴿ياقوم اعمَلُوا عَلَي مَكانَتِكُم إني عَامِلٌ سَوفَ تَعلَمونَ مَن يَأتيهِ عَذابٌ يُخزِيه وَمَن هُوَ كَاذِب وَارتَقِبوا إني مَعَكُم رَقِيب﴾ (هود/٩٣)، واتا: گەلەکەم لە جێی خۆتاندا بمێننەوە و کاری خۆتان بکەن، منیش هەر سوورم لەسەر کاری بانگخوازی خۆم، بەم نزیکانە دەزانن کێمان سزای سەختی خوای بۆ دێت و ڕیسوا دەبێت و کێ درۆزنە، ئەوا منیش وەکو ئێوە و لەگەڵتان چاوەڕوان دەبم، تاکە خوای گەورە یەکلایی دەکاتەوە، دیارە ئەمەش دواهەمین ئاگاداری و هۆشیار کردنەوەی گەلەکەیەتی و پڕە لە گازەندە و هەڕەشە، چونکە ئەوان سوورن لەسەر خراپکاری خۆیان، (عذاب یخزیه)، واتا سزایەکی ڕیسواکەرانە، ئەمەش بۆ دنیایە، (عذاب مقیم)، واتا: سزایەکی ئامادە و بەردەوام، ئەوەیان بۆ ڕۆژی دواییە . ئەمەش وەك ئەو نموونەیە وایە کە خوای گەورە لە سوورەتی (الاعراف) و ئایەتی (٨٧-٨٩)دا باسی فەرمووە، کە بێ بڕوایان داوایانکرد ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و لەگەڵ شوعەیب دان، بگەڕێنەوە و پاشگەز ببنەوە، بەڵام شوعەیب (علیه السلام)دڵنیای کردن کە باوەڕدارانی ڕاستەقینە هەرگیز و هەرگیز پەشیمان نابنەوە، هەر کەسێك بە ڕاستی ڕێی خواپەرستی گرتەبەر، تازە دانەبەزێتەوە چەسپ بوو، بە هیچ کەسێك لەق ناکرێت و دەستی کەسی پێناگات، لەبەرئەوە وێڕا لەگەڵ (شوعەیب)دا (علیه السلام)فەرموویان: ﴿قَدِ افْتَرَيْنَا عَلَي اللَّهِ كَذِباً إنْ عُدْنَا فِي مِلَّتِكُمْ بَعْدَ إذْ نَجَّانَا اللَّهُ مِنْهَا وَمَا يَكُونُ لَنَا أنْ نَعُودَ فِيهَا إلَّا أنْ يَشَاءَ اللَّهُ رَبُّنَا وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيْءٍ عِلْماً عَلَي اللَّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا افْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِالْحَقِّ وَأَنْتَ خَيْرُ الْفَاتِحِينَ﴾ (الاعراف/٨٩)، واتا: ئەوە دەچنە ڕیزی ئەو کەسانەوە کە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستن، ئەگەر جارێکی تر ئێمە بگەڕێینەوە ناو ئێوەی بێبڕوا، دوای ئەوە خوا ئێمەی لەدەست ئەو میللەتە خراپە ڕزگار کرد، هەرگیز ناگەڕێینەوە مەگەر

پەروەردگارمان خۆی خواستی وابێت کە ئەوپەڕی زانایە بەرانبەری هەموو شتەکان و ئێمەش بە تەواوەتی پشتمان بە ئەو بەستووە . پاش ئەوە پارانەوە لە خودای گەورە تاکو سەرکەوتوویان بکات بەسەر ئەو بێبڕوایاندا و هێڵی جیاکەرەوەیان لە نێواندا دابنێ، گوتیان: ﴿رَبَّنَا افْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِالْحَقِّ وَأَنْتَ خَيْرُ الْفَاتِحِينَ﴾ (الاعراف/٨٩)، بەم جۆرە شوعەیب (علیه السلام)نزای لێکردن، دیارە خوای گەورەش نزای پێغەمبەرانی خۆی ڕەت ناکاتەوە، ئەوان سووربوون لەسەر باوەڕی دێرینی باووباپیرانیان، تەنانەت ڕیش سپی و سەرەك هۆزە گەورەکانیان بە خەڵکی بن دەستی خۆیان ڕادەگەیاند و پێیان دەگوتن ئەگەر ئێوە شوێن شوعەیب بکەون، ئەوا ڕەنجەڕۆ دەبن ﴿وَقَالَ الْمَلَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَوْمِهِ لَئِنِ اتَّبَعْتُمْ شُعَيْبًا إِنَّكُمْ لَخَاسِرُونَ﴾ (الاعراف/٩٠)، پاش ئەو هەموو ئاگادارکردنەوە و ڕاسپاردە گەورانەی کە خوای گەورە ناردی بۆ ئەو گەلە، ئەوان هێشتا مێش میوانیان نەبوو، گوێیان کەڕبوو لە ئاستی بیستنی ڕاستی، ئەمان مشەخۆرێکی چڵێس و گروپێکی جەردە و ڕێبڕۆ تەرازوو خوار و بڕوالاربوون، دڵیان تۆزقاڵێك ڕووناکی بڕوایی تێدا نەبوو، لەبەر ئەوە کاتی ئەوەیان هات کە خوای گەورە بە سزا و تۆڵەی سەخت و کوشندە بیانگرێت، هەر وەکو خوای گەورە خۆی دەفەرموێت: ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ﴾ (الاعراف/٧٨)، واتا: زەوی لەرزە و داتڵەکانێکی توند دایگرتن و لەماڵەکانی خۆیاندا بوونە کۆمەڵێك تەرم و لاشەی بێ گیان . کەواتە زەوی لەرزەیەکی تووندو کوشندە و لەناو زەنوقی بردن و کۆشك و خانوو ماڵ و بت و سامان و سەریان لە چاوتروکانێکدا لەدەست دا، تەنانەت گیاندارەکانیشیان وەك بەردودار ڕەق هەڵاتن، لاشەیان بێگیان کەوتن، جا لەبەرئەوەی جۆرەها سیفەتی ناشرینیان تێدابوو، خوای گەورەش بە جۆرەها سزا سزای دان، سەرەتا ڕاتڵەکاندنێکی گەورە زەمانی شکاندن و لەپەل و پۆی خستن، زریکەیەکی بەهێز گوێچکەی تەقاندن و بێدەنگی کردن، پاشان هەورێکی ناردەسەریان کە لەهەموو لایەکەوە تەڵەزمی گەردونی و پارچەی بڵێسە ئاگرین و تشیکی ترسناکی بەسەردا ڕشتن .

بەڵام لە سورەتی (هود)دا خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەوانمان بە زریکە و دەنگێکی بەرز و بەهێز لەناوبردن و لە ماڵەکانی خۆیاندا کردمانن بە لاشەی بێگیان، ئەمەش وەك وەڵامێکی خواییە بۆ گاڵتە جاڕیەکانیان کە وایان دەزانی پەروەردگاری شوعەیب بێ دەسەڵاتە و دەستی بە ئەوان ڕاناگات، کاتلا خۆشی ئەو قسە و باسە ناشیرین و

قێزەونانەی ئەوان مێشك و دڵی شوعەیب و باوەڕدارانیان ئازار دەدا، کەواتە جۆری سزاکە پڕ بە پێستی خۆیەتی .

لە سورەتی (الشعراء)دا خوای گەورە وا باسیان دەکات کە ئەوان بە سزای (ڕۆژی هەورەکە) لەناوچوون، ئەوەش زۆر نزیکە لە وەڵامی داخوازیەکەی خۆیانەوە، کە بە شوعەیبیان دەگوت: ﴿فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِنَ السَّمَاءِ إِنْ كُنْتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ، قَالَ رَبِّي أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ، فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ الظُّلَّةِ إِنَّهُ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (الشعراء/١٨٧-١٨٩)، واتا: ئەگەر ڕاست دەکەیت هەورێکی ترسناك لە ئاسمانەوە بێنەرە سەرمان، گوتی: پەروەردگارم بۆ خۆی دەزانێت ئێوە چی دەکەن و چی دەڵێن، بە درۆیان دەخستەوە، بۆیە سزای ڕۆژی هەور و سێبەرەکە دایگرتن، بە ڕاستی ئەو ڕۆژە سزایەکی گەورە و ناڕەحەتیان بۆ هات .

ئەوان قسە و باسیان زۆر ناڕێك و نەشیاوبوون، ساتێك دەیانگوت ئەی شوعەیب ئەتۆش هەر وەکو ئێمە مرۆڤیت، ساتێکی تر دەیانگوت ئەگەر ڕاست دەکەیت هەورێکمان لە ئاسمان بۆ بێنە، ئاخر ئەم دوو جۆرە قسەیە تەواو لە یەکترەوە دوورن، ئینجا دەیانگوت تۆ جادوگەریت، ڕاست ناکەیت، بەڵام سەرنجام دڵنیابوون کێ ڕاستە و کێ درۆزنە ! بەڵام کاتێك بە خۆیان زانی کە بڕیاری سزایان لەلایەن خواوە درابوو، فەرمانی خواش گەڕانەوەی نییە . چەند کەسێکی کەم پێیان وابووە کە (أصحاب الايكة) و (خەڵکی مەدیەن) دوو میللەتی جیاوازبوون، بەڵام ئەو کەسان بەڵگەی تەواویان نیە، بەڵکو هەردووکیان هەر یەك گەل و میللەت بوون و (شوعەیب) (عليه السلام)بۆ سەر هەردووکیان ڕەوانە کرابوو، وە هەردووکیان بەهەمان گروپە سزا لەناوچوون، وەکو ئایەتە قورئانیەکان وا ئاماژەیان فەرمووە، خوای گەورە دەزانێت . فەرموودەیەکی (غەریب)یش هەیە، کە لە (جامع التحصيل)ی (الترمذي)دا لە ژمارە (١٧٤)دا هاتووە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (گەلی مەدیەن و هاوەڵانی دارستان دوو گەل بوون خوای گەورە شوعەیبی بۆ ڕەوانە کردن تا ڕێنومایيان بکات بۆ خوا پەرستی)، ئەوە فەرموودەیەکی زۆر لاواز و بگرە (منکر)ە و لەوە دەچێت دەست هەڵبەستی جولەکەکان بێت . هەردووکیان هەمان فێڵ و تەڵەکەیان هەبووە لە تەرازووبازی و کێشانە و پێوانە و بێبڕواییدا و پێکەوە بە سزای هەموو جۆر لەناوچوون، قورئانی پیرۆزیش هەر جارە و بەپێی ڕەوتی گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەیان شێوەیەك لە شێوەکانی سزاکەیان باس دەکات . سەبارەت بە جۆرە سزای ڕۆژی سێبەر و هەورەکە وا باس کراوە کە گەرمایەکی زۆر توندوتیژ و گڕەبایەکی بە ئازار

دایگرتوون، بۆماوەی (حەوت) ڕۆژ، لەو ماوەیەدا نە ئاو و نەسێبەر و نەژێر زەمینەکان بە فریایان نەهاتوون و بەڵکو بە تەواوەتی گڕە بایەکە ووشکی کردوونە، ئیتر ڕوویان کردوەتە دەشت و دەر، هەورێك سێبەری بۆکردوون، تاکو هەموویان هاتوون و لە ژێر هەورەکەدا کۆبوونەوە، کە بەتەواوەتی هەموویان هاتوونە ژێر هەورەکە، ئیتر خوای گەورە تەڵەزمی گەردوونی و تیشك و پریشکی گڕاوی بەسەردا باراندوون و زەویشی ڕاوەشاندوەو پاشانم بە دەنگ و قیژەیەکی گەورە لە ئاسمانەوە لەناوی بردوون، بە لەناوبردنێك کە دەتگوت جێ ماڵ و شاریان هەرگیز ئاوەدانیشی تێدا نەبووە . وەکو خوای گەورە دەفەرموێت ﴿فأصبحوا في دارهم جاثمين. الذين كذبوا شعيباً كأن لم يغنوا فيها، كانوا هم الخاسرين﴾ (الاعراف/٩١-٩٢)، واتا: لە خانە و ماڵی خۆیاندا بوون بە لاشەی بێ جووڵە و بێگیان، ئەوانەی شوعەیبیان بە درۆ دەخستەوە، وامان لێکردن کە وەك ئەوە وابوو هەر کەسیش لەو خانوو و ماڵانەدا نەژیابێ، ئەوانەی شوعەیبیان بە درۆ دەخستەوە هەر ئەوان ڕەنجەڕۆ بوون، بەڵام خوای گەورە شوعەیب و باوەڕدارانی ڕزگار کرد، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْباً وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَأَخَذَتِ الَّذِينَ ظَلَمُوا الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا فِي دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ﴾ (هود/٩٤)، واتا: لە خانە و ماڵی خۆیاندابوون بە لاشەی بێجووڵە و بێگیان، ئەوانەی شوعەیبیان بە درۆ دەخستەوە، وامان لێکردن کە وەك ئەوە وابوو هەر کەسیش لەو خانوو ماڵانەدا نەژیابێ، ئەوانەی شوعەیبیان بو درۆ دەخستەوە هەر ئەوان ڕەنجەڕۆ بوون . بەڵێ هەمیشە بێبڕوایان ڕەنجە ڕون، گەرچی دنیاش هی ئەوان بێ، چونکە دنیا دەسکەوتی هەموو ڕەنجەکەیانە، بەڵام دنیاشیان لەدەست دەچێت و دەڕوات، کەواتە ڕەنجەڕۆن، لای باوەڕداران دنیا کێڵگەی دواڕۆژە، کێڵگە بابڕوات، بەروبوومی کۆتایی گرنگە، ئەو بەرهەمەی هەرگیز نابڕێتەوە و کەم ناکات ، پاش تیاچوونیان، (شوعەیب)ی پێغەمبەر (علیه السلام)چووە سەر تەرم و شوێنەوارە کاولەکانیان و پێی گوتن: ﴿فَتَوَلَّى عَنْهُمْ وَقَالَ يَا قَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالاتِ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ فَكَيْفَ آسَى عَلَى قَوْمٍ كَافِرِينَ﴾ (الاعراف/٩٣)، واتا: ئەی گەل، من پەیامی پەروەردگاری خۆمم پێ ڕاگەیاندن، وە ئامۆژگاریم کردن و ئیدی چۆن خەم بۆ گەلێکی بێبڕوا دەخۆم ؟ لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە کە شوعەیب لەدوای (یوسف)ی پێغەمبەر بووە(علیه السلام)، (وهب ابن منبه)یش دەڵێت: شوعەیب لە (مەککە) کۆچی دوایی کردووە و گۆڕی خۆی و باوەڕدارانیشی هەر لەوێیە لە خۆراوای کەعبەوە لە نێوان (دار الندوه)ە و (دار بنی سهم)ەوە، سەلامی خوای لەسەر بێت .

## ﴿پێغەمبەری خوا حەزرەتی ( ئیسماعیل ) ( دروود و سەلامی خوای لەسەر بێت )﴾

وەکو باسمان کرد، ئیبراهیم خەلیل (علیه السلام)چەند کورێکی هەبووە، بەناوبانگترینیان دوو کورە بەناوبانگەکەیەتی کە بوون بە پێغەمبەر و باوکی پێغەمبەرانی دوای خۆیان(علیه السلام)، یەکەمیان ئیسماعیلی پێغەمبەرە (علیه السلام)کە زۆرینەی بۆچوونەکان لەسەر ئەوەن کە ئەویان ئەوە بووە کە بڕیار بوو بیکات بە قوربانی (الذبیح) ناسراوە و دایکیشی ناوی هاجەرەی قبطي میصرییە، ئەو کەسانەی دەڵێن گوایە (ئیسحاق) (علیه السلام)ئەوەیە کە خەریك بوو بکرێت بە قوربانی، ئەوە بە هەڵەدا چووە وان نییە، بەڵکو ئەو جۆرە بۆچوونانە لەو (بەنی ئیسرائیل)یانەوە وەرگیراوە کە دەستکاری دەقی تەورات و ئینجیلیان کردووە و گۆڕیویاننە سەر ئارەزووی خۆیان، ئیبراهیم (علیه السلام)فەرمانی لە پەروەردگارەوە پێکرا کە کوڕە تاقانەکەی بکات بەقوربانی، ئەویش ناوی ئیسماعیل بووە بە دەقی بەڵگەکان، تەنانەت لە کتێبیی ئیسرائیلیەکانیش دا هاتووە کە کاتێك ئیسماعیل لەدایك بووە کە ئیبراهیمی باوکی (علیه السلام)لە تەمەنی هەشتا و شەش ساڵیدا بووە و پاش سەد ساڵی تر ئینجا (ئیسحاق) (علیه السلام)لەدایك بووە، لەبەرئەوە ئیسماعیل نۆبەرە کوڕی بووە لەگەڵ هاجەرەی دایکیدا کۆچیان کرد، کاتێك شیرەخۆر بووە و باوکی بردوونی دۆڵی (فاران) دایناون کە زنجیرە شاخی دەوری (مەككە)یە و جگە لە ئاو و خۆراکێکی کەم هیچیان نەبوو، تاکو پشت بە خوا ببەستن، تاکو خوای گەورەش لای ڕەحمەتی لێکردنەوە و بەرەکەتی خۆی بەسەردا ڕشتن و تا ئەمڕۆش ئەو خێر و بەرەکەتە هەر هەیە، کێ دەزانێت چی بەسەر هات و ڕووداوێکی گرنگ لە پشتی ئەم دایك و منداڵە ساوایەوە هەیە ؟ مەگەر خوای گەورە هەر خۆی بزانێت .

بەڵێ ئیسماعیل (علیه السلام)دەبێتە منداڵێك کە خوای گەورە بە دانا و خۆڕاگر و ڕاستگۆ و نوێژکار وەصفی دەکات، خوای گەورە لە چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆزدا باسی (ئیسماعیل)ی پێغەمبەر (علیه السلام)دەکات بە تاك و بە کۆ، لە خوارەوە ناوی ئەو سورەت و ژمارەی ئەو ئایەتانە دەنووسین کە باسی (ئیسماعیل) پێغەمبەر (علیه السلام)دەکەن، بەپێی پێویست لە جێی خۆیاندا تەفسیر و واتاکانیان دەخەینە ڕوو، بەڕێزت دەتوانیت بۆ تەفسیرەکەیان سوود وەربگریت لە تەفسیرە کوردیەکان بەتایبەتی تەفسیری ئاسان .

| ژمارەی ئایەت | ناوی سورەت |
| --- | --- |
| ١٠١ – ١٢٠ | سورەتی الصافات |
| ٥٤ – ٥٥ | سورەتی مريم |
| ٤٥ – ٤٨ | سورەتی ص |
| ٨٥ – ٨٦ | سورەتی الانبياء |
| ١٦٣ | سورەتی النساء |
| ١٣٦، ١٤٠ | سورەتی البقرة |

خوای گەورە هەموو سیفەتە جوانەکانی لە ئیسماعیلی پێغەمبەردا (علیه السلام)کۆکردۆتەوە و کردوویەتی بە پێغەمبەر و پاکانەی کردووە لە هەموو ئەو شتە خراپانەی کە بێبڕوایان داویانەتە پاڵی و فەرمانی پێکردووە تاکو خەڵکی بانگ بکات بۆ خواپەرستی و زانایان و پشتناسان پێیان وایە کە (ئیسماعیل) (علیه السلام)یەکەم کەس بووە کە سواری ئەسپ کێوی بووە پێش ئەو ئەسپ و ماڵی نەکرابوو، پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەسپ ڕابگرن، چونکە ئەوە میراتی ئیسماعیلی باوکتانە) [١]

گوتراوە پێشتر ئەسپەکان کێوی بوون، بەڵام ئیسماعیل بانگی کردن و ئەوانیش هاتن بەدەم داواکەیەوە و ماڵیبوون، هەر ئەو یەکەم کەس بووە کە بەزمانێکی ڕاست و دروست و پاراوی عەرەبی بۆ یەکەم جار دواوە، گەرچی خۆیشی لە عەرەبی عاربەوە فێربیوو کە لە مەککە لە دەورووبەری ئاوەکەدا هۆزی جورهەم و عەمالیقەکان و یەمەنی و گەلە کۆنەکان هاوژیانیان بوون لەسەر ئاوی زەمزەم . لە فەرموودەیەکدا لە (علی کوڕی حسین) ئەویش لەباوانیەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (یەکەم کەس کە زمانی بە عەرەبییەکی ڕەوان پڕژابێت، ئیسماعیل بووە، کاتێك لە تەمەنی چواردەساڵیدا بووە) [٢] . کاتێك تەمەنی گەیشتە دەمی ژن هێنان، کچێکی لە عەمالیقەکان خواست، بەڵام باوکی فەرمانی پێکرد تەڵاقی بدات، (ئەمەوی) دەڵێت: (ئەو ژنەی ناوی عەمارەی کچی سەعدی کوڕی ئوسامەی کوڕی ئەکیلی عەمالیقی) بوو ناوی (سەیدەی کچی مضاضي کوڕی عەمرۆی جورهومی) بووە،، دەڵێن: گوایە ئەوەیان سێهەم ژنی بووە، لەم ژنەی دوازدە کوڕی بووە، کە ناویان (نابت، قیذر، ئیزبل، میشا، مسمع، ماش، دوصەن،

---

[١] اسناده ضعيف .

[٢] حسن الاسناد، الحافظ في الفتح (٤٦٤/٦)، ابن عباس (٤٨) فيض القدير (٩٣/٣)، الشيخ ناصر الالباني في الجامع (٢٥٨١) .

ئەرر، یطور، نبش، طیما، قیذما) بووە، وەك (ابن اسحاق) و (أهل الکتاب) هاودەنگ لەو ناوانەدا (أهل الکتاب) پێیان وایە ئەوانە دوازدە گەورەی مژدەدەرن بە ئەوان، بەڵام دەست هەڵبەستی خۆیانە و ڕاست ناکەن .

(اسماعیل) (علیه السلام)وەك پێغەمبەر ڕەوانەکرا بۆ سەر ئەو گەلە کە پێك هاتبوون لە خێڵەکانی جورهم و عەمالیقە و خەڵکی یەمەن، لە سەرەمەرگیشدا وەسیەتی بەجێهێشت بۆ (ئیسحاق)ی برای (علیه السلام)لە بەرچەی ئەویش (روم) کەوتەوە، کە پێیان دەگوتن (بنو الاصفر) بە هۆی هەبوونی زەردییەکی جوان لە ڕەنگی (عیصی)ی کوڕی (ئیسحاق)دا لە بۆچوونێکی تردا ئەویش (یونان)ی لێکەوتەوە .

(ئیسماعیل)ی (علیه السلام)لەگەڵ دایکیدا لەلای بەردە ڕەشەکە ئەسپەردەی خاك کراون، لە تەمەنی سەد و سی و حەوتساڵیدا کۆچی دوایی کرد، لە (عومەری کوڕی عبدالعزیز)ەوە دەگێڕنەوە کە (ئیسماعیل) (علیه السلام)سکاڵای گەرمای شاری مەککەی لەلای خوای گەورە کردووە، خوای گەورەش وەحی بۆکردووە کە دەرگایەکی بۆ دەکاتەوە بەرەو بەهەشت لەو جێگەیەی کە تیایدا ئەسپەردەی خاك ئەکرێت، بە چەشنی کە بۆن و بەرامەکەی تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام بێت، هەموو عەرەبەکان دەچنەوە سەر دوو کوڕەکەی (ئیسماعیل) (علیه السلام)کە (نابت) و (قیذار)ن، ئێستاش دەچینە سەر باسی ژیانی (ئیسحاق)ی پێغەمبەر (علیه السلام)کە برای (ئیسماعیل)ە (علیه السلام).

## ﴿پێغەمبەری خوا حەزرەتی ئیسحاق (دروود و سەلامی خوای لەسەر بێت)﴾

پێشتر باسمان کرد کە ابراهیم (علیه السلام)تەمەنی (سەد ساڵ) بوو کە خوای گەورە ئیسماعیلی پێبەخشی، چواردە ساڵ دوای ئەویش (ئیسحاق) لە دایك بوو، کاتێك مژدەی ئەو لەدایك بوونەی ئیسحاق درا بە باوکی، دایکی تەمەنی نەوەد ساڵ بوو ! خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿وَبَشرناهُ باسحاقَ نَبياً مِن الصالحين. وباركنا عليه وَعلي اسحاق وَمِن ذريتهما محسنٌ وَظَالِم لِنفسه مبين﴾ (الصافات/١١٢-١١٣)، واتا: مژدەمان دا بە ابراهیم کە ئیسحاقت دەبێت، ودەشبێتە پێغەمبەرێك لە چاکەکان، پیرۆزباییمان لە ئیبراهیم و ئیسحاق کرد و ئەوەی لەوانیش دەکەوێتەوە چاکەکارن و تیاشیاندا هەیە کە بە ئاشکرا ستەم لە خودی خۆی دەکات، واتا بێبڕوایە .

(أهل الکتاب) وا باس دەکەن کە (ئیسحاق) (علیه السلام)هات (ڕەفقای کچی بەتاوییل)ی مارە کرد تەمەنی خۆی (چل) ساڵ بوو، باوکیشی هێشتا لە ژیاندا مابوو، (رفقا) نەزۆك بوو، نزای بۆ کرد و خوای گەورە منداڵی دوانەی پێ بەخشی، یەکەمیان ناوی (عیصو) کە عەرەبەکان بە (العیص) ناوی دەبەن و باوکی (روم)ە، دووەمیشیان ڕاستەوخۆر دوای ئەو لەدایك بوو، واتا: (بعقب) لەبەرئەوە ناویان نا (یەعقوب) و (بنو ئیسرائیل)ەکان دەچنەوە سەر ئەو، چونکە کوڕی نۆبەرەی بووە، بەڵام (رفقا)ی دایکی (یەعقوب)ی زیاتر خۆشی دەویست، چونکە منداڵ بچکۆلەی بوو . دەگێڕنەوە کە (ئیسحاق) بە ساڵدا چوو، چاوەکانی کز بوون، ئارەزووی لەخواردنێك بوو کە (عیص) بۆی دروست بکات، (عیص) ڕاوچیەکی شارەزابوو، ئەو ڕۆیشت، لەملاوەوش (ڕفقا)ی دایکی بە (یەعقوب)ی کوڕی گوت برۆ دوو کاری زۆر جوا سەربڕە و بیکە بەو خۆراکەی کە باوکت حەزی لێئەکات، ئیتر سازی کرد و بەرگەکانی (عیص)ی برای لەبەر کرد و چەرمی توکنی دوو کارەکەی بە قۆڵ و قوڕگی خۆیەوە چەسپ کرد، چونکە (عیص) توکن بوو، ئیتر خواردنەکەی بۆ برد، باوکی پرسی تۆ کێیت؟، وتی: من کوڕەکەی خۆتم (ئیسحاق) (علیه السلام)لەبەر خۆیەوە دەیفەرموو: دەنگەکەت دەنگی یەعقوبە و بەرگو لەش و لاریشت (عیص)ە . کاتیك تێری خوارد، لەخوای گەورە پاڕایەوە تاکو خوای گەورە لە هەموو براکانیدا زیاتر ڕێزی خۆی بەسەردا بڕێژێ و بیکاتە گەورەی گەلان و ڕۆزی و منداڵی زۆری پێبدات . پاش ماوەیەك (عیص) لە ڕاو هاتەوە و خواردنەکەی ئامادە کرد و هێنای لە پێش دەمی باوکی داینا، باوکی گوتی: ئەمە چییە ڕۆڵە ؟ گوتی: ئەوە ئەو خۆراکەیە کە ئارەزووت لێبوو، گوتی:

ئەی پێش کەمێك نەتهێنا؟ خواردم و نزاشم بۆکردیت، گوتی: نە بەخوا . ئیتر زانی کە ئەوە براکەی بووە ئەو پێش دەستیەی کردووە، لێرەدا زۆر دڵی لەخۆی داما، تەنانەت دەڵێن: گوایە گوتویەتی دەبێ براکەم بکوژم پاش مردنی باوکم، داوای کرد کە باوکی نزایەکی تر بۆ ئەم بکات، تاکو بەرەو وەچەی ئەم توندترین کەسی سەر زەوی بن و ماڵ سامانیشیان زۆربێت .

کاتێك دایکی گوێی لەم قسە و باسە بوو، بە (یەعقوب)ی کوڕی گوت: کە لەوناوەوە دوور بکەوێتەوە و بڕوات بۆلای (لابان)ی خاڵی کە لەخاکی حەڕان دا دەژیا، تاکو قین و ڕقی براکەی دەپووکێتەوە، هەر لەوێش کچێکی خاڵی بخوازێت، هەر دایکەکە ئەم قسانەی بە (ئیسحاق) گوت:، تاکو ئاوا فەرمان بە یەعقوب بکات و ئامۆژگاری بکات، باوکیشی پێی ڕاگەیاند و ئیتر (یەعقوب) (علیه السلام)ڕۆیشت، تا ئێوارەی بەسەر هات، ئیتر خەو دایگرت بەردێکی کرد بە سەرین و خەوی لێکەوت، لەوێدا خەونێکی دێت، لە خەویاپەیژەیەکی هەڵواسراوی دیت، کە لە ئاسمانەوە بۆ زەوی شۆڕ ببوەوە، فریشتەکان بە سەریا دەڕۆیشتنە سەرەوەو دادەبەزینە خوارەوە، خوای گەورە لەگەڵ یەعقوب دا کەوتە گفتوگۆ، پێی فەرموو: من پیرۆزی خۆمت بەسەردا دەڕێژم، بەرو وەچەت زیاد دەکەم، ئەم خاك و زەمینەش بە تۆ و بەرەکانی تۆ دەبەخشم، کە بەیانی لەخەو ڕابوو، تەواو دڵی بەو خەونەی خۆش بوو، پەیمانیدا و لەسەر خۆی نەزری کرد کە ئەگەر بە بێوەیی بگاتەوە لای کەس و کاری خۆی، ئەوا لەو شوێنەدا ماڵێکی خوا دروست دەکات و وە هەرلاشتێ کە خودا پێی ببەخشێت دەیەکی دەکات بەخێر، بەردەکەی بە ڕۆن چەور کرد و تاکو دوایی بیناسێتەوە، شوێنەکەش ناسرا بە (بیت ئیل)، واتا: (ماڵی خوا) کە ئێستا (بیت المقدس)ی لێدروست کراوە و کاتی خۆی (یەعقوب)ی پێغەمبەر (علیه السلام)بنیاتی ناوە گوتراوە: کاتێك (یەعقوب) (علیه السلام)چوو بۆ ماڵی خاڵی کە لەخاکی (حران) دەژیان، خاڵی کە ناوی (لابان)بوو دوو کچی هەبوو، کچە گەورەکەی ناوی (لیا)بوو، بچوکەکەی ناوی (راحیل)بوو، کە ئەمیان چاکتر و جوانتر بوو لە خوشکە گەورەکەی، (یەعقوب) (علیه السلام)داوای لە خاڵی کرد کە کچە بچووکەکەی پێبدات، خاڵیشی دیاری نەکرد، بەڵام پەیمانی دایە کە کچێکی بداتێ بەو مەرجەی ماوەی حەوت ساڵ شوانی مەڕەکانی بێت، کاتێك ماوەی حەوت ساڵەکەی تەواو کرد، خواردنێکی نایابی ئامادە کرد و ئاهەنگێکی شایی سازدا، بەڵام خاڵی (لیا)ی پێدا، هەرچەندە ئەو

جوانەش نەبوو، وێڕای ئەوە چاویشی کز بوو، (یەعقوب) (علیه السلام)بەخاڵی فەرموو: من (ڕاحیل)م مەبەستە، خاڵی گوتی: ئاخر ئێمە نەریتمان وانیە کە کچی بچووک پێش کچی گەورە بدەین بەشوو، کەچی دواتر (ڕاحیل) نەزۆك دەرچوو، (یەعقوب) (علیه السلام)ئەم منداڵانەی لە (لیا) لێکەوتەوە: ڕۆبیل، شەمعون، لاوی، یەهوذا،پاشان قەدەری خوایی وابوو کە (ڕاحیل)یش بوو بە هاوسەری، ئەوەبوو منداڵی نەدەبوو، لەخوای گەورە پاڕایەوە تاکو منداڵی پێببەخشێت، خوای گەورەش نزاکەی وەرگرت و منداڵێکی نموونەیی زۆر نایاب و بە ڕێز و پیرۆزی پێبەخشی کە ناوی نا (یوسف)(علیه السلام)، ئەم هەموو ڕووداوانە ڕوویاندا، ئەوان هێشتا لەخاکی (حەران)دا دەژیان و هێشتا (یەعقوب) (علیه السلام)هەر شوانی مەڕەکانی خاڵی بوو، تەنانەت تا ماوەی (٢٠) ساڵ لەوێ مایەوە، ئیتر داوای لەخاڵی کرد کە ڕێگە بدات تاکو (یەعقوب) (علیه السلام)بگەڕێتەوە لای کەس و کاری خۆی، خاڵی پێی گوت: من بەهۆی تۆوە خێر و بێرێکی زۆرم بەسەردا ڕژاوە، لەماڵ و ماڵاتی من چیت دەوێت ببیە بۆ خۆت، ئەویش فەرمووی: ئەمساڵ هەر مەڕ و بزنێك بەچکەی بەڵەکیان بوو بۆ منی دابنێ، خاڵیشی گوتی: بەسەرچاو، تەنانەت ئەو ساڵە مەڕ و بزنەکانی هێندەی پانتایی سێ ڕۆژە ڕێ زیادیان کرد، بەمەش (یەعقوب) (علیه السلام)بوو بە خاوەنی زیندەماڵێکی زۆر و گەلێك خزمەتکار و بەردەستیشی هەبوو .

خوای گەورە سروشی کرد بۆ (یەعقوب) تاکو بگەڕێتەوە بۆ ناو کەس و کار و وڵاتی خۆی و گفتی پێدا کە پشتیوانی بکات و بیپارێزێ، ئەویش ئەمەی بەگەل و هۆزەکەی ڕاگەیاند، ئەوانیش بڕیاریاندا کە گوێڕایەڵی بکەن، بەڵام (عیص)ی برای بەخۆی و چواردە سوارەوە ڕوو بەڕووی هاتبوون بۆ بەرەنگاربوونەوەی، (یەعقوب)یش (علیه السلام)زۆر لەوە ترسا کە جەنگ دروست ببێ، لەبەر ئەوە زۆر لەخوا پاڕایەوە و پەیمانیدا کەو ئەگەر بە ئاشتی بێتە پێشەوە ئەوا (٥٥٠) سەر مەڕ و ڕەشە وڵاخی پێشکەش بکات، لە هەموو جۆرەکان، فەرمانیشی بە شوان و بەردەستەکانی کرد کە هەر یەکە لەو جۆرانە بەجیا لە ڕەوەیەکدا بەرەوپیری (عیصی) بەرن کە ماوەیەکی دووری لە نێوانیاندا هەبێت، کاتێك (عیص) یەکەم ڕەوەی بینی پرسی تۆ کێیت و ئەمانە هی چییە پێتە ؟ ئەویش دەیگوت: من شوان و بەردەستی یەعقوبم و ئەمانەش خەڵات و دیاری ئەوە بۆ بەڕێز و گەورەمان (عیص)، بەم جۆرە نۆ ڕەوەی هەمە جۆر و دوابەدوا بەرەو (عیص) ڕۆیشتن لەماوەی جیاجیادا، (یەعقوب) (علیه السلام)خۆیشی لەدوای دواوە بەخۆی و دوو

ژن و یازدە کوڕەکەیەوە لەگەڵ خزمەتکارانی بەشەو دەڕۆیشتن و بەرنۆرا خۆیان دەشاردەوە، بەربەیانی ڕۆژی دووەم بوو کە فریشتەیەك لە شێوەی مرۆڤێکدا هاتە لای یەعقوب(علیه السلام)، ئەویش وای زانی کەسێکە و هاتووە بۆ جەنگ، بۆیە ئەویش بۆی دابەزی و فریشتەکەی ماندوو کرد، بەلاّم یەعقوبیش تووشی شەلین بوو، بەربەیان فریشتەکە پێی فەرموو: تۆ ناوت چییە ؟ فەرمووی: یەعقوب، پێی فەرموو: لە ئەمڕۆ بەدواوە بە تۆ دەگوترێت (ئیسرائیل)، (یەعقوب) (علیه السلام)فەرمووی: ئەی تۆ کێیت و ناوت چییە ؟ ئیتر فریشتەکە ڕۆیشت، ئینجا (یەعقوب) (علیه السلام)زانی کە ئەوە یەکێك بووە لە فریشتەکان ، لێرەدا چاوەکانی کردەوە بینی ئەوا (عیصو)ی برای بەخۆی و چوارسەد کەسەوە وەستاوە، (یەعقوب) (علیه السلام)بەرەو ڕوویان ڕۆیشت و حەوت جار کڕنووشی ڕێزی بۆ براکەی برد، ئەم جۆرە کڕنوشە لەو سەردەمەدا مانای سلاّوکردنێکی پڕ لە ڕێز بووە، هەر وەکو چۆن فریشتەکانیش کڕنووشی ڕێزیان بۆ (ئادەم)(ﷺ)، وە براکانی یوسف و باوکیشیان هەر کڕنووشی ڕێزیان بۆ (یوسف) (علیه السلام)دەربڕی .

ئیتر (عیص)ی برای کە چاوی بە (یەعقوب) کەوت هاتە پێشەوە و باوشی پێدا کرد و ماچی کرد و لەخۆشیاندا گریا، پاشان کە (عیص) چاوی کردەوە ئەم هەموو ژن و منداڵەی بە دەوری براکەیەوە بینی، گوتی: ئەمانەت لەکوێ بوون؟ فەرمووی: ئەمانە خوای گەورە پێی داوم، ئەوانیش کڕنووشی ڕێزیان بۆ (عیص) دەربڕی، ئیتر (یەعقوب) (علیه السلام)پاش ئینکاریەکی زۆر توانی قەناعەت بە براکەی بکات تاکو ئەو دیاریانەی لێ وەربگرێت، هەموویان پێکەوە بەرەو قەرەباڵخی و مێگەل و ئاژەڵ و خەڵکە زۆرەوە بەرەو وولاّتی خۆیان ڕوەو شاخی (ساعیر) کەوتنە ڕێ، کاتێك گەیشتنە (ساحور) خانوویەکیان بۆ خۆی دروست کرد لەگەڵ نەوایەك بۆ ئاژەڵەکانی، ئینجا گەیشتنە (ئۆر شەلیم) کە بە گوندی (شەخیم) ناسرابوو، پێش گوندەکە لایاندا و (یەعقوب) کێڵگەی (شەخیم)ی کوڕی (جەمور)ی کڕی بەسەد (کاوڕ)، ئیتر نزرگەیەکی تێدا دروست کرد و پاشان سەربڕگە و قەسابخانەیەکی ئاژەڵیشی تێدا دروست کرد کە ناوی نا (ئیل)، واتا: خانەی خوای ئیسرائیل، مەبەست لەماڵی خوایە، لەو قەسابخانەیەدا ئاژەڵ دەکران بە قوربانی، ئەو شوێنە ئێستا (بیت المقدس)ە کە سولەیمانی کوڕی داود (علیه السلام)دواتر تازەی کردەوە و لە بنەڕەتیشدا ئەو جێگەیەیە کە بۆ یەکەم جار (یەعقوب) (علیه السلام)بەردەکەی کردە سەرین و خەوی لێکەوت، ئەوە بوو بەردەکەی بە ڕۆن چەور کرد تاکو بیناسێتەوە،

ئاوا خوای گەورە خواستەکەی هێنایەدی و جێی بەردە چەورەکەش کرا بە مزگەوتێکی پیرۆز . (راحیل) زگیبوو، کاتێك منداڵەکەی بوو، کوڕ بوو، ناوی لێنا (بنیامین) کە دایکی زۆر بەگران منداڵەکەی لێبوەوە و سەرنجام دایکەکە بەسەر منداڵەوە مرد، (یەعقوب)ی باوکی مناڵەکە، (راحیل)ی دایکی مناڵەکە لە (افراث)ی (بیت لحم) بەخاك سپارد، پاشان بەبەرد گۆڕەکەی هەڵبەست و تائێستاش شوێنەوارەکەی ماوە و پێی دەگوترێ (گۆڕی راحیل)، کوڕەکانی (یەعقوب) (علیه السلام)دوازدە کوڕ بوون .

(یەعقوب) (علیه السلام)هاتە خزمەت (ئیسحاق)ی باوکی و لەگەڵ ئەوەدا لە گوندی (حەبرون) نیشتەجێ بوو، کە لە خاکی (کەنعان)دا بوو، کاتی خۆیشی (ئیبراهیم) (علیه السلام)لەوێدا دەژیا، ئیتر لە تەمەنی سەد و هەشتاساڵیدا (ئیسحاق)ی باوکیان (علیه السلام)بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد و (عیص) و (یەعقوب)ی کوڕی لەلای گۆڕەکەی (ئیبراهیم)ی باوکی لەو ئەشکەوتەدا کە کڕیبووی ئەسپەردەی خاکیان کرد، لەباسی ژیانی (ئیبراهیم) پێغەمبەردا (علیه السلام)دەربارەی ئەو ئەشکەوتە دواوین کە حەزرەتی (ئیبراهیم) (علیه السلام)کڕیبووی .

## ﴿پێغەمبەری خوا حەزرەتی یوسف ( دروود و سەلامی خوای لەسەر بێت )﴾

گەلێك شتی گرنگ لە ماوەی ژیانی (ئیسرائیل) پێغەمبەردا ڕوویانداوە، لەوانەش لەدایك بوونی (یوسف)ی کوڕی (راحیل)(علیه السلام)، بەسەرهاتوو ژیانی ئەم سەروەرەش هێندە پیرۆزە کە خوای گەورە سەراپای یەك سورەتی تەواوی بەناوی (یوسف)ەوە ناردوە بۆ پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) تەنانەت بە باشترین چیرۆك (احسن القصص) ناوی بردووە .

هەروەکو خوای گەورە لە سەرەتای سورەتی (یوسف)دا دەفەرموێت: ﴿الر تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ الْقَصَصِ بِمَا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ هَذَا الْقُرْآنَ وَإِنْ كُنْتَ مِنْ قَبْلِهِ لَمِنَ الْغَافِلِينَ﴾، واتا: (الر) گەلێك واتا و لێکدانەوەی هەیە، هەر وەکو چەند سورەتێکی تریش هەیە بە چەند پیتێك دەست پێئەکەن، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە تەفسیرە کوردیەکان، هەروەها (ابن کثیر)یش لە لێکدانەوەی سەرەتای سورەتی (البقرە)دا هەندێ لێکدانەوەی کردووە، ئینجا خوای گەورە دەفەرموێت: ئەمانە ئایەتەکانی ئەو کتێبەن کە ئاشکرا خوێنە (واتا: قورئان) و ڕێگەی ڕاست و ناڕاستی ڕوون کردۆتەوە، ئێمە قورئانێکی عەرەبی زمانمان بۆ دابەزاندن، بەڵکو ژیرین هەر لەو قورئانەدا باشترین چیرۆکت بۆ باس دەکەین، هەروەکو چۆن ئەو قورئانەمان بە وەحی بۆ ناردویت گەرچی پێشتر لەو قورئان و بەسەرهاتانە بێئاگابوویت.

بە کورتی: لێرەدا خوای گەورە باسی گەورەیی و پیرۆزی قورئان دەکات کە بە زمانێکی ڕەوانی عەرەبی لەژوور ئاسمانەکانەوە بە بەرزترین فریشتەدا ڕەوانە کراوە بۆ سەر پیرۆزترین دروست کراوی خوای گەورەو لە پیرۆزترین خاکی سەر زەویدا، هەروەها لە چەند شوێنێکی تردا خوای گەورە باسی ئەوەی فەرمووە کە قورئان چەندە گەورە و پیرۆزە و گەلێك چیرۆك و ڕووداوی ڕابوردوو باس دەکات و باشترین پەیام و ڕێ نیشاندەرە بۆ مرۆڤ لەبەر ئەوە هەر کەسێك بە رەنگاری بوەستێت ئەوا لە ڕۆژی دواییدا تاوانەکانی لە کۆڵی خۆیەتی و ئەو سزایەشی درێژەی هەیە، هەروەکو لە ئایەتی (٩٩)ی سورەتی (طه)دا دەفەرموێت: ﴿كَذَلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنْبَاءِ مَا قَدْ سَبَقَ وَقَدْ آتَيْنَاكَ مِنْ لَدُنَّا ذِكْراً مَنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُ يَحْمِلُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وِزْراً خَالِدِينَ فِيهِ وَسَاءَ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حِمْلاً﴾، واتا: هەر کەس جگە لەم قورئانە شوێن پەیام و بەرنامەی تر بکەوێت، ئەوا دوچاری ئەو سزایە دەبێتەوە . لە فەرمودەیەکیشدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (هەر کەسێك بیەوێ ڕێنومایی لە شتێکی تری جگە لە قورئان–ئیسلام– وەربگرێت ئەوا خوای گەورە

گومڕانی دەکات) [٣٤]، هەروەها پێشەوا احمد[٣٥] هێناویەتی کە عومەری کوڕی خەتاب کتێبێکی هێنایە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) کە هەندێك شتی (أهل الکتاب)ی تێدابوو بۆ پێغەمبەری خوێندەوە (ﷺ)، دەڵێت: پێغەمبەر تووڕە بو، فەرمووی: (ئەوە خۆت بە خوێندنەوەی ئەوەوە خەریك کردووە ئەی کوڕی خەتاب ؟ سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، پەیامێکم بۆ هێناون کە سپی و بێگەردە شتێك نیە کە ئێوە دەربارەی بپرسن و تیایدا نەبێت لە بە جۆرێك ئەو ڕاستتان پێ ڕابگەیەنێت و ئێوە بە درۆی بکەنەوە، یان پێتان بڵێت فلأنە شت بێسوودە و ئێوە وانەیبینن، دووبارە سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر موسا لەژیاندا بوایە دەبوایە هەر شوێن من بکەوتایە) [٣٦] هەروەها گەلێك فەرموودەی تری لەم بارەیەوە هەیە، هەموویان جەخت لەوە دەکەنەوە کە پەیامی قورئان دواهەمین پەیامی ئاسمانیە و دەبێت مرۆڤ تەنها پابەندی ئەو بێت ئەگەر دەیەوێت بەختەوەری هەردوو دنیا بێت. ئیتر لێرەدا دەچینە خزمەتی چیرۆکی (یوسف) پێغەمبەر (علیه السلام)وەك لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکاندا باس کراوە، خوای گەورە لە سورەتی (یوسف) ئایەتی (٤-٦)دا دەفەرموێت: (یوسف بە باوکی گوت: باوکە من خەوێکم دیوە، لە خەومدا یازدە هەسارە و خۆر و مانگ کڕنووشیان بۆ بردم، باوکی گوتی: ئەم خەوەت بۆ براکانت نەگێڕیتەوە، چونکە فێڵ و تەڵەکەت لێدەکەن، شەیتانیش دوژمنێکی ئاشکرای مرۆڤە، خوای گەورە ڕێزی لێناویت و فێری لێکدانەوەی ڕووداو (خەونی) کردویت و تەواوی ئەو نیعمەتانەی خۆی بەسەر تۆ و خاوخێزانی یەعقوب دا دەڕێژێ، هەروەکو پێشتر بەسەر باوانتیدا ڕشت لە ئیبراهیم و ئیسحاقەوە، پەروەردگارت زانا و کار بەجێیە)، پێشتر باسمان کرد کە (یەعقوب) (علیه السلام)یازدە کوڕی هەبوو، ناوەکانیشیانمان باس کرد، ئەوجا هەر یەکە لەوانە گەلێکیان لێکەوتەوە و هەمووشیان سەر بە (بەنی ئیسرائیل)ن، هەندێ لە زانایان فەرموویانە لەناو ئەوانەدا تەنها (یوسف) (علیه السلام)کراوە بە پێغەمبەر و براکانی دیکەی وەحیان بۆ نەهاتووە، ڕووداوی چیرۆکی (یوسف)یش لە قورئاندا بە ڕووکار ئەو ڕاستیە دەردەخات، بەڵام هەندێکی تر فەرموویانە (اسباط)، واتە: گەلەکانی (بەنی ئیسرائیل) بە گشتی کە چەند پێغەمبەرێکیان بۆ ڕەوانە کراوە، خوای گەورە زاناترە .

---

[٣٤] المسند (٩١/١)، ضعيف: الترمذي (٢٩٠٦)، الدارمي (٣٣٣١-٣٣٣٢) .

[٣٥] حسن بطريقة: المسند (٢٨٧/٣) فيه مجالدين سعيد ضعيف .

[٣٦] حسن: المسند (٢٦٥/٤) .

ڕوون و ئاشکرایە کە (یوسف) (علیه السلام)پێغەمبەری خوایە، بەڵام سەبارەت بە پێغەمبەرایەتی براکانی هیچ بەڵگەیەکی ئەو تۆ لە بەردەستدا نیە، تەنانەت براکانیشی نەیانزانیوە کە دەکرێت بە پێغەمبەر، سا مەگەر دوایی زانیبێتیان .

سەبارەت بە فەرموودەی پێغەمبەرمان (ﷺ) ئەو فەرموودەیە هەیە کە پێشەوا أحمد [٣٧] هێناویەتی کە پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی: (کەریمی کوڕی کەریمی کوڕی کەریمی کوڕی کەریم، یوسف کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم)، ڕاڤەکارانی قورئان و کەسانی تر فەرمویانە: یوسف منداڵ بوو کە لە خەویدا بینی یازدە هەسارە و خۆر و مانگ، واتا: براکانی و دایکی و باوکی کڕنووشی ڕێزیان بۆ برد، کە لە خەو ڕابوو خەونەکەی بۆ باوکی گێڕایەوە ئەویش زانی کە یوسف (علیه السلام)چ پلە و پایەیەکی بەرزی پێدەدرێت، بە جۆرێك کە خەڵکی و باوکی و دایکی پێویستیان بە ئەو دەبێت، لەبەرئەوە بە یوسفی کوڕی ڕاگەیاند کە ئەو خەونە هەر بە نهێنی بهێڵێتەوە و لای براکانی باسی نەکات نەبادا ئیرەیی پێبەرن و چاڵێکی بۆ هەڵکەنن، هەروەکو پێغەمبەرمان فەرمویەتی: (بۆ بەدەست هێنانی پێویستەکانتان هەوڵ بدەن و پشت بە شاردنەوەیان ببەستن، چونکە هەمو خاوەن نیعمەتێك چاوی لەسەرە، واتا: چاوی حەسودان [٣٨] .

پرسیار کرا لە پێغەمبەر (ﷺ) چ کەسێك لە هەمووان زیاتر بەڕێزە ؟ فەرمووی: (یوسف پێغەمبەری خوایە و کوڕی پێغەمبەری خوایە و کوڕی پێغەمبەری خوایە و کوڕی خلیل الله)یە، (ابن جرير) [٣٩] و (ابن ابی حاتم) [٤٠] لە تەفسیرەکەیاندا و (أبو يعلى) [٤١] و (بەزار)یش لە مەسنەدەکانیاندا فەرموودەیەکیان هێناوە کە پیاوێك لە یەهودیەکان کەناوی (بوستانەی یەهودی)بوو هاتە خزمەتی پێغەمبەر و گوتی: ئەی محمد ئەو هەسارانەی کڕنووشیان برد بۆ یوسف ناویان چی بوو ؟ پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ وەستا وەڵامی نەدایەوە، لێرەدا (جبريل) (علیه السلام)دابەزی و ناوەکانی بە پێغەمبەر ڕاگەیاند، ئەو جا پێغەمبەر ناردی بەدوای کابرای یەهودیدا و فەرمووی: ئەگەر ناوەکانت پێبڵێم موسوڵمان دەبیت ؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی:

---

[٣٧] ساخ کردنەوەی فەرموودەکە لە ژیاننامەی ئیبراهیم پێغەمبەردا (ل) باس کراوە .

[٣٨] ضعيف: رواه الطبراني في الكبير ٢٠/٩٤/ح/١٨٣، ابن حبان (٣١٨/١)، البيهقي (٦٦٥٥)، ابن أبي حاتم (٢٢٥٨)، الالباني (١٤٥٣).

[٣٩] ضعيف: ابن جرير (٧/الجزء/١٢/١٥١) تفسير ابن جرير (١١٣٣٢) .

[٤٠] الحافظ ابن حجر في المطالب (٤٠١٥) .

[٤١] كشف الاستار (٣/٢٢٢٠)، الحاكم (٣٩٦/٤) .

(جەریان و طارق و دەییال و ذوالکتفان و قابس و وثاب و عەمودان و فەیلەق و مصبح و ضروح و ذوالفرع و الضیاء والنور)، یەهودیەکە گوتی: ئەریٚ بەخوا ئەوە ناوەکانیان بووە .

﴿لَقَدْ كَانَ فِي يُوسُفَ وإِخْوَتِهِ آيَاتٌ لِلسَّائِلِينَ إِذْ قَالُوا لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَى أَبِينَا مِنَّا وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلالٍ مُبِينٍ اقْتُلُوا يُوسُفَ أَوِ اطْرَحُوهُ أَرْضاً يَخْلُ لَكُمْ وَجْهُ أَبِيكُمْ وَتَكُونُوا مِنْ بَعْدِهِ قَوْماً صَالِحِينَ قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ لا تَقْتُلُوا يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِي غَيَابَتِ الْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ السَّيَّارَةِ إِنْ كُنْتُمْ فَاعِلِينَ﴾ (یوسف/٧-١٠)، واتا: چیرۆکی یوسف و براکانی گەلێك نیشانەی گەورە گەوری تێدایە بۆ کەسانێك لەو بارانەوە پرسیار بکەن، براکانی خۆبەخۆ گوتیان یوسف و براکەی لەلای باوکم لە ئێمە خۆشەویست ترن و ئێمە بەرەیەکی ترین و باوکمان لەم بارەیەوە گومڕاو بێئاگایە، لەکاتێکدا ئێمە زیاتر شایستەی خۆشەویستین تا یوسف و بنیامین، گوتیان یوسف بکوژن یان لەچاوی باوکم ونی بکەن و ڕەوانەی خاکێکی تری بکەن و دوای ئەو ئیتر ئێوەش خۆتان بکەنە گەلێکی باش (لەلای باوکتان) یەکێکیان گوتی: یوسف مەکوژن، بەڵکو لە پەناڕێیەکی کاوانچیەکان دایبنن، بەڵکو ئەوان هەڵی بگرنەوە بۆ خۆیان ئەگەر دەتانەویٚ بەرانبەر یوسف شتێك بکەن ئاوا بکەن.

(مجاهد) دەفەرموێت: (شەمعون)بوو کە گوتی: مەیکوژن، بەڵام (السدی) دەفەرمویٚ: (یەهوذا)بوو وایگوت، بەڵام (قەتادە و محمد کوڕی ئیسحاق) فەرموویانە: ناء (ڕۆبیل)ی برا گەورەیان وای گوت، ئیتر پاش ڕاوێژ لە نێوانیان لەسەر ئەوە پێك هاتن (بابە بۆچی یوسف بە ئێمە ناسپێریت، خۆ ئێمە ئامۆژگاری چاکەی دەکەین، سبەینیٚ لەگەڵماندا بینێرە بۆ دەشت و دەر پێکەوە یاری دەکەین و پارێزگاری دەکەین، باوکیان گوتی: من دەترسم لەگەڵتاندا بینێرم و ئێوەش لێی بیٚ ئاگابن و گورگ بیخوات، گوتیان: جا ئەگەر ئەو گورگ بیخوات مانای دەمێکە ئێمەشی خواردووە و هەمووومان زیانمان پێدەگات، زۆر لە باوکیان پاڕانەوە، تا یوسفی لەگەڵ ناردن، هەر ئەوەندە لەچاوی باوکیان ون بوون کەوتنە سوکایەتی پێکردن و قسە پێگوتن، ئیتر بڕیاریاندا بیخەنە ناو بەردی دۆڵچەی بیرە ئاوێکەوە هەر کە کردیانە ناویەوە، خوای گەورە وەحی بۆ نارد و پێی فەرموو: کە لەو ناڕەحەتیە ڕزگارت دەبێت و فێڵی براکانیشت ئاشکرا دەبێت و ڕۆژێکیش دێت ئەو برایانەت پێویستیان بە تۆ دەبێت، بەڵام جاریٚ ئەوان لەو ئایندەیە بێئاگان، بەڵام (مجاهد) [٤٢] و (قتادە) [٤٣] دەڵێن: واتا: ئەوان

---

[٤٢] صحیح إلیه: رواه ابن جریر (٧/الجزء١٢/١٦١) .

[٤٣] صحیح إلیه: رواه ابن جریر (٧/الجزء١٢/١٦١) .

بێئاگان لەوەی کە خوای گەورە بەو جۆرە وەحی بۆناردووە، هەرچی (ابن عباس)یش [٤٤] دەفەرموێت (وهم لایشعرون)، واتا: کاتێك تۆ هەواڵی ئەم تاوانەیان پێ دەڵێت کە ئەوان هێشتا تۆیان نەناسیوەتەوە .

هەر کە یوسفیان لەو جێیە شاردەوە، کراسەکەشیان لێسەند و بەخوێن هەندێکیان سوور کرد ئیتر دەمەو خەوتنان هاتنەوە لای باوکیان بە گریانەوە تاکو ستەمەکەیان بپۆشن و بیانوو نەخەنە ڕو، گوتیان: بابە ئێمە پێشبڕکێمان دەکرد و یوسفمان لەلای بەرگەکانمان دانابوو، بەڵام چونکە زۆر دوورکەوتبووینەوە هەتا گەڕاینەوە گورگ خواردبووی، ڕەنگە باوەڕیشمان پێنەکەیت و بە درۆزنمان بزانیت، کەچی هەر خۆت بوویت ڕێگەت نەدەدا لەگەڵماندا بینێریت چونکە دەترسایت گورگ بیخوات، (وجاءوا علي قميصه بدم كذب)، واتا: خوێنێکی درۆینەیان بەسەر بەرگەکانی داڕشت، بەڵام ئەوەیان بیر نەبوو کە کراسەکەش بەچەند شوێنێ بدڕێنن وەکو جێگەی کەڵبەی گورگ، بەلای درۆش بیرچوونەوەیە، کاتێك سیناریۆکەیان لای باوکیان نمایش کرد نەیانتوانی دڵی باوکیان بەلای خۆیاندا بهەژێنن، چونکە ئەو هەر لە بنەڕەتدا بە دوژمنایەتی نێوان ئەوانی دەزانی و دەشیزانی کە براکانی چەندە ئێرەیی بە یوسف و بنیامین دەبەن .

لەبەرئەوە (یەعقوب)ی باوکیان (عليه السلام)فەرمووی بەڵکو ئەوە خۆتان ئەو گێچەڵەتان ناوەتەوەو فیتی خۆتانە، ئیتر زۆر بەجوانی ئارامی گرت و گوتی: خوای گەورە ئاگادار و پشتیوانە سەبارەت بەوەی کە ئێوە باسی لێوە دەکەن، وە دەزانێت کە ئێوە درۆ دەکەن .

(أهل الكتاب) دەڵێن: (ڕۆبیل)ی برا گەورەیان ئاماژەی پێدان کە یوسف بخەنە ناو دۆڵچەکەوە، لێی بێئاگابوون و فرۆشتیان بەو کاروانیانەی لەوێوە هاتن، کاتێك دەمە و ئێوارە (ڕۆبیل) هاتەوە تاکو لە دۆڵچەکەدا یوسف دەربهێنێتەوە، بەڵام نەیدۆزیەوە، ئیتر کەوتە هاوار و گریان و کراسەکەی لەبەر خۆی دادڕی، ئەوانی دیکەش ئەو کراسەیان هێنا و کارێکیان بەسەریا سەربڕی و خوێناویان کرد، (یەعقوب) (عليه السلام)بەوە خەڵەتا و باوەڕی کرد و چەندین ڕۆژ گریا، بەڵام هەر ئەو بۆچوونە گەلێك هەڵەی تێدایە .

(یوسف) (عليه السلام)خرایە دۆڵچەی بیرەکەوە، تیایدا دانیشت و چاوەڕوانی سۆز و بەزەیی پەروەردگاری دەکرد تاکو دەربازی بکات، ئیتر کاروانێك لەوێوە هاتن، (أهل الكتاب)

---

[٤٤] موضوع: رواه ابن أبي حاتم (١١٣٨١) کە (كنانە)ی کوڕی (جبلە) لە (سند)ەکەیدا ناوی هاتووە و ئەو پیاوەش بە درۆزن تاوانبار کراوە .

دەڵێن: بارەکەیان بستە و سنەوبەر و قەزوان بوو لە شامەوە بەرەو (میصر) دەڕۆیشتن، چەند کەسێکیان نارد تا لەو بیرە ئاویان بۆ هەڵبگوازن، کە دۆڵچەکەیان داهێشت، یوسف خۆی پێوە هەڵواسی، کە هێنایانە دەرەوە پیاوێکیان بینی هاواری کرد: مژدەبێ . . مژدەبێ (ئەوە منداڵێکە) وایزانی لەگەڵ پێڕی خۆیانە، بەڵام خۆ خوا دەزانێت کە براکانی چ فێڵێکیان کردووە و ئەوانەی دۆزیویشیانەتەوە چەندە دڵخۆشن، ئەم شتانە نەخشەی کارجوانی خودا تێك نادەن، ئەوا چووزانن کە ئەو دیلە دۆزراوە ناسکەڵەیە دەبێتە مایەی چ خێر و بێرێکی گەورە بۆ خەڵکی (میصر) و چۆن گەورەترین کێشەیان لەداهاتوودا بۆ چارەسەر دەکات کە براکانی زانیان ئەو کاروانیانە یوسفیان هەڵگرتوەتەوە، وە دوایان کەوتن و پێیان گوتن کە ئەو منداڵە هی ئێمەیە ولێمان بەجێ ماوە بە پارەیەکی کەم بە ئەوانیان فرۆشت (دراهم معدودە)، (ابن مسعود) [45] و (ابن عباس)[46]، (نوف البکالی) [47] و (السدی) [48] و (قتادە) [49] و (عطیة العوق) [50] دەڵێن: براکانی یوسفیان فرۆشت بە بیست پەنجایی و دوو . . دوو لەنێوان خۆیاندا بەشیان کرد، بەڵام (مجاهد) [51] دەڵێت: بە بیست و دوو پەنجایی فرۆشتیان، (عکرمە) و (محمدی کوڕی ئیسحاق)یش [52] دەڵێن: بەچل پەنجایی فرۆشتیان، خوای گەورە باشتر دەزانێت .

﴿وَقَالَ الَّذِي اشْتَرَاهُ مِن مِّصْرَ لِامْرَأَتِهِ أَكْرِمِي مَثْوَاهُ﴾ (یوسف –٢)، واتا –ئەو کەسەی بۆ دواجار لەمیسر یوسفی کڕی، بەژنەکەی خۆی گوت، چاك ڕێزی ئەم منداڵە بگرە و چاودێری بکە (لەوانە یە سوودمان پێ بگەیەنێت، یان دەیکەین بەکوڕی خۆمان)، گوتراوە ئەوکەسەی کە کڕیویەتی (عەزیز)ی میسر بووە، واتا وەزیری نگەنجینەکان بووە، (ابن اسحاق)دەڵێت: ئەو وەزیرە ناوی (ئیطفیري کوڕی ڕوحەیب)بوە، پاشای میصریش لەو سەردەمەدا

---

[45] منقطع: رواه ابن جرير (٧/١٢/١٧٢-١٧٣) .

[46] ضعيف إليه: رواه ابن جرير (٧/الجزء١٢/١٦١) .

[47] صحيح إليه: رواه ابن جرير (٧/الجزء١٢/١٦١) .

[48] فيه ضعيف إليه: رواه ابن جرير (٧/الجزء١٢/١٦١) .

[49] صحيح إليه: رواه ابن جرير (٧/الجزء١٢/١٦١) .

[50] فيه ضعيف إليه: رواه ابن جرير (٧/الجزء١٢/١٦١) .

[51] صحيح إليه: رواه ابن جرير (٧/الجزء١٢/١٦١) .

[52] ضعيف إليه: رواه ابن جرير (٧/الجزء١٢/١٦١) .

(ڕەیانی کوڕی وەلید) بووە کە پیاوێکی عەمالیقەیی بووە، وتراوە ژنەکەی وەزیر ناوی (ڕاعیل)ە کچی (ڕماییل)بوە، هی تریش وتویانە ناوی (زولەیخا)بوە، بەڵام وادیارە (زولەیخا)نازناوی بوە، وتراوە: ناوی (فەکای کچی یەنوس)بوە، هەروەکو ثەعلەبی لە ئیبن هشامی رفاعییەوە دەگێڕێتەوە .

(محمدی کوڕی ئیسحاق)[٥٣] دەڵێت: ئەو کەسەی بۆ یەکەم جار یوسفی کڕی لەبراکانی و هێنای بۆ میصر ناوی (مالك)ی کوڕی (زەعر)ی کوڕی (نوەیت)ی کوڕی (عەفقا)ی کوڕی (میدیان)ی کوڕی (ابراهیم)ە، خوای گەورە باشتر دەزانێت .

(ابو اسحاق)[٥٤] دەڵێت: ئەویش لە ابی عوبەیدەوە ئەویش لە (ابن مسعود)ەوە: باشترین سوارچاك لەناو خەڵکیدا سێ کەسن: عەزیزی میسر، کەبەژنەکەی خۆی گوت: ڕێزی ئەم منداڵە بگرە، ئەو کچەی کە دەربارەی موسا (علیه السلام)بەباوکی گوت: ﴿قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ﴾[٥٥]، وە ئەبو بکری صدیق کەعومەری کوڕی خەتابی کردە خەلیفەی دوای خۆی . ووتراوە: یوسف (علیه السلام)بەبیست دینار فرۆشراوە،یان بەرانبەر کێشی خۆی (میسك)یان ئاوریشم، یان ...یان ...بەڵام خوای گەورە خۆی دەزانێت .

بەو جۆرە هەر لەمنداڵیەوە خوای گەورە، چەند بەهرەو نیعمەتێکی تایبەتی بە (یوسف) (علیه السلام)بەخشیوە، ئەوەتا وەزیرێك و ژنەکەی دەبنە مایەی بەخێو کردن و چاودێری کردنی لەماڵی خۆیاندا، توانایەکی باشی پێدراوە کە لەوتەو وتار بەچاکی تێ بگات و لێکی بداتەوە، بەهرەی لێکدانەوەی خەونی پێ بەخشیوە، لەگەڵ گەلێك شتی تردا کە پاشان بۆمان دەردەکەوێت . ﴿وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ (یوسف – ٢١)، واتا: خوای گەورە زاڵە بەسەرکارو خواستی خۆیدا ﴿وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ بەڵام زۆربەی خەڵکی بەوە نازانن، ئینجا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ آتَيْنَاهُ حُكْماً وَعِلْماً وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ (یوسف – ٢٢)، واتا: کاتێك پێگەیشت حوکم و زانیاریمان پێ بەخش، ئاوا پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە .

---

[٥٣] ضعيف جداً: رواه ابن جرير (٧ / ١٢ / ١٧٥ ) .

[٥٤] صحيح عنه: رواه ابن جرير (٧/١٢/ ١٧٦)، حاكم (٣ / ٩٠ )، ابن جرير (٧/ ١٢ / ١٧٥)، حاكم (٢/٣٤٥)، الطبراني في الكبير (٨٨٢٩)، الطبراني (٨٨٣٠).

[٥٥] سورەتی (القصص، ئایەتی ك(٢٦)، واتا: باوکە بەکرێی بگرە بۆ کارکردن. چونکە باشترین کەسە کە بەهێز و ئەمینە.

ئەم ئایەتە بەرزە نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە هەموو ڕووداوەکان تائێرە کەڕووبانداوە، هێشتا یوسف منداڵ بوە، بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن (حد الرشد) بریتیە لەتەمەنی (چل) ساڵی و زۆربەی پێغەمبەران (علیه السلام)لەوسنورە وەحیان بۆ هاتووە، ڕاڤەکان ڕاو بۆچوونی جیاوازیان هەیە دەربارەی ئەوتەمەنەی کە یوسف تیایدا پێگەیشتوە، (مالك) [٥٦] و (ربیعه)[٥٧]و (زەیدی کوڕی ئەسلەم)[٥٨]و (الشّعبی)[٥٩] دەڵێت: هەرکە هاوتەمەنی باڵق بونی ئاسایی بوە، (سعدی کوڕی جوبەیر)[٦٠] دەڵێت: هەژدە ساڵ بوە، (ضحاك)[٦١]دەڵێت: بیست ساڵ بوە، (عکرمه)[٦٢] دەڵێت: بیست و پێنج ساڵ بوە، (سودەی)[٦٣]دەڵێت: سی ساڵ بوە هەروەها (ابن عباس)و (مجاهد)[٦٤]و (قتادە)[٦٥] دەڵێت: سی و سێساڵ بوە، (الحسن)[٦٦] دەڵێت: چل ساڵ بووە، خوای گەورەش لەهەموویان زاناترەو دەفەرموێت: ﴿حَتَّى إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ﴾ (الأحقاق – ١٥)، واتا: تاکو بەتەواوەتی پێگەیشت و تەمەنی گەیشتە چل ساڵ .

پاشان خوای گەورە، لەسورەتی (یوسف)ئایەتی(٢٣ – ٢٩)٨باسی ئەو بارە تاقیکردنەوە سەختە دەفەرموێت کە چۆن ژنەکەی وەزیر بەو هەموو دەست ڕۆیشتنەی خۆیەوە داوای شتێك لەیوسف دەکات کەزۆر دوورە لەڕێزو شکۆی یوسفەوە س. خ، لەکاتێکدا ئەوژنە لەوپەڕی جوانی و دەسەڵات و لاوێتی و دەوڵەمەندی دابوە، دەرگاکانی لەسەر یوسف و خۆی داخستوە و داوای کاری خراپی لەیوسف کردوە . (ابن اسحاق)دەڵێت: ژنەکەی وەزیر خوشکەزای (ڕەیان)بوە کەپاشای (میصر)بوە.وێڕای ئەمانەش(یوسف) (علیه السلام)خۆیشی تابلۆی جوان و ڕووشیرین و لاوبوە، بەڵام لەباوباپیریانەوە پێغەمبەربون،

---

٥٦ صحیح الی مالك: رواه ابن ابی حاتم (١١٤٤٧)

٥٧ حسن الیه: نفس المصدر (١١٤٤٦)

٥٨ ضعیف الیه: نفس المصدر

٥٩ ضعیف الیه: نفس المصدر (١١٤٤٨)

٦٠ ضعیف الیه، نمفس المصدر (١١٤٥٠)

٦١ ضعیف الیه: ابن جریر (٧/ ١٢ / ١٧٧)

٦٢ فیه ضعف الیه، رواه ابن ابي حاتم في تفسیره (١١٤٤٥)

٦٣ حسن الیه: ابن ابي حاتم (١١٤٤٩)

٦٤ صحیح الیه :

٦٥ (ابن ابی حاتم)باس کردوه بەڵام هیچ (اسناد)ێکی بۆ نەهێناوە .

٦٦ کەسانی متمانەدار: ابن ابي حاتم (١١٤٤٤)

لەبەرئەوە خوای گەورە کاری تایبەتی پێی هەیەو دەیپارێزێت لەو ناپاکی و داوێن پیسییەی کەژنی وەزیری ولات دەیەوێت تێوەی بگلێنێ

بەڵێ (یوسف) (علیه السلام)گەورەی حەوت کەسە پارێزکارەکانە کەناویان لەفەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتوە کە لەخوای گەورەوە وەری گرتوەو دەفەرموێت: [٦٧] (حەوت کەس خوای گەورە دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە لەرۆژێکدا جگە لەلای خودا لەهیچ شوێنی سێبەر نامێنێ، پێشەوایەکی دادپەروەر،کەسێك چاوەکانی پڕ فرمێسك بێت لەیادی خوادا، کەسێك دڵی وابەستەی مزگەوتەکان بێت کەلێوەی دەردەچێ تابۆی دەگەرێتەوە، ئەودوو کەسەی لەبەر خاتری خودا یەکەتریان خۆش دەوێ و لەسەر ئەو خۆشەویستییە کۆدەبنەوە یان لێك جیادەبنەوە، ئەو کەسەی بەدەستی ڕاستی خێر دەکات و ناهێڵێ دەستی چەپی پێی بزانێت، ئەو لاوەی لەخوا پەرستیدا گەشەی کردبێت، ئەو پیاوەی ژنێکی جوانی دەست ڕۆیشتوو بۆ خراپەکاری بانگی بکات، بەڵام ئەو ڕەتی بکاتەوەو بڵێت: من لەخوا دەترسم)،پاش داواکـاریەکەی ژنە وەزیر، یوسف (علیه السلام)فـەرمووی: ﴿قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ إِنَّهُ رَبِّي﴾ پەنــا بەخوا، پیاوەکەی تۆ پەروەردەی منی کردوەو زۆر ڕێزی لێ گرتووم – (احسن مثواي) ئیتر من چۆن ناپاکی بەرانبەر دەکەم و بەدنەمەك دەبم ؟ ﴿إِنَّهُ لا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ﴾ هەرگیز ئەو ستەمکارانی خۆش ناوێت، یان خوای گەورە ستەمکاران سەرکەوتووناکات .

بەڵێ چەندین قسەی جۆراو جۆری (اهل الكتاب)لەم بارانەوە کراوەو گوتراوە، بەڵام ڕاستیەکەیان ئەوەیە کە خوای گەورە خۆی لەقورئاندا ڕوونی کردوەتەوەو دەری دەخات کە هەرخۆی (یوسف)ی پاراستوەو پاك گرتویەتی و لەخراپە لایداوە و شایەتی بۆ دەدات کەلەبەرزە دڵسۆزەکانە، وەکو فەرمویەتی: ﴿كَذَلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاءَ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ﴾ (یوسف– ٢٤)، ژنی وەزیر دەرگاکانی داخستبوو، بەڵام یوسف U بەوەی نەزانیبوو، ڕای کرد بەرەودەرگاکە، ژنەکەش بەدوایدا ڕایکرد (وأستبقا الباب): بەرەو دەرگا کە پێشبڕکێیان کرد (وَألفيا): بینییان (سیدها): گەورەی ژنەکە، واتامێردەکەی (لدي الباب): لەدەرگاکەدا ﴿قالت ماجزاء من اراد بأهلك سوءً الاّ ان يُسجن أو عذاب اليم﴾ واتا: ژنەکە گوتی بەمێردەکەی سزای ئەو کەسە چییە کە بیەوێت بەرانبەر ژن و منداڵت خراپە بکات، مەگەر بەندکردن یان سزایەکی توند نەبێت ؟ لێرەدا ژنەکە پێش دەستی کردو سکاڵای درۆینەی کرد،

---

[٦٧] متفق عليه: البخاري (٦٦٠)، مسلم (٢٣٧٧)

**نەبادا (یوسف) (علیە السلام)پێش بکەوێت و شکات بکات . ئەم تاوانە گەورەیەی دایە پاڵ یوسف(علیە السلام)، ئیتر (یوسف)یش (علیە السلام)بەناچاری و بەشەرمەوە فەرمووی: ئەو منی خستوەتە پەرەی دڵی خۆیەوەو وازم لێ ناهێنێ . ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِنْ أَهْلِهَا﴾، واتا: یەکێك لەکەسە نزیکەکانی یان خێزانی ژنەکە هاتە قسەو شایەتی داو پشتیوانی ڕاستگۆیی خۆی بۆ یوسف – س. خ دەربڕی (ابن عباس)[٦٨] دەفەرموێت: (منداڵێك لەبێشکەدا بوو هاتە قسەو شایەتی پاکانەی (یوسف)ی کرد . (ابو هریرە)[٦٩] و (هلال)ی کوڕی (یساف)[٧٠] و (حسن البصری)[٧١] و (سعیدی کوڕی)[٧٢] و (ضُحاك)[٧٣] و (ابن جریر)یش هەڵی بژاردوە کە لە (ابن عباس)ەوە [٧٤] دەگێڕێتەوە کە ئەو کەسەی شایەتیەکەی داوە پیاوێکی خزمی ژنەکە بوە، ئەوانەی دەڵێن پیاوێك بوە شایەتیەکەی داوە ئەمانەن: (ابن عباس)[٧٥] و (عکرمە)[٧٦] و (مجاهد)[٧٧] و (حسن)[٧٨] و (قتادە)[٧٩]و (السدی)[٨٠]و (محمد ابن اسحاق)[٨١]و (زەیدی کوڕی نەسلەم)[٨٢] گوتراوە ئەو شایەتە شایەتی بەو جۆرە داوە کەخوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بۆ پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) باسی کردوەو فەرمویەتی: ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِنْ أَهْلِهَا إِنْ كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِنْ قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ الْكَاذِبِينَ وَإِنْ كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِنْ دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِنَ الصَّادِقِينَ فَلَمَّا رَأَى قَمِيصَهُ قُدَّ مِنْ دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُ مِنْ كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ﴾ (یوسف/٢٦– ٢٨) .**

---

[٦٨] فيه ضعف: ابن جرير (٧ / ١٢ / ١٩٣ )

[٦٩] ضعيف: ابن جرير (٧ / ١٢ / ١٩٣ )

[٧٠] فيه ضعف: ابن جرير (٧ / ١٢/ ١٩٤ )

[٧١] ابن ابی حاتم باسی کردووە (سند)ەکەی نەهێناوە .

[٧٢] صحيح اليه غبن جرير (٧ / ١٢/ ١٩٣ )

[٧٣] ضعيف ابن جرير (٧ / ١٢/ ١٩٣)

[٧٤] رواه ابن جرير: (٧ / ١٢/ ١٩٣ ) الحاكم (٤ / ٤٩٧)

[٧٥] پێشتر باسمان کردوە

[٧٦] صحيح اليه: ابن جرير (٧ / ١٢/ ١٩٤ )

[٧٧] صحيح اليه: ابن جرير ( ٧ / ١٢ / ١٩٤)

[٧٨] صحيح اليه: ابن جرير (٧ / ١٢/ ١٩٤ )، ابن ابي حاتم (١١٥٠٨)

[٧٩] صحيح اليه: ابن جرير (٧ / ١٢/ ١٩٤ )ابن ابي حاتم (١١٥٠٧)

[٨٠] فيه ضعف: ابن جرير (٧ / ١٩٤/١٢ )

[٨١] فيه ضعف: ابن جرير (٧ / ١٢ /١٩٤ )

[٨٢] اسناده ضعيف: ابن ابي حاتم (١١٥١٠)

واتا: ئەگەر کراسەکەی یوسف لەپێشەوە هەڵدرابێ ئەوا ژنەکە ڕاست دەکات و یوسف لەدرۆزنانە – بەڵام ئەگەر کراسەکەی لەدواوە هەڵدڕابوو یان شوێنەواری دیار بو – ئەوا ژنەکە درۆدەکات و یوسف لەڕاستگۆیانە، کاتێك تەماشای کرد کراسەکەی لەدواوە دڕابوو، گوتی بەژنەکە: ئەمە لەفێڵ و تەڵەکەی ئێوەی ژنە، بەڕاستی فێڵەکانتان گەورەن، ئایا تۆ خۆتی پەلاماری یوسفت داوە، کەچی هێشتا تاوانباریشی دەکەیت، ئنجا ڕووی کردە یوسف و گوتی: ﴿يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا﴾ (یوسف– ٢٩)، واتا: ئەی یوسف ئەم ڕووداوە بپۆشە و لای کەس باسی مەکە، چونکە مرۆڤ کەتاوانی کردو پاشان لەنێوان خۆی و خوادا تەوبەیەکی ڕاستەقینەی کرد،. ئەوا خوای گەورە لێبوردەیە، خەڵکی (میصر) یش گەرچی بت پەرست بوون، بەڵام بڕوایان وابوە کە تەنها خوای گەورە لەتاوان دەبورێت و هەر ئەویش هیچ هاوەڵێکی نیە، خۆ ئەو جۆرە کارانەش شورەیی مرۆڤ ناهێڵێن، بەتایبەتیش لەخێزان و تیرەی وەزیرو پاشایاندا، بەژنەکەیشی گوت: داوای لێبوردن بکە، تۆ هەڵەیت، ژنانی شارو کچانی خانەوادەی وەزیران کەوتنە تەشەر لێدان لەژنی وەزیر و گاڵتەیان پێ دەکرد کە چۆن بەوکارە دزێوە هەستاوە لەگەڵ غولامی خۆیدا، وە بەو جۆرە شەیدای بوە، لەکاتێکدا لەئاستی ئەودا نیە، بۆیە گوتیان: ئێمە ژنی وەزیر لە گومڕاییەکی گەورەدا دەبینین، کاتێك ژنی عەزیز بەوەی زانی، ویستی ئاڵۆزی دەنگ و باسەکە کەم بکاتەوە، بیانویەك دروست بکات کەئەگەر هەرژنێکی تریش بێت لەجیاتی ئەو، هەر هەمان کاری دەکرد، چونکە یوسف جوانێکی بێ هاوتایە و کەسێکی ئاسایی نیە، هات داوەتێکی فراوانی بۆ ژنان ساز کرد لەماڵی خۆیدا، خۆراکی وای هێنایە پێشەوە کە چەقۆی پێویست بێت، وەکو میوە، هەریەکەشیان چەقۆیەکی لەبن دەست دابوو، (یوسف)یشی گۆڕیبوو بەجوانترین بەرگەوە کەلەهەرەتی لاویدا بوو، ئیتر فرمانی بەیوسف (علیه السلام)کرد کەلەو بارە و بەو بەرگ و باڵاجوانەوە سەرێك لەمیوانەکان بدات، وەك مانگی چواردەی دەرکەوت،﴿فَلَمَّا رَأَيْنَهُ أَكْبَرْنَهُ﴾واتا:کاتێك دیتیان بەشێوەیەکی خۆنەکردانە کەوتنە بەگەورە ناوبردن بەسەرا گوتن و لێوردبوونەوەی؛دەیانگوت هەرگیز باوەڕ ناکەین ئەوە مرۆڤ بێ، بگرە ئەوە فریشتەیە، بەوجۆرە هێندە سەرقاڵی تەماشاکردنی بون، تەنانەت بەچەقۆکانی دەستیان، دەستی خۆیان دەبڕی، بەڵام بەخۆیان نەدەزانی و هەستیان نەدەکرد، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَقُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَا إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ﴾ واتا:

**ژنەکان گوتیان: نەخێر . هەرگیز ئەوە مرۆڤ نیە، ئەوە فریشتەیەکی بەڕێزە لەفەرمایشتی (الأسرار)[٨٣]ی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتوە کە فەرمویەتی: (بەلای یوسف دا ڕۆیشتم، کەئەو نیوەی جوانی پێ درابوو)، واتا: یەکەم جوان لەسەرزەویدا (ئادەم)بوە** (علیه السلام) **دوای ئەو (یوسف)** (علیه السلام) **لەبەرئەوە بەهەشتیەکان بەهەمان جوانی و بالای ئادەمەوە دەچنە بەهەشتەوە، هەروەها یەکم ژنی جوان لەسەر زەوی دا (دایکە حەوا)بووە، پاشان (سارە)ی ژنی ئیبراهیم پێغەمبەر** (علیه السلام).

**(ابن مسعود)[٨٤] دەفەرموێت: ڕووی یوسف وەکو هەورە بروسکە ڕووناك، هەر کات بۆ کارێکی پێویست ژنێك بهاتایەتە خزمەتی ئەوا یوسف** (علیه السلام)**دەموچاوی خۆی دادەپۆشی، تەنانەت بەزۆری دەموچاو داپۆشراوبو، هەربۆیە ژنەکانی شار بەژنی عەزیزیان گوتبوو: چۆن ژنە وەزیر حەز لە غولامێك دەکات ؟! چونکە نەیانبینیبوو،بەلام کاتێك بەفرمانی ژنەوەزیر، ڕووپۆشەکەی لەسەر لاداو نیشانی ژنەکانی دا، هەموویان دەست و پەنجەی خۆیان کۆلەوار کرد، ژنی وەزیر ئەمجا کەوتە مەدح کردنی داوێن پاکی یوسف و گوتی: ﴿قَالَتْ فَذَلِكُنَّ الَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِ وَلَقَدْ رَاوَدْتُهُ عَنْ نَفْسِهِ فَاسْتَعْصَمَ﴾ (یوسف:٣٢)، واتا :ئەمەیە ئەو کەسەی کەئێوە لۆمەو سەرزەنشتی منی لەسەر دەکەن، من دلم پیایداچووبو، بەلام ئەو بەرپەرچی دامەوە . ئیتر بڕیاری دا بەندی بکات، (یوسف)** (علیه السلام)**لێرەدا ڕووی کردە پەروەردگارو پاڕایەوە و فەرمووی: ﴿قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُنْ مِنَ الْجَاهِلِينَ﴾ (یوسف:٣٣)، واتا: ئەگەر خۆم دەکەیتە سەرپشك ئەوا بەندیخانەم پێ خۆشترە لەوەی کە وەلامی داخوازی وابدەمەوە – کەئەو ژنە دەیەوێ تووشم بکات – خۆئەگەر تۆ ئەو بەلایەم لەکۆل نەکەیتەوە، ئەوا گیرۆدەی داوی ئەو ژنە خراپکارانە دەبم و دەچمە ڕیزی نەزانانەوە . ، بەکورتی لێرەدا یوسف** (علیه السلام)**بێدەسەلاتی خۆی نیشان دەدات و داوای یارمەتی لەخوای گەورە دەکات تاکو فریای بکەوێت، خوای گەورەش نزاکەی وەرگرت، وەك دەفەرموێت: ﴿فَاسْتَجَابَ لَهُ رَبُّهُ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ واتا: خوای گەورە وەلامی نزاکەی دایەوەو لەفرت و فێلی ئەو ژنە لایدان بەڕاستی ئەو خوایە بیسەرو زانایە، بەدلنیاییەوە هەرکەسێك ئەگەر بەلای ئاوا یەخەی پێ بگرێت و ئەو کەسەش بەڕاستی**

---

[٨٣] لەکۆتایی ژیانی ئادەمدا (علیه السلام) ئەم فەرمودەیە ساخ کراوەتەوە .

[٨٤] فیه الضعف، رواه الطبراني في الكبير (٨٥٥٧)

لەپەروەردگاری میهرەبان بپارێتەوە، ڕزگاری دەکات ودەیخاتە ڕیزی حەوت کەسەکەی ژێر سێبەری تایبەتی لە ڕۆژی دواییدا . خوای گەورە لەسورەتی (یوسف)، لەئایەتی (٣٤- ٤١) دا باسی شتێکی نوێ لەژیانی (یوسف) (علیه السلام) ڕوون دەکاتەوە، ئەویش بەم جۆرە: کاتێك عەزیزی میصرو ژنەکەی بۆیان دەرکەوت کە (یوسف) (علیه السلام) پاك و داوێن پاکە، بەڵام قسەو باسەکەشی بەناو خەڵکدا بڵاوبوەتەوە،وایان بەباش زانی کە ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت پێویستە (یوسف) (علیه السلام)بخرێتە بەندیخانەوە، لەبەرئەوە ستەمکارانە لەبەندیخانەیان قایم کرد، هەڵبەت ئەوەشیان خوای گەورە لەچارەی نووسیبوو، لەلایەکی ترەوە هەربەدەستی خۆیان لەوخێزانەیان دورخستەوە کەبارێکی دەروونی ناڕەحەتی بۆ یوسف دروست کردبوو، هەروەکو پێشەوا شافعی دەفەرموێت: لەبەر ئاکي خۆی باش وایە دەرنەکەوێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَدَخَلَ مَعَهُ السِّجْنَ فَتَيَانِ﴾ (یوسف:٣٦)، واتا هاوکات لەگەڵ ئەو دوو کوڕی لاو خرانە بەندیخانەوە، گوتراوە: یەکیان مەی گێڕ، یان مەی گوشی پاشابوەو ناوی (نبوا)بوەو ئەوی تریان نانەوا یان کارمەندی چێشتخانەی پاشابوەو و ناوی (مجلث)بوە، بەچەند شتێك تاوانبار کرابون، لەبەرئەوە خرانە بەندیخانەوە، کە(یوسف) یان ناسی (علیه السلام)بەگفتارو کرداری جوان و خواپەرستیەکەی ئاشنابون، کردیانە جێگەی متمانەی خۆیان، هەریەکە لەو دووانە خەونێکی گوجاویان بەخۆیانەوە دی، ڕاڤەکاران دەڵێن: هەردوکیان لەیەك شەودا خەونیان دی مەی گوشەکە لەخەویا سێ گورزە گوشی بینی کەبەرچنە ترێ یەکی پڕ لەهێشووی پێوە بوو، هێنای و گوشی و کردیە ناو پێکی پاشاوە، نانەواکەش سێ بەرچنە نانی لەسەرسەربوو، باڵندەکان دەهاتن لەبەرچنەی سەرەوەیاندا نانیان دەخوارد، دولاوەکە، داوایانکرد کە (یوسف)ﷺ مانای خەونەکانیان بۆ لێك بداتەوە، پێیان گوت: ﴿إِنَّا نَرَاكَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾، واتا: ئێمە تۆ بەکەسێك لەچاکەکاران دەزانین، لێرەدا (یوسف)ﷺ ڕاستگۆیانە بەبێ خۆ هەڵکێشان متمانەی پێدان کە خوای گەورە توانای ئەوەی پێ داوە کەخەون ڕاڤەبکات، تەنانەت تێیگەیاندن کە ئەو دەزانێت چ خواردنێکیان بۆ دێت، بەرلەوەی هێشتا بۆشیان هاتبێت، ﴿قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِ قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَكُمَا﴾ (یوسف-٣٧) . وتراوە: مەبەست لەوەیە کە فەرمویەتی: خەونەکانتان هەرچۆنێك بێت وەکو خۆی بۆتان لێك دەدەمەوەو چۆنیشتان پێ دەڵێم، ئاوا دەبێت . وتراوە: مەبەست لەوەیە کە بەرلەوەی خواردنەکەتان بۆ بێت من پێتان دەڵێم تامەکەی شیرینە، یان ترشە یان . . هتد، هەروەکو چۆن (عیسا) (علیه السلام) بەگەلەکەی دەفەرموو:﴿وَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ﴾

(ال عمران/٤٩)، واتا پێتان دەڵێم کەچی دەخۆن و چیشتان لەماڵەکانتاندا خەزن کردوە، وەپێی گوتن کەخوای گەورە تەو بەهرەیەی پێ بەخشیوە و چونکە کەسێکی خواپەرستەو دورە لەبت پەرستیو لەباوك و باپیرانیشیەوە هەرئاوا پاك و خواناس بون و هەرگیز ناکرێت ئێمە جگە لەخوا شتی تر بپەرستین، ئەوەش گەوەرییەکە کەخوای گەورە بەئێمەی بەخشیوە و خەڵکیش دەبێت ئەوەمان لێ وەربگرن کەلە نەژادی هەمووماندا هەیە، بەڵام زۆربەی خەڵکی لەبەرانبەر ئەو بەخشیشە گەورەیە سوپاسگوزار نین، پاشان بانگی کردن بۆ ڕێگەی خوا پەرستی گو دوورکەوتنەوە لەبت پەرستی و ئەو داخوازیەی ئەوان هەیانبوو سەبارەت بەمانای خەونەکەیان بچووکی کردەوە بەبەراورد لەگەڵ گەورەیی یەکتاپەرستی و خواناسیدا، کەپڕاوپڕی هەردو دنیایە فەرمووی: ﴿يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللَّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ مَا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِهِ إِلَّا أَسْمَاءً سَمَّيْتُمُوهَا أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِهَا مِنْ سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ (یوسف: ٣٩-٤٠) واتا: ئەی هاوەڵەکەی بەندیخانەم، ئایا فرە پەروەردگاری هەمەجۆر باشترە، یان خوای تاك و تۆڵەگر ؟ ئێوە هەرچی شتێك جگە لەو پەروەردگارە بپەرستن چەند ناوگەلێکە خۆتان و باوانتان داتانتاشیون و خوای گەورە هیچ دەسەڵاتێکی بۆ ئەوانە دانەبەزاندوەو بڕیارو حوکمداری هەر بۆ خوایە .

لێرەدا یوسف (علیه السلام) دەیەوێت مەسەلەی بەندیخانەو بگرە ژیانی دنیاش بەگشتی نەبێتە ئامانجی یەکەمی ئەو خەڵکە، بەڵکو ژینی ڕاستەقینە لەدوای ژیانی دنیاوە دەست پێدەکات و ئەویش بەندە بە یەك خوا پەرستی یەوە، ئەو خودایە هەرخۆی فرمانی داوەکە جگە لەئەو هیچ پەروەردگارێکی دیکە نەپەرسترێت و ئەوەش ڕاستە شەقامی سەرفرازی یەو ئاینی ڕاستەقینەیە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەو ڕاستیە نازانن، یان خۆیان لێ هەڵەدەکەن. ئەودووکەسەی لەگەڵیدا بەندکرابوون، سەرەتا دڵنیا بون لەوەی کە یوسف (علیه السلام)پیاوێکی شایستە و ڕاستگۆیە،کەواتە بوەتە جێگەی متمانەیان، هەربۆیە لەزوربەی کاروبارەکانیاندا، تەنانەت لەلێکدانەوەی خەونەکانیشیاندا هەر ڕاوێژ بەئەو دەکەن، (یوسف) (علیه السلام)دەزانێت ئەوبارە زۆرشیاوە بۆ ئەوەی پەیامی خواپەرستیانپێ ڕابگەیەنێت . چونکە لەو بارانەدا مرۆڤ زۆر گوێڕایەڵی دڵسۆزەکانیەتی، پاش ئەو ئاراستەکردن و ڕوونکردنەوەو ڕابەرایەتی کردن و ڕێنیشاندانە مەزنە، ئینجا دێتە سەر جێ بەجێکردنی داخوازیەکانیان و بەبێ گرێ و پێچ و پەنا زۆر بەڕاشکاوی مانای خەونەکانیان پێ دەڵێت و دەفەرموێت: ﴿يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَمَّا أَحَدُكُمَا فَيَسْقِي رَبَّهُ خَمْرًا﴾ (یوسف-٤١)، واتا: ئەی جووتە هاوەڵەکەی بەندیخانەم یەکێکتان مەی

**دەگوشێت بۆ گەورەکەی، وتراوە: ئەوە مانای خەونی ئەوەیان بوو کە پێشتریش (مەی گوش)ی یان مەی گێڕی پاشا بووە . ﴿وَأَمَّا الْآخَرُ فَيُصْلَبُ فَتَأْكُلُ الطَّيْرُ مِنْ رَأْسِهِ﴾ (یوسف-٤١)،واتا: بەڵام ئەوی ترتان لەدار دەبەسترێ و باڵندەکان لەسەری دەخۆن، گوتراوە: ئەوەشیان مانای خەونی ئەوەیان بوو کە پێشتر نانەوابووە: ﴿قُضِيَ الْأَمْرُ الَّذِي فِيهِ تَسْتَفْتِيَانِ﴾ (یوسف – ٤١)، واتا: بەوجۆرە کارەکە ڕووی داو هیچ گۆڕانی بەسەردانەهات، هەروەکو لەفەرموودەی پێغەمبەرماندا (ﷺ) هاتوە کە (خەون بەقاچی باڵدارێکەوەیە، ئەگەر لێك نەدرێتەوە، بەڵام ئەگەر لێکدایەوە بەردەبێتەوە – واتا ڕوودەدات)** [٨٥]

﴿وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُ نَاجٍ مِنْهُمَا اذْكُرْنِي عِنْدَ رَبِّكَ فَأَنْسَاهُ الشَّيْطَانُ ذِكْرَ رَبِّهِ فَلَبِثَ فِي السِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ﴾ **(یوسف:٤٢)، واتا:یوسف بەوەیانی گوت کەپێی وابوو ڕزگاری دەبێت لەدوو کەسەکە:لای گەورەکەت منت بێتەوە یاد و باسی بکە کەبەبێ تاوان گیراوم، بەڵام شەیتان ئەوەی لەبیر کابرا بردەوە،لەبەرئەوە یوسف چەند ساڵێکی تر لە بەندیخانەدا مایەوە.وتراوە کە یوسف**(علیه السلام)**بەمەی گێڕەکەی گوت، بەڵام ئەویش پاش ڕزگاربونی لەبیری نەمابوو، کەواتە گرتنە بەری هۆکار بۆ خۆڕزگارکردن هیچ لەوە کەم ناکاتەوەکە مرۆڤ پشت بەخوای گەورە ببەستێت، سەبارەت بەوەی کەشەیتان لەبیری مەیگێڕەکەی بردەوە کەلای پاشا، یان گەورەکەی باسی بێتاوانی یوسف** (علیه السلام) **بکات (ابن مسعود)** [٨٦]**و (مجاهد)**[٨٧] **دەڵێن بەمەی گێڕەکەی وتووە، هەروەها جارێکی تر (مجاهد)**[٨٨] **و (ابن اسحاق)**[٨٩]**پێیان وایە، یوسف** (علیه السلام) **(بضع)ساڵ لەبەندیخانەدا مایەوە، واتا (٣- ٩) ساڵ یاخود (٣-٧) یان (٣- ٥) یان هەرژمارەیەکەلە (١٠)کەمتر بێ .هەرکەسێك بڵێ ڕاناوەکەی ئەم ڕستەیە** ﴿فَأَنْسَاهُ الشَّيْطَانُ ذِكْرَ رَبِّهِ﴾ **دەگەڕێتەوە،بۆ یوسف** (علیه السلام)**، ئەوا بەهەڵەدا چووە، گەرچی لە (ابن عباس)** [٩٠] **و (عکرمە)**[٩١] **ەوە بەلاوازی هاتوو. پاش ماوەیەك، (ڕەیان)ی کوڕی (ولید)کە** [٩٢] **پاشای**

---

[٨٥] اسنادەکانی لاوازە، رواه احمد (٤ /١٠)، ترمذي (٢٢٧٨ )، ابوداود (٥٠٢٠ )ابن ماجة (٣٩١٤ )، الفتح (١٢/ ٤٥٥)، الحاكم (٣٩١/٤) .

[٨٦] صحيح بطريقة: رواه ابن حاتم (١١٦٣٦)، رواه ابن جرير (٧/ ١٢/ ٢٢١)

[٨٧] رواه ابن جرير (٧ / ١٢/ ٢٢١)

[٨٨] فيه ضعف: رواه ابن ابي حاتم (١١٦٤١)

[٨٩] ضعيف اليه: ابن جرير (٧ / ١٢/ ٢٢٤ )

[٩٠] ضعيف: رواه ابن ابي حاتم (١١٦٤٣)

[٩١] ضعيف: البطري (٧/ ١٢/ ٢٢٣ )

(میصر)بوو، خەونێکی دی، ئەو خەونەش بۆ یوسف (علیه السلام)بەخێر گەڕا چونکە بوە هۆی ڕزگار بونی لەبەندیخانەو کردنی بەخەزنەداری گەنجینەی وڵات .

(اهل الکتاب) دەڵێت: پاشا لەخەویا بینی کە لەکەناری ڕوبارێکە، لەڕوبارەکەوە حەوت مانگای قەڵەو هاتنە دەرەوە و دەستیان کرد بە لەوەڕ خواردن لەباخێکی نزیك ڕوبارەکە پاشان حەوت مانگای لەڕو لاواز لەهەمان ڕوبار هاتنە دەرەوە و ڕویان کردە لای حەوتەکەی پێشوو، پەلاماریان دان و خواردیانن، لێرەدا لەخەو ڕاپەڕی و سەرسام بوو، خەوتەوە، دیسان لە خەویدا حەوت گوڵە جۆی سەوزی بینی و حەوتی تریش چرچ و قرپۆك و سیس، کەحەوت گەشە کەیان خوارد، پاشا بەسەرسامی یەوە لەخەوڕابوو، کاتێك بەیانی خەونەکەی بۆ دەست وپێوەندەکانی باس کرد کەس نەیزانی مانای خەونەکە لێك بداتەوە، بەڵکو بێ پێچ و پەنا بەپاشایان گوت: ﴿قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلامٍ وَمَا نَحْنُ بِتَأْوِيلِ الْأَحْلامِ بِعَالِمِينَ﴾ (یوسف:٤٤)، واتا: ئەوانە وڕێنە خەون و هیچ لێکدانەوەیەکیان نیە، ڕاستیەکەی ئێمە زانانین دەربارەی لێکدانەوەی مانای خەون لێرەدا مەی گێڕەکە (یوسف)ی وەبیر هاتەوەو دیارە ئەوەش حیکمەتی خوایی لەپشتەوەیە، کاتێك وەبیری هاتەوە کەبینی ئەنجومەن و دەست و پێوەندو وەزیر و پیاوانی دەوری پاشا دەستەوسانن لەئاستی لێکدانەوەی مانای خەونەکەی پاشادا . ﴿وَقَالَ الَّذِي نَجَا مِنْهُمَا وَادَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ﴾، واتا: ئەوەیان لەدوانەکەی ناو بەندیخانەکە ڕزگاری ببوو، یوسفی هاتەوە بیر، پاش چەند ساڵێك – بەسەر ڕزگار بوونیدا، ئیتر ڕووی کردە کوڕەکەو پێی گوتن:
﴿أَنَا أُنَبِّئُكُمْ بِتَأْوِيلِهِ فَأَرْسِلُونِ﴾ واتا: من مانای خەونەکەتان پێ دەڵێم، دەی بمنێرن – بەدوای یوسفدا کەلەبەندیخانەیە، چوو بۆلای و پێی گوت: ﴿يُوسُفُ أَيُّهَا الصِّدِّيقُ أَفْتِنَا فِي سَبْعِ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنْبُلاتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ لَعَلِّي أَرْجِعُ إِلَى النَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ (یوسف:٤٦) واتا: یوسف ! ئەی هاوڕێ ڕاستگۆکەم، مانای ئەم خەونەمان پێ بڵێ کە حەوت مانگای قەڵەو لەلایەن حەوتی لاوازەوە بخورێن، لەگەڵ حەوت گوڵە گەنمی سەوزو ئەوانی دیکەی و شك، تاکو بچمەوە ناو خەڵکەکەو پێیان بڵێم .

(اهل الکتاب) پێیان وایە کاتێك مەی گێڕەکە باسی یوسفی بۆ پاشا کرد،پاشا مەی گێڕەکەی بانگ کرد بۆ دیوانی پاشایەتی و ئەو لەوێدا یەسەرهاتی خۆی و یوسفی بۆ پاشا باس کردو خەونەکەیشی بۆ پاشا لێکدایەوە، بەڵام ئەمە هەڵەیەکی ئاشکرای (اهل الکتاب)ە،

---

[92] ڕەیانی کوڕی وەلیدی کوڕی ( ثروان)ی کوڕی (ابن اراشه)ی کوڕی (فاران)ی کوڕی (عمرو)ی کوڕی (عملاق)ی کوڕی (لاوذ)ی کوڕی (سام )ی کوڕی (نوح)ە .

ڕاستیەکەی بەو جۆرەیە کە خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا باسی فەرمووە، بەڵکو یوسف خۆی س. خ بەوپەڕی هەوڵەوە لەچوارچێوەی ئەو زانستەی خوا پێی دابو، بەبێ مەرج و بەبێ داواکاری ڕزگارکردنی لەبەندیخانە، هێنایانە دیوانی پاشاو خەونەکەی بۆ لێك دایەوە، کەمانای ئەوەی دەگەیاند حەوت ساڵی داهاتوو پڕ لە هەرزانی و و باران بارین دەبێت و حەوت ساڵی دوای ئەو حەوتەش وشکە ساڵی گرانی دەبێت ﴿ثُمَّ يَأْتِي مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ النَّاسُ﴾ واتا: پاش ئەوە ساڵێك دێت کە خەڵکی لەخۆش بەختی و فرەبارانی دا دەژین و ﴿وَفِيهِ يَعْصِرُونَ﴾، واتا: لەوساڵەدا دەکەونە گەلاڵەکردن و گوشینی میوەکانیان، وەکو قامیشی شەکرو ترێ و زە یتون و کونجی و ... هتد لێرەدا یوسف (عليه السلام)بەوردی هەردو بارودۆخەکەی بۆ باس کردن و ڕێنومایی کردن کە چۆن لەم حەوت ساڵەدا مشوری حەوت ساڵەکەی دواتر بخۆن و گەنم ودانە ویڵە پەزمەندە بکەن و هەربەگوڵەوە دایبنێن تاکو تێك نەچێ و مێروو لێی نەداو شێ نەکات و بڕێکی دیاری کراوی لێ دابچێنن . جا کاتێك پاشا ئەم شارەزایی و زیرەکیەی لەیوسف دا (عليه السلام)بەدی کرد، ناردی بەشوێنیدا تاکو بیکاتە یەکێك لەپیاوانی نزیك لەخۆی و ڕاوێژی پێ بکات، کاتێك هاتن بەدوای دا بۆ ئەو مەبەستە، ئەو حەزی نەکرد بەندیخانە بەجێ بهێڵێت هەتا بەتەواوەتی ڕوون نەبێتەوە کە بێ تاوان و ئەوان بەناهەق ئەم چەند ساڵە لەبەندیخانەیان قایم کردوە، بەکورتی دەیویست بۆ هەموو لایەك ئاشکرا بێت کە ئەو تاوانەی بۆی هەڵ بەستراوە، وان ییەو ئەم دووره لەو شتانەوە و داوێن پاکە .

یوسف (عليه السلام)بەنێرراوەکەی گوت: ﴿ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ﴾ بگەڕێرەوە بۆ لای پادشات و واتا من هەروا سەر بەخۆ لەیەندیخانە نایەمە دەرەوە ﴿فَاسْأَلْهُ مَا بَالُ النِّسْوَةِ اللَّاتِي قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ إِنَّ رَبِّي بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ﴾ واتا: لەپاشا بپرسە کەچۆن ئەو ژنانە دەستی خۆیان بڕی و بەچ هۆیەك بوو،یان چۆن زۆریان لەمن کرد کەبچم بۆ لایان ؟ خۆ پاشا خۆی دڵنیایە لەوەی کەمن داوێن پاکم، جاکاتێك پرسیاریان لەوژنانە کرد دانیان بەڕاستیەکەداناو داوێن پاکی و سەروەری یوسفیان باس کرد گوتیان ﴿قُلْنَ حَاشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِنْ سُوءٍ﴾، حاشا لەو بەخوا هەرگیز خراپەکاریمان لە یوسف نەدیوە و تەنانەت (قالت امراه العزين) ژنەکەی پاشا گوتی ﴿الْآنَ حَصْحَصَ الْحَقُّ﴾ ئێستا هەموو شتێ ئاشکرا بوو، ڕاستی دەرکەوت، کەڕاستیش دەرکەوت دەبێ شوێنی بکەوێت ﴿أَنَا رَاوَدْتُهُ عَنْ نَفْسِهِ وَإِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ﴾، واتا: من نەفسی ئەوم دنە دەدا، ئەو ڕاستە و لەڕاستگۆیانە، چونکە بەبێ تاوان و بەناهەق چەند ساڵ خرایە بەندیخانەوە و ناپاکی خراپە پاڵی، ﴿ذَلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِالْغَيْبِ وَأَنَّ اللَّهَ لا يَهْدِي كَيْدَ الْخَائِنِينَ﴾، واتا: ئەمەش بۆئەوەی ئەو بزانێ کەمن ژێر

بەژێر ناپاکی و خەیانەتم لەئەو نەکردووە، خوای گەورەش لەگەڵ فێڵی خەیانەتکاران نییە، گوتراوە: ئەوە دەقی قسەی (یوسف)بوە (علیه السلام)کە ویستویەتی ئەوەب ۆ پاشا ساخ و یەکلایی بکاتەوە کە هەرگیز یوسف (علیه السلام) نیازی خراپ نەبوەو نەیویستوە ژێر بەژێر فێڵ و خەیانەت لەگەورەی خۆی بکات، لەلایەکی ترەوە گوتراوە: ئەوە دەقی قسەی زلێخان ژنی پاشابوە، واتا: دان بەوەدا دەنێم کەهەرگیز من ژێر بەژێر خەیانەتم لەمێردەکەم نەکردووە، کەمێك و نەم داوە، بەڵام هەرگیز ئیش بەدکار و بێ شەرمیم لەگەڵدانەکردووە، ئەمەش ڕاوبۆچوونی زۆربەی پێشەوایانی دوایی و ئەوانی دیکەیش، بەڵام (ابن جریر)و (ابن ابی حاتم)خ. ل تەنها مەبەستی یەکەمیان باس کردوە . ﴿وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّي إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾، واتا: من پاکانە بۆ دەرونی خۆم ناکەم، بەڕاستی دەروون فرمان بەخراپەکاری دەکات، سامەگەر دەروونێك کەپەروەردگارم بەزەیی پیایدا بێتەوە و لایبدات، وە پەروەردگاری منیش لێبوردەو بەبەزەییە . گوتراوە: ئەمە دەقی قسەی یوسف بوە (علیه السلام)، وەگوتراوە: ئەمە دەقی قسەی زلێخا بووە، کەئەمەشیان گونجاوترە، خوای گەورە خۆی باشتر دەزانێ .

ئیتر کە پاشا دڵنیابوو لەوەی کە شکۆو شەرمی ئەو پارێزراوە و هیچ کەسێك دەست درێژی نەکردوەتە سەر ناموسی ژنەکەی، بەڵکو ئەوانە قسەو بوختانی خەڵکی بون، ئیتر ﴿وَقَالَ الْمَلِكُ ائْتُونِي بِهِ أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِي﴾ واتا: یوسفم بۆ بهێنن، دەیکەمە دەستە پیاوی هەڵبژاردەی نزیك لەخۆم و دەسەڵاتداری دەوڵەت، هەرکە قسەو گفتوگۆی لەگەڵدا کردو بەتەواوەتی لایەنی ڕاستەقینەی ڕوداوەکەی زانی پێی گوت: ﴿إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ﴾ واتا: تۆ لە ئەمڕۆوە لەلای ئێمە خاوەن دەسەڵات و ئەمینداریت ، وەك ئەوە وایە پێی بڵێ: دەی فەرموو چیت دەوێ بیکە بۆ ڕزگارکردنی ئەم گەلە لەو قەیرانەی بەڕێوەیە: ﴿قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الْأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ﴾ واتا: گەنجینەکانی وڵاتم پێ بسپێرە من دەزانم چۆن دەیانپارێزم و بەئەمانەتەوە ڕاگیریان دەکەم، دیارە پاشا بۆی دەرکەوتووە کە کەسێکی پارێزەرو لێزانە لەبواری دەوڵەتداریو ئابووریدا، هاوکات ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دروستە مرۆۃ خۆی داوای بەرپرسیارێتی و پلەی دەسەڵات بکات بەمەرجێك شیاوترین کەسی ئەو جێگەو پایەبێت زانای ئەو بوارەبێت و بەئەمانەتەوە و بەچالاکانە کارەکانی ڕاپەڕێنێ . (اهل الکتاب) پێیان وایە کە فرعەونی میصر یوسفی زۆر زۆر بەرزکردەوە و کردی بەدەسەڵاتداری هەموو زەوی و زارەکانی میصر، موستیلەکەی پەنجەی خۆی کردە پەنجەی ئەو، بەرگی ئاوریشمی

بۆ لەبەر کرد، گەردانەی زێڕی کردە گەردنی، لەکەژاوەی دوەمی دوای خۆیەوە سواری وڵاخی کرد، کەسێکی دانابو کە لەجیاتی پاشا لەپێشەوە دەڕۆیشت و دەیگوت: تۆ گەورەو دەسەڵاتداری، (یوسف)یش (علیه السلام) دەیفەرموو:من لەتۆ گەورەتر نیم مەگەر تەنها بەکورسی

وتراوە: ئەوسا تەمەنی یوسف (علیه السلام) سی ساڵ بو، ژنێکی گەورەی خاوەن شکۆی هێنا، (تعلبی)دەڵێت: پاشا (قەطفیر)ی لەسەرکاری وەزارەت و خەزێنەداری لابردو (یوسف)ی لەجێگەی ئەودانا، واباس دەکرێت کاتێك پاشا کۆچی دوایی کردوە زلێنحای ژنی شووی بەئەو کردوەتەوە کە وەك کچ وابوە، چونکە مێردەکەی بەمەبەستی منداڵ بون نەدەچوە لای ژنەکانی، لەبەرئەوە لە (یوسف) (علیه السلام) دوو منداڵی بو، کەناویان (ئەفرایم)و (مەنسا)بوەو سەرەنجام (یوسف)U متمانەی تەواوی خەڵکەکەی بۆخۆی مسۆگەر کردو بوو بەپاشایان، پاشایەکی دادپەروەر و دڵسۆز، بەجۆرێ کە هەموو خەڵکەکە خۆشیان دەویست و لێی ڕازی بوون . وا دەگێڕنەوە کە: کاتێك یوسف (علیه السلام) بانگ کرا بۆ دیوانی پاشایەتی تەمەنی سی ساڵ بو،. پاشا بەحەفتا جۆرە زمان قسەی لەگەڵدا کردوەو ئەویش بەهەموو زمانەکانی بەرەوانی وەڵامی داوەتەوە، پاشا بەوە زۆر سەرسام بوە، چونکە هێشتا تەمەنی یوسف کەم بوە بەبەراورد لەگەڵ فێربونی ئەو زمانانە، خوای گەورە باشتر دەزانێت .

﴿وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ وَلِنُعَلِّمَهُ مِنْ تَأْوِيلِ الْأَحَادِيثِ وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾

یوسف (٥٦ – ٥٧)، واتا: پاش ئەو نارەحەتیەی لەبەندیخانە چەشتی، تواناو دەسەڵاتێکی گەورەمان بەیوسف بەخشی، بەچەشنێ کەڕووی بکردایەتە هەر شوێنێکی سەر زەوی قەدرو ڕێزو شکۆیەکی تایبەتی هەبو، ئاوا خوای گەورە پاداشتی بڕواداران دەداتەوە، ئەمە وێڕای پاداشتی دواڕۆژیان کە تایبەتە بەبڕواداران و خۆپارێزان . گەلێك قسەو باسی سەرزارەکی دەربارەی (یوسف پێغەمبەر)U پشتاوپشت گوتراوە، لەوانەش گوایە: کاتێك (قەطفیر) (زلیخا) مارە دەکات، دەمرێت، ئیتر یوسف دەکرێتە پاشا و ژنەکەیشی بۆ خۆی مار ە دەکاتەوە، (ابن اسحاق)یش خ دەڵێت: (ولیدی کوڕی ڕەیان) کە پاشای هەرە گەورەی (میصر)بووە لەسەر دەستی یوسف (علیه السلام)موسوڵمان ب ووە، خوای گەورە دەزانێت، بێگومان ب ەسەر هاتی (یوسف) (علیه السلام)گەلێك قسە و شتی ناڕاتیشی تێکەڵ کراوە بە چەندین شێوە گوتراوە و نوسراوە، بەڵام ڕاستتر لە هەموویان ئەوەیە کە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی فەرمووە .

## به یەکتر گەیشتنەوەی یوسف ( علیه السلام )و براکانی

خوای گەورە لە ئایەتی ژمارە (٥٨-٦٢)ی سورەتی یوسف باسی چیرۆکی بە یەکتر گەیشتنەوەی یوسف (علیه السلام)و براکانی دەکات .

پاش ئەوەی سەرەتای حەوت ساڵی بێبارانی و گرانی دەستی پێکرد، براکانی یوسف (علیه السلام)بە کاروانی ڕوویانکرد وولاّتی میصر، بەمەبەستی وەرگرتن و کڕینی دانەوێڵەو خۆراك و ئازووقە، لەو کاتەشدا یوسف (علیه السلام)پاشای (میصر) بوو، کە چوونە لای، ئەو براکانی خۆی ناسیەوە، بەلاّم براکانی ئەویان نەناسیەوە، بگرە هەر بە خەیاڵیشیاندا نەدەهات و نەیاندەزانی کە براکەیان بەو پلە و شکۆبەرزە گەیشتووە، لەبەرئەوە نکۆڵیان دەکرد کەپاشا یوسف برایان بێت . (أهل الكتاب) پێیان وایە کە کاتێك چوونە لای یوسف (علیه السلام)کڕنوشی ڕێزیان بۆ برد، بەلاّم یوسف (علیه السلام)ئەوانی ناسییەوە، بەلاّم دەیویست براکانی نەیناسنەوە، لەبەرئەوە بە توڕەیی و بە ڕەقی لەگەڵیاندا دەدوا، پێی گوتن: ئێوە سیخوڕن و هاتووە خێر و بێری ئەم وولاّتە بۆ خۆتان بەرن، ئەوانیش گوتیان: نەخوازە لاّ ... بەڵکو ئێمە هاتووین خۆراك و ئازووقە بەرینەوە بۆ خەڵکی وولاّتی خۆمان کە گیرۆدەی گر انی ووشکە ساڵی هاتووە، هەمووشمان کوڕی یەك باوکین کە کەنعانییە، لە ڕاستیدا دوازدە برا بووین،بەلاّم یەکێکمان لێڕۆیشت و برا بچووکەمان لای باوکمانە،یوسف(علیه السلام)فەرمووی هەر دەبێت بەکار وبارتان بزانم و سێ ڕۆژ بەندی کردن پاشان (شەمعون)ی لای خۆی بە بارمتە هێشتەوە وە تاکو برا بچووکەکەیان بهێنن، ئەمەش قسەی زۆر هەڵ دەگرێت .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَهَّزَهُمْ بِجَهَازِهِمْ قَالَ ائْتُونِي بِأَخٍ لَكُمْ مِنْ أَبِيكُمْ﴾ واتا کاتێك ئازووقەیان پێدان کە وا باو بووە هەر کەسە و باری ووشترێك وەربگرێت و نابێ لەوە زیاتر بدر ێت بەهیچ کەسێك، لێر ەدا یوسف فەرمووی بە براکانی دەبێت براکەی ترتان کە لە باوکتانەوە براتانە بۆم بهێنن، ئەوەش پاش ئەوە پرسیاری لێکردن دەربارەی باری گوزەرانیان و ژمارەیان، ئەوانیش لە وەلاّمدا گوتیان: ئێمە دواتزدە برا ین، یەکێکیان وون بوو ڕۆیشت یان بێ سەر و شوێنە، بەلاّم براکەی ئەو لەگەڵ باوکم دادەنیشێ و لە ژیاندایە،. یوسف (علیه السلام)پێی ڕاگەیاندن کە ئەگەر ساڵی داهاتوو هاتنەوە بۆ ئازووقە وەر گر تن دەبێت ئەو برایەش لەگەڵ خۆتاندا بهێنن بۆ لام، ﴿أَلا تَرَوْنَ أَنِّي أُوفِي الْكَيْلَ وَأَنَا خَيْرُ الْمُنْزِلِينَ﴾ واتە: ئەدی نابینن کە من چۆ ن پێشوازیم لێتان کردووە و هاوکاریم کردوون لە پێدانی ئازووقەدا،

من ئاوا ڕێزی میوانی خۆم دەگرم، تاکو براکەیان بهێنن، ئەمەیان هاندان بوو، بەڵام یوسف (علیه السلام)ڕێگەی دووەمیشی گرتنەبەر و ویستی بیانترسێنێ و هەڕەشەی لێکردن بەوە کە پێی فەرموون: ﴿فَإِنْ لَمْ تَأْتُونِي بِهِ فَلَا كَيْلَ لَكُمْ عِنْدِي وَلَا تَقْرَبُونِ﴾، واتا: ئەگەر براکەتان لەگەڵ خۆتاندا نەهێنن بۆلام کە گەڕانەوە ئەوا هیچ ئازووقەیەکتان لای من نیە و ناتاندەمێ و بگرە هەر نزیکیشم مەکەونەوە، واتا: هەتا نەیهێنن لەگەڵ خۆتاندا مەیەنەوە بۆ لای من و بەتەمای ئازووقە مەبن، بە پێچەوانەوە ئەگەر براکەتان پێبێت ئەوا یەکەم کەس ئێوە بەڕێ دەکەم .﴿قَالُوا سَنُرَاوِدُ عَنْهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَاعِلُونَ﴾گوتیان:ئێمە ئەوپەری هەوڵ لەگەڵ باوکیدا دەدەین تاکو ڕێگەی بدات تا لەگەڵماندا ڕەوانەیلا بکات، ئاسانە بەلامانەوە و دەتوانین هێنانی ئەو مسۆگەر بکەین . ئینجا یوسف (علیه السلام)فەرمانی کرد بە بەردەستەکانی کە ئەو شتانەیان بۆ بخەنەوە ناو بارەکانیان کە لەجیاتی ئازووقە هێنابویان، واتە ئەو شتەی کە لەجیاتی پارە بۆ ئاڵوگۆڕ هێنابوویان، بەبێ ئەوەی ئەوان بە خۆیان بزانن . ﴿لَعَلَّهُمْ يَعْرِفُونَهَا إِذَا انْقَلَبُوا إِلَى أَهْلِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾، واتا: بۆ ئەوەی ئەوان بیناسنەوە کە ئەوە شتی خۆیانە بۆیان گەڕاوەتەوە یاخود لەگەڵ خۆیان هێناویانەتەوە، کاتێك دەگەڕێنەوە ناو کەس و کاریان بەڵکو بەهۆی گەڕاندنەوەی ئەو شتانە سەرلەنوێ جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ میصر و براکەشیان لەگەڵ خۆیاندا بەرن .

گوتراوە: بۆیە ئەو شتانەیان بۆ کردونەتەوە ناو بارەکەیانەوە تاکو کاتێك چوونەوە وولاتی خۆیان ناچاربن بگەڕێنەوە و ئەو شتانە بگێڕنەوە و بە هۆیەوە براکەیشیان بەرن، هەروەها ووتراوە: یوسف (علیه السلام)لەوە دەترسا ئەم برایانەی جارێکی تر نەیەنەوە بۆ (میصر)، لەبەرئەوە ئەو شتانەی کردە ناو بارەکەیانەوە تاکو ناچاربن لەبەرئەوە هەر دەبێ بگەڕێنەوە، هەروەها ووتراوەپێی جوان نەبووە کرێ لە براکانی وەربگرێ لەجیاتی ئازووقەکە، سەبارەت بەو کەل و پەل و شت و مەکانەی پێی دانەوە و کردیە ناو بارەکەیانەوە، ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز ڕا و بۆچوونی جیاجیایان هەیە و لەمەودوا باسی دەکەین . لای (اهل الکتاب) بریتیبووە لە چەند پریاسکەیەکی پارە، خوای گەورە باسی هەڵوێست و کاری براکانی دەکات کاتێك گەڕانەوە بۆ وولاتی خۆیان و دەنگ و باسەکەیا ن لە باوکیان گەیاند و گوتیان: ﴿مُنِعَ مِنَّا الْكَيْلُ﴾ واتا: قەدەغە کراوە لەمەولا ئازووقە وەربگرین هەتا براکەمان بنیامین لەگەڵماندا نەنێری ﴿وَلَمَّا فَتَحُوا مَتَاعَهُمْ وَجَدُوا بِضَاعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ قَالُوا يَا أَبَانَا مَا نَبْغِي هَذِهِ بِضَاعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا﴾ کە بارەکانیان کردەوە بینیان کەلوپەلەکانی خۆیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوەتەوە، بە باوکیان گوت: بابە چی بکەین ؟ ئەوەتا کەل و پەلەکەمان وەك خۆی

خراوەتەوە بارەکانمانەوە و هێناو مانەتەوە، کەواتە ئەمساڵیش دەچینەوە بۆ ئازووقەی تر ﴿وَنَمِيرُ أَهْلَنَا﴾ ئازووقە بۆ کەس و کارمان دەهێنین، لەخۆشی ئەوەشدا ﴿وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ذَلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ﴾ براکەشمان باشتر دەپارێزین و دیار ە بەهۆی ئەوەوە بارێکی وشتر زیاتر ئازووقە وەردەگرین، ﴿ذَلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ﴾ واتا: لە بەرانبەر بردنی براکەیان لەگەڵ خۆیاندا ئەوە شتێکی گونجاوە کە بارێکی زیاتر وەربگرن .

(یەعقوب) (علیه السلام)خۆشەویستی یوسفیشی دابوو بە (بنیامین)ی برای، چونکە بۆنی ئەوی لێدەهات و دڵی پێی ڕوون دەبوەوە و بگرە لەجیاتی ئەویش دایناوبوو، لەبەرئەوە دەترسا کگە ئەگەر ئەمیشیان بداتە دەست و بێ سەرو شوێنی بکەن ئەوا بە تەواوەتی چرای ئاواتی دەکوژێتەوە. لەبەر ئەوە هەموویانی کۆ کردەوە و پێی گوتن لەگەڵتاندا ناینێرم هەتا هەمووتان پەیامم نەدەنێ کە بیپارێزن و بە سەلامەتی بۆم بهێننەوە، ئەوانیش هەموویان بە یەك دەنگ پەیمانیاندا، خوای گەور ە نەخشەی ووردی داناوە بۆ کاروبارەکانی و هەموو شتێکی لەوپەڕی ووردی و ئەندازەگەری دایە .

خۆ ئەگەر کەس و کاری (یەعقوب) (علیه السلام)پێویستیان بە ئازووقە نەبوایە، ڕەنگە (یەعقوب) (علیه السلام)بنیامینی کوڕی بە ئەوان نەسپاردایە، بەڵام قەدەری خوایی حوکمی خۆی هەیە، خوای گەورە خۆی دەزانێت چ کاری بەو کار ەیە، ئەوەبوو (یەعقوب) (علیه السلام)بە کوڕەکانی خۆی فەرموو: ﴿قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُ مَعَكُمْ حَتَّى تُؤْتُونِ مَوْثِقاً مِنَ اللَّهِ لَتَأْتُنَّنِي بِهِ إِلَّا أَنْ يُحَاطَ بِكُمْ فَلَمَّا آتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قَالَ اللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾ واتا: لەگەڵتاندا نایینێرم هەتا پەیمان بەخوا نەدەن کە بۆم دەهێننەوەو بە هەمووتان دەیپارێزن، جا کە پەیمانیان دایە لە کۆتاییدا فەر مووی: خوای گەورە وەکیلە بەسەر ئەو قسانەوە کە کردمان و ئەو ئاگادارە .

ئینجا (یەعقوب) (علیه السلام)فەرمانی کرد بە کوڕەکانی کە هەموویان پێکەوە لەیەك دەروازەی شارەوە نەچنە ناو شارەکەوە، بەڵکو لە دەروازەیەکی جیاجیاوە بچنە ناو شارەوە، ووتراوە بۆئەوە ئاوا فەرمانی پێکردوون تاکو نەبن بە چاوەوە، چونکە ئەوان زۆر شێوە جوان بوون و هەمووشیان برابوون، ئەوەش ڕاوبۆچوونی (ابن عباس)[٩٣] و (مجاهد)[٩٤] و (محمدی کوڕی کەعب)[٩٥] و (قتادە)[٩٦] و (السدی)[٩٧] و (ضحاك)ە[٩٨] هەروەها ووتراوە: مەبەستی

---

[٩٣] ضعيف جدا: ابن جرير (١٣/١٣/٨) .

[٩٤] ضعيف اليه: ابن ابي حاتم (١١٧٦٧) .

[٩٥] ضعيف اليه: ابن جرير (١٣/١٣/٨) .

(یەعقوب) (علیه السلام)لەوەدا ئەوەبوو کە هەریەکەیان لە ڕێگەیەکەوە بڕۆنە ناو شارەکەوە تاکو هەواڵ و دەنگ و باسی یوسف بزانن، ئەگەر مابێت، ئەمەشیان ڕاوبۆ چوونی (ئیبراهیمی نەخەعی)یە (رحمه الله)، لەوەدەچێت بۆچوونی کۆمەڵی یەکەم ڕاست تر بێت، هەروەکو خوای گەورە لەسەر زمانی یەعقوب (علیه السلام)دەفەرموێت: ﴿وَمَا أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ﴾، وە خوا گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا دَخَلُوا مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُمْ مَا كَانَ يُغْنِي عَنْهُمْ مِنَ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا حَاجَةً فِي نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَاهَا وَإِنَّهُ لَذُو عِلْمٍ لِمَا عَلَّمْنَاهُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ واتا: کاتێك لەو شوێنانەوە چوونە شارەکەوە کە باوکیان فەرمانی پێکردبوون هیچ سوودێکی نەبوو بۆ ئەوان مەگر داخوازیەکی یەعقوبیان هێنایە دی، ئەو دەیزانی کاتێك فێرمانم کرد، بەڵام زۆربەی خەڵکی بەوە نازان، واتا: سودێکی بەرچاویان نەدی لەوەدا کە هەواڵی یوسفیان دەست بکەوێت .

(أهل الكتاب) پێیان وایە کە (یەعقوب) (علیه السلام)بە کوڕەکانیدا دیاریان نارد بۆ پاشای (میصر) کە بریتیبوو لە بستە و بادەم و سنەوبەر و قەزوان و هەنگوین، پاشاش پارەی جاری پێشووی لێوەرگرتن و دیاریەکانی ڕەت کردەوە .

خوای گەورە باسی ئەو بارە دەکات کە یوسف (علیه السلام)لەگەڵ بنیامینی برایدا بەیەك دەگەن و خۆی پێدەناسێنێت و بەدرێژی بەسەرهاتەکە ڕوون دەکاتەوە لە ئایەتی (٦٩-٧٩)ی سورەتی (یوسف)دا، هەروەها باسی ئەوە دەفەرموێت: کە چۆن بە نهێنی (یوسف) (علیه السلام)لەگەڵ بنیامینی برایدا دەکەوێتە گوتار و هەواڵ و دەنگوباسی خۆی و باوکی دەپرسێت و پێیشی دەڵێت کە ئەو شتە بەهێنی و لە نێوانیاندا بپارێزێ و کەس پێیان نەزانێت، دڵنەواییشی کرد ئینجا یوسف (علیه السلام)هەوڵیدا بۆئەوەی کە نەخشەیەك دابنێ کە (بنیامین) لای خۆی گل بداتەوە و ئەوان ڕەوانە بکاتەوە، لەبەرئەوە فەرمانی کرد بە گەنجە بەردەستەکانی کە جامی ئاوخۆرەی پاشا کە خەڵکی بۆ پێوانە کردنیش وەك (ڕبە) بەکاریان دەهێنا بۆ دابەش کردنی خۆراك بەنهێنی بیخەنە ناو بار و کەل و پەلی بینامینەوە، پاشان بەوان بڵێ کە ئێوە ڕبەی پاشاتان دزیوە، دەبێ زۆر بەخێرایی کۆڵ بار ەکانتان بکەنەوەو بە ووردی بپشکێنرێت، بانگخوازەکە کەوتە هەڕەشە لێکردنیان، ئەوانیش گوتیان: ﴿قَالُوا تَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُمْ مَا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِي الْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَارِقِينَ﴾، واتا: بەخوا خۆشتان دەزانن کە ئێمە بۆ دزی و

---

[96] ضعيف اليه، ابن جرير (١٣/١٣/٨) .

[97] ضعيف اليه، ابن جرير (١٣/١٣/٨) .

[98] ضعيف اليه، ابن جرير (١٣/١٣/٨) .

خراپکاری سەرزەوی نەهاتووینە ئێرە و ئێمە دزنین، ﴿قَالُوا فَمَا جَزَاؤُهُ إِنْ كُنْتُمْ كَاذِبِينَ، قَالُوا جَزَاؤُهُ مَنْ وُجِدَ فِي رَحْلِهِ فَهُوَ جَزَاؤُهُ كَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ﴾، واتا: سزا ئەو کەسە چی بێت ئەگەر درۆ بکات، یان ئەگەر ئێوە درۆ بکەن ؟ گوتیان ئەو ڕبەیەتان لەباری هەرکەسێکماندا دۆزیەوە، ئەوە خۆیەتی، ئاوا سزای ستەمکارانە دەدەین .

﴿فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَاءِ أَخِيهِ ثُمَّ اسْتَخْرَجَهَا مِنْ وِعَاءِ أَخِيهِ﴾، واتە: دەستی کرد بە پشکنینی دەفروبارەکانیان پێشا هی ئەوان گەڕا پاشان هی بنیامین، تاکو گومانیان بۆ دروست نەبێت، بەڵام دوایی لەناو دەفروباری بنیامین دا ڕبەکەی دۆزیەوەو دەریهێنا ﴿كَذَلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ﴾، واتا: ئاوا نەخشەی فێڵێکی بەجیامان بە یوسف فێرکرد، وانەبوایە بەپێی دەستوری پاشا نەیدەتوانی براکەی گل بداتەوە، واتا: ئەگەر دان پیانانی براکانی نەبوایە بەوەی کە لەباری هەرکەسێکدا بدۆزرێتەوە دەبێت ئەو کەسە گل بدرێتەوە، ئەوەش سزاکەیەتی، ئەوا خوای گەورە پلەی زانستی هەندێ کەس کە خوای گەورە دەیەوێت بەرز دەکاتەوە و لەسەرو هەموو خاوەن زانستێکەوە زانایەکی تر هەیە، بەو جۆرە خوای گەورە ئەو جۆرە زانستەی بە یوسف بەخشی (علیه السلام)کە براکانیان هەر گیز دەرکیان بەوە نەکردبوو، جارێ ئەوەش سەرەتایاکە بۆ ئەو ڕوداوانەی دواتر ڕوو دەدەن، دیارە یەعقوبی باوکی (علیه السلام)یان نوێنەری ئەو کەس و کارەی دێن بۆلای پاشا و لە کوڕەگیراو و بارمتەکەیان دەپرسنەوە . هەر کە ڕبەکەیان لەباری بنیامین دا دۆزیەوە، براکانی گوتیان ئەگەر ئەو دزیبێتی ئەوا وەك براکەی (واتا: یوسف) دزە، گوتراوە: کە گوایە یوسف بتی باوە گەورەی بردووە و شکاندویەتی، واتا: باوکی دایکی، گوتراوە: پوری لەنێو بەرگەکانیدا شاردوویەتیەوە بێئەوەی ئەو بەخۆی بزانێت، چونکە منداڵ بووە، پاشان دەری هێناوەتەوە و ئاشکرای کردووە ئەمەیشی بۆ ئەوە کردووە کە بەو بیانوە یوسف لای ئەو بمێنێتەوە، چونکە زۆری خۆش دەویست . هەروەها گوتراوە: یوسف بە منداڵێ خۆراکی لەماڵی خۆیان دەبرد و دەیدا بە هەژاران، گەلێك قسەی تریش لەملاولاوە گوتراون،﴿فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفْسِهِ﴾،واتا:یوسف (علیه السلام)(بنیامین)ی دەست بەسەر کرد و لای خۆی هێشتیەوە دوای ئەوەی بە ئەوانی گوت: ﴿أَنْتُمْ شَرٌّ مَكَاناً وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ﴾، واتا: ئێوە شەڕەنگێزن . کوێندەرین ؟ خوا بۆ خۆی چاکتر دەزانێت لەوەی کە ئێوە دەیڵێن، براکانیشی پێکەوە لەگەڵیدا چوونە بەندیخانەوە و دەستیانکرد بە تکا بۆ کر دن و پاڕانەوە لە پاشا و گوتیان :﴿قَالُوا يَا أَيُّهَا الْعَزِيزُ إِنَّ لَهُ أَباً شَيْخاً كَبِيراً فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُ إِنَّا نَرَاكَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ أَنْ نَأْخُذَ إِلَّا مَنْ وَجَدْنَا مَتَاعَنَا عِنْدَهُ إِنَّا إِذاً لَظَالِمُونَ﴾

یوسف (٧٨-٧٩).. واتا: ئەی گەورە و خاوەن شکۆ، ئەم کوڕە باوکێکی پیری هەیە، لەبری ئەو یەکێك لە ئێمە بگرە و با ئەو بڕواتەوە لای باوکی، بەڕاستی بەڕێزتان چاکەکار ن (دەخوازین داواکەمان وەربگریت)، یوسف فەرمووی: پەنا بەخوا ئەگەر کەسێکی تر بگرین جگە لەو کەسەی کە شتە دزراوەکەمان لە بارەکەیدا دۆزیوەتەوە، جا خۆ ئەگەر وا بکەین واتا: لەجیاتی تاوانبارێك بێتاوانێك سزا بدەین، کەواتە ئێمە ستەمکارین .

(اهل الکتاب) دەڵێن: لێرەدا یوسف (علیه السلام)خۆی بە براکانی ناساند، بەڵام ئەوە هەڵەیە، چونکە ڕووداوی تر بەدوایدا هات . کاتێك براکانی نائومێدبوون هاتنە دەرەوە و کەوتنە قسەی خۆیەخۆ لە نێوان خۆیاندا، (ڕۆبل)ی برا گەورەیان گوتی: ﴿فَلَمَّا اسْتَيْأَسُوا مِنْهُ خَلَصُوا نَجِيّاً قَالَ كَبِيرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوا أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُمْ مَوْثِقاً مِنَ اللَّهِ وَمِنْ قَبْلُ مَا فَرَّطْتُمْ فِي يُوسُفَ فَلَنْ أَبْرَحَ الْأَرْضَ حَتَّى يَأْذَنَ لِي أَبِي أَوْ يَحْكُمَ اللَّهُ لِي وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ﴾، واتا: ئەدی نازانن کە باوکتان پەیمانی لێوەرگرتوون و سوێندی داون بە خوا کە (بنیامین) بەبێوەیی بگەڕێننەوە بۆ لای، وا دیارە ئێوە پەیمانتان شکاند، هەروەکو چۆن لە بردنە دەرەوەی یوسفی برایشیدا کاتی خۆی پەیمانتان شکاند، بە ڕاستی من ڕووم نایات ئاوا بچمەوە بەر دیوانی باوکم، لەبەر ئەوە من لێرە دەمێنمەوە، تا باوکم دێت یان خوای گەورە خۆی باشترین حوکمدەرە بەسەر فەرمانەکانیدا، بەڵام ئێوە ﴿ارْجِعُوا إِلَى أَبِيكُمْ فَقُولُوا يَا أَبَانَا إِنَّ ابْنَكَ سَرَقَ﴾. واتا: بگەڕێنەوە بۆلای باوکتان و پێی بڵێن کوڕەکەت دزی کردووە و گیراوە، وەك ڕوکاری ڕوداوەکە وا دیارە ﴿وَمَا شَهِدْنَا إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَافِظِينَ. وَاسْأَلِ الْقَرْيَةَ الَّتِي كُنَّا فِيهَا وَالْعِيرَ الَّتِي أَقْبَلْنَا فِيهَا وَإِنَّا لَصَادِقُونَ﴾، واتا: بڵێن ئێمە باوەڕمان نەکرد تاکو ئەوەی بە چاوی خۆمان دیمان، خۆ ئێمەش نازانین لە پەنهاندا بەسەرهاتەکە چۆن چۆنییە، هەروەها بۆ باوکم باسی بکەن کە بەسەرهاتی ئەو دزیە هەموو شاری میصری گرتۆتەوەو هەموو کەس بەو دەنگ و باسەی زانیوە، پێی بڵێ ﴿وَإِنَّا لَصَادِقُونَ﴾ ئێمە ڕاست دەکەین لەم گێڕانەوەیەداو فێڵ و درۆی تێدا نییە.

﴿بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنْفُسُكُمْ أَمْراً فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ﴾ واتا: باوکیان باوەڕی پێنەکردن و فەرمووی: ئەوە دەست هەڵبەستی خودی خۆ تانە ئەگینا دزی کردن ڕەوشت و ڕەفتاری بنیامین نییە . (ابن اسحاق)[99] و هەندێکی تر پێیان وایە کە زۆر نکوڵی و سووربوونییان لەسەر بەسەرهاتی بنیامین کێشەی (یوسف)یشی لەسەر زەق ترکردنەوە، وەك هەندێ لە پێشینان گوتویانە: یەعقوب (علیه السلام)گەلێك قسەی پێگوتن و لێیان توڕەبوو،

[99] فیه ضعف: رواه ابن جریر .

تاکو بە ئومێدێکی گەشەوە گوتی: ﴿عَسَى اللَّهُ أَنْ يَأْتِيَنِي بِهِمْ جَمِيعاً﴾ واتا: سا بەڵکو خوای گەورە هەموویانم بۆ بنێرێتەوە، واتا: ڕۆبیل و یوسف وە بنیامین ﴿إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾، واتا: ئەو پەروەردگارە خۆی زانایە بەوەی کە من چەندە پەرۆشی کوڕەکانمم و هەر ئەویش کار بەجێیە و توانای بەسەر هەموو کردار و ڕەفتارێکدا هەیە، ﴿وَتَوَلَّى عَنْهُمْ﴾ ڕەخنەی توندی لە کوڕەکانی گرت و بەدەم بێزاری و هەناسە ساردییەوە گوتی ﴿وَقَالَ يَا أَسَفَى عَلَى يُوسُفَ﴾، داخەکەم بۆ یوسف، کەواتە سەرلەنوێ بەرامە تازەکە زامی کۆنیشی کولایەوە ﴿وَابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ الْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ﴾، واتا: دووچاوەکانی سپی داهاتن بەهۆی گریان و خەمی زۆرەوە ﴿فَهُوَ كَظِيمٌ﴾ ڕقی خۆی خواردبوەو زۆر لە دڵی لە خۆی دامابوو، بۆ دووری خۆی و کۆڕە بێسەر و شوێنەکانی، کوڕەکانی هاتنە لای باوکیان و سەرلەنوێ دڵنیاییان کردەوەو گوتیان: ﴿قَالُوا تَاللَّهِ تَفْتَأُ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّى تَكُونَ حَرَضاً أَوْ تَكُونَ مِنَ الْهَالِكِينَ﴾، واتا: بڕوات و هێندە بیری یوسف بکەیت بەخوا هەموو لەشت لێك هەڵدەوەشێت و کەنفت و بێهێز دەبێت، باش وایە بەزەییەکت بەخۆتدا بێتەوە، بەڵام (یەعقوب) (عليه السلام)فەرمووی: ﴿قَالَ إِنَّمَا أَشْكُو بَثِّي وَحُزْنِي إِلَى اللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ اللَّهِ مَا لا تَعْلَمُونَ﴾ واتا: من سکاڵای حاڵی خۆم تەنها لای خودا دەکەم نەك لەلای ئێوە یان خەڵکانی تر، خوای گەورە شتێکی پێڕاگەیاندووم کە بە ئێوەی نەگوتووە، واتا: خوای گەورە دەرووی ڕزگاریم لێدەکاتەوە و ئەبێت ئەو خەونەی یوسف بێتەدی، کە لەخەویدا من و ئێوەش کڕنوشی ڕێزمان بۆ بردووە، من دڵنیام کە ئەوان ماون، یوسف ماوە، لەم بڕوا بەهێزەیەوە بە کوڕەکانی گوت: ڕۆڵەکانم هەستن بڕۆن بگەڕێن بەدوای یوسف و براکەیدا، لە ڕەحمەتی خوا نائومێد مەبن، چونکە ئەوانە لە ڕەحمەتی خوا نائومێدن کە بێبڕوان.

خوای گەورە لە سورەتی (یوسف)دا لە ئایەتی (٨٨-٩٣) باسی ئەوە ئەفەرموێت کە چۆن بۆ جاری سێهەم براکانی یوسف چوونەوە بۆ وڵاتی (میصر) و ئەم جارەیان برسێتی و هەژاری تەواو پەکی خستبوون، چوون بۆ ئازووقە هێنان، بەڵام دەست مایەکەیان زۆر قەڵب و کەم بوو، ﴿فَلَمَّا دَخَلُوا عَلَيْهِ قَالُوا يَا أَيُّهَا الْعَزِيزُ﴾، واتا: ئەی خاوەن شکۆ خۆمان و کەس و کارمان پەکمانە لەبەر گرانی و بێبارانی و هەژاری ﴿مَسَّنَا وَأَهْلَنَا الضُّرُّ وَجِئْنَا بِبِضَاعَةٍ مُزْجَاةٍ﴾، واتا: شتێکی کەممان هێناوە کە ئازووقەی پێبکرین، گوتراوە پارەیەکی قەڵب و خراپیان پێبوە، گوتراوە شتێکی یەکجار کەمیان پێبوە لە دەنکە سنەوبەر و قەزوان و شتی لەو بابەتانە، (ابن عباس)

[100] دەگێڕێتەوە کە شتەکانیان بریتیبوون لە ووشکە بەروبوی قرپۆك و گوش، براکانی بە سکالأوە گوتیان ﴿فَأَوْفِ لَنَا الْكَيْلَ وَتَصَدَّقْ عَلَيْنَا إِنَّ اللَّهَ يَجْزِي الْمُتَصَدِّقِينَ﴾، واتا: ئەمانەمان لێوەربگرە و بۆمان بگۆڕەوەوە بە ئازووقە، خێرمان پێبکە، خوای گەورە پاداشتی خێرکاران دەداتەوە، وتراوە: ئەوەش خێرە پێمان دەکەیت ئەگەر ئەمانەمان لێ وەربگریت بەرانبەر بەو ئازووقەیەی دەماندەیتێ، (السدی) [101] وا دەڵێت، بەلأم (ابن جريج) [102] دەڵێت: ئەوە خێرە پێمان دەکەیت کە براکەمان بەڕەلأ بکەیت، (سوفیانی کوڕی عەینیە) [103] دروست نەبووە خێر بکرێت بە پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) بەم ئایەتەش بەڵگەی دەهێنایەوە، ابن جرير گێڕاویەتەوە کاتێك (يوسف) (عليه السلام)حاڵی براکانی بەو جۆرە نارەحەتە بینی سۆزی جولأو بەزەیی پێیاندا هاتەوە، ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو کە خۆی ئاشکرا بکات، بۆیە ڕووی کردە براکانی و پێی گوتن: (هل علمتم مافعلتم بيوسف واخيه اذ انتم جاهلون ؟)، واتا: ئایا لە بیرتان ماوە چیتان بەسەر یوسف و براکەیدا هێنا، کاتێك کە ئێوە نەزان بوون ؟ بەوپەڕی سەرسامییەوە لە یەکتریان هەڵڕوانی، چەند جارێك چووبوونە لای، بەلأم نەیانناسیبووەوە، بۆیە بە سەرسامییەوە گوتیان: ﴿قَالُوا أَإِنَّكَ لَأَنْتَ يُوسُفُ قَالَ أَنَا يُوسُفُ﴾ بە ڕاست ئایا خۆت یوسفیت ؟ ﴿قَالَ أَنَا يُوسُفُ وَهَذَا أَخِي﴾ فەرمووی: من یوسفم و ئەوەش واتا: (بنيامين) براکەمە ﴿قَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا﴾ خوای گەورە چاکەی گەورەی بەرانبەرمان کردووە، کە ئارامی و خۆڕاگری بەخشی بەخۆمان و باکمان وێڕای ئەو هەموو خراپەکاریەی ئێوە کردتان بەرانبەرمان .

بە ڕاستی باوکیشمان زۆر بە بەزەیی بوو بۆمان و خۆی لە خراپە پاراست و ئارامی گرت و دیارە خوای گەورەش پاداشتی چاکەکاران وون ناکات، ئەوانیش گوتیان ﴿قَالُوا تَاللَّهِ لَقَدْ آثَرَكَ اللَّهُ عَلَيْنَا وَإِنْ كُنَّا لَخَاطِئِينَ﴾، واتا: بەخوا چاك خوای گەورە ئێوەی بەسەر ئێمەدا شکۆمەند کرد بە ڕاستی ئێمەش زۆر هەڵە بووین، ئێستاش بەبێ دەسەلأتی و داماوی لەبەر دەستی خۆتدا وەستاوین ﴿قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ يَغْفِرُ اللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ من ئەمڕۆ تۆڵەی خۆمان لە ئێوە ناکەمەوە، بگرە لێتان دەبوورم، بەڵکو خوای گەورەش لێتان ببورێ .

---

[100] صحيح جدا: ابن جرير (٨/١٣/٥٠-٥١)، ابن ابي حاتم (١١٩١٩)، عبدالرزاق (١٣٤٠) .

[101] ضعيف الاسناد: ابن جرير (٨/١٣/٥٣) .

[102] ضعيف الاسناد: ابن جرير (٨/١٣/٥٤) .

[103] ضعيف الاسناد: ابن جرير (٨/١٣/٥١) .

هەر ئەوە کە لە هەموو بەزەییدارێك بە بەزەی ترە، ئینجا کراسەکەی خۆی پێدان، تاکو بیگەیەننە دەستی باوکیان، تاکو بە چاوەکانیدا بیهێنێ و بە ویستی خوا بینایی چاوانی چاك ببێتەوە، پاشان فەرمانی پێکردن کە هەموویان ماڵ و منداڵیان بێن بۆ وولاّتی میصر، کە ئەو سەردەمە شاری هەرزانی و خێر و بێربوو، پاش چەندین ساڵ لێك دابڕان و دوور کەوتنەوە .

(عبدالرزاق) [١٠٤] لە (ابن عباس)ەوە دەربارەی ئایەتی﴿وَلَمَّا فَصَلَتِ الْعِيرُ﴾ دەڵێت: هەر کە ڕبەکانی دەرهێناو بارەکانیان کردەوە نەرمەبایەك هەڵیکرد و بۆنی کراسەکەی یوسفی گەیاندە لوتی یەعقوب(عليه السلام)، ئیتر فەرمووی: ﴿إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلَا أَنْ تُفَنِّدُونِ﴾، واتا: من بۆنمی یوسف دەکەم، ئەگەر نەمکەن بەکێوداو نەڵێن: پیربووەو دەبزرکێنێ وەدەڵێت: لە دوری سێ ڕۆژە ڕێوە بۆنی کراسەکەی یوسفی کردووە . (حسنی بصری) [١٠٥] و (ابن جریج المکی) دەڵێت: دوری نێوان یوسف و یەعقوب (عليه السلام)هێندەی هەشتا فەرسەخ بووە، وە ماوەی هەشتا ساڵ لە یەکتری دابڕاون، بەلاّم کوڕەکانی هەستیان بەو بۆنە نەکردووە و بە باوکیان گوت: ﴿قَالُوا تَاللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَالِكَ الْقَدِيمِ﴾، واتا: بەخوا هێشتا هەر لەسەر ڕاوبۆچوونی دێرینی خۆتیت خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا أَنْ جَاءَ الْبَشِيرُ أَلْقَاهُ عَلَى وَجْهِهِ فَارْتَدَّ بَصِيراً﴾، واتا: هەرکە مژدەی پێدراو کراسەکەی یوسفی هێنا بەچاوە پیرۆزەکانیدا سەرلەنوێ بینایی بەچاوەکانیدا هاتەوەو یەکسەر کۆتایی بە کوێربوونەکەی هات . هەر لەو کاتەشدا بەکوڕەکانی گوت: ﴿قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ مِنَ اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾، واتا: ئەی کوڕەکانم ! ئەدی من پێم نەگوتن خوای گەورە شتێکی بە من فێرکردووە کە ئێوە نایزان، منی فێرکردووە کە یوسف و هەموو کوڕەکانم پێ شاد دەکاتەوە، چاوم پێیان ڕوون دەبێتەوە، ئینجا کوڕەکانی لەڕووی شەرمەزاری و تکاوە گوتیان: ﴿قَالُوا يَا أَبَانَا اسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا إِنَّا كُنَّا خَاطِئِينَ﴾، واتا: بابە ! داوا بکە لەخوای گەورە تاکو لێمان ببورێت بەڕاستی ئێمە هەڵەکارو تاوانبارین، جا چونکە بەڕاستی لەو کارەیان پەشیمان ببوونەوە، ئەویش فەرمووی: ﴿قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّي إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾، واتا: داوای لێبوردنتان لە خودا بۆ دەکەم، هەر ئەویشە کە لێبوردەو بە بەزەییە، گوتراوە کە (یەعقوب) (عليه السلام)بڕیاریدا کە لە داهاتوودا داوای لێبوردنیان لەخودا بۆ بکات، مەبەستی ئەوەبووە کە سبەینێ لەکاتی سەبای بەیانیدا نزاو داوای لێبوردنیان بۆ

---

[١٠٤] سنده صحيح: رواه عبدالرزاق (١٣٤٣)، ابن جرير (٥٨/١٣/٨ - ٥٩) .

[١٠٥] متفق عليه: البخاري (١١٤٥)، مسلم (١٧٦٩) .

بكات، چونكه بەزۆری نزای ئەوانە وەردەگیرێ كە بەیانیان زوو لەخوا دەپارێنەوە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحَارِ﴾ سورەتی (ال عمران)، لە فەرموودەی پێغەمبەری ئازیزماندا (ﷺ) هاتووە كە فەرموویەتی: (پەروەردگارمان هەموو شەوێك دێتە ئاسمانی زەوی و دەفەرموێت: كێ تەوبە دەكات، تەوبەی لێ وەردەگرم، كێ داوای چی دەكات با داوا بكات دەیدەمێ، كێ داوای لێبوردن دەكات لێی دەبوورم)، هەروەها لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە كە (یەعقوب لەشەوی هەینیدا داوای لەخوای گەورە كرد تاكو لە كوڕەكانی ببورێت)، (ابن جریر) [١٠٦] فەرموودەیەكی لە (ابن عباس)ەوە هێناوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (سوف استغفر لكم ربی، واتا: بوەستن تا شەوی هەینی دێت، ئەوەش قسەی یەعقوبی برامە كە بە كوڕەكانی خۆی گوت) .

پاش لێك دابڕانێكی دوور و درێژ خۆشەویستان بە یەكتری شاد بونەوە، وتراوە ماوەی دابڕانەكەیان (هەشتا ساڵ) یان (هەشتاو سێ ساڵ) [١٠٧] بووە، یاخود (هەشتاو پێنج ساڵ بووە)، وەك (قتادە) [١٠٨] دەڵێت: (محمدی كوڕی ئیسحاق)یش [١٠٩] دەڵێت: هەژدە ساڵ بووە، بەڵام (اهل الكتاب) دەڵێن (چل ساڵ) بووە، ڕووكاری ڕووداوەكەش تا ڕادەیەك ڕاستی ماوەكە بە نزیكەیی دیاری دەكات، چونكە كە ژنەكەی عەزیزی میصر دڵی چووە سەر یوسف (علیه السلام)(یوسف) (علیه السلام)لەو كاتەدا لە هەرەتی لاویدابووە، واتا: حەڤدە ساڵ بووە، ئیتر خرایە بەندیخانەوە و ماوەی نزیكەی حەوت ساڵ لە بەندیخانەدابوو، كە هاتە دەرەوە لەحەوت ساڵی خێروبێری و هەرزانی دابوو، ئینجا حەوت ساڵی تر گرانی و ووشكە ساڵی هات بەسەر وولاتدا، ساڵی یەكەم بوو كە براكانی هاتن بۆ میصر بۆ ئازووقە، لەساڵی دووەمدا (بنیامین)ی برایان بۆهێنا، لەساڵی سێهەمدا خۆی پێناساندن وپێی گوتن كە خاووخێزانیان هەموو بێن بۆ (میصر) بەگشتی، ﴿فَلَمَّا دَخَلُوا عَلَى يُوسُفَ آوَى إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ﴾، واتا: كاتێك چوونە لای یوسف ڕووناكایی بە دڵی باوانیدا هات، ووتراوەی سەرەتا لەچادرگەكانی دەوری شاردابون و پاشان ووترا ﴿ادْخُلُوا مِصْرَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ﴾، واتا: وەرنە ناو شارەوە (یان میصرەوە) بە پشتیوانی خوا،

---

[١٠٦] تفسير ابن جرير (٦٥/١٣/٨) .

[١٠٧] صحيح إليه، رواه ابن جرير (٧٠/١٣/١٨) .

[١٠٨] حسن إليه، رواه ابن أبي حاتم (١١٩٩٩) .

[١٠٩] ضعيف الاسناد: ابن جرير (٢١٣/١٢/٧) .

پارێزراو دەبن، هەوەکو (السدی) [110] وادەڵێت، خۆئەگەر مەبەست لەوەبێت، واتا: فەرموون لە (میصر)دا نیشتەجێبن و پشت بەخوا پارێزراو دەبن، هەر ڕاستە .

(أهل الکتاب) پێیان وایە کە (یەعقوب) (علیه السلام)کاتێك گەیشتە خاکی (جاشن) کە بەخاکی (بەلبیس) ناسراوە، یوسف (علیه السلام)هات بەرەوڕوویان بۆ پێشوازی لێکردنیان، لەو کاتەدا (یەعقوب)یش (علیه السلام)(یەهوذا)ی کوڕی ناردبوو کە مژدەی هاتنی بە یوسف بگەیەنێت، گوایە پاشا (واتا پاشای میصر) خاکی جاشری پێشکەش بەئەوان کرد تاکو خۆیان و ئاژەڵیان تیایدا نیشتەجێ بن .

هەندێ لە ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز پێیان وایە کە کاتێك یەعقوب (علیه السلام)نزیك بوەوە (یوسف)یش ڕۆیشت بۆ پێشوازی لێکردنیان، ئیتر پاشا و سەربازەکانیش بۆ ڕێز لێگرتن لە یوسف (علیه السلام)سواری ووڵاخ بوون و چون بۆ پێشوازی کردن لەو پێغەمبەرە گەورەیە، کە نزا بۆ پاشا کردووە، خوای گەورە ساڵەکانی تری وشکە ساڵی و گرانی لەسەر میصر لابرد بەبەرەکەتی هاتنی یەعقوب (علیه السلام)بۆ ئەو ووڵاتە، خوای گەورە خۆی باشتر دەزانێت .

لە (ابن مسعود)ەوە [111] دەگێڕنەوە کە (سیو شەش) کەس پێشوازی لە (یەعقوب) (علیه السلام)کردووە، یاخود (هەشتاو سێ) [112] کەس بوون، لە گێڕانەوەیەکی تردا (سێسەد و نەوەد) [113] کەس بوون، وتراوە لەگەڵ (موسا)دا (علیه السلام)دەرچوون و ژمارەیان لە (شەش سەد هەزار) کەس زیاتربووە. ﴿وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ﴾، واتا: دایکی و باوکی بەرز کردوەتەوەو لەسەر کورسی وەزارەت دایناون، وتراوە پێشتر دایکی کۆچی دوایی کردووەو ئەوەی لەگەڵ باوکی بۆ ڕێزلێنان لەسەر تەختی وەزارەت دایناوە پوری بووە، کە لەجێی دایکە، بەڵام (ابن جریر) و هەندێکی تر فەرموویانە: ئایەتە قورئانیەکە بەسە بۆ بەڵگەی ئەوەی کە تا ئەو کاتەش دایکی هەر مابێت، خوای گەورە دەزانێت، پاشان ﴿وَخَرُّوا لَهُ سُجَّدًا﴾ واتا: دایك و باوکەکە و یازدە براکەیشی پێکەوە کڕنوشیان برد بۆ (یوسف) (علیه السلام)کە تاکو ئاینی ئێمە کڕنوش بردن حەرام نەبوو، لێرەدا (یوسف) (علیه السلام)بەباوکی فەرموو: ﴿وَقَالَ يَا أَبَتِ هَذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِنْ قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقًّا﴾، واتا: ئەمەیە مانای ئەو خەونەی کە بەمنداڵی دیتم و تۆش

[110] ضعیف الاسناد: رواه ابن جریر (٢٠٠/١٢/٧) .

[111] ضعیف إلیه: رواه ابن جریر (٧٢/١٢/٨)، ابن أبي حاتم (١١٩٥٧) .

[112] ضعیف إلیه: رواه ابن جریر (٧٢/١٣/٨) .

[113] فیه ضعیف إلیه: رواه ابن جریر (٧٢/١٣/٨) .

فەرموت لای براکانت باسی مەکە، ئەوەتا خوای گەورە خەونەکەی هێنایەدی و چاکەی زۆری لەگەڵدا کردم، هەرئەو لەبەندیخانە ڕزگاری کردم وئێوەی لەخاکی دوری لادێکانەوە بۆ هێنامە ناوشار پاش ئەوەی شەیتان دوژمنایەتیو ناکۆکی خسبووە نێوان من و براکانمەوە و ئاوامان بەسەر هات کە بەسەرمان هات، بەڕاستی خوای گەورە بەبەزەییە بەرانبەر بەهەر کەسێك کە بیەوێت و هەرئەو زاناو کار بەجێیە .

(أهل الكتاب) دەڵێن: کە (یوسف) (عليه السلام)بەهۆی ئەو خۆراك و گەنجینە زۆرەی لەبەردەستی دابوو، هەموو شتێکی لەخەڵکی (میصر)کڕی، تەنانەت مرۆڤەکانیشی کڕیو بوون بە (کۆیلە)، پاشان هەموویانی ئازادکرد و زەوی پێدان کە ئیشی تێدا بکەن بەپێنج یەك، واتا: چوار بەش بۆ خۆیان و بەشێك بۆ پاشا، ئەم نەریتەش لە(میصر)دابوو بەباو لەدوای (یوسف)یش(عليه السلام)، (الثعلبي) دەڵێت: یوسف (عليه السلام)لەو وشکەساڵییەکاندا هەرگیز تێری نەدەخوارد، نەبادا کەسانی برسیو هەژاری لەبیر بچێتەوە، بەڵکو ڕۆژانە تەنها نیوەژەمی نیوەڕۆی دەخوارد، پاشان پاشاکانی تریش چاویان لەئەو دەکرد، هەروەها عومەری کوڕی خطابیش (رضي الله عنه) لە وشکە ساڵییەکەی (الرمادە)دا هەرگیز تێری نەدەخوارد .

جا کاتێك یوسف (عليه السلام)بینی کەخوای گەورە هەموو جۆرە نازو بەخشیشێکی پێداوە، سوپاسی پەروەردگاری کردو بۆی دەرکەوت کەخانەی دنیا تەواودەبێ و دەبێت بەجێی بهێڵین، لەبەرئەوە هەرچەند تێروپڕ و خاوەن سامان و ماڵ بین سەرئەنجام دەست بەتاڵ بێمایەیت، ئیتر لەخوای گەورە پاڕایەوە تاکو بیمرێنێت لەسەر ئاینی ئیسلام وشادی بکات بەکاروانی خواناسان و چاکەکاران، هەروەکو لەنزاکردندا دەگوترێت: (پەروەردگارا بەموسوڵمانی بمانژێنەو بەموسوڵمانی بمانمرێنە)[114]، لەوانەیە (یوسف)ی پێغەمبەریش (عليه السلام)لەکاتی سەرەمەرگدا ئەو نزایەی کردبێ، هەروەکو چۆن پێغەمبەری خۆمان (ﷺ) لەسەرەمەرگدا فەرمووی (اللهم في الرفيق الأعلي) [115] سێجار ئەوەی فەرموو، پاشان گیانی پیرۆزی سپارد (عليه السلام)لەپەیامی ئەواندا دروست بووە مرۆڤ داوای مەرگ بکات لەخوای گەورە، (یوسف) (عليه السلام)یەکەم پێغەمبەرە کەداوای مەرگی کردبێ بەڵام لەئاینی ئێمەدا دروست نیە، مەریەمی دایکی عیساش (عليه السلام)مەرگی بەئاوات دەخواست کەفەرمووی: ﴿قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا﴾ (مريم/٢٣)، هەروەها ئەو کەسانەی کەناڕەحەتی و فیتنەییان

---

114 صحيح: رواه أحمد (٤٢٤)، بخاري في الادب المفرد/٦٩٩ وصححه الالباني .

115 متفق عليه: البخاري (٤٤٣٦)، مسلم (٦٢٤٧) .

هاتۆته ڕێو مەرگیان بەباشتر زانیوه لەژیان داوای مەرگیان لەخوا کردووه، لەوانەش (علی کوڕی أبی طالب) (رضي الله عنه) لەکاتی فیتنەکەدا، هەروەها پێشەوا (بخاری) .

(ابن اسحاق) له (أهل الکتاب)ەوه دەگێڕنەوه کە یەعقوب (علیه السلام)لەمیصر لەدەوروبەری (یوسف)دا (علیه السلام)دا ماوەی حەڤدە ساڵ ژیاوەو پاشان کۆچی دوایی کردووه، وەسیەتی کردوزوه بۆ (یوسف) (علیه السلام)کە لەهەمان ئەشکەوت لەلای گوڕی ئیبراهیم و ئیسحاق (علیه السلام)بەخاکی بسپێرێت، ئیتر ئەویش وەسیەتەکەی بەجێ هێناو بردیەوه بۆ وولاتی (شام) .

(اهل الکتاب) پێیان وایه کەکاتێك (یەعقوب) (علیه السلام)چۆ بۆ (میصر) تەمەنی (سەدو سی ساڵ) بووەو ماوەی حەڤدە ساڵ لەوێ ژیاوه لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێن تەمەنی (سەدو چل)ساڵ بووه و دیاره ئەوەش هەڵەیەکی گەورەیه، چونکه خوای گەوره خۆی دەفەرموێت: ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِن بَعْدِي قَالُوا نَعْبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلَٰهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ (البقرة:١٣٣)، واتا: ئایا ئێوه لەو کاتەدا لەوێبوون کەیەعقوب گیانی دەسپارد و بە کوڕەکانی گوت: دوای مردنی من کێ دەپەرستن ؟ ئەوانیش گوتیان: خوای تۆو باووباپیرانت (لەئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق) دەپەرستین کەیەك خوایەو ئێمە بڕوامان بە ئەو هێناوه .

گوتراوه: وەسیەتی بەوه بۆکردن کە لەئیسلامدا هەیه، بەڵام (أهل الکتاب) دەڵێن: یەك بەیەك وەسیەتی بۆ هەموو کوڕەکانی کردووەو گەلێك مژدەی پێداون، لەوانەش بە (یەهوذا)ی کوڕی ڕاگەیاندووه کە لەبەرو بەرەچەی تۆ پێغەمبەرێکی زۆر پاك و پیرۆز دەکەوێتەوه، ئەویس (عیسا)ی کوڕی مەریەم(علیه السلام)، ووتراوه کاتێك (یەعقوب) (علیه السلام)کۆچی دوایی کرد خەڵکی میصر حەفتا ڕۆژ بۆی گریان، (یوسف) (علیه السلام)فەرمانی بەپزیشکان کردو بەتەواوەتی چاودێرییان کرد و چل ڕۆژ لەلای مایەوەو ئینجا (یوسف) (علیه السلام)یارمەتی لەپاشای (میصر) خواست و لەگەڵ تەرمی پیرۆزی باوکیدا ڕۆیشت، پاشان مۆڵەتیداو گەوره پیاوانی (میصر)یش لەگەڵیدا ڕۆیشتن، تا گەیشتنه (حەبرون) و لەو ئەشکەوته ئەسپەردەی خاکییان کرد کەکاتی خۆی (ئیبراهیمی خلیل) (علیه السلام)له (عەفرونی کوڕی صەخەری حەیثي) کڕیبووی، حەوت ڕۆژ پرسەیان بۆگرت، پاشان گەڕانەوه (میصر) و براکانی یوسف (علیه السلام)هەموویان سەرەخۆشیان لە یوسف کرد، ئیتر لەوێدا ژیان .

## كۆچی دوایی یوسف پێغەمبەر ( درود و سەلامی خوای لەسەر بێت )

یوسف (علیه السلام)کۆچی دوایی کرد، وەسیەتی کرد کەلای گۆڕی باوانی ئەسپەردەی خاك بکرێ، ئیتر کفنیان کرد و خستیانە تابوتەوە و لە (میصر) هێنشتیانەوە تاکو (موسا) (علیه السلام)هات و بردی لەو شوێنە بەخاکی ئەسپاردە کرد کە وەسیەتی کردبوو، ووتراوە (یوسف) (علیه السلام)لەتەمەنی (سەد و دە)ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، هەروەك (ابن جریر) فەرموویەتی: (مبارك)ی کوڕی (فضالة)ش[116] لە حەسەنەوە دەگێڕنەوە کە (یوسف) (علیه السلام)لەتەمەنی حەڤدە ساڵیدا خرایە بیرکەوە، ماوەی هەشتا ساڵ لەباوکی وون بوو، پاشان بیست و سێ ساڵیتر ژیاو لەتەمەنی سەدوبیست ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، هەندێك گوتویانە: وەسیەتی خۆی بۆ (یەهوذا)ی برای کردووە سەلامی خوای لێبێت .

---

[116] صحيح ابن جرير (٧١/١٣/٨)، ابن أبي حاتم (١٢٠٠١) .

## ﴿ پێغەمبەری خوا ( أیوب ) ( درودو سەلامی خوای لەسەربێت )﴾

(ابن اسحاق)[1] دەفەرموێت: (ئەیوب) (علیه السلام)پیاوێکی ڕۆمی یە و ناوی تەواوی (ایوب)ی کوڕی (موص)ی کوڕی (رازح)ی کوڕی (عیص)ی کوڕی (اسحاق)ی کوڕی (ابراهیم الخلیل)ە، کەسانی تریش جگە لەئەو فەرمویانە: ناوی (ایوب)ی کوڕی (موص)ی کوڕی (ڕەعویل)ی کوڕی (عیص)ی کوڕی (اسحاق)ی کوڕی (یعقوب)ە، هی تریش هەبون کە بۆچوونی تریان هەیە دەربارەی ناوو شەجەرەی (أیوب) (علیه السلام)، (ابن عساکر)[2] واباس دەکات کە دایکی کچی (لوط) بوە(علیه السلام)، وتراوە :باوکیشی لەوکەسانەیە کەڕۆژی ئاگرەکە بڕوای بە (ئیبراهیم) (علیه السلام) هێناوە و موسڵمان بوە، کاتێك بینیویەتی ئاگرەکە (ابراهیم)ناسوتێنێ، ڕای یەکەمیان باوترە، چونکە (ایوب) (علیه السلام)بن و بنەچەی دەچێتەوە سەر (ابراهیم) (علیه السلام) هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ ذُرِّيَّتِهِ دَاوُدَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ﴾ (الأنعام:٨٤)، واتا: لەبەرو بەرەچەی ئەو – واتا ئیبراهیم – ئەمانە کەوتنەوە کە بریتین لەداودو سولەیمان و ئەیوب و یوسف و موسا و هارون، ئاوا پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە .

زۆربەی ڕاوبۆچونەکان لەگەڵ ئەوەدان کەئەو ڕاناوە (ئەو)دەگەڕێتەوە بۆ (ابراهیم) (علیه السلام) نەك (نوح)، کەیەکێکە لەو پێغەمبەرانەی بەدەقی قورئان ناوی هاتوە کەوەحی بۆ دابەزیوە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:﴿إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ ...وَعِيسَى وَأَيُّوبَ﴾ (النساء:١٦٣) ئەوەیان ڕاستە کە دەگەڕێتەوە سەر (عیص)ی کوڕی (اسحاق)واباس دەکەن کەژنەکەیشی ناوی (لیا)ی کچی (یەعقوب)ە، یان (ڕەحمەی کچی ئەفرائیم)ە، وتراوە ناوی (لیا)ی کچی (منسام ی کوڕی (یعقوب)ە، ئەمەشیان باوترە، هەرلەبەرئەوەشە لێرەدا باسمان کردووە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ...وَذِكْرَى لِلْعَابِدِينَ﴾الأنبیاء (٨٣ – ٨٤)، واتا :هەروەها ئەیوبیش کاتێك بانگی لەپەروەردگاری خۆی کردو گوتی: بەڕاستی من ئێش و زیانم پێ گەیشتوە،تۆش لەهەموو بەزەییدارەکان خاوەن بەزەتری، لەبەرئەوە ئێمەش وەڵاممان دایەوە و زیان و ئێشەکەیمان لەسەر لابردو خۆی و خێزانمان خستەوەناو بەزەیی خۆمان و کردمانە مایەی یادو باسی خواپەرستان، هەروەها خوای گەورە لەسورەتی(ص ئایەتی ٤١–٤٤)دا باسی هەمان ئێش و ئازاری ئەیوب

---

[1] ضعیف ألآسناد،رواه ابن جریر (١٠ / ١٧ / ٦٥ ) .

[2] تأریخ دمشق (١٠ / ٨٥ ) .

دەکات .(ابن عساکر)[1] لەرێگەی (الکلبي)یەوە دەڵێن: کەیەکەم پێغەبەر (ئیدریس) بوە، پاشان (نوح) ئینجا بەم شێوەیە بوە (ابراهیم، اسماعیل، اسحاق، یعقوب،یوسف، لوط، هود، صالح، شعیب، موسی، هارون، الیاس، الیسع، عرفی کوڕی سویەلغی کوڕی ئەفرائیمی کوڕی یوسفی کوڕی یەعقوب، یونس، أیوب کوڕی رازح کوڕی ئاموص کوڕی لیفرز کوڕی عیص کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم، ئەم ڕیزکردنەش سەرنج و وردبونەوەی زیاتر هەڵدەگرێ،چونکە هود و صالح بەناوبانگترن بەوەی کە لەدوای (نوح)و پێش (ابراهیم)بون . خوای گەورە زاناترە .

زانایانی ئەفسیر و مێژوو زانایانی بوارەکانی تر دەڵێن: (أیوب) (علیه السلام)پیاوێکی دەوڵە مەندبوەو لەهەموو جۆرە نیعمەتەکاندا لەهەموو کەس زیاتری هەبوە، لەچاخی خۆیدا، وەکو هەبونی ئاژەڵ و کۆیلە و چوارپێ و زەوی و زاری فراوان و زۆری خاکی حۆران هی ئەوبوە . (ابن عساکر)[2] دەگێڕێتەوە کە هەموو خاکی حۆران هی ئەوبوە، منداڵ و بەروبەرچەیەکی زۆری لێ کەوتوەتەوە، کەخاوەنی هەمووشتەکان بنەچەیان دەچێتەوە سەر (أیوب)(علیه السلام)، خوای گەورە بەچەندین جۆرە دەردو نەخۆشی لاشەیی تاقیکردەوە،تەنانەت جگە لە دڵ و زمانی هیچ ئەندامێکی لەشی بەساغی نەمایەوە، بەڵام بە (دڵ و زمان)یشی لەیادی خوای گەورە نەکەوت و بەردەوام ناوی خوا لەدڵ و زمانیدا دەگوترایەوە، گەلێك ئارامگرو ڕازی بوە بەبەشی خوا، شەوو ڕۆژ سوپاسگوزاری خوای گەورە بوە، نەخۆشیەکەی درێژەی کێشا و بەتەواوەتی پەکی خست، تاکو خەڵکی لێی دورکەوتنەوە و پزیشکانیش وایان پێ باش بوو کەلەشار بکرێتە دەرەوە و لەخەڵکی دوور بخرێتەوە، لەبەرئەوە بردیان بۆ کەناری شار، کەسی بەدەورەوە نەما، بێجگە لە ژنەکەی، کەچاودێری دەکردو بەوەفابوو بەرانبەر بەو چاکانەی کە پێشتر (ئەیوب) (علیه السلام) بەرانبەری کرد بوی . ژنەکەی بەوردی چاودێری دەکرد و تیماری دەکرد، ماڵ و سامانی نەما، هەژارو دەردو دارکەوت، تەنانەت ژنەکەی ڕۆژانە دەچو لەناوشار خزمەتی خەڵکی دەکردو ئەو پارەیەی بەوە پەیدای دەکرد دەیدا بەخۆراك و پێویستی و پێشکەش بە (أیوب)ی دەکرد، (علیه السلام)، ژنەکەیشی نمونەی ئارامگر بو لەگەڵیدا کەوێڕای نەمانی ماڵ و منداڵ و سامانیش هێشتا وەفادارانە دەست بەرداری مێردە نەخۆش و زامدارەکەی

---

[1] ضعیف: تاریخ ١٠ / ٥٨ .

[2] هەمان سەرچاوە .

نەدەبو، خوای گەورە لەئەویش خۆش بێت و پاداشتی بداتەوە لە (الصحيح)[1]دا هاتووە کە پێغەمبەرمان(ﷺ)فەرمویەتی: (ئەوکەسەی خراپترین و گرانترین ناڕەحەتی بەسەردێت پێغەمبەرانن، پاشان چاکەکاران،پاشان بەوجۆرە بەدوای یەکتری دا، مرۆڤ بەپێی بڕی ئایینەکەی تاقی دەکرێتەوە جائەگەر باوەڕەکەی بەهێز بو ئەوا بەشتی گرانتر تاقی دەکرێتەوە) . بەڵێ لەهەمووبارەکاندا (ایوب) (عليه السلام) هەر ڕازی بو بەبەشی خوای گەورە . . ئارامی دەگرت، یادی خوای دەکرد، سوپاسگوزاربوو، تەنانەت ئارامگری (ئەیوب) س. خ بەنمونە دەهێنرێتەوە لەگەڵ هەبونی بەڵاو ناڕەحەتی زۆریشدا .

لە (وهب کوڕی مبنه)[2] لەگەڵ هەندێ لەزانایانی (بنی اسرائیل)کە چیرۆکی تاقیکردنەوەو بەڵای (ایوب)(عليه السلام) دورو درێژە، سەندنەوەی سامان و ماڵەکەی و منداڵەکانی و دوچاربوونی خۆیشی بەنەخۆشی کوشندە، خوای گەورە باشتر دەزانێت .

لە (مجاهد)ەوە دەگێڕنەوە کە گوتویەتی: (ایوب)(عليه السلام) یەکەم کەسە کە ئاوڵەی گرتوە، زانایانی ڕای جیاجیایان هەیە دەربارەی ماوەی توش بونەکەی، (وهب)پێی وایە کە ماوەی (سێ) ساڵی خایاندوەو لەوەش زیاتر و کەمتر نەبوە، بەڵام (أنس) (عليه السلام)دەڵێت: حەوت ساڵ و چەند مانگێکی خایاندوە، فڕێدراوەتە زبڵدانی کەنار شارەوە، کرم لەشی داگرتوە، پاشان خوای گەورە دەروی بەخێری لێکردوەتەوەو پاداشتی چەندانە لێکردوە بۆی و چاکی کردوەتەوە، پاش ئەوەی کە سوپاسێکی زۆری خوای کردووەو ئارامی گرتوە . (حمید) [3] دەڵێت: ماوەی هەژدەساڵ دەردەدار و زەلیل بوە، (السدی) [4] دەڵێت: گۆشتی لەشی دائەوەریە سەر زەوی و سەرەنجام تەنها ئێسك و دەمارەکانی بەلەشیەوە مایەوە،ژنەکەی خۆڵەمێشی ئەهێناو لەژێریدا سدایدەخست، کاتێك نەخۆشیەکەی درێژەی کێشا ژنەکەی پێی گوت: ئەی ئەیوب بەڵکو داوا لەپەروەردگار بکەیت یەکلاییت بکاتەوەو دەروی بەخێرت لێ بکاتەوە، بەڵام ئەیوب (عليه السلام)فەرمووی من حەفتا ساڵ بەبێ دەردو نەخۆشی ژیاوم ئەی بەکەمی نازانیت کەلەسەرئەم بارەش حەفتا ساڵ بۆ خواو لەبەر ئەو ئارام بگرم ؟ ژنەکەی لەم قسەیە سەرسام ما . .! کاتێك خزمەتکاری خەڵکی دەکردو بەکرێ یەکەی خزمەتی ئەیوبی

---

[1] حسن: رواه احمد (١/ ١٧٢)، ترمذي (٢٣٩٨ )، النسائي (٧٤٨١)، ابن ماجة (٤٠٢٣)(٤٠٢٤)، بخاري (٥١٠)، نسائي (٧٤٨٢).

[2] حسن اليه: رواه ابن جرير (١٠/ ١٧ / ٥٧ ) .

[3] تأريخ دمشق (١٠/ ٧٣) .

[4] لم اقف عليه .

دەكرد (عليه السلام). لەلايەكى ترەوە خەڵكەكە ئەوەى بيناسيبايە كە ئەوە ژنى ئەيوبە، بەكرێيان نەدەگرت و ئيشيان پىٚ نەدەدا، چونكە دەترسان بەهۆى تێكەڵاوبون و لێنزيكبونەوەى لە (ئەيوب)ەوە ئەوانيش هەمان دەردو نەخۆشى بگرن، ئيتر كار گەيشتە ئەو ئاستە كە ژنەكەى هيچ ئيشێكى دەست نەدەكەوت، تا سەرەنجام ڕۆژێكيان يەكێك لەپرچەكانى خۆى بڕى بو، فرۆشتبووى بەكچى گەورە پياوانى ناودارى شارو بەپارەكەى خواردنێكى باشى كڕيبوو بۆ (ايوب)(عليه السلام) س، (ئەيوب پێغەمبەر)(عليه السلام) بە سەرسامىيەوە پرسى: ئەمەت لەكوىٚ هێناوە ؟ ژنەكەى فەرمووى: خزمەتكارى خەڵكم كردووە، واتا دەرى نەبڕى كە پرچى خۆى بڕيوە .

بۆ ڕۆژى دوايى، ديسان ژنەكەى ڕۆيشت تاكو خزمەتكارى خەڵكى بكات، بەلاّم كەس نەيگرت بەكرىٚ، بەناچارى پرچەكەى تريشى بڕى و فرۆشتى و داى بە خۆراك و هێناى بۆ (ئەيوب) (عليه السلام)، بەلاّم ئەم جارە (ايوب)سوێندى خوار ئەو خواردنە ناخوات هەتاكو دڵنيا نەبێت ئاخۆ ژنەكەى لەكوىٚ و چۆن هێناويەتى . . ! ئيتر ژنەكەى لەچكى لەسەرسەرى لابردو (ايوب)يش U زانى كە پرچەكانى بڕيوەو فرۆشتويەتى، ئيتر لێرەدا (ايوب)(عليه السلام) پڕ بەدڵ لەخواى گەورە پاڕايەوەو فەرمووى: ﴿أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ﴾ (الانبياء:٨٣) واتا: من زيان و ئێشم پىٚ گەيشتوەو تۆش لەهەموو خاوەن بەزەيەك بەبەزەيى تريت !) . (ابن ابى حاتم)[1] دەيباتەوە سەر (عبدالله)ى كوڕى (عبيد)ى كوڕى (عومەير)كە دەڵێت: (ايوب) (عليه السلام)دوو براى هەبوە، ڕۆژێكيان هاتن بۆ سەردانى، بەلاّم لەبەربۆن و بەرامەى ناخۆش نەخۆشيەكەى (ايوب)(عليه السلام) نەيانتوانى لێى نزيك ببنەوە، لەدورەوە ڕاوەستان، يەكيان بەئەوى تريانى گوت: خوا دەزانێت كەئەيوب هيچ خێرو بێرێكى نيە، بۆيە بەم دەردەى بردوە، (ايوب) (عليه السلام) بەم وتەيە زۆر پەرێشان بو بەجۆرێك كە هەرگيز بەهيچ شتێك هێندە پەرێشان نەبوە پێشتر، بۆيە لێرەدا (ايوب) (عليه السلام) فەرمووى: (خوايە گيان تۆ باشتر لەمن دەزانيت، ئەگەر تەنها يەك شەو من تێر بوبێتم، لەكاتێكدا شوێنى برسيەكەم شك بردبىٚ بيدەرەوە بەچاومدا)لەئاسمانەوە پشتگيرى لێكراو دوبراكەيشى بيستيان، پاشان فەرموى: (خوايە گيان تۆباش لەمن دەزانيت، ئەگەر هەرگيز دووكراسم هەبووبێت لەكاتێكدا زانيبێتم كە هەژارێك هەيەو بۆم نەناردبێت، ئەگەر وانيە بيدەرەوە بەچاومدا)،

---

[1] صحيح اليه: ابن ابي حاتم (١٣٦٩٥)

**دیسان پشتگیری ڕاستی قسەکەی لێکراو هەردوو براکەیشی بیستیان،پاشان فەرمووی: (خوایە بۆ خاتری عیزەتی خۆت)ئینجا کەوت بەکڕنووشداو فەرمووی: (خوایە بۆ خاتری عیزەتی خۆت سەرم بەرزنەکەمەوە هەتاچاکم دەکەیتەوە)بەڵێ سەری بەرز نەکردەوە هەتا خوای گەورە چاکی کردەوە .**

**(ابن ابی حاتم و ابن جریر)[1] دەیبەنەوەسەر(انس)ی کوڕ ی (مالك) کە پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموی: پێغەمبەری خوا ئەیوب ماوەی هەژدەساڵ دەردەداربوو، کەس و کاری دورو نزیکی لێی دورکەوتنەوە، تەنها دوو برای نەبێت کە جاروبارسەردانیان دەکرد، ڕۆژێکیان یەکیان بەوی تریانی گوت: ئەزانیت بۆیە ئەیوب وای بەسەر هاتوە، چونکە تاوانێکی کردوە کە هیچ کەسێك تاوانی وای نەکردووە ؟ براکەی پێی گوت: ئەو تاوانەی ئەیوب چی بوو ؟ گوتی: ماوەی هەژدەساڵە خوای گەورە بەزەیی پێیدا نەهاتوەتەوەو چاکی نەکردوەتەوە، جاکاتێك چوونەلای ئەیوب، ئەوەیان هیچ خۆی پێ نەگیراو ئەو قسەیەی لای ئەیوب (علیه السلام) باس کرد، ئەیوب (علیه السلام) فەرمووی: نازانم مەبەستت چییە ؟ ئەوە نەبێت کە خوای گەورە خۆی باشتر دەزانێت ؟ جارێکیان بەلای دووپیاودا ڕەت بووم، کە هەردوکیان لێك ڕاسابون و ناوی خواشیان دەهێنا . من گوێم نەدانێ و چووم بۆ ماڵەوە، ئەوەم دەرنەخست بۆیان و پێم نەگوتن کە دەبێت تەنها لەشتی هەق و ڕاست دا ناوی خوا ببرێت، کاتێك ئەیوب دەیویست بچێت بۆسەر ئاو لەکاتی نەخۆشیەکەیدا، دەبوایە ژنەکەی دەستی بگرتایە و بیبردایەو بیگەڕاندایەتەوە شوێنی خۆی، ڕۆژێك ژنەکەی تۆزێ درەنگ بەدەمیەوە هات، تاکو خوای گەورە وەحی نارد بۆ ئەیوب و فەرمووی: (أركضْ برجلك هذا مغتسل باردٌ وشراب)[2] ژنەکەی درەنگ گەڕایەوە، بەملاولادا چاوی دەگێڕا بۆ ئەیوب، بەڵام خوای گەورە ئەیوبی چاك کردبوەوە،**

**بگرە زۆر لەجاری جارانیش جوانتر بو، کاتێك ژنەکەی ئەیوبی بەو شێوەیە دیت، گوتی: خوای گەورە لێت پیرۆزبکات، ئەی پێغەمبەری خوا ئەو گیرۆدەیەت بینی ؟ سوێند بە خوا پیاوێکم بینی کەلەتۆدەچوو بەڵام ئەو لەش ساغ بو ؟ ئەیوب فەرمووی: منم . . ئەوە خۆمم، فەرمووی: دووخەرمانی هەبوو، خەرمانێك بۆ گەنم و خەرمانێك بۆ جۆ، خوای گەورە دوو پەڵە هەوری ناردەسەر دوو خەرمانەکە، یەکەمیان چوە سەر خەرمانی**

---

[1] سندە صحیح: ابن ابي حاتم (١٣٦٩٨)، ابن جریر (١٢ / ٢٣ / ١٦٧ )

[2] سورەتی (ص)ئایەتی (٤٢)، واتا: لەجێی خۆتا قاچت بکێشە بەزەویدا ئاوی دەست شۆرو ساردو خواردنەوەت بۆ هەڵ دەقوڵێت .

گەنمەکەو پارەی بەسەرداڕشت، تاکو پڕی کرد، دووەمیان چوە سەر خەرمانی جۆیەکەو پارەی بەسەردا ڕشت تاکو پڕی کرد – ئەمە دەقی گێڕانەوەی (ابن جریر)ە (ابن حبان)[1]یش بەتەواوەتی گێڕاویەتەوە لە (صحیح)ە کەیدا ئەوەش زیاتر بەلای (غریب رفعه)دا دەڕوات و پێدەچێت کە (موقوف)بێت . (ابن ابی حاتم)[2]دەیباتەوە سەر (ابن عباس)و دەیگێڕێتەوە کەخوای گەورە خشڵی بەهەشتی کردەبەری (ئەیوب)(علیه السلام)، ئیتر (ایوب)چوولەولاوە دانیشت، کاتێك ژنەکەی گەڕایەوە، (ایوب)ی نەناسیەوە، بۆیە لەئەوی پرسی: ئەی بەندەی خوا ئەو پیاوە گیرۆدەو دەردەدارەی لێرەدا بوو چی بەسەر هات ؟ ڕەنگە سەگ و گورگ خواردبێتیان ! ماوەی نزیکەی کاتژمێرێك گفتوگۆو قسەوباسیان بو، تاکو پیاوەکە گوتی داماو بۆ نامناسیتەوە من (ئەیوب)م، ژنەکەی گوتی: ئەی بەندەی خوا گاڵتەم پیێ دەکەیت ؟ دیسان (ئەیوب) (علیه السلام) فەرمووی منم، من، من ئەیوبم، خوای گەورە چاکی کردمەوە (ابن عباس)[3] دەڵێت: خوای گەورە ماڵ و منداڵەکانی بۆ زیندو کردەوە، بەخۆیان و خێزانەکانیانەوە، بەڵام (وهب کوڕی منبه) دەڵێت: خوای گەورە وەحی نارد بۆ ئەیوب و پێی فەرموو کە ماڵ و مناڵەکانت پیێ دەبەخشمەوە، هێندەی ئەوانیش زیاترت دەدەمێ، دەی تۆش هەستە بەو ئاوە خۆت بشۆ، چارەسەری تۆ لەوئاوەدایە،قوربانی بکە بۆ هاوەڵەکانت و داوای لێخۆشبونیان بۆ بکە، چونکە ئەوانە لەمن یاخی بون لەسەرتۆ.(ابن ابی حاتم)گێڕاویەتەوە ،هەر (ابن ابی حاتم) فەرمودەیەکی هێناوە کە بردویەتیەوە سەر ابو هریرە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: (کاتێك خوای گەورە شیفای بۆ ئەیوب نارد (علیه السلام) کوللەی زێڕینی بەسەر داباراند، ئەویش کوللەکانی دەگرت و دەیخستنە ژێر کراسەکەیەوە (واتا بن باڵی)، پێی گوترا: ئەی ئەیوب ئایا تێر نەبویت ؟ فەرموی: ئەی پەروەردگار کێ لە ڕەحمەتی تۆ تێر دەبێت) پێشەوا (أحمد)[4]یش هەربەو جۆرە هێناویەتی لەگەڵ (ابن حبان)[5] دا. پێشەوا (احمد) دووفەرموودەی هاوشێوەی تری ئەم فەرموودەیەی هێناوە کە هەردوکیان دەچنەوە سەرگێڕانەوەی ابو هریرەله (مسند)ە کەیدا (٢ / ٢٤٣)، (٣١٤)، وە (بخاری / ٢٠٧٣) .

---

[1] سنده صحیح: ابن حبان (٢٨٩٨) .

[2] ضعیف الیه: ابن ابي حاتم (١٣٦٩٩).

[3] ابن جریر (١٠ / ١٧ /٧٢) .

[4] صحیح: احمد (٢ / ٣٠٤) .

[5] صحیح: ابن حبان (٦٢٣٠) .

خوای گەورە دەفەرموێت: (اركضْ برجلك) واتا: ئەی ئەیوب قاچت بکوتە بەزەویدا،ئەویش فرمانی خوای وەکو خۆی بەجێ هێنا، ئیتر خوای گەورە کانیاوێکی ساردو سازگارو فێنکی بۆ هەڵقوڵاندو فرمانی پێ کرد کە خۆی پێ بشوات و لێی بخواتەوە، چونکە بەوە شیفای بۆ دێت و ئازارو ئێش و نەخۆشی لەلەشی دا نامێنێ و بەدیارو نادیارەوە، پاشانیش خوای گەورە ماڵ و سامانی بەسەردا هەڵڕشت و جێ نشینی پێدا لەمنداڵەکانی خۆی، یان منداڵەکانی بۆ زیندوو کردەوە، خوا دەیزانێت، ﴿وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُمْ مَعَهُمْ﴾، وتراوە: نەخێر خوای گەورە پاداشتی ئەوەی داوەتەوە کە منداڵەکانی لێ سەندۆتەوە، منداڵی تری پێ بەخشیوە، لەقیامەتیشدا هەموویانی پێکەوە دەداتەوە .﴿رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنَا﴾ واتە: ئەوەش ڕەحمەتی بەزەیی ئێمە بۆ بەرانبەر کەئازارەکەمان لەسەر لابردو چاکمان مردەوە، ﴿فَكَشَفْنَا مَا بِهِ مِنْ ضُرٍّ وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُمْ مَعَهُمْ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنَا وَذِكْرَى لِلْعَابِدِينَ﴾ کردمانە مایەی یادو باس و خواس و نمونەی خواناسان، بەهۆی ئەو ئازارو دەردە توندەی کەئەومان پێ تاقی کردەوە، لەگەڵ ئەو هەموو ماڵ و سامان و منداڵانەی پێمان بەخشی و لێمان سەندەوە و پێمان دایەوە بەزیادیشەوە، بەڵام ئەویش سوپاسگوزاری خوابو، ئارامی گرت، بۆیە پاداشتی چاکەمان دایەوەو ڕزگارمان کرد، سەرفەزاری هەردودنیامان کرد . هەندێ کەس لە ڕوانگەی ئەو ئایەتەوە فەرمویانە ژنی (ئەیوب) (عليه السلام)ناوی (ڕەحمە)بوە، (ضحاك) لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە کە: خوای گەورە لاوێتی گەڕاندۆتەوە بۆ ژنەکەی (أيوب)و تەمەنی درێژ کردوە، بەڕاددەیەك کەدواتر (بیست و شەش)کوڕی تری لە (ایوب)بوە(عليه السلام)، (ئەیوب)یش (عليه السلام) پاش ئەوە ماوەی حەفتا ساڵ لەخاکی ڕۆم دا ژیاوە و لەسەر ئاینی ئیبراهیم (عليه السلام)بەردەوام بوون و پاشان وردە ... وردە خەڵکی لەو ئاینە لایانداوە . خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثاً فَاضْرِبْ بِهِ وَلَا تَحْنَثْ إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِراً نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾ سورەتی (ص)، ئایەتی ژمارە (٤٤)، ئەم ئایەتە مۆڵەت پێدانی خوای گەورەیە بە (أيوب) (عليه السلام) تاکو ئەو کارە ئەنجام بدات کە سوێندی لەسەر خواردبو، چونکە (أيوب) (عليه السلام)بڕیاری دابو، وەسوێندی خواردبو، کە (سەد)قامچی لەژنەکەی خۆی بدات، وتراوە چونکە بێ پرس و ڕای ئەو پرچەکانی خۆی فرۆشتوە، یان چونکە جارێکیان شەیتان لەشێوەی پزیشك داهاتوە تاکو چارەسەر بۆ (أيوب)دابنێ، ئیتر ژنەکەی هاتوە بۆلای (أيوب)(عليه السلام) و پێی ڕاگەیاندوە کە پزیشکێك هاتوە بۆ لات، بەڵام کاتێك (ایوب)(عليه السلام) چاوی پێی دەکەوێت دەزانێت کەئەوە شەیتانە، لێرەدا (أيوب) (عليه السلام)سوێند دەخوات لەتۆڵەی ئەوەدا سەد قامچی

لەژنەکەی بدات، جاکاتێك خوای گەورە شیفای نارد بۆ (أیوب) ڕێگەی بەجێ هێنانی سوێندەکەی بۆ ئاسان کرد، بەوەی کە سەد لکی جامانەکەی، کەوەك عەگالە وابوە بەیەکەوە بگرێت و بەیەك جار بیکێشێ بەژنەکەیدا، ئەوەش بۆی بری ئەوە دەکەوێت کە سەد قامچی لێ دابێت و سوێندەکەی لەسەرلادەچێت و ژنەکەیشی لەو تۆڵەیە پاك دەبێتەوە، لێرەوە زانایان بەپێی کارئاسانی ئەم ئایەتە ئەوەیان خواستوە کە دەکرێت (سەد)قامچی بکرێت بەیەك جار، واتا سەد قامچی بەیەکەوە ببەستیت و بەیەك جار بیدەی لەهەر تاوانبارێك وەك ئەوە وایە (سەد قامچی)لێ درابێ، هەروەها زانایان گەلێك حوکم و لێکدانەوەو شتی تریان لەمانای ئەو ئایەت و هەڵوێستە وە هەڵگواستوە . (ابن جریر) و هەندێکی ترو ژمارەیەك زانایانی مێژوو وا باس دەکەن کە کاتێك (أیوب) (علیه السلام)کۆچی دوایی کرد، تەمەنی نەوەدو سێ ساڵ بوە، وتراوە: نەخێر لەوەش زیاتر بوە . فەرمودەیەك هەیە کە (لیث)لە (مجاهد)ەوە واتاکەی هێناوە بەم جۆرە: (خوای گەورە ڕۆژی دوایی نمونەی سولەیمان (علیه السلام) دێنێتەوە بەسەر دەوڵەمەندەکاندا، وەنمونەی یوسف (علیه السلام) بەسەر جوانەکاندا، وەبە(ئەیوب)(علیه السلام) بەسەر ئەوانەی کە گیرۆدەی بەڵاو نارەحەتی بون) (ابن عساکر)[1] ئەو مانایەی گێڕاوەتەوە، (أیوب)(علیه السلام) وەسیەتی خۆی بۆ (بشر)ی کوڕی بەجێ هێشت، کەهەندێ کەس پێیان وایە ئەو (ذو الکفل)بوە، خوای گەورە دەزانێت، ئەم کوڕەیشی پێغەمبەرێك بوە، وەك باس دەکەن، وەتەمەنی حەفتاو پێنج ساڵ بوە، لەبەرئەوەی هەندێ کەس پێیان وایە (ذو الکفل)کوڕی (ایوب) بوە(علیه السلام)، لێرەدا ژیانەکەی باس دەکەین .

## ﴿ژیانی ( ذو الکفل ) کە وا باوە گەورەی ئەیوب بوە ( سلاوی خوایان لەسەر بێت )﴾

خوای گەورە لەسورەتی(الآنبیاء)دا پاش چیرۆکی ژیانی(أیوب)(علیه السلام) دەفەرموێت: ﴿وَإِسْمَاعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا الْكِفْلِ كُلٌّ مِنَ الصَّابِرِينَ وَأَدْخَلْنَاهُمْ فِي رَحْمَتِنَا إِنَّهُمْ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ (٨٥ – ٨٦)، واتا: هەریەکە لەئیسماعیل و ئیدریس و ذوالکفل ئارامگربون و خستماننە ناو ڕەحمەتی خۆمانەوە، ئەوانە لەپیاوچاکان بون، هەروەها لەسورەتی (ص)ئایەتی(٤٥ – ٨٨)دا خوای گەورە باسی چەند پێغەمبەرێك دەکات (علیه السلام)، پاشان باسی (اسماعیل والیسع و ذالکفل)دەکات و بەخێرخواز و چاکەکار ناویان دەبات . ئەوەی کەلەقورئاندا هاتوە

---

[1] ضعیف الیه: تأریخ دمشق (١٠ / ٨٢ )

**دەربارەی(ذوالكفل)هەمیشە بەكەسێكی چاك و سوپاسكراو ناوی براوە لەگەڵ پێغەمبەرانیش دا (علیهم السلام) ناوی هاتوە، واباوە كەپێغەمبەر بووە، (علیه السلام)خوای گەورە زاناترە، بەڵام هەندێكی تر لە زاناو مێژوونوسان بەپێغەمبەریان نەزانیوە،بەڵكو كەسیكی خواناس و چاكەكارو دادپەروەر بوە، هەروەكو (ابن جریر)لێرەدا ڕادەوەستێت.**

**(ابن جریر)[1] دەیباتەوە سەر (مجاهد) كە دەفەرموێت: (ذو الكفل)پێغەمبەر نەبوە، بەڵكو پیاوێكی باش و دادپەروەر بوەولەنێوان ڕۆڵەكانی گەلەكەی دا بەوەناسراوە كە داد پەروەر بوەو كەفالەتی كردون، [2] لەبەر ئەوە بە (ذالكفل)ناسراوە، لەگێڕانەوەیەكی تردا (إبن جریر) دەیباتەوە سەر (مجاهد) كە فەرمویەتی: كاتێك (ئیل یەسەع) (علیه السلام) پیربو،بەسالاچوو،خۆزگە كەسێك خۆی بكردایە بەجێنشینی من بۆ ڕاپەڕاندنی كاروبارەكان لەدوای من، بەڵام هەتا خۆم لەژیاندام بمبینیایە، ئاخۆ چۆنە و چۆن كاروبار ڕادەپەڕێنی؟! خەڵكەكەی كۆكردەوەو فەرمووی: كێ لە ئێوە سێ سیفەتی تێدا بێ دەیكەمە جێ نشینی خۆم، مەرجەكان ئەمانەن: بەڕۆژ بەڕۆژووبێت، بەشەو هەستێت بۆشەو نوێژ كردن و خواپەرستی و هەرگیز توڕە بوونیش نەزانێت ؟ پیاوێك چاوپڕ لەفرمێسك هەستاو فەرمووی: من، فەرموی: ئایا تۆ بەڕۆژ بەڕۆژوویت و شەو نوێژ دەكەیت و توڕەش نابیت ؟ فەرمووی: بەڵێ، ئیتر ئەو ڕۆژە قبوڵی نەكردو بڵاوەیان لێكرد، ڕۆژی دواتر دیسان (ئیل یەسەع) (علیه السلام) هەمان كاری كردەوەو هەمان پرسیاری لەخەڵكەكە كرد، هەموو خەڵكەكە بێ دەنگ وەستان و كەس نەبوو وەڵام بداتەوە،**
**دیسان هەمان پیاوی دوێنێ هەستایە سەرپێ و فەرمووی: من، ئیتر لێرەدا (ئیل یەسەع) (علیه السلام) كردی بەجێ نشینی خۆی .**

**شەیتان كەبەمەی زانی بەدەستو پێوەندەكانی خۆی ڕاگەیاند كە بەهەموویان لەهەوڵی فریودانی ئەو پیاوەدابن و پێی گوتن ئەو پیاوە بۆمن دابنێن . ئیتر شەیتان لەسەر شێوەی پیاوێكی پیرو هەژارو بەش خوراو دا هات بۆلای (ذو الكفل)كە شەوو ڕۆژ نەدەخەوت، كەمێك نەبێت، لەكاتی ئەو تۆزە خەوەدا هات بۆلای ولەدەرگای دا، (ذو الكفل) فەرموی: كێیە ؟ شەیتان گوتی: پیاوێكی پیری ستەملێكراو، (ذ الكفل) هەستاو دەرگاكەی لێكردووە، پیاوە پیرەكە بەسەرهاتی درۆینەی خۆی بۆ دەگێڕایەوە و گوتی: دوژمنایەتی لەنێوان من و هۆزەكەمدا هەیەو ئەوان ستەمم لێ دەكەن و ئاواو ئاوا**

---

[1] صحیح الیه: ابن جریر (١٠/ ١٧ / ٧٥ ) .

[2] صحیح الی مجاهد: ابن جریر (١٠ /١٧ / ٧٤ )، ابن ابی حاتم (١٣٧٠٢) .

زوڵمیان لیٚ کردوم، قسەکانی درێژەی کێشا تاکو کاتی خەوتنە کەیش نەما ، پێی گوت: ئەگەر دانیشتم بۆ کاروباری خەڵکی وەرە بۆلام و سکالاْی خۆت بکە، منیش هەقی خۆت لەئەوان بۆ دەسێنمەوە، ئیتر شەیتان ڕۆیشت، (ذا الکفل) لەناو کۆڕ و ئەنجومەنی کاروباردا دانیشتبوو، چاوی دەگێڕا بۆ کابرای پیر، بەڵکو هاتبێت و دوایش هەر لەناو کۆڕو ئەنجومەنەکەیدا چاوی دەگێڕا، هەردیسان نەیبینی، کەکاتی ئیشەکانی تەواو بوو، چوو بۆ ماڵەوە تاکو سەرخەوێکی کورت بشکێنیٚ، هەر کەسەری نایەوە، دیسان لەدەرگایدا، (ذالکفل) فەرمووی :کێیە ؟ گوتی: پیرێکی ستەملێکراوە، دەرگاکەی لیٚ کردەوە و فەرمووی: ئەی پێم نەگوتی: هەرکەدانیشتم بۆ کاروبار ڕاپەڕاندن وەرە بۆ لام ؟ شەیتان گوتی: گەلەکەم زۆر فێڵ بازن، دەزانن کەئەوکاتە تۆ دانیشتوی بۆ حوکمڕانی و بڕیاردان و دادگایی، لەوکاتەدا پێم دەڵێن خۆمان هەقی خۆتت دەدەینیٚ، بەلاْم هەرکەتۆ هەڵسایت دیسان ئەوان نکوڵی لەوەدەکەن، فەرمووی: بڕۆ هەرکات دانیشتم لەناو کۆڕدا بۆ کاروبار ڕاپەڕاندن ئەوسا وەرە بۆلام، دیسان هێندەی قسە لەگەڵ کرد تاکو خەوەکەی لیٚ زڕاند، ئینجا(ذ الکفل) هەستا ڕۆیشت بۆ شوێنی حوکمڕانی و دادوسکالاْ، گەلێك چاوەڕوانی پیاوە پیرەکەی کرد، بەلاْم هەردیار نەبوو، ئیتر وەنەوزو بیٚ خەوی پەرێشانی کرد، بەوانەی دەوروبەری گوت، نەهێڵن کەس توخنی ئەم دەرگایە بکەوێت، دەمەوێت تۆزێك بخەوم، چونکە تەواو پەرێشانم، دیسان شەیتان لەشێوەی پیاوە پیرەکەدا هاتەوە، پیاوی بەردەرگاکە پێی گوت: بۆ دواوە ... بۆ دواوە ...پیرە پیاوەکە گوتی: دوێنیٚ خۆم چووم بۆلای و سکالاْی خۆم لاکردەوە، دەچمەوە بۆ وەلاْمەکەم، پیاوەکە گوتی:

نا ... بەخوا فرمانی پیٚ داوین کە ڕێگە بەکەس نەدەین توخنی بکەوێت، کەپیاوە پیرەکە نائومێد بوو، کونە درزێکی دۆزیەوە و خۆی پێدا کردو لەوێوە چوە ژوورەوە و لەدیوی ناوەوە لەدەرگاکەی دەدا، (ذ الکفل) هەستا وبەپیاوی بەردەرگاکەی فەرموو: ئەی من پێم نەگوتی باکەس نەیەتە ژوورەوە، پیاوەکەش گوتی: بەخوا لەپێش مندا خۆی کردوە بەژووردا، لەلای منەوە نەهاتووە، بزانە لەکویٚ وە لەپێش مندا خۆی کردوە بەژووردا، لەلای منەوە نەهاتوە، بزانە لەکویٚ وە هاتوەتە ژورەوە ؟ (ذ الکفل) هەستا تەماشای دەرگاکەی کرد، بەوشێوەیەی کە دایخستبوو،بەو شێوەیە داخرابوەوە، کەچی پیاوە پیرەکەش لەژورەوە بوو، ناسیەوە زانی کەشەیتانە، پێی گوت: ئەوە تۆی ئەی دوژمنی خوا ؟گوتی: بەڵیٚ، تۆ لەهەمووو بارەکاندا ڕێت لیٚ گرتم، ئەی چی بکەم ؟

هەردەبێ تورەت بکەم! لەمەوە خوای گەورە نازناوی (ذ الکفل)ی لێ نا چونکە هەرکات کارێکی گرتبێتە ئەستۆی خۆی لێی پرسیوەتەوە و فەرامۆشی نەکردووە .

(ابن ابی حاتم) هاوشێوەی ئەو فەرمودەیەی لە (ابن عباس)[1]ەوە هێناوە، لای (عبدالله ی کوڕی حارث)[2]و (محمدی کوڕی قیس)[3]و هەندێکی تر هەربەهەمان گێڕانەوە هاتوە . (ابن ابی حاتم)[4]لە (ابی موسای ئەشعەری)یەوە دەگێڕێتەوە کەلەسەر دوانگە فەرمویەتی: (ذو الکفل)پێغەمبەر نەبوە، بەڵکو پیاو چاکێك هەبو، ڕۆژانە سەد نوێژی دەکرد، پاش ئەو (ذو الکفل) کەفیلی کردنی ئەوسەد نوێژە ڕۆژانەیەی گرتە ئەستۆی خۆی و ئەودەیکرد، لەبەرئەوە بە (ذو الکفل) ناوی دەرکرد، (ابن جریر)[5]یش هەروا گێڕاویەتیەوە. پێشەوا(احمد)[6] فەرمودەیەکی هێناوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (کفل)دەچێتەوە سەر بەروبەرەچەی کوڕانی ئیسرائیل، لوگوناهکردن خۆی نەدەپاراست ژنەکەی خۆی داوای قەرزی لێکرد، ئەویش شەست دیناری پێدا، بەومەرجەی کەبۆی بگەڕێنێتەوە، کەپەکی کەوت، ژنەکەی گریا، ئەویش پێی گوت بۆچی دەگریت، ئایا ڕقم لێت بوە ؟ ژنەکەی گوتی: نا ... بەڵام ئەمە کارێکە هەرگیز کاری وام نەکردووە ئینجا دابەزیە خوارەوەو پێی گوت: برۆ پارەکانیش بۆ خۆت بێت، بەڵام ناچاری وای لێکردوم، فەرمووی: کارێك دەکەیت کەهەرگیز کاری وات نەکردوە، ئینجا گوتی: سوێند بەخوا نابێت (کفل)ئیتر لەخوا باخی بێت، هەمان شەو (کفل) کۆچی دوایی کرد، لەسەر دەرگاکەی نوسرابو،خوای گەورە لەکفل خۆش بو. [7]، تەنانەت ئەگەر فەرمودەکەش ڕاست بێت ئەوا ناوی پیاوەکە بە (الکفل) هاتووە نەك بە (ذو الکفل)، وادیارە ئەوەیان پیاوێکی ترەو ئەوەیان نیە کە لەقورئاندا ناوی هاتوە . خوای گەورە باشتر دەزانێت .

---

[1] ضعيف اليه: ابن ابي حاتم (١٣٧٠٣)

[2] فيه ضعف: ابن جرير (١٠ / ١٧ / ٧٣ )

[3] ضعيف اليه: ابن جرير (١٠ / ١٧ /٧٥)

[4] لەتەفسيرى ابن ابي نەمديوە و ئيسنادەكەى سەرەوە لاوازە .

[5] ضعيف اليه: ابن جرير (١٠ / ١٧ /٧٥ )

[6] ضعيف المسند: (٢ / ٢٣)، الترمذي (٢٤٩٦)

[7] ضعيف: رواه البخاري فى التأريخ (٤ / ٦٦)ترجمة رقم (١٩٧٨)

## ﴿ئەو گەلانەی سەرا پا لەناوچوون﴾

وادیارە زۆربەی ئەو گەلانەی کەوردوبچوکیان پێکەوە لەناوچوون کەم نەبوون، هەمووشیان پێش دابەزینی تەورات بون، بەبەڵگەی ئایەتە قورئانیەکان وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسى الْكِتَابَ مِنْ بَعْدِ مَا أَهْلَكْنَا الْقُرُون الْأُولَى﴾ (قصص-٤٣)، هەروەها (ابن جریر)و (ابن ابی حاتم)[1] و (بزار)فەرموودەیەکیان لە (ابی سعید الخدری)یەوە هێناوە کە دەڵێت: خوای گەورە هیچ گەلێکی لەناونەبردوە بەسزایەکی ئاسمانی یان زەمینی پاش دابەزینی تەورات جگە لەو گەلەی کە خوای گەورە کردنی یە سەر شێوەی مەیمون، ئەوە نیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ مِنْ بَعْدِ مَا أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ الْأُولَى﴾ ، (البزار)[2] فەرمودەکەی بەرز کردۆتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەئەو گەلانەی بەگشتی لەناوچوون لەپێش هاتنی (موسا)دابون (علیه السلام)لەوانەش (أصحاب الرّس، قوم یس ..........) هتد .

### أصحاب الرّس

**وشەی (رس) واتا: داپۆشین، یان خستنە ژێر خاك .**

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَعَاداً وَثَمُودَا وَأَصْحَابَ الرَّسِّ وَقُرُوناً بَيْنَ ذَلِكَ كَثِيراً، وَكُلّاً ضَرَبْنَا لَهُ الْأَمْثَالَ وَكُلّاً تَبَّرْنَا تَتْبِيراً﴾ (الفرقان: (٣٨ -٣٩) ، هەروەها خوای گەورە لەسورەتی (ق)یش دا لەئایەتی (١٢)دا لەگەڵ چەند گەلێکی تردا ناوی (أصحاب الرس)ی هێناوە، هەردو ئایەتەکە ئەوە دەسەلمێنێت کەئەو گەلانەی بەگشتی تیاچوون، هاوکات بەڵگەیە لەسەر بەرپەرچ دانەوەی (ابن جریر)یش کەپێی وایە (أصحاب الرس) هەر ئەو (اصحاب الأخدود)ەیە کە خوای گەورە لەسورەتی (البروج)دا ناوی بردوە، چونکە بەلای (ابن اسحاق)و هەندێکی دیکەوە دوای هاتنی (مەسیح) (علیه السلام)بوە، دیارە ئەوەشیان قسەو باسی تر دەخوازێت و جێگەی سەرنجە . (ابن جریر)[3] لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی (اصحاب الرس) دانیشتوانی شارۆچکەیەکی (ثەمود)بون، (ابن عساکر)یش لەباسی دروستکردنی دیمەشق داو لەمێژوەکەیدا باسی کردوە و کە (اصحاب الرس)گەلێك بون، خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ ناردن کەناوی

---

[1] صحيح: الى ابي سعيد: رواه ابن جرير (١١/ ٢٠ / ٨٠)، ابن ابي حاتم (١٦٩٢٨)

[2] كشف الآستار (٢٢٤٨).

[3] ضعيف اليه: رواه ابن جرير (١١/ ١٩ / ١٣)وسنده ضعيف و منقطع .

(حنظله کوڕی صفوان)بو، بەڵام ئەوان بڕوایان پێ نەهێناو شەهیدیشیان کرد،ئیتر (عاد)ی کوڕی (عوص)ی کوڕی (ئیرەم)ی کوڕی (سام)ی کوڕی (نوح) (علیه السلام)بەخۆی و کوڕەکەیەوە شەو (ڕەس)یان بەجێ هێشت و لە (احقاف)گیرسانەوەو مانەوە،خوای گەورەش (اصحاب الرس)ی تەفروتونا کردن و ئەوانەی مانەوە لەیەمەن دا نیشتەجێ بون، تەنانەت بەسەر زەوی دا بڵاوبونەوە، (جەبرون)ی کوڕی (سعد)ی کوڕی (عاد)ی کوڕی (ئیرەم)ی کوڕی (سام)ی کوڕی (نوح) (علیه السلام)ڕووی کردە دیمەشق و شارێکی دروست کردو ناوی نا (شاری جەبرون)کەئەو شارە لەقورئانی پیرۆزدا بە (ئیرەم)ی ئەستونگدار ناسراوە (ارم ذات العماد)کە هیچ شوێنێك نیە لەسەر زەوی دا ئەستونگی بەردی هێندەی شاری دیمەشق تێدابێ،پاشان خوای گەورە (هود)ی نارد (علیه السلام) بۆ سەر نەوەی (عاد)کە لە (احقاف)دائەنیشت،دیسا باوەڕیان پێ نەهێناو خوای گەورە ئەو گەلەیشیلەناوبرد، ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی بزانین کە (اصحاب الرس) بە چەندین ماوەو چاخی دورو درێژ لەپێش گەلی (عاد)دا ژیاون، خوای گەورە زاناترە (ابن ابی حاتم)[1] دەیباتەوە سەر (ابن عباس) کەفەرموی (رسّ)بیرێکە لە (ئاذربیجان)، بەڵام (الثوری)[2] دەیباتەوە سەر قسەی (عکرمە) کەفەرمویەتی: (رَسّ)ئەو بیرەیە کە خەڵکەکە پێغەمبەرەکەی خۆیان تێدا ژێر خاك کرد، (ابن جریج)[3] لە(عکرمە)وە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (أصحاب الرّس)ئەو کەسانەبون کەلە شارۆچکەی (فەلیج)[4]ی سەر بەیەمامە دادەنیشتن، واتا گەلی (یس)، ئەوانەی لەسورەتی (یاسین)دا باسیان کراوەو خوای گەورەش لەناوی بردون بە دەنگ و قیژەیەکی تیژ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَامِدُونَ﴾ (يس:٢٩)، وەباسەکەشیان لەقورئاندا لەدوای ئەمانەوە هاتوە، خۆئەگەر ئەمان نەبن وەك لەڕوکاردا وادیارە، خۆئەمانیش هەر خوای گەورە لەناوی بردون، ئەمانەش هەمووی بۆچونن و (ابن جریر) باسی کردون، لەلایەکی ترەوە (ابوبکر محمد)ی کوڕی (حسن النقّاش)دەڵێت: (أصحاب الرّس) بیرێکی گەورە و پڕ ئاویان هەبو، کەبەشی تێراوکردنی خۆیان و زەوی و زارەکانیانی دەکرد، پاشایەکی

---

[1] ضعيف: رواه ابن ابی حاتم (١٥١٧٣) .

[2] رجاله ثقات: ابن جرير رواه (١١ / ١٩ / ١٤ )

[3] ضعيف اليه: رواه ابن جرير (١١/ ١٩ / ١٤ )وسنده ضعيف

[4] قتادة: صحيح اليه: رواه ابن جرير (١١/ ١٩ / ١٤ )سنده صحيح، وكذلك ابن ابي حاتم (١٥١٧٦)

دادپەروەر و باشیشیان هەبو، کاتێك پاشاکەیان مرد، زۆر بۆی پەرۆش بون، پاش چەند ڕۆژێك شەیتان خۆی خستە سەرشێوەی پاشاکەیان و بەخەڵکەکەی گوت: من نەمردوم، بەڵکو چوبومە دنیای نادیارەوە تاکو بزانم پاش مردنم چۆن کارو ڕەفتار دەکەن، ئەوانیش زۆر زۆر شادمان بون بەوە، شەیتانیش فرمانی پێ کردن کە دەبێت هەمیشە لەودیو پەردەوە قسەیان لەگەڵ بکات، هەروەها پێی گوتن: کەمن هەر دەژیم و هەرگیز نامرم، زۆربەی خەڵکەکەش باوەڕیان بەوقسەیەی کردو گیرۆدەی بون، تا کار گەیشتە ئەو ئاستەی کە بیپەرستن، بەڵێ پەرستیان، خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانەکردن تاکو تێیان بگە یەنێ و بڕوایان ڕاست بکاتەوە، فێریان بکات کە ئەو کەسەی ئەودیو پەردەکە شەیتانەو فریویان دەدات و نابێت شەیتان بپەرسترێت، بەڵکو بەتەنها پەروەردگاری تاك و بێ هاوەڵ شیاوی پەرستنە .

(سوهەیلی) دەڵێت: خوای گەورە لەڕێگەی خەونەوە پەیامی خۆی بۆ ئەو پێغەمبەرە دەنارد (علیه السلام)کەناوی (حنظلەی کوڕی صفوان بوو)، بەڵام خەڵکەکە بەرەنگاری بونەوەو شەهیدیان کردو فڕێیاندایە بیرە کەیانەوە، ئیتر بیرەکەوشکی کرد، بێ ئاوی و تینوێتی پەکی خستن، دارو درەختیان وشك بو، بەروبومیان بڕا، ماڵ و خانەیان تێك ڕما، پەیوەندی کۆمەڵایەتیان پچڕا وەکو کیۆیلە پەرتەوازەبون، تاسەرەنجام هەمویان لەناوچون و جێ ماڵ و حاڵیان بو بەکەلاوەی ترسناك و جنۆکە و دڕندەیان تێدا دەژیا، تەنها چرپەی جنۆکە و نەڕەی شێرو قیژەی کەمتیار لەماڵ و کەلاوە چۆڵکراوەکانیاندا دەبیسترا، بەڵام ئەوەیان کە (ابن جریر)دەیباتەوە سەر(کەعبی قەرظی)کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (انَّ اول الناس یدخل الجنة یوم القیامة العبد الأسود)[1]، واتا: یەکەم کەس کەلەڕۆژی دوایی دادەچێتە بەهەشتەوە پیاوە ڕەشەکەیە . کەکاتی خۆی خوای گەورە پیاوێکی کردە پێغەمبەر بەسەر گەلێکەوە، بەڵام کەس باوەڕی پێ نەکردو شوێنی نەکەوت، جگە لەپیاوێکی ڕەش نەبێت دواتر خەڵکەکە کەوتنە دژایەتی کردنی پێغەمبەرەکەو بیرێکیان بۆ هەڵکەندو فڕێیاندایە ناویەوەو پاشان زاری بیرەکەیان بەتاشە بەردێك گرت، دەڵێت: ئەو پیاوە ڕەشە دەچوو کۆڵەداری دەهێناو لەشارۆچکەکە دەیفرۆشت و بەپارەکەی خۆراکی دەکڕی و دەیهێنا بۆ ئەو پێغەمبەرە(علیه السلام)، بەردەکەی لادەبرد، خواردنەکەی بۆ شۆڕ دەکردەوەو پاشان وەکو خۆی بەردەکەی لەسەر

---

[1] مرسل ضعیف: رواه ابن جریر ١١/ ١٩ /١٤ اوسنده ضعیف .

دادەنایەوە ئەمەش درێژەی کێشا تاهێندەی کەخوا ویستی لەسەر بو، ڕۆژێك وەك هەمو ڕۆژانی تر، پیاوەکە چوو بۆ کۆڵەدار، کۆڵەکەی بەست و لەولاوە داینا، وەنەوزگرتی، ئانیشکی بۆداناو لێی خەوت، خوای گەورە ماوەی (حەوت ساڵ)خەوی لێ خست، پاشان هەستاو کۆڵەکەی خستە سەرشانەکەی تری و ڕۆیشت، دیسان خەو بردیەوەو خوای گەورەش ماوەی حەوت ساڵی تر خەوی لێ خست، ئەم جارەش هەستا، ڕاست بوەوەو کۆڵەکەی هەڵگرت، تەنها وایدەزانی چەند ساتێك خەوی پێداکەوتوە، چوەوە بۆ شارۆچکەکەو دارەکانی فرۆشت و خواردنی پێ کڕی و بەرەو بیرەکە ڕۆیشت، بەڵام پێغەمبەرەکەی نەدۆزیەوە، دیار بو کە پێشتر خەڵکەکە بەوەیان زانیبوو، بۆیە چووبوون دەریان هێنابوەوەو باوەڕیان پێ هێنا بوو، دەڵێت: پێغەمبەرەکەش هەواڵی ئەو پیاوە ڕەشەی لەخەڵکی دەپرسی کەئاخۆ چی بەسەر هاتوە ؟ یان چی کردوە ؟ ئەوانیش دەیانگوت: نازانین، تاکو پێغەمبەرەکە س. ح کۆچی دوایی کردو پاشان پیاوەکەش لەخەو ڕابوو . هەرچەندە ئەم بەسەرهاتە باری سەرنجی وردی دەوێت و زیاتر لەقسەی (محمدی کوڕی کەعبی قرظني) دەچێت، خوا دەیزانێ، پاشان (ابن جرير)هەر خۆیشی بەر پەرچی ئەوە دەداتەوەو دەفەرموێ . ناشێت ئەم گەلە بە (اصحاب الرسّ)ی قورئانی پیرۆز ناوزەد بکەین، چونکە خوای گەورە واباسی (اصاب الرسّ)دەفەرموێت کە لەناوچون، بەڵام وادیارە ئەمان باوەڕیان بە پێغەمبەرەکەیان هێناوە، سامەگەر بەهۆی چەند ڕوداوێکەوە ڕۆڵەی ئەوانەی کەلەناوچوون باوەڕیان هێنابێ، خوا دەیزانێ، پاشان ئەوەش هەر لاوازە کەوا بزانین (أصحاب الأخدود)ن، چونکە خوای گەورە پەیمانی سزای داوە بۆ ئەوان لەقیامەتدا ئەگەر تەوبە نەکەن، باسی تیاچونیانی نەکردوە، بەڵام بەئاشکرا خوای گەورە باسی تیاچونی (أصحاب الرّس)ی کردوە، خوای گەورە زاناترە .

## بەسەرهاتی گەلی یاسین

مەبەست لەو گەلەیە کە لەسورەتی (یاسین)ا ئایەتی (١٣ – ٢٩) خوای گەورە بەناوی (أصاب القريه)وەك نمونە باسیان دەکات، لەلای زۆربەی زانایانی پێشین و پاشین واباوە ئەو گوندە، یان ئەو شارۆچکەیە (ئە نطاکیە)یە، لەوانەش (ابن اسحاق)لە (ابن عباس)و (كعب الأحبار)و (وهب کوڕی منبه)وە دەگێڕێتەوە، ئەمە وێڕای گێڕانەوەی بورەیدەو عەکرەمەو قەتادەو زوهری و هەندێکی تر .

(ابن اسحاق) لەو گێڕانەوەیەیدا کە هێناویەتی دەڵێت: ئەو شارۆچکەیە پاشایەکی بت پەرستیان هەبو کەناوی (ئەنطیخس)ی کوڕی (ئەنطیخس)بوە، خوای گەورە سێ کەسی ڕەوانەکردە سەری کە پەیامی تاکپەرستی خوای پێ ڕابگەیەنن، تاکو دەست بەرداری بت پەرستی ببێت، ئەو سێ کەسەش ناویان (صادق – مصدوق، شەلوم)بو، بەڵام پاشاکە بڕوای پێ نەهێنان و بەدرۆی دەکردنەوە، بەپێی ڕوکاری ئاشکرای ئایەتەکە ئەو سێ کەسە لەلایەن خوای گەورەوە ڕەوانە کران و بەڵام (قتادە) پێی وایە کە (عیسا)پێغەمبەر (علیه السلام) ئەوسێ کەسەی ناردە لای پاشاکەو گەلەکەی تاکو باوەڕ بێنن، (ابن جریر)یش لەوەهبی کوڕی سولەیمان ئەویش لە شوعەیبی جەبائییەوە دەگێڕێتەوە کە ئەوسێ ڕەوانە کراوە ناویان (شەمعون، یۆحەننا، پۆڵس)بوە، گوندەکەش ناوی (ئەنطاکیە)بوە، بەڵام ئەم لێکدانەوەیە هەڵەیە، چونکە خەڵکی (ئەنطاکیە)هەرکە (عیسا) (علیه السلام)سێ کەسی حەواری نارد بۆلایان یەکسەر باوەڕیان هێنا لەو کاتەدا و نکوڵییان نەکرد، بەڵکو یەکەم شارە کە باوەڕیان بە (مەسیح) (علیه السلام) هێنا لەناو چوار شارە باوەڕدارەکەدا کەئەمانە بون (ئەنطاکیە، قودس، ئیسکەندەریە، ڕۆمیە)پاشان (قسطنطنیە)ش باوەڕی هێناو خوای گەورەش لەناوی نەبردن، بەڵام ئەو گەلەی کەلە سورەتی یاسین دا بە (أصحاب القریة)ناویان هاتوە لەناوچون و خوای گەورە لەناوی بردن، هەروەکو خوای گەورە لەکۆتایی گێڕانەوەی چیرۆکەکەیاندا باسی لەناوبردنەکەیان دەفەرموێت، پاش ئەوەی ڕەوانەکراوە کەیشیان کوشت، وەکو دەفەرموێت (ان کانت الا صیحةً واحدةً فاذا هم خامدون)، وادیارە ئەوسێ کەسە ڕەوانە کراون بۆ دانیشتوە دێرینەکانی (ئەنطاکیە)و ئەوانیش باوەڕیان پێ نەکردون خوای گەورەش لەناوی بردون، پاشان سەر لەنوێ جارێکی تر (ئەنطاکیە) دروست کراوەتەوەو ئاوەدانکراوەتەوە، ئەوەش دروستە بڵێین ئەو خەڵکە لەسەردەمی حەزرەتی مەسیح دا (علیه السلام)باوەڕیان هێناوە و خواش لەناوی نەبردون، خوای گەورە خۆی زاناترە . بەڵام ئەوەیان ئەگەر بڵێین: ئەم بەسەرهاتەی لەسورەتی (یس)دا هاتوە هەمان باسی (أصحاب المسیح)ە، ئەوەیان لاوازەو ڕێی تێ ناچێت . چونکە ڕوکاری ئاشکرای ئایەتەکە وانیشان ئەدات کە ئەوسێ کەسە لەلایەن خوای گەورەوە ڕەوانەکراون نەك نێرروای(مەسیح) (علیه السلام)بوبێتن

(واضرب لهم مثلاً) واتا: ئەی محمد نمونەی ئەمە بۆ گەلەکەی خۆت باس بکە، کە چۆن (اصحاب القرية)دانیشتوانی شارەکە (اذجاءها المرسلون اذ ارسلنا اليهم اُثنين، فكذّ بوهما فعززنا بثالث) ڕەوانەکراوی خوایان بۆ ناردرا، سەرەتا دووکەس بون و بەدرۆیان کردنەوە، بەکەسی سێهەمیش پشت ئەستورمان کردن، (فقالوا انا اليكم مرسلون)ئەوجا هەرسێکیان بەخەڵکەکەیان گوت: ئێمە بۆلای ئێوە ڕەوانە کراوین – تاکو پەیامی تاکپەرستی خوای گەورەتان پێ ڕابگەیەنین، بەڵام خەڵکی شارەکە بەرپەرچیان دانەوەو باوەڕیان پێ نەکردن، بگرە هەروەکو چۆن گەلەبێ بڕواکانی پێشتر بە پێغەمبەرەکانیان دەگوت: خۆ ئێوەش هەر وەکو ئێمە مرۆڤن و هیچتان لەئێمە زیاتر نیە،چۆن دەبێت مرۆڤ پێغەمبەر بێت؟! لێرەدا خوای گەورە بە پێغەمبەری ئازیزمان محمد (ﷺ) دەفەرموێت: ئەو نموونە یەیان بۆ باس بکە، تاکو گەلەکەی تۆش قسەی کۆنی ئەوان نەکەنەوە، هەروەها ئەوان تووشی سزاو تۆڵە و تیاچون بونەوە، واتا :ئەگەر گەلەکەی تۆش پشتیوانیت لێ نەکەن و بڕوات پێ نەهێنن ئەوا دوورنیە کە تووشی سزاو تۆڵەی سەختی پەروەردگار ببنەوە، ئەوسێ کەسە دڵنیا یان کردنەوە کە ئێمە لەلایەن خواوە ڕەوانەکراوین و ئەگەر ڕاست نەکەین ئەوا خوای گەورە ئێمەش سزا دەدات ' لەبەرئەوە ئەوا ئێمە پێتان ڕادەگەیەنین و ئەرکی سەرشانی خۆمان جێبەجێ دەکەین (وما علينا الا البلاغ المبين) ئەوەی لەسەرمانە تەنها پێڕاگەیاندنێکی ڕوون و ئاشکراو بەڵگە دارانەیە و هیدایەت بەدەست ئێمەنیە، ئەوان گوتیان (انا تطيرّنا بكم) ئێمە ڕەشبینی لەئێوەدا بەدی دەکەین – تاقیکردنەوەی خۆمانمان کردووە – (لئن لم تنتهوا لنرجمنّكم وليمسّنكم منّا عذاب اليم)؛ جائەگەر واز لەو ڕاگەیاندن و بانگەوازەتان نەهێنن ئەوا بەردبارانتان دەکەین و بگرە سزایەکی توندتان دەدەین، وتراوە ئەمە تەنها هەڕەشەیەکی سەرزارەکی بوە بۆ ترساندنیان، بەڵام لەلایەکی ترەوە وتراوە: نەخێر بەزارو بەکردار ئازار و هەڕەشەیان لێکردون وبگرە پێیان ڕاگەیاندون کەئەگەر وازنەهێنن دەتانکوژین. (قالوا طائركم معكم) گوتیان: نەخێر نەگریسی بەخودی خۆتانەوەیەو لەخۆتاندایە، (أإن ذُكرتم)باشە بۆچی کەمن ناوتان دەبەم بۆئەوەی بێنە سەر ڕێی ڕاست، کەچی ئێوە هەڕەشەی سوکایەتی پێکردن وکوشتنم لێ دەکەن (بل أنتم قوم مسرفون)بەڵکو ئێوە خۆتان گەلێکی زێدەڕەون و نەهەق وەردەگرن و نەهەقتان دەوێ . (ابن جرير) دەفەرموێت: یەکەمیان بەجێ ترە، واتا: هەق وەرناگرن.

﴿وَجَاءَ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَى قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ اتَّبِعُوا مَنْ لا يَسْأَلُكُمْ أَجْراً وَهُمْ مُهْتَدُونَ﴾ واتا:

لەوپەڕی شارەوە و پیاوێك هات بۆ پشتیوانی لەسەر خستنی داوای نێردراوەکان و دەرخستنی بیرو بڕوای خۆی بەو پەیامبەرانە، دەیگوت: هۆ گەمل شوێن ئەو پەیامبەرانە بکەون، شوێن ئەوان بکەون کەبەبێ بەرانبەر بانگتان دەکەن بۆسەر ڕێی ڕاست، ڕێگەی خوا پەرستی و دورکەوتنەوە لەبت پەرستی، ئەوەی ڕێی خوا پەرستی هەڵبژێرێت قازانج دەکات لەدنیاو دواڕۆژدا، (انّي اذاً لفي ضلال مُبين)تەنانەت منیش ئەگەرشوێن ئەوان نەکەوم و خواپەرستی نەکەم ئەوا مانای وایە لە گومڕاییەکی ئاشکرادام، پاشان هەر ئەوپیاوە وەك نمونە هێناوە و هاندانی گەلەکە بۆ باوەڕ هێنان ڕووی کردە پەیامبەرەکانی (علیه السلام)و گوتی (انّي امنتُ بربّكم فاسمعون) من بڕوام بە پەروەردگاری ئێوە هێناوە، گوێم لیّ بگرن،گوتراوە :ئەوە مانای ئەوەیە کە ئەوپیاوە بەپەیامبەرەکانی گوتوە: گویّ لەم قسەیەی من بگرن کە باوەڕهێنانی منە بە پەروەردگار، وەشایەتیم بۆ بدەن لەدوا ڕۆژدا لای ئەو خوایەی کە ئێوەی بەهەق ناردوە بەوەی کەمن دەست بەرداری بت پەرستی بوم و هاتومەتە سەر شارێگەی خوا پەرستی، وتراوە: قسەکەی کابرا بۆئەوە بوە کەڕوی کردوەتە گەلەکەو گوتویەتی ئەی گەلەکەم ئێوە شایەت بن کەمن بەئاشکرا باوەڕ بەخوا دەهێنم و نایشارمەوە و ناترسم لەهیچ کەسێك، گوتراوە: لەسەر ئەم هەڵوێستەی هەر لەوێدا خەڵکەکە کابرایان گرن و شەهیدیان کرد، واتراوە بەردبارانە کردن کوشتیان، یان بەگاز لێگرتن، یان بەپێ لەقە هەڵیان کوتاوەتە سەری و شەهیدیان کردوە، (ابن اسحاق)دەیباتەوە سەر (ابن مسعود)کە فەرمویەتی: بەپێ چوونە سەر لەشی کابراکەو کوتاویانەتەوە هەتا هەناویان دەرهێناوە یان سنگیان تێك شکاندوە.

لە (الثوری)یەوە،ئەویش لە(عاصم الآحوال)،ئەویش لە(ابی مجلن)دەگێڕێتەوەکە ئەوپیاوە ناوی (حەبیب کوڕی مەری)بوە،وتراوە دارتاش بوە، یان جۆلاّبوە، یان پینەچی بوە، یان هەڵپاچ بوە، وتراوە: لەئەشکەوتێکدا خواپەرستی دەکرد،خوادەیزانێت . لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە کە(حبیب)ی دارتاش زۆر قسە لەڕوو بوە، زۆر ڕاستگۆبوە، لەبەرئەوە گەلەکەی شەهیدیان کرد، خوای گەورە دەفەرموێت: (قِيل اُدخلِ الجَنة): واتا: کاتێك پیاوەکەیان کوشت لەلایەن خواوە پێی گوترا (بڕۆرە بەهەشتەوە)، جاکاتێك چوە ناو بەهەشت و ئەو هەموو خۆشی و ڕازاوەیی و دڵشادیەی لەبەهەشت دا بەدی کرد، هێشتا خەمی گەلەکەی دەخوارد ودەیگوت: (قال ياليت قومي يعلمون بما غفرلي ربّي وَجعلني من المكرمين)، واتا: خۆزگە گەلەکەم بەوە بزانن کە پەروەردگاری خۆم لێم خۆش بوەو ڕێزی

لێناوم، (ابن عباس) دەفەرموێت: ئەم پیاوە تاکو لەژیاندا بو بەگەلەکەی دەگوت :(یاقوم اتبعوا المرسلین)، کاتێك کۆچی دوایشی کرد دەیگوت: (یالیت قومي یعلمون بما غفرلي ربّي وجعلني من المکرمین)(ابن ابی حاتم)گێراویەتەوە، (قتادة)ش دەڵێت: مرۆڤی باوەڕدار لەهەموباریێکدا ئامۆژگاری خەڵکەو هەرگیز فێڵ ناکات، هەرکەڕێزی باوەڕە کەی گرت خوای گەورەش ڕێزی لیٚ دەگرێت – وەکو ئەو پیاوە – کەدەخوازێت گەلەکەی بەوە بزانن کەچەندەلای خۆی بەرێزە، تاکو ئەوانیش وازلە گومڕایی بهێنن و وەکو ئەو باوەڕ بهێنن .

(قتادة) دەڵێت: بەخوا، پاش ئەوەی ئەو گەلە پیاوە باوەڕ دارەکەیان بەوبیٚ ویژدانیە شەهید کرد، ئیتر خوای گەورەش بەیەك دەنگ و هاواری یەکێك لەفریشتەکانی هەموویانی کپ وبیٚ دەنگ کردو لەناوی بردن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنْ كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَامِدُونَ﴾ یان ﴿وَمَا أَنْزَلْنَا عَلَى قَوْمِهِ مِنْ بَعْدِهِ مِنْ جُنْدٍ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا كُنَّا مُنْزِلِينَ﴾ ، واتە: ئێمە پێویستمان بەوە نەبوە کە سەرباز و فریشتەی خۆمان دابەزێنینە سەر زەوی بۆ تۆڵە سەندنەوە لەو گەلەی کە ئەو پیاوە باوەڕدارەیان بەناهەقی کوشت ، هەرگیز فریشتەشمان دانەبەزاندووە بۆ لەناوبردن ، ئەمەش ئەو مانایەش دەگرێتەوە کە (ابن اسحاق) [1] لەهەندیٚ یاوەرەوە دەیباتەوە سەر (ابن مسعود) ، (مجاهد) [2] و (قتادە)ش [3] دەڵێت: واتا: مەبەست لەوەیە کەدوای کوشتنی ئەو پیاوە ئیتر خوای گەورە هیچ پەیام و پەیامبەرێکی تری نەناردە سەریان ، واتا: لەناوبردن ، (ابن جریر)یش دەڵێت: بۆچوونی یەکەم ڕەواترە ، (ابن کثیر)یش دەڵێت: منیش ئەوەیانم بەلاوە بەهێزترە .

ڕاڤەکارانی قورئان فەرموویانە: خوای گەورە (جبریل)ی نارد (علیه السلام)کە دەستی گرت بەئەملاولای دەروازەی شارەکەوەو یەك قیژەی گەورەی بەسەردا کردن ، ئیتر بەو قیژەیە هەموویان لەناوچوون ، ئەمانەش کەباس کراون بەڵگەن لەسەرئەوەی کە ئەو شارە (ئەنطاکیە)نەبووە،چونکە ئەمان لەناوچوون بەهۆی بێبڕواییانەوە،بەلاٚم خەڵکی (ئەنطاکیە)یەکەم کەس بوون کە باوەڕیان بەو حەواریانە کرد کە(عیسا)(علیه السلام)ناردنی بۆلایان ، هەروەها وتراوە: (ئەنطاکیە) یەکەم شارە کە بڕوایان بە (مەسیح) (علیه السلام)هێنابیٚ .

---

[1] ضعیف: رواه ابن جریر ١/٢٣/١٢ .

[2] صحیح إلیه: ابن جریر ١/٢٣/١٢ .

[3] صحسن: ابن جریر ١/٢٣/١٢ .

## ﴿پێغەمبەری خوا یونس درووود و سڵاوی خوای لەسەربێت﴾

خوای گەورە لەچەند شوێنێکدا لەقورئانی پیرۆزدا باسی (یونس) پێغەمبەری فەرمووە(علیه السلام)، جگە لەوەی کە یەك سورەتی تایبەتی بەناوی (یونس) لە قورئاندا هەیە، ئەمەش ناوی ئەو سورەتانەیە کەباسی (یونس) پێغەمبەریان تێدا کراوە (علیه السلام)کە بەرانبەریان ژمارەی ئایەتەکانیش نووسراوە .

| ناوی سورەت | ژمارەی ئایەت |
|---|---|
| سورەتی یونس | ٩٨ |
| سورەتی الانبیاء | ٨٧ – ٨٨ |
| سورەتی الصافات | ١٣٩ – ١٤٨ |
| سورەتی القلم | ٤٨ – ٥٠ |

زانایانی بواری قورئانی پیرۆز فەرموویانە: خوای گەورە (یونس)ی نارد بۆسەر گەلی (نەینەوا) کە لە (موصل) دادەنیشتن بانگیکردن بۆ خوا پەرستی و باوەڕداری، بەڵام وەڵامیان نەدایەوەو سووربوون لەسەر بەدبڕوایی خۆیان، جا ئەم بارەش درێژەی کێشا، (یونس) (علیه السلام)خۆی لێشاردنەوەو لەناویان خۆی وون کردو بەجێیێ هێشتن، پاش ئەوەی پێی ڕاگەیاندن کە سێ ڕۆژی تر خوای گەورە سزایان بۆدەنێرێژ (ابن مسعود)[1] و (مجاهد)[2] و (سعید کوڕی جوبەیر)[3] و (قتادە)[4] و هەندێکی تر فەموویانە: کاتێك یونس (علیه السلام)بەجێی هێشتن، خوای گەورەش دڵی خەڵکەکەی نەرم کرد و باوەڕیان هێنا، تەوبەیان کرد و پەشیمان بوونەوە، تەنانەت هەموو دایك و بەچکەیەکیش لەیەکتری دابران و خۆیان تەرخان کرد بۆ پاڕانەوە لەخوای گەورە، گریان هاوار هاواریان پێکەوت، بەپیاوو ژن و منداڵ و کوڕو کچ و ساخ و نەخۆشەوە، کەوتنە لاڵانەوە و تکاکردن لەخوای گەورە، تەنانەت وشترو مانگاو مەڕو ماڵات کەوتنە بارەباڕ، بەڵێ ئەو ساتانە زۆر گەورەو کاریگەربون، لەبەرئەوە دەرباری سۆزو بەزەیی پەروەردگاریان هەژاندو بەزەیی جولا، لێرەوە خوای گەورە بڕیاریدا بەلابردنی ئەو سزایەی کە پێشتر ویستی پەروەردگار وابوو

---

[1] صحيح إليه: رواه ابن ابي حاتم (١٠٥٩٧)، ابن جرير (١٧٢/١١/٧) .

[2] رواه ابن جرير (١٧٢/١١/٧) .

[3] في سنده ضعيف: رواه ابن ابي حاتم (١٠٦٠٣)، ابن جرير (١٧٢/١١/٧) .

[4] صحيح إليه: ابن جرير (١٧٢/١١/٧)، ابن ابي حاتم (١٠٦٠٥) .

بەسەریان بهێنێ، بۆیە سزاکەش لەسەر سەریانەوە وەك پارچە تاریکاییو تەمی شەوگار بەسەریاندا ڕابوردو ڕەویەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ آمَنَتْ فَنَفَعَهَا إِيمَانُهَا إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّا آمَنُوا كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَى حِينٍ﴾ (یونس:٩٨) واتا: هیچ گوندو شارێکی نەبوو کە خوای گەورە بڕیاری سزادانی دابن و کەچی پاشان خوای گەورە سزاکەی دواخستبون باوەڕهێنانی کۆتاییان فەریایان کەوتبێت، بێجگە لەگەڵی یونس کەسزا پڕ لەڕیسواییەکەی دنیامان لەسەر لابردن و درێژەمان دا بەژیانیان تا ماوەیەکی تریش.سەبارەت بەسوودی ئەو باوەڕ هێنانەی گەڵی یونس (علیه السلام)لەکوتاییدا زانایانی تەفسیری قورئانی پیرۆز بۆچوونی جیاجیایان هەیە، هەندێکیان گوتوویانە: ئایا ئەو باوەڕهێنانەیان سوودی هەیە بۆ ڕۆژی دواییان یان تەنها بەزەییەکی خوایی بوە بۆ دنیایان ؟ لێرەدا ڕاڤەکاران زۆربەیان فەرموویانە: بەڵێ خوای گەورەش زاناترە .

بەڵگەیان ئەوەیە کە خوای گەورە فەرموویەتی:(لما امنوا)، کاتێك باوەڕیان هێنا، کەواتە وازیان لەبێباوەڕی هێناوەو بەیەکجارەکی موسوڵمان بون، سزاش بۆ موسوڵمانان نیە. وە خوای گەورە لەسورەتی (الصافات) ئایەتی (١٤٧)دا دەفەرموێت: ﴿وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَى مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ﴾، واتا: یونسمان ڕەوانە کرد بۆسەر خەڵکانێك کە ژمارەیان سەد هەزار کەس و یان زیاتربوون، ئەوانیش باوەڕیان پێهێناو ئێمەش درێژەمان بەژیانیان دا و هێشتماننەوە بۆ کاتێکی تریش . دیارە ئەم هێشتنەوەیە درێژە لەگەڵ ئەوەدا کەهاوکات سزای ڕۆژی دواییشیان لەسەر لابرێت، خوای گەورە زاناترە .

وتراوە ژمارەی خەڵکەکە سەد هەزار کەس بووە، بەڵام لە دیاریکردنی زیادەکەیدا ڕای جیاواز هەیە، لای (مکحول) ئەو زیادەیەی سەروو سەد هەزارەکە بریتیە لە (دە هەزار)، لەلایەکی ترەوە (ترمذی)[1] و (ابن جریر)[2] و ابن اب حاتم)[3] وا هێناویانە کە (ئوبەی کوڕی کەعب) پرسیاری لەپێغەمبەر کرد (ﷺ) دەربارەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَى مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ﴾ سورەتی (الصافات/١٤٧)، کە ئاخۆ ئەو زیادەیە چەندبووە؟ دەڵێت بیست هەزار بووە، بەڵام لەزنجیرەی گێڕانەوەیەکەیدا (عمن سمع) هاتووە واتا: پچڕانی تێدایە و ئەو پیاوە نەزانراوە، کەواتە فەرموودەکەش یەکلایی

---

[1] ضعیف: الترمذي (٣٢٢٩) .

[2] ضعیف: ابن جریر (١٢/٢٣/١٠٤) .

[3] ضعیف: ابن ابي حاتم (١٨٢٩٧) .

نەكراوەتەوە . لە (ابن عباس)ەوە [1] ئەو زیادەیە (سی هەزار)كەس بووە، دیسان هەر لەگێڕانەوەیەكی (ابن عباس)دا هاتووە كە (سی هەزار) و (بضع)ێك بووە، یان (بضع)ێك و (چل هەزار) بووە، (سعیدی كوڕی جوبەیر)یش[2] دەفەرموێت: زیادەكە (حەفتا هەزار)كەس بووە؛ لەلایەكی ترەوە زانایانی تەفسیر ڕای جیاجیایان هەیە دەربارەی ئەوەی ئاخۆ خوای گەورە چ كات (یونس)ی كردە پێغەمبەریان؟ ئاخۆ پێش ئەوەبووە كە نەهەنگەكە قوتی بدات ؟ یان دوایی بوە ؟ یاخود ڕەوانە كراوە بۆسەر دوو گەل لەدوو كاتی جیاجیادا ؟ هەر سێ بارەكە بەسێ گێڕانەوە لەتەفسیرەكەماندا[3] باسمان كردووە، بەكورتی كاتێك (یونس)ی پێغەمبەر (علیه السلام)بەتوڕەییەوە گەلەكەی بەجێهێشت، ڕایكرد سواری كەشتییەك بوو، كەبوو بەهۆی قورس كردنی توانای كەشتیەكەو لەنگەرەكەی تێكدا، وەك زانایانی تەفسیر فەرموویانە: خەریك بوو كەشتیەكە نقوم بێت، ئیتر خەڵكی ناو كەشتیەكە ڕاوێژیان كردو بڕیاریاندا كە تیروپشك بكەن، جا بۆ هەركەسێك دەرچوو ئەوا ئەو كەسە فڕێدەدەنە دەریاكەوە، كاتێك یەكەم جار تیروپشكیان ناوی (یونس) (علیه السلام)دەرچوو، پێیان باش نەبوو، نەیانهێشت خۆی فڕێبداتە ئاوەكەوە، دیسان دووبارە تیروپشكیان كردەوە، ئەم جارەش هەر بەناوی ئەوەوە دەرچوو، خۆی ئامادەكرد تاكو بەرگەكانی دابكەنێت و خۆی فڕێبدات نەیانهێشت سەرلەنوێ بۆ جاری سێهەم تیروپشكی تازەیان كردەوە ئەم جارەش هەر بەناوی ئەوەوە دەرچوو، دیارە خوای گەورەش ئیشی بەوە هەیە، هەروەكو لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویێت: ﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ، إِذْ أَبَقَ إِلَى الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ، فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ الْمُدْحَضِينَ، فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ﴾ (الصافات/١٣٩-١٤٢)، دیارە ئەو ڕووداوەش كاتێك بوو كە بۆ سێهەم جار تیروپشكەكە كراو هەر سێجارەكە ناوی ئەو دەرچوو، ئیتر هەڵدرایە دەریاكەوە، خوای گەورەش هاوكات نەهەنگێكی گەورەی لەدەریای سەوزەوە ڕەوانەكردبوو تاكو (یونس) (علیه السلام)قوت بدات، خوای گەورە وا فەرمانی بەو نەهەنگە كردبوو كەگۆشت و ئێسقانی ئەو لەو نەهەنگە حەرامەو نابێت ئازاری بدات . بەڵێ نەهەنگەكە قوتی داوە كە لەئەو گەورەتر بووە، جاكاتێك (یونس) (علیه السلام)گەیشتە ناو جەرگی زگی نەهەنگەكە وایدانا

---

[1] ضعیف إلیه: ابن جریر (١٢/٢٣/١٠٤) .

[2] ضعیف: ابن جریر (١٢/٢٣/١٠٤) .

[3] واتا: (تفسیر القرآن العظیم)ی (ابن كثیر) .

کەمردووە، بەلاْم کاتێك ویستی قاچ و دەستی بجولێنێ، بینی دەتوانێت قاچ و دەستەکانی بجولێنێ، ئیتر بۆی دەرکەوت کەنەمردووەو ماوە، لەبەرئەوە هەر لەناو زگی نەهەنگەکەدا کڕنوشی بۆ خوای گەورە بردو فەرمووی: پەروەردگارا شوێنێکم کردۆتە جێکڕنووش و مزگەوت کەهەرگیز هیچ کەسێك لەم شوێنەدا تۆی نەپەرستووە (واتا: پێش من) . دووبارە دەربارەی مانەوەکەی لەزگی نەهەنگەکەدا ڕاوبۆچوونی جیاجیا هەیە، (مجاهد) لە (الشعبی)ەوە[1] دەگێڕێتەوە کەکاتی چێشتەنگا قوتیداوەو کاتی خەوتنان دایناوەتەوە، (قتادە)ش[2] دەفەرموێت: سێ ڕۆژ ماوەتەوە، (جەعفەری صادق)یش دەفەرموێت: حەوت ڕۆژ ماوەتەوە، بەلاْم (سەعیدی کوڕی ابی حسن)[3] و (ابو مالك)[4] دەڵێن: ماوەی (چل ڕۆژ) لەزگی نەهەنگەکەدا ماوەتەوە، خوای گەورە زاناترە .

مەبەست لەوەیە کەکاتێك نەهەنگەکە بەناو قولاْیی و شەپۆلی دەریادا دەڕۆیشت (یونس) (علیە السلام)گوێی لەدەنگی زیکرو تەسبیحاتی نەهەنگەکان و بگرە دەنگی زیکری دەنکوڵە زیخەکانی بنی دەریاش دەبوو، کە هەموویان بەزمانی خۆیان تەسبیحاتی خوایان دەکرد، لەم کاتەدا هاودەنگ لەگەڵ ئەواندا (یونس)یش (علیە السلام)بەزمانی حاڵ یان بەزمانی ئاسایی خۆی کەوتە زیکرو یادی خوای گەورە .

هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿وَذَا النُّونِ إِذْ ذَهَبَ مُغَاضِباً فَظَنَّ أَنْ لَنْ نَقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ وَكَذَلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾(الانبیاء:٨٧ – ٨٨)، واتا: کاتێك یونس بەتوڕەییەوە گەلەکەی خۆی بەجێهێشت، وایدەزانی دەستمان پێی ڕاناگات (یاخود فریای ناکەوین و تیادەچێ) ئیدی لەناو تاریکاییەکاندا بانگی لەپەروەردگاری خۆیکرد و فەرمووی: هیچ پەروەردگارێك نیە جگە لەتۆ کە شایستەی گەورەیی بێت، ئەمن لە ستەمکارانم، ئێمەش بەدەمیەوە هاتین وە لەو ناڕەحەتیە ڕزگارمان کرد، هەر ئاوەهاش باوەڕداران ڕزگار دەکەین، دەربارەی (الظلمات) لەو ئایەتەدا هەندێك لەزانایان فەرموویانە مەبەست لەتاریکی ناو زگی نەهەنگەکەو تاریکی ناو دەریاکەو تاریکی شەوە ئەو زانایانەش

---

[1] ضعیف: رواه أحمد فی الزهد (٤٥)

[2] السیوطی لەسەر بناغەی ابن ابی حاتم پشت ڕاستی کردۆتەوە .

[3] صحیح إلیه: ابن جریر (١٠/١٧/٧٩) .

[4] صحیح إلیه: ابن جریر (١٢/٢٣/١٠١) .

ئەمانەن (ابن مسعود)[1]، (ابن عباس)[2]، (عەمروی کوڕی میمون)[3]، (سەعیدی کوڕی جوبەیر)[4]، (محمد کوڕی کەعب)[5]، (الحسن)[6]، (قەتادە)[7]، (الضحاك)[8]، بەڵام لەلایەکی تریشەوە (سالم کوڕی ابی المجعد)[9] دەفەرموێت: تاریکییەکان دوان بون و بەتاریکی دەریاکەوە بوون بە سێ تاریکی، دەربارەی ئەو ئایەتەش کەخوای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾، واتا: ئەگەر یونس لەوانە نەبوایە کە تەسبیحاتی خوای دەکرد ئەوا هەتا ڕۆژی قیامەت لەزگی ئەو نەهەنگەدا دەمایەوە، دیارە (یونس) (علیه السلام)دانی بەهەڵە و تاوانی خۆیدا ناوە، پەشیمان بۆتەوە، تەوبەی کردووە، سکاڵای لای خوای گەورە کردووە، تەسبیحاتی کردووە، پاڕاوەتەوە لەبەرئەوە خوای گەورەش وەڵامی داوەتەوەو ڕزگاری کردووە، ئەوەش بەهێنانەوەی نموونەی پشتیوانی کردنی ئەو فەرموودەیەی لەگەڵدایە کە لە(سعید کوڕی جوبەیرەوە)[10] دەگێڕنەوە، لەلایەکی تری دیکەوە ووتراوە خوای گەورە دەفەرموێ (فلولا ان کان)، چونکە (کان)ی تێیدایە، کەواتە (یونس) (علیه السلام)پێشتر تەسبیحاتی خوای گەورەی کردووەو پیاوێکی پاك بووەو یادی خوای کردووە، بۆیە لەو کاتەوە تەنگانەیەش دا خوای گەورەفریای گەوتووەو ڕزگاری کردووە، ئەم لێکدانەوەیەش لە (الضحاك)ەوە[11] گێڕراوەتەوەو دیسان لەلایەن (ابن عباس)[12] و (ابو العالیه)[13] و (وهبی کوڕی منبه)[14] و (سعیدی کوڕی

---

[1] صحيح إليه: رواه الحاكم (٢/٣٨٣)، ابن جرير (١٠/١٧/٨٠)

[2] ضعيف إليه: ابن جرير (١٠/١٧/٨٠) .

[3] ضعيف إليه: ابن جرير (١٠/١٧/٨٠) .

[4] صحيح إليه: رواه ابن ابي شيبة في المصنف (٧/٤٦٠) .

[5] ضعيف إليه: ابن جرير (١٠/١٧/٨٠) .

[6] صحيح الى الحسن :/ رواه البيهقي في الاسماء والصفات (١٠٧٩) .

[7] صحيح إليه: ابن جرير (١٠/١٧/٨٠) .

[8] ضعيف إليه: ابن جرير نفس المصدر ص٧٨ .

[9] صحيح إليه: ابن جرير (١٠/١٧/٨٠) .

[10] ضعيف إليه: ابن جرير (١٢/٢٣/١٠١) .

[11] صحيح إليه: ابن جرير (١٢/٢٣/١٠-) .

[12] حسن إليه: ابن جرير (١٢/٢٣/١٠-) .

[13] ضعيف إليه: ابن جرير (١٢/٢٣/١٠-) .

[14] صحيح إليه: رواه عبدالرزاق (٢٥٥٧)

**جوبەیرە)[1] و (ضحاك)[2] و (السدی)[3] و (عطاء کوڕی سائب)[4] و (حسن البصری)[5] و (قتادە)ەوە[صحیح إلیە: ابن جریر] [6] لەچەند کەسەوە گێڕاوەتەوە و ابن جریر هەڵیبژاردووە بۆ ڕاستی ئەمەش ئەو فەرموودەیە ئەهێنینەوە کە پێشەوا (احمد)[7] و هەندێ کەسی تر گێڕاویانەتەوە لە (ابن عباس)ەوە پێی فەرموو: (من چەند ووشەیەکت فێردەکەم، سنوری خوای گەورە بپارێزە، خوای گەورە دەتپارێزێت، سنوری خوای گەورە بپارێزە، دەبینین کەخوای گەورە بەئاراستەی تۆ کاروباروە پێش دێنێ، لەکاتی خۆشا خوات لەبیربێت، ئەویش لەکاتی ناخۆشی و تەنگانەدا فریات دەکەوێت و تۆی لەبیر دەبێت)**

**(ابن جریر)[8] لە تەفسیرەکەیدا گێڕاویەتەوە، وە (بەزار)یش لەمەسنەدەکەیدا هێناویەتی دەیبەنەوە سەر (ابو هریرە) کە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (کاتێك خوای گەورە ویستی یونس لەزگی نەهەنگەکەدا دیل بکات، خوای گەورە وەحی بۆ نەهەنگەکە کرد کە یونس بگرێتە ناو زگی و زیان بەگۆشت و ئێسکی نەگەیەنێ و نەیشکێنێ، جا کە بەتەواوەتی قوتیدایە ناوگەدەیەوە ئیتر نەهەنگەکە بەرەو قوڵایی بنی دەریاکە دابەزی، یونس هەستی بەدەنگە دەنگ کرد، لەخۆی پرسی ئەوە چییە؟ خوای گەورە وەحی بۆکرد بۆناو زگی نەهەنگەکەو فەرمووی: ئەوە دەنگی تەسبیحاتی گیاندارانی دەریایە، ئینجا یونس دەستیکرد بەتەسبیحات بەڕادەیەك کەفریشتەکان گوێیان لەدەنگی یونس بوو، فەرموویان ئەی پەروەردگارمان ئێمە گوێمان لەدەنگێکی لاوازو نزم هەیە لەخاکێکی نامۆدا، خوای گەورە فەرمووی: ئەوە دەنگی بەندەی خۆم یونسە . کەلێم یاخیبوو، منیش لەبنی دەریادا لەزگی نەهەنگدا گیرۆدەم کردووە، فریشتەکان گوتیان: ئەو پیاوە چاکەی کەهەموو ڕۆژو هەموو شەوێك کردەوەیەکی چاکی ئەو بۆلای خۆت بڵند دەکرایەوە؟ خوای گەورە فەرمووی: بەڵی، ئیتر هەموو فریشتەکان**

---

[1] حسن إلیه: ابن جریر (١٢/٢٣/١٠٠) .

[2] ضعیف إلیه: ابن جریر (١٠/١٧/٨٠) .

[3] حسن إلیه: ابن جریر (١٠/١٧/٨٠) .

[4] لم اقف علیه .

[5] حسن الیه: رواه الحاکم (٢/٥٨٤ — ٥٨٥) .

[6] صحیح إلیه: ابن جریر (١٢/٢٣/٩٩) .

[7] صحیح: المسند (١/٣٠٧) .

[8] منکر: ابن جریر (١٠/١٧/٨٠)، البزار، کشف الاستار (٢٥٥٤) .

تکایان بۆکرد، خوای گەورە فەرمانی بەنەهەنگەکە کرد کەبێتە قەراغی دەریاو دەمی بکاتەوەو یونس دابنێ، هەروەکو خوای گەورەش لە قورئاندا دەفەرموێت: (وهو سقيم) (الصافات/١٤٥) ئەوەش بە (اسناد) و (مەتن)ەوە دەقی فەرموودەکەیە بەبێژەی (ابن جرير) .

(ابن ابی حاتم)[1] لەتەفسیرەکەیدا فەرموودەیەکی هێناوە کە بردویەتەوە سەر (انسی کوڕی مالك) کەئەویش بردویەتیەوە سەر هەندێ کەس کەپێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کاتێك یونس پێغەمبەر (عليه السلام)بەم چەند وشەیە پاڕایەوەو فەرمووی: (لا اله الا انت سبحانك اني كنت من الظالمين)، ئیتر نزاکەی وەرگیرا و عەرشی پەروەردگاریش هاتەسۆز، فریشتەکان فەرموویان: پەروەردگارا دەنگێکی لاوازو کز لەخاکێکی نامۆدا دەبیستین،خوایگەورەفەرمووی، ئایائەو دەنگە ناناسنەوە؟ فەرموویان: ئەی پەروەردگارا ئەوە دەنگی کییە؟ خوای گەورە فەرمووی: دەنگی بەندەی خۆم (یونس)ە ! فریشتەکان فەرموویان: بەندەی خۆت ئەو یونسەی کە تاکو ئێستاش کردەوەی چاکی و نزای وەرگیراوی بۆ ئاسمان بڵند دەبێتەوە؟ ئەی پەروەردگارا ئایا بەزەییت بەکەسێکدا نایەتەوە کە لەکاتی خۆشیدا چاکەی دەکردو تۆش لەم کاتی تەنگانەیەدا ڕزگاری بکەیت، خوای گەورە فەرمووی: بەڵێ، ئیتر فەرمانی بەنەهەنگەکە کرد تاکو لەکەناری دەریادا یونس دابنێ، وتراوە خوای گەورە فەرمانی بەنەهەنگەکە کرد، نەهەنگەکەش یونسی بەڕوت و ڕەجاڵی لەکەناری دەریاکە دانا، خوای گەورەش هەر لەو شوێنەدا دارێکی بۆ ڕواند یان درەختێلەیەك، کە (ابو هريره) دەفەرموێت: ڕوەکی کولەکەبووە، وخۆراکی شێریشی لەگیاندارێکی کێوییەوە دەست دەکەوت هەموو ئێوارەو بەیانیانێك، تاکو کولەکەکە پێگەیشت . خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿فَنَبَذْنَاهُ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ سَقِيمٌ﴾، واتا: فرێمان دایە دەرەوە لەزگی نەهەنگەکە بۆ کەنار دەریایەکی ڕوتەن و بێدارو دەوەن، لەکاتێکدا لەش و لاری لەناو زگی نەهەنگەکەدا ناسك و لاواز ببوەوە، (ابن مسعود)[2] دەڵێت: هەروەکو چۆن جوجەڵە لەشی ناسکەو هێشتا توکی لێدەرنەهاتووە . (ابن عباس)[3] و (السدى)[4] و (ابن زيد)یش[1] فەرموویانە: لەشی وەك لەشی مناڵێکی تازەبوی ساوا

---

[1] ضعيف: ابن أبي حاتم (١٣٧١٠)، ابن جرير (١٢/٢٣/١٠-) .

[2] صحيح إليه: ابن ابي شيبة فى المصنف (٤٥٩/٧) .

[3] ضعيف إليه: رواه ابن جرير (١٢/٢٣/١٠٢) .

[4] حسن إليه: رواه ابن جرير (١٢/٢٣/١٠٢) .

ناسك و لاوازبو، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَأَنبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِن يَقْطِينٍ﴾، واتا: درەختی (یەقطین)مان بۆ ڕواند کە (ابن مسعود)[2] و (ابن عباس)[3] و (عکرمە)[4] و (مجاهد)[5] و (سعید)[6] و (وهبی کوڕی منبە)[7] و (هلالی کوڕی یەساف)[8] و (عبداللە کوڕی طاوس)[9] و (السدی)[10] و (قتادە)[11] و (الضحاك)[12] و (عطاء خراسانی)[13] فەرموویانە ئەو دارە کولەکەیە زانایان دەڵێن کولەکە گەڵاکانی نەرمەو سێبەرەکەی چڕو خۆشە، مێش پێوەی نانیشێ بەروبومەکەی هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی وەرز دەخورێت بەکاڵیو کوڵاوی و بە توێکڵ و بێتوێکڵ و بەدەنکەکانیشیەوە، وە سودێکی زۆری هەیە بۆ بەهێزکردنی مێشك ﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ وَكَذَٰلِكَ نُنجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾،واتا:وەڵامی یونسمان دایەوەو ناڕەحەتیە ڕزگارمان کرد﴿وَكَذَٰلِكَ نُنجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾هەر ئاوهاش باوەڕداران ڕزگار دەکەین ئەگەر داوامان لێ بکەن . (ابن جریر)[14] فەرموودەیەکی هێناوە کە لەکۆتایەکەیدا دەچێتەوە سەر (سعدی کوڕی مالك)، واتا: سەعدی کوڕی ابی وقاص کەدەڵێت: گوێم لێبوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ناوێکی خوا هەیە کەئەگەر بەو ناوەوە داوای لێبکەیت و لێی بپاڕێیتەوە خوای گەورە وەڵامت دەداتەوە، وە ئەگەر داوای شتێکی لێبکەیت بەو ناوەوە خوای گەورە پێت دەبەخشێت، ئەویش ئەو داواو نزایەیە کە یونسی کوڕی مەتی پێی لەخوا پاڕایەوە)، دەڵێت پرسیم لە پێغەمبەر (ﷺ) ئایا ئەو داواو پاڕانەوەیە هەر تایبەتە بە

---

[1] صحیح إلیه: رواه ابن جریر (١٢/٢٣/١٠٢) .

[2] صحیح إلیه: رواه ابن جریر (١٢/٢٣/١٠٢) .

[3] ضعیف إلیه: رواه ابن جریر (١٢/٢٣/١٠٢) .

[4] السیوطي ئەشت راستی کردوەتەوە بۆ (عبد بن حمید) .

[5] صحیح إلیه: رواه ابن جریر (١٢/٢٣/١٠٢)، درەختە بە (دباء) و (قرع) هاتووە .

[6] صحیح إلیه: رواه ابن جریر (١٢/٢٣/١٠٢) .

[7] صحیح إلیه: عبدالرزاق (٢٥٥٧) .

[8] لم أقف علیه .

[9] صحیح إلیه: رواه عبدالرزاق (٢٥٥٠) لەباوکیەوە .

[10] حسن إلیه: رواه ابن جریر (١٢/٢٣/١٠٣) .

[11] حسن إلیه: رواه ابن جریر (١٢/٢٣/١٠٣) .

[12] فیه ضعف إلیه: رواه ابن جریر (١٢/٢٣/١٠٣) .

[13] لم أقف علیه .

[14] صحیح بمجموع طرقه: رواه ابن جریر (١٠/١٧/٨٢) .

**یونس** (علیه السلام)**یان بۆ سەرجەم موسوڵمانانیشە بەگشتی ؟ فەرمووی: (ئەوە تایبەتە بە یونس و بۆ سەرجەم موسوڵمانانیشە ئەگەر پێی لەخوا بپاڕێنەوە، ئەوە نیە خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾

﴿فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ وَكَذَلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾ **(الانبیاء:/٨٧-٨٨)، ئەوەش مەرجێکە لەلایەن خواوە بۆ هەر کەسێك کە لەخوا بپاڕێتەوە . (ابن ابی حاتم)**[1] **دەڵێت: (ابو سعید الاشبح) بۆی گێڕاوەمەوە ئەویش لە (ابو خالد الاحمر) ئەویش لە (کثیر کوڕی زەید) ئەویش لە (مطلب کوڕی حنطب)ەوە . (ابو خالد) دەیباتەوە سەر (سەعد) کەدەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەسێك بەو پاڕانەوەیەی یونس لەخوای خۆی بپاڕێتەوە لەلایەن خواوە وەڵامی دەدرێتەوە، ابو سعید الاشبح) دەڵێت: مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) لەو ئایەتەیە کەخوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿وَكَذَلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ﴾ .

**پێشەوا (ئەحمەد)** [2] **فەرموودەیەکی هێناوە کە دەیباتەوەسەر (سعدی کوڕی ابی وقاص) کەدەڵێت: بەلای عثمانی کوڕی عەفاندا تێپەڕیم لەمەزگەوتدا، سڵاوم لێکرد، کەچی وەڵامی نەدامەوە لەکاتێکدا پڕ بەچاوەکانیشی سەیری دەکردم، ئیتر چووم بۆلای عومەری کوڕی خطاب پێم گوت: ئەی ئەمیری موسوڵمانان: ئایا سڵاوکردن هیچ گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە؟ فەرمووی: نەء، هیچ شتێکی بەسەردا نەهاتووە ئەدی بۆچی دوێنێ لەمزگەوت عوسمانی کوڕی عەفانم بینی، سڵاوم لێکرد کەچی ئەو وەڵامی نەدامەوە لەکاتێکدا زەق زەق سەیری کردم؟ عومەر ناردی بەشوێنی عوسماندا لێی پرسی: بۆچی ئەم برایە سڵاوی لێکردویت کەچی وەڵامت نەداوەتەوە، عوسمان فەرمووی: شتیوام نەکردووە، دەنگە دەنگ پەیدابوو، کارەکە گەیشتە سوێند خواردن، ئیتر عوسمان فەرمووی: ڕاستە ئێستا وەبیرم دێتەوە، داوای لێبوردن لەخوای گەورە دەکەم، بەڵام من لەو کاتەدا لەگەڵ خۆمدا دەدوام و زۆر قوڵ ببوومەوە لەلێکدانەوەی مانای شتێك کە لەپێغەمبەری خواوە (ﷺ) بیستبووم بەخوا هەر کاتێك ئەو فەرموودەیەم دێتەوە بیر دڵ و چاوم بەتەواوەتی بۆئەوە تەرخان دەبێت (واتا: دادەبڕێم و هۆشم لەسەر دەوروبەرم نامێنێ)، (سعد)دەڵێت:دەزانم ئەو فەرموودەیە کامەیە ئەوەبوو پێغەمبەر (ﷺ) باسی نزایەکی گەورەی کرد، بەڵام پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی و باسەکەی بڕی،**

---

[1] ابن أبي حاتم (١٣٧١٣) .

[2] صحيح بمجموع طرقه: المسند (١/١٧٠)، الترمذي (٣٥٠٥)، النسائي الكبرى (١٠٤٩٢) و االنسائي الكبرى (١٠٤٩١) .

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) هەستاو ڕۆیشت منیش لەخزمەتیدا ڕۆیشتم، چاوەڕوان بووم کە داوەتم بکات بۆ ماڵی خۆیان بۆیە بەنوکی قاچم ئەمکێشا بەزەویدا تاکو پێغەمبەر لایکردەوەو فەرمووی: (خوە)، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا باسی سەرەتای نزایەکی گەورەت بۆکردین تەواوت نەکرد کەپیاوێکی دەشتەکی هات و سەرقاڵی کردیت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بەڵێ نزاو پاڕانەوەکەی ذوالنونم مەبەست بوو، کە لەزگە نەهەنگەکەدا دەیفەرموو: ﴿لا إِلَهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ هەرکەسێك بەو پاڕانەوەیە لەخوای گەورە بپاڕێتەوە بۆ هەر شتێ، هەر وەڵامی دەدرێتەوە لەلایەن خواوە) (ترمذي و نسائي) گێڕاویانەتەوە .

## گەورەیی و سەروەری یونس پێغەمبەر ( درورد و سڵاوی خوای لەسەر بێت )

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾ (الصافات:١٣٩)، واتا، یونس لەپێغەمبەرانە، هەروەها خوای گەورە ناوی یونس (عليه السلام)لەناو ناوی پێغەمبەراندا (عليه السلام)هێناوە لەهەردوو سورەتی (الانعام) و (النساء)دا پێشەوا (ئەحمەد)[1] فەرموودەیەکی هێناوە کە دەچێتەوە سەر (عبدالله) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ناشێت هیچ کەسێك بڵێت: من لەیونسی کوڕی مەتی باشترم) بوخاری گێڕاویەتەوە، هەروەها پێشەوا (بوخاری)[2] فەرموودەیەکی هاوتای ئەوەی هێناوە کە دەیباتەوە سەر (ابن عباس)، دیسانەوە پێشەوا (أحمد)[3] فەرموودەیەکی ئەمیشی هێناوە کە دیباتەوە سەر (ابن عباس)، (بخاری)[4] گێڕانەوەیەکی تریشی هێناوە، دیسان هەر لەگێڕانەوەیەکی (بخاری)دا[5] هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (کەس نیە بڵێ من لەیونسی کوڕی مەتی باشترم)، لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کەپێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (گەورەیی من مەدەن بەسەر پێغەمبەرانی ترو یونسی کوڕی مەتیدا) دیارە ئەوەش لەڕووی بێفیزی پێغەمبەرە (ﷺ) وای فەرمووە .

---

[1] صحيح: المسند (١/٣٩٠)، البخاري (٤٦٠٣) .

[2] متفق عليه: البخاري (٧٥٣٩)؛ المسند (١/٢٤٢)، مسلم (٦١١٠)، ابو داود (٤٦٧١) .

[3] ضعيف الاسناد: المسند (١/٢٥٤) .

[4] ضعيف الاسناد: الطبراني فى الكبير (١١١٢٢) .

[5] متفق عليه: البخاري (٣٤١٦)، مسلم (٦١٠٩) .

## ﴿( موسا ) پێغەمبەر ( درودو سڵاوی خوای لەسەر بێت )﴾

(موسا) (عليه السلام) یەکێکە لەپێغەمبەرە گەورەکان و بە (كليم الله)ناسراوە، واتا ئەو پێغەمبەرەی کە گفتوگۆی لەگەڵ خوادا کردووە، لەبنەڕەتدا ناوی(موسا)ی کوڕی (عمران)کوڕی (قاهت)کوڕی (عازر)کوڕی (لاوی)کوڕی (یەعقوب)ی کوڕی (اسحاق)ی کوڕی (ابراهیم)ە (عليه السلام)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مُوسَى إِنَّهُ كَانَ مُخْلَصاً وَكَانَ .........هارونَ نَبِيّاً﴾ (مريم:٥١– ٥٣)

واتا: ئەی محمد ! بیرلەو کتێبە بکەرەوە کەناردمان بۆ موسا، موساش کەسێکی دڵسۆز بوو، ڕەوانەکراوو پێغەمبەرێکی خوا بوو، لەپەنای کێوی (طور)ەوە بانگمان لێکردو لەخۆمانمان نزیك کردەوەو ڕزگارمان کرد، ڕەحمەت و سۆزی خۆمانمان پێبەخشی و برای ئەویشمان کردە پێغەمبەر و هاوکاری موساش .

بەڵێ، خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا، لەگەلێك سورەت دا بەکورتی و بەدرێژی و سەربەخۆو لەگەڵ پێغەمبەرانی تردا (عليهم السلام) بەچەندین چەشن و جۆرباسی موسا پێغەمبەری فەرمووە، چەمك و قۆناغەکانی ژیانی و چیرۆکی گوزەرانی خۆی و چارەنووسی گەلەکەی و فرعەونەکانی کردوە، کەئێمەش لێرەدا بەپشتیوانی خوای گەورە بەپێی توانا لەڕوانگەی قورئانی پیرۆزو فەرمودەکانی پێغەمبەرمانەوە(ﷺ)لەگەڵ ڕاوبۆچونی ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆزو فەرمودەکانی پێغەمبەرمانەوە (ﷺ) لەگەڵ ڕاوبۆچونی ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆزو مێژوونوسان، ژیانی ئەو سەروەرە پایە بەرزە دەخەینە ڕوو . خوای گەورە لەسەرەتای سورەتی (القصص)دا لەئایەتی یەکەمەوە تاکو ئایەتی شەشەم دەفەرموێت: ﴿طسم ، تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ .... ... وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُما مِنْهُمْ مَا كَانُوا يَحْذَرُونَ﴾ القصص (١ – ٦)، لێرەدا بەکورتی خوای گەورە پوختەی چیرۆکی ژیانی موسا (عليه السلام)بۆ پێغەمبەری ئازیزمان باس دەکات، وە دڵنیای دەکات کەئەو بەسەرهاتەی بەشێوەیەکی هەق و ڕاست بۆ دەخاتە ڕوو، کە لەگەڵ فرعەون دا چۆن گفتارو ڕەفتاری کراوە، تیایدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعاً﴾، واتا: فرعەون فیزو لەخۆبایی بون دایگرت، لوتی بەرزبو، دەستی دایە ستەم و نادادی، گیرۆدەی پلەو پایەی ژیانی دنیا بو، تاکو سەرەنجام کۆسپی دەخستە بەردەم خەڵکی لەپەرستنی خوای تاك و تەنهادا، گەلەکەی پارچەپارچە و بەش . . بەش کرد، هەندێکی بەگەورەتر و باشتر لەقەڵەم دەدا لەهەندێکی تر،

کۆمەڵێکی لاوازو بێ دەسەڵات کردبو، ئەوانیش ئەو خێڵ و بەرانە بوون کە دەچوونەوە سەر بەروبەرەچەی (یەعقوب)ی پێغەمبەر(علیه السلام)، کەبە (بنواسرائیل) ناسراون و لەوکاتەدا باشترین خەڵکی سەرزەوی ئەو بەرەیەبون .

خوای گەورە ئەو فرعەونە ستەمکارو خوێن ڕێژو بێ باوەڕەی بەسەردا زاڵ کردن، بەڕاددەیەك کەئەوپاشا ستەمکارە ئەو گەلەی زۆر بەسوکو بێ نرخی تەماشا دەکرد و بەئارەزوی خۆی بەلای ڕاست و چەپدا لێی دەکوشتن، نەك هەر کوشتنی سادەو ساکار بەڵکو نێرینەکانی سەردەبڕین و ژن و مێینەکانی دەهێشتنەوە، بەڕاستی فرعەون خراپکار و بەدکارێکی سەرزەوی بو، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ﴾ هۆیەکەیشی ئەوەبوو کە فیرعەون هێندە بەتوندو تیژی دژی (بنو ئیسرائیل)دەوەستایەوە چونکە هەر لەسەردەمی (ابراهیم)ەوە (علیه السلام)پشتاوپشت بیستبوویان کە یەکێك لەنەوەکانی ئیبراهیم (علیه السلام)و بەروبەرەچەی ئەو لەدایك دەبێت و سەرەنجام دژی پاشای میصر دەجەنگێ و تەفرو تونای دەکات و لەناوی دەبات، لەناو (بنی اسرائیل)داواباوبوەکە کاتێك فریشتەکان هاتن بۆ خزمەتی (ابراهیم) (علیه السلام)مژدەیان بە (سارە)ی ژنی دا کە لەبەرو بەرەچەی تۆ منداڵێك دەکەوێتەوە تەخت و تاراجی پاشای میصر لەناو دەبات، (قبطی یەکان)یش لەناوخۆیاندائەم قسەیان باس دەکردو دەیانگێڕایەوە، تاکو سەرەنجام قسەکە گەیشتەوە بەفرعەون، ئەوەبو هەندێ ژن و ژاڵ و خزمەتکارەکانی و کارەکەرەکانی ئەم قسەو باسەیان گەیاندەوە بەفرعەون، لەبەرئەوە فرعەون بڕیاری دا کە لەمەولا هەر کەسێك خێڵ و بەرەی (بنی اسرائیل)منداڵی نێرینەیان ببێت، دەبێت بکوژرێ، نەبادا لەسەردەمی ئەوفرعەونەدا ئەو منداڵە لەدایك ببێت کە تەخت و تاراجی فرعەون لەسەر دەستی ئەو کاول دەکرێ . (السیدیّ)[٩٩] لەگێڕانەوەیەکدا کە دەیباتەوە بۆسەر (ابن مسعود)، ئەویش لەهەندێ لەیاوەرانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە (فیرعەون)خەونێکی بینی، لەخەویدا ئاگرێك لەلای (بیت المقدس) ەوە هەڵگیرساو بەرەوڕووی (میصر) هات، ماڵەکانی وڵاتی میصری هەموو سوتاند، لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی کە (قبطی)بون، بەڵام هیچ زیانێکی بە (بنو اسرائیل)یەکان نەگەیاند، کە فیرعەون لەخەوڕابو،سەرسام بو بەو خەونەو هەرچی جادوگەر و دەست و پێوەندەکانی خۆی هەبوو کۆی کردنەوە تاکو

[٩٩] حسن: ابن جرير فى التأريخ (١ / ٢٣٢ )

مانای خەونەکەی بۆ لێك بدەنەوە، سەرەنجام بەفرعەونیان گوت: خەونەکەت ئەوە دەگەیەنێت کە منداڵێك لەدایك دەبێت دەبێتە مایەی لەناوبردنی خەڵکی میصرو تەخت و تاراجی پاشای وڵات، لەمەوە فرعەون بڕیارێکی شاهانەی دەرکرد کەلەمەولا هەرمناڵێکی کوڕ لەدایك بو دەبێت لەناو ببرێت ئەگەر سەر بە (بنو اسرائیل)بێت، بەڵام ئەگەر کچ بێت ناکوژرێت و مەترسی نیە . بەڵام خوای گەورە حیکمەتی خۆی بەردەوامە و نهێنی کارەکانی نەزانراوە،بەڵکو دەفەرموێت: ﴿وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ﴾،واتا:خوای گەورە منەت بەسەر (بنو اسرائیل)وا دەکات کە دەسەلاتی پێدانەوەو کردنی بەنەوەیەکی گەورەو نەتەوەیەکی زل و میراتی زەویان پێ بڕاو حوکمڕانی و پاشایەتی میصر لەفرعەونەکان سەنرایەوە و درایە دەست ئەوان، کە پێشتر زەلیل و داماو بون و بەردەوام نێرینەیان لەناو دەبرا، وە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُمْ مَا كَانُوا يَحْذَرُونَ﴾کورتەی ئایەتەکە واتە: ئێمە لاوازو بێ دەسەلاتەکان بەهێز دەکەین و دەسەلاتیان پێ دەدەین، هەموو ئەمانەش خوای گەورە بەخشی بە (بنو اسرائیل) چونکە ئارامیان گرت بەرانبەر ئەو هەموو نادادی و ستەمکاریە درێژخایەنەی بەرانبەریان کرا، ئەوەش لەئایەتی (١٣٧ی سورەتی الاعراف)دا بەئاشکرا دیارە، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَمْ تَرَكُوا مِنْ جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ (الدخان — ٢٥)، وتا ئەوبێ بڕوایانەی پێش (بنو اسرائیل) چ باخ و کانیاوێکی خۆشیان هەبو، لێمان سەندنەوەو دامانن بە (بنو اسرائیل)وە سورەتی (الشعراء)ئایەتی(٥٧— ٥٩) دیسان باسی هەمان نیعمەت دەکات لەگەڵ گەنجینەکانیشیان کە هەموویان بەمیراتی بەجێ ماون بۆ (بنو اسرائیل) بەکورتی: فرعەون هەموو ڕێگەیەکی گرتە بەر بۆئەوەی ڕێگە بگرێ لەهاتنە دنیای ئەو منالەی کە دەبێتە مایەی مەترسی بۆی، تەنانەت چاودێرو پیاوی خۆی تەرخان کرد کەلەگەڵ مامانەکان بەسەر ژنە زگ پڕو دوگیانەکاندا دەگەڕان و دەیانزانی کامیان کەی منالی دەبێت،جاهەر کات ژنەکە ژانی منالْ بون دەیگرت پیاوانی فیرعەون و مامانەکان بەسەرسەریەوە بون، ئەگەر منالەکە کوڕ بوایە، هەرئەوساتە سەریان دەبڕی و لەناویان دەبرد. (اهل الکتاب)دەڵێن: فیرعەون بۆیە فرمانی دەرکرد بەلەناوبردنی کۆرپەی کوڕو نێرینەکان، تاکو بەرو بەرچەی (بنو اسرائیل)کەم بن و بێ هێز بن، نەتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن ئەگەر ویستیان کودەتا و هەڵمەت بەرنە سەرکۆشك و تەلاری پاشایەتی، بەڵام ئەوەیان بۆ چونێکی هەڵەیە چونکە دەرکردنی

فرمانەکانی فرعەون بۆ کوشتنی کوڕان پاش ئەوە بوو کە خوای گەورە (موسا)ی کردبو بەپێغەمبەر، هەروەکوخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَاءَهُمْ بِالْحَقِّ مِنْ عِنْدِنَا قَالُوا اقْتُلُوا أَبْنَاءَ الَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ وَاسْتَحْيُوا نِسَاءَهُمْ وَمَا كَيْدُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ﴾ (غافر/٢٥) واتا: (کاتێك ئێمە هەق و ڕاستیمان بۆ ناردن – واتا موسامان کرد بەپێغەمبەریان – ئینجا گوتیان منالی ئەو کەسانە بکوژن کە بڕوایان بەموسا هێناوە و شوێنی کەوتون،بەلام ژنومێینەیان بهێلنەوە)، لەبەرئەوە (بنو اسرائل)یەکان هاتن بەموسایان گوت (علیه السلام) ﴿قَالُوا أُوذِينَا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَأْتِيَنَا وَمِنْ بَعْدِ مَا جِئْتَنَا﴾ (الأعراف/١٣٩) ، بەلام ئەوەیان ڕاستترە کە فیرعەون بۆیە نێرینەی لەناودەبرد نەبادا ئەو منالە لەدایك ببێ کە لێی دەترسا، واتا (موسا)پێغەمبەر(علیه السلام)، بەلام خۆ بڕیاری خوایی جیاوازە، قەدەری خوایی دەلێت: ئەی پاشای بەزەبرو زەنگ و لەخۆبایی بەسەر بازە زۆرەکانت و بەکورسی و تەخت و دەسەلاتت، خوای گەورە گەلێکی لەتۆ بەدەسەلاتدارتری بێ سەرو ناوکردوە، ئەو منالەش کە تۆ زینۆقت لێی چوە، هەرلەدایك دەبێت، ئەو منالەی کەلەترسی بونی هەزاران هەزار مندالی بێ تاوان و ساوات کوشتوە، نەك هەر ئەو منالە لەدایك دەبێت،بەلکو لەناو مالی خۆیشت دا بەدەستی خۆت و لەژێر چاودێری خۆتدا گەورەی دەکەیت، لەسەر ڕاخەری خۆت، بەخۆراکی سفرەی خۆت گۆشی دەکەیت، بەبێ ئەوەی بەنهێنی ژیانی ئەو منالە بزانیت، سەرەنجام تیاچونی خۆت و تەخت و تاراجت لەدنیاو دواڕۆژدا لەسەر دەستی ئەو منالە دەبێت، چونکە تۆی فرعەون، تۆی پاشای میصر، پێچەوانەی پەیامی ئەو منالە دەجولێیتەوە کەکاتێك خوای گەورەرە دەیکات بە یەکێك لەپێغەمبەرە گەورەکان (علیه السلام)تاکو ئەوەش ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ تۆو تۆو نموونەی تۆ، بۆئەوەی دلنیا بن کە هیچ کەسێك سەر دەرناکات لەکاروبارە پڕ لەحیکمەتەکانی پەروەردگار و نەخشە بەجێکانی و ئەوەی بیەوێت بیکات، دەیکات و هیچ کەسێك ناتوانێت بەربگرێت لەفرمانەکانی .

دەگێڕنەوە لە زیاتر لەیەك کەس لەزانایانی تەفسیر کە (قبطی یەکان) سکالایان کرد لەلای فرعەون کە ژمارەی (بنو اسرائیل)یەکان زۆرکەم بوەتەوە، بەهۆی ئەو کوشتارەی کەبوەتەمایەی بن بڕکردنی توخمی نێرینە تیایاندا، چونکە وردە،، وردە،، پیرەکان دەمرن و کەس نیە جێگەیان بگرێتەوە، بەم جۆرە بەتەواوەتی ئەوبەرەیە بنەبڕدێن و سالی دواتر وازیان لێ بهێنرێت، واباس دەکەن کە (هارون) (علیه السلام) لەو سالەدا لەدایك

بوه کەساڵی لێبوردنەکەبوە، بەڵام (موسا) (علیه السلام) لەوساڵەدا لەدایك بوە کەتیایدا منداڵەکان سەردەبڕان،لەبەرئەوە دایکی موسا (علیه السلام) بەتەواوەتی تەنگی پێ هەڵچنرابوو، تەنانەت هەر لەیەکەم ساتی هەست کردنی بەوەی کەزگی هەیەو دووگیانە، بەڵام باشیەکەی لەوەدابو کە هیچ نیشانەیەکی دوگیانی پێوە دیارنەبو، کاتێك منداڵەکەیشی بو، خوای گەورە خستیە دڵی دایکی یەوە کە منداڵەکە بخاتە ناوتابوتێکەوە و تابوتەکەش بە پەتێکەوە ببەستێ و سەری پەتەکە لەلای خۆی بێت لەکەنارەکەو منداڵەکەشی لەکاتی مەترسی دا بخاتە تابوتەکەوەو بیخاتە دەریاکەوە، هەرکات چاودێر و پیاوانی پاشادەهاتن و دەگەڕان دایکی خێرا منداڵەکەی لەتابوتەکە دەهاویشت و دەیدایە دەریا، پاش گەڕانەوەی پیاوەکان دیسان دایکەکە گوشەکەی ڕادەکێشاو شیری بەمنداڵەکەی دەداو لای خۆی دەبو تاکو کاتی مەترسی یەکی تر، خوای گەورەش بەدەقی ئایەتی قورئان ئەو کارەی دایکی موسای باس کردوەو دەفەرموێت: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ......... وهم لايشعرون﴾ (القصص:٧ -٩)، واتا وەسیەتمان کرد بۆ دایکی موسا کەبێ مەترسی شیر بدات بە منداڵەکەی و ئەگەر ترسایشی منداڵەکەت فڕێدەرە دەریاکەوە، مەترسە، دڵتەنگ مەبە، ئێمە ئەو منداڵە سەرەنجام دەگەڕێنینەوە لای خۆت، وە دەیکەینە یەکێك لەپێغەمبەران . پاشان خوای گەورە باسی ئەوە دەفەرموێت کە پیاوانی فرعەون منداڵەکەیان لەدەریاکەدا لەناو تابوتەکەدا گرتەوەو بردیانەوە بۆلای فرعەون، تاکو فرعەون و هامانی وەزیری و سەربازەکانی لەناوی بەرن، چونکە ئەوانە بەڕاستی خراپکارو تاوانبار بون، بەڵام ژنەکەی فرعەون گوتی: چاوڕونی خۆمان، لەمن و لەتۆ ئەی فرعەون، ئەم منداڵە مەکوژن، سابەڵکو سودمان پێ بگەیەنێت، یان دەیکەینە منداڵی خۆمان، ئەوان چوزانن چ نهێنی یەکی گەورە لەپشتی ئەو منداڵەوەیە .

ئەو جۆرە وەحی یەی کە خوای گەورە خستیە دڵی دایکی موساوە(علیه السلام)جۆرە وەحیەکە لەچەشنی ڕێنومایی، نەك وەحی تەواوەتی بێت وەکو هی پێغەمبەران(علیه السلام)، هەروەکو لەقورئانی پیرۆزدا خوای گەورە باسی چەند شتێکی تر دەفەرموێت کەئەم جۆرە وەحیەی بۆ ناردون، لەوانەش وەحی ڕینومایی کردنی هەنگ، کەخوای گەورە ڕێنومایی جەنگی کردوە تاکو ماڵ و هێلانە و شانە هەنگوینی خۆی و ماڵی خۆی لەشاخ و کلۆرەدارەکاندا دروست بکات، هەروەکو لە سورەتی(النمل) ئایەتی (٦٨-٦٩)دا

دەفەرموێت: ﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتاً وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ، ثُمَّ كُلِي مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلاً يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾، کەواتە ئەو جۆرە وەحی یە جیاوازە و لەوجۆرەنیە کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەرانی ناردوە (علیه السلام) هەروەکو (ابن حزم) و هەندێکی تر وای بۆنەچوون، دیارە بۆچوونی یەکەمیان ڕاست ترە، هەروەکو (ابو الحسن الآشعری) لە(أهل السنة والجماعة) وەریگێراوەتەوە . (سوهەیلی) دەفەرموێت: دایکی موسا (علیه السلام) ناوی (ئاریاخا)بوە، لەلایەکی ترەوە گوتراوە ناوی (ئەیاذخت)بوە.

بەڵێ: خوای گەورە چۆن فرمانی بەدایکی موسا (علیه السلام)کردبو،ئەویش واجێ بەجێی کرد، ڕۆژانە بەو جۆرەی دەکرد، منداڵەکەی شیر پێ دەدا، هەر کە هەستی بەمەترسی دەکرد، دەیخستە ناو تابوتە تەختەکەوەو دەم ئاوی نیلی دەداو سەری گوشەکەی لای خۆیەوە قایم دەکرد، ڕۆژێکیان سەری پەتەکە بەرببوو، یان لەدەستی ترازا بوو، یاخود بیری چوبوەوەکە بیبەستێ و قایمی بکات – دیارە ئەوەش ویستی خوای گەورەی لەسەربوە بۆیە تابوتەکە بەخۆی و منداڵەکەی ناویەوە ئاوەکە دەیبات، تادەگاتە بەردەمی ماڵی فیرعەون، ئیتر وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (فالتقطه آل فرعون) دەست و پێوەندەکانی فرعەون گرتیانەوەو بردیان بۆ خۆیان .

زانایانی تەفسیر فەرمویانە: [100] کە جاریەکانی فیرعەون بینیان کەتابوتێکی سەرداخراو لەسەرئاوی نیل ڕووبەڕوویان دێت،گرتیانەوە،بەڵام هیچیان نەیانوێرا تابوتەکە بکەنەوە،تاکو بردیانە بەردەمی (ئاسیە)ی ژنی فرعەون، کەکچی (مزاحم)ی کوڕی(عبید) ی کوڕی (ڕیّان)ی کوڕی (ولید)بوە کە لەسەردەمی (یوسف)پێغەمبەردا (علیه السلام) فرعەونی وڵاتی میصر بوە، لەلایەکی ترەوە وتراوە کە (ئاسیە)ی ژنی فرعون سەربە (بنی اسرائیل)یەکان بوەو دەچێتەوە سەر تیرەی (موسا)پێغەمبەر(علیه السلام)وتراویشە نەخێر (ئاسیە)پوری (موسا)بوە(علیه السلام)ئەمەی دواییان قسەی (السهیلی)یە خوای گەورە زاناترە .جاکاتێك (ئاسیە)تابوتەکەی کردەوە، منداڵێکی خوێن شیرین و زۆر جوانی تێدا بینی، کە ڕوخساری شەوقی دەدایەوە، کەچاوی تێبڕی بەزەیی بۆی جوڵا . خۆشەویستی یەکی زۆری بۆی هەبوو، کاتێکیش فیرعون ئەمەی بینی، پرسی: ئەوە چی یە ؟ دەی سەری بڕن ! بەڵام ژنەکەی سۆز و پشتیوانی بۆ دەربڕی و

---

[100] ابن جریر اخ. ل/ گێراویەتیەوە لەهەمان سەرچاوەی پێشوودا .

پشتیوانی لێکردو گوتی (قرتُ عین لي وَلك) واتا چاوی من و تۆ ڕوون بەومناڵە، فیرعون لەوەڵامی ژنەکەیدا گوتی: بۆتۆبەڵێ،بەڵام هەرگیز من نا، واتا تۆکەیفی خۆتە، بەڵام من هیچ پێویستیەکم بەو مناڵە نیە، بەڵام ژنەکەی گوتی: ﴿عَسی ان ینفعنا أو نتخذه ولداً﴾، بابیهێڵینەوە، سابەڵکو سوودی لێ وەربگرین، یان هیچ نەبێ بیکەینە مناڵی خۆمان!، بەڵێ ئاسیە لەدنیادا سودی لێ وەرگرت کەبوبەمایەی ڕێنومایی کردنی بۆسەر ئاینی خواپەرستی و لەدواڕۆژیش دا بەهۆی ئەوەوە خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە، سەرەنجام پێك هاتن لەسەر ئەوەی کە بەخێوی بکەن و بیکەنە مناڵی خۆیان، چونکە مناڵی کوڕیان نەبوو، (وهم لایشعرون)بەڵام ئەوان نەیاندەزانی خوای گەورە چ کارێکی گرنگی بەومناڵە هەیە . (اهل الکتاب)پێیان وایەکە ئەو کەسەی (موسا)ی هەڵگرتەوە و کردی بە منداڵی خۆی کچی فرعون بوو، نەك ژنەکەی بەڵام ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە و پێچەوانەی ئایەتی قورئانی پیرۆزە کە دەفەرموێت: ﴿وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغاً .... وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾ (القصص١٠–١٣).

چەندکەسێك فەرمویانە کەمانای ئەم ئایەتە (واصبح فؤاد ام موسی فارغاً) واتا: دڵ و دەروونی دایکی موسا (علیه السلام)بەلای هیچ شتێکی دنیادا نەدەڕۆیشت، بەڵکو هەموو هۆش و گۆشێکی دایکی تەرخان بوو بۆ موسای کوڕی (علیه السلام)، ئەوچەند کەسەش کەئاوامانای ئەو ئایەتەیان لێك داوەتەوە، ئەمانەن: (ابن عباس)(١٠١)، (مجاهد)(١٠٢)، (عکرمە)(١٠٣)، و (سعید بن جبیر)(٣)و (ابو عبیدە)(٣)و (الحسن)(٣)و (قتادە)(١٠٤)و (ضحاك)(١٠٥) و هەندێکی تر، تەنانەت بارودۆخەکەی دایکی موسا (علیه السلام)هێندە کاریگەرو پڕ مەترسی بوو، کەخەریك بوو دایکی موسا (علیه السلام)نهێنی یەکەی ئاشرا بکات،لەتاوئەوەی کە هێندە پەرۆشی بوو بۆمناڵەکەی کە دەم ئاوەکەی دابوو، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:(ان کادتْ لتبدي به) خەریك بوو ئاشکرای بکات،(لو لا ان ربطنا علی قلبها)ئەگەر ئێمە دڵڕاگری و خۆ گریمان بەدایکی موسا نەبەخشیایە (لتکون من المؤمنین) تاکو کردمان بەکەسێکی باوەڕدار، – دیارە مرۆڤی باوەڕداریش پشتی بەخوا دەبەستێ

---

[١٠١] صحیح لطرقە: ابن جریر (١١ / ٢٠ / ٣٥ – ٣٦ )

[١٠٢] ضعیف الاسناد: ابن جریر (١١/ ٢٠ / ٣٥ – ٣٦ )

[١٠٣] ابن ابي حاتم (٩ / ٣٩٤٦)

[١٠٤] صحیح الیە: رواە ابن جریر (١١ / ٢٠ / ٣٦ )وابن ابي حاتم (١٠ ١٦٧١ )

[١٠٥] ضعیف: ابن جریر (١١/٢٠/٣٦)

و ترسی نیه . (وقالت لاخته) دایکی موسا بەبراکەی موسای گوت – کەکچی گەورەی بوو، (قُصّیه)شوێن پێی هەڵگرەو وەدوی بکەوە، بزانە ڕوودەکاتە کوێ و هەواڵم دەربارەی ئەو بۆ بنێرەوە (فبصرتْ به عن جنب)، واتا: دوور بەدوور بەچاوبینی – وەك (مجاهد)[١٠٦] دەفەرموێت، بەڵام (قتادة) [١٠٧] دەفەرموێت: خوشکەکەی موسا (علیه السلام)دووربەدور چاوی لەسەر تابوتی سەر ئاوەکە بوو، بەڵام بەڕوانینێك تەماشای دەکرد کە واخۆی نیشان دەدا گوایە مەبەستی تەماشاکردنی تابوتەکە نیە .

خوای گەورەش دەفەرموێت: (وهم لایشعرون)، ئەوان نازانن ، چونکە کاتێك (موسا) (علیه السلام)لەتابوتەکە دەرهێنراوبرا بۆماڵی فرعون ویستیان تێری بکەن لەشیرو بیحەوێننەوە، چونکە بۆ خۆیانیان هەڵگرتەوە، ئەوەبو (موسا) (علیه السلام)مەمکی هیچ ژنێکی نەمژی و خۆراکی دەستی کەیشی وەرنەگرت، ژنەکانی دیوانی پاشایەتی هەموویان ئەوپەڕی هەوڵیان لەگەڵ دا بەڵام هەوڵەکانیان بێ سوودبوو، دیارەئەوەش فرمانی خوایی لەسەر بووە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِنْ قَبْلُ﴾، واتا پێشتر ئێمە شیری هەموو کەسێکی ترمان لەموسا حەرام کردبوو، –لەبەرئەوە منداڵەکەیان سپارد بەچەند ژن و مامانەکان تاکو بیبەن بۆ بازاڕ سابەڵکو ژنێکیان دەست بکەوێت کەئەم منداڵە بەشێوەیەك ڕازی بێت و بیخوات، بەڵێ منداڵەکەیان برد (علیه السلام) خەڵك و ژن و ژاڵ دەوریان لێدا، لەوکاتەدا خوشکەکەی بەتیلەی چاو تەماشایەکی کردو واخۆی نیشان نەدا کەئەو منداڵە دەناسێت و پێی گوت: ﴿هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُ لَكُمْ وَهُمْ لَهُ نَاصِحُونَ﴾ (القصص:١٢)، واتا: ئایا خێزانی ماڵێکتان پێ بڵێم کەئەتوانن ئەومنداڵەتان بۆ بگرنە خۆیان و بەباشی ئامۆژگاریشی بکەن ؟

(ابن عباس)[١٠٨] دەفەرموێت: کاتێك خوشکەکەی (موسا) (علیه السلام)ئەو قسەیەی کرد، پێیان گوت: تۆ چوزانیت کە ئەوماڵە ئامۆژگاری دەکەن و بەزەییان بۆی دەبێت ؟ ئەویش بەدەمیداهات و گوتی: لەخۆشی ئەوەی کەمنداڵی ماڵی پاشایەو چاوەڕوانی خێرو بێریش لەماڵی پاشا دەکرێت، ئیتر لەگەڵ کچەکەدا ڕۆیشتن بۆماڵەکە – واتا ماڵی دایکی موسا خۆی U، دایکەکە منداڵەکەی وەرگرت و مەمکی خستە ناو دەمی یەوە،بینی

---

[١٠٦] صحیح الیه: رواه ابن جریر (١١ / ٢٠ / ٣٩ )

[١٠٧] في سنده ضعف: رواه ابن جریر (١١/ ٢٠ /٣٩ )، عبدالرزاق (٢١٩٦)

[١٠٨] ابن ابي حاتم (١٦٧٣٥) .

منالەکە مەمکی ئەو ژنە دەمژێت و شیرەکەی دەخوات، خەڵکەکە بەوە زۆر شادمان بون مژدانەیان بە (ئاسیە)دا، ئەویش ژنەکەی بانگ کرد بۆ ماڵی خۆیان و پێی گوت کە هەر لەماڵی خۆماندا بەو چاودێری ئەو منالەمان بۆبکە، ئێمەش چاکەت لەگەڵدا دەکەین و چاومان لێت نەبێت، بەڵام ژنەکە ئەوەی ڕەت کردەوە و ڕازی نەبوو، بیانووی هێنایەوەو گوتی: من مێردێکی پیرو منالی خۆم هەیە، لەبەرئەوە ناتوانم، بەڵام ئەگەر بەمنی بسپێریت و بیبەمبۆلای خۆم ئەوە جیایە، (ئاسیە)منالەکەی دایەو موچەیشی بۆ بڕیەوە و ڕۆژی مانگانەی بۆ دیاری کردو جل و بەرگی بۆ دانا، خەلات و دیاری پێشکەش کرد، بەم جۆرە ئەو منالەی مەترسی تیاچوونی لێ دەکرا، سەرلەنوێ گەڕایەوە ناو ئامێزی دایکی خۆی بەدەستی ئەو دوژمنەی کەدژی مندالان بوو .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَرَدَدْنَاهُ إِلَى أُمِّهِ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ﴾(القصص:١٣)، واتا: موسامان گەڕاندەوە بۆلای دایکی خۆی تاکو چاوی پێی ڕوون بێتەوەو دڵتەنگیش مەبە، ئەوەمانکرد تاکوبزانیت و دڵنیابێت کە پەیمانەکانی خوای گەورە ڕاست و دروستن، لێرەدا خوای گەورە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە (موسا)ᴗ دەکات بە پێغەمبەرێکی خۆی ، ئەوەش پەیمانێکی خوایی یە، دیارە پەیمانەکانی خوای گەورەش ڕاست و دروستن،هەروەکو چۆن کاتی خۆی پەیمانمان بەدایکی دا کەئەو منالە هەربۆلای خۆت بگەڕێنینەوە، لەبەرئەوە فڕێی بدەرە ئاوی نیلەوە و مەترسە (ولكن اكثرهم لايعلمون) ، بەڵام زۆربەیان بەوکارە پڕ لەحیکمەتەی خوای گەورە نازانن، خوای گەورە ئەوشەوەی کەقسەی لەگەڵ موسادا کرد ᴗ ئەوەی وەبیردەخاتەوەو منەتی خۆی دەکات بەسەردا و دەفەرموێت :﴿وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَى ، إِذْ أَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّكَ مَا يُوحَى ....... وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَى عَيْنِي﴾ (طه:٣٧ –٣٩)، واتا: دیسان منەتت بەسەردا دەکەینەوە کە وەحیمان بۆ دایکت کرد، بەو وەحیەی کەبۆی کرا، پێی گوترا منالەکەت بخەرەناو تابوتێکەوەو فڕێی بدەرە ناودەریاوە، دەریاکە دەیباتە کەنارو دوژمنی من وە دوژمنی خۆیشی دەیگرێتەوە، هەروەها خۆشەویستیم خستە دەرونتەوە بەجۆرێك کەهەر کەسێك بۆت بڕوانێت تۆی خۆش بوێت، هەروەکو کاتی خۆی بەمندالی ژنەکەی فیرعەون کەتۆی لەتابوتەکە دابینی، بەزەیی بۆی جوڵاو خۆشی ویستیت و ئەوەش بوە مایەی ڕزگاربونی خۆت و ئەو ژنەش لەدنیا و قیامەتیشدا (ولتصنع على عيني) (طە/٣٧ – ٣٩)، لەلایەکی ترەوە لەو کاتەدا کە خوشکەکەت کەوت بەسەر ئەو

قەرەباڵغییەدا کە لەدەوری تۆ کۆبوبونەوە و واتا: (وامان لەوژنەی فرعون کرد کە باشترین خۆراکت دەرخوارد بدات، چاکترین و خاوێن ترین بەرگ و خواردنت پێشکەش بکات، ئەمانەش بەخشیش ونیعمەتی خوای گەورەن بۆ تۆ ئەی موسا[١٠٩] خوشکەکەت گوتی: کەسێکتان پێ نیشان بدەم کەئەو منالە بگرێتە خۆی ؟ بەو هۆیەوە تۆمان گەڕاندەوە بۆ باوەشی دایکت، تاکو چاوڕوونی بۆ بگەڕێتەوە، دەی تۆش ئەی موسا دڵتەنگ و دوودڵ مەبە، ئەوەبوو کەسێکت کوشت خەریك بوو بتکوژنەوە ئێمە ڕزگارمان کردیت، لەو خەم و تەنگانەیەش کە فیتنەیەکی گەورەبو) پشت بەخوا دواتر باسی ئەو ڕووداوە دەکەین . خوای گەورە لەسورەتی (القصص) ئایەتی (١٤ — ١٧)دا باسی ئەوە دەفەرموێت کەپاش گەڕاندنەوەی بۆلای دایکی خۆی و ئەو چاکانەی تر کەلەگەڵیدا کردووە، ئیتر ئێستا پێگەیشتووە کاتی ئەوەی هاتوە کە سپاردەی پەیامی خوایی پێ بدرێت، چونکە تەمەنی گەیشتووەتە تەمەنی هاوسەنگی کە قۆناغی چل ساڵییە لای زۆربەی زانایان، ئیتر لەم تەمەنەدا شیاوە بۆئەوەی کە خوای گەورە بیکاتە پێغەمبەرێکی خۆی ، هەروەکو لەکاتی ساوایی دا مژدەدرا بەدایکی کەکوڕەکەت دەبێتە یەکێك لەپێغەمبەران وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾، پاشان باسی ئەوە دەکات کەهۆی چی بوو لەوڵاتی میصر چووە دەرەوەو ڕووی کردە خاکی (مەدیەن) و لەوێدا نیشتەجێ بوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَدَخَلَ الْمَدِينَةَ عَلَى حِينِ غَفْلَةٍ مِنْ أَهْلِهَا﴾، واتا: موسا (عليه السلام)چووە ناوشارەکەوە لەکاتێکدا خەڵکەکە و دانیشتوانی شارەکە لەکاتی بێ ئاگایی دابوون، لێرەداو لەمانای ئەو ئایەتەدا (ابن عباس)[١١٠] و (سعید کوڕی جوبەیر)[١١١] و (عکرمە)[١١٢] و (قتادە)[١١٣] و (السیدی)[١١٤] فەرموویانە: ئەوکاتە کاتی نیوەڕۆ بووە . لەگێڕانەوەیەکی تری (ابن عباس)[١١٥]دا کاتی نێوان ئێوارەو خەوتنان

---

[١٠٩] ئەوە لێکدانەوەی ( قتادە)ە و هەندێکی ترە بۆتەفسیری ئەو ئایەتە، هەرچەندە سەنەدی لاوازە، عبدالرزاق(١٨١٢)، ابن جرير (٩ / ١٦ / ١٦٢ )

[١١٠] پیاوانی بەمتمانە گێڕاویانەتەوە: ابن ابی حاتم (١٦٧٥٥). ابن جرير (١١/ ٢٠ /٤٤) .

[١١١] پیاوانی بەمتمانە گێڕاویانەتەوە: ابن ابی حاتم (١٦٧٥٦) .

[١١٢] ابن ابی حاتم باسی کردوە بەڵام سەنەدەکەی نەهێناوە .

[١١٣] صحيح: ابن ابی حاتم (١٦٧٥٧)، ابن ابی جرير (١١ /٢٠ /٤٤ )

[١١٤] حسن اليه: ابن جرير (١١ / ٢٠ / ٤٤)

[١١٥] ضعيف اليه: ابن جرير (١١ / ٢٠ /٤٤ )، ابن ابي حاتم (١٦٧٥٨)

بووە . لەوکاتەش دا (فوجد فيها رجلين يقتتلان) واتا: دووکەسی بینی کەشەڕیان دەکردو خەریك بو یەکتری بکوژن، کەیەکەمیان (من شيعته)،واتا: (بەنی ئیسرائیل) بوو، وە دووەمیان (من عدوّه)واتا: دوژمنی بوو، واتا: (قبطی)بوو .

هەروەکو (ابن عباس)[116] و (قتاده)[117] و (السّدی)[118] و (محمد کوڕی ئیسحاق)[119] فەرموویانە، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِنْ شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ عَدُوِّهِ﴾ واتا: ئەوەیان کە ئیسرائیلی بوو پەنای هێنا بۆموسا (علية السلام) تاکو فریای بکەوێت، چونکە ئەوان شانازیان بەوەوە دەکرد کەکاتی خۆی ئەوان موسایان گەورە کردوەو لەماڵی فرعەون دا بووەو وەکو (خاڵ) وابوون بۆی لەڕێگەی شیرەوە،ئیتر کەپیاوەکە پەنای بردبۆموسا (علية السلام) موساش (علية السلام) پەنای داو (فَوَكَزَهُ): واتا بەقاچ و دەست هەڵی کوتایەسەری، هەروەکو (مجاهد)[120]وای فەرمووە لەمانای ئایەتەکەدا، بەڵام (قتادة)[121] فەرمویەتی: موسا (علیه السلام)بەوردارو گۆچانەی کە بەدەستیەوە بوو کێشای بەپیاوەکەداو سەرەنجام (فَقَضى عليه) پیاوەکە بەوە مرد، (قبطی یەکە) لەبنەڕەتدا بێ بڕوابوو بەخوای گەورەو نامسوڵمان بوو، لەگەڵ ئەوەش دا موسا (علية السلام) بەونیازە پیای نەکێشا کەبیکوژێت، بەڵکو ویستی لەجەنگەکەداپاشگەزی بکاتەوەو دووری بخاتەوە . خوای گەورە بەسەرهاتەکەی (موسا)پێغەمبەر (علية السلام) تەواو دەکات و دەفەرموێت ﴿. قَالَ هَذَا مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ ....... . قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾(القصص ١٥ – ٢١)، لەم چەند ئایەتەدا خوای گەورە باسی ئەوە دەفەرموێت کەموسا (علية السلام) بەترس و بیمەوە بەناوشاری میصردا دەگەڕا، دەترسا لەدەست و پێوەندەکانی فیرعەون کەپێی بزانن و بیگرن، چونکە تاوانی ئەوە درابووە پاڵی کە دوێنێ (قبطی)یەکی کوشتوە لەپێناو (ئیسرائیلی)یەکدا و دڵنیا بوون کەیەکێ لەو پیاوکوژانە (موسا) بووە، بۆیە بەوردی بەدوای دا دەگەڕان و چاویان بۆ دەگێڕا، لەوناوەندەدا، پیاوە (ئیسرائیلی)یەکە چاوی پێی دەکەوێت و هاواری لێ دەکات، موساش (علية السلام) بەتوندی دەیگرێت و

[116] حسن اليه: رواه ابن ابي حاتم (١٦٧٦١)، ابن جرير (١١ / ٢٠ / ٤٥ )

[117] حسن اليه: رواه ابن جرير (١١ / ٢٠ / ٤٤)

[118] حسن اليه: رواه ابن جرير (١١ / ٢٠ / ٤٤)

[119] لسنده لا بأس به: ابن ابي حاتم (١٦٧٦٢).

[120] صحيح اليه: رواه ابن جرير (١١ / ٢٠ / ٤٦ ) .

[121] صحيح اليه: رواه عبدالرزاق (٢٢٠٢)، ابن جرير (١١ / ٢٠ /٤٦) .

سەرەنجام پیاوەکە پێی دەڵێت: تۆ کەسێکی خراپکاری ئاشکرای، ئینجا (موسا) (علیه السلام)دەیەوێت پەلاماری ئەو پیاوەش بدات کەدوێنێ زەلامێکی لەسەر کوشتوەو ئێستا بووەتە دوژمنی کوژراوەکەو دوژمنی موساش(علیه السلام)، لەکاتی نزیک بوونەوەی لەپیاوەکەدا، پیاوەکە گوتی: ﴿أتُريدُ أن تقتلني كما قتلت نفساً بالأمس﴾ دەتەوێت منیش بکوژیت، هەروەکو دوێنێ کەسێکت کوشت، وادیارە تۆ جگەلەوەی کەدەتەوێت کەسێکی توندوتیژبی لەسەر زەویدا هیچی ترت ناوێت و ناشتەوێ لەچاکەکاران بیت، هەندێ لەزانایانی تەفسیر فەرموویانە: ئەمە قسەی ئەو پیاوە ئیسرائیلییە بووە دوێنێ ڕووداوەکەی بەچاوی خۆی لە(موسا) (علیه السلام)بەدی کرد و پیاوەکە کە کاتێك بینی (موسا) (علیه السلام)بەرەو ڕووی دێت، وای زانی بۆئەوە لێی نزیك دەبێتەوە تاکو بیکوژێت، چونکە پێشتریش پێی وتبوو ﴿إنك لغوي مُبين﴾ وتراوە: ئەوقسەیەی کەپیاوەکە بەموسای گوت (علیه السلام)بووبەمایەی دروستکردنی گومان لەسەر موسا سەبارەت بەکوشتنی ئەو پیاوەی دوێنێ، بۆیە فرعون کەوتە دژایەتیکردنی موسا(علیه السلام)، ڕەنگە ئەوە دەقی قسەی پیاوە (قبطی)یەکەش بوبێ، کەکاتێك موسا (علیه السلام)بەرەوڕووی ڕۆیشتووە، ئەویش لەترسانا وای زانیوەکە ئەو دەکوژێ، لەڕووی گومانیشەوە شکی بۆئەوە چووە کە پیاوەکەی دوێنێش هەر ئەم کوشتویەتی، یاخود لەقسەو هاواری پیاوە ئیسرائیلی یەکە تێ گەیشتووە کە پێشتر بە (موسا)ی گوتبوو، خوازاناترە مەبەست لەوەیەکە فرعون بەموسای ڕاگەیاند کە تۆ پیاوکوژەیت وەئەو پیاوەی دوێنێ تۆ کوشتووتە، لەبەرئەوە بەپیاوانی خۆی ڕاگەیاند کە بەدوای موسادا بگەڕێن و بیگرن، بەڵام لەوپەڕی شاروە پیاوێکی چاك لەڕێگەیەکی نزیکترەوە هات بۆلای موسا(علیه السلام)پێی ڕاگەیاند کە دەست و پێوەندی فرعون کۆبونەوە تاکو لەناوت بەرن تۆش هەستەو لەم شارە بڕۆرە دەرەوە، من ئامۆژگاریت دەکەم، ئەویش بەقسەی پیاوەکەی کرد و ﴿فَخرجَ منها خائفاً يَترقب﴾ واتا: لەشارەکە چووە دەرەوە بەدەم ترس و چاوە مۆلەقێ، بەڵام نەیدەزانی ڕووبکاتە کوێ ؟ شارەزای ڕێگەوبان نەبوو، بۆیە ڕووی کردە پەروەردگار و فەرمووی: ﴿فَخَرَجَ مِنْهَا خَائِفاً يَتَرَقَّبُ قَالَ رَبِّ نَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ....... . رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنْزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾ (القصص:٢٢-٢٤) لەوچەند ئایەتەی پێشوودا خوای گەورە باسی ئەوە دەفەرموێت کە موسا (علیه السلام)شاری بەجێ هێشت، بە نەشارەزایی ، چونکە پێشتر دەرەوەی ئەوشارەی نەبینیبوو، ڕێگەوبانی نەدەزانی، بەوردی بەملاولای خۆیدا چاوی دەگێڕا، نەبادا دەست

و پێوەندو پیاوانی فیرعەون پێی بزانن و بیگرن، سەربەخۆ ڕێگەیەکی گرتەبەر وگوتی: پەروەردگارا لەدەست ئەم گەلەستەمکارە ڕزگارم بکە، سابەڵکو ئەم ڕێگەیەی پیادا دەڕۆم ڕێگەی ڕزگاربوونم بێت، کەبەرەو (مەدیەن)دەچوو، مەدیەنیش ئەو شارەیە کە کاتی خۆی گەلی (اصحاب الآیکة)ی تێدا دەژیان و خوای گەورەش شوعەیبی بۆ ناردن وەك پێغەمبەرێك بۆ سەریان(علیة السلام) بەلاّم ئەوان باوەڕیان نەهێناو خوای گەورەش شاری مەدیەنی بەسەریاندا کاول و وێران کرد، لەو ڕێگەیەوە ڕۆیشت، گەیشتە شوێنێك لەدەرەوەی شاری میصر کە بیرێکی ئاوی لێ بوو، شوانەکانی ئەوێ مەڕومالأتیان: لەو بیرەکۆکردبوەو ئاویان دەدان، جگەلەوانەی سەر بیرەکەش دوو کچی بینی کەدورە پەرێز لەئەوانەوە چاودێری مەڕەکانی خۆیانیان دەکردو نەیاندەهێشت لەگەڵ مەڕو مالأتی شوانەکانی تر تێکەلأو بن، دووکچی زۆر بەئەدەب و بەشەرم دیاربوون، [١٣٢] موسا (علیة السلام) بەزەیی بەدووکچەکەدا هاتەوەو لێی پرسین کەچی دەکەن و چاوەڕوانی چی دەکەن لێرەدا ؟ دووکچەکە گووتیان: دەمانەوێ مەڕەکانمان ئاو بدەین، بەلاّم دەبێت چاوەڕوان بین تاکو ئەو خەڵکە تەواو دەبن و سەربیرەکە چۆڵ دەکەن، چونکە ئێمە لاوازین و وەك ئەو شوانە پیاوانەمان پێ ناکرێت، باوکیشمان بەهۆی پیری یەوە لاوازو بێ توانا بوەو ناتوانێت لەگەڵماندا بێت، لێرەدا (موسا)پێغەمبەر (علیة السلام) هاوکاری کردن و مەڕەکانی بۆ تێراو کردن . زانایانی تەفسیر فەرمویانە: ئەوشوانانە هەرکەمەڕو مالأتی خۆیان تێراو دەکرد، بەردێکی زل و گەورەیان دەخستە سەر زارکی بیرەکە ئەو دوکچەش ڕۆژانە مەڕەکانیان بەبەرماوەی مەڕومالأتی پێش خۆیان تێراو دەکرد، ئەو ڕۆژە (موسا) (علیة السلام) خۆی بەتەنها تاشەبەردی سەر زارکی بیرەکەی لابردو کچەکەکان و مەڕەکانیشی تێراوکرد، پاشان هەر خۆی تاشە بەردەکەی لەسەرزارکی بیرەکە دانایەوە . (عومەری کوڕی خطاب)[١٣٣] فەرموویەتی: ئەو بەردە بە دەپیاو ئینجا لادەبراو دادەنرایەوە پاشان ڕووی کردە بن سێبەری دارێك، وتراوە: ئەو دارە (ڕەشەدار)بووە و (ابن هرير)لە (ابن مسعود)[١٣٤] ەوە دەگێڕێتەوە کەئەو دارەی هەڵبژاردووە تاکو لەبن سێبەرەکەیدا

---

[١٣٢] (اهل الکتاب)دەڵێن: کچەکان حەوت کچ بوون، بەلاّم ئەوە هەڵەیەکی دیارەو خوای گەورە بە (جووت) ناوی کچەکانی بردوە، واتا دووکچ بوون .

[١٣٣] صحیح الیه: رواه ابن ابي حاتم (١٦٨٢٧)

[١٣٤] ضعیف الیه: رواە ابن جریر (١١ / ٢٠ / ٥٨ )

پشوویەك بدات، چونكە درەختێكی گەڵاسەوز بوەو لەوكاتەدا دەشنایەوە، (ابن عباس)[١٣٥] دەفەرموێت: موسا (علیة السلام) لە (میصر)ەوە بەپێ ڕۆیشتبوو بۆ مەدیەن بەزگی برسی، ئەوەی خواردبووی تەنها پاقلەی كاڵ و گەڵای دارەكان بو، پێشی پەتی بوو، چونكە نەعلەكانیشی لەكاركەوتبوون،زگی لەبرسانا بەپشتیەوە لكابوو،گەدەی سەوزایی پاقلەی تێدا دەبینرا، پەرۆش بوو بۆ دەنكە خورمایەك، (عطاء كوڕی سائب)[١٣٦] دەفەرموێت: كچەكان گوێیان لەقسەكەی موسا بوو كە فەرمووی ﴿رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾ . كەكچەكان گوێیان لەوقسەیەی موسا بوو (علیة السلام) بەخێرایی هەواڵەكەیان بردەوە بۆ باوكیان،ئەویش یەكیانی نارد بەشوێنی دا و بانگی كرد، كچەكەش زۆر بەشەرم و ئەدەبەوە چووە پێشەوە لە موسا (علیة السلام) و زۆر بەڕاشكاوی پێی گوت: باوكم بانگت دەكات تاكو پاداشتی ئەو چاكەیەت بداتەوە – یان كرێی ئەو چاكەیەت بداتەوە – كە لەگەڵ ئێمەدا كردت و ئاوت بۆ دابینكردین، وتراوە: كچەكە زۆر بەئاشكرا لەیەكەم قسەیدا بەموسای ڕاگەیاند كەبۆچی بانگیدەكات، تاكو دەرفەت بۆهیچ گومانێك نەمێنێ، (موسا) (علیة السلام) هاتە لای باوكی دووكچەكە بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە، كەچۆن و لەسەر چی لەدەست فرعون لەمیصرەوە ڕایكردوە، پیاوە پیرەكەش دڵنەوایی كردو پێی گوت: مەترسە تازە تۆرزگارت بوو لەو گەلە ستەمكارە و لەسنووری دەسەڵاتی ئەوان و وڵاتی ئەواندا نەماویت .

زانایان و مێژوونووسان ڕاوبۆچوونی جیاوازیان هەیە دەربارەی ئەو پیاوە پیرە، هەندێكیان فەرمویانە: ئەوپیاوە (شوعەیب)ی پێغەمبەر بووە(علیة السلام) ئەم بۆچوونەش لەهەموویان زیاتر باوە، ئەوانەی دەقی فەرمودەی پێغەمبەریشیان ﷺ لەو بارەیەوە هێناوە، ئەمانەن: (حسن البصری)، (مالك كوڕی ئەنەس)[١٣٧] ، بەڵام ئیسنادی فەرموودەكە جێگەی سەرنج و هەڵوێستەیە، هەندێكی تر فەرموویانە كە (شوعەیب) (علیة السلام) تەمەنێكی دوورودرێژی بەسەربردوە پاش لەناوچوونی گەلەكەیشی. بگرە تەمەنی هێندە دوورودرێژی بەسەبردوە پاش لەناوچوونی گەلەكەیشی، بگرە تەمەنی هێندە درێژبووە كە (موسا)پێغەمبەریشی دیوە (علیة السلام) وەكچەكەی خۆیشی پێداوە، لە (ابن

---

[١٣٥] صحيح اليه: رواه ابن جرير (١١ / ٢٠ / ٥٣ )، ابن ابي حاتم (١٦٨١٠)، ابن جرير (١١/ ٢٠ / ٥٩ )

[١٣٦] صحيح اليه: ابن جرير (١١ / ٢٠ / ٥٣ )

[١٣٧] لەباسی ژیانی (شوعەیب)دا (علیه السلام) فەرمودەكەمان ساخ كردۆتەوە .

ابی حاتم)[١٣٨] ەوە وە جگە لەئەویشەوە لە (حسن البصری) دەگێڕنەوە کە ئەوپیاوە پیرەی موسای بانگ کرد (علیه السلام)ناوی شوعەیب بووە، بەڵام ئەو شوعەیبە نەبووە کە خوای گەورە ڕەوانەی کردبوو بۆسەر گەلی (مەدیەن) وەك پێغەمبەرێك بۆسەریان، هەروەها وتراوە: برازای شوعەیب، یان پیاوێك بووە ناوی (یەثرون)پیاوێکی کاهنی مەدیەن بووە، وە (ابن عباس)[١٣٩]و (ئەبو عوبیدەی کوڕی عبدالله)[١٣٠] فەرموویانە ناوی (پەترون)بووەو (ابو عبیده) فەرموشیەتی کە ئەو پیاوە برازای شوعەیب بووە، (ابن عباس)یش فەرموویەتی: شوعەیبی مەدیەن بووە .

بەکورتی: کاتێك ئەو پیاوە پیرە میوانداری (موسا)ی کرد(علیة السلام) زۆر ڕێزی نواند و بەسەرهاتەکەی خۆی بۆباس کرد، پیاوەپیرەکەش مژدەی پێدا کە ڕزگاری بووە لەدەست ئەوستەمکارانە، لەوکاتەش دا یەکێك لەکچەکان بەباوکی گوت: (یا ابت استأجره)، واتا: بابە بەکرێی بگرە بۆشوانی مەڕەکانمان، پاشان کچەکە کەوتە پیاهەڵدانی ئەم کوڕە لاوە بەتوانایەو گوتی (القوّي الأمين) واتا: کەسێکی بەهێزو ئەمینە، هەندێ لەزانایان فەرموویانە: کەکچەکە ئەو قسەو وەسفەی موسای کرد (علیه السلام)باوکیان فەرمووی: تۆ چوزانیت ئەم پیاوە بەهێزو ئەمینە ؟ کچەکەش گوتی: بەتەنها بەردی سەربیرەکەی لابرد کەبەدەکەس نەبێت لانابرێت، هەروەها کە منت نارد بەدوایدا پێشی کەوتم، بەڵام ئەو گوتی: نا لەدوامەوە بڕۆ، کە ڕێگاکەم هەڵەکرد، بەردوچکەیەك فڕێدەرە پێشمەوە تێدەگەم و دەچمەوە سەر ڕێگا ڕاستەکە،ئەوازانایانەی بەو جۆرە مانای ئایەتی (قويّ أمين)یان لێك داوەتەوە ئەمانەن:

(عمر)[١٣١]و (ابن عباس)[١٣٢]و (شریح القاضي)[١٣٣]و (ابو مالك)[١٣٤]و (قتادة)[١٣٥]و (محمدی کوڕی ئیسحاق)[١٣٦]، کەلەزیاتر لەیەك کەسەوە گێڕاویانەتەوە .

---

١٣٨ صحيح: ابن ابي حاتم (١٨٣٣)، ابن جرير (١١ / ٢٠ /٦٢ )

١٢٩ حسن اليه: رواه ابن جرير (١١ / ٢٠ / ٦٢ )

١٣٠ صحيح اليه: رواه ابن جرير (١١ / ٢٠ / ٦٢ )

١٣١ صحيح اليه: رواه ابن ابي حاتم (١٦٨٤٣)

١٣٢ حسن لطرقه: رواه ابن جرير (١١ / ٢٠ / ٦٣ )

١٣٣ ضعيف اليه: رواه ابن جرير (١١ / ٢٠ / ٦٤ )

١٣٤ روي ابن ابي حاتم بسند صحيح (١٦٨٤٨ )

١٣٥ صحيح اليه: ابن جرير (١١ / ٢٠ / ٦٤ )

١٣٦ ضعيف اليه: ابن جرير (١١ /٢٠ / ٦٤ )

(ابن مسعود)[١٣٧] دەفەرموێت: سێ کەس زۆر بیرتیژبوون، ئەوپیاوە پاشایەی کەبەژنەکەی خۆی گوت دەربارەی یوسف (علیة السلام) (اکرمي مثواه)، ئەوکچەی بەموسای گوت (علیه السلام)(یا أبت أستأجره ان خیر من أستأجرت القويّ الأمین)، وە ئەبوبکری صدیق کە (عومەری کوڕی خەتاب)ی کردەکردە جێ نشین و میری موسڵمانان . پیاوە پیرەکە فەرمووی: ﴿قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ ....... . قَالَ ذَلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا الْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَانَ عَلَيَّ وَاللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾ (القصص٢٧–٢٨)، هەندێ لەوانەی کەلەسەر پەیڕەوی حەنەفین ئەم ئایەتەیان کردوە بەبەڵگە کە مرۆڤ دەتوانێت کەرەسەی خۆی، یان بەندە بەردەستەکانی خۆی بفرۆشێت، دیارە ئەمەش جێگەی شی کردنەوەیە، چونکە قسەی پیاوە پیرەکە تەنها بۆ ئەوەبو کە (موسا) (علیة السلام) ڕازی بکات تاکولەلای بمێنێتەوە نەك پەیمانێکی مۆرکراوی نێوانیان بووبێت . [١٣٨] هەروەها کردویانە بەبەڵگە کە دەکرێت مرۆڤ بەکرێ بگیرێت بەنانەزگی، بۆئەم مەبەستەش پەنایان بردۆتە بە ئەوفەرمودەیەی کەلە (ابن ماجە)ەوە گێڕدراوەتەوە[١٣٩] کەدەیباتەوەسەر (عەلی کوڕی رباح) کەدەڵێت گوێم لێ بوو (عەتبەی کوڕی نودەر)گوتی: لەخزمەتی پێغەمبەری خوادابوین(ﷺ) دەستی کرد بەخوێندنی ئەو سورەتەی کەبە (طسم) دەست پێ دەکات، تاکو گەیشتە سەربەسەرهاتی (موسا) (علیه السلام)لەو سورەتەدا، ئینجا فەرمووی: (موسا (علیة السلام) بەکرێ بۆماوەی هەشت خۆراك بۆگەدەی))، فەرموومکە لەوڕێگەیەوە ڕاست نیە، بەڵام لەڕێگەیەکی ترەوە هەمانە کە فەرموودەیەکی ڕاست و دروستە و هاو واتای هەمان فەرموودەی پێشووە . [١٤٠]

خوای گەورە دەقی گفتوگۆکەی ئەو دوانەی بەم جۆرە هێناوەو دەفەرموێت ﴿قَالَ ذَلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا الْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَانَ عَلَيَّ وَاللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ﴾ (القصص– ٢٨) گوتی بائەوقسانە لەنێوان من و تۆدا بێت و لەنێوانمان دەرنەچێت، باهەرکام لەم دووگفتەمان بردەسەر ئەوا هیچ دژایەتیەکی من مەکە، خوای گەورە ئاگادارە بەسەر ئەو قسانەوە کەدەیکەین . (موسی) (علیة السلام) بەحەزرەتی گوت: کاربەو جۆرە بێت کە خۆت فەرموت،

---

[١٣٧] صحیح الیە، لەباسی (یوسف)پێغەمبەردا (علیه السلام) ساخ کراوەتەوە.

[١٣٨] هەروەکو لەکوردەواریدا دەگوترێت: ئەگەر تۆببی بەکوڕی ئێمە ئەوا ژنیشت بۆ دەهێنین، یان کچەکەی خۆمانت دەدەینێ، ئەوەش قسەیە، نەك پەیمان و مەرج .

[١٣٩] ضعیف: ابن ماجة (٢٤٤٤)

[١٤٠] ضعیف: ابن ابي حاتم (١٦٨٥٦) .

جا هەرکام لەم دووکاتەمان بردەسەر (هەشت ساڵ، یان دەساڵ)ئەوە مافی منەو دژایەتیم مەکە، واتا بەپێچەوانەوە مەجوڵێرەوە و خوای گەورەش ئاگاداری قسەو باسەکانی هەردولامانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (موسا) (علیه السلام)هەردوو ماوەکەی بڕی و تەواوی کرد، واتا لەهەشت ساڵەکە، کەماوەی یەکەم بوو تێپەڕی بۆ دەساڵەکە، کەماوەی دووەمەو زۆر تر بینیویانە . ئەوەبوو ڕێك کەوتن لەسەر ئەوەی کەهەشت یان دەساڵ شوانی بۆ بکات ئەو قسەیەش لەنێوانیان دەرنەچێت، ئەوسا دەیکاتە زاوای خۆی.

(بوخاری)[141] دەفەرموێت: کەسەعیدی کوڕی جوبەیر فەرموی: پیاوێکی یەهودی کەخەڵکی (حیرە)بوو، پرسیاری لیّ کردم کە ئایا موسا (علیه السلام)کام لەدووکاتەکەی تەواو کرد – هەشت ساڵ یان دەساڵ – ؟ منیش گوتم: نازانم، تاکو چووم بۆلای (ابن عباس) وە لەئەو پرسیارم بۆکرد، ئەویش فەرمووی: کاتە زۆرەکەیان و باشەکەیانی تەواو کرد، چونکە پێغەمبەری خوا ئەگەر شتێکی فەرموو بەکردەوەش دەیباتەسەر .

لەگێڕانەوەیەکی تردا لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوەکە پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرمووی: (پرسیارم لەجبریل کرد (علیه السلام)ئاخۆ موسا (علیه السلام) کام لەدوو کاتەکەی بردەسەر ؟ فەرمووی: تەواوەکەیان و پڕەکەیان) ئەم فەرمودەیە (البزار)[142]و (سونەید)[143] هێناویانە، دووەمیان دەیباتەوە سەر (مجاهد) کەلەوبارەیەوە پێغەمبەرمان (ﷺ) پرسیاری لەجبرئیل (علیه السلام)کرد، (جبرئیل)یش پرسیاری لە (ئیسرافیل)کرد (علیه السلام)ئەویش لەپەروەردگاری پرسی، خوای گەورەش فەرمووی: باش و تەواوەکەیانی تەواو کرد . بەهەمان شێوە (ابن ابی حاتم)[144] هێناویەتی لەگەڵ (ابن جریر)[145] لەلایەکی تریشەوە (البزار)و (ابن ابی حاتم)[146] فەرمودەیەکیان هێناوە کەدەچێتەوە سەر (ابا ذر) کەدەفەرموێت: پرسیارکرا لە پێغەمبەر (ﷺ) (موسا) کام لەدوو ماوەکەی بردەسەر ؟ فەرمووی چاك و تەواوەکەیانی بردەسەر، پاشان فەرمووی: ئەگەر پرسیاریشیان لیّ کردیت: کام لەدووکچەکەی خواست ؟ لەوەلامدا بڵێ: بچکۆلەکەیان .

[141] صحیح: البجاري (٢٦٨٤)، ابن جریر (١١ / ٢٠ / ٦٨ )؛ ابن ابی حاتم (١٦٨٦٥)

[142] كشف الأستار (٢٢٤٥)

[143] منكر: رواه ابن ابي جرير (١١ / ٢٠ / ٦٨ )

[144] مرسل: ابن ابي حاتم (١٦٨٦٦) .

[145] مرسل: رواه ابن جرير (١١ / ٢٠ / ٦٨ ).

[146] ابن ابي حاتم (١٦٨٦٤)، البزار (٢٢٤٤)

دیسان (البزار) و (ابن ابی حاتم)[١٤٧] فەرمودەیەکیان لەعەتەبەی کوڕی نودەرەوەی هێناوە کەهاوشێوە، یان هاو واتای ئەو فەرمودانەی پێشووە .

جاکاتێك موسا (علیه السلام)ماوەی خۆی تەواو کرد لەشوانکارەیی، ئینجا بەژنەکەی خۆی گوت: بەڵکو بەباوکت بڵێیت کەهەندێ مەڕی پێ بدات تاکو ژیان و گوزەرانی خۆیانی پێ دابین بکەن، باوکیشی ئەومەڕانەی پێدان کە قاڵب ڕەنگن و لەوساڵەدا لەدایك بوون، موساش (علیه السلام)دارێك یان گۆچانێکی هێناو، ئەوبەشەی خۆیانی جیاکردەوەو بردنی بۆسەر حەوزو ئاوێك، گۆچانەکەی لەوبەری حەوزەکە دانا، مەڕەکانی ئاودا، خۆیشی لەکەنارحەوزەکەمایەوە، هیچ مەڕێك نەبوو کەبێتە دەرەوەو یەکێکی تری لەگەڵدا نەبێت، هەموویان دوانەیان بوو، یەك دوودانەیان نەبێت لەو ساڵەدا، هەمووشیان تەواو بون، کوێر و شەل و لاوازو ناتەواویان تێدا نەبوو، پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێت: (ئەگەر شام بگرن ئەوا شوێنەوار و پاشماوەی ئەو مەڕومالآتەی ئەو دەبینن کە (سامرّیە)یە) ئەم فەرموودەیەش جێگەی سەرنج و تێرامانە وەکو لای (ابن جریر)[١٤٨] فەرموودەیەکی (موقوف)ەو فەرمودەیەکی هاو واتای ئەو دەباتەوە سەر (ابن مالك)کە دەفەرموێت: کاتێك (موسا) (علیه السلام)ماوەکەی خۆی لەشوانکارەیی تەواو کرد، خەزوری پێی گوت :هەر بەچکەیەك لەڕەنگی خۆی لەدایك بووەوە ئەوا بۆتۆیە، ئەویش چاوی وردکردەوە، گوشی ڕایەڵ کردبوو بەسەر ئاوەکەدا، بۆجیاکردنەوەیان کاتێك ژنەکەی گوشەکانی بینی، سەرسام بوو، بەناویاندا گەڕا، تەماشای کرد هەموویان بەچکەی بەڵەکیان بوە، جگە لەیەك دانەیان نەبێ، ئیتر ئەوساڵە هەموو بەچکەکان بۆخۆیان بوون، ئەم فەرموودەیەش ئیسنادی تۆکمەو تەواوە، خوای گەورە زاناترە .

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا قَضَى مُوسَى الْأَجَلَ وَسَارَ بِأَهْلِهِ آنَسَ مِنْ جَانِبِ الطُّورِ نَاراً قَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَاراً لَعَلِّي آتِيكُمْ مِنْهَا بِخَبَرٍ أَوْ جَذْوَةٍ مِنَ النَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُون ...... وَاضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ الرَّهْبِ فَذَانِكَ بُرْهَانَانِ مِنْ رَبِّكَ إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَإِهِ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْماً فَاسِقِينَ﴾ (القصص- ٢٩ – ٣٢)، پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە (موسا) (علیه السلام)لەو دووماوەیەی بڕیار بوو، باش و زۆرەکەیانی تەواو کرد، ئەوەش بەپێی ئەم ئایەتە ﴿فَلَمَّا قَضَى مُوسَى الْأَجَلَ﴾ (مجاهد) پێی وایە کە موسا (علیه السلام)لەسەرەتادا دەساڵی تەواو کردو پاشان دەساڵی تریشی درێژە

---

[١٤٧] ضعیف: البزار، کشف الأستار (٢٢٤٦)، ابن ابي حاتم (١٦٨٦٧)

[١٤٨] پیاوانی بەمتمانەن: رواه ابن جریر (١١ / ٢٠ / ٦٩ )

**پێدا، بەپێی ئەو فەرمودەیەی کە هێناویەتی (وسارَ بأهله)** [149]**. لای زۆربەی زانایانی تەفسیر ئەو ئایەتە مانای ئەوەی هەیەکە (موسا)پێغەمبەر (علیه السلام) بیری کەس و کاری خۆی دەکرد کەلەمیصر بوون، بۆیەلای خەزووری مۆڵەتی خواست تابچێتەوەناویان، بەڵام دیارە ئەم جارەیان گەڕانەوەکەی جیاوازترە وەك لەهاتنی، وتراوە: کاتێك ئامادەبوون تاکو بەرەو (میصر) بڕۆنە شەوێکی زۆر ساردوسەرمابوو، شەوێکی زۆر تاریك بوو، (موسا) (علیه السلام)خۆی و ژنەکەی و دوو منداڵ بوون، مەڕومالاتێکی زۆریشیان پێ بوو، شارەزای ڕێگەنەبوون، بەهۆی سەرماوتەپوتوشی یەوە ئەستێ و بەردەکەی (یان چەرخەکەی)ئیشی نەدەکرد و بێ ئاگربوون، تاکو لەم تەنگانەیەدا (موسا) (علیه السلام)ئاگرێکی لەدورەوە بەدی کرد لەبناری کێوی (طور)بەلای ڕاستی دا ﴿قَالَ لِأَهْلِهِ امْكُثُوا إِنِّي آنَسْتُ نَاراً﴾ بەخێزانەکەی فەرموو: ئێوە لێرە بمێننەوە، من ئاگرێك بەدی دەکەم، وادیارە ئەو ئاگرە تەنها (موسا) (علیه السلام)بینیویەتی، نەك هەموو ئەندامانی خێزانەکەی، چونکە لەڕاستی دا ئەوە (نور)ێکی خوایی بوو، نەك ئاگری ئاسایی، دیارە هەموو کەسێك نوری خوایی نابینێ، خوای گەورە زاناترە، ﴿لَعَلِّي آتِيكُمْ مِنْهَا بِخَبَرٍ﴾ واتا: سا بەڵکو بەهۆی ئەو ئاگرەوە هەواڵێکی ڕێبەر دەریم دەست بکەوێت ﴿أَوْ جَذْوَةٍ مِنَ النَّارِ لَعَلَّكُمْ تَصْطَلُونَ﴾ یان بەڵکو چلۆسکێ لەو ئاگرەتان بۆبێنم و تۆزێ گەرممان بکاتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شەوەکە تاریك و سارد بووە، هەروەها خوای گەورە جارێکی تر لە سورەتی (طه) ئایەتی (٩،١٠)، وە سورەتی (النمل) ئایەتی (٧)دا باسی هەمان ئەو بارەی موسای کردووە (علیه السلام)﴿فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِيَ مِنْ شَاطِئِ الْوَادِ الْأَيْمَنِ فِي الْبُقْعَةِ الْمُبَارَكَةِ مِنَ الشَّجَرَةِ أَنْ يَا مُوسَى إِنِّي أَنَا اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾(القصص/٣٠)، کاتێك موسا (علیه السلام)بەرەو ڕووناکییەکە هات لەکەناری ڕاستی لادۆڵەکەوە بانگ کرا، لەخاکێکی پیرۆز و پەنادارێکەوە پێی وترا ئەی موسا من پەروەردگاری هەموو جیهانیانم، وە لە سورەتی (النمل)ئایەتی/٨-٩دادیسانەوە باسی هەمان ڕووداو کراوەتەوە،خوای گەورە دەفەرموێت:﴿فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِيَ يَا مُوسَى إِنِّي أَنَا رَبُّكَ فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ إِنَّكَ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى . وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَتَرْدَى﴾ (سورەتی طـه) ئایەتی (١١-١٦).**

**زیاتر لەیەك کەس لە زانایانی تەفسیر فەرموویانە: کاتێك موسا (علیه السلام)ئەو ئاگرەی بەدی کرد، وابینی کە لەدارێکی سەوزەوە هەڵدایسێ و تا گڕەکە زیاتر بوایە، دارەکەش**

[149] صحيح اليه: رواه ابن ابي حاتم (١٦٨٦٩) .

سەورزتر دەینواند، وتراوە درەختەکە لە جۆری (عوسج)بووە، بۆیە موسا پێغەمبەر (علیه السلام)بەسەرسامی لەبەر دارەکە دانیشت، کە لەبناری کێوەکە دابوو بەلای خۆراوادا لەلای ڕاستیەوە، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَا إِلَى مُوسَى الْأَمْرَ وَمَا كُنتَ مِنَ الشَّاهِدِينَ﴾ (القصص:٤٤)، واتە ئەی محمد تۆ لەلای خۆراوایەوە نەبویت، کاتێك فەرمانی خۆمان بەموسا ڕاگەیاند و پێمان سپارد، وە بگرە تۆ هەر لە بینەرانی ئەو ڕووداوەش نەبویت (موسا) (علیه السلام)لەو کاتەدا گەیشتبووە دۆڵێك کە ناسرابوو بە دۆڵی (طوی)، (موسا) (علیه السلام)بە ئاڕاستەی ڕووەو (قبلە) وەستابوو، درەختەکەش لەلای ڕاستیەوە بوو، بە ڕووکاری خۆراوادا، لەم کاتەدابوو کە پەروەردگار بانگی لێکرد و سەرەتاش فەرمانی پێکرد کە نەعلەکانی لەپێی دابنێت، وەك ڕێزلێنانێك بۆ ئەو شوێنە و پیرۆز ڕاگرتنی بەتایبەتیش لەو شوێنە پیرۆزەدا .

(أهل الكتاب) پێیان وایە کە (موسا) (علیه السلام)لەو کاتەدا دەستی نابووە سەر چاوەکانی بۆ خۆڕاگیر کردنی لە بەرانبەر ئەو تیشکە ڕووناکیە توندەی کە بەرەوڕووی هات، نەبادا چاوەکانی کوێر ببێت، لەم کاتەدابوو کە خوای گەورە پێی فەموو: ﴿إني انا الله رب العالين﴾ یان ﴿إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلاةَ لِذِكْرِي﴾ (طه:١٤)، واتا: من ئەو خوایەم کە جگە لەمن هیچ کەسێك نیە پەروەردگاری جیهانیان بێت و هەموو کار و فەرمانێك بە ویستی خۆمەو تۆش من بپەرستە و نوێژم بۆبکە و یادم بکە .

لەپاشان خوای گەورە بە (موسا)ی ڕاگەیاند (علیه السلام)کە ئەم دنیایە شایانی برانەوەیە و جیهانەکەی دوایی ماڵی سزا و پاداشتە، لەو دنیایەش دا ﴿لِتُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا تَسْعَى﴾، واتا ئەو ڕۆژ و جیهانەی تر دێتە پێش کە لەویٚ هەموو کەسێ پاداشتی کاروباری خۆی وەردەگرێتەوە، بەچاك یان بەخراپ، پاشان خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَا مُوسَى﴾ (طه:١٧)، واتا: ئەی موسا ئەوە چیە بەدەستەوەیە ؟ دیارە خوای گەورە زۆر چاك دەزانێت کە ئەوە چییە بەدەستیەوە، بەڵام دەیەوێت لە ڕوانگەی ڕەواندنەوەی ترسەکەیەوە دڵنیای بکات کە خوای گەورەیە کە دەیبینێ و هەرچیشی بوێت دەیکات، ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: ﴿قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّأُ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَى غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَآرِبُ أُخْرَى﴾ (طه:١٨) .

(أهل الكتاب) دەڵێن: موسا(علیه السلام)داوای لەخوای گەورە کرد کە بەڵگە و نیشانەیەکی تایبەتی پێبدات تاکو خەڵکی میصر بڕوای پێبکەن کە موسا (علیه السلام)پێغەمبەری خوایە

و جادوگەر نیە، خوای گەورە فەرمووی: ئەوە چییە بەدەستت فرێی بدەرە سەرزەوی ﴿فَأَلْقَاهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَى﴾ واتا: فرێدا بوو بەمارێك كە بەرورووی دەهاتەوە، (موسا) (علیة السلام)ترسا و ڕایکرد، خوای گەورە فەرمانی کرد کە دەستی بۆ درێژ بکات و کلکی بگرێت، پێوەی نادات و زیانی پێناگەیەنێت، بەڵکو دەچێتەوە سەر شێوەی خۆی، واتا: دەبێتەوە بە داردەستەیەکی پێشوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَلْقِ عَصَاكَ فَلَمَّا رَآهَا تَهْتَزُّ كَأَنَّهَا جَانٌّ وَلَّى مُدْبِراً وَلَمْ يُعَقِّبْ﴾ (القصص/٣١)، واتا: داردەستەکە، یان گۆچانەکەی دەستی موسا (علیه السلام)بوو بەمارێك بگرە مارێکی زۆر گەورە، کە شەویلاگەکانی بەیەکدا دەدایەوە و زۆر خێراش دەجولاً، وەك خێرایی جنوکەکان دەهەژا و فیشکەی دەهات، موسا کەبینی (ولى مدبرا)، پشتی تێکرد ڕایکرد، (ولم يعقب) لای نەکردەوە، هەروەکو سروشتێکی مرۆیی کەپشت دەکاتە مەترسی و ڕا دەکات، لەم کاتەدا (فناداة ربة) پەروەردگار بانگی لێکرد و فەرمووی: ﴿يَا مُوسَى أَقْبِلْ وَلَا تَخَفْ إِنَّكَ مِنَ الْآمِنِينَ﴾ (القصص:٣١)، واتا: ئەی موسی بەرەورووی وەرەوەو مەترسە، تۆ پارێزراویت، ئیتر موساش (علیه السلام)گەڕایەوە و ڕووی تێکرد، ئینجا خوای گەورە فەرمووی: ﴿قَالَ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا الْأُولَى﴾ (طـه:٢١) واتە: بیگرە و مەترسە، ئێمە دەیخەینە سەر شێوەی پێشوو، واتا: بۆت دەکەینەوە بەدار و گۆچانە ئاساییەکەی جاری جاری، گوتراوە: موسا (علیه السلام)زۆر بەترسەوە دەستی بۆدرێژ کرد، بگرە دەستی لەقۆڵی زریەکەی خۆی هەڵکێشا و ئینجا دەستی کرد بەناو دەمی مارەکەدا .

(أهل الکتاب) دەڵێن: کلکی مارەکەی گرت، ئیتر بوەوە بەدارە دووسەرەکەی جاری جاران، پاشان خوای گەورە بەڵگە و خەلاتێکی تریشی پێشکەش کرد، فەرمانی پێکرد کەدەستی خۆی بکات بەباخەڵکی خۆیدا و دەریبێنێتەوە، دەستی سپی دەنوێنی و هیچ تاریکایی و ڕەشییەکی پێوەنابیٚ، هەرکات ترس دایگرتیت وابکە و دەست لەسەر سینە و دڵت دابنیٚ ترس و بیمەکەت دەڕەوێتەوە، مەبەست لەباوەڕ و ئیمانی دامەزراوی ناو دڵە، وەکو خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا لە سورەتی (القصص)دا ئایەتی/٣٢، وە (النمل) ئایەتی/١٢دا باسی فەرمووە، بەڵی دەستیکرد بە گیرفان و باخەڵی خۆیدا و کاتێك دەریهێنایەوە وەکو مانگ دەدرەوشایەوە و سپی دەینواند و شەوقی دەدایەوە، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَذَانِكَ بُرْهَانَانِ مِنْ رَبِّكَ إِلَى فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْماً فَاسِقِينَ﴾ (القصص:٣٢)، واتا: ئەم دووشتە (مارەکە و دەست) دوو بەڵگە و موعجیزەی گەورن

لەلایەن پەروەردگارەوە بەتۆ دراون بۆئەوەی بەو بەڵگانەوە بچیتە لای فرعون و دارودەستەکەی و گەلەکەی بۆئەوەی باوەڕ بهێنن، چونکە گەلێکی خراپکار و دووڕوون، جگە لەمەش حەوت بەڵگەی تریشی پێدەدەین و ئەوسا دەبێتە خاوەنی نۆ بەڵگە و نیشانە و موعجیزەی تەواو، وەکو لەم سورەت و ئایەتانەدا خوای گەورە ئاماژەی پێداوە و دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ فَاسْأَلْ بَنِي إِسْرَائِيلَ إِذْ جَاءَهُمْ فَقَالَ لَهُ فِرْعَوْنُ إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَا مُوسَى مَسْحُوراً قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا أَنْزَلَ هَؤُلاءِ إِلَّا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ بَصَائِرَ وَإِنِّي لَأَظُنُّكَ يَا فِرْعَوْنُ مَثْبُوراً﴾ (الاسراء:١٠١-١٠٢)، هەروەها لە سورەتی (الاعراف)دا ئایەتی (١٣٠-١٣٣) دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَا آلَ فِرْعَوْنَ بِالسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ آيَاتٍ مُفَصَّلاتٍ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْماً مُجْرِمِينَ﴾ کە دواتر بەووردی باسی دەکەین.

مەبەست لەوەیە کە خوای گەورە فەرمانی کرد بەموسا (عليه السلام)کە بچێت بۆلای فرعون، موساش (عليه السلام)فەرمووی: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلْتُ مِنْهُمْ نَفْساً فَأَخَافُ أَنْ يَقْتُلُونِ *قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجْعَلُ لَكُمَا سُلْطَاناً فَلا يَصِلُونَ إِلَيْكُمَا بِآيَاتِنَا أَنْتُمَا وَمَنِ اتَّبَعَكُمَا الْغَالِبُونَ﴾ (القصص:٣٣-٣٥)، پەروەردگارا خۆی چاکتر دەزانیت کە من پیاوێکم لەئەوان، واتە: لە قبطیەکان کوشتووە دەترسم بمکوژنەوە، خوایە گیان داوات لێدەکەم کە هاڕوونی برایشم (عليه السلام)بکەیت بەهاوکارو پشتیوان و وەزیرم و لەگەڵمابێت بۆلای فرعون، چونکە ئەو زمانی لەمن ڕەوان ترە، خوای گەورەش داواکەی قبوڵ کرد و فەرمووی: ﴿قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ﴾ (القصص:٣٥)، واتا پشتت ئەستور دەکەین بە براکەت، تاکو هاوکاریت بکات، بەڵگەی باشترت دەدەینێ دڵنیابە کە ئەوان واتە: (فرعون و دارودەستەکەی) (فلا يصلون اليكما) دەستیان پێتان ناگات، بەهۆی پاراستنی ئێمە بۆتان و پێدانی بەڵگەی تەواومان بە ئێوە هەرگیز ئەوان ناتوانن زیان تان پێبگەیەنن، دیتان خوای گەورە لە سورەتی (طه)دا دەفەرموێت: ﴿اذْهَبْ إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى .... . يَفْقَهُوا قَوْلِي﴾ (طه:٢٤-٢٨)، وتراوە کاتی خۆی کە موسا (عليه السلام)بە منداڵی لەبەردەستی ئاسیا و لەماڵی فرعون دا بوو، فرعون ویستی توانای ژیری موسا (عليه السلام)تاقیبکاتەوە، کاتێك موسا (عليه السلام)منداڵ بوو ڕیشی فرعونی گرت، فرعەونیش دەیویست منالەکە بکوژێ، (ئاسیا) گوتی: ئەوە منداڵە و عەقڵی بەشت ناشکێ، حەزدەکەیت وەرە عەقڵیشی تاقیبکەرەوە دەنکە خورمایەك و پشکۆیەکی لەبەردەم دابنێ و ئاخۆ ئەزانێت لەیەکیان جیابکاتەوە، لێرەدا فرعون بەفێڵ دەستی پێبردە پشکۆکە و بردی بۆسەر زمانی منداڵەکە واتا: (موسا)(عليه السلام)، بەمەش

زمانی (موسا) سووتا(علیه السلام)، بەو هۆیەشەوە (موسا) (علیه السلام)زمانی (پسك)بوو، بەئاسانی قسەی بۆنەدەکرا، هەرچەندە مرۆڤ لێی تێدەگەیشت، بەلاّم بەتەواوەتی نا (حسن البصری) دەلێت: پێغەمبەر (علیه السلام)بەقەدەر پێویست داوای شت لەخوای گەورە دەکەن، (موسا)ش (علیه السلام)زمانی بەشینەوەی بەبەرەوە مابوو کە لەقسەکانی تێبگەین، بۆیە داوای لەخوای گەورە نەکرد بۆی چاك بکات، بەلاّم ڕیسوایی بۆ فرعەونە کە توانی پێغەمبەرێکی گەورە لەمندالّیدا عەیب دار بکات، ﴿يَكَادُ يُبِينُ﴾ (الزخرف:٥٢)، واتا: هێشتا موسا (علیه السلام)دەیتوانی قسەوباسەکانی ڕوون بکاتەوەو مەبەستی ناخی دلّی بەخەلّکی ڕابگەیەنێت .

پاشان موسا (علیه السلام)فەرمووی: ﴿وَاجْعَلْ لِي وَزِيراً مِنْ أَهْلِي ... قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَا مُوسَى﴾ (طه:٢٩-٣٦)، واتا: کەسێك بکە بە وەزیر و هاوکارم لەکەسەکانم، هاوڕونی برایشم وا لێبکە کە پشتم بگرێت بیکە هاوبەشی کارەکەم، تاکو پێکەوە زۆر تەسبیحاتی تۆ بکەین، وە زۆر یادت بکەین خۆ تۆ خۆت بینای بە ئێمە، خوای گەورە فەرمووی: ئەی موسا هەچیت داواکرد بۆمان هێنایتەدی، دیارە ئەمانەش مانای ئەوەیە کە موسا لەلای خوای گەورە قەدەر و شان و شکۆیەکی تایبەتی هەیە، بەتایبەتیش کە داوای لەخوای گەورە کرد کە وەحی بنێرێت بۆ هاڕونی برایشی(علیه السلام)، وە خوای گەورە ئەو داوایەشی بۆ هێنایەدی، هەلّبەت ئەوەش لەوەوەیە کە لەلای خوای گەورە خاوەن شکۆ بوە، وەکو لە قورئاندا خوای گەورە باسی ئەو شکۆداریەی دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَكَانَ عِنْدَ اللَّهِ وَجِيهاً﴾ (الأحزاب:٦٩) .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ مِنْ رَحْمَتِنَا أَخَاهُ هَارُونَ نَبِيّاً﴾ (مريم:٥٣)، واتا: لە ڕەحمەتی خۆمان بەشی براکەی موساشمان دا کە هاڕونی پێغەمبەرە(علیه السلام)، (عائشە) ڕۆژێکیان گوێی لە پیاوێك بوو کەکاتێك لە کۆمەلّی کەسی سەر ڕێگەی حەجی دەپرسی: ئەو کەسە کێبوو، کە براکەی خۆی لەخۆی پێباشتربوو، کاروباری خۆی بە ئەو سپارد ؟ خەلّکەکە وەلاّمیان پێنەبوو، (عائشە) بە کەساکانی دەوری کەژاوەکەی خۆی گوت: ئەوە موسای کوڕی عمران بوو (علیه السلام)کە تکایە لەخوای گەورە کرد کە وەحی بنێرێت بۆ هاڕوونی برای(علیه السلام)، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ مِنْ رَحْمَتِنَا أَخَاهُ هَارُونَ نَبِيّاً﴾ (مريم:٥٣) .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ نَادَى رَبُّكَ مُوسَى ....وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾ (الشعراء:١٠-١٩)، واتا: (ئەی محمد پەروەردگاری تۆ بانگی موسای کرد، کە بڕوات بۆلای گەلە ستەمکارەکەی فرعون تا پێیان بڵێ: ئایا خۆتان لەخراپە ناپارێزن ؟ موسا گوتی: پەروەردگارا دەترسم بەدرۆم بکەنەوە و منیش بەرگەی نەگرم و سینەم تەسك بێت و زمانیشم زۆر پاراو نیە، بەڵکو وەحی بفەرمووی بۆ هارونی برام، ئەوان هەقیان بەسەر منەوە هەیە، دەترسم لەجیاتی پیاوەکەی خۆیان (کە کاتی خۆی کوشتم) بمکوژنەوە، خوای گەورە فەرمووی: نا . . تۆ و براکەت بڕۆن بەخۆتان و بەڵگەکانی ئێمەوە ئێمەش لەگەڵتانین، گوێمان لێتانە، هەردووکتان بچنە لای فرعون و پێی بڵێن: ئێمە هەردووکمان ڕەوانەکراوی پەروەردگاری جیهانیانین، بەڵکو بەنی ئیسرائیلییەکان ئازاد بکەیت و لەگەڵماندا بیان نێریت تاکو بڕۆین لەهەر شوێنێ بمانەوێت لەوێ خواپەرستی خۆمان بکەین، فرعون گوتی: ئەدی تۆ ئەو منداڵە ساوایە نەبوویت کە لەناو ماڵی ئێمەدا گەورە کرایت و چەند ساڵێکی تەمەنت لای ئێمە بەسەر برد، وە ئەوەشت کرد کەخۆت دەزانیت چیت کردووە، واتا: (پیاوێکت کوشت) ئەتۆ کەسێکی بەدنمەکیت!.

بە کورتی هەردووکیان چوونە لای فرعون و پێیان ڕاگەیاند کە ئەمانە ڕەوانەکراوی خوای گەورەن، تاکو خەڵکی لەبت پەرستی لادەن و بیانخەنە سەر ڕێی خواپەرستی، یان بەلایەنی کەمەوە دیل و دەست بەدەست بەسەرەکانی (بنی ئیسرائیل) ئازاد بکات و ڕێگەیان پێبدات کە ئازادانە خوای تەنها و تاك بپەرستن ! بەڵام فرعون لووتیکرد خۆی بەگەورە زانی . . فیزی نواند و بەگاڵتە پێکردن و سووکایەتی پێکردنەوە بە موسای گوت: ئەدی تۆ ئەو منداڵە بووی کە ئێمە لەماڵی خۆمان و بە نان و ئاوو بەرگی خۆمان بەخێومان کردیت، کەچی ئەمڕۆ ئەو هەموو چاکەشمان لەگەڵ کردیت و واش پیاوێکت لێکوشتین و ڕاتکرد، ئێستا هاتوویت ئامۆژکارمان دەکەیت تاکو بێینەسەر ئاینی تۆو خوای تۆ بپەرستین، ئەرێ جارێ وەرە پێمان بڵێ: پەروەردگاری جیهانیان کێیە ؟ موساش (علیه السلام)فەرمووی: ﴿قَالَ فَعَلْتُهَا إِذاً وَأَنَا مِنَ الضَّالِّينَ﴾، واتا: ڕاستە من ئەو کارانەم کرد و ئەو پیاوەشم کوشت، بەڵام ئەوسا گومرابووم و خوای گەورە پەیامی بۆ نەناردبووم، ئەو وەڵامەی فرعون بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە فرعون هەر ئەو فرعەونە بووە کەکاتی خۆی (موسا) (علیه السلام)لەدەستی ڕایکرد و لەترلسانا سەری خۆی هەڵگرت، نەك وەك

(أهل الكتاب) دەڵێن: گوایە ئەو فرعەونەیان لەو ماوەیەدا مردووە کە موسا (علیه السلام)لە (مەدین) بووە و ئەمەیان فەرعەونێکی ترە .

(موسا) (علیه السلام)دان بەو تاوانەی خۆی و ڕاکردنەکەیشی دادەنێت و قورئانی پیرۆز لەسەر زمانی (موسا) (علیه السلام)دەفەرموێت: ﴿فَفَرَرْتُ مِنكُمْ لَمَّا خِفْتُكُمْ فَوَهَبَ لِي رَبِّي حُكْماً وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾، واتا: لەدەستی ئێوە ڕامکرد، کە لێتان ترسام بمکوژنەوە، بەڵام پاشان خوای گەورە حوکمی بۆناردم و کردمی بەیەکێك لە پێغەمبەران، ئینجا فەرمووی: ﴿وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ ئەی فرعون: ئەو چاکەیەی تۆ دەیکەیت بەمنەت بەسەر منەوە کە من تاقە یەك کەسم لە (بنی اسرائیل)یەکان، کەچی لەلایەکی ترەوە هەموو نەوەی (بنی اسرائیل)ت کردوەتە کۆیلە و ژێر دەستی خۆت و بە ئارەزووی خۆت کاری گرانیان پێدەکەیت و ئازاریان دەدەت .

فرعون وازی لەو قسەیە هێناو چووە سەر کرۆکی باسە سەرەکییەکە و گوتی: ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ الْعَالَمِينَ ...... قَالَ رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ﴾ (الشعراء:٢٣-٢٨)، ئەم ئایەتەش نموونەو برگەیەکە لەو گفتوگۆیەی لەنێوان فرعون و موسادا(علیه السلام)ڕوویداوە، کە پڕە لەبەڵگەی تەواو دەربارەی تەنها پەروەردگاری میهرەبان، بەڵام فرعون خەڵکەکەی کۆکردەوە و بانگی لێکردن و پێی گوتن: منم خوای هەرەگەورەی ئێوە ﴿فَحَشَرَ فَنادَى. فَقَالَ أَنا رَبُّكُمُ الْأَعْلَى﴾ (النازعات:٢٣-٢٤) دووبارە فرعون ڕوویکردە گەورە پیاوانی وولاتەکەی و مەجلیسی خەڵکەکە و گوتی: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرِي﴾(القصص:٣٨)، واتا: ئەمن جگە لەخۆم کەسێکی تر شك نابەم کە پەروەردگاری ئێوەبێ، لێرەدا فرعون زۆر چاك دەزانێت کەخوای گەورە بەدیهێنەر و پەروەردگاری هەموو شتێکە، بەڵام بەئەنقەست نکوڵی دەکات دیارە خەڵکەکەیشی وا ترساندووە کە نەوێرن ڕەخنەی لێبگرن، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْماً وَعُلُوّاً فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ﴾ (النمل:١٤)، هەربۆیە فرعون بەکەللە ڕەقی و گاڵتەجاریەوە گوتی: ﴿وَمَا رب العَالَمِين﴾ پەروەردگاری بونەوەریان کێیە؟ چونکە ئەوان واتا: موسا و هارون(علیه السلام)پێشترفەرموویان:﴿أنا رَسُول رَب العالَمين﴾،موساش(علیه السلام) فەرمووی: ﴿قَالَ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِنْ كُنتُمْ مُوقِنِينَ﴾ (الشعراء:٢٤)، واتا: پەروەردگارمان پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و نێوان ئەوانیشە ئەگەر دەتانەوێ بەتەواوەتی لە باوەڕداران بن، واتا: پەروەردگاری هەموو شتێکە لەئاسمانەکان و زەوی و

هەورو باوباران و ئاژەڵ و ڕووەکو هەموو شتێك ، کەچی فرعون بەو کەسانەی دەوروبەری خۆی گوت: ﴿قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُ أَلا تَسْتَمِعُونَ﴾،﴿رَبُّكُمْ وَرَبُّ آبَائِكُمُ الْأَوَّلِينَ﴾خۆ گوێتان لێبوو چۆن موسا گوتی خوای من خوای باوك و باپیرە بەرابیەکانی ئێوەیشە.

دیارە بەبێ بەدیهێنەر هیچ شتێك بەدی نایات، سەرنجام هەموو کەسێك هەر دەزانێت کە ئەوە شتێکی هەق و ڕاستە، وەك خوای گەورە لەسورەتی (فصلت) ئایەتی/٥٣دا ئاماژەی بەوە کردووە .

فرعون سووربوو لەسەر کەللەڕەقی و نکوڵی خۆی، حەزرەتی موساش هەر بە ڕێگەی ژیری بەڵگەی بۆدەهێنایەوە، بەلأم کەم جار دەسەلأت و باوەڕ بەخوابون پێکەوە لەمرۆڤدا کۆدەبنەوە، مەگەر کەسێك زۆر لە خواترس بێت، بۆیە فرعون بەخەڵکەکەی گوت:، یاخود بە (بنی اسرائیل)یەکانی گوت: ئەو کەسەی بە پێغەمبەر بۆتان ڕەوانە کراوە شێتە، بەلأم موسا (علیه السلام)هەرسوور بوو لەسەر هێنانەوەی بەڵگەی گەردوونی و سروشتی دەربارەی دەسەلأتی پەروەردگار، هەروەکو لەسورەتی (الشعراء) ئایەتی (٢٧-٢٨)دا خوای گەورە باسی فەرمووە .

دیارە پاش گفتوگۆ فرعون بەڵگەی پێنامێنێ و دەمکوت دەبێت، بۆیە وەکو سروشتی هەموو بێبڕوایەکی دەسەلأتدار پەنادەباتە بەر ڕێگەی بەکارهێنانی هێزو زەبرو زەنگ و هەڕەشە و ترساندن، هەرکات مرۆڤێکی دەسەلأتداری بێبڕوا لەڕووی عەقڵییەوە بەڵگەی پێنەما و مایە پووت بوو ئەوسا پەنا دەباتە بەر هێزو هەڕەشە.

لێرەدا فرعون نەك هەر بڕوای بە (موسا) (علیه السلام)نەکرد، نەك هەر ئازادیشی نەکرد لەوەدا کە چ خوایەك بپەرستێت، بەڵکو هەڕەشەی ئەوەی لێکرد کە دەبێت موسا خۆیشی جگە لەفرعون کەسی تر بە پەروەردگاری خۆی نەزانێ، خۆ ئەگەر بەقسەی فرعون نەکات و لابدات ئەوا دەیخاتە زیندانەوە، موسا (علیه السلام)ئینجا فەرمووی: ئەی دەتەوێت بەڵگەیەکی ئاشکرا و تایبەتیش بەرچاو بخەم ؟ فرعون گوتی: بەڵێ چیت هەیە بیهێنە! ئەگەر ڕاست دەکەیت، موساش گۆچانەکەی یان داردەستەکەی هەڵداو بوو بەمارێکی ئاشکرا، دەستی لەبن باخەڵی دەرهێنا، کە دەستی وەکو مانگ شەوقیدایەوە بینەران دەیانبینی .

ئەوەش لەم ئایەتەدا خوای گەورە باسی دەکات و دەفەرموێت: ﴿قَالَ لَئِنِ اتَّخَذْتَ إِلَهاً غَيْرِي .... وَنَزَعَ يَدَهُ فَإِذَا هِيَ بَيْضَاءُ لِلنَّاظِرِينَ﴾ (الشعراء:٢٩-٣٣)، دیارە ئەو جۆرە بەڵگانە

لەسەرو عەقڵ و توانای ئاسایی مرۆڤەوەن ئەوەش بەجۆرێك کاریگەر بووە کەگوتراوە: خودی فرعون ترسێکی زۆری لێنیشت و لەرزگرتی، بەڕادەیەك تووشی سك چوونێکی وایکرد و ڕۆژانە زیاتر لەچل جار دەچووە سەر ئاودەست، کەوا باو بووە کە فرعون پێشتر و لەباری ئاسایی جاری جارانیدا بە چل ڕۆژ جارێك دەچووە سەر ئاودەست، کەواتە بارە تەندروستییەکەی بەتەواوەتی پێچەوانە بوەوە .

ئینجا دەستی لەباخەڵی دەرهێنا کەوەکو مانگ دەدرەوشایەوە، پاشان دەستی خستەوە باخەڵی و دەریهێنایەوە، دەستی وەکو جاری جاران ئاسایی بوەوە، لەگەڵ ئەم هەموو سەراسا و موعجیزە گەورانەشدا ئەو توێژە درێژخایەن و بەڵگەدارە هێشتا فرعون هەر سووربوو لەسەر ئینکاری کردنەکەی خۆی، بگرە ئەم جارەیان گوتی: ئەوانەی موسا (علیه السلام)دەیکات فێڵ و جادوگەرییە و هات جادوگەرەکانی سنوری دەسەلأتی دەوڵەتەکەی خۆی هەموویانی کۆکردەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی موسا (علیه السلام)کەدوایی بەدرێژی باسی دەکەین بەپشتیوانی خوای گەورە .

خوای گەورە باسی چاکەکانی خۆی دەکات بەسەر موساوە (علیه السلام)لەم ئایەتە بەرزانەدا کە دەفەرموێت: ﴿فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِي أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَى قَدَرٍ يَا مُوسَى ....... أَسْمَعُ وَأَرَى﴾ (طه:٤٠-٤٦)، واتەکە بەکورتی ئەمەیە کە شەوەکە لەسەر کێوی (طور) پێی فەرموو: خوای گەورە پێغەمبەرایەتی بەتۆ بەخشی پاراستمانیت تاکو گەیشتیتە مەدیەن، چەند ساڵێك لەناو ئەو خەڵکەدا مایتەوە، ئەوەش ویستی ئێمەی لەسەر بووە، کردمیت بەهاوگفتی خۆم و قسەم لەگەڵدا کردیت، تۆو براکەت بەبەڵگەو ناشانەکانی منەوە بڕۆن لەیادی من دامەبڕێن، بڕۆنە لای فرعون ئەو پێی لەبەرە تێپەڕاندوە، بەجووت پێی بڵێن: بەلأم بەنەرمی بەڵکو بەخۆیدا بچێتەوەو بیرێك بکاتەوە و لەخوای خۆی بترسێ و دەست بەرداری ستەمکاری ببێت، گوتیان پەروەردگارا دەترسین بەسەرماندا هەڵ بشاخێت و ستەم لەئێمەش بکات و دەست درێژیمان بکاتەسەر، خوای گەورە فەرمووی: مەترسن من لەگەڵتاندام، واتا: پێشوازیتان لێدەکەم، دەبیستم و دەبینم کەئێوەو ئەو چ دەڵێن و چیدەکەن . سەرنج بدە،، خوای گەورە لەجیاتی یەك پێغەمبەر دوودانە ڕەوانە دەکات و دەیانێرێت بۆلای بێبڕوایەکی کەللەڕەق و ئینکار و ستەمکار، خوا خۆی گەورە پێشتر دەزانێت کەفرعون باوەڕ ناهێنێ، بەلأم هێشتا دوو پێغەمبەر ڕەوانەی لای ئەو دەکات و پێشیان فەرمان دەکات کە نابێ توڕەبن، بەڵکو دەبێ بەنەرمی لەگەڵیا بدوێن و بەڵگە

بخەنە پێش چاو، هەروەکو چۆن خوای گەورە بە پێغەمبەری خۆمان دەفەرموێت: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ﴾ (النحل:١٢٥)، واتا بنگەوازی خەڵکی بکە بۆسەر ڕێگە ڕاستی پەروەردگارەکەت بەشێواز و ڕێگەی پڕ لەحیکمەت و ئامۆژگاری ئەو تۆ کە لەباشترین شێوەدابێ، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ﴾(العنكبوت:٤٦) .

(حسن البصري) دەفەرموێت: (فقولا له قولاً ليناً)، واتە: بەنەمی پێی بڵێن: کە ئەی فرعون تۆش پەروەردگارێکت هەیە، ڕۆژێك دێت دەگەڕێیتەوە لای ئەو بەهەشت و دۆزەخیش لەبەر دەستتدایە و ئازادیت بە کردەوەی دنیات کامیان هەڵبژێریت .

بەڵام (وهب کوڕی منبە)[١٥٠] دەفەرموێت، واتا: من لێبوردن و لێخۆشبوونم لێوە نزیکترە تاکو تۆڕەبوون و سزادان، (يزيد الرقاشي)[١٥١] لەئاستی مانای ئەم ئایەتەدا و لەو ڕوانگەیەوە دەڵێت: ئەی ئەو کەسەی خۆشەویستی بۆ کەسێك دەردەبڕێ کەدژایەتیت دەکات، ئاخۆ چۆن بێت بۆ ئەو کەسەی ڕووی تێکردوویت و تکات لێدەکات ﴿فَقُولا لَهُ قَوْلاً لَيِّناً لَعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى.....إِنَّا قَدْ أُوحِيَ إِلَيْنَا أَنَّ الْعَذَابَ عَلَى مَنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى﴾ (طه:٤٧-٤٨)، واتا: هەردووکتان بچنە لای فرعون پێی بڵێن، ئێمە ڕەوانەکراوین لەلای خوای گەورەوە تاکو (بني اسرائيل)یەکان ئازاد بکەین لەژێر زیندانی دەسەڵاتی خۆت و بائازادبن لەخوا پەرستیدا و خۆ ئێمە دوو بەڵگەی گەورەشمان لەلایەن پەروەردگارەوە بۆهێناویت واتە: دارەکە کە دەبێت بەمار و شەوقی دەستی موسا، لەکۆتاییشدا سڵاو لەسەر ئەو کەسەی ڕێی ڕێنومایی گرتوەتە بەر .

بەڵام دواتر بەم ئایەتە ترسانیان و پێیان گوت:﴿إِنَّا قَدْ أُوحِيَ إِلَيْنَا أَنَّ الْعَذَابَ عَلَى مَنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى﴾، واتا ئێمە لەلایەن خواوە پێمان ڕاگەیەنراوە کەئازار و سزای خوایی بۆ ئەو کەسەیە کە درۆ دەکات و پشت هەڵدەکات لە بەرنامەی خوایی بەگفتار بێ یان بەکردار یان بەهەر دووبارەکەدا(السدي)[١٥٢] و هەندێکی تر فەرموویانە: کاتێك موسا (عليه السلام) گەیشتە (میصر) کە لە (مەدیەن)ەوە هاتبوو، چوو بۆ ماڵی دایکی، کە (هارون)ی برایشی

---

[١٥٠] التفسير (١٣٤٤٤)، بەڵام (اسناد)ی نیە هەروەها بۆ ژمار (٤) بڕوانە (١٣٤٤٥) .

[١٥١] لم اقف علية .

[١٥٢] لم اقف علية .

لەگەڵ دایکیدا دەژیا، کاتەکە دەمەو خەوتنان بوو، چێشتی (طفشیل)یان[153] دەخوارد، لەگەڵیاندا نانی خوارد، پاشان گوتی: هاڕونی برام خوای گەورە فەرمانی بەمن، هەروەها بە تۆش کردووە کەبانگەوازی فرعون بکەین بۆ خواپەرستی، تۆش فەرموو لەگەڵمدا بابڕۆین بۆلای بەرەو دەرگای پاشایەتی فرعون بەڕێکەوت، بەلاّم دەرگاکە داخرابوو، (موسا) (علیه السلام)بەدەرکەوان و پاسەوانانی فەرموو: ئەوە پێغەمبەری خوایە لەدەرگا دەدات، کەچی ئەوان گاڵتەیان پێکرد .

هەندێ کەس فەرموویانە: هەتا ماوەیەکی زۆر دەرگایان لێنەکردەوە، (محمد کوڕی ئیسحاق) دەفەرموێت: پاش دوو ساڵ چاوەڕوانی ئینجا دەرگاکەیان لێکردەوە، چونکە کەس لەخۆی ڕانەدەبینی مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەیان بدات خوای گەورە زاناترە، هەتا موسا (علیه السلام)بەدارەدەستەکەی یان بە گۆچانەکەی لە دەرگاکەیدا و فرعون هەراسان بوو، فەرمانی کرد کە ئەوانە بێنە ژوورەوە کە لەدەرگا دەدەن، هەردووکیان لەبەردەمی فرعون ڕاوەستان و بانگەوازی خوایان پێڕاگەیاند وەکو خوای گەورە ڕایسپاردبوون (اهل الکتاب) دەڵێن: خوای گەورە بە موسای فەرموو (علیه السلام)هارونی لاوی واتە (هارون کە دەچێتەوە سەر لاوی کوڕی یەعقوب) بەرەوڕووت دێت گەورە پیاوانی (بنی اسرائیل)ی لەگەڵدایە و بڕۆن بۆلای فرعون و ئەوەی پێتان گوتراوە لەخواوە بەئەوی ڕابگەیەنن، موسا (علیه السلام)گوتی: دەبێت بگوشم بۆچی براکەم ئەو خەڵگەی گەلەکەم بەرێت بۆ تکای لای فرعون لەکاتێکدا بەڵگە و نیشانەی واسەرسوڕهێنم لەخواوە پێدراوە کەکەس بەڵگەی وای لەخاکی (میصر)دا بەخۆیەوە نەدیوە، خوای گەورەش وەحی کرد بۆ هاڕون کە بەرەو براکەی بڕوات، تاکو لە ووشکایی و لەنزیك کێوی (حورب) پێی بگاتەوە، کاتێك پێیگەیشت، موسا (علیه السلام)ئەوەی کەخوای گەورە پێی سپاردبوو بە هاڕونی برای گەیاند (علیه السلام)جا کەگەیشتنە (میصر) پیاو ماقوڵانی شارو ناودارانی (بنی اسرائیل)یان کۆکردەوەو هەموویان پێکەوە چوون بۆلای فرعون، جا کاتێك کەپەیامی خوایان پێڕاگەیاند، فرعون گوتی: ئەو (الله)یە کامەیە کەئێوە باسیدەکەن ؟ من ئەو خوایە ناناسم و (بنی اسرائیل)یش هیچی بۆ ڕەوانە نەکراوە . خوای گەورەش ئەو دیمەنە لەقورئاندا بۆ پێغەمبەرمان محمد( ﷺ) دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت:

---

[153] (طفشیل) واتە :

﴿قَالَ فَمَنْ رَبُّكُمَا يَامُوسَى .... مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى﴾ (طه:٤٩-٥٥)، لەواتای ئەو ئایەتەدا بۆمان دەردەکەوێت کە فرعون نکوڵی لەدەسەلاّتی پەروەردگار کردووە، بۆیە بە موسا و هارون دەڵێت: (فمن ربکما) پەروەردگاری ئێوە کییە؟ موساش (علیە السلام)فەرمووی: ﴿قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى﴾ واتە: پەروەردگار ئێمە ئەو پەروەردگارەیە کە هەموو شتێکی بەدیهێناوە و پاشان هۆکارەکانی بەدیهێنان و بەردەوام بوونەکەی پێبەخشیوە، وەکو ئەوەی ئەو ڕاستیەی تێبگەیەنێت کەهەموو شتێك تەسبیحات و یادی خوا دەکات، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى﴾(الأعلى:١-٣) گوتی:﴿قَالَ فَمَا بَالُ الْقُرُونِ الْأُولَى ؟﴾ ئەی موسا ئەگەر ڕاست دەکەیت ئەدی بۆچی باووباپیرانمان و پێشینەکان هاوەڵیان بۆ ئەو خوایە داناوە ؟ وەشتی تریان پەرستووە ؟ موسا (علیە السلام)فەرمووی: ئەوەیان پەروەردگارم دەزانێت وهەموو شتێکی لە (لوح المحفوظ)دا یاداشت کردووەو هەرگیز پەروەردگاری من شتی لێوون نابێ و هیچی لەبیرناچێ، واتە قسەکەی تۆ ئەی فرعون هیچ بایەخێکی نیە، چونکە ئەوانیش واتە (ئەو پێشینانەی بت پەرست بوون) هەروەکو کەللەڕەق و نەزان و نکوڵکارکاربوون، بگرە خوای گەورە خۆی پێشتر لە (زەبور)دا ئەوانەی بۆ ڕوون کردونەتەوە و پێی ڕاگەیاندن و کە زۆر و کەم لە کردەوەو گفتار بەچاك و خراپەوە لای خوا ون نابێ، ئینجا موسا (علیە السلام)باسی ئەوە دەکات کەچۆن خوای گەورە زەوی بۆکردووین بەبێشکە و هەموو پێویستییەکی ژیانی بۆ مسۆگەر کردووین بۆ خۆمان و مەڕومالآتەکانمان و ڕووەك و ئاژەڵەکانمان، ئەمانەش بەڵگە و نیشانەی ئاشکران بۆ ئەو کەسانەی کەخاوەنی ژیریەکی تەواون، هەروەکو خوای گەورە لەئایەتی ژمارە (٢١-٢٢)ی سورەتی البقرە)دا دیسانەوە باسی ئەو گونجانە گەورەی هەسارەی زەوی دەکات کەچۆن ڕاگیراوەو ئاسمانی بەسەرەوە چاسپ کراوەو بەروبومیشی لەزەوی بۆ دەرهێناوین، دەبێت ئێمەش ئەو پەروەردگارە بناسین و هاوەڵی بۆدانەنێین ئەگەر خاوەنی ژیری تەواوبین .

دواتر موسا (علیە السلام)باس لەوەدەکات کەخوای گەورە لەم زەوییە ئێمەی دروست کردووەو هەر دەمانکاتەوە بەو خاکە و پاشان هەر لەم خاکەشەوە سەرلەنوێ دەرماندەهێنێتەوە هەروەکو چۆن یەکەم جار دروستی کردووین ئاوهاش دروستمان دەکاتەوە، وەك لەسورەتی (الاعراف)دا ئایەتی (٢٩)دا ئاماژەی بەوە کردووە، لەگەڵ

ئایەتی (٢٧)ی سورەتی (الروم) گفتوگۆی نێوان موسا و هارونی برای لەگەڵ فرعوندا درێژەی کێشا، بەڵام فرعون هەر سووربوو لەسەر بێباوەڕی، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَرَيْنَاهُ آيَاتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَى .... وَأَنْ يُحْشَرَ النَّاسُ ضُحىً﴾ (طه:٥٦-٥٩)، لەم ئایەتەدا خوای گەورە باسی سەرکەشی فرعون دەکات لەگەڵ ئەو نەفامییەی کەتیایدا بووە، وێڕای کەمی عەقڵی لەبەڵگە لاوازەکانیدا بۆ بەدرۆخستنەوەی موساو براکەی(علیە السلام)، فرعون لوت بەرزبوو، بۆیە سەرەنجام بەموسای گوت: ئەمانەی تۆ دەیکەیت هەرهەموویان جادویە، ئێمەش دەتوانین بەهەمان جادوو ڕووبەڕووت ببینەوە، بۆیە بەموسای گوت: ئەگەر ئازایت کاتێك دیاریبکە بۆئەوەی جادوگەرانی ئێمە لەگەڵ ئێوەی جادوگەردا ڕووبەڕوو دانیشن هەریەکەیان جادووی خۆیان بکەن، دیارە موساش (علیە السلام)ئەوەی لەخوا دەویست، کەخەڵك کۆبکرێتەوەو بەڵگەو نیشانەکانی موسا کەخوای گەورە پێیداوە خەڵکەکە بەئاشکرا ببینن، بۆیە موسا (علیە السلام)هات ڕۆژێکی هەڵبژارد کەلەلای خەڵکەکە زۆر گرنگ بوو، ئەویش ڕۆژی جەژنیان بوو کە بەڕۆژی خۆجوان کردن (یوم الزینە) ناسرابوو، واباوبووە خەڵکی لەو ڕۆژەدا خۆیان دەڕازاندەوەو دەهاتنە دەرەوەو کاروباریان نەدەکرد، موسا (علیە السلام)فەرمووی: باڕۆژی خۆجوانکردنەکە دابنێین لەکاتی چێشتەنگا، چونکە ئەو کاتە تاریکایی شەو نەماوەو دەرفەتی فێڵ و چاوبەست نیە، لەو کاتەدا دنیا ڕووناکە، هەق و ناهەق بەئاشکرا دەردەکەون، دیارە موسا (علیە السلام)دڵنیابوو کەخوای گەورە ئاینی خۆی سەردەخات و لوتی قبطیە بێبڕواکان دەشکێنێ ﴿فَتَوَلَّى فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُ ثُمَّ أَتَى ... وَقَدْ أَفْلَحَ الْيَوْمَ مَنِ اسْتَعْلَى﴾(طه:٦٠-٦٤)، لەم ئایەتە پیرۆزانەدا خوای گەورە باسی ئەوە دەکات کەفرعون کەوتە خۆی و هەرچی جادوگەری گەورەی وولاتەکەیبوو کۆی کردنەوە، کە لەو سەردەمەدا . جادوگەری زۆر باوی هەبوو، کەسانی زۆر شارەزا هەبوون، ژمارەی جادوگەرەکان زۆربوو، (محمدی کوڕی کەعب)[١٥٤] دەفەرموێت: جادوگەرەکان ژمارەیان هەشتا هەزار کەس بوو، (القاسم)[١٥٥] دەفەرموێت: حەفتا هەزار کەس بوون، بەڵام (السدی)[١٥٦] دەفەرموێت:

---

[١٥٤] ضعیف إلیه: رواه ابن ابي حاتم (٨٧٩٦)

[١٥٥] صحیح إلیه: رواه وابن جریر (١٨٤/١٦/٩) .

[١٥٦] ضعیف إلیه: رواه وابن جریر (١٨٥/١٦/٩) .

(بضع)ێك و سی هەزار كەس بوون، (ابی امامە)[157]دەفەرموێت: نۆزدە هەزار كەس بوون، (محمدی كوڕی ئیسحاق)[158] دەفەرموێت: یازدە هەزار بوون، (كعب الاحبار)[159] دەڵێت: دوازدە هەزار بوون .

(ابن ابی حاتم) لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێنەوە كە حەفتا كەس بوون [160]، بەڵام لە گێڕانەوەیەكی تردا هێناویەتی كە چل هەرزەكار یان منداڵی (بنر اسرائیل) بە فەرمانی فرعون ڕەوانەكران بۆلای جادوگەرەكان تاكو فێربن چۆن جادوگەری بكەن، بۆیە گوتیان: ﴿وَمَا أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ السِّحْرِ وَاللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَى﴾(طە:٧٣)، ئەمەش دیسان مایەی تێڕامان و وردبوونەوەیە .

فرعون خۆی بانگهێشتی بۆ خەڵكەكە ڕاگەیاند كە هەموویان بێن و بەشداری دیتنی ئەو كارە بكەن كە تیایدا دووجۆر جادوگەر (بەبۆچوونی ئەو) توانای خۆیان دەخەنە ڕوو، خەڵكەكەش كۆمەڵ كۆمەڵ دەهاتنە دەرەوە لەماڵەكانیان و بەرەو ئەو شوێنە دیاریكراوە دەچوون و دەیانگوت: ﴿لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ السَّحَرَةَ إِنْ كَانُوا هُمُ الْغَالِبِينَ﴾، واتا: بەڵكو پشتگیری لەجادوگەرەكانمان بكەین ئەگەر ئەوان سەركەوتووبوون، موساش (عليه السلام) هاتنە ناو جادوگەرەكانەوەو پێی ڕاگەیاندن كەئەمە بەهرە و موعجیزەیەكی خواییە جادوگەری نیە، لەبەرئەوە خۆتان لەسزای خوایی بپارێزن و قسە بەناوی خواوە هەڵمەبەستن دەربارەی ئەوەی كەگوایە كاری پێغەمبەرەكەی واتا(موسا)(عليه السلام) جادوگەرییە، وە فەرمووی: ﴿قَالَ لَهُمْ مُوسَى وَيْلَكُمْ لا تَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ كَذِباً .... فَتَنَازَعُوا أَمْرَهُمْ بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا النَّجْوَى﴾ (طە:٦١-٦٢)، واتا داماوخۆن و بەوەیلاچن بەدەم خواوە درۆ هەڵمەبەستن، ئەگینا خوای گەورە گیرۆدەی سزاتان دەكات و دیارە ئەو كەسەش تیاچوو پەشیمانە كەدرۆ بەناوی خواوە هەڵبەستێ .

سەرەنجام دووبەرەكی كەوتە نێوانیانەوە، لەمانای ئەم ئایەتەدا وتراوە: خەڵكەكە بوون بەدوو بەشەوە، یاخود جادووگەرەكان بوون بە دوو بەشەوە، بەشێكیان پێشەكی بڕوایان بەموسا (عليه السلام)كرد كە ئەوەی ئەو موعجیزەیە و جادوو نیە، بەڵام هەندێكیان

---

[157] حسن إليه: رواه وابن جرير (٩/١٦/١٨٥)، ابن ابي حاتم (٨٨٠٠) .

[158] حسن إليه: رواه ابن ابي حاتم (٨٧٩٧)، وابن جرير (٦/٩/١٩) .

[159] اسناده لاباس به، رواه ابن ابي حاتم (١٣٤٧٩)

[160] ضعيف: رواه ابن ابي حاتم (١٣٤٨٢)

سووربوون لەسەر قسەی خۆیان و فرعوعەونەکەیان و دەیانگوت جادووە، خوای گەورە زاناترە.

ناحەزەکان کەوتە مقۆمقۆو چرپەچری نێوان خۆیان و لەناو خەڵکەکەدا گاڵەیان نایەوە کەگوایە هارون و موسا دەیانەوێ بەجادووگەری خۆیان خەڵکەکە لەسەر خاکی خۆیان وەدەرنێن، هەروەکو خوای گەورە دیمەنی قسەوباسی ئەوان ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێت: ﴿قَالُوا إِنْ هَذَانِ لَسَاحِرَانِ يُرِيدَانِ أَنْ يُخْرِجَاكُمْ......... فَأَجْمِعُوا كَيْدَكُمْ ثُمَّ ائْتُوا صَفّاً وَقَدْ أَفْلَحَ الْيَوْمَ مَنِ اسْتَعْلَى﴾ (طـه:٦٤)، واتا: ئێوەش فێڵ و جادویی خۆتان بەباشی ئامادە بکەن دژ بەموسا و هارون، هەمووتان یەك ڕیز بن، چونکە ئەمڕۆ ڕۆژی یەکلایی کردنەوەیە و کێ سەربکەوێت ئەوە براوەیە، پێکەوە هاوڕیزبن، چونکە فرعەون پەیمانی پێتان داوە، بەڵام سەرەنجام دەرکەوت کە فێڵ و جادوگەری هەرچەندە گرنگ و بەتوانا بن هەرگیز بە موعجزەیان پێناکرێت و دەبێت داماو و دەستەوسان بوەستن لەئاستیدا.

﴿قَالُوا يَامُوسَى إِمَّا أَنْ تُلْقِيَ ......... وَلا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى﴾(طـه:٦٥-٦٩)، واتا: جادوگورەکان گوتیان یان تۆ جادوکەی خۆت بکە یان لەسەرەتادا ئێمە جادووی خۆمان هەڵدەدەین، موسا (عليه السلام)فەرمووی: ناء جارێ ئێوە هی خۆتان هەڵبدەن، کاتێك گوش و پارچە کورسیەکانیان فرێدایە سەرزەوی، وادەهاتنە بەرچاو کەبوون بەماری گەورە . گەورەو هووشەیان دەهات، موسا لەناخی خۆیدا ترسا لەوەی کە سەرکەوتوو نەبێت، چونکە تا ئەو کاتەش خوای گەورە هیچی پێڕانەگەیاندبوو، خوای گەورە دەفەرموێت: بەموسامان گوت: مەترسە و دوودڵ مەبە، تۆ سەرکەوتوویت، ئەوەی بەدەستی ڕاستەوەیە فڕێی بدە، هەرچی ئەوان کردوویانە دەیماشێتەوە، چونکە کاری ئەوان جادوگەری و فێڵەو جاودوگەریش والێدەکەین کەخۆشی نەزانێت لەکوێوە هاتووە !

وتراوە کەجیوەو ئامێری تریان تێکردبوون تاکو لەبەرچاوی خەڵکەکە هەڵباوسێن و گەورە دیاربوون ئەوان کە شتەکانی خۆیان نمایش کرد وتیان: ﴿وَقَالُوا بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ الْغَالِبُونَ﴾ (الشعراء:٤٤)، واتا بەسەروەری و ناوی فرعەونەوە دەست بەکارەکەمان دەکەین و ئێمەش سەرکەوتوودەبین، بەڵام کەموسا (عليه السلام)دارەکەی دەستی فڕێدا، فەرمووی: ﴿فَ وَلَمَّا جِئْتُمْ بِهِ السِّحْرُ إِنَّ اللَّهَ سَيُبْطِلُهُ وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُونَ﴾(يونس:٨١-٨٢)، واتا: ئەوەی ئێوە جادووەو خوای گەورەش بەتاڵیان دەکاتەوە، خوای گەورە کاری بەدکارانی خۆشی نایە،

خوای گەورە خۆی هەق سەردەخات (بەفەرمانی خۆی) گەرچی تاوانباران سووریش بن لەسەر کارەکەیان، واتا: جادووکەیان.

﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ............ رَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ﴾ (الأعراف:١١٧-١٢٢)، واتا: وەحیمان بۆ موسا کرد کەدارە دەستەکەت فرێدە سەرزەوی، ئیتر هەموو جادوکانی ئەوان دەماشێتەوە، ئەوەبوو هەق دەرکەوت و ناهەق کە ئەوان نمایشیان کردبوو بەتاڵ بوەوە، لێرەدا جادوگەران شکان بەدەستی بەتاڵی قلْپ بوونەوە، جادووگەرەکانیش بەکڕنووشیدا کەوتن و بەئاشکرا گوتیان: بڕوامان بە پەروەردگاری جیهانیان هێنا کە پەروەردگارس موسا و هارونیشە (علیه السلام).

بەڵێ کاتێك موسا دارەکەی دەستی هەڵدایە سەرزەوی، خوای گەورە بۆی کردە مارێکی گەورەی پێدار، وەکو هەندێ لەپێشینەکان واباسیان کردووە، هەروەها مارێکی گەورە و شێوەیەکی ترسناکی ئەوتۆی هەبوو کەزۆر هەراسان بوو، خەڵکەکە لەترساندا رایانکردو فریا شوێنەکانی خۆیان نەکەوتن، مارەکەی موساش (علیه السلام)هەموو جادوەکانی ئەوانی ماشییەوەو قوتیدان بەیەك جار، خەڵکەکەش بەر لەراکردنەکەیان بۆیان دەڕوانی و تەماشایان دەکرد کەزانیان کار لەتەماشاکردندا نەماوە، ئیتر بەخێرایی کەوتنە خۆیان و ڕایانکرد.

هەرگیز شتی وایان بەخەیاڵیشدا نەهاتبوو، بەلاّم جادوگەرەکان زۆر چاك بۆیان دەرکەوت کەئەمە جادوو نیە، بگرە جادوگەری هەرگیز شتیوای تێدا نیە و ناگاتە ئەو ئاستە، بۆیە زۆر ڕاستگۆیانە دانیان بەڕاستیدا هێنا و بێسڵەمینەوەو ترسان لەفرعون، بەبێ بیرکردنەوە لەسزای فرعون زۆر ڕاشکاوانە لەبەرچاوی خەڵکەکە بەدەنگی بەرز گوتیان: ﴿قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ هَارُونَ وَمُوسَى﴾، واتا: باوەڕمان هێنا بەپەروەردگاری هارون و موسا(علیه السلام).

ئەگەر سەرنج بدەین جادووگەرەکان لەباوەڕهێنانەکەیاندا ناوی هارونیان لەپێش ناوی موساوە هێناوە، وەك ئەوەی ئاماژەبێت بۆ ساخی و دروستی موعجیزەکانیان، بەڕاددەیەك کەجیاوازی ناکەن لەنێوان هارون و موسادا (علیه السلام)گەرچی بەزۆری موسا (علیه السلام)گفتوگۆی لەگەڵ فرعون و خەڵکەکەدا دەکردو هارون وەکو پشتیوان و زمان پاراوێك وەزیریبووە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سُجَّداً ... وَذَلِكَ جَزَاءُ مَنْ تَزَكَّى﴾ (طه:٧٠-٧٦)، واتا: جادوگەرکان بەکڕنووشیدا کەوتن، وتیان بڕوامان هێنا بەپەروەردگاری هاڕون و موسا(علیه السلام)، فرعون گوتی: چۆن بڕوا دەهێنن لەکاتێکدا من مۆڵەتم پێتان نەداوە ؟ دیارە موسا ئەوکەسە سەرگەورەیەتان بووە کە هەرخۆی فێری ئەمانەی کردوون و جادووی ئاوای پێگوتون ! دەبێ دەست و قاچتان ببڕم لاوینو، پاشان لەخاچتان بدەم و بەقەد دارخورمایەکەوە هەڵتان بواسم تاکو بزانن کاممان سزای توندتر و درێژخایەنترمان هەیە، گوتیان ئەو قسانەو ئەو کارانەی تۆ بەرانبەر بەئێمە بڕیارت داوە بیانکەیت هیچ کارمان تێناکات لەو ڕووەوە کەخوای گەورە هەق و ناهەقی بۆجیا کردووینەتەوەو لەنەژادوکرۆکماندا بڕوابونمانی بەخوا داچاندوەو ئەو خوایەش ئێمەی بەدی هێناوەو توش چیت دەوێ بیکە، تازە بڕوامان بە پەروەردگاری خۆمان هێناوە تاکو لەهەڵکانمان ببورێ .و لەو شتانە ببورێ کەتۆ وات لێکردبووین ڕقمان لێیان بێتەوەو وات تێگەیاندبووین کەموسا (علیه السلام)جادوگەرە، بەڵام خۆ خوا زۆر باشترە بۆمان و دەمێنێتەوە، ڕۆژێ دێت هەرکەس بەتاوانباریەوە بێتە بەر بارەگای پەروەردگار ئەوا دەخرێتە دۆزەخێکەوە کە نەتیایدا دەمرێت و نەدەژی، هەرکەسێکیش بەباوەڕەوە بێتە لای و کردەوەی چاکەی کردبێت، ئەوا ئەو چاکەکارانە پلەو پایەی بەرزیان لای خوا هەیەو لەو بەهەشتەدا دەبن کە ئاو بەژێریاندا بەڕەوانی دەڕوات لەوێدا بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوە، ئەوەش پاداشتی ئەوانەیە کە چاکەکارن .

(سعیدی کوڕی جوبەیر)[١٦١] و (عکرمە) و (القاسم)[١٦٢] و (الاوزاعی)[١٦٣] و هەندێکی تر فەرموویانە: کاتێك کەجادوگەرەکان سەریان دانەواند بۆ کڕنووش بردن بۆ خوای گەورە لەو کاتەدا خوای گەورە کۆشك و شوێنە خۆشەکانی خۆیانی نیشاندان لەناو بەهەشتدا، کەخۆیان ئامادە کردووە بۆئەوان، ئەوانیش لەخۆشی ئەو شوێنە هۆشیان بەسەرئەوەوە نەما ئاخۆ فرعون دەڵێت چیو بەچی دەیانترسێنێ، بگرە هەر بەلاشیانەوە گرنگ نەبوو، ئاخۆ فرعون چۆن سزایان دەدات و لەناویان دەبات .

---

[١٦١] ضعيف: رواه ابن ابي حاتم (١٥٦٣٩) .

[١٦٢] تفسير ابن ابي حاتم (١٣٤٨٠) ليس له سند .

[١٦٣] رواه ابن ابي حاتم (١٣٤٨١) .

فرعون زۆر ترسا کەجادووگەرەکان باوەڕیان هێناو ئەو ڕەواجە گەورەیان بەهاڕون و موسا (عليه السلام)دا، بۆیە هەڕەشەی لێکرد کەچۆن بێپرسی ئەو لەپێش چاوی ئەو خەڵکە باوەڕیان هێنا، وە موساش بەوە تاوانبار کرد کەئەو فێری ئەو جادوگەری کردوون تاکو بەفێڵ فریوی خەڵکی بدەن و لەشار بیانکەنە دەرەوەو لەدەسەڵاتی فرعون دا نەبن، بەڵام خۆ ئەم جادوگەرانە نەموسا (عليه السلام)کۆی کردونەتەوە نەپێشتر ناسیونی، بەڵکو پیاوانی فرعون لەشارو لادێکانی ژێر دەسەڵاتی فرعون هەڵیان بژاردون و هێناویانن .

هەروەها خوای گەورە لەگەلێك سورەتی قورئانی پیرۆزدا بەجۆرەها شێوە چیرۆکی موسا و فرعون و گەلەکەی و چارەنووسی هەردوو لایەن باس دەکات، وەکو سورەت و ئایەتانە: (الاعراف) ئایەتی (١٠٣-١٢٦)، (یونس) ئایەتی (٧٥-٨٢)، (الشعراء) ئایەتی (٢٩/٥١)، هەروەها، خوای گەورە سزایەکی سەختی داناوە بۆ فرعون، جگە لەسزای لەدنیا، ئەویش ئەوەیە کەدەیخاتە دۆزەخەوەو پێی دەگوترێت: ﴿ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْكَرِيمُ﴾ (الدخان:٤٩)، واتا بچێژە لەو سزایە کە تۆ خۆت بەخاوەن تۆڵە و بەتوانا و دەسەڵات دەزانی ؟!

بەپێی ڕووکاری واتای ئایەتەکە فرعون جادوگەرەکانی سزای سەخت دا، بەڕادەیەك کەدەستی ڕاست و قاچی چەپی بڕین و پاشان بەقەدی دارخورماوە هەڵیواسین، تاکو خاڵکەکە لەو بەرزیەدا بیانبینێ، بەڵام ئەوان هەر سووربوون لەسەر باوەڕی خۆیان و داوایان لەخوا دەکرد کە خۆگری و ئارامییان پێببەخشێ و بە باوەڕداریەوە بیانمرێنێ، وەکو خوای گەورە نزاو پاڕانەوەی ئەوانی لەقورئانی پیرۆزدا هێناوەو دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْراً وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ﴾ .

(عبدالله کوڕی عباس)[١٦٤] و (عبیدی کوڕی عومەیر)[١٦٥] هێناویانە کە ئەوانە سەرلەبەیانیەکەی جادوگەربوون و دەمەو ئێوارەی هەمان ڕۆژ شەهیدبوون، کەواتە تەنها یەك ڕۆژ موسوڵمان بوون، بەڵام چۆن موسوڵمان بوونێك؟!

---

[١٦٤] ضعيف إليه: رواه عبدالرزاق (٩٦٢)، ابن ابي حاتم (٨٨١٢)، ابن جرير (٦/٩/٤) .

[١٦٥] ضعيف إليه: رواه ابن جرير (٦/٩/٤) .

# گەورە پیاوانی قبط پاش موسڵمان بوونی جادوگەرەکان

**گەورە پیاوانی قبط پاش موسڵمان بوونی جادوگەرەکان هانی فیرعەون دەدەن کە ئازاری موسا (علیە السلام) بدات:**

ئەوە ڕوویدا کە پێشتر باسمانکرد، (قبطی)یەکان بێ بەڵگەمان و دەمکوت بوون، جادوگەرەکانیش ملیان دانەواند بۆهەق و ڕاستی، باوەڕیان بەخوای تاك و تەنها هێناو موسڵمان بوون، بەڵام دەست و پێوەندی فرعون و(قبطی)یەکان هەر سووربوون لەسەر ناهەقی و بێ بڕوایی خۆیان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ الْمَلَأُ مِنْ قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَتَذَرُ مُوسَى وَقَوْمَهُ لِيُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ ....... وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي الْأَرْضِ فَيَنْظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ﴾(الأعراف ١٢٧ – ١٢٩)، لەم ئایاتانەدا خوای گەورە ئاماژە بەوەدەکات کەچۆن میرو پاشا و دەسەڵاتداران و دەست و پێوەندەکان فرعون و پیاوانی دەوروبەری هانی فرعەونیان داوە بۆئەوەی دژی هارون و موسا و باوەڕداران بوەستنەوە، کە بەپێچەوانەوە دەبوایە هانی فرعونیان بدایە بۆسەر ڕێی هەق و خواناسی، یان هیچ نەبێ بێ دەنگ وبێ لایەن بوونایە،ئەوەبوو دەستەیەك لە گەورە پیاوانی فرعون، چوونەلای فرعون و پێیان گوت: ئایا هەروا بەئاسانی وازلە موسا و گەلەکەی دەهێنی کەخراپە لەسەرزەویدا بڵاوبکەنەوە و وازلە تۆ بێنن بەخۆت و خواکانتەوە؟واتا تۆ فەرامۆش و پەراوێز بخرێیت و شتی تر بپەرسترێت ؟ فرعون گوتی: ئێمەش کوڕەکانیان دەکوژین و ژنەکانیان دەهێڵینەوە، خۆ ئێمە بەسەر ئەواندا زاڵ و بەدەسەڵاتین، موساش (علیە السلام)بەگەلەکەی خۆی گوت: پشت بەخوا ببەستن و ئارام بگرن، ئەم زەویە بۆخوایە و موڵکی ئەوە، خوای گەورەش موڵکی خۆی دەداتە دەست ئەو بەندانەی کەخۆی دەیەوێت و چارەنووسیش هەر بۆ پارێزکاران و خواناسانە، گەلەکەی گوتیان، پێشتر گەلی فرعون ئێمەیان ئازاردەداو کوڕەکانیان لەناو دەبردین، ئێستاش کەخوای گەورە تۆی ناردووە بەپێغەمبەر بۆسەر ئێمە دیسان هەر ئازارمان دەدەن، موسا (علیە السلام) فەرمووی سابەڵکو خوای گەورە دوژمنەکەتان ڕیسوابکات و لەناوی بەرێت و ئێوە بکاتە خاوەنی ئەم زەویە و بزانێت ئێوەش لەمەولا چۆن چۆنی ڕەفتار دەکەن! دیسانەوە خوای گەورە نمونەیەکی تر لەفەرموودەی موسای هێناوە کەدەفەرموێت: ﴿وَقَالَ مُوسَى يَا قَوْمِ إِنْ كُنْتُمْ آمَنْتُمْ بِاللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُسْلِمِينَ . وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ (یونس ٨٤ – ٨٦)، واتا: موسا گوتی: گەلەکەم ئەگەر ئێوە بەڕاستی باوەڕتان بەخوا هێناوە، دەئیتر پشت بەو خوایە ببەستن ئەگەر موسڵمانن،

ئەوانیش پشتیوانی خۆیان نیشانداو گوتیان . پشتمان بەخوا بەستوە، خوایە گیان ! پەروەردگارا ...! تۆش مەمانکەرە مایەی فیتنەی گەلی ستەمکاران، وە بەرەحمەتی خۆت رزگارمان بکە لەوگەلەستەمکارە .

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ . إِلَى فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَقَارُونَ فَقَالُوا سَاحِرٌ كَذَّابٌ﴾ (غافر ٢٣ — ٢٤)، واتا: (موسامان نارد بەخۆی و بەڵگە و پەیام و موعجیزەکانیەوە بۆلای فیرعەون و هامان و قارون، بەڵام هەموویان گوتیان موسا جادوگەرو ناڕاستە)، دیارە فیرعەون پاشای هەرە گەورەیان بووە، هامان وەزیری بووە، قارون پیاوێکی ئیسرائیلی زۆر زۆر دەوڵەمەندبوە، بەڵام لەسەر ئاینی فیرعەون بوە، کە بەپشتیوانی خوای گەورە دواتر بەدوورودرێژی باسی (قارون) دەکەین .

بەڵێ کاتێك پەیامی خوایی ڕەوانەکرا بۆسەر موسا (علیه السلام)و هارون تاکو بیگەیەنن بەفرعون و گەلەستەمکارەکەی، ئەوان وەریان نەگرت و دژی وەستان و دەستیان کرد بەسوکایەتی کردن بە (بنی اسرائیل)یەکان و کوشتن و لەناو بردنیان، بەتایبەتی منالی تازە لەدایك بووی کوڕ، تاکو بەروبەرەچەیان زیادنەکات و هێز پەیدا نەکەن، لەڕاستیدا (قبطی)یەکان زۆر لە (بنی اسرائیل)یەکان دەترسان، بەڵام خۆ خواست و ویستی پەروەردگار جیایە و هەرکات بیەوێت بێ دەسەڵات زاڵ دەکات بەسەر دەسەڵاتداراندا، کەسەرەنجام هەرواش بوو ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَنْ يُظْهِرَ فِي الْأَرْضِ الْفَسَادَ﴾ (غافر–٢٦)، واتە: فرعون گوتی: لێم گەڕێن بائەو موسایە بکوژم کەبانگەواز بۆ پەروەردگارەکەی دەکات، من دەترسم سەرەنجام موسا لەسەر ئەم ئاینە وەرتانبگێڕێت و لاتان بدات و یان خراپکاری لەسەر زەویدا بڵاوبکاتەوە، سەیرە فرعون گومانی وابوو کە موسا خەڵکی لەدین وەردەگێڕی و خراپە لەسەر زەویدا بڵاودەکاتەوە، لەکاتێکدا خۆی پەیتا پەیتا منالی بێتاوانی دەکوشت و ستەمی دەکردو داوای لە خەڵکی دەکرد بیپەرستن ...! ﴿وَقَالَ مُوسَى إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُمْ مِنْ كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ الْحِسَابِ﴾ (غافر – ٢٧)، موسا گوتی: من پەنا بە پەروەردگاری خۆم دەگرم کەپەروەردگاری ئێوەیشە لەهەرکەسێك بڕوای بەڕۆژی حساب و پرسینەوە نەبێ، ئەوا کەسێکی بەفیزو لوت بەرزە، وەکو فرعون .

﴿وَقَالَ رَجُلٌ مُؤْمِنٌ مِنْ آلِ فِرْعَوْنَ..................إِلَّا سَبِيلَ الرَّشَادِ﴾ (غافر:٢٧ — ٢٩)، پیاوێکی باوەڕدارەکەی خۆی ئاشکرا نەکردبوو، سەر بە قبطی‌یەکان بووە، لەدەستەی

فیرعەون، ئایا کەسێك دەکوژن کە دەڵێت: (الله)پەروەردگارمە و بەڵگەونیشانەی ئاشکرایشی بۆ هێناون لەو پەروەردگارەوە ، خۆ ئەگەر ڕاست نەکات ئەوا لەسەر خۆی دەکەوێت ، ئەگەر ڕاستگۆش بێت ئەوا ئێمە زیانمان پێ دەگات و ئەو سزایەی کەپێی ڕاگەیاندوون دێتە ڕێتان، وەخوای گەورەش ڕێنومایی کەسانی زێدەڕەوو درۆزن ناکات، گەلەکەم ! ڕاستە ئەمڕۆ موڵك و سامان و دەسەلات لەژێر دەستی ئێوەدایە و لەسەرزەویدا ئێوە دیارو ناودارن، ئەی ئەگەر لەناکاو خوای گەورە سزایەکی بۆ ناردین کێ فریامان دەکەوێت و ڕزگارمان دەکات ؟ فرعون گوتی: ئەوەی من دەیبینم هەرئەوەیە کەئێوەش دەیبینن، من چی بڵێم هەر ئەوەیە، جگە لەمنیش کەس نیە کە ڕێنوماییتان بکات بۆ ڕێگەیەکی باش.

وتراوە :ئەو پیاوەی کەژێر بەژێر باوەڕدار بوەو هەتا کاتی بڕیارەکەی فرعون بۆ کوشتنی موسا (علیه السلام)بڕوای خۆی ئاشکرانەکردوە، ئامۆزای فرعون بوە، ترساوەکە موسا بکوژێت و خوای گەورەش قین و خەشمی خۆی بە قبطیەکان بڕێژی، یان لەدواڕۆژدا خوای گەورە سزایان بدات و بەبێ بڕوایی بمرن،هەندێکی تروتویانە، ئەو پیاوە ئیسرائیلی بوەو لەوپەڕی شاردا نیشتەجێ بوە، بەلاْم ڕوکاری مانای ئایەتە کە بۆ یەکەمیان نزیکترە، (ابن عباس)[166] فەرمویەتی: لەناو (بني اسرائیل)یەکاندا تەنهایەك کەس باوەڕی بەموسا هێناو (علیه السلام) ئەویش ئەوپیاوە بوە، کەلەوسەری شارەوە هاتبوو، هەروەها ژنەکەی (فرعون)یش باوەڕداربووە . بەلاْم (الدارقطني) دەفەرموێت: کەسێك نیە کەناوی (شەمعان)بوبێت، جگەلە و پیاوە ئیسرائیلی یەی کە باوەڕی بەخوا هەبوو[167]، لەمێژووی (الطبراني)دا ئەو پیاوە ناوی (خەیر) بووە، خوای گەورە زاناترە .

ئەوپیاوە جوانترین ڕستەو گوتەی فەرموو لەبەرانبەر زاڵمترین کەسی ئەوکاتەی سەرزەوی دا کەفرعون بووە، لەوتەکانی دا هاندان و ترساندنی تێدایە، ڕوونکردنەوەی ڕاستی و بەڵگەی لۆژیکی ئاشکرایە بەدی دەکرێت، بەڵگەیە لەسەر قسەی ڕاست و دروست، کەتەنها موسڵمان دەتوانێت ئەو جۆرە قسە پڕ لەداد پەروەریانە دەربڕێت، کەبەوپەڕی ئەدەبەوە لەڕووی دەربڕینی ڕای خۆی و ڕاوێژەوە پرسی پێ کراوەو ئەویش بێ سڵەمینەوە ڕاستیەکانی دەربڕیوە، لەفەرمودەی پێغەمبەری ئازیزماندا (ﷺ) هاتووە

---

[166] منقطع: رواه ابن ابي حاتم .

[167] السهیلی گێراویەتەوە .

**که دەفەرموێت ك (گەورەترین جیهاد گوتنی وتەی ڕاست و دادپەروەرانە یە لەبەردەمی پاشا – سەرکردە –یەکی ستەمکاردا)[١٦٨]، و دیارە ئەو پیاوەش بەرزترین پلەی جیهادی بۆخۆی هەڵبژاردوە، وێڕای ئەو قسەجوان و وەڵامە ڕاست و ڕاوێژە دروستەی ئەم پیاوە خواناس و داد پەروەرە هێشتا فرعون هەرسووربوو لەسەر کەللە ڕەقی و لەخۆبایی بون و لەبێ بڕوایی و خۆ پەرستی خۆی و سەرگەردانکردنی خەڵکەکەی، تەنانەت لەڕاوێژکردنیش دا تەنها بەقسەی ئەوپێڕەی دەکرد کەهەرگیز قسەو باس و نەخشەیان دژی خواستی فرعون نەبوو، ئەو تەنها ئەو ڕاوێژەی بەلاوە پەسەند بوو کە دژی موسا و هارون و باوەڕداران بێ، نەك ئەو ڕاوێژەی بۆ دۆزینەوەی ڕاستی و شوێن کەوتنی بێ، ئەمەش سروشتی هەموو ستەمکارێکی بێ باوەڕە.**

**خوای گەورە هەواڵی موسا** (علیه السلام) **لەقورئانی پیرۆزدا بۆ پیغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت:**﴿قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا أَنزَلَ هَؤُلاءِ ...جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفاً﴾**(الاسرار ١٠٢– ١٠٤).**

**هەروەها دەفەرموێت:** ﴿فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ آيَاتُنَا مُبْصِرَةً .....................كيف كان عاقبة المفسدين﴾**(النمل ١٢ – ١٤)، هەروەها لەسورەتی (الزحرف)ئایەتی (٥١ – ٥٦)، وە سورەتی (النازعات) ئایەتی (٢٠ – ٢٦) وەسورەتی (هود)ئایەتی (٩٦ – ٩٩)وەسورەتی (غافر)ئایەتی (٣٠ – ٣٥)دا باسی موسا و هارون و باوەڕداران دەکات** (ع)، **لەگەڵ هەندێ لەسیفەتەکانی فرعون و سزاو چارەنووسەکەی و ئەوسزایەی لەدنیادا چەشتی و لە دواڕۆژدا لەوە سەخت تریشی بۆ ئامادەکراوە .**

**لەسورەتی (غافر)دا خوای گەورە نمونەی وتەکانی پیاو چاکەکەی هێناوە کە ئەگەر ئەو خەڵکە باوەڕ بە موسا**(علیه السلام) **نەکەن ئەوا وەکو گەلانی تر لەوانە تووشی سزابن، هەروەکو گەلانی پێشوو لەسەردەمی نوح عادو ثەمود دا تیاچوون، خوای گەورە ستەم لەبەندەکانی خۆی ناکات، پیاو چاکەکە دەڵێت: دەترسم ئەو ڕۆژە هیچ دەروازەی ڕزگاریتان نەبێ، یاخود ڕۆژیی دوایی لەبەردەمی پەروەردگاردا، خۆ خۆتان دەزانن کە کاتی خۆی خوای گەورە (یوسف)ی نارد بۆسەر باو باپیرانی ئێوە کە (موسا)ش**(علیه السلام) **هەر لەبەروبەرەچەی ئەو یوسفەیە، ئەوسا باو باپیرانتان گومانیان لەپێغەمبەرایەتی یوسف هەبوو، کەچی ئێستاش ئەو گومانەتان هەرماوە لەبەرانبەر**

---

[١٦٨] صحیح: رواه احمد (٤ / ٣١٥ )، النسائي الكبرى (٧٨٣٤ )، ابو داود (٤٣٤٤)، الترمذي(٢١٧٤)، ابن ماجة (٤٠١١)، احمد (٦١/١٩/٣)، احمد (١٥ / ٢٥١ )

(موسا)دا(علیه السلام)ئەوان تیاچوون، ئێوەش دەتانگوت تازە خوا هیچ پێغەمبەرێك رەوانە ناكات ! بەڵام خوای گەورە ستەمكاران ریسوا دەكات، ئەوانەی كە بێ زانیاری رەخنە لەكاروباری پێغەمبەران دەگرن، ئەوە كارێكی ناشیرینە، لای خوای گەورەش گەورەیە، ئاوا خوای گەورە دڵی لوت بەرزو ستەمكاران مۆر دەكات لەسەر ئەو شتەی كەلەو دڵەدایە .لەگەڵێك ئایەتی قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە باسی ئەوە دەكات كە لەڕۆژی سەغڵەتی و ناڕەحەتی دا مرۆڤی ئارامی لێ هەڵدەگیرێ و دەروازەی رزگار بونیشی نامێنێ، بۆ نموونە: ئایەتی (١٠ – ١٢)ی سورەتی (القیامە)و ئایەتی (٣٣ – ٣٦)ی سورەتی (الرحمن).

﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا هَامَانُ ابْنِ لِي ...........إِلَّا فِي تَبَابٍ﴾(غافر: ٣٦ – ٣٧)، پاش ئەوەی فرعون باوەڕی نەهێنا، نەبەموساو نەبەڕاوێژكارانی خۆی و سور بوو لەسەر بەرپەرچدانەوەی ئەو پێغەمبەرە نازدارانە (علیه السلام)، ئینجا بەتەواوەتی رووی راستەقینەی پڕ لەگێلی و نەزانینی خۆی دەرخست، كاتێك بە (هامان)ی وەزیری خۆی گوت: ئەی هامان كۆشكێكی بەرزم بۆ دروست بكە تاكو پیایدا سەربكەوم بەرەو ئاسمان بۆئەوەی بپرسم یان بزانم دەربارەی ئەو پەروەردگارەی موسا باسی دەكات، یان دەربارەی یەكلایی كردنەوەی ئەوەی ئاخۆ پەروەردگارە موسا باسی دەكات، یان سەربەخۆ لەخۆیەوە دەڵێت من پێغەمبەرم، چونكە من باوەڕ بە موساناكەم و بەڕاستی نازانم، ئاوا بەو جۆرە بەدكاریەكانی فرعون لەبەرچاوی خۆی جوانكرابون و خراپكاریەكانی خۆی لەدڵیدا شیرین كرابون، لەگەڵ ئەوەش دا كەبەرەنگاری ئەوە دەبوەوە كە خەڵكی رێگەی خواپەرستی بگرێتە بەر، فرت و فێڵەكانی فرعون هەرهەموویان بەسەر خۆیدا شكایەوەو بەزیانی خۆی تەواو بوون، هەروەها خوای گەورە دەربارەی ئەو فرمانەی فرعون بۆ هامانی وەزیری كەكۆشكێكی بەرزی بۆدروست بكات، دەفەرموێت، فرعون بەگەلەكەی گوت: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرِي فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَلْ لِي صَرْحاً لَعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾(القصص: ٣٨)، واتا ئەی خەڵكینە ! من جگە لەخۆم هیچ پەروەردگارێكی دیكە شك نابەم كەخوای ئێوە بێ، ئەی هامان تۆش بەخشتی سورەوەكراو – بەناگر –كۆشكێكی بەرزم بۆ دروست بكە تاكو پیایدا سەربكەوم بۆ ئاسمان و بزانم ئەو پەروەردگارەی موسا باسی دەكات چی یەو چۆنە و بڕیاری چی یە دەربارەی موسا، چونكە من لەموسا بەگومانم و بەڕاستی

نازانم . وشەی (تباب)لەئایەتەکەی پێشوودا مانای (ڕەنجەڕۆیی و خەسارەت مەندی)یە، وەکو (ابن مسعود)[١٦٩] و (مجاهد)[١٧٠] هێناویانە، فرعون ویستی بەهۆی ئەو کۆشکەوە بگاتە ئاسمان و بەوردی ڕێگەکانی وئاسمان و ئەستێرەکان بگەڕێچت، تاکو پرسیاری ڕاستی یان ناڕاستی موسا (علیه السلام) بکات هامانیش کۆشکێکی زۆر بەرزی بۆ دروست کرد، کەوتراوە: هیچ کۆشکێك نەبووە لەوسەردەمەدا لەولاّتی میصر لەو کۆشکە بەرزتربێت .

(اهل الکتاب) پێیان وایەکە فرعون (بنی اسرائیل)یەکانی زۆر شەکەت و ماندوو دەکرد لەدروست کردنی خشتی ئەو کۆشکەدا، بەهیچ جۆرێ کەسیش بۆی نەبوو پارمەتییان بدات، دەبوایە هەر خۆیان گڵی خشتەکانیان هەڵکەندایەو کۆیان بکردایەتەوە و لەبێژنگیان بدایە، پاشان ئاویان بهێنایەو قوڕیان بگرتایەتەوەو خشتەکانیان لەقاڵب بدایەو پاشان وشکییان بکردنایەتەوەو ئامادەیان بکردنایە بۆ دروست کردنی کۆشکەکە واش داوایان لێ کرابوو کە دەبوایە ڕۆژانە ژمارەیەکی دیاری کراوی خشتیان ببڕیایەو ئامادەیان بکردنایە، خۆئەگەر ئەو ژمارەیەی بۆیان دیاری کرابوو لەخشت ڕۆژانە تەواویان نەکردایە ئەوا ئازاردەدران و سووکایەتیەکی زۆریان پێ دەکراو سزا دەدران، لەبەرئەوە بوو (بنی اسرائیل)یەکان هاتنە خزمەتی موسا (علیه السلام) و پێیان گوت: ﴿أُوذِينَا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَأْتِيَنَا ............ كَيْفَ تَعْمَلُونَ﴾ (لأعراف:١٢٩) ، واتا: ئێمە بەرلەوەی تۆشمان بۆ ڕەوانە بکرێی وەك پێغەمبەر ئازار دەدراین، وە ئێستاش کە تۆمان بۆ ڕەوانەکراویت هەرئازار دەدرێین، موساش U فەرمووی :بەڵکوپەروەردگارتان دوژمنەکەتان لەناو بەرێت و خۆتان ببنە خاوەن زەوی و خاکی خۆتان لەدوای لەناوچوونی ئەوان، تاکو خوای گەورە بتانبینێ ئەوسا چۆن دەبن و چۆن ڕەفتار دەکەن،ئەوەبوو موسا(علیه السلام)پەیمانی پێدان کە چارەنووسی چاك بۆئەوانە لەلایەن خواوە، ئەوەبوو سەرەنجام پێشبینی و پەیمانەکەی موسا چۆن بوو،خواش وای هێنایە پێش، دیارە ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەرئەوەی کە موسا (علیه السلام)پێغەمبەری خوایە .

پیاوچاکەکەش لەلایەکی ترەوە لەلایەن خۆیەوە خەریکی بانگەوازی خۆی بوە بۆلای خواپەرستی و بەڵگە هێناوە بۆ خەڵکی و ئامۆژگاری کردنیان و پشتیوانی دەربڕین

---

[١٦٩] رواه ابن جرير (١٢ / ٢٤ / ٦٦) .

[١٧٠] صحيح: رواه ابن جرير (١٢ / ٢٤ / ٦٦) .

بۆموساو هارون وموسڵمانان، وەکو خوای گەورە نمونەی قسەو بانگەوازەکانی ئەو پیاو چاکەیشی لەقورئاندا باس کردوەو دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ .... . فَأُولَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ (غافر: ٣٨ – ٤٠) واتا: کەسەباوەڕدارەکە گوتی: ئەی گەلەکەم شوێن پەیامی خوایی بکەون و لەگەڵ مندابن، بەرەو ڕێنومایی دەتانبەم، ئەی گەلەکەم ژیانی ئەم دنیایە دەسکەوتێکی کەمەو دەبڕێتەوە، ژیانی دواڕۆژ درێژخایەنە و ئەوێ خانەی مانەوەی هەتا هەتایی یە، هەرکەس کردەوەیەکی خراپ بکات ئەوا وەك خراپەیەکی خۆی سزادەدرێت و ئەوکەسەی چاکەش بکات نێربێ یان مێ، ئەگەر باوەڕداربێ، ئەوا دەچێتە ئەو بەهەشتەوەو بەبێ بەرانبەر و بەخۆڕایی لەلایەن خواوە رزق و ڕۆزی پێ دەدرێت،لەبەشێکی تری و ئەو بانگەوازەکانی دا ئەم پیاوچاکە باسی بێ هودەیی ئەوبیر و بۆچوونە هەڵانە دەکات کە ئەوان شوێنی کەوتوون و ئاگاداریان دەکاتەوە لەوچارە نووسە ترسناکەی لەپێشیانە ئەگەر هەروا بەردەوام بن لەو بارو بڕوا خراپەیەی هەڵیانبژاردووە و دوای فیرعەون کەوتوون، بۆیە بەگەلەکەی فەرموو ﴿وَيَا قَوْمِ مَا لِي أَدْعُوكُمْ إِلَى النَّجَاةِ ...... وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ﴾ (غافر: ٤١ – ٤٦)، واتا: ئەی گەلەکەم ! چیتانە ؟ خۆمن بانگتان دەکەم بۆ ڕزگاربوون، کەچی ئێوە بانگەوازم دەکەن تاکو باوەڕبەخوا نەکەم و هاوەڵی بۆ بڕیاربدەم لەسەر بنەمای نەزانی، کەمن هیچ زانیاریەکم نیە لەو بارەیەوە کە بەڵگە بۆبێ بڕوایی خۆم بهێنمەوە لای خوای گەورە،من بانگتان دەکەم بۆ پەرستنی ئەو خوایەی کەخاوەن دەسەڵات و بەتوانایە، بێگومان ئەو شتەی کەئێوە منی بۆ بانگ دەکەن نەلەدنیاو نەلەقیامەتدا سوودی نیە، وەدوا ڕۆژی گەڕانەوەمان هەربۆلای خوایە، وەزێدەڕەوانیش لەبێ بڕوایی و سەرگەردانی و دنیا پەرستی دا دەبنە هاوەڵی ئاگرو دۆزەخ، ئەوسا لەو دنیایەدا ئەو قسانەی منتان دێتەوە بیر، من بەقسەی ئێوە ناکەم و کاروباری خۆم دەدەمە دەست ئەو خوایە، هەرئەویشە کە بینایە بەبەندەکانی خۆی، ئەوەبوو خوای گەورە ئەو پیاوەی پاراست لەوفێڵ و تەڵەکانەی خەڵکەکە بەرانبەریان دەیکرد، سزایەکی توندیشی هێنایە سەر دارو دەستە و شوێنکەوتوانی فرعون دا، ئەو ئاگرەی کە بەیانیان و ئێواران ڕوحیان سزادەدات لەبەرزە خودا لەڕۆژی دوایش دادەست و پێوەندی فرعون دەخرێنە ناو توندترین سزاوە .

مەبەست ئەوەیە: کەخوای گەورە هیچ کەس و گەلێك سزانادات تاکو پەیامی خۆی بۆ نەنێرێت و بەڵگەکانی لەسەر ماڵ نەکات و بەخۆشی و ناخۆشی و ترس و مژدە پێیان

ڕانەگەیەنێت، هەربۆیە پاش ئەو هەموو بەڵگە زۆرانەی کەناردی بۆ (قبطي)یەکان و دەست پێوەندی فرعون، ئەوان هەر باوەڕیان نەهێنا، ئیتر خوای گەورەش دەروازەی سزا جۆرەکانی خۆی ترازاندبەسەریاندا،وەکو دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَا آلَ فِرْعَوْنَ بِالسِّنِينَ ...... فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ آيَاتٍ مُفَصَّلاتٍ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْماً مُجْرِمِينَ﴾ (الأعراف: ١٣٠ – ١٣٣) کە کورتەی واتاکەی بەم جۆرەیە، خوای گەورە گەلی فرعونی تووشی وشکە ساڵی و بێ بارانی کرد، کە کشتوکاڵ کردن هیچ سوودی نەبوو بۆیان، بەروبووم و دانەوێڵەیان زۆرکەمی کرد، دارودرەختیان وشك و زەرد هەڵگەڕا، سابەڵکو بیرێك بکەنەوەو بەخۆیاندا بچنەوە، بەڵام بێ سوود بوو،هەرسوور بوون لەسەر بەد بڕوایی و بت پەرستی خۆیان، هەرکە هەورێکی باراناویان بەدی دەکرد دەیانگوت ئەمە بەشی ئێمەیە و ئەمجارەیان بۆ ئێمە دەبارێت،وەئەگەر باران نەبارییایە دەیانگوت ئەونەگبەتیە بەشانی موساوە یە لەگەڵ شوێن کەوتوەکانی، بەپێچەوانەوە بوو بەڵام ئەوان وایان نەدەگوت، هەموو نەگریسی و نەهاتی و وشکە ساڵییەکیان دەدایە پاڵ موساو باوەڕدراران و هەموو چاکەیەکیشیان دەدایە پاڵ خۆیان . بەڵام خوای گەورە فەرمووی (پاداشت و خەڵاتی موسا و باوەڕداران لای خوایە) دەیانگوت بەموسا ﷺ هەرچەند بەڵگەو موعجزەمان نیشان بدەیت ئێمە باوەڕت پێ ناکەین و شوێنت ناکەوین و بەقسەت ناکەین،تەنانەت ئەگەر هەموو بەڵگەکانیش بخەیتە بەر دەستمان،بۆیە خوای گەورە خۆی باشتر دەزانێ کە ئەوانە باوەڕ ناهێنن و دەربارەیان دەفەرموێت:﴿إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لا يُؤْمِنُونَ ، وَلَوْ جَاءَتْهُمْ كُلُّ آيَةٍ حَتَّى يَرَوُا الْعَذَابَ الأَلِيمَ﴾(یونس: ٩٦– ٩٧)، واتا: ئەوکەسانەی کەبڕیاری خوا دەربارەیان ڕوون وئاشکرایە و سزابەخۆیان ڕەوادەبینن ئەوانە باوەڕ ناهێنن، تەنانەت ئەگەر هەموو ئایەت و موعجیزەی خواییشیان بۆبهێنێ،هەتا سزا نەبینن ، دیارە کاتی سزاکەش دەرگای تەوبەدادەخرێ و پەشیمانی دوایی بێ سوودە .

پاش ئەو هەموو بەڵگە زۆرانە و ناردنی پێغەمبەران و ئامۆژگاری پیاو چاکان و چاکە لەگەڵ کردنی زۆر لەگەڵیاندا، ئەوان هەر بەردەوام بوون لەسەر نادانی و کەللە ڕەقی و پابەند بوونیان بەوبت پەرستیەی کەلە باو باپیرە نەفامەکانیانەوە بۆیان مابووەوە، بەسەر کردایەتی فرعون و دام و دەزگاو وەزیرەکانی و لایەنگرانی، ئینجا کاتی ئەوە هات کەسەرەتای سزایان نیشان بدرێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ آيَاتٍ مُفَصَّلاتٍ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْماً مُجْرِمِينَ﴾ (الأعراف:١٣٣)، وشەی (الطوفان)لەم ئایەتەدا چەند واتایەکی جیاواز هەڵدەگرێت، لەوانەش: (ابن عباس)[١٧١]دەفەرموێت :واتا باران و لافاوێکی زۆرو سەرومڕو بێ وەستانەوە، کە دەبێتە مایەی خنکاندنی دارودرەخت و لەناوبردنی کشتوکاڵ و بەروبووم .

وە (سەعید کوڕی جوبەیر)[١٧٢]یش هەروای فەرموە،بەڵام (قتادة)[١]و (السّدي)[١]و (الضحاك)[١٧٣]و (ابن عباس وعطاء)[١٧٤]واتە: زۆر مردن، یان مەرگی بەکۆمەڵ،وە (مجاهد)[٣]دەفەرموێت: واتا سێڵاوی ئاو وە تاعون بەهەمووجۆرەکانیەوە و وە لە (ابن عباس)[١٧٥]ەوە وتراوە کە (طوفان)واتا چوار لا لێگرتن، یان سزایەك کە لەهەموو لایەکەوە بیانگرێتەوە. هەروەها (ابن جرير)[١٧٦] بردویەیتەوە سەر (عائشة) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ﴿الطوفانُ الموت﴾، واتا: لافاوی مەرگ .

بەڵام وشەی (الجراد) ئەوە ئاشکرایە و مانای (کولله)یە، هەروەکو لە (ابوداود)[١٧٧]ەوە دەگێڕنەوە، کە دەیباتەوە سەر سەلمانی فارسی، دەفەرموێت: پرسیار کراله لەپێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی (کولله)، فەرمووی: (زۆرترین سەربازی خوان، من خۆم نایانخۆم و حەرامیشی ناکەم)، واتا پێغەمبەر (ﷺ) لەڕووی قێزەونی یەوە کولله ناخوات نەك لەڕووی حەرامی یەوە، هەروەکو چۆن خواردنی سیرو پیازو گۆشتی چەقەڵ ناخورێت لەبەر بۆن و بەرامەیان نەك لەبەر حەرامی، بگرە سیرو پیاز زۆر بەسوودن و نابێت بۆ ناوکۆمەڵ بخورێت،نەبادا بەبۆنەکەی خەڵکی هەراسان بێت، ئەگینا کولله لەڕووی شەرعی یەوە دەخورێت، لە (عبدالله کوڕی ئەبی ئەوفی)یەوە دەگێڕنەوە کە گوتویەتی: لەحەوت جەنگدا لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بەشداربووین و کوللەمان دەخوارد، واتا ئەوان دەیان خوارد، نەك پێغەمبەر (ﷺ)، نەخواردنەکەیشی تەنها لەڕووی قێزەونی

---

[١٧١] صحيح بمجموع طرقه: رواه ابن ابي حاتم (٨٨٦٤)، ابن جرير (٦ / ٩ / ٣٠ / ٣١ )ابن ابي حاتم (٨٨٥٧)، ابن ابي حاتم (٨٨٦١)

[١٧٢] ابن ابي حاتم باسی کردوە بەڵام سەنەدی نیە .

[١٧٣] حسن: رواه ابن جرير (٦ / ٩ / ٣٠ / ٣١ )، ابن ابي حاتم (٨٨٥٣)

[١٧٤] صحيح اليه: رواه ابن جرير (٦ / ٩ / ٣٠ / ٣١ )

[١٧٥] ضعيف: رواه ابن ابي حاتم (٨٨٥٧)، ابن جرير (٦ / ٩ / ٣١ )

[١٧٦] ضعيف: رواه ابن جرير (٦ / ٩ / ٣١ )، ابن ابي حاتم (٨٨٥٥) .

[١٧٧] مرسل: رواه ابو داود (٣٨١٣ - ٣٨١٤)ابن ماجه (٣١٢٩)، ابن ابي حاتم ح (١٤٩٥)

یەوە بووە، لەتەفسیرەکەشماندا [١٧٨] ئەو فەرمودەو وتە بەنرخانەمان هێناوە کەلەم بارەیەوە گوتراون .

بەکورتی، بەروبووم و میوەیان وشك هەڵات و دوچاری نەخۆشی هات، سەبارەت بە (القمل)یش، هەرچەندە وشەکە مانای (ئەسپێ)دەگەیەنێت، بەڵام ئەویش لێرەدا چەند لێکدانەوەیەکی هەیە، لەوانەش (ابن عباس)[١٧٩] دەفەرموێت: ئەوسنەیە کە لەگەنمەوەپەیدا دەبێت، یان ئەوسنەیەکەلەگەنم و دانەوێڵە دەدات، لەمانایەکی تریدا[١٨٠] هێناویەتی کەمانای ئەو کوللە وردیلانەیە کە باڵیان نیە، هەروەها (مجاهد)[١٨١] و (عکرمە)[١٨٢]و (قتادە)[١٨٣]ش هەروایان فەرمووە، بەڵام سعید کوڕی جوبەیر و (الحسن)[١٨٤] فەرمویانە: مەگەزێکی وردیلەی ڕەشکەڵەیە،(بن اسلم)[١٨٥]یش دەفەرموێت ك (قُمل) واتە: ڕشك و ئەسپێ،لەلایەکی ترەوە (ابن جریر) واباس دەکات کەمانای جۆرە (هەڕە)یەکەلەناو زمانی عەرەبی دا، کەئەم هەڕانە لەگەڵیاندا ژیاون،هەموو شوێنێکیان پڕکردۆتەوە، ڕاخەرو داخەریان داکردماندوە، بەتەواوەتیخەڵکەکەیان بێزارکردووە بەڕادەیەك کەئیتر خەڵکەکە لەوزەیاندا نەماوەو بەتەواوەتی پەکیان کەوتوە، (عطاء کوڕی سائب)یش وای لێکداوەتەوە کە هەرئەسپێ‌ی ئاسایی بوون و (حسن البصری)یش بەخوێندنەوەی سووك، واتا بێ گیراوی خوێندویەتیەوە و (الشّدة)ی بۆنەکردوە و بە (القمل)خوێندویەتیەوە نەك بە (القُمل)، سەبارەت بە (الضَفادع)یش واتە (بۆق)بەڕاددەیەك بۆق زۆربوو کە دەکەوتە ناو خۆراك و مەنجەڵ و قاپ و دەفرەکانیانەوە، تەنانەت وتراوە: ئەگەر یەکێکیان دەمی بکردایەتەوە لەناکاو بۆقێك ئەکەوتە دەمی یەوە، (دَمْ)یش مانای (خوێن)ە، هەموو شلەمەنیەکانیان خوێنی تێدەکەوت، تەنانەت ئاوی خواردنەوە شیان تێکەڵی خوێن بوو، یان خوێن تێکەڵی بوو، هەرناوێکیان لەدەریای (نیل)یش هەڵبگواستایە ئەوا هەر پڕبوو لە خوێنێکی قێزەون و پیس، وێڕای ئەوەش

---

[١٧٨] واتە: تفسیر القران العظیم – ابن کثیر

[١٧٩] فی سنده ضعف: رواه ابن جریر (٦ / ٩ / ٣٢ )، ابن ابی حاتم (٨٨٧١)٠

[١٨٠] حسن لطرقە :رواه ابن ابی حاتم (٨٨٧٠)، ابن جریر (٦ / ٩ / ٣٢ )

[١٨١] رواه ابن جریر (٦ / ٩ / ٣٢)

[١٨٢] ضعیف: ابن جریر (٦ / ٩ / ٣٢ )

[١٨٣] صحیح الیە: ابن جریر (٦ / ٩ / ٣٢)

[١٨٤] ضعیف: رواه ابن جریر (٦ / ٩ / ٣٢ )

[١٨٥] صحیح الیە: رواه ابن ابی حاتم (٨٨٧٥)، ابن جریر (٦ / ٩ / ٣٢ )

ئاویان لەهەر ڕووبارو جۆگەلەو بیرێکیشەوە هەڵبگواستایە دیسان هەر خوێنی تێدابوو، بەڵام هیچ کام لە (بنی اسرائیل)ئەوبارەیان بەسەردانەهات، نەئەسپێ لێی دەدان و نەبۆق بەسەریاندا دەباری و نەئاویشیان بەخوێن پیس و سورو بۆگەن دەبوو، ئەوەش لەبەرخاتری گەورەیی و ڕێزی موسا (علیه السلام) لەلای خوای گەورە، (محمدی کوڕی ئیسحاق)[١٨٦] دەفەرموێت: ﴿فرعون کاتێك زانی جادوگەرەکان باوەڕیان هێنا، ئەو هەرسوور بوو لەسەر بەدبڕوایی و لوت بەرزی خۆی، بگرە دەستیدایە دژایەتی کردن و بەرەنگار بوونەوەی موسا (علیه السلام) لەگەڵ ئەو کەسانەی کەلەگەڵیدا بوون، بەڵام هێشتا خوای گەورە ماوەیپێدا، تاکو بیربکاتەوە و تەوبە بکات، لەبەرئەوە سزای گەورەی بۆ نەنارد، بەڵکو بەدوای یەکدا چەند وردە نمونەیەکی سروشتی نیشاندان، سەرەتا دوچاری وشکەساڵی و بێ بارانی ردن، پاشان لافاوی بۆ ناردن، ئینجا کوللە، پاشان ئەسپێ، دواتر بۆق، ئینجا خوێن، هەموویان لەکاتی جیاجیادا، کاتێك لافاوی بۆناردن، زەوی وزاری کردنە قوڕو لیتە و ڕوەکەکانیان بەقوڕو لیتە سواخ دران و گەشەیان نەکرد، بۆیە برسێتی ڕووی تێ کردن، ئیتر لەم بارەدا هیچ چاریان نەماو پەنایان هێنا بۆ موسا (علیه السلام) کەفریایان بکەوێت و ڕزگاریان بکات، هەروەکو قورئانی پیرۆز لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ الرِّجْزُ قَالُوا يَامُوسَى ادْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِنْدَكَ لَئِنْ كَشَفْتَ عَنَّا الرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾(الأعراف:١٣٤)، واتە: ئەی موسا لەپەروەردگاری خۆت بپاڕێرەوە ە پەیمانی پێداویت – وەڵامت بداتەوە – تاکو لەم ناڕەحەتیە ڕزگارمان بکات، جائەگەر توانیت ئەم بەڵایەمان لەسەر لابەریت، ئەوا باوەڕت پێ دێنین و بەنی ئیسرائیلیەکانت بۆ ڕزگار دەکەین و دەیاندەینەوە دەست خۆت، (موسا)ش (علیه السلام)بەکوڵ لەخوای گەورە پاڕایەوە، نزاکەی وەرگیراو ئەو ناڕەحەتیەیان لەسەر لاچوو، بەڵام ئەوان هەردەمیشیان نەکردەوە کەباوەڕ بهێنن یان لە پەیمانەکەی خۆیان بپرسنەوە، لەبەرئەوە خوای گەورە کوللەی بەسەردا باراندن وتراوە: کوللەکان ئەوەندە زۆر بوون کە هەموو میوەو بەری دارو گەڵای دارو قەدی داریشیان داکرۆشت و خواردیان، بەوەشەوە نەوەستان ڕویان کردە ناوماڵەکانیان و لاشیپانی دەرگاکانیان خوارد، داری دارەڕایان خوارد، بگرە بزماری ئاسنینی دەرگاکانیان خوارد، خانەو ماڵیان بێ دارو دارەڕاو دەرگاو پەنجەرە مانەوەو زۆربەیان ڕمان بەسەریاندا، دیسان کە زانییان چاریان نیە،

---

[١٨٦] ضعیف الأسناد: رواه ابن جریر (١ / ٢٤٧).

هاتنەوەلای موسا (علیه السلام)وەهەمان قسەی پێشویان کردەوە و گوتیان: ئەی موسا ئەگەر لەپەروەردگارت داوا بەکەیت ئەم کوللانەمان لەکۆڵ بکاتەوە ئەوا باوەڕ دەهێنین و موسڵمان دەبین، دیسان موسا (علیه السلام)لەپەروەردگار پاڕایەوە، خوای گەورە ئەم جارەش دەرفەتی دان . وەدەشی زانی کەباوەڕ ناهێنن و پەیمان دەشکێنن، بەنزاکەی موسا پێغەمبەر (علیه السلام)کوللەکانیش لەناوچوون و ژیانیان ئاسایی بوەوە، بەڵام ئەم جارەش وەکوە جاری پێشوو زمانیان بەو بارەدا نەسوڕاندو ورتەیان لێوەنەهات کە باوەڕ بهێنن، بۆیە خوای گەورە ئەسپێی بۆ ناردن،واباس کراوە کە فرمان بەموسا کرا(علیه السلام) کەبەلای مەڵۆیەکدا بڕوات و بەدارەکەی دەستی پیای بکێشێ، ئەویش چوەلای مەڵۆیەکی گەورە و دارەکەی پێدا کێشا، ئیتر لەو مەڵۆیەوە ئەسپێی بێ ژمار پەرتەوازە بوون و بڵاودەبوونەوەو هێرشیان بردە ناوماڵەکانیان و خواردنەکانیانەوە، خەوو خۆراك و حەوانەوەیان نەما، ئارامیان لێ هەڵگیرا، کاتێك تینیان بۆ هات بەدەست ئەو ئەسپێیانەوە بێزار بوون، سەرلەنوێ هاتنەوە لای موسا (علیه السلام) وەهەمان داواو پەیمانیان پێ ڕاگەیاند، خوای گەورەش ئەم جارەشیان ئەو بەڵایەیشی لەسەر لابردن، بەڵام وەکو سروشتی ئاسایی خۆیان نەهاتنەوە بەلای قسەو پەیمانەکەی خۆیانداو فەرامۆشیان کرد . بۆیە خوایە گەورەش بۆقی بەسەردابارەندن بەڕادەیەك کەناوماڵ و ژورو خۆراکیان پڕبوو لەبۆق، هیچ کەسێك نەبوو کە جل و بەرگ و خۆراکەکانی بۆقی تێنەچووبێت، هەمووشتەکان بۆق دایانپۆشیبوو، ئەم جارەشیان کە ژیانیان بەدەست بۆقەوە لێ هەراسان بوو، دیسان هاتنەوەلای موسا (علیه السلام)هەمان پەیمان و داوای جاری جارانیان ئاراستە کرد، خوای گەورە ئەم جارەشیان دڵی پێغەمبەرەکەی نەشکاندو داوای گەلەکەی هاتەدی و بۆقەکان پووکانەوەو بارودۆخ چاك بوەوە، کەچی ئەوبێ گفت و پەیمانانە شەرمیان نەکردو نەهاتنەوە بەلای پەیمانەکەی خۆیاندا، لەبەرئەوە خوای گەورە خوێنی بەسەردابارەندن بەجۆرێك کەئاوی نیل و ڕووبارەکان و کانی و بیرەکان هەر هەموویان پڕبوون لەخوێناوێکی قێزەونی بۆگەن، (ابن ابی اسلم)دەڵێت: خوێنی لوت پڕژان بوە، وەك (ابن ابی حاتم)[187] هێناویەتی . خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ الرِّجْزُ قَالُوا وَيَلَيهُمْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ ......فَانْتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا عَنْهَا غَافِلِينَ﴾(الأعراف:١٣٤-١٣٦)، لەم ئایەتە بەرزانەدا خوای گەورە بۆ پێغەمبەرمان (ﷺ)ئەوە

[187] صحيح: رواه ابن ابي حاتم (٨٨٨٣)

باس دەکات کە چۆن (قبطی یەکان) و دەست و پێوەندەکانی فرعون لەکاتی خۆشی دا لەخۆیان بایی دەبوون و سزای باوەڕداران و (بنی اسرائیل)یەکانیان دەداو لەکاتی تەنگانەدا هانایان بۆ موسای پێغەمبەر (علیه السلام) دەهێنا کەلە خوا بپاڕێتەوە و ڕزگاریان بکات و پاش ڕزگاربوون سەر لەنوێ دەچوونەوە سەر هەمان باری پێشوویان، بەڵام خوای گەورەش ماوەی زۆر پێدان و سزایەکی بۆ دواخستن، سەرەنجام شایستە بوون بەسزایەکی توند، بۆیە خوای گەورە سزای سەرەتاو کۆتایی دنیای بۆ ناردن و نقومی کردن و کۆتاییان پێ هات، ئەو فرعەونەی ساتێك دەیگوت: من پەروەردگاری هەرە گەورەی ئێوەم و ساتێکی تر دەیگوت: ئەی ئەوەنیە هەموو موڵك و سامانی وڵاتی میصر لەبەردەستی خۆمدایە و ئاوی ڕووبارەکان بەژێر باخ و باخاتاکانم دا دەڕوات، هاوکات بەموسای گوت: تۆ جادوگەریت و دەتەوێ لەسەر ئاینی باو باپیرانمان لامان بدەیت و خراپە لەسەر زەویدا بڵاوبکەیتەوە !

ئەمانەو چەندین و چەندین بێ شەرمی و بێ ئەدەبی تری نواند بەرانبەر بەخوای گەورەو پێغەمبەرە نازدارە کەی و باوەڕدارە ڕاستگۆو خۆڕاگرەکان . تاسەرەنجام لەدنیادا بەئاو خنکاو لەقیامەتدا بەئاگر سزا دەدرێت .

وە لەسورەتی (الزخرف)ئایەتی (٤٦ - ٥٦)دا خوای گەورە دیمەنێکی تری ئەو گفتوگۆیە بەشێوەیەکی تر باس دەکات و باس لە تیاچوونی ئەوان دەکات کە چۆن خوای گەورە کردنی بەپەندو نموونە بۆ ئەوکەسانی تر لەسەر زەویدا . خوای گەورە پێغەمبەرێکی خۆڕاگرو داناو زیرەکی بۆ ناردن تاکو ڕێنومایییان بکات بۆ سەر ڕێی ڕاست و لەبت پەرستی دووربکەونەوەو خوای تاك وتەنها بناسن و بیپەرستن، چەندین نموونەی ئایەتی بەهێزو موعجیزەی گەورە گەورەی بۆ ناردن هەرلە داردەستەکەی دەستی موسا (علیه السلام)وەفات دەگات بەدەستی سپی و شەوقداری موسا (علیه السلام)لەگەڵ چەندین نموونەی تر، لەوسەر دەمەدا هیچ کەمایەتی و عەیبە نەبووەکە بەکەسێکی زاناو لێزانیان بگوتایە جادوگەر چونکە ئەوان بەلایانەوە زۆر ئاسایی بوو، بەڵکو زۆریش جێگەی شانازی بوو کەبەکەسێکی زانا بڵێت (جادوگەر)بۆیە هاتن و بەموسایان گوت (علیه السلام)﴿وَقَالُوا يَا أَيُّهَا السَّاحِرُ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِنْدَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ﴾ . پاشان خوای گەورە باسی لەخۆبایی بوونی فرعون دەکات و شانازی بەو دورگانەوە دەکات و لەکاتی ئاوزیادبوونی نیل دا پڕاوەبوون و پاشان شانازی بەماڵ و سامان خشڵ و زێڕەکەیەوە

دەكردو دەیگوت: خۆموسا ئەمانەی نیە، ئەوەنەیدەزانی كە جوانی پیاوو پاشایان لەزیرەكی و دانایی و ژیرییان دایە و جوانی ژنان زیاتر بەخشڵەیەوە، نەك پیاوان، گاڵتەی بەموسا (علیه السلام) دەكرد كە بۆچی فریشتەی لەگەڵدانیە ؟ ئەوەنەیدەزانی كە فریشتەكان زۆر بێ فیزو ساكارن و لەخزمەتی بەندەچاكەكارو پێغەمبەراندان، تەنانەت باڵیان دادەخەن وەك ڕێز لێنانێك بۆئەو كەسانەی بەدوای زانست و زانیاریدا دەگەڕێن، وەك پێغەمبەرمان (ﷺ) لەفەرموودەیەكدا ئاماژەی بەوەداوەو دەفەرموێت [١٨٨]: (فریشتە باڵەكانی دادەخات بۆكەسانی زانست مەند وەك نیشاندانی ڕەزامەندی بۆئەوكارەی كەدەیكەن)،ئیتر ئاخۆ ئەو فریشتانە بەرانبەر بە پێغەمبەرێكی وەك موسا(علیه السلام) گەورەو نازدار چی بكەن ؟، ویڕای ئەمانە ﴿فَاسْتَخَفَّ قَوْمَهُ فَأَطَاعُوهُ إِنَّهُمْ كَانُوا قَوْماً فَاسِقِينَ﴾، واتا فرعون قۆناغ بە قۆناغ عەقڵی ئەو خەڵكەكەی دوادەخست و پلە بەپلە وای لێ كردن كە ئاسایی بێ بەلایانەوە كە باوەڕبەوە بكەن (فیرعەون) خوای هەرە گەورەیانە .

نەفرەت لەفرعون بێت، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿فَلَمَّا جَاءَهُمْ موسَى بِآيَاتِنَا بَيِّنَاتٍ قَالُوا مَا هَذَا إِلَّا سِحْرٌ مُفْتَرى ... وَأَتْبَعْنَاهُمْ فِي هَذِهِ الدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ هُمْ مِنَ الْمَقْبُوحِينَ﴾(القصص: ٣٦ – ٤٢)كورتەی واتاكەی بەو جۆرەیەكە فرعون و شوێنكەوتوانی دژی هەق و ڕاستی وەستانەوەو بەماڵ و موڵك و سامان و پلەوپایەو دەسەڵاتی دنیایی یەوە لەخۆیان بایی بوون و سەرەنجام داوای خوایەتیشی بۆخۆی دەكرد، ئاكامەكەی بەهێنانی چەند ئایەت و بەڵگەیەك بوو، كەنەبوونە مایەی گۆڕانی عەقڵ و ژیری ئەوان، بۆیە ئەوەیان بەخۆیان ڕەوا بینی كەخۆیان دوچاری سزا و تۆڵەیەكی دنیایی گەورە كردو ڕیسوایی و تیاچوون سەرەنجامیان بوو، تەنانەت لەسەر لەبەیانیەكدا فرعون و سەربازو كۆشكدارە كانی پێكەوە دوا بەیەكیان نقوم بون و تیا چوون و كەسیان دەرباز نەبوون، ماڵ و خانەیان بێ سەروشوێن بوون، هەموویان نقومی ئاوبوون و گیانیشیان بۆ ئاگری دۆزەخ ڕەوانەكرا، بەم جۆرە نەفرەتی دنیایان هاتە سەرو لەدوا ڕۆژیش دا كەسانی ڕیسواو بەدنمودو ڕووتاڵن .

---

[١٨٨] حسن: رواه احمد (٤/ ٢٣٩)، الترمذي (٣٥٣٥)، ابن ماجه (٢٢٦)؛ عبدالرزاق (٧٩٣ – ٧٩٥ )، احمد (٥ / ١٩٦)، ابو داود (٣ / ٣٦٤١ – ٣٦٤٢ )الترمذي (٥/ ٢٦٨٢)، ابن ماجه (٢٢٣).

## تیاچوونی فرعون و سەربازەکانی

کاتێك قبطی یەکانی میصر سوور بوون لەسەر بەدبڕوایی و کەللە ڕەقی خۆیان و شوێن فرعەونیەکەیان کەوتن و پشتیان کردە پێغەمبەرەکەی خوا موسا(علیه السلام) کەپەیامی خوایی و تەوراتی بۆ هێنابوون ، ئینجا خوای گەورە بۆ ڕاستی پێغەمبەرەکەی خۆی چەندین بەڵگەو موعجیزەو دەراسای گەورە گەورەی بۆ ناردن ، بەڵام ئەمانە هیچ سوودیان نەبوو ، هەموو ئەوانەی باوەڕیان هێنا ،وەك گوتراوە : تەنها سێ کەس بوون ، ژنەکەی فرعون و پیاوێکی تری دەستەی فرعون و ئەوپیاوەش کەلەوپەڕی شارەوە هاتبوو ، پشتیوانی خۆی بۆموسا ڕاگەیاندو ئاگاداریشی کردەوە کە دەست و پێوەندی فرعون بەتەمای کودەتا لێکردنی ئەون ، وەك لەئایەتی ژمارە (٢٠)ی سورەتی (القصص)دا هاتووەو لەمانای ئایەتەکەش دا فەرموودەی پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) هەیە کە (ابن عباس)[1] هێناویەتی و (ابن ابی حاتم)لەئەوەوە گێڕاویەتەوە ، دیارە ئەوکەسانەی باوەڕیان هێنا جگە لە جادوگەرەکان سێ کەس بوون ، ئەگینا جادوگەرەکان بەگشتی کڕنووشیان بردو بەئاشکرا موسڵمانی خۆیان دەربڕی و ، وتراوە : ئەوانەی بڕوایان هێناو سێ کەس بوون بریتی بوون لەوسێ کەسەی کەسەر بە (قبطی یەکان )بوون ، بەڵام لەلایەکی ترەوە وتراوە ك کۆمەڵێك لە قبطی یەکان و دەست و پێوەندەکانی یان کەسە نزیك و خزمەکانی فرعون بوون لەگەڵ جادوگەرەکان و هەموو (بنی اسرائیل)یەکان ، بەڵگەش لەسەر ئەوە فەرموودەی خوای گەورەیە کە دەفەرموێت : ﴿ فَمَا آمَنَ لِمُوسَىٰ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِنْ قَوْمِهِ عَلَىٰ خَوْفٍ مِنْ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِمْ أَنْ يَفْتِنَهُمْ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِي الْأَرْضِ وَإِنَّهُ لَمِنَ الْمُسْرِفِينَ ﴾(یونس: ٨٣) ڕاناوەکەی سەر (قومه)دەگەڕێتەوە بۆ فیرعەون ، چونکە ڕەوتی گشتی ئایەتەکە وادەریدەخەن ،وتراویشە نەخێر ئەو ڕاناوە دەگەڕێتەوە بۆ (موسا)(علیه السلام)، چونکە لەواژەی ڕستەکەدا جێکەوتەکەی لەئەوە نزیکە ، بەڵام بۆ چوونی یەکەم بەهێزترە و لەتەفسیرەکەش دا وا ئاماژەی پێکراوە و فرعون خۆی زۆردەسەڵاتداریوە لەسەرزەویدا وخەڵکەکە لەترسی ئەو نەیانوێراوە باوەڕ بهێنن ، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ فِي الْأَرْضِ﴾ ، واتا: زۆر بالادەست و دڕندە و ستەمکاربووەو ﴿ وَإِنَّهُ لَمِنَ الْمُسْرِفِينَ ﴾ وێڕای ئەوەش زۆر زێدەڕەوو توند ڕەوبووە ، کەچی مێشولەیەکی ساکار تەنگی پێ هەڵچنی کە سەربازێکی زۆر بچکۆلەی خوای گەورەیە ، کەوابوو ئەوانەی باوەڕیان

---

[1] سنده لا باس به : رواه ابن ابي حاتم (١٦٧٩٧) .

هێناوە کەم بوون ، جگە لەجادووگەرەکان کە دوایی و لەڕۆژی نمایشەکە داباوەڕیان هێنا ماناى وایە ڕاناوەکەش لەسەر وشەی (قومە)دەگەرێتەوە بۆ فرعون نەك بۆ (موسا)(علیە السلام)خوای گەورە زاناترە ، بەڵگەیەکی تر بۆ هەمان ڕاستی ئەوەیە کە (موسا)(علیە السلام) ئامۆژگاری گەلەکەی و باوەڕدارانی کرد کە پشت بەخوابیەستن لەدەست ستەمی ئەو ستەمکارەو داوابکەن کەخوا بەڕەحمی خۆی ڕزگاریان بکات لەوبێ بڕوا شەڕەنگێزانە .

پاشان خوای گەورە وەحی کرد بۆ (موسا) و هاڕونی برای(علیە السلام) کەلە میصر کۆمەڵێ خانوی چاك و جیاواز لەهی قبطی یەکان دروست بکەن ، تاکو لەکاتی کۆچ و تەنگانەدا ڕوویکەنە ئەو خانوانەو لەوێدا نیشتەجێ بن ؛ بەخانوە کانیش وابن کە بتوانن بەنوێژو خواپەرستی ئاوەدانیان بکەنەوە و مژدەبەباوەڕداران بدە –ئەی موسا– کە ئەوە سەرکەوتنێکی باشەو هی باشتریش بەڕێوەیە ، هەروەکو خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى وَأَخِيهِ أَنْ تَبَوَّءا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتاً وَاجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً وَأَقِيمُوا الصَّلاةَ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (یونس:٨٧).

وتراوە وشەی (قبلة)واتە : مزگەوت ، یان شوێنێك کە نوێژی زۆری تێدا بکرێ ، وە وتراوە بۆیە خوای گەورە فرمان و مژدەیان دەداتێ کە ئەوخانوانە دروست بکەن ، تاکو تیایدا نوێژ بکەن ،چونکە ئەوان نەیاندەتوانی لەترسی فرعون بە ئاشکرا نوێژ بکەن ، وەتراوە (قبلة)بەمانای (بەرانبەر)، واتا خانوەکانتان بەرانبەری یەکتری دروست بکەن [٢] تاکو لەیەکترەوە نزیك و بەئاگابن ، دیارە نوێژ کردن لەکاتی تەنگانەدا زۆر گرنگە و ئارامی بەمرۆڤ دەبەخشێت ، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت بەپێغەمبەرمان محمد (ﷺ) و موسڵمانان: ﴿وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلاةِ﴾ (البقرة : ٤٥) پێغەمبەری ئازیزمان(ﷺ) هەرکاتێك ترس و نائارامی کارێك ڕووی تێ بکردایە ، خێرا نوێژی دەکرد [٣]، وە وتراوە : مانای وایە ئەی موسڵمانان مژدەتان لێ بێ ئێستا دەتوانن بەئاشکرا لەماڵەکانی خۆتاندا نوێژ بکەن ، چونکە نەتاندەوێرا لەمزگەوت و لەبەرچاوی پیاوانی فرعون بیروبڕواکەتان ئاشکرابکەن .

﴿وَقَالَ مُوسَى رَبَّنَا إِنَّكَ آتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُ زِينَةً وَأَمْوَالاً فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا عَنْ سَبِيلِكَ .....فَاسْتَقِيمَا وَلا تَتَّبِعَانِّ سَبِيلَ الَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ﴾ (یونس : ٨٨ – ٨٩) ئەمەتکاو پاڕانەوەی موسا بوو(علیە السلام)

---

[٢] ئەوەیان لێکدانەوەی سعید کوڕی جوبەیرە ، ضعیف ؛ ابن جریر (٧ / ١١ / ١٥٥ )

[٣] حسن : رواە احمد (٥ / ٣٨٨)، ابو داود (١٣١٩)، محمد بن نصر (٢١٢)مسلم (٦٨٦١).

دژی دوژمنەکەی خوا ، تاکو قین و فەشەی خۆی پێ برێژێ چونکە فرعون بەنهێنی و ئاشکرا دژایەتی خوای دەکرد ، فیزو لوت بەرزی تێدابوو ، یاخی و بەدکاربوو ، (موسا) (علیه السلام) فەرمووی: خوایە خۆت بەفرعون و دەست و پێوەندەکانی ماڵ و سامانێکی زۆرت بەخشیوە ، هەروەها بە قبطی‌یەکان بەگشتی وئەوان لەسەر ئاینی فیرعەونن ، هەموو شتێکی ڕازاندنەوەی ژیانی دنیاو خۆشیەکانت بەوان داوە ، کەنەزانەکان وادەزانن ئەوە مانای ئەوەیە کە ئەوان باشن و چاکەکارن بۆیە ئەو هەموو نازەیان گیراوە و ئەو هەموو شتانەیان پێ دراوە ، بەڵام خۆ ئەوانە هەر ماڵ و سامانەوە تادەگات بەپلەو پایەی دنیایی و خۆراك وبەرگ و پۆشاك و وڵاخی بەهێزو پاشایەتی و دەسەڵات و تەنها شتێکی دنیایین و پەیوەندیان بە ئایینەوە نیە ، دەی سا خوایە ﴿ رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَى أَمْوَالِهِمْ ﴾ ماڵ و سامانیان لەناوبەرە [٤] بەڵام (ابو العالیه)[٥] و (الربیع بن انس)[٦] و (الضّحاك)[٧] فەرموویانە مانای ئەوەیەکە (ئەی خوایە بیانکەرە بەردێکی نەخش دار و بەو شێوەیە بیانهێڵەرەوە)بەڵام (قتادة)[٨] دەفەرموێت: پێمان ڕابگەیەنە کە کشتوکاڵەکانیان بوە بەبەرد (محمد کوڕی کعب)[٩]یش دەفەرموێت : (قامیشی شەکریان بوو بەبەرد)وە ماڵ و سامانیان هەر هەمووی بوو بەبەرد ، (ئەوبەسەر هاتەی عومەری

کوڕی عبدالعزیز باس کرا ، عومەریش بە گەنجێکی فەرمو: ئادەی بڕۆکیسە یەکم بۆ بێنە ، کیسەکەی بۆ هێنا کەنۆك و هێلکەی تێدا بوو ، کردی بەبەرد)[١٠]، پاشان موسا (علیه السلام) فەرمووی: ﴿ وَاشْدُدْ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا حَتَّى يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ ﴾، واتــا دڵیــان بگوشە ، چونکە ئەوانە باوەڕناهێنن هەتا سزای توند نەچێژن ، لەمانای ئەم ئایەتە پیرۆزەش دا (ابن عباس)[١١] دەفەرموێت: واتا ئەی پەروەردگارا سەردڵیان مۆربکە کەئەوانە چ کەللە ڕەق و بێ بڕوایەکن و شایستەی سزان . خوای گەورەش وەڵامی داوەتەوەو نزاکەی وەرگرتووە ، هەروەکو چۆن کاتی خۆی (نوح)(علیه السلام) نزای کرد لەگەلەکەی و فەرمووی: ﴿وَقَالَ نُوحٌ رَبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ

---

[٤] ابن عباس و مجاهد خ.ل فەرموویانە (اطمس علی اموالهم) واتا: لەناوی بەرە : ضعیف : ابن جریر (٧ / ١١ / ١٥٨)، صحیح الیه : ابن جریر (٧ / ١١ / ١٥٨ )

[٥] ضعیف الأسناد : ابن جریر (٧ / ١١ / ١٥٧ )

[٦] ضعیف الیه : ابن جریر (٧ / ١١ / ١٥٧)

[٧] حسن الأسناد : ابن جریر (٧ / ١١ / ١٥٨)

[٨] صحیح الیه : ابن جریر (٧ / ١١ / ١٥٨ )

[٩] ضعیف الأسناد : ابن جریر (٧ / ١١ / ١٥٨)

[١٠] ضعیف الأسناد : ابن ابي حاتم (١٠٥٤٣) .

[١١] ضعیف الیه : ابن ابي حاتم (١٠٥٤٦)ابن جریر (٧ / ١١ / ١٥٨)

الْكَافِرِينَ دَيَّاراً ، إِنَّكَ إِنْ تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا عِبَادَكَ وَلا يَلِدُوا إِلَّا فَاجِراً كَفَّاراً ﴾ (نوح: ٢٦– ٢٧) ، واتا: (پەروەردگارا هیچ لەوکەسە بێ بڕوایانە مەبوێرە و لەناویان بەرە ، ئەگەر وازیان لێ بێنی و هەر بمێننەوە ، ئەوا بەندەکانت گومڕا دەکەن و جگە لەوەی کە خراپکارو بێبڕواشیان لێ دەکەوێتەوە !)، هەروابەو جۆرەش خوای گەورە نزای موساو هارونی برای ﷺ وەرگرت و فەرمووی: ﴿ قَالَ قَدْ أُجِيبَتْ دَعْوَتُكُمَا فَاسْتَقِيمَا وَلا تَتَّبِعَانِّ سَبِيلَ الَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ ﴾(یونس: ٨٩) ، واتا: خوای گەورە فەرمووی : نزاو داواکەتان وەرگیرا ئێوەش –ئەی موساو هارون–لەسەر ڕێبازی خۆتان بەردەوام بن و هەرگیز نەکەونە شوێن ئەوکەسانەی کە نەزانن –واتا فرعون و بێ بڕوایان–زانایانی تەفسیرو هەندێ لە (اهل الكتاب) فەرموویانە: (بنو اسرائیل)یەکان مۆڵەتیان لە (فیرعون)خواست تاکو ڕێگەیان بدات بڕۆنە دەرەوەی شار بۆ ئەنجامدانی مەراسیمی چەژنێکی خۆیان ، هەرچەندە فرعون ئەگەرچی پێی خۆش نەبوو بەڵام مۆڵەتیشی دان ، ئەوانیش وا خۆیان ئامادەکردبوو کەبەیەکجارەکی سەری خۆیان هەڵبگرن و بەرەو شام بکەونەڕێ ، (اهل الكتاب) واباس دەکەن کە خوای گەورە فرمانی بە (بنی اسرائیل) کرد کە خشڵ و کەرەسەی ڕازاندنەوە لە قبطی‌یەکان بخوازن بۆچەژنەکەیان ، ئەوانیش خشڵێکی زۆریان کۆکردەوە و هەرئەوشەوە شاریان بەجێ هێشت و درێژەیان بەکۆچەکەیاندا بەرەو شام ڕێك گرتەبەر ، کاتێك هەواڵی کۆچە بە فیرعون گەیشت ، زۆر زۆر پەست و توڕە بوو ، کەوتە گەڵاڵەکردن و سازدانی سوپاکەی تاکو دوایان بکەوێت ، خوای گەورەش ئەم هەڵوێست و ڕووداوە بۆ پێغەمبەری ئازیزەمان (ﷺ) باس دەکات و دەفەرموێت: ﴿ وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي ...وإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴾ (الشعراء:٥٢ – ٦٨) ، کورتەی واتاکەی بەم جۆرەیە: وەحیمان کرد بۆ موسا کە خۆت و شوێنکەوتوانت شەو بڕۆن و شارچۆڵ بکەن ، چونکە فیرعەون و سەربازەکانی بەدواتانەوەن ، فیرعون خەڵکێکی زۆری کۆکردوەتەوە ئەمەش بە باوەڕداران ڕابگەیەنە کە ئەوان بەرامبەرمان زۆر قین لەدڵن ، هەموومان دەبێ هۆشیار بین ، سەرەنجام ئەو خەڵکەی میصرمان لەو بەهەشت و کانیاوانە وەدەرنا ، لەگەڵ ئەو خشڵ و زێرە زۆرەی هەیانبوو ، وێڕای خانوە جوانەکانیشیان ، ئاوامان لێکردن و هەموویمان بەمیراتی لەوان سەندەوەو دامان بەبنی اسرائیلی یەکان ، لەگەڵ خۆرهەڵاتن دا ئەوان شوێن موسا و باوەڕ داران کەوتن ، کاتێك گەیشتنەوە بەباوەڕداران ، شوێنکەوتوە باوەڕ دارەکان ڕویان کردە موساو گوتیان ، ئێمە بینراوین لەلایەن سەربازەکانی فرعونەوەو پێشمان بەدەریاگیراوە و

دەرفەتی ڕزگاربونمان نەماوە ، موسا(علیه السلام) فەرمووی: وانیە ،من پەروەردگاری خۆمم لەگەڵدایە و ڕێنومایيم دەکات ، ئێمە وەحیمان بۆ موسا کرد کە بەدارەکەی دەستی بدات لەدەریاکە ، بەوەش دەریاکە دووکەرت بوو ، گروپ گروپ سەربازەکان وەك کێوێکی گەورە بەدوای موسڵمانەکاندا ڕایانکرد بەناو وشکایی دەریادا ، لەوکاتەدا دەریاکەمان وێك هێنایەوەو موساو باوەڕدارانمان ڕزگارکرد بەگشتی ، بەڵام پاشان ئەوانی دیکەمان نقوم کرد ، ئەمەش ئایەت وبەڵگەیەکی خوایی یە ، گەرچی زۆربەی ئەوان باوەڕدارنەبوون واتە قبطی یەکان-پەروەردگاری تۆش بەتواناو بەبەزەییە .

زانایانی تەفسیر فەرموویانە: کاتێك فرعون و سەربازەکانی کەوتنە شوێن موسا و باوەڕداران ، لەشێوەی سوپایەکی بێ شومارو زۆرداربوو ، تەنانەت وتراوە : هەر ژمارەی ئەسپە ڕەشباوەکانیان سەد هەزار سەربازبووە ، خوای گەورە زاناترە ، وتراوە : ژمارەی بنی اسرائیلی یەکانی نزیکەی شەش سەد هەزار سەرباز بوون ، درێژی ئەو ڕێگەیەی کەبڕیویانە بەیاوەری موسا(علیه السلام) تا سەرگۆڕی(یعقوب)ی باپیرە گەورەیان(علیه السلام) چوارسەد و بیست و شەش ساڵ هەتاوی بووە .

مەبەست لەوەیە کە : فرعون بەخۆی و سەربازەکانیەوە کەوتە شوێن موساو باوەڕداران(علیه السلام) لەکاتی خۆرهەڵاتن دا گەیشتە سەریان ، هەردوو کۆمەڵە تەواو یەکتریان بەدی کرد ، هەریەکە لەتاکەکانی کۆمەڵەکە خۆی دەدایە پاڵ گروپەکەی خۆی و بەتەواوەتی خۆیان سازدابوو ، هەرئەوە مابوو کە بەگژی یەکدابچن و دەست بکەن بەکوشتار لەیەکتری و چەخماخەی جەنگ دەست پێ بکات ، لێرەدا قسەو باس و مقۆمقۆ دەستی پێ کرد ، هاوەڵانی موسا زۆرترسان ، گوتیان: ئەی موسا ئێمە بینراوین و هەستمان پێ کراوە لەلایەن سەربازو سوپای فرعونەوە و پێشەوەشمان دەریایە و ئەملاو لاکانیش شاخ و کێوە و دەست و پێوەندەکانی فرعون هەموو ڕێگە و دەروازە و سەر لوتکەکانیان لێ گرتبوون و بەوردی گەمارۆیان دەدان ، خۆ دەشیانزانی ئەو فرعونە چەندە ستەمکارو دڕندەیە دژی ئەوان ، بەڵام لێرەدا موسا(علیه السلام) فەرمووی: مەترسن ، من پەروەردگارێکم لەگەڵدایە کەچاوی لێمانەو ڕێمان نیشان دەدات ، موسا(علیه السلام) چووە پێشەوەی باوەڕداران و سەرکەناری دەریاکە ، تەماشایەکی ئەو دەریا فراوان و بەرینەی کرد کە شەپۆلە ترسناکەکانی وەکو شاخ و کێو جمەیان دەهات ، سات لەدوای سات کەفی دەریاکە باربوو دەبوو ،موسا(علیه السلام) فەرمووی : ئەی خوایە گیان بۆ ئێرە

فرمانت پیٚ کردووم که هاڕوونی برایشم لەگەڵدایە ؟ هەروەها یوشەعی کوڕی نون)یش (علیه السلام) یاوەرمانە کەلەزانا و گەورە پیاوانی بنی اسرائیل بوو ، پاشان خوای گەورە وەحی بۆنارد و کردی بە پێغەمبەر(علیه السلام) کە دوایی بەپشتیوانی خوای گەورە باسی دەکەین ، باوەڕدارانی خزمی فرعونیش لەگەڵیاندابوون ، تەنانەت ئەو باوەڕدارەیان بەئەسپەکەی چەند جارێك کەناری دەریاکەی پشکنی تاکو دەروازەیەکی دەرباز بوون بدۆزێتەوە ، بەڵام هیچی نەدۆزیەوە ، بۆیە هاتەوە بۆلای موسا(علیه السلام) وە لێی پرسی : ئایا فرمانت پیٚ کراوە بمانهێنیت بۆ ئێرە ؟ موسا(علیه السلام) فەرمووی : بەڵیٚ .

لەو لاوە فرعون و سەربازەکانی دانیان جێردەکەنەوەو ڕقێکی زۆریان هەڵگرتوەو بۆ هەڵمەتێکی کوشندە ئامادە کردوەو لەملاوەش پێغەمبەری خوا یاوەرە ئارامگرەکانی جێیان پیٚ لێژبوەو لەسەر لێواری مەرگی بەکۆمەڵدا جۆرێك لەترس و ڕاڕایی دایگرتوون ، هیچ دەروازەیەکی ڕزگاربوونیان لەبەردەمدانیە . ئەگەر جەنگ بکەن ئەمان زۆر کەمن و سەرەنجام هەموو بنی ئیسرائیلی یەکان تیا دەچن ، ئەگەر خۆیان دەدەنە دەم دەریاکە دیسان هەر قازانجی فرعون و قبطی یەکان ، بۆیە سەربەخۆ هیچیان نەکرد بەڵکو چاوەڕوانی هەڵوێست و فرمانی موسایان کرد(علیه السلام) ، تاکو ئەوانیش شوێنی ئەو بکەون ، جا جەنگ کردن بیٚ ، یان خۆدانە دەم ئاو ، ئەوانە گرنگ نین ، گرنگ ئەوەیە توانیان بەرەنگاری دوژمنی خوا ببنەوە و باوەڕیان سەلامەت بێت ، ئیتر لەم بارەش دا مەرگ زۆر بچووك و بیٚ مەترسییە .

لەم ئان و ساتە ناسك و ترسناکەدا ، کەمەرگ بۆتە تەمی سەردەریاو ڕاڕای مرۆڤ دێنێتە هەژان ، خوای گەورەو میهرەبان فرمانی بەموسا کردو وەحی بۆ نارد ، فەرمووی : ﴿ إضربْ بعصاك البَحرَ ﴾. واتە: بەدارەکەی دەستت بکێشە بە دەریاکەدا .

وتراوە کاتێك دارەکەی دەستی بەرزکردەوە تاکو بیکێشیٚ بەدەریاکەدا ، موسا ﷺ فەرمووی : بەناوی خوا دوکەرت بە ! خوای گەورەش لەو بارەیەوە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت : ﴿ فَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنِ اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْبَحْرَ فَانْفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ ﴾(الشعراء : ٦٣) ، وتراوە دەریاکە دوازدە ڕێگەی تێدا دروست بوو ، هەریەکە لەو دوازدە گروپە بەڕێگەی خۆیاندا ڕۆیشتن ، تەنانەت وتراوە کە پەنجەرە لەنێوان ڕێگە ئاویەکاندا هەبووە تاکو یەکتری ببینن ، بەڵام ئەمەیان جێگەی سەرنجە ، چونکە ئەگەر ڕووناکی لەپشتی ئاوەوە بوو ، ئەوا ئەو ئاوە وەکو ئاوێنەی لیٚ دێت و شتەکانی ئەودیوی نابینرێت

،لەلایەکی ترەوە ئاوی دەریاکە وەکو شاخ و کێو ڕاوەستا ، خوای گەورە (با)یەکی بۆ ناردن کە بەتەواوەتی قوڕولیتەی ڕێگەکەیشی بۆ وشك کردنەوە ، بەڕاددەیەك کەسمی وڵاخەکانیشیان قوڕاوی نەدەبوون .

مەبەست لەوەیەکە : کاتێك خوای گەورە فرمانی کەرت کردنی دەریای بەموسا(علیه السلام) ڕاگەیاندا و دەریاکە ڕێگەی وشکی دەربازبونی تیادروست بوو ، باوەڕداران زۆر دڵخۆش بون وبەشادی یەوە پیایدا ڕەت بوون و پەڕینەوە ، جا کاتێك دواهەمین دانەی موسڵمانان گەیشتە ئەوبەری دەریاکە ، یەکەم کەس لەپێشەتای سوپای فیرعون گەیشتە سەرەتای ڕێگەکەی ناو دەریاکە ، لەم کاتەدا ، موسا (علیه السلام) ویستی دیسان دارەکەی دەستی بکێشێتەوە بەئاوی دەریاکەدا ، تاکو کۆمەڵێ فرعون و سەربازەکانی نەتوانن بپەڕنەوە و شوێنیان بکەون ، بەڵام خوای گەورە فرمانی بەموسا کرد کەلەڕێی خۆتان بڕۆن و واز لەدەریاکە بێنن . بالەو بارەی خۆی بمێنێ – دیارە خوای گەورە کاری بەوە ماوە – هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَلَقَدْ فَتَنا قبلهم قومِ فِرعَونَ ..............وَآتَيناهُمْ من الآيات ما فيه بَلاءٌ مُبين ﴾ (الدخان : ١٧ – ٣٣ )، بەکورتی مانای ﴿وَاْتْرُكِ البحْرَ رَهْواً﴾، واتا : دەریاکە واز لێ بهێنە باناوەکەی هەروەکوخۆی بەڕاوەستاوی بمێنێتەوە و لێك نەدرێتەوە ، ئەمەش بە پێی ئەو گێڕانەوەی کە (عبدالله)ی کوڕی (عباس) و زیاتر لەهەشت کەسی تر گێڕاویانەتەوە [١٢]، لێرەدا شوێنکەوتانی فرعون سەرسام مان و نەیاندەزانی چی بکەن ، واباس دەکرێت : کە (جبر یل)(علیه السلام) لەسەر شێوەی ئەسپ و سوارێك هاتە پێش کەژاوەو ئەسپەکانی فرعون و هان و دنەی ئەسپەکانی فرعونی دا کە ڕووبکەن دەریاکە – واتا ڕێگەی ناو دەریاکە – خۆیشی بەتیژی بەسواری ئەسپەکەیەوە لەپێش ئەواندا کەوتە سەر هەمان ڕێگە ، ئەسپەکانی فرعون کەئەمەیان بینی بەتوندو تیژی دوای ئەو ئەسپە کەوتن و خۆیان کرد بەدەریاکەدا ، واتا ڕێگەی ناو دەریاکە – سەربازەکانی فرعون کەزانیان ئەوا فرعون و کەژاوەکەی و ئەسپە تایبەتیەکانیو سوارە پاسەوانەکانی بەتیژی و بەخێرایی هەمان ڕێگەیان گرتەبەر کە موساو(علیه السلام) باوەڕداران پیایدا ڕەت بوون و ئەوانیش شوێنیان کەوتن و تاکە یەك کەس دوانەکەوت و هەرهەموویان بەدوایدا ڕۆیشتن . ئیتر لەم کاتەدا خوای گەورە فرمانی بەموسا کرد(علیه السلام) کە ئێستا بەدارەکەی دەستت بکێشە بەئاوی دەریاکەدا ، ئەویش فرمانی خوای بەجێ هێناو هەر

---

[١٢] ابن جرير (١٣ ٢٥ ١٢١ – ١٢٢) .

لەگەڵ پیاکێشانیدا ئاوی دەریاکە هاتەوە یەك و هەر هەموویان لەناو دەریاکەدا نقووم بوون ، بگرەیەك کەسیان لیّ دەرنەچوو .دەربارەی باوەڕدارانیش خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَ أَنجينا موسى وَمَنْ مَعَهُ ........هو العزيز الرحيم ﴾

لەئاوەکەدا و هیچ کام لەباوەڕدارانیشمان لەناونەبرد ، بەڵکو هەرهەموویانمان ڕزگار کردن ، ئەمەش بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر تواناو دەسەڵاتی پەروەردگار و ئایەتێکە بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستیەی کەموسا (عليه السلام) (الشعراء/٦٥ – ٦٨) ، بەکورتی واتا: هیچ کام لەدوژمنانی خوامان ڕزگار نەکردو هەرهەموویانمان خنکاندن پێغەمبەرێکی گەورەی پەروەردگار بووە ، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە بەندە ڕاستەکانی خۆی لەتەنگانە ڕزگار دەکات ئەگەر چی بەڕووکار وا دیاربێت کە ڕێگەی ڕزگار بوونیشیان نەماوە.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَجاوَزْنا .........عَن آياتنا لَغافِلُونَ ﴾(یونس/٩٠ – ٩٢)، لەم دووئایەتەدا خوای گەورە ئاماژە بەحاڵی فرعون دەکات لەئان و ساتی نقوم بوون و گیاندانی دا ، کە چۆن فرعون و سەربازەکانی شەپۆلەکانی دەریا جارێك بۆ بنی دەریا و جارێك بۆ سەر ڕووی دەریاکە هەڵکێش و داکێشیان پیّ دەکەن و بەو بنوئیسرائیلیە موسڵمانەکانیش لەوبەر دەریاکەوە بەشادی یەوە بۆیان دەڕوانن و دڵخۆش بەسەرکەوتنی هەق بەسەر ناهەق دا ، لێرەدا فرعون ئان و ساتی تیاچوون و مەرگیەتی، مەرگێکی پڕ لەڕیسوایی چاوەڕوانی دەکات و سەرەنجامەکەیشی سزای سەختی بەرزەخ و دۆزەخە ، ئیتر کە دڵنیابوو هیچ ڕێگەیەکی ڕزگار بوونی لەبەردەمدا نەماوە ، وەکو هەموو مرۆڤێکی ئاسایی و ستەمکار کە لەسەرەمەرگدا هەمان هەڵوێستی هەیە ، دەمی کردەوە بۆئەوەی باوەڕ بەپەروەردگاری موسا(عليه السلام) بهێنیّ ، کەلەڕاستیدا خواوو پەروەردگاری هەموو جیهان و بونەوەرانە بەگشتی ، فرعون گوتی : ئەوا بڕوا دەهێنم کە پەروەردگار نیە ، جگە لەو پەروەردگارەی کە بنواسرائیل باوەڕیان پیّ هێناوە و ئەوا منیش موسڵمان بوونی خۆم ڕادەگەیەنم بەو پەروەردگارە ، خوای گەورەش تەوبەو پەشیمانی پاش نائومێدی هیچ کەسێکی ناویّ ، ئەوساتانەش بۆ هیچ کەسێك بەسات و ئانی پەشیمانی و تەوبەدانانرێت ، چونکە سەرەمەرگ بۆخۆی بەشێکە لەمەرگ و ئەوکەسەی لەسەرەمەرگدایە وەك ئەوە مردبیّ .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لا يُؤْمِنُونَ وَلَوْ جَاءَتْهُمْ كُلُّ آيَةٍ حَتَّى يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ ﴾ (يونس/٩٦ – ٩٧) ، واتە : ئەوانەی کەسزای خواییان بەخۆیان ڕەوا بینی ، ئەوانە باوەڕ ناهێنن ، ئەگەر چی هەموو بەڵگەو ئایەتی خوایشیان بۆ بێت ، مەگەر ئەوساتانەی کە سزای خواییان نیشان بدرێ ، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ فَلَمْ يَكُ يَنْفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ ﴾ (غافر : ٨٤ – ٨٥) ، ئەوەیە مانای گیرابوونی دوعاکەی موسا (ل لەفرعون و گروپەکەی کاتێك فەرمووی ﴿رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَى قُلُوبِهِمْ ﴾، چونکە ئەوانە باوەڕناهێنن تاسزاکە بەچاوی خۆیان نەبینن ، هەر لەو کاتەدا خوای گەورە نزاکەی موساو هارونی (عليه السلام) وەرگرت و فەرمووی: ﴿ قَدْ أُجِيبَتْ دَعْوَتُكُمَا﴾(يوسف : ٨٩) ، واتا: نزاو پاڕانەوەکەتان وەرگیرا ، بەڵام مەرج نیە هەموو وەرگرتنێك یەکسەر خوای گەورەش جێ بە جێی بکات ، ئەوەبو نزاکەیان وەرگیرا بەڵام هەڵگیرا بۆئەم کاتە تاکوبەڕیسوایی فرعون و دارودەستەکەی تیاچوون .

لەفەرمودەیەکدا کەپێشەوا (احمد)[١٣] لە (ابن عباس)ەوە هێناویەتی ، کەپێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: کاتێك فرعون گوتی : (ئەوا باوەڕم هێنا کە هیچ پەروەردگارێك نیە جگە لەو پەروەردگارەی کە بنو ئیسرائل باوەڕیان پێی هەیە) جبریل(عليه السلام) پێی گوتم: ئەگەر لەوکاتەدا منت دەبینی کەچۆن پەیتا پەیتا ئاوی دەریاکەم دەڕژاندە دەمی فرعونەوە لەترسی ئەوەی نەبادا ڕەحمەتی خوایی بیگرێتەوە) (الترمذي)[١٤] فەرموویەتی ئەمە فەرمودەیەکی (حسن)ە ، هەروەها (ابوداود الطيالسي)[١٥] دەفەرموێت : لە (ابن عباس)ەوە کە پێغەمبەرمان(ﷺ) فەرمودەیەکی هاو واتای ئەوەی پێشووی فەرمووە، (إبن ابي حاتم)[١٦]یش فەرموودەیەکی هێناوە کە بردویەتیەوە سەر (ابن عباس) کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (کاتێك خوای گەورە فرعونی نقومی ئاوەکە کرد ، فرعون پەنجەی دەرهێناو بەدەنگی بەرز گوتی: ﴿ءَآمَنْتُ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلَّا الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ ﴾ (يونس: ٩٠) ، (جبرئيل)(عليه السلام) لەوەترسا کە ڕەحمەتی خوایی بەرانبەر بە فرعون پێش

---

[١٣] صحيح : المسند (١ / ٣٩٠)، الترمذي (٣١٠٧)، ابن جرير (٧ / ١١ / ١٦٣)، ابن ابي حاتم (١٠٥٦١)

[١٤] بەوسەندە لاوازە

[١٥] صحيح الآسناد : مسند الطيالسي (٢٦١٨ )، الترمذي (٣١٠٨)، ابن جرير (٧ / ١١ / ١٦٣ )احمد (١ / ٢٤٠ – ٣٤٠)، ابن جرير (٧ / ١١ / ١٦٤ ).

[١٦] ضعيف : ابن ابي حاتم (١٠٥٦٣)

**قين و غەزەبەكەی بكەوێت ، لەبەرئەوە بەباڵەكانی لەدەم و چاوی دەدا و نقومی دەكرد ) ئەم فەرموودەیە (ابن جریر)[17]گێڕاویەتەوە .هەمان فەرموودەی بەگێڕانەوەیەكی تر و بەهەمان واتا و بەچەشنێكی تر هێناوە [18] .**

**دیسان هەندێ كەس لەپێشینەكان بە (ارسال) هێناویانە ، لەوانەش (ابراهیم التیمی)[19]و (قتادە ومیمون كوڕی مهران)[20]، وەوتراوە كە (الضحاك)[21]یش بۆ خەڵكی باس كردووە ، لەهەندێ گێڕانەوەدا هاتووە كە (جبرئیل)**(علیه السلام) **فەرموویەتی :**

**هەرگیز هێندە ڕقم لەكەس نەبووە ، ئەوەندەی كەڕقم لە (فرعون)بوە كە كاتێك گوتی :** (أنا ربّكم الأعلى ) **(لنازعات : ٢٤) ، بۆیە لەوكاتەش دا فرعون كە دەیویست شاتمان بێنێ و باوەڕ بوونی خۆی بەپەروەردگار ڕابگەیەنێ (جبریل)U قوڕی دەكردە دەمی فرعەونەوە ، وەڵامی خوای گەورەش بۆ فرعون و كەدەفەرموێت :**﴿ا لآن وقد عَصَيتَ قَبلُ وُكُنتَ مِن المفسدين ﴾ **(یونس : ٩١)، پرسیارێكی نكولكارانەیە و مانای ئەوەیەكە خوای گەورە تەوبەی لێ وەرنەگرتوە – خوا گەورە خۆی زاناترە – وەكو ئەوە وایە كەئەگەر ڕزگاریشی بكات ، وەكو جاری جاران دەچێتەوە سەر بێ بڕوایی و خراپەكاریەكەی خۆی ، هەروەكو چۆن بێ بڕواكان لەڕۆژی دواییدا كاتێك ئاگری دۆزەخ دەبینن ، دەڵێن:** ﴿ يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ **(الأنعام:٢٧) ، واتە: خۆزگە سەرلەنوێ بگەڕێنرێینەوە بۆدنیا ، ئیتر ئایەتەكانی خوای گەورە بەدرۆ نازانین و دەچینە ڕیزی باوەڕدارانەوە، بەڵام خوای گەورە لەوەڵامی ئەواندا دەفەرموێت:** ﴿ بَلْ بَدا لَهُمْ .........لكَاذِبُونَ ﴾ **(الانعام :٢٨) ، واتە: بەڵكو بۆیان دەركەوت كەئەوەی پێشتر پێیان دەوترا ڕاستەو ئەمڕۆ لێی دەترسن ، ئەگەر بشگەڕێنرێنەوە بۆدنیا ، ئەوا هەرئەوانە دەكەن كەدەبوو ، نەیانكردایە ، وەئەوانە درۆزنن .دەربارەی ئەو ئایەتەی كە خوای گەورە بەفیرعون دەفەرموێت:** ﴿فاليومَ نُنجّيكَ بَبَدنِكَ ببَدنِكَ لتكونَ لِمَنْ خَلفَكَ أية ﴾**(یونس: ٩٢) ، (ابن عباس )[22] لەمانای ئەو ئایەتەدا دەفەرموێت**

---

[17] **ابن جریر (٧ / ١١ / ١٦٤ )**

[18] **ابن جریر (٧ / ١١ / ١٦٣)**

[19] **ضعيف الأسناد : ابن جریر (٧ / ١١ / ١٦٤ )**

[20] **ضعيف الأسناد : ابن جریر (٧ / ١١ /١٦٣ ) ، عبدالرزاق (١١٦٧ )**

[21] **ضعيف الأستاد : ابن جریر (٧/ ١١ / ١٦٣ )س**

[22] **حسن لطرقه : ابن جریر (٧ / ١١ / ١٦٥ )، ابن ابي حاتم (١٠٥٦٨) .**

هەندێ لەبنی ئیسرائیلیەکان گومانیان هەیە لەسەر مردنی فرعون ، تەنانەت هەندێکیان گوتویانە: نامرێت ، بەڵکوخوای گەورە فرمانی بەدەریا کردوە کەبەرزی بکاتەوە و فرێی بداتە سەربەرزایی یەك ، وتراوە: ئەو بەرزاییە لەسەر شەپۆلەکانی ئاوە ، یان لەتەپۆڵکەیەکی سەرزەوی یە و هەمان زرێ ی هەر لە بەردایە کەکاتی خۆی لەبەری بووەو بەوە دەناسرێتەوە ، ئەمەش بۆ دڵنیا بوونی ئەوان و خەڵکی ترە ، تاکو گومانیان نەبێت لە لەناوبردنی فرعون و توانای بێ سنووری پەروەردگار ، بۆیە هەندێکیان دەڵێن : لاشەکەی هەر پارێزراوە و خوای گەورە بۆ پەندو ئامۆژگاری نەوەکانی داهاتوو هێشتوویەتیەوە .

هەندێ و تویانە: خوای گەورە بەخۆی و زرێ یەکەیەوە لەئاوی دەریاکەدا بێ سەرو شوێنی نەکردووە وەکو تەرمەکانی تر ، بەڵکو لایداوەتە کەناری دەریا و بەزریەکەوە بنو ئیسرائیلی یەکان ناسیویانەتەوەو دڵنیابوون کەئەوە فرعونە ، لەناوچوونی فرعون و سەربازەکانی ڕێکەوتی ڕۆژی (عاشورا)بوو ، هەروەکو بۆ بەڵگە پێشەوا (بجاری) (ﷺ) لە فەرمودەیەکی بردۆتەوە سەر (ابن عباس) کە پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) کاتێك هات بۆ مەدینە بینی کە یەهودیەکان ڕۆژی (عاشورا)تیایدا بەڕۆژوو بوون ، پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لەیەهودیەکان کرد : (ئەو ڕۆژەی کە تیایدا بەڕۆژوو دەبن بۆچی یە ؟)گوتیان : ئەمە ئەوڕۆژەیە کە موسا(علیە السلام) بەسەر فرعون دا سەرکەوت ، پێغەمبەریش (ﷺ) بەهاوەڵەکانی خۆی فەرموو (ئێوە لەئەوان لەپێشترن بۆموسا ، لەبەرئەوە ئەو ڕۆژە تیایدا بەڕۆژووبن) [٢٣] خوای گەورە زاناترە .

---

[٢٣] متفق علیه : الجاري (٤٦٨٠)، مسلم (٢٦٥٣) .

## بارودۆخی بەنی ئیسرائیلیەکان پاش تیاچوونی فرعون

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَانتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ .... وَفِي ذَٰلِكُم بَلَاءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴾ (الاعراف:١٣٦-١٤١) ، بە کورتیەکەی خوای گەورە لەم چەند ئایەتەدا باسی ئەوە دەفەرموێت کە چۆن تۆڵەی لە فرعون وپێرەکەی سەندۆتەوە و هەموویانی لە دەریادا نقوم کردن ، چونکە ئەوان درۆزن بوون و باوەڕیان بە ئایەتەکانی خوای گەورە نەدەهێنا و بێئاگایانە ڕەخنەیان دەگرت ، ئەو گەلەی کە لاواز و بێدەسەلاَت بوون (واتە بنی ئیسرائیل) دەسەلاَتی خۆرهەلاَت و خۆراوای زەویمان پێبەخشین و کردماننە میراتگری فرعەون و قبطيیەکان ، چونکە موسوڵمانەکان ئارامیان گرت و لە بەرانبەر ئەوەشدا فرعونیەکانمان وێران کردن بە خۆیان و لانە و کاروباریانەوە ، بەنی ئیسرائیلییەکانمان لەدەریا پەڕاندنەوە و لەویٚ چاویان بەمیللەتێکی بت پەرست کەوت و لەو کاتەدا بەموسایان گوت: تۆش پەروەردگارێك بۆ ئێمە دەست نیشان بکە ، هەوەکو چۆن ئەو گەلانە ئەو هەموو پەروەردگارە زۆرانەیان هەیە ، موسا (علیه السلام) فەرمووی: ئێوە گەلێکن خۆتان گێل دەکەن ؟ ئەوەی ئەو گەلە دەیکەن هەڵە و خراپە ، ئەدی جگە لەخوا داوای پەروەردگاری دیکەم لێدەکەن ؟ کە هەر ئەو بەسەر ئەو خەڵکەدا ڕێزی لێگرتن و ڕزگاری کردن لەدەست ئەو فرعەونەی کە زۆر بەتوندی سزاو ئازاری دەدان و کوڕەکانی ئێوەی دەکوشت و ژنەکانتانی دەهێشتەوە ، ئەمە تاقیکردنەوەی خوایی زۆر گەورەی تێدایە بۆ ئێوە .

بەڵی خوای گەورە منەتی نازو خۆشەویستی خۆی بە بنی ئیسرائیل ڕادەگەیەنیٚ ، هەروەکو لەئایەتی (٥٩)ی سورەتی (الشعراء) و ئایەتی (٥)ی سورەتی (القصص) و لەم ئایەتەی پێشووش دا ئەو منەتە دووبارە دەکاتەوە ، وە باس لەوە دەکات کە ئێوەی لەفرعون ڕزگار کرد و فرعون و دەست و پێوەندەکانیشی لەناوبردن بەجۆریٚ کە لە (میصر)دا تەنها ڕەشە خەڵك و شوانەکانی مانەوە .

(ابن عبدالحکم) لە (مێژووی میصر)دا دەڵێت: پاشاو میرە فرعەونیەکان پاش تیاچوونی پیاوەکانیان لەدەریاکەدا ناچار شوویان کرد بەخەڵکە هەژار و ڕەش و ڕووت و شوانەکانی میصر کە مابوونەوە ، بەلاَم لەبەرئەوەی ژنەکان خۆیان بە خانەدان و زنجیرەی تیرەی پاشاو دەسەلاَتداران دەزانی ، خۆیان سەپاندبوو بەسەر خەڵکەکەدا ئەگەرچی

لەهەمان کاتدا شووشیان بەوان کردبوو ، لەو ڕۆژەوە هەتا ئێستاش لەمیصردا ژن زاڵە بەسەر پیاوەکەیدا .

دەربارەی ئەو داوایەی کە شوێن کەوتوانی موسا (علیه السلام) لەوبەری دەریاکە گەلە بت پەرستەکەیان بینی و بەموسایان گوت: تۆش وەکو ئەوانە پەروەردگارێکمان بۆ دەست نیشان بکە ، وتراوە: ئەوە قسە و داواکاری چەند کەسێکی کەمی بنی ئیسرائیلییەکان بوو ، نەك هەموویان .

(پێشەوا أحمد) فەرموودەیەکی هێناوە کە دەیباتەسەر (ابی واقد اللیثي) کەدەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بەر لە (حونەین) چوینە دەرەوەو ڕێمانکەوتە شوێنێك کە بێبڕواکان چەکەکانی خۆیان پێوە هەڵدەواسی بە پێغەمبەرمان گوت: (ﷺ) ئەی پێغەمبەری خوا تۆش شوێنێکمان بۆ دیاری بکە بۆئەوەی چەکەکانمانی پێوە هەڵبواسین و بەدەوریاندا بگەڕێین هەروەکو چۆن بێبرواکان شوێنی وایان هەیە ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: (الله اکبر .. ئەو قسەیەیان وەکو ئەو قسەیەی بەنو ئیسرائیل وایە کە بەموسایان گوت: ﴿ قَالُوا يَا مُوسَى اجْعَلْ لَنَا إِلَهاً كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ ﴾ ئێوەش هەمان کاری ئەوانە دەکەن و هەڵەی پێشینەکانی خۆتان دووبارە دەکەنەوە) [1] .

هەروەها فەرموودەیەکی بێژە جیاوازی هاووتای ئەوەی پێشوو (ابن جریر)[2] هێناویەتی کەهەمان ئایەتی تێدایە ، واتا: کاتێك موسا (علیه السلام) لەگەڵ باوەڕداران و یاوەڕانیدا لەدەریاکە پەڕینەوە ئەوبەر ، بەو نیازەی کە لە (میصر)ەوە بەرەو (بیت المقدس) بڕۆن میللەتێکی تێکەڵیان لە (حثاني) و (فەزاري) و (کنعاني) و خەڵکەکانی تر بینی کە بت پەرست بوون ، موسا (علیه السلام) فەرمانی بەیاوەرەکانی کرد کە ئەو گەلە لەناوبەرن کەناهێڵن ئەمان بچنە ئەو (بیت المقدس)ەی کەخوای گەورە گفتیداوە بەئەمانی بدات لەسەر زمانی ئیبراهیمەوە (علیه السلام) ، بەڵام باوەڕداران و شوێنکەوتوانی موسا (علیه السلام)ئەوەیان بەپەسەند نەزانی و نەیاندەکرد .

خوای گەورەش لەبەرانبەر ئەوەدا ترس و بیمی لەناودا بڵاوکردنەوەو پەراکەندەو لاوازوبێسرەوتنی کردن ، بۆیە هەردەهاتن و دەچوون و هیچ دەرەتان و ئاسوودەییەکیان بەدینەدەکرد و وادیارە ماوەی چل ساڵ لەو بارەدا مانەوە ، هەروەکو خوای گەورە

---

[1] صحیح : المسند (٥/٢١٨) ، النسائي في الکبری (١١١٨٥) ، الترمذي (٢١٨٠) .

[2] صحیح الاسناد : ابن جریر (٦/٩/٤٥) ، احمد في المسند (٥/٢١٨) .

دەفەرمویّت: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ .... فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ ﴾(المائدە:٢٠-٢٥) ، لەم چەند ئایەتەدا خوای گەورە باسی ئەوە دەفەرمویّت کە چۆن موسا (علیه السلام) ئامۆژگاری موسوڵمانەکانی کرد کە نیعمەتەکانی خوای گەورە وەبیر خۆیان بهێننەوەو بزانن کەچۆن خوای گەورە پێغەمبەران و پاشاو دەسەڵاتداری لەناو ئەواندا هەڵبژاردووەو ماڵ و سامانی ئەوتۆی داونەتێ کەهیچ کەس لەدنیادا ئەوەی پێنەداوە ، ئەی قەومەکەم بەفەرمانی خوا فەرمانتان پێدەکەم کەبڕۆن بەرەو خاکی (مقدس) کەخوا بۆ ئێوەی داناوە ، پشت هەڵمەکەن و مەترسن ئەگینا ڕەنجەڕۆ دەبن ، گوتیان: ئەی موسا گەلێکی زۆر ئازا و دڕندەی تێدایە لەو خاکەداو ئێمە ناچینە ئەوێ تاکو ئەوان نەچنە دەرەوە ، دووکەس لەوانە کە نیعمەتەکانی خوایان لەیادبوو ، لەخوا ترس و باوەڕداربوون گوتیان ئێوە بڕۆنە دەروازەی شارەکەیانەوە هەر کە ئاوانتان لێگرتن زاڵ دەبن بەسەریاندا ، دەی پشت بەخوا ببەستن ئەگەر باوەڕداری راستەقینەن ، وتیان ئەی موسا (علیه السلام) هەرگیز ئێمە ناچینە ئەو شارو خاکەوە تائەوانی تێدابن ، فەرموو خۆت و پەروەردگارەکەت بڕۆن بیانکوژن و جەنگیان لەگەڵدا بکەن ، ئەوا ئێمە لێرە دانیشتوین و چاوەڕوانی ئەنجامەکە دەکەین ، موسا (علیه السلام) لەخوا پاڕایەوە و فەرمووی: خوایە من تەنها جڵەوی خۆم و براکەمم بەدەستە ، جیاوازی لەنێوان ئێمە و گەلە ستەمکارەکەدا بکە ، خوای گەورە فەرمووی: ئەوا ئەو خاکەم لەوسەر حەرام کردن تا ماوەی چل ساڵی تر ، ئەبێت هەر بێخاك و نیشتمان لەم سەرزەویە هاتووچۆیان بێ ، تۆش لەو فاسقانە مەترسە و بێ هیوا مەبە وادیارە ئەوانەی دەوروبەری موسا(علیه السلام)ئەگەر هەمووشیان نەبووبێت ، زۆربەیان لە قورئاندا بە سەرزەنشتکراوی ناویان هاتووە ، چونکە ترسان لەوێ ڕووبەڕووی ئەو گەلە ببنەوە لەکاتێکدا خوای گەورە خراپترین سەرکردەی سەرزەوی بۆ لەناوبردن کە (فرعون)بوو .

لێرەدا هەندێ لەزانایانی تەفسیر چەند شتێکی ئەوتۆیان باس کردووە کە لەو گەلەدا هەبوون کە یاوەرانی موساو بنی ئیسرائیلییەکان لێیان دەترسان ، وتراوە: خەڵکی ئەوێ زۆر کەتاو زل بوون ، کاتێ کەنوێنەرانی بەنی ئیسرائیل چوون بۆلای نوێنەرانی ئەو شارە ، نوێنەرەکانی ئەو شارە هێندە کەتەو زەبەلاح بوون ئەمانیان گرتوون و لەناو قوڵی کراسەکانیاندا شاردوویاننەوە ، یان لەناو لینگی شەڕواڵەکانیاندا ، یاخود لەناو مێزەرەکانی خۆیاندا لوولیان کردوون کە بریتی بوون لەدوازدە کەس ، بەو جۆرە هەموو

نوێنەرانی بەنی ئیسرائیلیان گرتوون و لەجل و بەرگەکانی خۆیاندا شاردویاننەوەو بردویانن لەبەردەمی پاشاکەی خۆیان هەڵیانرشتوون .

پاشای ستەمکارەکان گوایە گوتوویەتی: ئەمانە کێن؟ نەیزانیوە ئادەمیزادی ئاوا بچوك هەیە ، پاشان ناسیونیەوە کەئەمانەش ئادەمیزادن ، هەروەها دەڵێن گوایە پاشاکە ترێی لەگەڵدا ناردوونەتەوە ، بەڵام هەموو دەنکە ترێیەك بەشی یەك کەس لەوانەی کردووە ، گوایە پاشا بۆیە ئەمەی کردووە کە دەربیخات ئەمانە چەندە زەبەلاح و گەورەن بگرە ترێ و میوەکەشیان هەروەکو خۆیان گەورەیە ، وە باسی (عوج بن عنق)کراوە کە لەلایەن پاشای ئەو گەلە ستەمکارەوە ڕەوانەکراوە بۆ لەناوبردنی (بنی ئیسرائیل)یەکان کە ئەم (عوج)ە گوایە درێژیەکەی سێ هەزار و سێ سەد و سی وسێ باڵ و سێ یەکی باڵێك بووە بەڵام ئەم قسانە هیچ ڕاستیەکان نیە بەڵکو ئەفسانەو هەڵبەستراون ، هەروەکو لەو فەرموودەیەدا ڕوونمان کردەوە کەدرێژی ئادەم (علیه السلام) شەست باڵ بووە ، ئیتر بەرە ... بەرە درێژی مرۆڤەکان بەردەوام بووە ، بگرە تاکو ئێستاش بەردەوامە [1] ، گەلێك پسەوباسی ئیسرائیلیات لەم بارەیەوە ووتراوە هەموویان ناڕاستن ، خۆنەگەر ئەو خەڵکانە هێندە کە ئەو درێژبوونایە هەرگیز خوای گەورە بەئەمانی ڕانەسپارد کە بەگژیاندا بچنەوەو بیانوویان بەدەستەوەبوو کە بەو گەلە دڕندەیە ناوێرن ، لەلایەکی ترەوە خوای گەورە ئەمانی سزانەدەدا ، چونکە خوای گەورە ئەرکێك ناخاتە سەرشانی مرۆڤ کە لەتوانایدانەبێ ، هەروەها دووکەسە باوەڕدارەکەی کەلەناو بنی ئیسرائیلەکاندا هانی خەڵکەکەیان دەدا بۆئەوەی دژی ئەو گەلە بجەنگن باسی قەوارەی ئەو گەلەیان نەکردووە ئاخۆ گەورەن یان بچوکن .تەنانەت ئەگەر کافر گەورەش بێ هێشتا هەر بچوکە لەلای موسوڵمانان و هیچ کافرو بێبڕوایەکیش ڕەنگە هێندەی فرعون ستەمکار نەبوبێ کەخۆی بەخوا دەزانی (نەفرەتی لێ بێ) کەچی بەخۆی و دەست و پێوەندو میرو کەس و کارو سەربازەکانیەوە لەئاودا نقوم بوون و مردن کە (ئاو) نەرمترین شتی سەرزەوییە وتراوە ئەو دوو پیاوە باوەڕدارەی کە هانی خەڵکەکەیان دەدا بۆ (جهاد) دژی ئەو گەلە (یوشەع کوڕی نون) و (کالب کوڕی یوفنا)بوون ، ئەوەش ڕاڤە و لێکدانەوەی ئەمانەیە کە لەزیاتر لەیەك کەسەوە هێناویانە (ابن عباس)[2] و (مجاهد)[3] و (عکرمە)[1] و (عطیە)[3] و

---

[1] لەباسی چیرۆکی ژیانی ئادەم دا(علیه السلام)بە ووردی باسی ئەم فەرموودەیە و ساخ کردنەوەو (تخریج)ەکەی کراوە .

[2] ضعیف الاسناد : ابن جریر في التاريخ الكبرى (١/٢٥٤) .

[3] صحیح : ابن جریر (١٧٦/٦/٤) .

(السدی)[3] و (ربیع کوڕی ئەنەس)[4] و (خەڵکانی تر)[5] ، وتراوە: کاتێك خەڵکەکە گوتیان بە موسا (علیه السلام) ئێمە جەنگ ناکەین دژی ئەو گەلە دڕندەیە و ئەی موسا تۆو پەروەردگارەکەت جەنگ بکەو ئەوا ئێمەش لێرە دانیشتووین (یوشەع) و (کالب) یەخەی کراسەکەی خۆیان لەداخاندا دادڕاند و موساو هارونیش(علیهم السلام)بەکڕنوشدا کەوتن بۆ خوای گەورە نابادا ئەو قسە گەورەو ترسناکە ببێتە مایەی دابەزینی سزای خوایی بۆسەریان ، بۆیە موسا (علیه السلام) وەك (ابن عباس)[6] تەفسیری کردووە فەرمووی (فافرق بیننا) واتە: ئێمە و ئەوانەی کەئاوا دەڵێن یەکلایی بکەرەوە ، خوای گەورەش نزاکەی موسای وەرگرت و تۆڵەی لێسەندن و سزایدان بەوەی کەماوەی (چل)ساڵی ڕەبەق نابێت لەو خاکەو زەویە دیاریکراوە بڕۆنە دەرەوە ﴿ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ أَرْبَعِينَ سَنَةً ﴾ . بۆیە وایان لێهات شەوو ڕۆژ بێمەبەست و بەبێڕاز و مەرامەوە هاتووچۆی بێهودەیان دەکرد لەو خاك و شوێنە سنوردارکراوەدا .

وتراوە: لەماوەی ئەو چل ساڵەدا ئەو کەسانە هەر هەموویان مردن و کەسیان نەماوە ، جگە لەئاژەڵ و زیندەماڵەکانیان و (یوشەع و کالب) (علیه السلام) . بەڵام لەڕۆژی (بەدر)دا یاوەرانی پێغەمبەرمان (ﷺ) وەکو ئەو قسەیەی یاوەرانی موسایان نەکرد (علیه السلام) ، بەڵکو (مقداد) لەجیاتی هەموو یاوەرانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی کردە پێغەمبەر و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە وەك یاوەرانی موسا (علیه السلام) وەڵامت نادەینەوە ، کە بنو ئیسرائیلییەکان بەموسایان گوت (علیه السلام) بڕۆ خۆت و پەروەردگارەکەت جەنگ بکە ئەوا ئێمە لێرە دانیشتووین ، بەڵکو فەرموو: خۆت و پەروەردگارەکەت جەنگە بکەو ئێمەش دەبینە جەنگاوەرتان . هەروەها بەجۆرو دەقی هاوشێوەو هاوتای ئەم فەرموودەیە هەیە ، کەئەوە دەسەلمێنێ کەیاوەرانی پێغەمبەرمان (ﷺ) پشتیوانی تەواوی خۆیان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دەربڕیوە کەتەنانەت ئەگەر فەرمانیان پێبکات خۆیان فڕێبدەنە ناو دەریاشەوە سەرپێچی ناکەن بۆ هاوشێوەی ئەم فەرموودەیە یان گێڕانەوە جۆراوجۆرەکانی تری ، بڕوانە (صحیح البخاری/٣٩٥٢) و (التفسیر/٤٦٠٩ المغازی) (مسند الامام احمد٤/٣١٤) .

---

[1] لم اقف علیة .

[2] ضعیف الاسناد : ابن جریر (٤/٦/١٧٦) .

[3] حسن : ابن جریر (٤/٦/١٧٦) .

[4] ضعیف : : ابن جریر (٤/٦/١٧٧) .

[5] قتادة و ابن جریر هێناویانة بة (سندی صحیح) .

[6] ابن جریر (٤/٦/١٨١) .

## گەمارۆی شوێن لەسەر بەنی ئیسرائیلیەکان و کارە پڕ لە سەرسامیەکان

باسمان لەوە کرد کە بنی ئیسرائیلییەکان نکوڵیان لەوە دەکرد کەدژی ئەو گەلە بەتوانا و ستەمکارە بجەنگن، لەبەرانبەر ئەوەشدا خوای گەورە سزایدان بەوەی کەنابێت تاکو ماوەی چل ساڵ لەو سنوورەی بۆیان دیاریکرابوو بچنەدەرەوە .

لەکتێبی (أهل الکتاب)دا شتێوام نەکەوتوەتە بەرچاو کە بنی ئیسرائیلییەکان نکوڵیان لەو جیهادە کردبێ ، بەڵام ئەمەیان هەیە لەلای ئەوان کە (یوشەع) (علیه السلام) لەلایەن موساوە (علیه السلام)ئامادەکرا بۆئەوەی جەنگ بکات دژی دەستەیەك لەخەڵکی بێباوەڕ . (موسا و هارون و خور) لەسەر لووتکەی تەپۆڵکەیەك دانیشتوون ،موسا(علیه السلام) دارەکەی دەستی بەرزکردۆتەوە ؛ هەر جارێك موسا دارەکەی دەستی هەڵبڕیبێ یوشەع (علیه السلام) سەرکەوتووە بەسەر ئەو بێبڕوایانەدا ، بەڵام هەر کەدەستی ماندوودەبوو دارەکەی دەستی بەلاری بەرزدەکردەوە ، ئەوان زاڵ دەبوون بەسەر موسوڵمانەکاندا ، لەبەرئەوە ئەو ڕۆژە تاخۆراوابون (هارون و خور) یارمەتی دەستی موسایان دەدا تا سەرنجام باوەڕداران بەسەرکردایەتی (یوشەع) (علیه السلام) سەرکەوتن بەسەر بێبڕواکاندا .

ئەوان پێیان وایە کە (یەثرون)ی سەرگەورەو زانای (مەدیەن) پێی ڕاگەیاندن کەچۆن خوای گەورە موسای زاڵ کرد بەسەر فرعوندا ، لەبەرئەوە پاشای بێبڕواکان خۆی دابەستەوەو موسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند و (صفورا)ی کچیشی و ژنی موسا و دوو کوڕەکەی (جرشون و عازەر) یەکانگیربوون و موساش (علیه السلام) زۆر ڕێزی لێگرتن و گەورەپیاوانی بەنی ئیسرائیلی کۆکردەوە بۆ پێشوازی لێگرتن و ڕێزلێنانی .

هەروەها واباس دەکەن کە ئەو پیاوە ئەو هەموو ئەرك و قورساییەی لەسەرشانی موسا (علیه السلام)بەدیدەکرد کە بەنی ئیسرائیلییەکان لەجەنگە ناوخۆیی و هەراکانیاندا پەنایان دەبردەوە بۆ موسا (علیه السلام) ، لەبەرئەوە ئەو پیاوە پێشنیاری کرد بۆ موسا (علیه السلام) کەهەندێ لەپیاوە ئەمین و سەر ڕاست و خواپەرستەکان و بەرتیل نەخۆرەکان بکاتە سەرکردەی چەند گروپێك ، بەڵکو موسا (علیه السلام) ئەم پیاوە هەڵبژاردانە بکاتە سەرکردەی هەزارکەس ، وە دووسەد کەس و پەنجا کەس و بیست کەس ، واتا دانانی ئەمیر بۆ گروپی جیاجیا .

موساش (علیه السلام) بەقسەی ئەو پیاوەی کرد ، هەروەها وتراوە: بنو ئیسرائیلییەکان گەیشتنە وشکایی زەمینێ لە (سیناء) لەمانگی سێهەمی دەرچوونیان لە

(میصر) ، وە یەکەم ڕۆژی دەرچوونەکەیان لە(میصر) کردیانە یەکەم ڕۆژی ساڵی خۆیان کەیەکەم ڕۆژی بەهاربوو ، کەواتە لەیەکەم ڕۆژی وەرزی هاویندا گەمارۆی سنووورداری زەوییان خرایەسەر ، واتە پەراوێزکردنیان ، خوای گەورە زاناترە .

هەروەها دەڵێن: بنو ئیسرائیلییەکان لەدەوروبەری (طور سیناء) دابەزین و لەوێدا مانەوە موساش (علیه السلام) چووەسەر کێوەکە و لەوێدا خوای گەورە لەگەڵیدا کەوتە گفتوگۆ ، وە فەرمانی پێکرد کە ئەو نازو بەخششانە وەبیری بەنی ئیسرائیلییەکان بخاتەوە کەچۆن لەدەست فرعون ڕزگاری کردن و هەروەکو چۆن وەك ئەوەی لەسەر دووباڵی هەڵو هەڵیگرتبن و دەربازی کردبن ، وەفەرمانی پێکردن کەخۆیان و بەرگەکانیان بشۆن و خۆیان بۆ ڕۆژی سێهەم ئامادە بکەن ، جاکاتێك ڕۆژی سێهەم هاتەپێشەوە لەدەوری کێوەکە کۆببنەوەو هیچ کامێکیشتان لەئەو نزیك نەبێتەوە ، چونکە هەرکەسێك لێی نزیك بێتەوە ئەمرێت (واتە: ئەیکوژێت) تەنانەت ئەگەر ئاژەڵیش بێت ،چونکە تا ئاژەڵەکان دەنگیان نەیەت و بێدەنگ بن دروست نیە بەکێوەکەدا سەربکەون،بەنی ئیسرائیلییەکان ئەوەشیان لەموسا(علیه السلام) وەرگرت و بەقسەیان کرد.

جاکاتێك ڕۆژی سێهەم هاتەپێش هەورێکی گەورە سەر لوتکەی کێوەکەی گرت و دەنگی هەورەتریشقە و بریسکەی هەورەبریسکە و گرمەگرمی هەور بەدەنگی زۆر زۆر بەرز دەبیستران ، بنو ئیسرائیلییەکان زۆر زۆر دەترسان چوونە بناری کێوەکە ، پاشان دوکەڵێکی چڕوپڕو تەمێکی زۆر کێوەکەی داپۆشی کە لەناوجەرگەی دوکەڵەکەدا ستونێك لەنور بەدیکرا ، ئیتر کێوەکە بەجارێك کەوتە لەرزین و هەژان ، دەنگی هەورەتریشقە و کەڕەناش دەبیسترا ، موسا (علیه السلام) تین و کوشاری توندی لەسەربوو کاتێك خوای گەورە قسەی لەگەڵدا دەکرد ، ئینجا خوای گەورە فەرمانی بەموسا کرد(علیه السلام)کە لەکێوەکە دابەزێ بەخەڵکەکە بڵێ ئیتر با لەکێوەکە نزیك ببنەوە تاکو گوێیان لە فەرمانەکانی پەروەردگار بێت ، فەرمانی بەزاناکانیان کرد کەنزیك ببنەوە بەکێوەکەدا سەربکەون ، ئەمە ئەو دەقەیە کە لەکتێبەکەی خۆیاندا هەیە و موسا (علیه السلام)فەرمووی: ئەی پەروەردگار! ئەوانە ناتوانن بەم کێوەدا سەربکەون ، کەخۆت پێشتر فەرمانت پێکردوون کەنابێ سەربکەون پیایدا ، خوای گەورە فەرمانی پێکرد کەموسا (علیه السلام) خۆی دابەزێت و بچێت هارونی برای بهێنێت کەزانا و پیاوە ئاینییەکانیش زۆر لەوانەوە دوورنەبوون و موساش ((علیه السلام) ئەو فەرمانەی خوای گەورەی بەجێهێناو لەوێدا (دە ووشە) گەورەکانی پێڕاگەیەنرا .

بنو ئیسرائیلییەکان پێیان وایە کەهەموو بەنی ئیسرائیلییەکانی ئەو کاتە گوێیان لەدەنگی پەروەردگار بووە ، بەلاّم هەتا موسا (علیە السلام) بۆی لێك نەدانەوە لێی تێنەگەیشتوون ، بۆیە پێیان گوت: ئەوەی پەروەردگار پێت دەڵێت تۆش بەئێمەی رابگەیەنە ، چونکە دەترسین بمرین و ئەو فەرمانانە دوابکەوێت ، ئەو (دە وشە گەورە)یەش ئەمانەن: فەرمانیان پێکرا کەتەنها خوای گەورە بپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن ، نابێ بەدرۆ سوێند بەناوی خوا بخۆن ، دەبێت ڕۆژی شەممە تایبەت بکەن بۆ خواپەرستی و کاروباری تێدا نەکەن ، واتە ئەمەش ئەو ڕۆژەیە کەئێستا بوە بەڕۆژی هەینی و شەممەکە لابرا بەفەرمانی خوای گەورە ، ڕێزی دایك و باوکت بگرە تاکو تەمەنت لەسەرزەوی درێژبێت ، خەڵك مەکوژە ، زینا مەکە ، دزی مەکە ، شایەتی بەدرۆ مەدە ، چاو مەبڕە ماڵە هیچ کەسێك ، نیازت خراپ نەبێ بەرانبەر ژنی (هاوسەری) هیچ کەسێك و بۆتۆ دروست نیە بەندەی ئەو هاوسەری ئەو و گایەکەی و گوێ درێژەکەی و هیچ شتێك کە هی خەڵکانی ترە ، بەکورتی واتە: هەرگیز ئێرەیی بەماڵی کەس مەبە .

گەلێك لەزانا پێشینەکان فەرموویانە ناوەڕۆکی ئەو (دە وشە) گەورەیە لەدوو ئایەتی قورئانی پیرۆزدا بەدیدەکرێت ، ئەوانیش ئایەتی (١٥١-١٥٣)ی سورەتی (الانعام)ە ، کەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً وَلا تَقْتُلُوا أَوْلادَكُمْ مِنْ إِمْلاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ ، جگە لەو دە وشەیە ، خوای گەورە گەلێك ڕێنومایی و پەیامی تری پێراگەیاندن کە تا ماوەیەکی زۆر لەچاخ و کاتەکان کاریان پێکراوە ، پاشان وردە ... وردە خەڵکی خۆیان لەو بەرپرسیارێتییە لاداوە و دواتر دەستکاری ئەو دەقانەشیان کردووەو بگرە هەڵە و گێڕیشیان کردونەتەوە .

هەروەها خوای گەورە باسی کۆمەڵێکی تر لەو بەخشیشانەی خۆی دەکات کەداویەتی بە (بنو ئیسرائیلییەکان) کە چۆن ڕزگاری کردن لە زوڵم و ستەمی فرعون و بگرە فرعونی یشی لەناو برد ، ئینجا داوەتی کردن بۆلای کێوی (طور) تاکو پەیامی پیرۆزی خۆی لەوێ بەموسا(علیە السلام) ببەخشێ ، هەروەها جێگەیەکی لەسەرزەوی پێدان کە گونجاوبێ بۆ ژیان و گوزەرانیان ، گەزۆی بەسەر کشتوکاڵەکانیان داباراند ، باڵندەی مێلاقەی دەمەوئێواران بۆ دەناردن کە زۆر بەئاسانی ڕاویان دەکردن و گۆشتەکەیان دەخواردن ، وە لەکاتی گەرمای نیوەڕۆدا پەڵە هەوری ئەوتۆی بۆدەکردن بەچەترو سێبەر کەسوودیان لێوەرگرتن ، هەروەکو لە سورەتی (طه) ئایەتی (٨٠-٨٢) باسی ئەوەی فەرمووە ، ئەمە

**وێڕای گەلێك بەخشیشی تر کە لەسورەتی (البقرە) ئایەتی (٤٠-٤١) و (٤٩) و (٥٧)دا باسیکردووە تاکوتایی ئایەتی (٦٠-٦١) ، ئەوەبوو بەیانیان گەزۆی بەسەردا دەباراند و ئێوارانیش پەلەوەری مێلاقەی بۆئەناردن . وە خوای گەورە ئاوی لەبەرد بۆ هەڵقولأندن کاتێك موسا (علیه السلام) بەدارەکەی دەستی دەیکێشا بەو بەردانەدا کە لەگەڵ خۆیاندا هەڵیاندەگرت ، تەنانەت دوازدە کانی ئاویان بۆهەڵقولا بۆ دوازدە تیرەکەی خۆیان ، پاشان ئاوێکی سازگاریان بۆ هەڵقوڵێنرا کەخۆیان و ئاژەڵەکانیان لێتێراو دەکرد ، کەئەمانە شایستەی ئەوەن بەردەوام سوپاسی خوا لەسەر ئەو بەخشیشانە بکەن کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکیان هێشا بەکەمیان دەزانین و داوایان لەموسا (علیه السلام) دەکرد کەبۆیان بگۆڕێ بە شتیتر ، ئەگەر هەرداوای ئەوەش دەکەن فەرموو بڕۆنە میصرەوە ، کەهەموو ئەو داوایانەی ئێوەی تێدایە ، کەبەداخەوە ئێوە زۆر ئاستی خۆتان بەزاندووە کە هێندە خووتان داوەتە ئەو شتە ساکارانە و داوای خۆراك و جۆری خواردن دەکەن ، وادیارە ئەوان هێشتا دەست بەرداری نەریتە کۆنەکانی نەبوون ، بۆیە خوای گەورە فەرمووی: لەسنور لامەدن ئەگینا لێتان توڕەدەبم وئەوەی توڕەبوونی منیش گرتیەوە manای تیاچووە ، بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا من لێبوردەم بەرانبەر هەرکەسێك کەتەوبە بکات و باوەڕی هێنابێ و کردەوەی چاکە بکات و لەسەر ڕێی ڕاست بڕوات ، ئەوەش لەسورەتی (طه) ئایەتی (٨١-٨٢)دا بەدی دەکرێت .**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ وَوَاعَدْنَا مُوسَى ثَلاثِينَ لَيْلَةً ........ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَلِقَاءِ الْآخِرَةِ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ **(الاعراف:١٤٢-١٤٧) ، کۆمەڵێك لەپیاوانی پێشین فەرموویانە: ئەو سیشەوە بریتیە لە سیشەوی مانگی (ذي القعدة) بەتەواوەتی پاشان دە شەوی تری لەمانگی (ذي الحجة) بۆ خراوەتەسەر لەلایەن خوای گەورەوە ، بەمەش ماوەکەی بووە بە (چل)شەوی تەواو کەکۆتاییەکەی دەکاتە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان ، ئەوانەش کە فەرموویانە بریتین لە : (ابن عباس)[1] و (مسشروق)[2] و (مجاهد)[3] ، بەهەمان شێوە خوای گەورە پەیامی خۆی تەواو ڕاگەیاند بە پێغەمبەرمان محمد(ﷺ)[4] .**

---

[1] ضعیف الاسناد : رواه ابن ابي حاتم (٨٩٢٠) ، ابن جریر(٦/٩/٤٨) .

[2] اسناد : لەلایەن چەند پیاوێکی متمانەدارەوە ، ابن جریر (٦/٩/٤٨) .

[3] صحیح بمجموع طرقه : ابن جریر ، هەمان سەرچاوەی پێشوو .

[4] متفق علیه:البخاری (٤٥) ، مسلم (٧٤٤٣) خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِيناً ﴾

مەبەست لەوەیە کەموسا (علیه السلام) کاتێك ئەو ماوەیەی تەواوکرد کە خوای گەورە بۆی دیاریکردبوو لەوکاتەدا بەرۆژووبوو ، وتراوە: موسا (علیه السلام) هیچی نەخوارد ، کاتێك یەك مانگی رەبەقی تەواوکرد لقە دارێکی هێناو بەناودەمیدا گەڕاندی و لەدەمی وەردا تاکو بۆنی دەمی خۆش ببێت و بۆنی ناخۆشی رۆژووانی لێنەیەت ، دیسان خوای گەورە فەرمانی پێکرد کە (دە)رۆژی تر بەدوای مانگەکەدا بەرۆژووبێت ، بەوەش ماوەکەی بوو بە (چل)رۆژی تەواو ، لەبەرئەوە لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە کە پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێت: (بۆنی دەمی رۆژوان بەلای خوای گەورەوە خۆشترە لەبۆنی میسك)[1] .

کاتێك موسا (علیه السلام) خۆی یەکلایی کردەوە بۆئەوەی بڕوات بەلای ئەو پەیمانەوە کەخوای گەورە بۆی دیاریکردووە ، سەبارەت بەوەی لەکێوی (طور) گفتوگۆی لەگەڵدا بکات ، (هارون)ی برای لەجیاتی خۆی دانا بۆ سەرپەرشتی کاروباری بنی ئیرائیلییەکان ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَمَّا جَاءَ مُوسَىٰ لِمِيقَاتِنَا ﴾ واتە کاتێك موسا هات بەدەم ئەو کاتەوە کەبۆمان دیاریکردبوو ﴿ وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ ﴾ خوای گەورە لەگەڵیادا دوا لەپشتی پەردەوە ، واتا: تەنها گوێی لەدەنگی پەروەردگاربووە نەك بینیبێتی ، بۆیە موسا (علیه السلام) داوای لەخوای گەورە کرد ئەو پەردەیەی نێوانیان لابەرێت تاکو بەچاوی سەر خوای گەورە ببینێ ، بۆیە فەرمووی: ﴿ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَن تَرَانِي ﴾ ، واتە پەروەردگارا رێگەم بدە بۆت بڕوانم ، خوای گەورە فەرمووی: ناتوانی بمبینی ﴿ قَالَ لَن تَرَانِي وَلَٰكِنِ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي ﴾ ، واتە بەڵام تەماشای ئەو کێوە بکە ، خۆم نیشانی ئەو کێوە دەدەم ئەگەر وەکوخۆی مایەوە ئەوا مانای تۆش دەتوانی بمبینی (اهل الکتاب) دەڵێن : خوای گەورە فەرمووی: هیچ کەسێکی زیندوو نایبینێ تا دەمرێت ، وەهیچ وشکاییەکیش مەگەر دەکەوێتە جمان و جووڵە .

لە هەردوو (صحیح)ەکەدا هاتووە [2] (ابی موسی) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەرمان محمد (ﷺ) کە فەرموویەتی: (حجابە النور) یان (حجابە النار) ، واتە: پەردەی نێوان خوای گەورە و موسا نور بوو (ئەگەر ئەو پەردەیە لابدرێت ئەوا روخساری موسا (علیه السلام) دەشێوێ و دەسووتێ و سەرنجام چاوی توانای بینینی نامێنێ) ، (ابن عباس) یش[3]

---

[1] متفق علیه : البخاري (١٨٩٤) ، مسلم (٢٦٩٨) .

[2] صحیح مسلم : تصحیف (٤٤٤) ، ابن ماجة (١٩٥) ، (احمد) (٤٠٥/٤) .

[3] حسن الاسناد : رواة ابن ابي حاتم (٧٧٣٨) ، الترمذي (٣٢٧٩) .

دەربارەی مانای ئایەتی (لاتدركه الابصار) دەفەرمویت: ئەوە ئەو نورەیە کە نوری خوای گەورەیەو ئەگەر نیشانی هەرشتێکی بدات ئەو شتە وەکو خۆی نامێنێ ، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ سُبْحَانَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ ، واتە: (کاتێك خوای گەورە نوری خۆی نیشانی کێوەکەدا ، کێوەکە کەوتە جوڵەو لەرزین ، وە موساش بەوە سەرسامانە بەزەویدا کەوت ، کاتێك چاك بوەوەو هۆشیهاتەوە بەبەردا گوتی: پەروەردگارا پاکی هەر بۆتۆیە ، بۆلای تۆ تەوبەدەکەم منیش یەکەم کەسی باوەڕدارانم) ، کە باوەڕم هێنا کەهیچ زیندویەك ناتبینێ تاکو نەمرێت ، وەهیچ وشکاییەکیش مەگەر دەکەوێتە جمان و جوڵان .

لە هەردووك (صحیح)ەکەدا هاتووە کە دەیبەنەوە سەر (أبی سعید الخدری) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بەباشترم دامەنێن بەسەر پێغەمبەرانی تردا ، خەڵکی لە ڕۆژی دواییدا هەورە تریشقەی قیامەت بێهۆشیان دەخات ، یەکەم کەس کەدێتەوە هۆش خۆمم تەماشادەکەم کە موسا(علیه السلام) دەستی گرتووە بەپایەیەکی عەرشی پەروەردگارەوە ، ئیتر نازانم ئایا ئەو لەپێش مندا هۆشی بەبەردا هاتووە یان هەر هەورەتریشقەکەی کە لەکێوی طور لێیدراوە بۆی بری ئەوە دەکەوێت [1] لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (بەسەر موسادا گەورەترم مەکەن)[2] ، ئەمەش لەڕووی بێفیزی پێغەمبەرەوەیە (ﷺ) کەکەس لەکەس بەگەورەتر دانەنرێت ، بەڵام خوای گەورە خۆی بەپێی پلە هەندێکی بەسەر هەندێکی تردا بەرزکردوەتەوە ، ئەگینا پێغەمبەرمان (ﷺ) سەرداری پێغەمبەرانە (ﷺ) ، خوای گەورە زاناترە .

لەلایەکی ترەوە گەلی موسوڵمانان لەهەموو گەلانی سەرزەوی باشترن ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ﴾ (آل عمران:١١٠) ، هەروەها پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێت: (من گەورەی هەموو ئادەمیزادەکانم لەڕۆژی دواییدا شانازە نەبێ)[3] ، پاشان باسی ئەو پلەوپایەی کرد کە لەقیامەتدا هەیەتی و هەموو پەیامبەر و نێردراوانی خوای گەورە ئیرەیی پێدەبەن ، تەنانەت پێغەمبەرە (اولوا العزم)ەکانیش ، دیارە فەرموودەکانی پێشووی کەباس لەوە دەکات کەهەموو کەسێك هەورەتریشقە لێی دەدات ، مەبەت لەو بورانەوەیە کەهەموو

---

[1] متفق علیه : البخاري (٢٤١٢) ، مسلم (٦١٠٥) .

[2] متفق علیه : البخاري (٦٥١٧) ، مسلم (٦١٠٣) .

[3] صحیح : مسلم (٥٨٩٩) ، ابو داود (٤٦٧٣) ، احمد (١٤٤/٣)

کەس لەترسی ئەو ڕۆژە بێهۆش دەبێ ، ئیتر یەکەم کەس پێغەمبەری خۆمان (محمد (ﷺ) دەبێت کەدێتەوە هۆش خۆی وموساش (علیه السلام) دەبینێ کەدەستی بەپایەیەکی عەرشەوەیەو هۆشی کراوەتەوە بەبەردا کراوەتەوە ، چونکە لەدنیادا هەورەتریشقەی (طور)ی دیوە ، یان هەورەتریشقەکەی ئەو لەبەر هەمان هۆکار ساکارتربووەو زووتر چاك بوەتەوە! یاخود هەر هەورەتریشقەکە لەبەر هەمان هۆکاری دنیایی دنیایی ئەوی نەگرتوەتەوە ، خوای گەورە زاناترە . دەبێ ئەوە بزانین کەهۆی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرمان (ﷺ) ئەوەبوو کەپیاوێکی یەهودی لەلای موسوڵمانێك گوتی: (نەخێر سوێند بەو خوایەی کەموسای بەسەر هەموو مرۆڤەکاندا شکۆدارتر کردووە) ، کە لەڕاستیدا شکۆدارکردنی موسا بەسەر هەموو خەڵکیدا ڕاست بووە لەسەردەمی خۆیدا کەپێش هاتنی (محمد) بووە (ﷺ) وەك پێغەمبەری کۆتایی سەرڕووی زەوی بۆ هەموو ئادەمیزادو مرۆڤـ و پەری ، تەنانەت خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿ قَالَ يَا مُوسَى إِنِّي اصْطَفَيْتُكَ عَلَى النَّاسِ بِرِسَالاتِي وَبِكَلامِي فَخُذْ مَا آتَيْتُكَ وَكُنْ مِنَ الشَّاكِرِينَ ﴾ ، کەواتە خوای گەورە موسای شکۆدارکردووە بەسەر ئەو کەسانەی سەردەم و چاخی خۆی ، نەك پێش خۆی کە (ابراهیم) (علیه السلام) لەپێش ئەوەدا بۆ سەردەمی خۆی لەهەموو کەس گەورەتر بووە ، وە دوای خۆیشی (محمد) (ﷺ) گەورەترینە ، ڕاستی ئەوەش لەشەوی (شەوڕەوی)دا دەردەکەوێت کە پێغەمبەرمان (محمد) (ﷺ) پێش نوێژی بۆ هەموو پێغەمبەران کرد(علیهم السلام)، تەنانەت لەفەرموودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە کەدەفەرموێت: (ڕۆژی دوایی شوێنێکم دەبێ کەهەموو خەڵکی چاویان لەو شوێنە بڕیوە ، تەنانەت ئیبراهیمیش) .

بەڵام ئەوەش ڕێزێکی زۆرە کە خوای گەورە بۆ موسای داناوە (علیه السلام) کە لەودیو پەردەوە قسەی لەگەڵدا کراوەو بە (کلیم الله) ناسراوە ، وە پێغەمبەرمان (محمد) (ﷺ) لەڕووی ڕێزەوە بۆ موسا (علیه السلام) دەفەرموێت: (لەکەس بە گەورترم دامەنێن لەپێغەمبەران ، یان لە (موسا) بەگەورەترم دامەنێن ئەمەیان ڕووکاری مرۆڤایەتییەکەیە ، ئەگینا لەڕووی وەحی و پێغەمبەرایەتییەوە دیارە کە (محمد)(ﷺ) لەهەموویان گەورەترە و سەروەرترە .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَخُذْ مَا آتَيْتُكَ وَكُنْ مِنَ الشَّاكِرِينَ ﴾ ، واتە: ئەی موسا باش وەریبگرە ئەو پەیام و سپاردەیەی کە دەیدەمەدەستت و پێت ڕادەسپێرم و سوپاسی خوای لەسەر بکەو لەوەزیاتر داوامەکە ، چونکە ئەوە هەموو پێویستییەکی ئێوەی تێدا ڕوون کراوەتەوە ﴿ وَكَتَبْنَا لَهُ فِي الْأَلْوَاحِ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْعِظَةً وَتَفْصِيلاً لِكُلِّ شَيْءٍ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ وَأْمُرْ قَوْمَكَ

يَأْخُذُوا بِأَحْسَنِهَا سَأُرِيكُمْ دَارَ الْفَاسِقِينَ ﴾(لأعراف:١٤٥) ، واتە:لەسەر لەوحەکان دەربارەی هەموو شتێ ئامۆژگاری و ڕێنومایییمان بەووردی بۆ نووسیوە ، ئەو لەوحانە لەجەوهەرێکی زۆر گران بەهاو کانزای بەنرخ بوون ، لە (صحيح)دا هاتووە کەخوای گەورە بەدەستی پیرۆزی خۆی تەوراتی بۆ موسا نووسیوەو بۆی ناردووە کەهەموو لایەنێکی ژیانی تێدا ڕوون کراوەتەوە بەحەلاڵ و حەرامەوە .

﴿ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ ﴾ تۆش ئەی موسا ئەم پەیام و لەوحانە بەوپەڕی گوڕوتین و هێزو نیاز بەرزییەوە وەربگرە و جێبەجێیان بکەو بە گەلەکەشت بڵێ کە بەباشی شوێنی ئەم پەیامە بکەون ، ئینجا چارەنووس و دوا خانەومالی ئەو کەسانەشتان نیشان دەدەم ، یان پێتان دەڵێم کە لەسنوری خوایی لادەدەن و لەئایەت و موعجزە خواییەکان خۆیان دەبوێرن ، وە خۆیان بەزل دەگرن و بەسەر زەویدا فیز دەکەن ، بەبێئەوەی هەقی ئەویان هەبێ ، ئەوانە ئەگەر هەموو ئایەت و بەڵگەکانی خوای گەورەشیان نیشان بدرێ باوەڕیان پێناکەن ، وە ئەگەر ڕێی خراپ و نالەباریان بێتەپێش دەیگرنەبەر ، چونکە ئەوانە ئایەتەکانی ئێمە بەدرۆ دەگرت و لێیان بێئاگاو ناحاڵیبوون تاکو خوای گەورە لە کۆتایی ئایەتەکەدا خوای گەورە دەفەرموێت: (وە ئەوانەی ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ گرتووە و گاڵتەیان بەپێك گەیشتنەوەی ڕۆژی دوایی نیە ، کارو کردەوەیان بەبا دەچێ و دیارە هەریەك لەوانە بەپێی کردەوەی خۆیان سزا وەردەگرنەوە ، بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە تەفسیری ئایەتی (١٤٦-١٤٧) لەسورەتی (الاعراف) .

## چیرۆکی مانگا پەرستی

خوای گەور ە دەفەرموێت: ﴿ وَاتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَى مِنْ بَعْدِهِ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلاً جَسَداً لَهُ خُوَارٌ ..... لِلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ ﴾ (الاعراف/١٤٨-١٥٤) ، هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَا أَعْجَلَكَ عَنْ قَوْمِكَ يَا موسَى.....إِنَّمَا إِلَهُكُمُ اللَّهُ الَّذِي لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَسِعَ كُلَّ شَيْءٍ عِلْماً ﴾(طه:٨٣-٩٨).

لەم چەند ئایەتە پیرۆزانەدا خوای گەورە بەسەرهاتێکی گەورەو گرنگ بۆ پێغەمبەری ئازیزمان (محمد) (ﷺ) دەگێڕێتەوە کەکاتێك موسا (عليه السلام) ڕۆیشت بەدەم ئەو شوێن و ماوەیەی بۆ دیاریکرابوو لەلایەن پەروەردگاریەوە لەکێوی (طور) تاکو گفتوگۆی پەروەوردگار بکات و پەیامی خۆی وەربگرێت و وەڵامی پرسیارە جۆراوجۆر و زۆرەکانی بداتەوە ، لەبەرئەوەی موسا (عليه السلام) وادیاربوو زۆری پێبچێت لەبەرئەوە پیاوێکی لەجیاتی ، خۆی لەناو بەنی ئیسرائیلییەکان دانا کەناوی (هارونی سامر)بوو ، ئەم پیاوە

ئەو خشڵ و زێرەی لێکۆکردنەوە کەکاتی خۆی لە قبطیبەکانیانی خواست و ڕاپانکرد ، لەو خشڵ و زێرە پەیکەری گوێرەکەیەکی بۆ داڕشتن و مشتێ خۆڵیشی تێکرد ، وادیاربوو هۆی ئەم کارەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەسپەکەی جبریل کاتێك لەپێش ئەسپەکانی فرعونەوە خۆی بە دەریاکەدا کرد و بوە مایەی نقوم بوونی فرعون و گەلەکەی ، جاکاتێك خۆی پیادەکرد ، پەیکەرەکە دەنگێکی لێوە دەردەچوو کەوەکو دەنگی گوێرەکەی ڕاستەقینە وابوو .

وتراویشە هەر گوێرەکەی ڕاستەقینەی بۆ دیاریکردوون ، وەك (قتادە)[1] فەرموویەتی لەگەڵ کەسانی تریشدا هەروایان فەرمووە ، وە وتراویشە ئەو پەیکەرەی زێڕینەی گوێرەکەکە کەناوەکەی کلۆربووە ، هەر (با)ی هاتووەو بایەکە لەکونی دواوە چووەتە ناو لەشیو لەدەمییەوە هاتوەتە دەرەوە دەنگێکی لێوە دروست بووە کە لەبۆرەی مانگاو گوێرەکە چووە ، ئەوانیش زۆر بەوە شادمان بوون و بەدەوریدا شایی و هەڵپەڕکێیان کردووە . بگرە وردە .. وردە هێندە ئەو گوێرەکەیەیان بەرێز گرت تاکو لەنێوان خۆیاندا دەیانگوت: ئەوە پەروەردگارە و پەروەردگاری موسایشە کە لەبیری چووە لەگەڵ خۆیدا بیبات و بگرە ئەو خوایەی کەئەو بەدوایدا دەگەڕێ نەیزانیوە والێرەیە ، پاکی و گەورەیی هەر بۆخوایە و ناسکی و جوانی هەر بۆ ناووسیفەتی خوایە ، خوای گەورە هەر لەو ئایەتەدا باسی ئەوەی فەرمووە کە ئەو شتەی ئەوان شوێنی کەتوون پوچەو نەتوانای قسەی هەیە و نەهیچی لەدەست دێت و نەزیان و نەسوودی لێناوەشێتەوەو هیچ ڕێنوێنیان ناکات و ئەوانەی ئەوەشیان هەڵبژاردووە ستەمکارن و ستەمی گەورەیان لەعەقڵ و خودی خۆیان کردووەو خۆ خۆشیان چاك دەزانن کەئەوە کارێکی دزێوو بێمانایە و نادانی و گومڕایی نەبێ هیچیتر نیە ، جاکاتێك دەستیان لەودیو هەمانەکەوە دەرچوو ، دڵنیابوون کە بەهەڵداچوون ، زۆر پەشیمان بوونەوەو گوتیان: ئەگەر بێت پەروەردگارمان ڕەحممان پێنەکات ولێمان نەبورێت بەڕاستی ڕەنجەڕۆین .

کاتێك موسا (علیه السلام) گەڕایەوە بۆناویان و بینی لەچ گومڕاییەکی گەورەدان و پاش ئەو هەموو بەخشیشە گەورانەی خوای گەورە پێیداون کەچی کەوتوونەتە شوێن پەرستنی گوێرەکەیەك ، موسا (علیه السلام) ئەو لەوحە نایابانەی پێبوو کە تەوراتیان لەسەر نووسرابوو ، فڕێیدان (یان لەتاوانا لەدەستی کەوتنە خوارەوەو شکان) ، وەك (أهل

---

[1] صحيح : رواه ابن جرير (٩/١٦/٢٠٠) .

الكتاب) دەڵێن ، بەڵام خوای گەورە بۆی گۆڕی و هیتری بۆناردەوە ، بەڵام هەرگیز شتیوا لە قورئاندا نیە ، بەڵکو ئەوە باس کراوە کەچۆن ئەوانی لەگومڕایی و گوێرەکە پەرستیدا بینی .

(أهل الكتاب) پێیان وایە کە لەوحەکان [1] دوودانەبوون ، بەڵام ڕووکاری ئاشکرای قورئان وانیشان دەدات کەچەند لەوحێك بوون ، موسا (علیه السلام) زۆر کاریگەرنەبوو لەسەری کاتێك خوای گەورە هەواڵی پێدا کەگەلەکەت کەوتوونەتە دوای گوێرەکە پەرستی ، بەڵام خوای گەورە گەڕاندیەوە ناویان و بەچاوی خۆی بارودۆخەکەی بینی ، هەروەکو پێغەمبەرمان (ﷺ) لەبارەی بیستنی هەواڵ و بینینی بەچاو دەفەرموێت: (ليس الخبر كالمعاينه)[2].

واتە: بیستن و وەکو بەچاوبینین نیە ، ئینجا موسا (علیه السلام) کەوتە ناویان و هەڕەشەو گازەندەو سوکایەتی زۆری پێکردن لەسەر ئەو گومڕایی و بەدکاریەی کەدەستیان داوەتیێ ، دوایئەوەی بۆ ماوەیەك بەجێیهێشتبوون و کەسێکی تریشی بۆ دیاری کردبوون لەجیاتی خۆی کەچاودێرییان بکات و وەڵامی پرسیارەکانیان بداتەوە ، ئەوانیش کە بەخۆیان زانی کارەکەیان هێندە هەڵەیە ، بیانویان بەوە هێنایەوەو گوتیان: (ئەو زێڕو زیوو خشڵەی لەو قبطيیە شەڕەنگێزانەوە دەستمان کەوت بەپیسمان زانی و فڕێماندا ، بەڵام (سامری) ئەوەی لێدەروست کرد ، ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە کەنابێ مرۆڤ شت حەڵاڵ و حەرام بکات ، خوای گەورە خۆی ئەو زێڕو خشڵەی گەلی فرعونی بۆ حەڵاڵ کردبوون ، ئیتر چۆن ئەوان سەربەخۆ لەسەر خۆیان حەرامی دەکەن .

ئینجا موسا (علیه السلام) ڕوویکردە (هارونی برای) (علیه السلام) و فەرمووی: ئەی هارون بۆچی نەهاتی بۆلام تاپێم ڕابگەیەنیت کە گەلەکەم گومڕا و سەرگەردان بووەو هەڵگەڕاونەوە لەئاینی ڕاستەقینە ؟ ئەویش فەرمووی: تۆ منت لەجێی خۆت دانا و ترسام ئەگەر بەجێیان بێڵم گلەیی ئەوەم لێبکرێت ، کەبۆچی ئەوانم بەجێهێشت و کارەکەتم ڕانەسپارد لەناو بەنی ئیسرائیلییەکاندا ، لەبەرئەوە هەر لەونایاندا مامەوە ، موسا (علیه السلام) فەرمووی: (پەروەردگارا لەخۆم و براکەم ببورە و بمانخەرە ناو ڕەحمەتی خۆتەوە ، بەڕاستی تۆ لەهەموو خاوەن بەزەییەك بەبەزەیی تری .

---

[1] لەوح : پلێت ، پارچە تەنك و تۆکمە لەکانزای قایم و نایاب / وەرگێڕ .

[2] صحيح : المسند (١/٢١٥) ، ابن حبان (٦٢١٤) ، الطبراني (١٢٤٥١) ، ابن عدي (٧/١٣٦) .

خۆ ئەوە نەبێت (هارون) (علیه السلام) فەرامۆشی کردبن و هیچی پێرانەگەیاندبن ، بەڵکو خوای گەورە خۆی شایەتی بۆدەدات کە زۆر بەباشی و بەوپەڕی حیکمەتەوە ڕێنومایی کردوون و پێی گوتون: خوای گەورە بەوە تاقیتان دەکاتەوە ئەی گەلەکەم ، پەروەردگار بەبەزەییە و هەرگیز وەکو ئەم پەیکەرە یان ئەم ئاژەڵە بێزمانە نیە ، دەیوەرن گوێم لێبگرن و شوێنم بکەون لەو ڕاستیانەدا و بەقسەم بکەن ، بەڵام ئەوان گوتیان : ئێمە واز لەوە ناهێنین هەتا موسا (علیه السلام) نەگەڕێتەوە بۆ ناومان ، ئینجا موسا (علیه السلام) ڕوویکردە (سامری) و فەرمووی: ئەوە چیت کرد و بۆچی ئاوات کردووە ئەی سامری؟ ئەویش وتی وێنەی ئەو ئەسپەی جبریلم بۆ پەیکەرکردن کەپێش ئەسپەکانی فرعون کەوت و لەدەریاکەدا بەخنکانیدان ، وئەوان نەیانبینی ، من بینیم ، واباس دەکرێت کە ئەو پیاوە ئەسپەکەی جبریلی وابینیوە کەقاچی لەهەر شوێنی دابنایە ئەو شوێنە گیای لێسەوز دەبوو ، ئەمیش گوێرەکەکەی وا دروست کردبوو ، موساش (علیه السلام) نزای لێکرد و سزایدا بەوەی کەنابێت توخنی کەس بکەوێت لەدنیادا ، وە ئەوەی پێراگەیاند کە لەقیامەتیشدا سزا خۆی هەیە ، وە هەڕەشەی زۆری لێکرد و پاشان موسا (علیه السلام) گوێرەکەکەی سوتاند هەروەکو (قتادە)[1] و هەندێکی تر هێناویانە .وە وتراوە بە بڕبەنگ لێکی هەڵوەشاند ، وەکو (علی) و (ابن عباس) هێناویانە ، بەڵام ئەوە دەقی (أهل الکتاب)ە و زۆر متمانەی نیە ، پاشان موسا (علیه السلام) پەیکەری گوێرەکە زێڕینەکەی فڕێدایە دەریاوەو فەرمانی بە (بنی ئیسرائیل)یەکان کرد لەو ئاوە بخۆنەوە ، تاکو بیناناسێتەوە ئاخۆ کامیان گوێرەکەکەی پەرستووەو کامیان نەیپەرستووە .

جاکاتێك لەو ئاوەیان خواردەوە ، هەرکامیان لینەو خۆڵەمێشی بەلێوەکانیەوە بگیرسایەتەوە، مانای ئەوە گوێرەکەپەرست بوە ، ئەگینا ئەگەر وانەبوایە نەدەگیرسایەوە بەدەم و لێوی خواپەرستەکانەوە ، وتراوە: نەخێر پاش خواردنەوەی ئاوەکە بت پەرستەکان ڕەنگیان زەرد هەڵدەگەڕا ، موساش (علیه السلام) پێی فەرموون: پەروەردگاری ئێوە ئەو خوایە یە کەجگە لەئەو خوای تر نیە و هەموو شتێکی بەزانیاری خۆی داپۆشیوە ، واتا ئاگای لەهەموو شتێکە ، خوای گەورەش دەربارەی چارەنووسی ئەو گوێرەکە پەرستانە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ اتَّخَذُوا الْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُفْتَرِينَ ﴾ (الاعراف:١٥٢) ، واتە: ئەو کەسانەی گوێرەکەیان هەڵبژارد بۆ

[1] صحیح الاسناد : رواه ابن جریر (٢٠٨/١٦/٩) ، عبدالرزاق (١٨٢٦) .

پەرستن قین و  غەزەبی پەروەردگاریان بەسەردا دەباریٚ و زەلیلی دنیا بەشیانە ، وەسزای ئەو هەڵبەستکارانەش دەدەین کەگویٚرەکە پەرستیان هەڵبەست و دایان هیٚنا ، هەندیٚك لەپیٚشینەکان فەرموویانە ئەم ئایەتە هەموو ئەو کەسانەش دەگریٚتەوە کە (بدعە)دەکەن و شتی بیٚهودە دادەهیٚنن ، لەگەڵ ئەو سزایەشدا خوای گەورە دەروازەیەکی میهرەبانی هەر بەڕوویاندا کردەوەو فەرمووی: ﴿وَالَّذِينَ عَمِلُوا السَّيِّئَاتِ ثُمَّ تَابُوا مِنْ بَعْدِهَا وَآمَنُوا إِنَّ رَبَّكَ مِنْ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (الأعراف:١٥٣) ، واتا: ئەوانەی کردەوەی خراپەیان کرد و پاشان تەوبەیان کرد و باوەڕیان بەخوای خۆیان هیٚنایەوە ، ئەوانە پەروەردگاری تۆ (ئەی محمد یان ئەی موسا) خۆی لیٚبوردەو بەبەزەییە ، بەڵام لیٚرەدا خوای گەورە تەوبەی لەو کەسانە وەرنەگرتووە کەگویٚرەکەکەیان پەرستبوو هەتا نەکوژریٚن ، واتا: مەرجە بکوژریٚن ، وەکو خوای گەورە دەفەرمویٚت: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ يَا قَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنْفُسَكُمْ بِاتِّخَاذِكُمُ الْعِجْلَ فَتُوبُوا إِلَى بَارِئِكُمْ فَاقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ عِنْدَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴾ (البقرە:٥٤) ، واتە: موسا (علیه السلام) بە گەلەکەی خۆت گوت: ئیٚوە ستەمیٚکی گەورەتان لەخۆتان کرد بەوەی کەئەو گویٚرەکەیەتان پەرست ، دەی تەوبە بکەن بۆلای خوای خۆتان و خۆتان (دەروونی خۆتان) بکوژن ئەوەیان بۆتان باشترە بەلای خوای خۆتانەوە ، ئیتر ئەویش لیٚتانی وەردەگریٚت و هەر ئەو خوایەشە کەتەوبە وەرگر و بەبەزەییە . وتراوە: خوای گەورە ڕۆژیٚکی هیٚنایە پیٚشەوە کە هەریەکە لەوانەی کە گویٚرەکەیان نەپەرستووە و موسوڵمان بوون ،

شمشیٚریان بەدەستەوە گرت و خوای گەورەش تەموتومانیٚکی چڕی ناردەسەریان بەشیٚوەیەك کەکەس نەبینیٚ بەو شیٚوەیەی کەبیناسیٚتەوە ، ئینجا فەرمانی پیٚکردن کەهەموو گویٚرەکە پەرستەکان بکوژن ، تەمەکە بۆئەوەبوو کە نابادا باوك و کوڕ یان خزم و برادەر یەکتری بناسنەوەو دەست لە بیٚبڕواکان و گویٚرەکە پەرستەکان بپاریٚزن ، وتراوە: تەنها لەبەربەیانی ڕۆژیٚکدا حەفتا هەزار کەسیان لەگویٚرەکە پەرستەکان کوشت .

پاشان خوای گەورە دەفەرمویٚت: ﴿ وَلَمَّا سَكَتَ عَنْ مُوسَى الْغَضَبُ أَخَذَ الْأَلْوَاحَ وَفِي نُسْخَتِهَا هُدًى وَرَحْمَةٌ لِلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ ﴾ الاعراف/١٥٤) ئیتر لەوحەکانی هیٚنا کە لەنوسخەی ئەواندا ڕیٚنومایی و ڕەحمەتی خوایی هەبوو بۆ ئەو کەسانەی لەپەروەردگاری خۆیان دەترسن ، هەندیٚ لەزانایان فەرموویانە: ﴿وَفِي نُسْخَتِهَا﴾ مانای ئەوەیە کە لەوحە سەرەتاییەکان شکاوەو خوای گەورە دواتر هیدیکەی بۆ ناردوەتەوە ئەگەر چی لەبیژەی ئایەتەکەدا شتیٚك بەدی ناکریٚ کەمانای ئەوەی هەبیٚ کە لەوحەکان شکابیٚ ، ئەمەش قسەوباسی تر

هەڵدەگرێت ، خوای گەورە زاناترە ، (ابن عباس)یش واباس دەکات لەفەرموودەی (الفتون)دا کەئەوان دوور نیە گوێرەکەیان پەرستبێت ویرە کۆنەکەیان هەر لەکەڵلەدا مابێ ، چونکە کاتێك لەدەریاکە دەربازبوون و گەلێکیان بینی کەبت پەرست بوون ، داوایان لەموسا کرد (علیه السلام) کە پەروەردگاریان بۆ دابنێ ، هەروەکو ئەو گەلە بت پەرستە هی خۆیان دانابوو ، ﴿ قَالُوا يَا مُوسَى اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴾ (الاعراف/١٣٨) .

هەروەها لای (اهل الکتاب)یش هەروایە و دەڵێن: گوێرەکەپەرستی بنی ئیسرائیلییەکان بەر لەوکاتەیان بوە کەبێن بۆ (بیت المقدس) ، وە هەر کە فەرمانیش کرا بەکوشتنی گوێرەکە پەرستەکانیان ، تەنها لە ڕۆژی یەکەم دا سێهەزار کەسیان لێکوشتن ، ئینجا موسا (علیه السلام) کەوتە پاڕانەوە لەخوای گەورە تاکو لێیان خۆش بێ و هیچی تریان لێنەکوژرێ ، خوای گەورەش بڕیاریدا لێیان ببورێ بەمەرجێ بڕۆنە خاکی پیرۆزی (بیت المقدس)ەوە .خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَاخْتَارَ مُوسَى قَوْمَهُ سَبْعِينَ رَجُلاً لِمِيقَاتِنَا فَلَمَّا أَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ..... أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴾(الاعراف/١٥٥-١٥٧) ،سەبارەت بەمانای ئەو ئایەتانە (السدی)[1]و(ابن عباس)[2]و هەندێکی تر فەرموویانە ئەو حەفتا پیاوەی کە موسا(علیه السلام) هەڵیبژاردن تاکو لەگەڵ خۆی بیانبات بۆ کێوی (طور) تاکو لەخوای گەورە داوای لێبوردن بکەن بریتیبوون لەزانایانی (بنو ئیسرائیل) و موسا و هاڕون و یوشەع و ناداب و ئەیبهویان لەگەڵدابوون ، ئەمانە لەلایەن خوای گەورەوە وا فەرمانیان پێکرا کەخۆیان پاك بکەنەوە ، خۆشیان بشۆن ، بەرگەکانیان خاوێن بکەنەوە ، ئینجا ڕۆیشتن ، کاتێك لەگەڵ موسادا (علیه السلام) ڕۆیشتن و لەلوتکەی شاخەکە نزیك بوونەوە کە پەڵە تەم و هەور دایپۆشیبوو ، ناوەڕاستەکەیشی یەك ستوون نووربوو ، دەدرەوشایەوە .

موسا(علیه السلام) چوە لەسەر چیاکە ، (بنو ئیسرائیل) واباس دەکەن کە کۆمەڵەکەش هەموویان گوێیان لەدەنگی خوای گەورە بووە ، ئەم لێکدانەوەیەش هەندێ لەزانایانی تەفسیر پشتیوانی لێدەکەن بەبەڵگەی ئەوەی کەخوای گەورە دەفەرموێت:

﴿أَفَتَطْمَعُونَ أَنْ يُؤْمِنُوا لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِنْ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾ (البقرە:٧٥) ، هەرچەندە ئەمەیان زۆر پێویست نیە ، گرنگ ئەوەیە بەگوێی خۆشیان نەیانبیستبێ یاخود لێی تێنەگەیشتبن ، خۆ موسا (علیه السلام) بەجوانی پێیگەیاندون و تێیگەیاندون هەروەها هەندێ لە (اهل الکتاب) دەڵێن: گوایە ئەو حەفتا کەسە خوای

---

[1] حسن : رواه ابن جرير (٦/٩/٧٢) .

[2] ضعيف الاسناد : ابن جرير (٦/٩/٧٢) .

گەورەیان بینیوە ، ئەمەیان بەتەواوەتی ناڕاستە و هەڵەیەو ، چونکە کاتێك داوای ئەوەیان لەخوای گەورە کرد یەکسەر کێوەکە کەوتە لەرزین و هەژان ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَامُوسَى لَنْ نُؤْمِنَ لَكَ...... ثُمَّ بَعَثْنَاكُمْ مِنْ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ (البقرە:٥٥-٥٦) ، وە لێرەدا دەفەرموێت : ﴿ فَلَمَّا أَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُمْ مِنْ قَبْلُ وَإِيَّايَ ﴾ (الاعراف/١٥٥) .

(محمد کوڕی ئیسحاق)[1] دەفەرموێت: موسا (عليه السلام) حەفتا پیاوی لە (بنی ئیسرائیل) هەڵبژارد کەیەك لەیەکتری چاکترو خواناسترببوون ، وە پێی فەرموون: بڕۆن بەرەولای خوای گەورەو تەوبە بکەن ، لەو کاروبارە خراپانەی پێشووتان ، وە داوای لێخۆش بوون بکەن بۆ ئەو کەسانەی کە لەگەڵتاندا نەهاتوون (واتا: ڕێگەی هاتنیان پێنەدراوە) ، وە بەڕۆژوو بن ، خۆتان پاك بکەنەوە ، بەرگەکانتان پاك بکەنەوە ، ئیتر بەناوی خوای گەورە سەرکەوتن ، حەفتا پیاوەکە داوایان لێکرد کەئەوانیش لەگەڵیدا بکەونەسەرەوە و گوێیان لەدەنگی خوای گەورە بێت ، موساش (عليه السلام) فەرمووی: وادەکەم ، واتا دەتانبەم ، کاتێك موسا (عليه السلام) چوەسەرەوە ستونێك لەهەور و تەم دایپۆشی ، پاشان ئەو هەورە هەموو شاخەکەی داپۆشی ، موسا (عليه السلام) لەهەور و تەمەکە نزیك بوەوە ، وەچوە ناو هەورەکەوەو بە گەلەکەی فەرموو: وەرنەپێشەوە ، جاکاتێك خوای گەورە قسەی لەگەڵ موسادا دەکرد ، موسا (عليه السلام) نورو ڕوناکیەکی گەشاوەو درەوشاوە دەکەوتە سەر ڕوخساری ، کەهیچ کەسێك چاوی بەرگەی ئەوەی نەدەگرت بۆی بڕوانێت .

خەڵکەکە چووەپێشەوە تا بەر پەردەکە کەوتن ، پاشان چوونە ناو هەورە تەمەکەوە ، بەکڕنووشدا کەوتن ، ئەو پیاوانە گوێیان لەدەنگی پەروەردگاربوو کە لەگەڵ موسادا دەدوا و فەرمانی چاکەی پێسپارد و فەرمانی خۆلادان لەخراپەی پێڕاگەیاند ، وابکە ! وامەکە ! .

جا کاتێك خوای گەورە پەیامی خۆی بەپایان گەیاند ، ئیتر هەورەتەمەکەی سەر موسا (عليه السلام) ڕەویەوە ، موسا (عليه السلام) بەرەوڕووی خەڵکەکە هاتوو خەڵکەکەش بەموسایان گوت: ﴿ وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَى لَنْ نُؤْمِنَ لَكَ حَتَّى نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ الصَّاعِقَةُ وَأَنْتُمْ تَنْظُرُونَ ﴾ (البقرە:٥٥) ، واتا: ئەی موسا باوەڕت پێناکەین هەتا بەئاشکرا خوا نەبینین ! لەم کاتەدا

[1] ضعيف الاسناد : ابن جرير (٧٢/٩/٦) .

لەرزەو هەژانێکی گەورە شاخ و کێوەکەی لەرزاندەوەو هەموویان لەناوچوون ، گیانیان دەرچوو ، ئیتر موسا (علیه السلام) کەوتە پاڕانەوە لەخوای گەورەو فەرمووی:﴿ قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُمْ مِنْ قَبْلُ وَإِيَّايَ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ السُّفَهَاءُ مِنَّا ﴾ (الاعراف/١٥٥) ، واتا: ئەی پەروەردگارا خۆ دەتتوانی پێشتریش هەر لەناویان بەریت ، بەمنیشەوە ئەگەر ویستت لەسەر بوایە ئایا لەناومان دەبەریت بەوەی کە نەفامەکانمان کردویانە (واتە: بەهۆی ئەوانەوە ئێمە لەناودەبەیت ؟ خۆ ئێمە لەوان نین .

(ابن عباس)[١] ، (مجاهد)[٢] و (قتادە)[٣] و (ابن جریج)[٤] فەرموویانە بۆیە خوای گەورە بەو لەرزین و ڕاچڵەکاندنە لەناوی بردن ، چونکە ڕێگەیان لەگەلەکەیان نەگرتبوو ، وە فەرمانیان پێنەدەکردن کەواز لەگوێرەکە پەرستی بهێنن ، بەڵکو دەیانگوت: ﴿ إِنْ هِيَ إِلَّا فِتْنَتُكَ ﴾(الاعراف/١٥٥) ، واتا: ئەی پەروەردگارا ئەمە کاری خۆتە کە بەندەکانتی پێ تاقیدەکەیتەوە ، ئەمەش لێکدانەوەی ئەو فەرموودانەیە کە (ابن عباس)[٥] و (سعید کوڕی جوبەیر)[٦] و (ابو العالیە)[٧] و (ربیع کوڕی انس)[٨] و هەندێکی تر لەزانایانی پێشینە و دواییش هەمان لێکدانەوەیان هێناوە ، هەروەکو (هاڕون)یش (علیه السلام) هەرپێشتر فەرمووی بەگەلەکەی: ﴿ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَارُونُ مِنْ قَبْلُ يَا قَوْمِ إِنَّمَا فُتِنْتُمْ بِهِ وَإِنَّ رَبَّكُمُ الرَّحْمَٰنُ فَاتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوا أَمْرِي ﴾ (طه/٩٠) ، ئیتر پاڕانەوەکانی موسا (علیه السلام) بەردەوام بوو ، وەك لەسورەتی (الاعراف) ئایەتی (١٥٥-١٥٦)دا هاتووە ، وەکو ئەو شوێنەی کەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ﴾ ، واتا ڕەحمەتی من هەموو شتێکی گرتوەتەوە ، لەفەرموودەی پێغەمبەرماندا (ﷺ) هاتووە کە فەرموویەتی: (کاتێك خوای گەورە ئاسمانەکان و زەوی دروست کرد ، نووسینێکی لای خۆی نووسی بەسەر عەرشەکەی خۆیەوە کەنووسراوە : ڕەحمەتی من بەسەر توڕەو قینم دا زاڵە[٩] ، هەروەها خوای گەورە

---

[١] حسن : رواه ابن جرير (٧٤/٩/٦) .
[٢] ضعيف الية : ابن جرير (٧٤/٩/٦) .
[٣] حسن : رواه ابن جرير (٧٤/٩/٦) .
[٤] ضعيف الية : ابن جرير (٧٤/٩/٦) .
[٥] ضعيف الية : ابن جرير (٧٧/٩/٦) ، ابن ابي حاتم (٩٠٣٠) .
[٦] ضعيف الية : ابن جرير (٧٧/٩/٦) .
[٧] ضعيف الية : ابن جرير (٧٧/٩/٦) .
[٨] ضعيف الية : ابن جرير (٧٧/٩/٦) ، ابن ابي حاتم (٩٠٣١) .
[٩] متفق علية : البخاري (٧٤٠٤) ، مسلم (٦٩٠٥) .

دەربارەی ڕەحمەتی خۆی دەفەرموێت: ﴿فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ ...... فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ (الاعراف/١٥٧) ، واتا: ئەو ڕەحمەتەی خۆم بۆئەوان دەنووسم کەخۆیان لەخراپە و حەرام دەپارێزن و زەکات دەدەن و وە ئەوانەش کەباوەڕیان بەئایاتی ئێمە هەیە ، دیارە ئەوانەش ئەو کەسانەن کەشوێن پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار کەوتوون (واتە: محمد) (ﷺ) ، دیارە ئەمە ئاماژەیەکی گەورەیە بۆ ئومەتی (محمد) (ﷺ) و موسوڵمانان کەهێشتا پەیدانەبوون ، وە یەکێکە لەوشتە گەورانەی کەخوای گەورە بۆ موسای باس کردووە لەتەفسیریشدا بەووردی باس کراوەو مانای ئەم ئایەتە لێك دراوەتەوە (قتادە)[1] دەفەرموێت: موسا (علیه السلام) فەرمووی: من لەلەوحەکانم دا باسی ئومەتێکم دەیوە کە بەباشترین ئومەت ناوت بردون و فەرمان بەچاکە دەکەن و نەریێ لەخراپە دەکەن ، خوایە ئەوانە بکەرە ئومەتی من ! خوای گەورە فەرمووی: ئەوە ئومەتی ئەحمەدە [2] ، فەرمووی من لەلەوحەکاندا دەبینم ئەو میللەتە دواهەمین میللەتی سەرزەوییە بەڵام پێشبڕکێ دەکەن بۆ چوونە بەهەشت ، خوایە ئەوانە بکەرە ئومەتیمن ! خوای گەورە فەرمووی: ئەوە ئومەتی ئەحمەدە فەرمووی من لەلەوحەکانمدا دیتومە کە ئومەتێك هەیە زانست بەسنگیاندا (کەپێش ئەوان گەلانی تر دەبوایە هەموو شتێك بە نووسراوو بوایە ، هەر کە لەنووسراوەکە لادەچوو هیچیان لەبیر نەدەما) وە خوای گەورە توانای لەبەرکردنی وای پێبەخشیون کە هەرگیز نەیداوە بە ئومەتەکانی تر ، خوایە ئەوانە بکەرە ئومەتی من ! خوای گەورە فەرمووی: ئەوە ئومەتی ئەحمەدە ، فەرمووی: خوایە من لەلەوحەکاندا دیتومە ئومەتێك هەیە بڕوایان بەیەکەم کتێبی خوایی هەیە تا دواهەمین کتێب ، وە هەرکەسێك دەکوژن کەمنیازی گومڕانی کردنی خەڵك بێ ، تەنانەت دەجالیش ، خوایە ئەوانە بکەرە ئومەتی من ! خوای گەورە فەرمووی: ئەوە ئومەتی ئەحمەدە ، فەرمووی: خوایە من لەلەوحەکانمدا دەبینم کە ئومەتێك هەیە خێرو سەدەقەکانیان لەناوگەدەی خۆیاندایە کەچی لای تۆش لێیان وەرگیراوە و یاداشت وەردەگرن لەسەریان ، کەپێش ئەوان هەرکەس وگەلێك خێریان بکردایە ، خوای گەورە ئەگەر خێرەکەر لێوەربگرتنایە ئاگرێك یان هەورە بروسکەیەکی لەئاسمانەوە دەنارد خێرەکەی دەسوتاند ،ە ئەگەر ئەو قوربانی و خێرە وەرنەگیرایە ئەوا قەل و داڵ و شێرو

---

[1] صحيح : رواه عبدالرزاق (٩٣٩) ، ابن جرير (٦/٩/٦٥) ، ابن ابي حاتم (٨٩٦٧) .

[2] ضعيف الية : ابن جرير (٦/٩/٧٤) . (احمد) واتة (محمد) (د.خ) .

ڕێوی گوشتەکەیان دەخوارد ، وە خوای گەورە ئەو خێر و چاکەشیان لێوەردگرێ کەدەوڵەمەندەکانیان دەیدەن بەهەژارەکانیان ، دی خوایە ئەمانە بکەرە ئومەتی من ! خوای گەورە فەرمووی : ئەوە ئومەتی ئەحمەدە ، فەرمووی: خوایە من لەلەوحەکانمدا بینیومە کەئومەتێك هەیە ئەگەر کەسێکیان نیەتی کردنی چاکەیەکی هەبێ ، بەلأم بۆی نەکرێت پاداشتی چاکەیەکی بۆدەنوسرێت ؛ وە ئەگەر کردی ئەوا پاداشتی یەك بەدە تاکو یەك بەحەوت سەد پاداشتی بۆ دەنوسرێ ، فەرمووی: خوایە ئەوە بکەرە ئومەتی من ! خوای گەورە فەرمووی: ئەوە ئومەتی ئەحمەدە ، فەرمووی: لەلەوحەکانمدا بەرچاوم کەوتووە کەئەموتێك هەیە کەخۆیان تکاکارن و تکاشیان بۆدەکرێت ، خوایە ئەوە بکەرە ئومەتی من ! خوای گەورە فەرمووی: ئەوە ئومەتی ئەحمەدە ، (قتادە) دەفەرموێت: واباس کراوە بۆمان کە موسا (علیە السلام) وازی لەلەوحەکان هێناو فەرمووی: ئەی خوایە دەی من بکە بەیەکێك لەکەسانی سەر بەئومەتی ئەحمەد ! گەلێك شتیتر بەدەم موناجاتی موسا (علیە السلام) هەڵبەستراوە کەهیچ بناغەیەکی ڕاست و دروستیان نیە ؛ بەلأم ئێمە لێرەدا ئەوانە باس دەکەین کەدەقی فەرمودە و (آثار)یان لەسەرە .

## پرسیاری موسا پێغەمبەر (علیە السلام) لەخوای

**پرسیاری موسا پێغەمبەر (علیە السلام) لەخوای گەورە دەربارەی نزمترین و بەرزترین پلەکانی خەڵکی بەهەشت:**

(ابن حبان) لە (صحیح)ەکەیدا[1] فەرموودەیەکی هێناوە کەگێڕانەوەکەی دەباتەوە سەر (موغیرەی کوڕی شعبە) کە لەسەر دوانگە فەرمووی: کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: موسا (علیە السلام) پرسیاری لە پەروەردگار کرد کام خەڵك نزمترین پلەیان هەیە لە بەهەشتدا ؟ خوای گەورە فەرمووی پیاوێکە پاش هەموو کەسێك دێتە بەهەشتەوە ، پێی دەگوترێت: برۆ بەهەشت ، ئەویش دەڵێت: بچمە کوێی بەهەشتەوەو چۆن بچم لەکاتێکدا هەموو کەس جێو شوێنی خۆیان بۆ دیاریکراوە . پێی دەگوترێت: ئایا ڕازی بەوەی کەهێندەی یەکێك لەپاشانی دنیات هەبێت ؟ دەڵێت: بەڵێ پەروەردگارا ، پێی دەگوترێت: ئەوەت پێدرا لەگەڵ ئەوەندو ئەوەندەی تریشدا ، ئیتر دەڵێت:پەروەردگارا ڕازیم ، پێی دەگوترێت لەگەڵ ئەوەشدا هەرچی ئارەزووت لێیەتی و چاوت پێی خۆشە بۆتۆیە .

---

[1] صحیح : ابن حبان (٦٢١٦) .

ئینجا موسا (علیه السلام) پرسیاری لەپەروەردگار کرد: چ جۆرە کەسێك پلەوپایەی بەرزترینە لەبەهەشت دا ؟ خوای گەورە فەرمووی: ئێستا لەبارەی ئەوانەوە بۆت دەدوێم ، ئەوانە بەدەستی خۆم کەرامەت و رێزم بۆچاندوون (لە دەرونیاندا) ، وە لەسەر دەرونیان مۆری خۆمم لێداون ، شتێکم بۆداناون کەهیچ چاوێك تاکو ئێستا نەیدیون ، وەهیچ گوێیەك دەنگی ئەو شتانەی نەبیستوە ، هەرگیز وەکو دالْغەو خەیاڵیش بەدڵی هیچ مرۆڤێکدا نەهاتوون ئەمانەم بەخشیوە بەو بەهەشتیە پلەیەکانە ، خوای گەورەش دەربارەی ئەوانە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ فلا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ (السجدە:١٧) ، واتا: هیچ کەسێك نازانێت کەمن چ شتێکی گەورەم بۆئەوانە داناوە ، کە دەبێتە مایەی چاوڕوونی ئەوان ، وەك پاداشتێك بۆ ئەو کارانەی کەکردوویانە لە دنیادا) ، هەروەها (مسلم)[1] بەشێوە گێڕانەوەیەکی تر کەهاومانایە هێناویەتی ، لەگەڵ (الترمذي)داهاودەق و هاو واتان .

هەروەها (ابن حبان)[2] دەیباتەوە سەر (ابو هریرە) کە دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: موسا پرسیاری لەخوای گەورە کرد دەربارەی شەش خەسڵەت کە وایدەزانی ئەوانە تایبەتن بەموسا خۆی ، بەڵام خەسڵەتی حەوتەمیان لای موسا (علیه السلام) خۆشەویست نەبوو ، موسا (علیه السلام) پرسیاری کرد ئەی پەروەردگارا ! کام لەبەندەکانت زۆر تەقواکارە ؟ فەرمووی: ئەوەی کەیادی خوا دەکات و هەرگیز لەیادی ناکات ، پرسی ئایا کام لەبەندەکانت لەهەموویان زیاتر رێی هیدایەتی گرتووە ؟ فەرمووی: ئەوەیان کەلەگەڵ هیدایەتی خواییدایە و شوێنی کەتووە ، فەرمووی کام لەبەندەکانت دادپەروەرترین حوکم دەکات ؟ فەرمووی: ئەوەیان کە ئەگەر حوکمی خەڵکی بکات وەك ئەوە دەیکات کەحوکمی خۆی بکات ، فەرمووی: کام لەبەندەکانت لەهەموویان زاناترە ؟ فەرمووی: ئەو زانایەی کە لەزانست تێرنەبێ و هەمیشە دەیەوێ زانست و زانیاری خەڵکیش بخاتەسەر زانیاریەکانی خۆی ، فەرمووی: کام لەبەندەکانت لەهەموویان بەرێزترە ، فەرمووی: ئەوەی لەکاتی دەسەڵات دا لێبوردەیە ، فەرمووی کام لەبەندەکانت دەوڵەمەنترینیانە ؟ فەرمووی: ئەوەی رازییە بەو بەشەی خوا داویەتیە ، فەرمووی: کام

---

[1] صحيح : مسلم (٤٦٤) ، الترمذي (٣١٩٨) .
[2] حسن : ابن حبان (٦٢١٧) .

لەبەندەکانت لەهەموویان هەژارترە ؟ فەرمووی: ئەوکەسەی کەهەمیشە بەشی خۆی بەکەم دەزانێ؟

پێغەمبەری خۆشەویستمان (محمد) (ﷺ) دەفەرموێت: دەوڵەمەندی ئەوە نیە کە بەبەرچاوەوە هەبوو دیارە ، بەڵکو دەوڵەمەندی ئەوەیە کە لەدڵدایە ، جا ئەگەر خوای گەورە ویستی خێر بێنێتە ڕێی بەندەیەکی خۆی لەناخیدا دەوڵەمەندی دەکات (واتا: دەرونی دەوڵەمەند دەکات) ، وە پارێزکاری دەخاتە دڵییەوە ، وەئەگەر خوای گەورە ویستی شەڕ بێنێتە ڕێی بەندەیەکی خۆی ، ئەو بەندە والێدەکات هەمیشە خۆی بەهەژار ببینێ و خۆی بەهەژار بزانێ .

لە گێڕانەوەیەکی تری (ابن حبان)دا[1]هاتووە کە بڕگەی پرسیارەکەی موسا (علیه السلام) دەربارەی زاناترین کەسواهاتووە کە خوای گەورە لەوەلامیدا فەرمووی: زاناترین کەس ئەو کەسەیە بەدوای فێربوونی زانستی زۆردا دەگەڕێ کەلای خەڵکەکەوە کۆی دەکاتەوەو دەیخاتە سەر زانیاری خۆی ، سابەڵکو وشەیەك بدۆزێتەوە کە ڕێنومایی چاکەی بکات یان لەخراپە لایبدات ، پاشان موسا (علیه السلام) فەرمووی: پەروەردگارا بۆچی کەس لەسەر زەوی هەیە کە لەمن زاناتربێ ؟ خوای گەورە فەرمووی: بەڵێ (خضر) لەتو زاناترە ، ئیتر موسا (علیه السلام) کەوتە گەڕان بەدوای دۆزینەوەی (خضر)دا .

پێشەوا (احمد)[2] فەرموودەیەکی بردۆتەسەر (ابو سعید الخدری) کە دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (موسا (علیه السلام) فەرمووی: ئەی پەروەردگار بەندەی وات هەیە کەزۆر لەخواترس و باوەڕدارە ، بەلام زۆر دەستکورت و هەژارە لەدنیادا ؟ خوای گەورە فەرمووی: ئەو کەسە دەرگایەکی بۆدەکرێتەوە لەدەرگاکانی بەهەشت و لەوێوە بەسەر بەهەشتدا دەڕوانێ ،فەرمووی:ئەی موسا ئەو شوێنەم بۆ ئەو جۆرە کەسانە داناوە

موسا (علیه السلام) فەرمووی: پەروەردگارا سوێند بەعیزەت و جەلالی تۆ ، ئەگەر ئەوکەسە لەدنیادا هەردوو دەست و هەردوو قاچی بڕابێت و بەگەدەخشکێ بڕوات یان ڕابکێشرێت لەو ڕۆژەوە کەدروستت کردووە تا ڕۆژی دوایی ئەوە حاڵی بێت ، بەلام ئەوە شوێن و چارەنووسی بێت لەبەهەشت دا بەڕاستی ئەوکەسە هەرگیز ناڕەحەتی نەدیوەو بێزارنابێ ، پاشان فەرمووی: بەندەی بێبڕوای وات هەیە کەزۆر دەوڵەمەندەو ئاسوودە

---

[1] حسن : ابن جرير في التاريخ (١/٢٢٣) .

[2] ضعيف الاسناد : المسند (٣/٨١) .

دەژی لەدنیادا ؟ فەرمووی: دەرگایەکی دۆزەخی بۆدەکرێتەوە ، ئەی موسا ئەو شوێنەم بۆداناوە ، موسا (عليه السلام) فەرمووی: سوێند بەعیزەت و جەلالی تۆ ئەوکەسە هەموو دنیا بۆ ئەوبێت لەو ڕۆژەوە دروستت کردووە هەتا ڕۆژی دوایی ، بەڵام ئەوە دواهەمین چارەنووسی بێت بەخوا هەرگیز خێروخۆشی لەخۆی نەدیوە .

(ابن حبان)[1] فەرموودەیەکی پێغەمبەری هێناوە (ﷺ) کەدیباتەوە سەر (ابی سعید الخدری) کە پێغەمبەر فەرمووی: (موسا (عليه السلام) فەرمووی: پەروەردگارا شتێکم فێربکە کەیادی تۆی پێبکەم و بەوە لەتۆ بپاڕێمەوە ! فەرمووی: ئەی موسا :﴿ **لا إله إلا الله** ﴾ ، فەرمووی: پەروەردگارا هەموو بەندەکانت ئەوە دەڵێن ، خوای گەورە فەرمووی: بڵێ :﴿ **لا إله إلا الله** ﴾ ، فەرمووی: ئاخر من شتێکم دەوێت تایبەت بێت بەخۆم . فەرمووی: ئەی موسا ئەگەر هەموو ستێکی حەوت ئاسمانەکان و حەوت زەوییەکان بەخۆشیانەوە لەلایەکی لە پیدەستێکدابێت و :﴿ **لا إله إلا الله** ﴾ لەلا پیدەستەکەی تردا بێت ، ئەوا :﴿ **لا إله إلا الله** ﴾ەکە قورسترینیانە .

بۆ پشتیوانی لەڕاستی ئەم فەرموودەیە ، فەرموودەی (البطاقة)[2] هەیە کە لە (السنن)دا[3] هاتووەو پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (گەورەترین نزا نزای عەرەفەیە و گەورەترین شت کە من یان پێغەمبەرانی پێش من فەرموویانە ئەمەیە: :﴿ **لا إله إلا الله وحده لاشريك له ، له الملك وله الحمد وهو علي كل شيء قدير** ﴾ .

(ابن أبي حاتم)[4]دەربارەی ئایەتە الكرسي فەرموودەیەکی بردۆتەوەسەر(ابن عباس) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بەنی ئیسرائیلییەکان پرسیاریان کرد لەموسا (عليه السلام) ئایا پەروەردگارت دەخەوێت؟ فەرمووی: تۆزێ لەخوا بترسن (واتا: پرسیاری بەجێ بکەن) ، فەرمووی: خوای گەورە بانگی موسای کرد و فەرمووی: ئەی موسا پرسیاریان لێت کرد ئایا پەروەردگاری تۆ دەخەوێت ؟ تۆش دوو شوشە بێنە و بیانگرە بەدەستتەوەو شەوهەستەرەوە لەخەو ، موساش (عليه السلام) وایکرد ، کاتێك سێیەکی شەو تێپەری باوێشکی هات و کەوتەسەر چۆکەکانی ، پاشان ڕاست بوەوە دوو شوشەکەی ڕێك کردەوە ، دیسان لەکۆتا بەشی شەودا باوێشك گرتی و خەواڵوبوو ، دوو

---

[1] ماناکەی (صحيح)ە و سەنەدەکەی لاوازە : ابن حبان (٦٢١٨) .

[2] صحيح : رواة احمد (٢/٢١٣) ، الترمذي (٢٦٣٩) ، ابن ماجة (٤٣٠٠) .

[3] صحيح بمجموع الطرق : سنن الترمذي (٣٥٨٥) ، مالك (١/١٨٨) .

[4] حسن : ابن ابي حاتم (٢٥٨٠) ، ابن عباس (٣٢١) ، ابن جرير (٣/٢/٨) .

شووشەکەیشی لەدەست کەوتە خوارەوەو شکان و فەرمووی: ئەی موسا ئەگەر من بخەوم ئەوا زەویو ئاسمانەکان دەکەون و تێك دەشکێن ، هەروەکو دوو شوشەکەی دەستی تۆ شکا ، لەبەرئەوە خوای گەورە ئایەتە الکرسی نارد بۆ پێغەمبەرمان (ﷺ) ، کەباسی لەهەمیشە ئاگایی پەروەردگار دەکات و هەرگیز وەنەوزو باوێشك و خەو دایناگرێت و زانینی ئەو بەسەر هەموو شتێکدایە لەهەموو کاتێکدا . گێڕانەوەیەکی تری هاوشێوەی ئەو فەرموودەیەش هەیە کە لەڕووی واتاوە نزیکە لەم فەرموودەیەو (ابن جریر)[1] هێناویەتی کە دەیباتەوە سەر گێڕانەوەی (ابی هریره) ، هەرچەندە لەوەدەچێ بنەچەی ئەو فەرموودەیە ئیسرائیلیاتی تێدابێ ، خوای گەورە زاناترە .

## چیرۆکی مانگاکەی بەنی ئیسرائیلییەکان

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُوا بَقَرَةً ... لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ (البقره/٦٧-٧٣) ، (ابن عباس)[2] و (عوبەیدەی سەلمانی)[3] و (ابو العالیه)[4] و (مجاهد)[5] و (السدی)[6] و زیاتر لەیەك کەس [7] لەپێشینەکان هێناویانەو لەمانای ئەو ئایەتەدا دەڵێن: پیاوێکی بەنی ئیسرائیل هەبوو کەزۆر دەوڵەمەند بوو ، پیاوێکی پیربوو ، چەند برازایەکی خۆی هەبوو ، کەمردنی مامەپیرەکەیان بەئاوات دەخواست تاکو میراتەکەی بۆئەوان بێ ، یەکێك لەبرازاکانی شەوێك خۆینایەوەو کوشتی و تەرمەکەی لەسەرە ڕێیەکی گشتی فڕێدا ، وتراوە لەبن دەرگای یەکێك لەو پیاوانە ، کاتێك ڕۆژبووەوە خەڵکەکە کەوتنە مقۆمقۆو جەنگ و شەڕ لەنێوان خۆیاندا ، برازاکەی کوژراوەکە هات بەدەم هاوار و لەخودانەوە ، شیوەنی دەکردو گوتی: ئەوە چیتانە بۆچی پەلاماری یەکتری دەدەن ئەوەنیە موسای پێغەمبەری خوا (علیه السلام) لەناوماندایە ، کوڕەکەی سکاڵای حاڵی

---

[1] لایصح مرفوعاً : ابن جریر (٨/٣/٢) .
[2] ضعیف : من روایة عوفي .
[3] صحیح : من روایة أیوب عن ابن سیرین .
[4] ضعیف : من روایة ابي جعفر .
[5] صحیح : من روایة خالد بن یزید .
[6] حسن : من روایة اسباط .
[7] هەموویان ابن جریر گێڕاونەتیەوە (١/ج١ / ٣٣٧-٣٤٠) .

کوشتنی مامەکەی بردەلای موسا (عليه السلام) و موساش (عليه السلام) لەخوای گەورە پاڕایەوە و فەرمووی: ئەو پیاوەکوژەمان بۆ ئاشکرابکە .

خوای گەورە فەرمانی پێکردن کەمانگایەك سەربڕن ، ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُوا بَقَرَةً قَالُوا أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا قَالَ أَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ ﴾ واتە: خوای گەورە فەرمان دەدات بەئێوە کەمانگایەك سەربڕن ، ئەوانیش بەموسایان گوت: ئەوە گاڵتەمان پێدەکەیت ؟ ئێمە داوای چیت لێدەکەین و تۆش فەرمانی چیمان پێدەکەیت ؟ موسا(ﷺ)فەرمووی: پەنا بەخوا دەگرم کەمن گاڵتەتان پێبکەم و لەنەزانان و نەفامان بم ، واتا: بەبێ وەحی خوایی بڕیارو فەرمان دەرناکەم ، کاتێك داواکەی ئێوەم بەخوای گەورە ڕاگەیاند فەرمانی ئەوەی پێکردم ، (ابن عباس)[1] وچەند کەسێکیتر لەواتای ئەو ئایەتەدا هێناویانەو فەرموویانە: کاتێك ئەو داوایە لە (بەنی ئیسرائیلەیەکان) کرا ، دەیانتوانی هەرمانگایەك سەربڕن کە دەیانەوێت ، بەڵام چونکە خۆیان پرسیارو مەرجەکانیان لەسەر خۆیان گران دەکرد ، خوایگەورەش هەرلەسەری گرانتردەکردن .

وە لەفەرموودەیەکی (مرفوع)ی [2] پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە کەئەوان لەبارەی سیفاتی مانگاکەوە پرسیاریان کرد ، پاشان لەبارەی ڕەنگەکەیەوە ، پاشان لەتەمەنی مانگاکە ، خوای گەورەش وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دانەوە ، بەکورتی: ئەوان فەرمانیان پێکرا کەمانگایەکی تەمەن مام ناوەندی سەربڕن ، بەڵام دوایی ڕێگەیان لەبەردەمی خۆیان تەسك کردەوەو پرسیاریان لەڕەنگی مانگاکە کرد ، خوای گەورەش فەرمووی ڕەنگێکی زێڕین و زەردباوی هەیە کەڕەنگێکی دەگمەن و خۆشەویستە لەمانگادا ، بەوەش نەوەستان و پرسیاری تریان کرد و گوتیان: ﴿ قَالُوا ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّنْ لَنَا مَا هِيَ إِنَّ الْبَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ﴾ واتە:ئەی موسا بە پەروەردگاری خۆت بڵێ ئەو مانگایە کامەیە ؟ لەوەدەچێ ئەوەمان دۆزیبێتەوە کە مەبەستە و پشت بەخوا ئێمە ڕێنومایی دەکرێین بۆ دۆزینەوەی زەلامکوژەکە ؛ لەو فەرموودەیەش دا کە لە (ابن ابی حاتم)ەوە بە (مرفوع)ی[3] هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر بەنی ئیسرائیلییەکان خۆیان هێندە باسی سیفەتی ئەو مانگایەیان نەپرسیایە ، بەمەرجەوە ئەو سیفەتانەیان پێدەگوترا) ، هەرچەندە ئەم فەرموودەیە لەڕووی (صحه)وە جێگەی

---

[1] ابن جرير (١/ج١/٣٤٧-٣٤٨) .

[2] مرسل : رواة ابن جرير ، المصدر السابق .

[3] ضعيف : ابن ابي حاتم (٧٢٢) .

سەرنجە ، خوای گەورە زاناترە . ﴿ قَالُوا ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّنْ لَنَا مَا هِيَ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لا فَارِضٌ وَلا بِكْرٌ عَوَانٌ بَيْنَ ذَلِكَ فَافْعَلُوا مَا تُؤْمَرُونَ ﴾(البقرە:٦٨) ، واتا: خوای گەورە دەفەرموێت: ئەو مانگایە ماندونەکراوە بەجووت و ژێرنێر نەخراوە بۆ زەوی کێلاّن و ئاو هەڵگواستن لەبیر ، تەواو لەش ساخە ، وە یەك ڕەنگە و بەڵەك نیە . جا کاتێك مانگایەکی بەو شێوەیان دۆزیەوە ، بە موسایان گوت: تەواوە ئەوە دۆزیمانەوە ئەوەی کە تۆ باسی دەکەیت ، وتراوە ئەو مانگایە هی پیاوێك بوو کە زۆر لەگەڵ باوك و دایکی خۆیدا چاکەکاربوو ، کاتێك داوایان لێکرد بیانداتێ تاکو سەریببڕن ، خاوەنەکەی ڕازینەبوو ، تاکو گوتیان هێندەی کێشی خۆی زێرت دەدەینێ ، هەرڕازی نەبوو ، ئەوانیش ئیشیان بەو مانگایە چارەسەر دەکرا دەڕۆی ، بۆیە هەتا دەهێندەی کێشی خۆی بۆی سەرکەوتن ، ئیتر بەو زێڕە زۆرە کڕییان و ئینجا موسا (علیە السلام) فەرمانی پێکردن کە سەریبڕن .

سەریان بڕی ، کەخەریك بوو سەریشی نەبڕن ، چونکە بەگومان و دوودڵ بوون ئینجا موسا بەلایەن خوای گەورە فەرمانی پێکرا کە بەبەشێك لەلەشی مانگاکە بکێشن بەلەشی مردوە کوژراوەکەدا ، وتراوە: بە گۆشتی لاڕانی مانگاکە پیایاندا کێشا یان بەو ئێسقانەی کە لەودیو کرکڕاگەیەوە ، وتراوە: بەو پارچەیەی کەدەکەوێتەوە نێوان هەردووك شانەوە .

جاکاتێك بەو بەشە بڕاوەی لەشی مانگاکە بەمردوەکەیاندا کێشا ، خوای گەورە مردووە کوژراوەکەی زیندووکردەوە ، کابرا هەستایەسەرپێ و تەماشای ئەملاولای خۆی کرد ، موسا (علیە السلام) پرسیاری لێکرد کێ تۆی کوشت ؟ گوتی: برازاکەی خۆم ، پاشان پیاوەکە مردەوە .

لەم بارەیەوە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ كَذَلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَى وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ واتە: هەروەکو ئەو مردووەتان بینی کە زیندوومان کردەوە ، ئاواش هەموو مردویەك زیندو دەکەینەوە ، لەهەر کاتێکدا خوای گەورە بیەوێ هەموو مردوەکان پێکەوە لەئاستی خۆیان زیندو دەکەینەوە ، هەروەکو چۆن ئێوەمان بەتاکە نەفسێك دروست کردووە هەروا بەتاکە نەفس زیندوتان دەکەینەوە ﴿مَا خَلْقُكُمْ وَلا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴾ (لقمان:٢٨) .

## چیرۆکی موساو خضر ( سلاْوی خوایان لەسەر بێت )

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَاهُ ......... مَا لَمْ تَسْطِعْ عَلَيْهِ صَبْرًا﴾ (الكهف:٦٠ – ٨٢) ، ئەم ئایەتانە باس لەچیرۆکی پەیوەندی نێوان موساو خضر دەکەن (علیه السلام) کە بەکورتی لێرەدا باسی دەکەین .

هەندێ لە (اهل الكتاب) گوتویانە: ئەو موسایەی کە ڕۆیشت بۆلای خضر ، بریتی یە لەموسای کوڕی میشای کوڕی (یوسف)ی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم (علیه السلام) ، بۆئەمەش هەندێ بەلْگەی کتێبی خۆیان لەبەردەستدایە ، کەیەکێك لەوانەی زانای ئەم جۆرە باسانەیانە لای ئەوان ناوی (نۆف)ی کوڕی ( فضالة)ی حەمیری شامی بەکالی یە ، وتراوە دیمەشقی یەو دایکیشی ژنی (كعب الأحبار)بوە ، بەلاْم ئەوەیان ڕاستە کە ڕوکاری ئاشکرای قورئان دەری دەخات کە ئەو موسایە ، موسای ، موسای کوڕی (عمران)ە (علیه السلام).

(پێشەوا بوخاری )[1] دەیباتەوە سەر (سعید کوڕی جوبەیر) کە دەلْێت: پرسم لە (ابن عباس) (نوف)ی بەتالی دەلْێت : موسا هاوەلْی خضر بوە ، بەلاْم نەك موسای بەنی ئیسرائیلی یەکان ، (ابن عباس) فەرمووی: دوژمنی خوا درۆدەکات ، ئەوەتا (ئوبەی کوڕی کەعب) دەگێڕێتەوە و دەلْێت : گوێم لیْ بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (ڕۆژێك موسا وتاری دەدا بۆ بەنی ئیسرائیلی یەکان ، پرسیاریان لیْ کرد : کیْ زاناترین کەسە؟

موسا (علیه السلام) فەرمووی: من ، خوای گەورەش سزای دا بەوەی کەزانایی یەکەمی نەدایە پالْ خوای گەورە ، بۆیە وەحی بۆناردو فەرمووی : ئەی موسا بەندەیەکم هەیە لەدوا وانی دەریاکاندا دەژی ،ئەو لەتۆ زاناترە ، فەرمووی : ئەی خوایە چۆن بگەمەلای ، فەرمووی :دوای نەهەنگێك بکەوە ، لەکویْ نەهەنگەکەت لیْ دیارنەما ،لەویْ بۆ ئەو پیاوە بگەڕیْ ، موساش شوێن نەهەنگێکی دیاری کراو کەوت ، لەگەلْیا ڕۆیشت ......ڕۆیشت (یوشەع)ی کوڕی نونیشی لەگەلْدابوو ، کەکوڕێکی لاوبوو ، تاگەیشتنە بەردێك ، سەریان لەسەر بەردەکە داناو خەویان لیْ کەوت ، نەهەنگەکە خۆی لەلاوانەکەداو هاتە دەرەوە ، – واتا لەتۆڕە بزێوەکە–ترازاو کەوتە دەریاکەوە و کەوتە ڕێگەبڕین بەدەریاکەدا ، خوای گەورە کارێکی کرد کە نەهەنگەکە وشوێن ئاراستەی ئاوەکە بکەوێت ، ئیتر وەکو سەراوکەوتە بەسەریا گوزەری کرد ، کاتێك بەئاگا هاتەوە –لاوەکە–بیری نەبوو

---

[1] صحیح : النجاری (٤٧٢٥)

نەهەنەگەکە وەبیری موسا بخاتەوە ، لەبەرئەوە ئەو ڕۆژە تائێوارە ڕێگەیان بڕی و پاشان شەوەکەیشی هەر ڕۆیشتن ، تاکو ڕۆژە تائێوارە ڕێگەیان بڕی و پاشان شەوەکەیشی هەر ڕۆیشتن ، تاکو ڕۆژیان لیّ هات ، موسا (علیه السلام) بەلاوەکەی گوت: ﴿ آتِنَا غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا ﴾، موسا (علیه السلام) هەتا ئەو شوێنەی کە خوای گەورە بۆی دیاری کردبوو .ئینجا گەنجەکە بەموسای گوت : ئەزانیت لای بەردەکە جلّەوبەندی نەهەنگەکەمان لەبیرچوو ، دیارە شەیتان لەبیری بردمەوە ، نەهەنگەکە لەڕەوتی خۆی بەردەوام بو ، موساو لاوەکەش لەسەرسامی خۆیان بەردەوام بون ، موسا (علیه السلام) فەرمووی: تازە ئەوەمان بەسەرهات و بەشوێن پێی خۆیاندا گەڕانەوە تاکو چونەوەسەر بەردەکەی پێشوو ، پیاوێکیان بینی بەکراسەکەی خۆی داپۆشیبوو ، موسا (علیه السلام) سلاّوی لەو پیاوە کرد ، –کە خضر بوو–تۆ کیّ‌ی وا لەولاّتی ئێوە سلاّو هەیە ؟ فەرمووی من موسام ، گوتی : موسای بەنی ئیسرائیلی یەکان ؟ فەرمووی : بەڵیّ ، هاتوم بۆلات تاکو هەندیّ لەو زانیاریەی خۆتم فێر بکەیت ، پیاوەکە فەرمووی: ﴿ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴾واتا: تۆ لەگەڵ من هەڵناکەیت و ئارامت نیە ، ئەی موسا من ئەو زانیاریەم هەیە کە خوای گەورە فێری کردوم و فێری کەسی تری نەکردوە ، وەتۆش خوای گەورە زانیاریەکی پێداوی کەبەکەسی تری نەداوە ، موسا (علیه السلام) فەرمووی: پشت بەخوا دەمبینی ئارام دەگرم و لەفرمانت یاخی نابم ، خضر فەرمووی ئەگەر لەگەڵ مندابیت هەرچیم کرد پرسیارم لیّ مەکە هەتادوایی خۆم بۆت باس دەکەم ، ڕێك کەوتن و ڕۆیشتن ، گەیشتنە کەناری دەریاکە ، کەشتی یەك هات و پێیان وتن کە هەڵیانبگرن ،ئەوان (خضر)یان ناسی (علیه السلام) لەبەر ئەوە بەبیّ کریّ هەڵیانگرتن ، هەرکەسەرکەوتن ، (خضر)(علیه السلام) پەلاماری پلێتی کەشتیەکەی داو شکاندی ،موسا (علیه السلام) پێی گوت ئەمانە بەبیّ کریّ ئێمەیان هەڵگرت کەچی تۆ کەوتیتە شکاندنی کەشتیەکەیان ؟ ئاوابکەی ئاخر کەشتیەکە نقوم دەبیّ و ئەمەش ئیشێکی نابەجیّ‌یە تۆ دەیکەیت . (خضر) (علیه السلام) فەرمووی : ئەی من پێم نەگوتی تۆ لەگەڵ من هەڵناکەیت ، فەرمووی : بمبوورە ، لەبیرم چوو کارم لیّ مەئاڵۆزکێنەو لەهاونیشینی و باوەڕیت دەرم مەکە ، جاری یەکەم موسا (علیه السلام) ئەوەی لەبیر چوبوەوە ، پاشان چۆلەکەیەك هات و بەلێواری کەشتیەکەوە نیشتەوەو دەنوکێکی لەئاوەکەداو خواردیەوە ، (خضر) (علیه السلام) بەموسای فەرموو (علیه السلام) زانستی من و هی تۆش بەبەراورد بەزانستی خوای گەورە هێندەی ئەو ئاوەنابیّ کەئەو چۆلەکە یە لەئاوی دەریاکەی خواردەوەو کەمیکرد ، پاشان گەیشتنە جیّ‌ی خۆیان و لەکەشتیەکە

دابەزین ، بەپێ بەکەناری دەریاکەدا ڕۆیشتن کەمناڵێکیان بینی خەریکی یاری کردن بوو لەگەڵ مناڵانی تر ، (خضر) هەر مناڵەکەی گرت و کوشتی ، موسا (علیه السلام) پێی گوت : (ئەوە بۆچی مناڵێکی بێ تاوانت کوشت بەناهەق بەڕاستی شتێکی ناباشت کرد ، (خضر)گوتی : ئەدی پێم نەگوتی تۆ لەگەڵ من هەڵناکەیت و ئارام ناگریت ، پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) فەرمووی: ئەمەیان لەیەکەم توندتربوو ، (خضر) (علیه السلام) گوتی:ئەگەر دوای ئەم ڕوداوە لەهۆکاری هیچ کارێکی تری من بپرسی ، ئیتر هاوڕێیەتیم مەکە ، ڕۆیشتن تاکو گەیشتنە گوندێك کەکاتی نان خواردن بوو ، داوایان کرد نانیان بدەنێ ، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون ، موساو خضر (علیه السلام) دیوارێکی ڕوخاویان لەگوندەکەدا بینی (خضر)(علیه السلام) دەستی کرد بەچاککردنەوەی دیوارەکە ،موسا (علیه السلام) بەسەرسامی پرسی : ئێە هاتینە ئەم گوندە ، ئەوان دەریان کردین و نانیان نەداینێ و میوانداری ئێمەیان نەکرد ، کەچی تۆ دیواری ڕوخاویان بۆچاك دەکەیتەوە کە دەکرێت داوای کرێی لێ بکەیت ، (خضر)(علیه السلام) بەموسای فەرموو (علیه السلام) ئالێرەدا من و تۆ لێك جیا دەبینەوە ، وەرە باهۆی ئەو کارانەت پێ بڵێم کە من کردمن و تۆ ئارامت لەسەر نەگرتن ، ئیتر هۆکارەکانی بۆ ڕوون کردەوە ، کەشکاندنی کەشتیەك لەبەرئەوەبو کەپیاوانی پاشا کەشتی ساخیان بەسۆخرە دەگرت و بۆخۆیان قۆرخیان دەکرد ، شکاندم تاکو عەیبداری بکەم و بەسۆخرە نەیگرن ، مناڵەکەشی خۆی بێ بڕوا بوو [1] ، بەڵام دایك و باوکی موسڵمان بوون ، ترسام ببێتە مایەی ئازار دانیان ، دیوارەکەش میراتی و زێڕی دوومناڵی هەتیو لەژێردا شارابوەوە ، کەئەگەر دیوارەکەیە نەمایە زێڕەکە دەدۆزرایەوەو مناڵەکە نەدەبوە خاوەنی مافەکەی خۆی .

(پێشەوا بخاری)[2] بەگێڕانەوەیەکی تریش فەرمودەکەی هێناوە ، کە هاوواتای ئەوی ترە ، کەتیایدا هاتوە : کەئەو بەردەی موساو یوشەع سەریان کردبوە سەری سەرچاوە ئاوێکی تێدابوو کەپێی دەگوترا ئاوی ژیان ، هەرشتێ بەرئەو ئاوەبکەوتایە زیندودەبوەوە ، نەهەنگە مردوەکەشیان کەبەسەر ئاوەکەدا دەیانبرد ، بەرئاوەکە کەوتبوو ، بۆیە زیندوو بوەوەو کەوتبووە جوڵەو لەتۆڕەکە دەربازببوو بەرەو ناودەریاکە ، هەروەها (البخاري)[3] فەرمودەیەکی پێغەمبەری هێناوە (ﷺ) کەبردویەتیەوە سەر (ابن عباس) کە هاو واتای

---

[1] خوای گەورە (خضر)ی تێگەیاندوە کە ئەو مناڵە بێ بڕوادەردەچێت

[2] صحیح: البخاري (٤٧٢٧)

[3] صحیح : البخاري (٢٢٦٧)

فەرموودەی پێشووترە ، تەنها جیاوازیەکی دەنووسین : کاتێك موسا (علیه السلام) ویستی شوێنی (خضر)بزانێ ، پرسی لەپەروەردگار ئەو پیاوە لەکوێ یە ؟ خوای گەورە فەرمووی (نەهەنگێکی مردوو لەگەڵ خۆتا بەرەو بەکەناری دەریادا برۆ ، لەکوێ نەهەنەگەکە زیندووبوەوە ئەوە دواوانی دەریاکانەو خضر لەوێ یە ، موسا (علیه السلام) بەولاوەی فەرموو –کەیوشەعی کوڕی نون بوو–ئەرکێکی زۆرت لێ داواناکەم ، تەنها ئەوە نەبێ لەکوێ نەهەنگەکەت لێ دابڕا پێم بڵێ ، ئەوەبو گەیشتنە لای بەردێك و لەبن سێبەری بەردەکە (موسا) (علیه السلام) خەوی لێ کەوت ، نەهەنگەکەش خۆی لەبەردەکە دابوو ، زیندوبووەوە ، لاوەکەش گوتبووی: جارێ موسا خەوتوەو هەڵی ناسێنم لەخەو ، نەهەنگەکەش وردە وردە بەرەودەریاکە کشابو بەڵام شوێنی ڕۆیشتنەکەی لەدەریاکەدا دیاربوو ، تەنانەت لەسەر بەردەکەش شوێنەواری دیاربوو ، گەڕانەوە دواوە و لەوێدا (خضر)یان بینی کە پاڵی دابوەوە و کراسەکەی لەخۆی ئاڵاندبوو ، دەستێکی نابوە ژێر سەری و دەستەکەی تری لەژێر دووقاچی خۆی دانابوو ، موسا (علیه السلام) سەلامی لێ کرد ، (خضر) (علیه السلام) کراسەکەی لەسەر دەم وچاوی لاداو پرسی : بۆلەخاکی تۆ واتا لەوڵاتی ئێوە سڵاوکردن هەیە ؟ ئەی تۆکێیت ؟ فەرمووی : من موسام .........تاکۆتایی فەرمودەکە .

وتراوە : دیوارەکەش موسا (علیه السلام) هەڵی گرتەوەو ڕاستی کردەوە ، وە ئەوپاشایەی کەشتیەکانی بە سۆخرەدەگرت ناوی (هُدد)کوڕی (بُدبد)بووەو مناڵەکەش ناوی (جیَسور)بوە ،وتراوە:مناڵەکەیان گۆڕیوە بە (جاریە)و نەیانکوشتوە ، دەربارەی خاوەنی دیوارە ڕوخاوەکەش وتراوە : خاوەنەکەی دوومناڵی هەتیوبون کەناویان (أصرم و صریم)بوەوباوکیان ناوی (کاشح)بوە ، وتراوە ئەو میراتیەی لەژێر دیوارەکەدابوو زێڕ بوە [1]وەك عکرمە وای فەرموە ،وە وتراوە زانیاری بووە [2]وەك (ابن عباس) وای فەرمووە ، لەوە دەچێ لەوحێکی زێڕ بوبێ کەزانست و زانیاری لەسەر نووسرابوبێت . (البزار)[3] لەفەرمودەیەکی بردۆتەوەسەر (ابي ذر) کە دەفەرموێت : (ئەو گەنجینەیەی خوای گەورە لەقورئاندا باسی کردوە لەوحێکی زێڕین بوە ،کەلەسەر نوسراوە : سەرم سوڕماوە لەوکەسەی لەقەدەر دڵنیایە ، وە سەرم سوڕماوە لەوکەسەی کەباسی دۆزەخی بۆکراوە ،

---

[1] صحيح : ابن جرير (٩ / ١٦ / ٦ )

[2] ضعيف اليه : ابن جرير (٩ ‌/ ١٦ / ٥)

[3] ضعيف : البزار (٤٠٦٥)

چۆن پێکەنینی دێت ؟ وەسەرم سوڕماوە لەوکەسەی باسی مەرگی بۆکراوە چۆن لێی بێ وئاگایە ؟ هیچ پەروەردگارێك نیە جگە لە (الله) ، وە محمد پێغەمبەری خوایە) ، (حسن البصری)[1] و (عمر مولاغفره)[2] (جعفر الصادق)یش[3] هەربەو شێوەیە گێڕاویانەتەوە .

دەربارەی باوکی دوومناڵە هەتیوەکەش وتراوە : باپیرەی حەوتەمی ئەو دوومناڵییبوە ، یان باپیری دەیەم ، بەهەرحاڵ گرنگ ئەوەیە ئەو پیاوە پیاوچاك بوە کەئامۆژگاری باشی بۆ نەوەکانی داناوە . وشەی (رَحمَةً منْ ربِّك)بەڵگەیە لەسەر ئەوەی (خضر) (ﷺ) پێغەمبەر بووە ، یان ڕەوانەکراوی خوابوەو سەربەخۆماری نەکردوە بەبێ فرمانی خوا ، وتراوە : پیاو چاك بوە ، یان لەوە سەیرتر وتراوە (فریشتە)بوە ، لەوانەش سەیرتر ئەوەیە کەوتراوە گوایە (کوڕی فرعون)بوە ، وەوتراوە : کوڕی ئەو (ضُحاك) بوەکە ماوەی هەزار ساڵ پاشای سەرزەوی بوە بەگشتی .

(ان جریر) دەفەرموێت : جمهوری زانایانی (اهل الکتاب) لەسەر ئەوەن کە (خضر) (علیه السلام) لەسەردەمی (ئەفرەیدون)دا ژیاوە ، یان لەسەرەتای دەرکەوتنی(ذي القرنین ) دابوە ، کە دەڵێن : ئەو (ذي القرنین) ە ش هەر (ئەفرەیدون) بوە یان (ذوالقرنین )کەلە سەردەمی (ابراهیم خلیل)دا بوە (علیه السلام) ، وە دەڵێت: گوایە ئەولەو ئاوی زیندەگی یە خواردۆتەوە و تائێستاش لەژیاندایە ، هەروەها ئەمانەی خوارەوەش دەربارەی (خضر) (علیه السلام) وتراوە: دەچێتەوە سەر بن و بنەچەی ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە (ابراهیم) (علیه السلام) هێناوە کاتی خۆی و لەگەڵ ئەو هاجەرەخاندا لە (بابل)ەوە کۆچیان کردوە، ناوی (ملکان)بوە ، یان ناوی (ئەرمیای کوڕی خەلقیا)بوە ، پێغەمبەرێك بوەلەسەردەمی (سەباسب)ی کوڕی (بەهراس)دا ، (ابن جریر) دەفەرموێت: بەڵام ماوەی نێوان (ئەفریدون)و (سەباسب)چەندین سەدەو چاخی دوورودرێژ بوە کە مێژوونووس و ڕەگەز ناسەکان ئەو ڕاستیە دەزانن .

(ابن جریر) دەفەرموێت :ئەوە ڕاستە کە بوترێ لەسەردەمی (ئەفرەیدون)دابووەو تەمەنی درێژ بوە تاکو هاتنی (موسا) (علیه السلام)،کاتی پێغەمبەرایەتی موساش (علیه السلام) لەکاتی دەسەڵاتی (مەنوشەهر)دابوەکە کوڕی (أبرج)ی کوڕی (أفریدون) بوە کەپاشایەکی فارسەکان بوەو دەسەڵاتی پاشایەتی لە (ئەفریدون)ی باپیری یەوە بۆماوەتەوەو ،

---

[1] ضعیف : ابن جریر (٩ / ١٦ / ٥ )

[2] جید : ابن جریر (٩ / ١٦ / ٥)

[3] ضعیف: ابن جریر (٩ / ١٦ / ٥)

پیاوێکی دادپەروەر بوە ،یەکەم کەسیشە کە خەندەقی لێداو لەهەموو گوندێك پیاوێکی دیاری کرد بۆ سەرۆکاری گوندەکە ، ماوەی دەسەڵاتداریشی نزیك بوەلەسەدو پەنجا ساڵەوە ، وتراوە : دەچێتەوەسەر وەچەی (اسحاق)پێغەمبەر (علیه السلام) واباس دەکەن کەسێکی زمان پاراوو قسەڕەوان و بیرتیژ و وتار زان بوە ، بەجۆرێك کە گوێگری سەرسام کردوە ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەچێتەوە سەر بنەماڵەی (ابراهیم)(علیه السلام) ، خوای گەورە زاناترە ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ ......... وَأَنَا مَعَكُمْ مِنَ الشَّاهِدِينَ﴾ (آل عمران:٨١) لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە باس لەوە دەفەرموێت کەهەر لەسەرەتاوە پەیمانی لەپێغەمبەران وەرگت کەباوەڕ بەو پێغەمبەرانە بهێنن کە لەدوای خۆیان دێن و پشتیوانیان بکەن ، دیارە ئەو پەیمانە پێغەمبەری خۆشمان (محمد) (ﷺ) دەگرێتەوە .

کەواتە دەبوایە (خضر)(علیه السلام) ئەگەر لەژیاندا بوایە ، تەنانەت ئەگەر پێغەمبەریش بوبێت دەبوایە باوەڕی بە پێغەمبەری خۆمان (محمد)(ﷺ) بهێنایەو شوێنی بکەوتایە هیچ نەبێ لەجەنگی بەدر بەشدار بوایە ، کە (جبریل)و گەورە فریشتەکان بەشدارییان کرد ، کە (جبرئل) (علیه السلام)خۆی سەرۆکی فریشتەکانەو موساش (علیه السلام) لەلای خواوە لە (خضر) گەورەترو پایەدارترە ، بەڵام ڕاست وایە بگوترێ : (خضر) (علیه السلام) ڕەوانەکراوی خوابوە ، هەندێ و تویانە (وەلی)بووە ، ئەگەر وەلی بوبێت ئەبوایە لەڕیزی ئەو کەسانەدا بوایەکە هەرزوو باوەڕیان بە (محمد)(ﷺ) هێناو شوێنی کەوتن ،یان هیچ نەبێ جارێك لەجاران سەردانی پێغەمبەری خوای دەکرد (ﷺ) بەڵام هیچ فەرمودەیەکی دروست و ڕاست لەوبارەیەوە نیە ، جگە لە فەرمودەیەك نەبێ کە (الحاکم)بە (اسناد)ێکی لاواز گێڕاویەتیەوە خوای گەورە زاناترە .

## چیرۆکی قارون لەگەڵ موسادا ( علیه السلام )

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِنْ قَوْمِ مُوسَى فَبَغَى عَلَيْهِمْ وَآتَيْنَاهُ مِنَ الْكُنُوزِ...... وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ (القصص: ٧٦- ٨٣) بۆ واتای ئەو ئایەتانە بڕوانە تەفسیرە کوردیەکان

(الاعمش) فەرمودەیەکی بردۆتەوە سەر (ابن عباس)[1] کە فەرمویەتی: قارون ئامۆزای موسابوە، هـەروەها ئەمانەش هەروایان فەرمووە (ابراهیم النخعي)[2]، (ابن

[1] صحيح اليه : ابن ابي حاتم (١٧٧٤)، طبري تاريخ (١ / ٢٦٥) .

[2] صحيح اليه : ابن جرير في التاريخ (١ / ٢٦٢ )

نوفل)[1]، (سَماك كوڕی حرب)[2]، (قتادة)[3]، (مالك كوڕی دینار)[4]، (ابن جریج)[5]، ئەوەیشی بۆ زیاد كردوەكە دەڵێت : (قارون كوڕی یصهب كوڕی قاهث)ە، وە موساش (علیه السلام) كوڕی (عمران)ی كوڕی (قاهث)ە ، (ابن جریر) دەفەرموێت: ئەوەبۆچوونی زۆربەی زانایانەو بەرپەرچی بۆچونەكەی (ابن اسحاق)ی داوەتەوە كە فەرمویەتی قاڕون مامی موسابوە ، (قتادە)[6] فەرمویەتی : پێی دەگوترا (النور)چونكە دەنگی زۆر خۆش بوە لەخوێندنەوەی تەوڕات دا ، بەڵام شەیتان توشی نیفاقی كرد هەروەكو (السامِّری)یشی والێكرد ، قاڕون لەخۆی بایی بوو بەهۆی دەوڵەمەندیەكەوە ، وە (شەهری كوڕی حەوشەب)[7] دەڵێت : بەرگەكانی خۆی بستێك درێژتر كرد لەهی خەڵكی ترو گەلەكەی تاكو شانازیان بەسەردابكات ، وەخوای گەورەش باسی گەنجینە و سامانی قارونی كردوە ، تەنانەت دەفەرموێت : كەپیاوانی زۆر ئازانەبێت كەس نەیتوانیوە كلیلی گەنجینەكانی هەڵبگرێ ، وتراوە : كلیلەكان لەپێست و چەرم دروست كراون و باری شەست هێستر بوون ،خوای گەورە زاناترە ،گەلێك لەئامۆژگاریكارانی گەلەكەی ئامۆژگارییان كردو پێیان گوت : كەزۆر بەو ماڵە دڵخۆش مەبەو لەخۆت بایی مەبە، وەك قورئان دەفەرموێت : ﴿لاتفرحْ ان الله لایُحبُّ الفرحینَ وَابتغ فیما أتاك الله دار الآخرة﴾واتا: هەوڵ بدەبەو سامان و ماڵە پاداشتی دواڕۆژت مسۆگەر بكەیت ﴿وَلا تَنسَ نَصیبكَ من الدّنیا﴾بەش خۆش گوزەرانی دنیاش لەیادنەچێ بەحەڵاڵی ﴿وَاحسنْ كما أحسَنَ الله إلیك﴾، چاكە بكە هەروەكو خوای گەورە چاكەی لەگەڵ كردویت ﴿وَلا تَبغِ الفَسادَ في الآرضِ﴾خراپەكاری لەسەرزەوی بەرپامەكەو وەدوی مەكەوە ، ئەگینا دوورنیە خوای گەورە ماڵ و سامانەكەت لێ بسەنێتەوە چونكە ﴿ان الله لایحِب المُفسِدینَ﴾ بەڵام ئەو نەك هەر ئامۆژگاری كەسەكانی وەرنەگرت ، بەڵكو بەناشیرینی وەڵامی دانەوەو گوتی: ﴿إنَّما أوتیتُهُ عَلي عِلْمٍ عِندي﴾،واتا : خوای گەورە بۆ خۆی دەزانێت كەمن شایستەی ئەوەم بۆیە ئەو هەموو ماڵ و سامانەی بەسەردا ڕشتووم ، مەبەستی ئەوەیە كە من هەرگوێ لەقسەی ئێوەش ناگرم ، بەڵام خوای

---

[1] ضعیف : نفس المصدر (١ / ٢٦٥)

[2] صحیح الأسناد : ابن جریر (١١ / ٢٠ / ١٠٦)

[3] صحیح الأسناد : ابن جریر (١١/ ٢٠/ ١٠٦)

[4] صحیح الأسناد : ابن جریر (١١/ ١٠٦/٢٠)

[5] ضعیف الیه : ابن جریر (١١ / ٢٠ / ١٠٦ )

[6] صحیح الأسناد : ابن جریر (١١ / ٢٠ / ١٠٦)

[7] ضعیف الیه : ابن جریر (١١ / ٢٠ / ١٠٦ )

گەورە بەرپەرچی دایەوەو فەرمووی: ﴿أولم يعلم ان الله قد اهلك من قبله من القرون من هو اشد منه قوة وأكثر جمعاً ولايسأل عن ذنوبهم المجرمون﴾.واتا ئەدی ئەوە نازانن کە چۆن خوای گەورە پێش ئەویش گەلێك کەس هەبون کەلەو بەهێزترو دەوڵەمەندتربون بەڵام بەهۆی سەرکەشی و تاوانەکانیەنەوە لەناومان بردن.

دیارە ئەگەر قسەی قارون ڕاست بوایە کەواتە دەبوایە ئەو دەوڵەمەندانەی پێش قارونمان سزانەدایە ،وە پێدانی ئەوسامانەش بەڵگەنیە لەسەر ئەوەی کەئێمە خۆشمان دەوێت ، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَمَا أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ ....صَالِحاً ﴾(سبأ:٣٧) واتا: ماڵ و منداڵتان هیچ لە ئێمەتان نزیك ناکاتەوە مەگەر کەسێك خۆی باوەڕ دارو کردەوە چاك بێ ، هەروەها لەئایەتی (٥٥- ٥٦ )دا لە سورەتی (المؤمنون) خوای گەورە باس لەوەدەکات کەئەگەر کەسێك ماڵ و منداڵمان پێ بەخشی واگومان نەبات ئەوە هەر خێرمان بەسەردا هەڵڕشتوە ، بەڵکو هەندێ لەوانە بەڵاْن و ئەوان بەخۆیان نەزانیوە و نازانن .

هەندێ کەس گومانیان وایەکە گوایە قارون پیشەو زانستی کیمیای زانیوە ، یاخود ناویهەرە گەورەی خوای گەورەی دۆزیوەتەوەو بەو ناوەوە داوای سامان و ماڵی لە خوا کردوەو نزاکەی وەرگیراوە ، ئەوبۆچونە ڕاست نییە چونکە کیمیا زانستە و هیچ فێڵ و تەڵەکەیەکی تێدانیە ، وە مرۆڤ ئەگەر موسڵمان نەبێ بابەناوی هەرە گەورەی خواوە لەخواش بپاڕێتەوە ، خوای گەورە نزای بێ باوەڕان وەرناگرێت ، قارونیش لەناوەڕۆکدا بێ باوەڕو لەڕوکەش دا دوو ڕوو بووە .

﴿فَخَرَجَ علي قومه في ز ينته﴾(القصص: ٧٩)، واتا قارون بەوپەڕی کەشخەیی و جل و بەرگی ڕازاوەو یاوەرو سوارچاکێکی زۆرەوە هاتۆتە ناو گەلەکەی و خەڵکی سەرسام کردوە ، هەندێ لەوانەی دیویانەو هەر ڕازاوەیی و سامانی دنیایان مەبەست بوە ، خۆزگەیان پێ بردوەو بریایان هەڵکێشاوە کە ئەوانیش وەکو ئەو بونایە ! گوتیان: ﴿يالیت لنا مثل ما أُوتِيَ قارونُ إنّه لذو حظ عظيم﴾، واتا : (خۆزگە ئێمەش وەکو قارون دەوڵەمەند بوینایە ، بەڕاستی چانس و بەختێکی گەورەی هەیە!)، بەڵام مرۆڤە ژیرو زاناو خاوەن زانست و داناو خواپەرستەکان وەڵامی ئەوکەسەنەزان و خۆزگە خوازانەیان دایەوە و گوتیان : ﴿ويلكم ثوابُ الله .................وعمل صالحاً﴾ (القصص : ٨٠)، واتا داماوی نە! بەوەیلداچن ، پاداشتی خوا زۆرباشترە – لەوەی ئەو – بۆئەوکەسانەی باوەڕدارو کردەوە

چاکن ، چونکه ئەوەیان نەبڕاوەو تاسەرە و ئەمەیان لەگەڵ تەمەنی مرۆڤ دایە و دەبڕێتەوە.

چەند جوانە هەندێ لەپێشینەکان فەرمویانە : خوای گەورە لەکاتی هەبوونی شتی گوماناوی لەناو خەڵکدا ئەو چاوە تیژانەی خۆش دەوێ کەبەسەر ئەوشتە سادانەدا ڕادەبورن و قوڵتر دەبینن لەچاوی ساکاری گوماندارەکان و وەلەکاتی بڵاوبونەوەی شوێنکەوتنی ئارەزووەکاندا لەناو خەڵکی داوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کەخاوەن ژیری یەکی تەواون .

﴿فَخَسفنابه ..............وما كان من المُنتصرين﴾(القصص: ٨١) واتا: زەوی ژێر پێی قارون و خانوەکەیشیمان بەزەوی دا ڕۆچوان ، ئەو دەمەش دەستەو گروپێك نەبوون – جگە لەخوای گەورە – کەبەهاواریەوە بێن و فریای بکەون و ڕزگاری بکەن و نەچوە ڕیزی سەرکەوتوانەوە .

(پێشەوا بخاری)[1] فەرمودەیەکی پێغەمبەری هێناوە (ﷺ) کەبردویەتیەوە سەر (سالم) ، ئەویش لەباوکی یەوە  کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: پیاوێکمان تێدابوو ، گوناهەکانی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا ، کاتێك لەناکاو زەوی ژێر پێی ڕۆچوو ، ئەوپیاوە لەو ڕۆژەوە هەربەناخی زەوی دا ڕۆدەچێت تاکو ڕۆژی دوایی ، وە لەگێڕانەوەیەکی تردا (پێشەوا بخاری)[2] فەرمودەیەکی هێناوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە (ابن عباس)[3] و (السّدی)[4]یش باسیان کردوە ، کە قارون چوەتە بن کلێشەی ژنێکەوە و بەپارە ومالّ فریوی داوەو دنەی داوە کەلەناو خەڵکی دابە (موسا)بلێت: تۆ واو وات لەگەڵدا کردم ..!

وتراوە : ژنەکە وای بەموسا گوتوە سلاوی خوای گەورە لەسەر موسابێت ، موساش (علیه السلام)) دا چڵەکی و سەرسامی گرتی ، تۆزێ لەخەڵکەکە دابڕاو دووڕکات نوێژی کرد ، ئینجا ڕووی کردە ژنەکەو داوای لێ کرد کە سوێند بخوات لەسەر ئەو قسەو بوهتانەی ، بەلام ژنەکە دانی بەڕاستیەکەداناو گوتی قارون ڕایسپاردووم –بەکرێی گرتووم– کەئەو قسەیەت لەناو خەڵکی دا پێ بلێم ، ژنەکە زۆر شەرمەزاربوو و، داوای لێخۆشبوونی لەخوای گەورە کرد ، وە داوای لێبوردنی لەموسا کرد ، ئیتر موسا (علیه السلام) بەکڕنوش

---

[1] صحيح : بخاري (٣٤٨٥) .

[2] صحيح : بخاري (٥٧٩٠) .

[3] پیاوانی متمانەدارن : ابن جرير في التاريخ (١ / ٢٦٥) .

[4] حسن : ابن ابي حاتم (١٧١٥٤) .

دا کەوت سوژدەی سوپاسی بۆ خوای گەورە برد و نزای لەقارون کرد و خوای گەورەش وەحی بۆ ناردو فەرمووی : ئەوا فرمانم بەزەوی کرد کە گوێڕایەڵی فرمانی تۆ بکات ، موساش (عليه السلام) فرمانی بەزەوی کرد کە قارون و ماڵ و سامانەکەی هەڵبلوشێت و بەزەویدا بیباتەخوارەوە ، خوای گەورە زاناترە.

هەروەها وتراوە : کاتێك قارون چووە ناو خەڵکەکەوە و بەوپەڕی جوانی یەوە خۆی ڕازاندبوەوە ، کەژاوەکەی ، ولاخ و ئەسپەکانی ، پیاوانی دەوروبەری و پاسەوانەکانی ،هەموویانە ڕازاوەو کەشخەبون و بەرگی نایاب و پۆشتەو پەرداخیان لەبەردابوو ، بەلای کۆڕێکدا ڕۆیشتن کەلە دەوروبەری موسا (عليه السلام) کۆببونەوەو ئامۆژگاری دەکردن و پەیامی خوای گەورەی بۆ ڕون دەکردنەوە ، کاتێك کەژاوەی ڕازاوەی قارونیان بینی ڕوویان بەلا ئەودا وەرگێڕا و هۆشی و گۆشیان بەلای قسەو فەرمایشتی موسا پێغەمبەرەوە (عليه السلام) نەما ،موسا (عليه السلام) کەبینی زۆربەی کۆڕەکەی بۆلای ئەو ئاوڕیان دایەوە ، بەقارونی گوت : چیەو چیت لێمان دەوێ ؟ قارون گوتی :ئەی موسا ئەگەر بە پێغەمبەرایەتی تۆ لەمن گەورەترین ، ئەوا من بەماڵ و سامان لەتۆ مەزنترم ،ئەگەر حەزیش دەکەیت وەرن ئێوە نزا لەئێمە بکەن و ئێمەش نزا لەئێوە دەکەین ، موسا (عليه السلام) لەلای کۆڕەکەی هاتە ئەملاوەو قارونیش لای یاوەرو خەڵکەکەی دەوروبەری لاکەوت ، موسا (عليه السلام) بەقارونی فەرموو : تۆنزای خۆت دەکەیت ، یان من نزای خۆم بکەم ؟ قارون گوتی: من نزا دەکەم ، نزای خۆی کرد بەلام لەلایەن خوای گەورەوە وەلامی نەدرایەوە ، ئینجا موسا (عليه السلام) فەرمووی: منیش نزای خۆم بکەم ؟ قارون گوتی : بەڵێ بیکە ! موسا (عليه السلام) فەرمووی : پەروەردگارا فرمان بەزەوی بکە تاکو ئەمڕۆ گوێڕایەڵی من بکات ! خوای گەورە وەحی بۆ نارد ، ئەوا داواکەتم وەرگرت ، موسا (عليه السلام) ئینجا فەرمووی : ئەی زەوی بیانگرە!زەوی پێی توند گرتن ، ئینجا فەرمووی بیانگرە ، زەوی گرتنی و بەناخی خۆیدا بردینە خوارەوە تا ئەژنۆکانیان ، پاشان تاسینەو سەرشانیان ، ئینجا فەرمووی : گەنجینە و ماڵیان بگرە ، زەوی ئەوانەی لەبەرچاویان بەرانبەریان ڕاگرت و تەماشایان کردن .ئینجا موسا (عليه السلام)بەئاماژەی دەست ئاماژەی کردو فەرمووی: بڕۆن ئەی کوڕانی لاوی ، دواجار زەوی ڕێك بوەوە و ئەوان تیایدا نقوم بوون و دیارنەمان . لە (قتادە)[1]وە دەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: هەموو

---

[1] صحيح : ابن جريرة في التفسير (١١ / ٢٠ / ١١٩ / ١٢٠) .

ڕۆژی هێندەی باڵای زەلامێك بەزەوی دا ڕۆدەچن تاڕۆژی دوایی، لە (ابن عباس)[1]یشەوە دەگێڕنەوەکە فەرمویەتی: تاچینی حەوتەمی زەوی داچوون و بەناخی زەویدا براونەتە خوارەوە ،گەلێك لەزانایانی تەفسیر ئیسرائیلیاتی زۆریان لێرەدا باس کردوە ، کەئێمە باسی ناکەین ، لەشوێنێکی تردا خوای گەورە باسی ئەو بارە دەکات کە قارون بەبێ کەسی بەزەویدا ڕۆچوو ، کەسی سەری نەخست و بەهاواریەوە نەهات ، نەهێزو ماڵەکەی فریای کەوت ، نەهۆزو گەلەکەی وەك خوای گەورە دەفەرمێت :

﴿فَمالَهُ مِنْ قوّة وَلا ناصِر﴾(الطارق: ١٠)ئەوجا کەئەوان تیاچوون،خۆزگە خوازە باوەڕ دارەکان هۆشیان هاتەوە لای خۆیان و خۆزگەیان بەخۆیان خواستەوە ، گوتیان : ﴿لَولا أن مَنّ الله عَلينا ...............الكافرون﴾(القصص:٨٢) ، واتا: ئەگەر خوای گەورە چاکەی لەگەڵ نەکردینایە ، ئەوا ئێمەش ڕۆدەچووین بەزەوی دا ، ئەدی نابینی کە بێ بڕوایان هیچیان دەست ناکەوێت ، پاشان خوای گەورە باسی خانەو ماڵی دنیاکەی تر دەکات و دەفەرموێت : ﴿تلك الدار الآخرة ...................المُتقينَ﴾(القصص : ٨٣ ) ، واتا: ئەوماڵەی ڕۆژی دواییمان داناوە بۆئەو کەسانەی کە فیزیان نیەو خۆیان بەزل نازانن و خراپە لەسەر زەوی بڵاوناکەنەوەو چارەنووسی باش هەربۆ خۆپارێزانە لەوانەیە ئەم بەسەرهاتی تیاچوونەی قارون پێش ئەوکاتە بوبێ کە لە(میصر)دەرچوون ، بەپێی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿فخسفنابه وبداره الأرض﴾، وشەی (دار) لەزمانی عەرەبی دا بەمانای (خانوو)دێت یاخود کۆڵان یان گەڕەك یان ئەو شوێنەی کە دەکرێتە چادرگەیەکی ئاوەدان ، ئەوەش لەم ئایەتەدا ئەومانایانە هەڵدەگرێت ، ئەگینا بەشێوە تایبەتیەکەی (دار)واتا (خانوو)یان (ماڵ)و (بینا )جاهەرجۆرێك بێت و لەهەرچیەك دروست کرابێت . خوای گەورە زاناترە. خوای گەورە لەچەند سورەتێکی تردا باسی بەسەرهاتی قارونی کردوە ، وەکو سورەتی (غافر: ٢٣- ٢٤) ، (عنکبوت : ٣٩ - ٤٠)، (پێشەوا ئەحمەد) فەرمودەیەکی هێناوە کە دەیباتەوە سەر(عبدالله)ی کوڕی(عەمرو)کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێکیان باسی گەورەیی نوێژەکانی دەکردو فەرمووی : (هەرکەس لەنوێژەکانی بێت - واتا بیانکات - ئەوا نورو بەڵگەو ڕزگاربوونی پێ دەدرێت لە ڕۆژی دوایی دا ، وەئەوەی ئاگاداری

---

[1] صحيح اليه : ابن جرير (١١ / ٢٠ / ١١٩) ابن ابي حاتم (١٧١٥٩) .

نوێژەکانی نەکات نورو بەڵگەو ڕزگاربوونی نیەو لەڕۆژی دوایی دا لەگەڵ قارون و فرعون و هامان و ئوبەی کوڕی خەڵەف دا دەبێت )[1]

## باسی گەورەیی موسا لەناو پێغەمبەراندا ( علیهم السلام )

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿وَاذكر في الكتابُ موسي ..........نبيَّا﴾(مريم : ٥١ – ٥٣) ، واتا: ئەی محمد (ﷺ) بیرێك لەو کتێبە بکەرەوە کەناردمان بۆ موسا ، تاکو بزانیت بەڕاستی موسا کەسێکی دڵسۆز ، ڕەوانەکراوێکی پێغەمبەربوو ، لای ڕاستی بناری کێوی (طور)ەوە بانگمان لێ کرد ، لەخۆمانمان نزیك کردەوەو ڕزگارمان کرد ، پلەی پەیامبەرێتی و ڕەحمەتباری خۆمان بەهارونی برایشی بەخشی ، هەروەها خوای گەورە دەربارەی سەروەری موسا (علیه السلام) دەفەرموێت: ﴿یاموسي إني .........من الشاكرين ﴾ (الأعراف : ١٤٤) ، واتا: ئەی موسا من هەڵم بژاردوی لەناو خەڵکی دا بۆ هاو گفتی خۆم و جیام کردویتەوە لەئەوان بەپەیام و گفتاری خۆم ، دەتۆش باش وەری بگرە ئەو سپاردەو پەیامەی دەسپێرم و بچۆ ڕیزی سوپاسگوزارانەوە .

پێشتر باسی ئەوەشمان کرد کە پێغەمبەرمان (محمد) (ﷺ) بەئێمە دەفەرموێت:[2] کە گەورەتری نەکەین بەسەر موسادا (علیه السلام) ، وەباوەسی ئەو هەورە تریشقە پشمان کرد کەلەڕۆژی قیامەتدا هەموو کەسێ بێ هۆش دەکات و پاشان خەڵکەکە وردە .. وردە دێنەوە هۆش خۆیان و پێغەمبەرمان (ﷺ) (محمد) یەکەم کەسەکە هۆشی بەبەردا دێتەوەو دەبینێ موسا (علیه السلام) دەستی گرتوە بەپایەیەکی عەرشی پەروەردگارەوەو دڵنیانیە ئاخۆ خۆی واتا محمد (ﷺ)لەپێش موسادا (علیه السلام) بەئاگاهاتوەتەوە یان موسا (علیه السلام) هەورەتریشقەکەی کێوی طور بۆی بری ئەوە کەوتوەیان بۆی کەم کردوەتەوە ، خوای گەورە زاناترە . هەروەها وتمان ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرمان (ﷺ) لەڕووی بێ فیزیەوە شی ئەکرێتەوە ، ئەگینا پێغەمبەرمان (محمد) سەروەرو سەرداری پێغەمبەرانە (علیهم السلام) .

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿انا أوحينا اليكَ .................الأسباط﴾(النساء : ١٦٣) تادەگاتە ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَرُسلاً قَدْ قَصَصْناهم عَليكَ ......موسي تكليماً﴾ (النساء:١٦٤) ، وەلەجێی خۆیاندا هەرلەباسی ژیانی (موسا پێغەمبەر)دا (علیه السلام)ڕاڤەو

---

[1] حسن : المسند (٢ ، ١٦٩ )، ابن حبان (١٤٦٧)

[2] پێشتر فەرموودەکەمان ساغ کردوتەوەو لەهەردو (صحيح)، کەدا هاتووە .

**ماناى ئەو ئايەتەمان بەوردى شى كردوەتەوە . خواى گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ..................عِندَ اللَّهِ وَجِيهاً﴾ (الأحزاب:٦٩)، واتە: ئەى ئەو كەسانەى باوەڕتان هێناوە ، وەكو ئەوانە مەبن كەموسايان ئازاردا – بەقسەى ناخۆشيان – وەخواى گەورە پاكانەى بۆكرد لەبارەى ئەو قسانەى يدەيانخستە پالى و موساش** (عليه السلام) **لاى خواى گەورە كەسێكى خاوەن كەسێتى خۆى و ئازيزبوە.**

**پێشەوا (عبدالله بخارى)[1] فەرمودەيەكى هێناوە كە دەيباتەوەسەر (ابو هريرە) كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمويەتى : (موسا پياوێكى زۆر بەشەرم و داپۆشراو بوە ، هەرگيز لەبەر شەرمكردنى لەخواى گەورە هيچ شوێنێكى لەشى دەرنەدەخست ، بەلاّم هەندىَ لەبنى ئيسرائيلى يەكان بەقسەى ناخۆش ئازاريان دا كەگوتيان : هەلّبەت موسا عەيب و ناتەواو يەك بەلەشييەوە هەيە بۆيە هەميشە خۆى داپۆشيوە ، جا يان بەلّەكە يان پەلاّوى يە ، يان ئافاتێكى هەر هەيە ، خواى گەورەش ويستى پاكانەى بۆ بكات لەوقسانەى ئەوان دەيانكرد ، ڕۆژێكيان موسا بەتەنها هەر خۆى بوو ، كراسەكەى لەسەر بەردێك داناو دەستى كرد بە خۆشۆردن ، كاتێك خۆى شۆرد ، هات كراسەكەى لەبەربكاتەوە ، بەلاّم بەردەكە بەسەركراسەكەى دا كەوتبوو ، موساش داردەستەكەى بەدەستەوەگرت و بەبەردەكاندا دەگەڕاو دەيفەرموو : ئەى بەرد كراسەكەم ! ئەى بەرد كراسەكەم .....! تاكو بەدەم ڕۆيشتنەوە گەيشتە لاى كۆمەلّێك لەپياو ماقولاّنى (بنى ئيسرائيل) و موسايان بەبىَ بەرگ بينى و بۆيان دەركەوت كە جوانترين دروستكراوى خوايە –واتە هيچ پەلّەو نالەباريەك لەلەشى و پێستى دانيە .**

**بەم جۆرە خواى گەورە پاكانەى بۆ كرد لەوقسانەى بۆيان هەلّبەستوو ، بەردەكە لاچوو ، كراسەكەيشى دەرهێنايەوەو لەبەرى كردەوە ، بەدارەكەى دەستى كێشانێك بەبەردەكەى داكێشا كە سوێند بەخوا چالاّيى يەكى لەبەردەكەدا دروست كرد، كەلەئەنجامى سىَ يان چوار يان پێنج جار پياى كێشا ، ئينجا پێغەمبەرمان (محمد)(ﷺ) فەرموى خواى گەورەش دەفەرموێت :﴿ياأيها الذّينَ أمنوا .........عِندَاللهِ وَجِيهاً﴾(الأحزاب : ٦٩) ئەو فەرمودەيە لەلايەن پێشەوا (ئەحمەد)[2]و گێڕانەوەى (بخارى ومسلم)[3]يش دا هاتووە**

---

[1] صحيح : البخاري (٣٤٠٤ )، المسند (٢ / ٣١٥)، (٢ / ٣٢٤) .

[2] متفق عليه : البخاري (٢٧٨)،مسلم (٦٠٩٨) .

[3] صحيح : مسلم (٦٠٩٩) .

هەندێ لەزانا پێشینەکان فەرمویانە هەرلەبەر ئەو ئازیزی و شەرمداریەی بووە کەکاتێك داوای کرد (هارون)ی برای (علیه السلام) بکاتە هاوکارو وەزیری ، خوای گەورەش وەرگرت و فەرمووی: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُ مِنْ رَحْمَتِنَا أَخَاهُ هَارُونَ نَبِيًّا﴾ (مريم: ٥٣) پاشان (البخاري) فەرمودەیەکی هێناوە کە دەیباتەوە سەر (الاعمش) ئەویش دەیباتەوە بۆ (عبدالله) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) سوێندێکی خوارد ، پیاوێك وتی : ئەمە سوێندێکە نامەوێ کەناوی خوای تێدابێ ، ئیتر چووم بۆخزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوبەسەرهاتەم بۆباس کرد ، پێغەمبەر (ﷺ) زۆر تورەبوو ، تەنانەت تورەییم لە ڕوخساریدا بەدی کرد ، پاشان فەرمووی: ﴿ ڕەحمەتی خوا لەموسا کەبەشتی زیاتر لەمەش ئازاریان دا بەڵام ئەو هەر ئارامی گرت ﴾[1]، وە پێشەوا (ئەحمەد) نمونەیەکی تری هاو واتای ئەو فەرمودەیەی هێناوە .

لەهەردوو (صحیح)ەکەدا[2]هاتوە کە پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) (شەوی (شەوڕەوی)لەئاسمانی شەشەمدا بەلای موسادا ڕەت بوو ،(جبریل) ((علیه السلام)فەرمووی: ئەمە موسایە (علیه السلام)، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) سڵاوی لیٚ کرد ،وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (سڵاوم لیٚ کرد ، ئەویش وەڵامی دایەوەو فەرمووی: مەرحەبا لەپێغەمبەرێکی باش و برایەکی باش ، کاتێك لەئەو تێپەڕیم ، موسا (علیه السلام)دەستی کرد بەگریان ، لێیان پرسی بۆچی دەگری ؟ فەرمووی : دەگریم ، چونکە کوڕێك دوای من ڕەوانە کراوە بەپێغەمبەر زیاتر لەئومەتی خۆی دەخاتە بەهەشتەوە وەك لە ئومەتی من) گێڕانەوەکان هاودەنگن لەوەدا کە کاتێك خوای گەورە پەنجا نوێژی لەسەر محمد(ﷺ) و ئومەتەکەی دانا لەشەو ڕۆژێکدا ، بەلای موسا دا ڕەت بوو ،موسا(علیه السلام) فەرمووی : بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگار و داوای لیٚ بکە کەئەم نوێژانە لەسەر ئومەتەکەت کەم بکاتەوە ، چونکە من گەلێك ئاسانکاریم بۆ بنی ئیسرائیل کردوە لەپێش تۆدا ، وەئومەتی تۆش گوێیان کەمترو چاویان سست تر و دڵیان لاواز ترە لەئومەتی من واتەلایەنی مەعنەوی – گفتوگۆ بەردەوام بوو ، هەموو جارێکیش محمد (ﷺ) دەهاتەوەلای موساو دیسان دەگەڕایەوە خزمەتی پەروەردگار ، تاکو سەرەنجام پەنجا نوێژەکان کەم کرانەوە بۆ پێنج نوێژ ، وەخوای گەورە فەرمووی ئەو نوێژانە وەك پێنج نوێژ لەسەر ئومەتەکەت دادەنێم ،بەڵام وەکو پەنجا نوێژەکە پاداشتیان دەدەمەوە.

---

[1] متفق علیه : البخاري (٣٤٠٥)، مسلم (٢٤٤٤) .

[2] پێشتر ئەم فەرمودەیەمان ساخ کردۆتەوە .

(پێشەوا بخاری)[1] فەرموودەیەکی هێناوە کەدەیباتەوە سەر (ابن عباس) کە دەفەرموێت : (ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ) هاتەلامان و فەرمووی : (گەلەکانم نیشان درا ، هێندە زۆر بون ، گەیشتبوونە ئاستی ئاسۆی ئاسمان ، وترا : ئەوە موسایە لەناوقەومە کەی دا) ، پاشان پێشەوا ئەحمەد فەرموودەیەکی دوورودرێژی هێناوە کە دەیباتەوە سەر (ابن عباس) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (گەلەکانی پێشینەم نیشاندرا ، هی وام تێدا بەدی کردن کە پێغەمبەرەکەیان و شوێنکەوتوەکانی بون ، پێغەمبەری وا هەبوو تەنها یەك کەس یان دوانی لەگەڵ بوو ، هی واشیان تێدا بوو کەهەربەتەنها خۆی بوو ، گەلێکی زۆر قەرەباڵغم نیشان درا ، گوتم : ئەوە ئومەتی منە ؟ وترا : ئەوە موسایە بەخۆی و گەلەکەیەوە ، بەڵام تەماشایەکی ئەم لایە بکە کەقەرەباڵغی یەکی زۆرە ، پاشان وترا تەماشایەکی ئەم لایەش بکە ، لەوێشەوە وەهەرقەرەباڵغی یەکی زۆرم بینی وترا : ئەمە ئومەتی تۆیەو حەفتا هەزار کەسیشیان بەبێ لێپرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە و سزاش نادرێن)، ئینجا پێغەمبەر هەستاو ڕۆی ، خەڵکەکە لەناو خۆیاندا کردیانە مشت و مڕ لەسەر ئەو حەفتا هەزار کەسەی بێ سزا و پرسینەوە دەچنە بەهەشتەوە.

هەریەکەیان شتێکی دەگوت ، تاکو پێغەمبەر (ﷺ) هاتەوە لایان و فەرمووی (ئەومشت و مڕەتان لەسەرچی یە ؟) ئەوانیش بۆیان باس کرد کەلەسەر چی یە ! ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (ئەوانە کە خەڵك داخ ناکەن وە گوێ بۆقسەی ئەم و ئەو هەڵناخەن و خەریکی فاڵ چێتی نین و پشتیان بەخوای گەورە بەستوە)، (عوکاشەی کوڕی محیصن)ی ئەسەدی هەستایە سەرپێ و فەرموی ئەی پێغەمبەری خوا ئایا من لەوانەم ؟ نەیدی تۆلە دانەیت فەرمووی: پاشان یەکێکی تر پرسی ئەی منیش هەر روانەم ؟ (عەکاشە پێش تۆی دایەوە) ، ئەم فەرمودەیە گەلێ جۆرە ڕێگەی گێڕانەوەی هەیەو چەند جۆرێکیش هەیە لە (صحیح)[2] و (حەسەن)ەکاندا هاتووە .

موسا (علیه السلام) پێغەمبەرێکی گەورەو نازدار بەشەرم و ویقارو دڵسۆز و خواپەرست و پاك و بەتوانا و خۆڕاگر و ئارامگربوە ، پەیامەکەی پیرۆزو خۆیشی هاوگفتی پەروەردگار بوە ، پەیامەکەیشی زۆربەی جارناوی لەگەڵ ناوی پەیامی پێغەمبەرماندا ﷺ ناوی هاتوەو بەگەورە تەماشای کراوەو بەبەرزو بەهادار لەقەڵەم دراوە ، هەربۆنمونە

---

[1] صحیح : البخاري (٣٤١٠)، المسند (١/ ٢٧١)

[2] صحیح : رواه مسلم (٥٢٦)

خوای گەورە لەم سورەت و ئایەتانەدا باسی پیرۆزی و بەرزی تەوراتی کردووە: (البقرة – ١٠١)، (آل عمران– ١ – ٤)، (الأنعام – ٩١ – ٩٢)، (الأنعام –١٥٤ – ١٥٥)، (المائدة – ٤٤ – ٤٨)، (الأنبياء– ٤٨ – ٥٠)، (القصص – ٤٨ – ٤٩).

بەکورتی پەیام و شەریعەتی موسا (عليه السلام) پەیامێکی گەورەو بڵند و پایەداربووە ، وەئومەتەکەی زۆربوە ، گەلێك پێغەمبەرو زاناو داناو خواناس و تەقواکارو پاشاو میرو سەرکردەی گەورەیان تێدا هەڵکەوتوە ، بەڵام پاشان وردە .. وردە پەیامەکە یان دەستکاری کرد و خستیانە سەر ئارەزووی خۆیان خوای گەورەش ئەوانی کرد بەمەیمون و بەراز و سزای دنیایی دان .

پێشەوا ئەحمەد فەرمودەیەکی هێناوە کە دەیباتە وەسەر (ابن عباس) کە پێغەمبەر (ﷺ) لەدۆڵی شین دا تێپەڕی ، فەرمووی : (ئەمە چ دۆڵێکە ؟)وتیان ئەمە دۆڵی شینە[1] ، فەرمووی: (وەك ئەوە وایە ئێستا بڕوانم بۆ موسا کەلەتەپۆلکەی (هەرشا)دێتە خوارەوە بەرەو لادۆڵەکەو دەیەوێ بێت حەجی ماڵی خوا بکات)پاشان گەیشتنە لادۆڵی هەرشاو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (ئەمە چ لادۆڵێکە ؟) وتیان ئەمە هەرشایە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (وەك ئەوە وایە بڕوانم بۆ یونسی کوڕی مەتی کە بەسوار پشتی وشترێکی سورەوەیە و جبەیەکی خوری بەسەر وشترەکەی داداوە )[2] ، هەروەها (الطبراني)[3]بە (مرفوع)ی لە (ابن عباس)ەوە هێناویەتی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (موسا بەسەر نورێکی سورەوە حەجی کرد)بەڵام ئەم فەرموودەیە زۆر (غریب)ە .

(پێشەوا احمد)[4] فەرموودەیەکی هێناوە کە دەیباتەوە سەر (مجاهد) کە دەفەرموێت: ئێمە لای (ابن عباس) بوین کە (دەجال)ی باس کرد ، فەرمووی: دەجال لەناو چوانی نوسراوە (ك . ف . ر )، فەرمووی ئەوە دەڵێت چی ؟ فەرمووی: دەڵێت : لەناوچاوانی نوسراوە (ك . ف .ر) (ابن عباس) فەرمووی ئەوەیانم لەپێغەمبەرەوە نەبیستووە ، بەڵام فەرمووی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی : (بەڵام دەربارەی شێوەی ئیبراهیم بڕوانن باهاوەڵی خۆتان – واتا محمد (ﷺ) بەڵام موسا پیاوێکی کەڵەگەتی قژ

---

[1] دۆڵی شین : وادی الأزرق .

[2] صحيح : المسند (١ / ٢١٥ – ٢١٦ )، مسلم (٤١٩)

[3] ضعيف الأسناد : الطبراني في الكبير (١٢٥١٠)

[4] صحيح الى ابن عباس : المسند (١ / ٢٧٦ – ٢٧٧ )

لوول بووه بەسواری وشتری سور دەگەڕا ، وەك ئێستا لەبەرچاومدا بێت و بەدۆڵەكەدا شۆڕ بێتەوە).

هەروەها چەند فەرموودەیەكی تری پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) دەربارەی ڕوخسارو شێوەی پێغەمبەران هەیە ، بەتایبەتی (ابراهیم ، عیسا ، موسی) كە لەباسی ژیانی (ابراهیم)دا (علیه السلام) باسمان كردون و بەپێویستی نازانین لێرەدا دوبارەیان بكەینەوە .

پێشەوا (بخاری)[1] گێڕانەوەیەكی بردۆتەوە سەر (ابن عباس) كە دەفەرموێت: فریشتەی گیان كێشان لەلایەن خوای گەورەوە ڕەوانەكرا بۆلای موسا (علیه السلام) تاكو گیانی بكێشێ ، كاتێك هاتەلای موسا ، موسا (علیه السلام) دەری كردو پاڵی پێوەنا ، فریشتەكە گەڕایەوە بۆلای پەروەردگار –جل جلاله–فەرمووی : ناردوتم بۆلای بەندەیەكی خۆت كەنایەوێت بمرێت ! خوای گەورە فەرمووی : بڕۆرەوە بۆلای و پێی بڵێ بادەستی لەسەر پشتی گایەك بگێڕێت ، دەستی بەر چەند مووی گایەك كەوت ئەوەندە ساڵی تر تەمەنی درێژ دەكەم ، فەرمووی : ئەی پەروەدگارا ئەی پاش ئەوە ؟ فەرمووی ئینجا دەمرێت ،موسا (علیه السلام) فەرمووی دەی كەواتە ئێستا ، بەڵام داوای لەخوای گەورە كرد نزیكی بكاتەوە لە خاكی پیرۆز و بەولایەش دا بەردێكی فڕێدا ، (ابو هریرە) دەفەرموێت : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : (ئەگەر بچینە ئەوناوەو بمێنم ، ئەوا گۆڕی موساتان نیشان دەدەم لەسەر لا ڕێی تەپۆڵكە سوورەكە).

(پێشەوا مسلم)[2] یش هەر گێڕاویەتیەوە ، (پێشەوا ئەحمەد)[3] گێڕانەوەیەكی بردوەتەوە سەر (أبی هریرە كە دەفەرموێت : (فریشتەی گیانكێشان هاتە لای موسا ، موسا (علیه السلام) فەرموی خۆم وەڵامی پەروەردگارت دەدەمەوە ، موسا (علیه السلام) مشتەكۆڵەیەكی دا لەچاوی فریشتەكەو چاوی كوێر كرد ، فریشتەكە گەڕایەوە بۆلای خوای گەورە و فەرمووی : تۆناردوتم بۆلای بەندەیەكی خۆت كەنایەوێ بمرێت و چاوێكیشی كوێر كردم ، دەفەرموێت : خوای گەورە چاوی بۆ چاك كردەوەو فەرموی : بڕۆرەوە بۆلای بەندەكەم پێی بڵێ : ژیانت دەوێت؟ ئەگەر ژیانت دەوێ ئەوا دەستت بخەرە سەر پشتی گایەك چەند موو بەردەستت كەوت ئەوەندە ساڵ تەمەنت درێژ دەكەم ،

---

[1] صحیح : مسلم (٦١٠١)
[2] صحیح : البخاري (٣٤٠٧)
[3] صحیح : المسند (٢ / ٣٥١)ابن حبان (٦٢٢٣ )، (٦٢٢٤)

فەرمووی ئەی دوایی چی دەبێت ؟ فەرمووی: مەرگ ، فەرمووی : دەی کەواتە هەرئێستا ئەی پەروەردگارا –گیانم بکێشە .

(ابن حبان) لە (صحیح)ە کەیدا هێناویەتی کە: کاتێك فریشتەکە چوو بۆلای موساو هەواڵی مەرگی پێدا ، موساش (علیه السلام) چاوی کوێر کرد ، دیارە فریشتەکە لەسەر شێوەی مرۆڤێك بەبێ پرس و ڕاچووەتە ماڵی موساوە (علیه السلام) ، ئەوەش مافی هەموو کەسێکە کە بۆی هەیە چاوی هەرکەسێك کوێر بکات کەبەبێ پرس دەڕوانێتە ناو ماڵ و خێزانەکەی ، هەروەکو چۆن (جبریل) (علیه السلام) لەسەر شێوەی پیاوێکی عەرەب دەهاتە خزمەتی پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) ، یان فریشتەکانی تر لەسەر شێوەی کۆمەڵێ گەنجی جوان چوونە لای (ئیبراهیم و لوط)(علیه السلام) وە ئەوانیش لەسەرەتادا نەیانناسین ، تاکو دوایی خۆیان ناساند کەئەمانە فریشتەو ڕەوانەکراوی خوان لەسەر شێوەی مرۆڤ دا هاتوون .

پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) لەو بارەیەوە دەفەرموێت : (فریشتەی گیان کێشان هاتە لای موسا (علیه السلام) تاکو گیانی بکێشێ ، موسا (علیه السلام) فەرمووی : خۆم وەڵامی پەروەردگارت دەدەمەوە ، ئیتر مشتە کۆڵەیەکی بەلاچاوی دا کێشاو کوێری کرد)هەرچەندە ئەوەیان زۆر جێگەی گومانە کە پێغەمبەرێك بەمشتەکۆڵە وەڵامی پەروەردگارەکەی بداتەوە ، بەڵام کاتێك فریشتەکە لەشێوەی مرۆڤ دا بەبێ پرس و ڕا چوەتە ژوورماڵەکەیەوە ، ئەوەیان دوورنیە ، چونکە موسا (علیه السلام) بەنیازی گەلێك شتی تر بوو لە دنیادا ، لەوانەش بەنیاز بوو گەلەکەی لەو گەمارۆیە ڕزگاربن کەلەسەریان بوو ، هەروەها دەیویست بچنە ناو خاکی پیرۆزەوە وەك خوای گەورە پەیمانی دابوو ، بەڵام ویستی خوا وابوو کە موسا لەو سەردەم و چاخەدا بمرێت پاش کۆچی هارونی برای (علیه السلام) .

هەندێ کەس وتویانە ، لەسەردەمی موسادا خەڵکەکە لەو گەمارۆیە ڕزگاریان بوو ، وەچوونە ناو خاکی پیرۆزەوە ، بەڵام ئەو ڕاست نیە ، چونکە کاتێك موسا (علیه السلام) مەرگی هەڵبژارد ، لەخوای گەورە پاڕایەوە کەلەخاکی پیرۆزی نزیك بکاتەوە ، وەك هاندانێك بۆ گەلەکەی تاکو ڕێزی ئەو خاکە بگرن هەروەها (پێشەوا ئەحمەد)[1]فەرموودەیەکی هێناوە کە دەیباتە سەر ئەنەسی کوڕی مالك کە پێغەمبەرمان

[1] حسن : ابن جریر (۱ : ۲۵۵)تاریخ .

(ﷺ) فەرمووی: (کاتێك کەشەو ڕەویم پێ کرا بەلای موسادا ڕەت بووم کەخەریکی نوێژکردن بوو لەگۆڕەکەی خۆیدا لەلای تەپۆلکە سورەکەوە).

(السّدی)[1] فەرموودەیەکی هێناوە کە دەیباتەوە سەر (ابن مسعود) ئەویش لەکۆمەڵی لەهاوەڵانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەفەرموێت :خوای گەورە وەحی کرد بۆموسا (علیە السلام) کە هارونی برات دەمرێنم لەفلآنە کێو ، موساو هارون (علیهم السلام) بەرەو ئەو کێوە بەڕێ کەوتن ؛ هارون (علیە السلام) چاوی بەدرەختێك کەوت کەهەرگیز درەختی وای نەدیبوو ، هەروەها چاوی بەخانوو و جێگەیەکی داخراو کەوت کەفەرشێکی جوانی لەسەر بوو ؛ بۆنێکی خۆشی لێ دەهات ، کاتێك هارون ئەو خانوودارو جێگە خۆشەی بینی زۆر بەلایەوە خۆش بوو ، بەموسای برای گوت : ئەی موسا من دەمەوێ لەو جێگەیە دابخەوم . فەرمووی : برۆ لەسەری بخەوە ! فەرموی : ئاخر دەترسم ئەم خاوەن خانووە بێت و لێم توڕەبێت ،موسا (علیە السلام) فەرمووی : مەترسە من خاوەن خانوەکە ڕازی دەکەم و ناهێڵم ئازارت بدات ، فەرمووی :ئەی موسا (علیە السلام) تۆش لەگەڵم بخەوە ! خۆئەگە خاوەن ماڵەکە هات وەکو یەك لە هەردوکمان توڕەدەبێت ، کاتێك خەوتن ، لەخەودا هارون (علیە السلام) کۆچی دوایی کرد ، کاتێك بەخۆی زانی بەموسای فەرموو : تۆ هەڵت خەڵەتاندم ، بەڵام هەرکەگیانی دەرچوو ، دارەکەو خانوەکە و جێگەکەش لەگەڵیا بەرزکرانەوە بۆ ئاسمان ، جاکەموسا (علیە السلام) گەڕایەوە ناو خەڵکەکە و هارونی لەگەڵدا نەبوو ، گوتیان : موسا هارونی برای گوشتوە چونکە ئیرەیی پێ بردوە لەسەر ئەوەی کە (بنی ئیسرائیل ) ئەویان زیاتر خۆش دەویست ، لەڕاستیش دا هارون زیاتر لەگەڵیان نەرم و نیان تربوو ، موسا (علیە السلام) هەندی زبرو توند بوو لەگەڵیاندا ، کاتێك ئەم هەواڵە بەموسا گەیشتەووە (علیە السلام) ،فەرمووی : دەك خۆتان بەخۆتان بن ؛ جاخۆ هارون برامە ، چۆن دەیکوژم ؟بەڵام کەزیاتر لەسەری ڕۆیشتن، موسا (علیە السلام) هەستاو دووڕکات نوێژی کرد ، ئینجا لەخوا پاڕایەوە – تاکو ئەو قسانەی یەکلایی بکاتەوە بۆیان– ئیتر جێگە کەلەئاسمانەوە دابەزی یەسەریان و ئەوان واتە بنوئیسرائیل بەجوانی بۆ جێگەکەیان دەڕوانی کە لەنێوان ئاسمان و زەوی دا بوو .

کاتێك موسا (علیە السلام) بەڕێگادا دەڕۆیشت و (یوشەع)یش (علیە السلام) لەدوایەوە دەڕۆیشت ، لەناکاو بایەکی بەهێزو تۆزاوی و ڕەش هەڵی کرد ؛ کاتێك یوشەع (علیە السلام)

---

[1] حسن : ابن جریر (١ / ٢٥٥)تاریخ .

بایەکەی بەو جۆرە دی ، زۆر ترساو وای زانی دنیا تەواو دەبێ، بۆیە توند موسای گرت و فەرمووی دنیا تەواو دەبێ و من پابەندم بەموساوە کە پێغەمبەری خوایە ، موساش (علیه السلام) خستیە ژێر کراسەکەیەوە ، بەلام کراسەکەش بەدەستی یوشەعەوە داکەنرا ، کاتێك یوشەع (علیه السلام) هاتەوە ناو بەنو ئیسرائیل پێیان گوت : پێغەمبەری خوات کوشت ؟فەرمووی : نا .....بەخوا نەمکوشتوە ، بەڵکو ئەو منی نەگرتە خۆی ، ئەوان باوەڕیان پێ نەکردو ویستیان بیکوژن ، فەرمووی : ئەگەر باوەڕم پێ ناکەن ، سێ ڕۆژ لەسەرم بوەستن ، یوشەع (علیه السلام) لەخوا پاڕایەوەکە کێشە کە یەکلایی بکاتەوە ، تاکو خوای گەورە خەونی پیشانی ئەو پاسەوانانەدا ،کەچاودێری یوشەعیان دەکردو دەستیان بەسەردا گرتبوو تاکو سێ ڕۆژەکە تەواو دەبێ ، خوای گەورە پیاوێکی لەخەونی ئەواندا نیشانی پاسەوانەکاندا کەپێی ڕاگەیاندن کە یوشەع موسای نەکوشتوە وەخوای گەورە بۆلای خۆی بەرزی کردوەتەوە ، ئیتر وازیان لەئەو هێنا .

وەهیچ کام لەوانەی کە ئەوقسەیان پەسەند نەکرد نەمانەوە لەژیاندا و نەچونە شاری خەڵکە بەهێزەکانەوە (قريَة الجبّارين)، هەمویان مردن و ڕزگارکردنی شارەکەی نەدی ، ئەگەر چی هەندێ لەم گێڕانەوەیە لەگەڵ ڕاستیدا ناگونجێ ، خوای گەورە زاناترە

(وهب کوڕی منبه)[1] دەفەرموێت: جارێکیان موسا (علیه السلام) بەلای کۆمەڵێك فریشتەدا ڕۆیشت کە خەریکی هەڵکەندنی گۆڕێك بوون ، موسا (علیه السلام) هیچ گۆڕێکی نەدیبوو کە ئەوەندە خۆش و بەرفراوان و چاك بێت ، موسا (علیه السلام) پرسی: ئەی فریشتەکانی خوا ئەم گۆڕە بۆکێ هەڵدەکەنن ؟ فەرموویان بۆ یەکێك لەبەندەچاکەکانی خوای گەورە ، جائەگەر حەزدەکەیت ئەو بەندە چاکە تۆبیت ، ئەوا بڕۆرە ئەم گۆڕەوەو تیایدا درێژ بە و ڕووبکەرە پەروەردگارەکەت ، بەئاسان ترین شێوە هەناسەیەك هەڵبمژە ، ئەویش – واتا موسا (علیه السلام) وای کردو کۆچی دوایی کرد ، درودو سلاوی خوای لەسەر بێت ، فریشتەکانیش نوێژیان لەسەر کردو بەخاکیان سپارد ، (اهل الکتاب)و خەڵکانی تریش واباس دەکەن کەموسا (علیه السلام) لەتەمەنی سەدو بیست ساڵی دا کۆچی دوایی کردوە .

---

[1] ابن جرير : التاريخ (١ / ٢٥٦)

(پێشەوا ئەحمەد)[1] دەفەرموێت: لە (ابو هريرە)وە که پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (جاران فریشتەی گیان کێشان بەئاشکراو بەشێوەیەکی دیار دەهاتنەلای خەڵکی ، بەڵام کاتێك هاتنەلای موساو داوای گیانیان لیٚ کرد ،موساش مشتە کوڵەی لەچاوی یەکیان داوکوێری کرد ، فریشتەکەش بەو شێوەیە گەڕایەوە بۆ خزمەتی پەروەردگارو فەرمووی : ئەی پەروەردگار بەندەی خۆت موسا چاوی کوێر کردم، ئەگەر لەبەر ڕێزەکەی نەبوایە ،ئەوا تۆڵەم لیٚ دەکردەوە )یونس دەفەرموێت : (لەسەریم قورستر دەکرد، پەروەردگار بەفریشتەکەی فەرموو : بڕۆرەوە بۆلای بەندەکەم و پێی بلٚیٚ بادەستی بخاتە سەر پشتی گایەك ، دەستی بەرچەند مووی گایەکە کەوت ئەوەندە ساڵی تر تەمەنی درێژ دەکەم و فریشتەکە ئەوەی بەموسا ڕاگەیاند ، ئینجا موسا (عليه السلام) فەرمووی ئەی دوای ئەوە ؟ فەرمووی :مەرگ ، ئیتر موسا (عليه السلام) فەرمووی : کەواتە ئێستا ، ئیتر بۆنێکی پیٚ هەڵمژی و گیانی کێشا )یونس دەفەرموێت :پاش ئەوەی خوای گەورە چاوی فریشتەکەی چاك کردەوە ئیتر لەو کاتەوە فریشتەکە بەشێوەی نادیارو دەرنەکەوتوو دێت بۆگیانکێشانی خەڵکی ،هەروەها(ابن جرير)یش هەربەوشێوەیە گێڕاویەتەوە[2] .هەزاران درودو سڵاوی پەروەردگارت لەسەر بێت ئەی موسای شەرمن و باوەڕدار و پێغەمبەر و سەروەرو دڵسۆز بۆبانگەوازی خوایی .کەلەسەر دەستی تۆ گەورەترین فرعونی سەرزەوی و خەڵەتاوەکانی لەناوچوون و بوون بەپەندو وانە بۆ هەتا هەتایە ... بۆ هەموو خەڵکی سەرزەوی .

---

[1] سندە حسن : المسند (٢ / ٥٣٣) .

[2] ابن جرير : التاريخ (١ / ٢٥٦) .

## ﴿ پێغەمبەری خوا یوشەع (درووود و سڵاوی خوای لەسەر بێت) ﴾

ناوی (یوشەع) کوڕی (نون) کوڕی (ئیفرایم) کوڕی (یوسف)ی کوڕی (یەعقوب)ی کوڕی (ئیحاق)ی کوڕی (ابراهیم)ە (علیه السلام).

دەڵێن: یوشەع (علیه السلام) ئاموزاری هود (علیه السلام) بوە ، بەلاْم خوای گەورە لە قورئاندا ناوەکەی ئاشکرا ناکات و دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِفَتَاهُ ﴾(الکهف:٦٠) واتە: موسا بەولاوەی فەرموو کە لەگەڵیدابوو ، هەروەها دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَاهُ آتِنَا غَدَاءَنَا ﴾(الکهف:٦٢) .

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە لەفەرموودەی (صحیح)دا [1] هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (یوشەع کوڕی نون بووە) ، هەروەها (اهل الکتاب) یەك دەنگن لەوەدا کەیوشەع پێغەمبەر بووە ، ئەوانەش باوەڕ بە پێغەمبەرایەتی کەسیتر ناکەن جگە لە (موسا) (علیه السلام) دەستەی(السامری)یەکانن، بەلاْم باوەڕ بە (یوشەع) دەکەن (علیه السلام)، چونکە زۆر بەئاشکرا خوای گەورە لەپەیامی ئەواندا(واتە: تەورات) ناوی ئەوانی بردووە

بەلاْم (ابن جریر) وە هەندێ لەڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆزیش وا باس دەکەن کەگوایە پێغەمبەرایەتی لەموساوە گواستراوەتەوە بۆیوشەع (علیه السلام) ، لەو کاتەدا کەموسا (علیه السلام) پیربووەو چووە بەساڵدا ، موسا (علیه السلام) زۆر لەگەڵ یوشەعدا تێکەڵاْوبووەو تەنانەت جارێکیان لەموسای پرسی: ئەی ئەو کەسەی خوای گەورە لەگەڵتدا دواوە ، من هیچ شتێکت لێناپرسم دەربارەی ئەو شتانەی خوای گەورە وەحی بۆکردوویت تاکو پێم نەڵێی ئاخۆ لەسەرەتادا لەخۆتەوە ئەمانەت کردووە یان خوای گەورە وەحی بۆکردوویت ، لەمەوە موسا (علیه السلام) ژیانی لێتاڵ بووەو ئارەزووی مردنی کردووە ، ئەم بەسەرهاتە جێگەی سەرسامییە و مشت و مڕەو چەندین گومانی لەسەرە ، چونکە موسا (علیه السلام) لەسەر هەموو شتێ وەحی بۆدەهات لەلایەن خوای گەورەوە ، تەنانەت سەرمەرگەکەیشی کە چاوی فریشتەکەی کوێرکرد ، هەروەها موسا (علیه السلام) تا ئەو کاتەش و هەمیشەش لای خوای گەورە زۆر بەڕێز و سەروەرو خۆشەویست و پایەداربووە ، دیارە ئەم گێڕانەوەیەی پێشوو (ابن اسحاق) هەر لەکتێبی (بنو اسرائیل)یەکان وەریگرتووە ، ئەو کتێبەی کە بەحساب ناویان لێناوە (تەورات) و واباس کراوەکە تا دوا نەفەس و ژیانی

---

[1] مەبەستمان لەو فەرموودەیە کەباس لەموسا و خضر دەکات (علیه السلام) و پێشتر ئەو فەرموودەیەمان ساخ کردوەتەوە تەخریجمان کردووە .

موسا هەر وەحی لەخواوە بۆ هاتووە ، وەك لەنموونەی (تابوت الشهادە)دا دەردەكەوێ ، كە لە (قبة الزمان)دا باسی دەكرێت .

دیسان ئەوانە لە (سیفر)ی سێهەمی خۆیاندا واباس دەكەن كە خوای گەورە فەرمانی بەموسا كرد لەگەڵ هارون دا كە (بەنی ئیسرائیل) سەرپەرشتی بكەن و بۆ جەنگ سازیان بكەن و بیانكەن بەچەند دەستەیەك و بۆ هەریەكە لەو دەستانەش دوازدە سەركردە دیاری بكەن ، ئەوەش لەو كاتەدابوو كەماوەی چل ساڵی گەمارۆكەیان لەسەر لاچووبوو (واتا: تەواویان كردبوو) هەرلەبەر ئەوەش بووە ، وەك هەندێ لە (أهل الكتاب) دەڵێن: موسا (علیه السلام) چاوی فریشتەكەی كوێركرد ، چونكە وافەرمانی پێكرابوو كە دەبێ بەسەر (الجبارین)دا زاڵ ببن و بچنە خاكی پیرۆزەوە ، موسا (علیه السلام) وایدەزانی ئەم ڕوداوانە هەردەبێ لەسەر دەستی خوی و لەسەردەمی ئەودا ڕووبدەن ، نەیاندەزانی كە مەرگ پێشی ئەو ڕوداوانە دەكەوێ و ویستی خوایی وایە ، لەمێژووی ئیسلامیش دا نموونەی هاوشێوەی ئەم ڕووداوەمان هەیە و بۆ زانیاری لەو بارەیەوە بڕوانە تەفسیری ئایەتی ژمارە (٢٩) لەسورەتی (التوبە) .

خوای گەورە فەرمانی بەموسا كرد (علیه السلام) كە (بەنی ئیسرائیل)یەكان بكاتە چەند دەستەیەك سەربازی ئامادە و لەسەر هەریەكە لەو دەستانەش (نقیب)ێك[1] دیاری بكات ، وە خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ نَقِيباً وَقَالَ اللَّهُ إِنِّي مَعَكُمْ لَئِنْ أَقَمْتُمُ الصَّلاةَ وَآتَيْتُمُ الزَّكَاةَ وَآمَنْتُمْ بِرُسُلِي وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً لَأُكَفِّرَنَّ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ فَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ مِنْكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ ﴾ (المائدە:١٢) . دیارە كەموسا (علیه السلام) بەئەوانی فەرمووە: ئەوا خوای گەورەتان لەگەڵدا دەبێ ئەگەر نوێژ بكەن و زەكات بدەن و باوەڕ بەپێغەمبەرانی دیكە بهێنن و قەرز بەخودای گەورە بدەن ، ئەوا لەخراپەكانتان دەبورێت و دەتانخاتە بەهەشتەوە ، بەلاّم ئەگەر دوای ئەوەش دیسان (وەك جاری جاران) بێباوەڕی هەڵبژێرن بەڕاستی ڕێی گومراییتان گرتوەتەبەر .

هەروەكو چۆن خوای گەورە لەدواكەوتەكانی جەنگی حودەیبیە) فەرمانی بەپێغەمبەر كرد(ﷺ) كەپێیان بڵێت:﴿ قُلْ لِلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَى قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ فَإِنْ تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْراً حَسَناً وَإِنْ تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُمْ مِنْ قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَاباً أَلِيماً ﴾ (الفتح:١٦) ، واتە:

---

[1] نقیب : سەردەستە . فەرماندە . پێشەوا ، سەركردە ، سەرهەنگ ، سەرپۆل ، سەر لق ، سەر لەشكر .

ئەی محمد(ﷺ) بەو عەرەبانە (یان ئەو دەشتەکیانە) بڵێ کە لەجەنگ دواکەوتوون گەلێکی توند و تیژی واتان بەگژدا دەکەم کە لەناوتان بەرن یان بەدیل و ژێردەستەتان بگرن ، بەڵام ئەگەر گوێڕایەڵی و بەفەرمانی پێغەمبەر بکەن (ﷺ) ، خوای گەورەش پاداشتی زۆر چاکتان پێدەبەخشێ ، خۆ ئەگەر پشت هەڵبکەن وەکو جاری پێشوو ئەوا خوای گەورە بەسزایەکی سەخت سزاتان دەدات . بەو جۆرە خوای گەورە هەرەشەش لە (بەنی ئیسرائیل)یش کرد ، ئەوەبوو موسا (علیه السلام) هات ئەو کەسانەی کرد بەسەربازو چەکدار کەتەمەنیان گەیشتبووە بیست ساڵ و بەرەوژوور ، وە ئەوانیشی کرد بەدوازدە دەستەوە و بۆ هەریەکەیان سەردەستەیەکی دیاریکرد ، بەم جۆرە:

**دەستەی یەکەم** : دەستەی ڕۆبێل بوو ، چونکە دەچوونەوە سەر (یەعقوب) (علیه السلام) وە ژمارەیان چل و شەش هەزار و پێنج سەد کەس بوو ، سەرکردەکەشیان ناوی (یەصور کوڕی شەدیئور)بوو .

**دەستەی دووەم** : دەستەی شەمعون بوون ، کە ژمارەیان نەوەد و پێنج هەزارو سێسەد کەس بوون و سەرکردەکەشیان ناوی (شەلۆمیئیل کوڕی هۆرشیدای)بوو .

**دەستەی سێهەم** : دەستەی یەهوذا بوو ، کە ژمارەیان حەفتاو چوار هەزار و شەش سەد کەس بوو ، سەرکردەکەشیان ناوی (نەخشون کوڕی عمیناذاب) بوو .

**دەستەی چوارەم** : دەستەی (ئەیساخر)بوو ژمارەشیان پەنجاو چوار هەزار و پێنج سەد کەس بون و سەرکردەکەشیان ماوی (نشائیل کوڕی صوغر)بوو .

**دەستەی پێنجەم** : دەستەی (یوسف)بوو کە ژمارەیان چل هەزار و پێنج سەد کەس بوون و سەردەستەکەشیان ناوی (یوشەع کوڕی نون)بوو .

**دەستەی شەشەم** : دەستەی (میشا)بوو ، کە ژمارەیان سیو یەك هەزار و دووسەد کەس بوون و سەر دەستەکەشیان ناوی (جەملی کوڕی فەدەهصور)بوو .

**دەستەی حەوتەم** : دەستەی (بنیامین)بوو کە ژمارەیان (سیو پێنج هەزار و چوارسەد کەس)بون و سەردەستەکەشیان ناوی (ئەبیدەن کوڕی جەدعون)بوو .

**دەستەی هەشتەم** : دەستەی (حاد)بوو ، کە ژمارەیان (چل و پێنج هەزار و شەش سەد و پەنجا کەس)بوو و سەردەستەکەشیان ناوی (یاساف کوڕی ڕەعوئیل)بوو .

**دەستەی نۆهەم** : دەستەی (ئەشیر)بوو کە ژمارەیان چل و یەك هەزار و پێنج سەد کەس بوون و سەردەستەکەشیان ناوی (فەجعیئیل کوڕی عەکرن)بوو .

**دەستەی دەھەم** : دەستەی (دان)بوو کە ژمارەیان شەست و دوو هەزار و حەوت سەد کەس بوون و سەردەسکەشیان ناوی (ئەخی عزر کوڕی عەمشدای)بوو .

**دەستەی یازدەھەم** : دەستەی (نفتالی)بوو کە ژمارەیان پەنجاو سێ هەزار و چوارسەد کەس بوون و سەردەسکەشیان ناوی (ئەخبرع کوڕی عێن)بوو .

**دەستەی دوازدەھەم** : دەستەی (زەبولۆن)بوو کە ژمارەیان (پەنجاو حەوت هەزار چوارسەد کەس بوون و سەردەستەکەشیان ناوی (ئەلیاب کوڕی حێلۆن)بوو ، ئەمەش بەپێی ئەو تەوراتەی کە بەدەستیانەوەیە ، خوای گەورە زاناترە .

بەڵام (بنولاوی)یان لەگەڵدا نەبوو ، چونکە خوای گەورە فەرمانی بە موسا کردبوو (علیه السلام) کە ئەوان چەکدار نەکەن ، چونکە بەرپرسیارێتی پاراستنی (گومەزی شهادە)یان پێدرابوو کە بیپارێزن ، چاودێری بکەن ، بیشارنەوە ، هەڵیبگرن ئەگەر هاتوو کۆچیان کرد و چۆڵیان کرد ، ئەوانیش سەر بەدەستەی (موسا و هارون)بوون و ژمارەیان بیست و دوو هەزار کەس بوو هەر لەمناڵی یەك مانگ تەمەنەوە تا دەگاتە پیرترین کەسیان ، لەهەر هۆزێك یان تیرەیەك دەستەیەکیان تەرخان کرد بۆ پاراستن و چاودێری ئەو گومەزە و بەردەوام هەر هەموویانی بەدەورییەوە بوون ، لەلای ڕاست و چەپ سەروو خوارویەوە بڵاوبوونەوە .

دیارە ئەمەش جێگەی سەرنجە و قسەلێکردنە ، چونکە زۆربەی ڕستەکان ناگونجێت لەگەڵ ئەوانی تردا ، خوای گەورە زاناترە ، بەکورتی کەس لە (بنی ئیسرائیل)نەمایەوە کە نکوڵی لەهێرش کردن بکات بۆسەر شاری خەڵکە بەتین و تاوەکە (قریە الجبارین) کە پێشتر دەیانگوت: ﴿ فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلَا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ ﴾(المائدە:٢٤) ، ئەمەش وتەی (الثوري)یە کە بردۆیەتیەوە سەر (ابن عباس)[١] و (قتادە)[٢] و (عکرمە)[٣] و (السدی)[٤] و گەلێکی تر ، وە لەبەر لاچوونی گەمارۆی سەریان هارون و موسا (علیه السلام) کۆچی دواییان کرد ، (ابن اسحاق)[5] (علیه السلام) پێیوایە کە (موسا) (علیه السلام) (بیت المقدس)ی ئازادکرد و ڕزگاری کردو (یوشەع)یش (علیه السلام) لە پێشەتای ئەوەدابووە لە ڕێگەیاندا

---

١ ضعیف الاسناد : ابن جریر ، التاریخ (٢٥٧/١) .

٢ صحیح : ابن جریر (٢٥٧/١) .

٣ پیاوانی بەمتمانە : ابن جریر (٢٥٧/١) .

٤ حسن : (٢٥٧/١) .

٥ ضعیف : (٢٥٧/١) .

بەسەرهاتی (بولعام کوڕی باعوراء) ڕوویداوە ، کە خوای گەورە دەربارەی ئەوە دەفەرموێت: ﴿ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا....... وَأَنْفُسَهُمْ كَانُوا يَظْلِمُونَ ﴾(الاعراف/١٧٥-١٧٧)

لە تەفسیرەکاندا (بەتایبەتی تفسیر القرآن العظیم) بەسەرهاتەکە مان ڕوون کردۆتەوە (ابن عباس)[1] و هەندێکیتر فەرموویانە: ئەو پیاوە ناوی هەرە گەورەی خوای گەورەی زانیوە و بەوناوەوە داوای لەخوا کردووە پاش ئەوەی گەلەکەی هاتوون بۆلای و پێیان گوتووە کە بەو ناوە پیرۆزەوە نزا لەموسا بکات (عليه السلام) ، ئەوەیش بەقسەی نەکردوون ، کاتێك تینیان بۆهێناوەو زۆریان لێکردووە کە هەردەبێت نزا لەموسا و سوپاکەی بکەیت ، ئەویش سواری وولاخەکەی بووەو بەرەو سەربازەکەی (بنی ئیسرائیل) ڕێگەی گرتوەتەبەر ، کاتێك گەیشتەلایان وولاخەکەی لەقەیەکی توندی لێ دا ، تاکو فڕێیدا ، بەڵام چونکە زۆر دوورنەبوو ، دیسان وولاخەکەی هێرشێکی تری بۆبردو لەقەیەکی توندی لەهی یەکەمجار لێدا ، هەروەها هەمان هەستان و پیاکێشانی دووبارەکردەوە .

وولاخەکەی بە(بولعام)ی گوت: بۆ کوێ دەچیت ؟ ئایا نابینی فریشتەکان لە پێشمەوەن و بەڕوخسارم دا دەکێشن ، ئایا دەچیت بۆلای پێغەمبەری خواو باوەڕداران و نزایان لێدەکەیت ؟ بەو بارەش هەر لەسەر قسەی خۆی سووربوو تاکو هەر لەقەی لێدەدرا و لەسەر لوتکەی (شاخی حوسبان) پێیان گەیشت و تەماشایەکی سەربازگەکەی موسا و (بنی ئیسرائیل)یەکانی کرد و دەستی کرد بە نزا لێکردنیان ، بەڵام هەستی بەوە کرد کە زمانی بە فەرمانی خۆی ناگەڕێ و هەرچەند دەیەوێ نزای خراپ لەموسا بکات ، نزاکەی بەچاکی بەزمانی دا دێن بۆ موسا و بەخراپی بەزمانیدا دێن بۆ گەلەکەی خۆی و گەلەکەی زۆر سەرزەنشتیان کرد لەسەر ئەو جۆرە نزایانە کە هەموویان لەدژی خۆیان و بەرژەوەندی موسا و گەلەکەیدان (عليه السلام) ، ئەویش زمانی دەرهێنا تاکو گەیشتە سەر سنگی ، ئینجا بەگەلەکەی گوت: دنیاو قیامەتم لەدەست چوو جگە لەفێڵ و تەڵەکە هیچم بۆنەمایەوە ، ئینجا فەرمانی بە گەلەکەی کرد ، کە ژنە کانیان خۆیان بڕازێننەوەو بەناوی شت فرۆشتنەوە بڕۆنە ناوسوپاکەوەو خۆیان بۆئەوان والأبکەن تاکو تووشی زیناکردنیان بکەن ، چونکە هەرکاتێ یەکێك لەوانە زینای کرد ئەوە بەسە بۆ تیاچوونیان ، ئەوانیش بەقسەی ئەویان کردو چۆنی پێگوتن وایان کرد. یەکێك لەژنەکان بەلای پیاوێکی (بەنی ئیسرائیل)یەکاندا ڕەت بوو ، ژنەکە ناوی (کەسبتی)بوو ، پیاوەکەش یەکێك بوو لەپیاوە

---

[1] حسن : هەمان (تخريج)ة ، ذمارة (٤) .

سەرگەورەکانی (بنی ئیسرائیل) و ناوی (زومری کوڕی شەلوم)بوو ، ئەڵێن گوایە: سەردەستەی (بنی شمعون)بووە ، ژنەکەی بردەناو گومەزەکەی خۆیەوە ، کاتێك هەرخۆی و ژنەکە دووبەدوو لە گومەزەکەدا مانەوە ، خوای گەورە (طاعون)ی نارد بۆ (بنی ئیسرائیل)یەکان و پەکیخستن و تەشەنەی کرد لەناویاندا ، کاتێك هەواڵەکە گەیشتەوە بە (فنحاص کوڕی عیزرای کوڕی هاڕون) نێزە ئاسنەکەی بەدەستەوە گرت و چووە سەر گومەزەکە و هەرهەموو سوپاکەیشی لەدەوری گومەزەکە کۆکردەوە ، ژن و پیاوەکەی هێنایە دەرەوە بۆ بەرچاوی خەڵکەکە و هەردووکیانی بەنێزەکەیەوە کرد و نێزەکەی لەسەر پشتی ڕانی خۆی داناو بەچەناگەی ڕاگیری کرد و بەرزی کردەوە تاکو خەڵکەکە بەباشی بیانبینن ، ئینجا فەرمووی: خوایە ئێمە ئاوا لەو کەسانە دەکەین کە لەتۆ یاخی دەبن !

پاش ئەوە خوای گەورە طاعونەکەی لەسەر هەڵگرتن و تا ئەو کاتەش حەفتا هەزار کەسیان بەو تاعونە لێمردبوو ، یان بیست هەزار کەس بوون ، خوای گەورە زاناترە ،

لەو ڕۆژەوە (بنی ئیسرائیل)یەکان لە قوربانیەکانیاندا نایابترین شت بەلایانەوە لەبەو ڕان و ڕیشە و ئەوانەش لە هەموو شتەکانیاندا ، تەنانەت بە نۆبەرە لە قەڵەم دەدەن ، چونکە (فنحاص)ی کوڕی (عیزار)ی کوڕی (هاڕون) منداڵی نۆبەرەی باوکی بووە .

(ابن اسحاق) ئاوا بەسەرهاتی (بولعام) دەگێڕێتەوەو گەلێکی تریش لەزانایان هەر وا باسیان کردووە ، بەلاّم لەوانەیە کاتێك موسا (علیه السلام) ویستی بچێتە (بیت المقدس)ەوە سەرەتا لەناوچە میصرییەکانەوە دەستی پێکردبێت ، بگرە لەوانەیە (ابن اسحاق)یش هەر ئەوەی مەبەست بوبێت . بەلاّم ئەوانەی دوای خۆی گێڕاویانەتەوە بەتەواوەتی لێی تێنەگەیشتبن ، هەروەکو پێشتریش دەقی (تەورات)مان هێنا کە ڕاستی هەندێ لەم باسە ڕوون دەکاتەوە ، خوای گەورە زاناترە .

لەوانەشە ئەمە چیرۆکێکی تربێ کە بەسەر سوپای موسا (علیه السلام) هاتووە کاتێك کە لەژێر گەمارۆکەدابوون و شوێنەکەش لە (بیت المقدس)ەوە دوور بووە ، یاخود ئەو کاتە بووە کە (یوشەع) کوڕی (نون) سەرکردایەتی سوپای کردووە ، کاتێك لە گەمارۆکە ڕزگاریان بوەو بەرەو (بیت المقدس) بەڕێ کەوتوون ، (السدی) بەڕاشکاوی لەگەڵ ئەم بۆچوونە یاندایە ، خوای گەورە زاناترە.

بە کورتی: هەموو لایەك لەسەرئەوە کۆکن کە (هارون) (علیه السلام) پێش (موسا)ی برای(علیه السلام) بەنزیکەی دوو ساڵێك کۆچی دوایی کردووەو پاشان موساش (علیه السلام) هەر لەکاتی گەمارۆکەدا کۆچی دوایی کردووەو داوایشی کرد کەخوای گەورە لە (بیت المقدس) نزیکی بکاتەوە ، خوای گەورەش داواکەی وەرگرت ، ئەمەش بۆچوونی جمهوری زایانایانە .

وادیارە ئەو کەسەی لەو گەمارۆیە دەربازی کردن و بەرەو (بیت المقدس) بردنی بریتیبوو لە (یوشەع کوڕی نون) (علیه السلام) ، (أهل الکتاب) و مێژونووسان گوتویانە: (بنی ئیسرائیل)یەکان ڕوباری (ئۆردون)یان بڕیوەو گەیشتوونەتە (ئەریحا) ، کەئەوسا قایمترین شاربوو ، چواردەوری شورە کرابوو ، بەرزترین کۆشك و تەلاری تێدابوو ، شارێکی گەورە و قەرەبالغ و ئاوەدان بوو ، بۆ ماوەی شەش مانگ گەمارۆی شارەکەدا ، ڕۆژێکیان لەناکاو هەڵیانکوتایە سەر شارەکە و بەمۆسیقەو تەپڵی سەرکەوتنەوە ڕوویان تێکرد ، هەرهەموو سوپاکەی (یوشەع) (علیه السلام) بەیەك دەنگ دەیانگوت: (الله أکبر) ، تاکو دیواری شورەکانی تێك ڕوخاو بەیەك جار دا ڕما ، چونە شارەکەوەو هەموو شتەکانیان بە غەنیمە بۆ خۆیان دەست بەسەرداگرت ، دوازدە هەزار کەسیشیان لێکوشتن بەژن و پیاویانەوە ، لەگەڵ گەلێك لە میرەکانیاندا بەجەنگ هاتن ، وتراوە (یوشەع) (علیه السلام) توانی دەربکەوێت و زاڵ بێ بەسەر سیویەك میر لە میرەکانی شام ، وا باس دەکرێت کە تاکو دوای عەسری ڕۆژی هەینی گەمارۆکەیان درێژەی هەبوو بۆسەر ئەو شارە . کاتێك خۆرئاوابو ، یان خەریك بو خۆرئاوابێ ، ئیتر ئەو ڕۆژە دەهاتە پێشەوە کە ڕۆژی شەممەیە و لەیاسای ئاینی ئەوانیش دا جەنگ و خوێن ڕشتن لەڕۆژانی شەممەدا حەرام بوو ، بۆیە (یوشەع) (علیه السلام) بەخۆری فەرموو: تۆ فەرمانبەری خوای گەورەیت ، هەروەها منیش فەرمانبەریم ، خوایە ئەم ڕۆژەش بۆ من دابنێ (واتە بە منی بسپێرە و هەینیم بۆ بخەرە سەر ڕۆژی شەممە کە سبەینێیە) ، خوای گەورە داواکەی وەرگرت تاکو بتوانێت ئەو شارە ڕزگار بکات ، هەروەها خوای گەورە فەرمانی بە (مانگ)یش کرد کە هەڵنەیەت و دەرنەکەوێ و بوەستێ ، ئەویش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو شەوە شەوی چوار مانگی یەکەم بوە ، دواییش بەپشتیوانی خوای گەورە باسی چیرۆکی ئەو خۆر وەستاندنە دەکەین لە فەرموودەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) ، بەڵام چیرۆکی وەستانی مانگ لای (أهل الکتاب) شتێکی ترە ، گەرچی دژوار نیە لەگەڵ فەرموودەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) ،

باش وایە نەبەدرۆی بزانین و نەبەڕاست ، بەڵام کە بڕوایان وابووە ئەو ڕوداوە لە ڕزگارکردن و گرتنی (ئەریحا)دا بووە ، ئەمەیان جێگەی تێڕامان و گفتوگۆیە ، خوای گەورە زاناترە .

لەوەیانەوە نزیکترە کە ئەم ڕووداوە لە ڕزگارکردنی (بیت المقدس)دابوبێت ، کە مەبەستی هەرەگەورە بووەو ڕزگارکردنی (ئەریحا) هۆکارێك بووە بۆ گەیشتن بە ڕزگاری کردنی ئەو ، خوای گەورە زاناترە . (پێشەوا احمد)[1] فەرموودەیەکی هێناوە کە دیباتەوە سەر (ابن سیرین) ، ئەویش لە (ابو هریرە)وەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خۆر بۆ هیچ کەسێك بەندنەکراوە ، بۆ یوشەع نەبێت ، ئەویش ئەو شەوانەی کە بەرەو (بیت المقدس) دەڕۆیشت) ، ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی گرنگە لەسەرئەوەی کە ئەو کەسەی (بیت المقدس)ی ڕزگار کرد (یوشەع)ی کوڕی (نون)بوە (علیه السلام) نەك (موسا) (علیه السلام) وەخۆر وەستێنرا بۆ ڕزگارکردنی (بیت المقدس) نەك بۆ ڕزگارکردنی (ئەریحا) ، هەروەکو پێشتریش هەروامان باس کرد ، هەروەها بەڵگەیە لەسەر لاوازی ئەو فەرموودەیەی کەگوایە خۆر وەستێنراوە بۆ (عەلی کوڕی ئەبی طالب)[2] تاکو نوێژی عەسری نەچێت ، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ڕانی ئەو خەوی لێکەوتبوو ، وەهەرگیز شتیوا نەبووە ، وەك فەرموودەکەش ئاماژەی بەوە کردووە کە خۆر بۆ هیچ کەسێك ڕانەگیراوە لە مرۆڤەکان جگە لە (یوشەع) (علیه السلام)، دیارە (علی) کوڕی (ئەبی طالب)یش مرۆڤێکە وەکو هەموو مرۆڤێکی تر . تەنانەت ئەگەر خۆر بۆ نوێژی عصر گەڕاندرابێتەوە ئەوا دەبێت ئەو نوێژە هەر (قضاء) بکرێتەوە ، چونکە بەئاوابوونی خۆر نوێژەکە دەچێت و بەگەڕانەوەی خۆر (اداء) ناکرێتەوە .

(پێشەوا أحمد) فەرمودەیەکی بردۆتەوە سەر (أبی هریرە) کە دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (یەکێك لەپێغەمبەران غەزای دەکرد ، بەگەلەکەی خۆی فەرموو: ئەو کەسە نەیات بۆ غەزا لەگەڵمدا کەچەند ژنێکی هەیە و دەیەوێت خانوویان بۆبکات و تائێستا نەیکردووە یان ئەو کەسەی خانووەکەی دروست کردووە سەرینەگرتوون ، یان ئەو کەسەی مەڕومالاتی کڕیوە و چاوەڕوانی وانییان دەکات) ، پاشان فەرمووی: (غەزای دەست پێکرد و لەشارەکە نزیك بوەوە ، کە نوێژی عەسری کردبوو ، یان نزیك نوێژی

---

[1] صحیح الاسناد : المسند ( ٢/٣٢٥ ) .

[2] موضوع : ابن جوزی في الموضوعات (١/٣٥٥) . الالبانی في الضعیفة (٩٧١) .

عەسر بوو ، بەخۆری فەرموو: تۆ فەرمانبەری خوای گەورەیت ، وە منیش هەر فەرمانبەری ئەو خوایەم ، پەروەردگارا بەشێك لەو ڕۆژەم بۆدابنێ ، ئیتر خوای گەورە خۆری ڕاگیرکرد تاکو شارەکەی ڕزگار کرد) ، ئینجا فەرمووی: (هەرچیان بە غەنیمە گرتبوو کۆیان کردەوە ، ئاگرێك هات تاکو بیخوات (واتە غەنیمەکە بسوتێنێ) ، بەلاّم ڕازینەبوو بیخوات (واتە پەسەند و وەرگیراو نەبوو) پێغەمبەرەکە فەرمووی: ناتەواویتان تێدایە ، وەرن بەیعەت و بەڵێنم بدەنێ لەهەر هۆزێك پیاوێك (بە نوێنەرایەتی ئەوان) هاتن و پەیمانتان پێداو دەستی پیاوێك نوسا بەدەستی پێغەمبەرەکەوە ، فەرمووی: دیسان ناتەواوتان تێدایە (واتە کەسانی خائن) بەڵێنی هۆزەکەتم بدەرێ ، هۆزەکە بەیعەتیان پێدا دەستی دوو یان سێ پیاویانی گرت و فەرمووی دیسان فێڵ و غەش و ناتەواویتان تێدایە ، ئێوە کە فێڵ و غەشتان کردووە) فەرمووی: (ئیتر وەکو سەرەگاجوت کلۆ ئاڵتونیان بۆ هێنا ، ئەویش خستیەسەر غەنیمە کۆکراوەکە و ئینجا ئاگرەکە پەسەندیکرد و سوتاندی

بەڵێ بەوجۆرە بووەو هەرگیز بەر لەئێمە گەلانی تر غەنیمەیان پێحەلاڵ نەبووە ، بەلاّم خوای گەورە دەزانێت کە ئێمە لاوازین ، بۆیە بۆی حەلاڵ کردین [1] .

بەکورتی مەبەست لەوەیە کەکاتێك (یوشەع) (علیه السلام) ئەوانی گەیاندە دەروازەی شارەکە ، فەرمانیان پێکرا کە بەکڕنوش و ئەژنەوینەوە بچنە ژوورەوەو زۆر بێفیز و سادە بڕۆن و سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەو سەرکەوتنەو لەکاتی چونە ژوورەوەشیاندا بڵێن: (حطة) ، واتا: خوایە ببورە لەتاوانەکانی ڕابوردومان بەتایبەتی ئەو نکوڵییەی کە دەمانکرد ، هەروەکو چۆن پێغەمبەرمان (محمد) (ﷺ) کاتێك شاری مەککەی ئازاد کرد ، زۆر بە بێفیزی بەسواری ووشترەکەیەوە بوو ، تەنانەت دامێنی ڕیشی دەدرا لەسەر کۆمەکەی پشتی وشترەکەی ، چونکە سەری داخستبوو وەك خۆ بەبچوکزانێك بۆ خوای گەورەو سوپاسکردنی و سوپاسەکەیشی لەدوایەوە بە بێفیزی و چاو وردکردنەوەوە لەدوایەوە دەڕۆیشتن ، بەتایبەتیش (کەتیبەی سەوز) کە پێغەمبەریان لەگەڵدابوو ، ئینجاش پاش چوونە ژوورەوەیان خۆی شۆرد و دەستنوێژی گرت و هەشت ڕکات نوێژی کرد [2] کە نوێژی سوپاسکردنی خوای گەورەبوو ، ئەمە بەلای زۆربەی زانایانەوە بەلاّم

---

[1] متفق علية : مسلم (٤٥٣٠) ، بخاري (٣١٢٤) ، مسند(٢/٣١٨)

[2] صحيح : رواة البخاري (٤٢٩٢) .

هەندێ لە زانایان فەرموویانە (نوێژی چێشتەنگاو بوو ، بەڵام (بەنی ئیسرائیلی)یەکان سەرپێچی ئەو فەرمانەیان کرد بەگفتار و بەکردار بە قنگەخشکێ چوونە شارەکەوەو لەجیاتی بڵێن (حطة) گوتیا (حنطة) ، لەگێرانەوەیەکی تردا هاتووە کە گوتویانە (حبە ف شعره)[1] ، واتە دەنکە جۆ .

بە کورتی: ئەوەی کە خوای گەورە فەرمانی پێکردبوون گۆڕییان ، وەك خوای گەورە لە دوو سورەتی قورئانی پیرۆزدا باسی ئەو کارە دزێوەی ئەوان دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ اسْكُنُوا هَذِهِ الْقَرْيَةَ وَكُلُوا ....... فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِجْزاً مِنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَظْلِمُونَ ﴾(الاعراف١٦١-١٦٢) ، هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُوا هَذِهِ الْقَرْيَةَ ....أَنْزَلْنَا عَلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا رِجْزاً مِنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴾(البقرە:٥٨-٥٩) .

(الثوري) فەرموودەیەکی بردۆتەوە سەر (ابن عباس)[2] کە مانای﴿ وَادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّداً ﴾ واتا: بە رکوع و نەوینەوە لەدەرگا بچوکەکەی شارەوە بچنە ژوورەوە[3] ، (مجاهد)[4] و (السدی)[5] و (ضحاك)[6] فەرموویانە: دەرگاکە ناوی (حطة)یە کە دەرگای (بین الیا)یە لە دەرگاکانی (بیت المقدس)ە ، (ابن مسعود)[7] دەفەرموێت: ئەوان سەریان داخستبوو کە چوونە شارەکەوە کە هاوتای (ابن عباس)ە کە فەرمویەتی: بەقنەخشکێ چوونە شارەکەوە

(وقولوا حطة) : واتە بەدەم بڵێن: خوایە لێمان خۆشبە و بەکردەوەش کڕنووش بەرن ، ئەمەش لێکدانەوەی (ابن عباس)[8] و (عطاء)[9] و (حسن و قتادە)[10] و (الربیع)ە[11] .

---

[1] صحیح : رواة البخاري (٣٤٠٣) .

[2] صحیح الیة : الحاکم (٢٦٢/٢) ، ابن جریر (١/ج١ / ٢٩٩-٣٠٠) ، ابن ابي حاتم (٥٧٦) .

[3] ضعیف الاسناد : ابن جریر (١/ج١ / ٢٩٩ - ٣٠٠) .

[4] صحیح الیة : ابن جریر (١/ج١ / ٢٩٩ - ٣٠٠) ابن ابي حاتم (٥٧٤) .

[5] حسن الیة : ابن جریر (١/ج١ / ٢٩٩ - ٣٠٠) .

[6] ابن أبي حاتم بەبێ (سند) هێناویەتی ، دوای فقەرمودەی ژمارە (٥٧٤) .

[7] سندة لاباس بة : ابن ابي حاتم (٥٧٩) .

[8] صحیح الیة : ابن جریر (١/ج١ / ٣٠٠) .

[9] صحیح الیة : ابن جریر (١/ج١ / ٣٠٠) .

[10] في اسنادة ضعف : ابن جریر (١/ج١ ٣٠٠) ، عبدالرزاق (٥٨) .

[11] ضعیف الیة : هەمان سەرچاوە بە (سند)ێکی لاوازەوی

(پێشەوان بخاری)[1] فەرموودەیەکی هێناوە کە دەیباتەوە سەر (ابو هریرە) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (بە بەنی ئیسرائیلیەکان گوترا : ﴿ وَادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّداً وَقُولُوا حِطَّةٌ نَغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ وَسَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ ﴾ کەچی ئەوان بەقنگەخشکی چوونە ژوورەوەو (حطة)یان گۆڕی بە (حطة حبە فی شعرە) ، هەروەها چەند گێڕانەوەیەکی تر بۆ هەمان فەرموودە هەیە کە جەوهەری واتاکەیان هەر هەمان مانای هەیە [2] ، لە (ابن مسعود)یشەوە[3] دەگێڕنەوە مانای ئەم ئایەتە ﴿ فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُوا قَوْلاً غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ فَأَنْزَلْنَا عَلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا رِجْزاً مِنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴾(البقرە:٥٩) ئەوەیە کە ئەوان لەجیاتی داوای لێبوردون لەخوای گەورە بکەن و سوپاسی بکەن ، کەچی قسەکەیان گۆڕی و گوتیان: (هطي سقانا أزمة مزیا) ، کە مانای کوردی بەم جۆرەیە: (دەنکە گەنمێکی سووری کوناودەر کە موویەکی ڕەشی تێدابێ) ، دیارە ئەو قسەیەش زۆر دوورە لەو قسەیەی کەداوایان لێکرابوو ، وە فەرمانیان پێکرابوو ، بۆیە خوای گەورەش سزایدان و بەڵای تاعونی بۆ ناردن[4] .

لە هەردوو (صحیح)ەکەدا[5] هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەم ئازارە و دەردە (واتا تاعون) ئازارێکە خوای گەورە هەندێ لەگەلانی پێش ئێوەی پێ ئازارداوە ، (النسائی)[6] فەرموودەیەکی هێناوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (تاعون سزاو بەڵایەکی ئەو گەلانەی پێئازار داوە کە لەپێش ئێوەدابوون) ، سەبارەت بە ووشەی (رجز) لەو فەرموودەیەی پێغەمبەردا (ﷺ) زانایان لێکدانەوەی جیاوازیان هەیە ، کە هەندێکیان فەرموویانە مانای (ئازار)ە ، هەندێکی تر فەرموویانە مانای (الغضب)ە ، وە هەندێکیتر فەرموویانە مانای (تاعون) یان (تەرزە)یە ، بەڵام زۆرینەیان لەگەڵ ئەوەدان کەمانای (تاعون)ە و خوای گەورەش بۆ چەند گەلێکی دێرینی ناردووە ، لەوانەش (بنی ئیسرائیل)یەکان .جاکاتێك ئەوان بوون بەخاوەنی شارەکە و تیایدا نیشتەجێبوون ، لەپاڵ (بیت المقدس)دا ژیانیان بەسەردەبردو پێغەمبەرەکەشیان (یوشەع) (علیە السلام)

---

[1] صحيح البخاري (٤٤٧٩) ، النسائي الكبري (١٠٩٨٩) موقوفاً ، (١٠٩٩٠) مرفوعاً .

[2] متفق علية : البخاري (٣٤٠٣) ، مسلم (٤٧٣٩) ، الترمذي (٢٩٥٦) .

[3] صحيح لغيرة : ابن جرير (١/ج١ ٣٠٢) .

[4] حسن : ابن أبي حاتم (٥٨٨) .

[5] متفق علية : البخاري (٣٤٧٣) و (٦٩٧٤) ، مسلم (٥٧٢٨) و (٥٧٣٣) .

[6] صحيح : النسائي الكبرى (٧٥٢٣) ، ابن ابي حاتم (٥٩١) ، مسلم (٥٧٤٢)

**لەناویاندابوو ، بەپێی (تەورات)ی پیرۆز پەیامی خوایی پێڕاگەیاندن و حوکمڕانیشی دەکردن ، هەتاوەکو خوای گەورە تەمەنی (یوشەعی) گەیاندە سەد و بیست و حەوت ساڵ و پاشان کۆچی دوایی کرد ، واتا تەنها ماوەی بیست و حەوت ساڵ دوای (موسا) (علیە السلام) ژیاوە درووود و بەزەیی خوایی بۆسەر گیانی هەموو پێغەمبەران بەگشتی و پێغەمبەری ئازیزمان (محمد) (ﷺ) بە تایبەتی .**

## ﴿ خضر وئیلیاس ( درووود و سلاّوی خوایان لەسەر بێت ) ﴾

**خضر(سەلامی خوای لە سەر بێت)**

لە ژیانی موسادا (علیه السلام) ئاماژەمان بەوەدا کە (خضر) (علیه السلام) ئەو پیاوەبوو کەموسا ((علیه السلام) بەدوایدا ویڵ بوو ، تاکو دۆزیەوە ، بۆئەوەی لێوەی فێری زانستی دنیایی بێت ، وە خوای گەورە لە سورەتی (الکهف)دا چیرۆکەکەی باس کردووە ، هەروەها ئەوەشمان بۆ ڕوون بوەوە کە ئەو موسایەی دوای دۆزینەوەی (خضر) (علیه السلام) کەوتبوو ، ئەو موسایە کە پێغەمبەری خوابوەوە (موسای کوڕی عمران)ەو (تەورات) بۆ ئەو دابەزیوە ، سەبارەت بە (خضر) (علیه السلام) و ناوی تەواوەتی و بن و بنەچەی و چۆنیەتی ژیانی ڕاوبۆچوونی جیاوازی هەیە کە بەپشتیوانی خوای گەورە لێرەدا باسیان دەکەین .

(حافظ کوڕی عساکر)[١٣٤] دەفەرموێت: وتراوە کە (خضر) دەچێتەوە سەر ئادەم لەپشتیەوە ، هەروەها (الدارقطني) لەچەند کەسێکەوە دەگێڕێتەوە تا دەگاتەوە بە (ابن عباس) کە فەرموویەتی: (خضر کوڕی ئادەمە لەپشتیەوە ، مەرگی دواخراوە تاکو دەجال بەدرۆ بخاتەوە ، بەلاّم ئەم لێکدانەوەیە جێگەی گومانە ، لەو ڕووەوە ئاخۆ فەرمودەی (ابن عباس)ە[١٣٥] یان نا ، هەروەها براوەتەوە سەر (ابو عبیدە)ە و هەندێکی تر کە وتراوە: تەمەنی درێژترین کەس لەکوڕانی ئادەم (خضر)ە ، کەناوی (خضرون کوڕی قابیل کوڕی ئادەم)ە ، (ابن اسحاق)یش[١٣٦]دەفەرموێت: کاتێك ئادەم (علیه السلام) لە سەرەمەرگدابوو بە کوڕەکانی خۆی ڕاگەیاند کە لافاوێکی گەورە ڕوودەدات ، وە ڕایسپاردن کە ئەگەر ڕوویدا تەرمەکەی لەگەڵ خۆیان لە کەشتیەکەدا هەڵبگرن و لەو شوێنە ئەسپەردەی خاکی بکەن کەبۆی دیاریکردبوون ، جاکاتێك لافاوەکە ڕویدا تەرمەکەیان لەگەڵ خۆیاندا برد کە لافاوەکەش نەما و خەڵکی دابەزینە خوارەوە (لەکەشتی نوح) (علیه السلام) بۆ سەر زەوی نوح (علیه السلام) فەرمانی بە کوڕەکانی کرد تەرمەکەی بێنن و لەو شوێنەدا کە خۆی (واتا: ئادەم (علیه السلام) وەسیەتی کردبوو ئەسپەردەی خاکی بکەن ، وتیان: زەوی دۆستایەتی هەڵناگرێت و کەس لەناو گۆڕدا

---

[١٣٤] ضعيف جدا / ابن عساكر – تاريخ دمشق (١٦/٤٠٠) .

[١٣٥] رواة ابن عساكر .

[١٣٦] هەمان باس و سەرچاوەی پێشوو .

هاوەڵی نیه ، زۆر لەسەرئەوە سووربوون ، (نوح) ((علیه السلام) : ئاخر ئادەم (علیه السلام) نزای کردووە کە هەرکەسێك ئەسپەردەی خاکی بکات (لەو شوێنەدا) خوای گەورە تەمەنی درێژبکات ، ئیتر چوونە هەمان شوێنی زوو ، کە ئادەم تیایدا بەخاك سپێرابوو ، بەڵام تەرمەکەیان لەلانەبوو ، تاکو (خضر) (علیه السلام) چوو تەرمەکەی هێنا و بەخاکی سپارد و خوای گەورەش نزاکەی ئادەمی وەرگرت و تەمەنی درێژکرد بۆ ئەو کاتەی کەخۆی (واتە: خوای گەورە) دەیەوێت دەیژێنێ ، (ابن قتیبە) لە (المعارف)دا دەفەرموێت: لە (وەهبی کوڕی منبە)وە کە (خضر) ناوی تەواوەتی بریتییە لە (بیلیا) ، وتراویشە بلیا کوڕی ملکان کوڕی فالغ کوڕی عانر کوڕی شالخ کوڕی ئەرفەخشد کوڕی سام کوڕی نوحە (علیه السلام) ، اسماعیل کوڕی (أبی أویس) فەرموویەتی: (خضر ناوی (مەعمەر کوڕی مالك کوڕی عبدالله کوڕی نصر کوڕی ئەزەد)ە ، خوای گەورە زاناترە ، هەروەها وتراوە : ناوی خضرون کوڕی عمیاییل کوڕی فەیز کوڕی عیص کوڕی (اسحاق) کوڕی (ابراهیم)ە (علیه السلام) یان ناوی (ئەرمیا کوڕی حولقیا)یە ، خوای گەورە زاناترە .

بگرە وتراوە : کوڕی (فرعون)ی سەردەمی موسا (علیه السلام) بووە ، کە پاشای (میصر)بوە ، بەڵام ئەمەیان زۆر دوور و نەشیاوە ، (ابن جوزی) دەفەرموێت: محمدی کوڕی ئەیوب لە (ابن لهیعە)وە (کە هەردووکیان لاوازن) دەگێڕنەوە کە (خضر) کوڕی (مالك) بووە ، کە برای (ئیلیاس)ە (علیه السلام)، وەکە (السدی) وای فەرمووە .

وتراوە: لەسەرەتای پەیدابوونی (ذي القرنین)دا بووە ، وتراوە: کوڕی یەکێك لەو کەسانەیە کەکاتی خۆی باوەڕیان بە (ابراهیم) (علیه السلام) هێناوە و لەگەڵیدا کۆچیان کردووە ، وتراوە: خضر پێغەمبەرێکی خوایە و لەسەردەمی (پشتاسب)ی کوڕی (بەهراسب)دا بووە . (ابن جریر) دەفەرموێت: ڕاست ئەوەیە کە پێش سەردەمی ئەفرەیدون کوڕی ئیثفیان دا بووەو تا ئەو کاتە ژیاوە کەخوای گەورە موسای کرد بە پێغەمبەر (علیه السلام) (ابن عساکر)[١٣٧] دەگێڕێتەوە لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە کە فەرموویەتی: دایکی (خضر) ڕۆمییە و باوکیشی فارسە ، هەروەها بەو جۆرەش باس کراوە کە لە (بنی ئیسرائیل)یەکانە و لە سەردەمی (فرعون)دا ژیاوە . (أبو زرعە) لە (دلائل النبوە)دا[١٣٨] فەرموودەیەکی بردۆتەوە سەر (ثوبەی کوڕی کەعب) کە ئەوشەوەی

---

[١٣٧] ضعیف الاسناد : ابن عساکر ، تاریخ دمشق (٤٠١:١٦) .

[١٣٨] ضعیف .

پێغەمبەر (ﷺ) بڵندکرایەوە بۆ ئاسمان بۆنێکی خۆشی بەلادا هات ، فەرمووی: (ئەی جوبرائیل ئەم بۆنە خۆشە چییە ؟ فەرمووی ئەوە بۆنی کوڕی ژنە سەرداهێنەرەکە و دوو کوڕو مێردەکەیەتی) ، بەرلەوە (خضر) یەکێك بووە لەپیاوە ناودارەکانی (بنی ئیسرائیل) و بەلای (ڕاهب)ێکدا تێپەڕی کە لەدێرەکەی خۆیدا خواپەرستی دەکرد ، ڕاهبەکە بینی و هات بۆلای و ئیسلامی بۆ ڕوون کردەوە و فێری کرد ، کاتێك (خضر) بالق بوو ، باوکی ژنی بۆهێنا ، ئیسلامی فێرکرد و پێی ڕاگەیاند کە بەهیچ کەسێك نەڵێت وەك نهێنی بیپارێزێت .

ئەو لە ژن نزیك نەدەبووەوە ، لەبەرئەوە تەلاقیدا ، باوکی ژنێکی تری بۆهێنا ، ئەویشی فێری ئاینی ئیسلام کرد و پێی ڕاگەیاند کە بەکەس نەڵێت ، پاشان ئەویشی تەلاق دا ، یەکێکیان نهێنییەکەی پاراست و ئەوەی تریان ئاشکرای کرد ، لەبەرئەوە (خضر) سەریخۆی هەڵگرت و ڕۆیشت ، تاگەیشتە دورگەیەکی کەنار دەریایەك ، دوو پیاوی بینی کە خەریکی دارکۆکردنەوەبوون ، یەکێکیان (خضر)ی بینی ئەوی تریان نەبینی ، یەکێکیان نەیگوت: (خضر)م بینیوەو باسی نەکرد ، بەڵام ئەوەیتریان ئاشکرای کرد و گوتی: (خضر)م بینی ، وتراوە: ئەی کێیتر لەگەڵ تۆدا خضري بینی ؟ وتی فلانە کەس ! پرسیاری لەو فلانە کرد ، ئەویش دانی پیانەنا و شاردیەوە ، لەئاینی ئەوانیشدا وابووە کە دەبوایە درۆزن بکوژرایە ، پیاوە درۆزنەکەی کوشت ، پیاوە نهێنی پارێزەکە ژنە نهێنی پارێزەکەی خواست ، وتراوە کاتێك ئەو ژنە قژی کچی فرعونی بەشانە دەکرد و بۆی دادەهێنا ، شانەکە لەدەستی کەوتە خوارەوە ، گوتی: نەگریسی فرعونە! کچەکە قسەکەی بۆ باوکی (واتە: فرعون) گێڕایەوە ، ژنەکە دوو کوڕ و مێردێکی هەبوو ، فرعون ناردی بەشوێنیاندا ، کە ژنەکەی بینی زۆر بەلایەوە جوان بوو ، پێی گوت: دەتکەمە ژنی خۆم ئەگەر ئێوە لەسەر دینەکەی خۆتان نەمێنن ، ئەوانیش ئەو قسەیان پەسەند نەکرد و ڕەتیان کردەوە ، پێی گوتن:کەواتە: دەتانکوژم!

گوتیان : چاکەمان لەگەڵدا دەکەیت ئەگەر پاش کوشتنەکەمان هەردووکمان بخەیتە ناو یەك گۆڕەوە ، ئەویش پاش کوشتنەکەیان هەردووکیانی پێکەوە خستەناو یەك گۆڕەوە ، هەربۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (هیچ بۆنێکم نەدیوە لەبۆنی گۆڕی ئەو دوانە خۆشتربێ) ، ئیتر ئەم بەسەرهاتە بە بەسەرهاتی (ژنە سەر داهێنەرەکەی کچی

فرعون)[١٣٩] ناسراوە و درێژەی هەیە تاکو ناوی (خضر) ، وتراوە: کوێنەکەی (ابو العباس)ە ، (خضر) نازناوێکە تازە بەسەریا زاڵ بووەو بەوە ناسراوە .

(پێشەوا بخاری)[١٤٠] فەرموودەیەکی هێناوە کە دیباتەوەسەر (أبو هريرە) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ناوی نراوە خضر ، چونکە لەسەر فەرویەکی سپی دانیشتووە ، کەچی کەوتۆتە هەژان و لەدوایەوە سەوزهەڵگەڕاوە) ، (عبدالرزاق) دەفەرموێت: (فەروە) لەم فەرموودەیەدا مانای گیای ووشکە ، کە ڕەنگی سپی بووبێت ، یان هەرشتێ لەوەبچێ ، واتا: گرژوگیای ووشك ، (الخطابي)یش دەفەرموێت: (أبو عمر) فەرموویەتی: (فەروە) واتا: ئەو زەویە سپی و ڕوتەنەی کە گرژوگیای لێناڕوێت ، وتراوە: (فەروە) مانای پێستی سەرو مووەکانی دەگرێتەوە .

دیسان (الخطابي) دەفەرموێت: بۆیە پێی وتراوە (خضر) ، چونکە زۆر جوان ڕووشیرین و ڕوخسار ڕووناك بووە ، منیش دەڵێم: ئەمەش پێچەوانە نیە لەگەڵ ئەوەی کە لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتووە (ﷺ) .

لە گێڕانەوەیەکی تردا کە هەر (ابن عساکر)[١٤١] هێناویەتیو کۆتایی فەرمودەکەی بردۆتەوە سەر (ابن عباس) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (بۆیە ناوی نراوە خضر ، چونکە نوێژی لەسەر فەرویەکی سپی کردووەو دوایی بوە بەسەوز) ، دیسانەوە لە (مجاهد)ەوە دەگێڕنەوە کە بۆیە ناوی (خضر)ە ، چونکە کاتێك نوێژی دەکرد دەوروبەری سەوز دەبوو . پێشتریش باسی ئەوەمان کرد کەموسا و یوشەع (عليه السلام) کاتێك گەڕانەوە بەجێگەکەی خۆیاندا (خضر)یان بینی کە لەسەر سەوزاییەك لەکەنار دەریا دانیشتبوو بەکراسێك و دەستێکی نابوە بن سەری و دەستەکەی تریشی نابوەبن قاچەکانی خۆی ، .... تاکوتایی فەرموودەکە ، ڕووداوەکەش بەڕادەیەك گەورەیە کە خوای گەورە لە قورئاندا بۆ پێغەمبەری سەروەرمان باسی فەرمووە (ﷺ) ڕەوتی گێڕانەوەی چیرۆکەکە وانیشان دەدات کە (خضر) پێغەمبەربووە (عليه السلام) ، ئەویش لەچەند ڕووکارێکەوە کە ئەمانەن:

---

[١٣٩] حسن : رواة احمد (٣٠٩/١-٣١٠) ، ابن حبان (٢٩٠٢-٢٩٠٤) ، الطبراني (١٢٢٧٩) . ابن عساكر (٤٢٠/١٦) .

[١٤٠] صحيح : البخاري (٣٤٠٢) .

[١٤١] ابن عساكر ، تاريخ (٤٠٢/١٦) .

**یەکەم** : فەرمووودەی خوای گەورە ﴿ فَوَجَدَا عَبْداً مِنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِنْ لَدُنَّا عِلْماً﴾ (الكهف:٦٥) .

**دووەم** : فەرمووودەی موسا (علیه السلام) کەداوای لە خضر کرد هاوەڵایەتی بکات ، وەکو خوای گەورە داواکاریەکەی موسای لەقورئاندا باس کردووە کە بە (خضر)ی فەرموو: ﴿ قَالَ لَهُ مُوسَى هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَنْ تُعَلِّمَنِ ......حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْراً ﴾(الكهف:٦٦-٧٠) ، جا ئەگەر (خضر) تەنها پیاوچاکێك بوایە و پێغەمبەر نەبوایە ئەو موسا (علیه السلام) بەو شێوەیە گفتوگۆی لەگەڵدا نەدەکرد و ئەویش بەو جۆرە وەڵامی موسای نەدەدایەوە ، ، ئەوەبوو موسا (علیه السلام) داوای لێکرد کەیاوەری و هاوڕێیەتی بکات تاکو لێوەی فێری زانست و زانیاری بێت .

خۆئەگەر پێغەمبەر نەبوایە ئەوا (معصوم)نەدەبوو ، وە موساش (علیه السلام) زانست و پلەی لەپیاوچاکان کەمتر نەبووە ، تاکو داوای زانیاریان لێبکات پاش چەند ساڵێك گەڕان بەدوایدا ئینجا دۆزیانەوەو کاتێك دۆزیشیەوە زۆر بەبێفیزی لەبەردەمیدا دانیشت تاکو فێری زانیاری بکات ، دیارە ئەوە مانای ئەوەیە کە (خضر)یش پێغەمبەر بووەو وەحی لەلایەن خوای گەورەوە بۆهاتووەو تایبەت بووە لەزانستە دنیاییەکاندا ، کە موسا (علیه السلام) ئەو بەهرەیەی پێنەدراوە بەو ڕادەیەی بە (خضر)دراوە (علیه السلام)

**سێهەم** : (خضر) (علیه السلام) دەست پێشخەری کرد لەکوشتنی ئەو منداڵە ، دیارە ئەوەش شتێکی شاراوەو نهێنی لەدواوەیە کە خوای گەورە بەوەحی بە (خضر)ی ڕاگەیاندووە (علیه السلام) ، وە بەڵگەیەکی تێروتەواوەو سەربەخۆیە لەسەر پێغەمبەرایەتی (خضر) (علیه السلام) و (معصوم)ی ئەو ، چونکە پیاوچاك ڕێگەی ئەوەی پێنەدراوە کەخەڵکی بکوژێ ، ئەگەر خوای گەورە بەوەحی بە پێغەمبەرێکی ئاگادار نەکاتەوە هیچ کەسێك نازانێت ئاخۆ منداڵێك کە گەورەبوو بێباوەڕ دەبێ یان باوەڕدار ؟

ئەوە تەنها لەبازنەی زانیاری خوای گەورەدایە و کەس نایزانێ ، مەگەر خۆی بەندەیەکی خۆی ئاگادار بکاتەوە کە ئەو بەندەیە پێغەمبەربێت (وەك خضر) هەر ئەم شتانەن کەبۆنەتە بەڵگە بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتی (خضر) بەدەستی (ابن جوزی) و (الرمانی)یەوە

**چوارەم** : لەدوای هەموو ڕووداوەکان (خضر) (علیه السلام) هۆکاری ڕووداوەکان بۆ موسا (علیه السلام) ڕاڤەدەکات و لێك دەداتەوەو پێی دەفەرموێت: ئەی موسا ﴿ رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ

﴿وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي﴾ (الكهف:٨٢) ، واته ئەی موسا ڕەحمەتی خوات لێبێت خۆمن بەویست و فەرمانی خۆم سەربەخۆ ئەم کارانەم نەکردووە ، واتە: وەحی لەلایەن خواوە بۆهاتووە ، کەواتە ئەمەش دەیسەلمێنێ کە (خضر) (علیه السلام) پێغەمبەر بووە ، ئەمەش دوورنیە و دژواریش نیە لەگەڵ ئەوەدا کە وەلیبووبێت پەیامی لەخواوە بۆهاتبێت .

بەڵام ئەوەیان کە گوایە (خضر) فریشتەبووبێت ، ئەمە شتێکی دوور و نامۆیە ، وە پێشتر سەلماندمان کە پێغەمبەر (علیه السلام) ، وە وەلی تەنها کەمێك لە ڕاستیەکانی نیشان دەدرێ و خۆی شتی تریان لێوە ڕاڤەدەکات و جێگەی پشت پێبەستنی تەواوەتی نیە ، وەك ئەوەی کەوەحی پێغەمبەران بێت و شەرع و یاسا و فەرمانی یەکلاکەرەوەی لەخوای گەورەوە بۆبێت .

سەبارەت بەوەی ئاخۆ تاکو ئێستاش لەژیاندا ماوە یان نا ؟ ئەوەیان جێگەی مشت و مڕێکی زۆرە لەنێوان زانایاندا و تائەمڕۆش درێژەی هەیە ، چەندین بۆچوون لەو بارەیەوە گوتراون: لەوانەش وتراوە: چونکە پاش لافاوەکە ئەو هات تەرمی پیرۆزی ئادەمی بەخاك سپاردەوە لەو جێگەیەدا کە وەسێتی بۆکردبوو ، لەبەر ئەو هۆکارە بەر نزاکەی بابە ئادەم کەوتووە (علیه السلام) کەنزای کرد بۆ ئەو کەسەی تەرمەکەی ئەسپاردە بکات ، خوای گەورە تەمەنی درێژ بکات ، وتراوە چونکە ئەو پیاوە لەئاوی ژیان و زیندەگی خواردۆتەوە تائێستاش لەژیاندا ماوە[١٤٢] وهەندێ شت باس دەکەن کە بەڵگەی لەسەر ئەوەی کەگوایە تائێستاش ئەو هەر لەژیاندا ماوەو دوایی باسیان دەکەین ، ئەوەی خوارەوەش ئەو وەسیەت و دوا ئامۆژگاریانەیە کە لەسەر داوای موسا (علیه السلام) (خضر) (علیه السلام) بەموسای ڕاگەیاند ، کەخوای گەورە بۆ پێغەمبەری ئازیزمان (ﷺ) باسی فەرمووە:﴿ قَالَ هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِعْ عَلَيْهِ صَبْراً ﴾ (الكهف:٧٨) ، ئەمەش گەلێك گێڕانەوەی لەسەرە ، لەوانەش (البیهقی)[١٤٣] گێڕانەوەیەك دەباتەوەسەر (عبدالله الملطي) کە دەفەرموێت: کاتێك موسا (علیه السلام) ویستی لە (خضر) (علیه السلام) جیابێتەوە ، فەرمووی: ئەی (خضر) ئامۆژگاریم بکە ، ئەویش فەرمووی: سوودبەخش بە و زیان بەخش مەبە ، ڕووخۆشبە و تووڕەمەبە ، کەمدووبە ، پێویستت نەبێت مەڕۆرە دەرەوەو مەگەڕێ ، پێمەکەنە تاکو شتەکە بایی پێکەنین نەبێ ، (وەهەبی کوڕی

---

[١٤٢] لە کوردەواریدا بە (خدری زیندە) یان (خیری زیندە) ناسراوە ، وەرگێر .

[١٤٣] معضل : البیهقي في الشعب (٦٦٩٤) .

منبه)یش[144] دەفەرموێت: (خضر) (علیه السلام) فەرمووی: بەموسا (علیه السلام) خەڵکی لەدنیادا بەپێی هەڵەوگیربونیان بەدەنیاوە دەچێژن ، (بشر الحاق)[145] دەفەرموێت: کاتێك موسا (علیه السلام) بە (خضر)ی فەرموو ئامۆژگاریم بکە ، (خضر) (علیه السلام) بەموسای فەرموو: خوای گەورە طاعەتی خۆی لەسەر تۆ ئاسان بکات .

(الحافظ أبو نعیم الاصفهانی)[146] فەرموودەیەکی بردۆتەوە سەر (زیاد) کە ئەویش لە (ابی امامه)ەوە دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) بە هاوەڵەکانی خۆی فەرمووی: (ئایا دەربارەی خضر قسەتان بۆبکەم ؟) گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی: (ڕۆژێکیان خضر بەبازاری بنی ئیسرائیل دا دەڕۆیشت ، پیاوێك چاوی پێیکەوت و پێی گوت: خێرێکم پێبکە خوا پایەدارت بکات ، (خضر) (علیه السلام) فەرمووی: باوەڕم بەخوا هەیە و هەرچی بوێت ئەو خوایە دەیکات ، شتێك شك نابەم کەبیدەم بەو پیاوە ، پیاوەکە دیسان پێیگوت: لەبەر خاتری خوا شتێکم پێ ببەخشە و لە ڕوخساری تۆوە سەرم بۆ ئاسمان بڵندکردووەو ناوی خوام بەڕووی تۆدا هێناوە ، تکای ئەوەم لێکردویت کەخوای گەورە بەرەکەتم بەسەردا برێژێ لەرێگەی تۆوە ، دیسان (خضر) (علیه السلام) فەرمووی: بروام بەخوای گەورە هەیە و پێم گوتیت هیچ شتێکم پێنیە پێت ببەخشم ، مەگەر خۆمت پێشکەش بکەم تاکو بمفرۆشیت ، هەژارەکە گوتی: جائەوە ڕەوایە ؟ فەرمووی: بەڵێ بەڕاستمە ، تۆ بەناوی خوای گەورەوە لەمن داوای یارمەتیت کردووە ، منیش لەبەر خاتری ئەو خوایە نائۆمێدت ناکەم ، بمفرۆشە!

پیاوەکە پێش خۆیدا و بردی (خضر)ی فرۆشت بەچوارسەد درهەم ، ماوەیەك لای کڕیارەکە مایەوەو هیچ ئیشێکی پێنەدەکرد ، بەخاوەنەکەی گوت: تۆ منت کڕی تاکو سوودێکت لەمنەوە دەست بکەوێت ، دەی کارێکم پێبسپێرە ! پیاوەکە گوتی: دەترسم گرانبێ بەلاتەوە ، چونکە تۆ پیاوێکی پیرو لاوازیت ، فەرمووی قورس نیە بەلامەوە ، وتی: دەیکەواتە ئەو بەردانەم بۆلێرە لاببە ، لەکاتێکدا لابردنی ئەو بەردانە ئیشی شەش کەس دەبوو ، پیاوەکە بۆ کاروباری خۆی چووە دەرەوە لەماڵ ڕۆیشت ، (خضر) (علیه السلام) بەردەکانی لەماوەی سەعاتێکدا گواستەوە ، پێی گوت: بەڕاستی کارێکی چاك و

---

[144] ابن عساکر : تاریخ دمشق (٤١٦/١٦) .

[145] هەمان سەرچاوەی پێشوو .

[146] ضعیف : ابن عساکر ، تاریخ دمشق (٤١٧/١٦) .

ڕێك و پێکت کردووه و ئەوەی من لێم چاوەڕوان نەدەکردیت کە لەوێزی تۆدابێت کردت ، پیاوەکە بە ڕێبواری ڕۆیشت و بە (خضر)ی گوت: بۆ کارێکی دوور دەڕۆم و من تۆ بەدەست پاك و سەرڕاست دەزانم و تۆ دەکەمە جێگری خۆم و ئەم ماڵەت پێدەسپێرم ، تۆش باش چاودێری بکە ، فەرمووی: پێم بڵێ چیبکەم ؟ گوتی: دەترسم نەتوانیت و پێت نەکرێت ، فەرمووی: نەخێر گران نیە بەلامەوە بڵێ ، گوتی: هەتا دەگەڕێمەوە خشت بېرە بۆ خانووەکەم تا دەگەڕێمەوە ، پیاوەکە ماوەیەکی پێچوو گەڕایەوە ، تەماشای کرد خانووەکەی دروست کراوە ، گوتی: توخوا پێم بڵێ تۆ کێیت و کارت چەیە ؟

فەرمووی: ناوی خوات هێنا ، بەوەش منت بەبەندایەتی خواوە بەستەوە ، کەواتە دەبێ پێت بڵێم من کێم ، من ئەو (خضر)ەم کەناویت بیستووە ، هەژارێك داوای یارمەتی لێکردم ، منیش هیچی وام پێنەبوو کەپێی ببەخشم ، جا لەبەرئەوەی ناوی خوای بردبوو خۆمم دایەدەوست تاکو بمفرۆشێت ، ئیتر فرۆشتمی ، پێت دەڵێم هەرکەسێك ناوی خوای برد و داوای یارمتی لێکردیت و تۆش وەڵامت نەدایەوە ، ئەوا لەڕۆژی دواییدا وا ڕادەوەستێنرێت کە نەگۆشتی بەلەشەوەیەو نەئێسقان و تەنها چەرمەکەی لەشیەتی پیاوەکە گوتی: بڕوام بەخوا هەیە ، ئەرکی گرانم پێسپاردیت ئەی پێغەمبەری خوا ، بەڵام نەمزانی و نەمناسیبوویت ، فەرمووی: قەیناکا چاکت کرد خوا بتهێڵێ ، پیاوەکە گوتی: باوکم و دایکم بەساقەتبێ فەرمووی: خۆت حوکمداربە بەسەر ماڵ و منالّمەوە یان منیش ڕێگەی تۆ دەگرم ! فەرمووی: حەزدەکەم ڕێگەی من بگریت ، خوا بپەرستە ، پیاوەکە ڕێگەی ئەوی گرتەبەر ، ئینجا (خضر) (عليه السلام) فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی منی کردە بەندەو پاشان لەو بەندایەتییە ڕزگاری کردم ، لەڕاستیدا ئەو فەرموودەیە (رفع)کردنەکەی هەڵەیە و زیاتر لەوەدەچێ (موقوف)بێت و ئەو کەسانەی گێڕاویانەتەوە کەسانی وای تێدایە کە ناسراونین ، خوای گەورە زاناترە .

(ابن جوزي) لەکتێبی (عجالة المنتظر في شرح حال الخضر)دا فەرموودەیەکی هێناوە کە (الحافظ ابن عساكر)یش[١٤٧]بردویەتیەوە سەر (السدي) کە دەفەرموێت: (خضر و ئیلیاس دوو برابوون ، باوکیان پاشابوو ، ئیلیاس بەباوکی گوت: بابەگیان براکەم ئارەزووی ماڵ و سامانی نیە ، ئەگەر تۆ ژنی بۆبێنی ، بەڵکو کوڕێکی ببێت کە ئارەزووی ماڵ و سامانی هەبێت ، باوکیشی کچێکی ڕێك و پێکی بۆ خواست ، (خضر)

---

[١٤٧] حسن ، تاريخ دمشق (٤١٩/١٦) .

(عليه السلام) بەژنەکەی خۆی گوتبوو: من پێویستم بەژن نیە ئەگەر حەزدەکەیت دەست بەردارت دەبم و ئازادت دەکەم ، ئەگەر دەشتەوێ لەگەڵمدا خەریکی خواپەرستی بیت ئەوا ڕێگەی پێدراوە ، بەڵام دەبێ نهێنی من بپارێزیت ، ژنەکەی گوتی: باشە ، ماوەی ساڵێك بەو جۆرە لەگەڵیا ژیا ، پاش ساڵەکە پاشا بانگی بوکەکەیکرد (واتە ژنی خضر) پێی گوت: تۆ گەنجی و کوڕەکەیشم هەرگەنجە ئەوە خێرە منداڵتان نابێت ؟ ژنەکە گوتی: خوای گەورە منداڵ دەبەخشێ ، بیەوێت دەیبەخشێ ، نەیەوێت نایبەخشێ ، باوکی (خضر) (عليه السلام) فەرمانی بە (خضر)کرد ، ئەو ژنەی تەڵاق دا ، پاشان قەیرەیەکی بۆخواست بەڵکو خوای گەورە کوڕێکی لەم ژنە پێببەخشێ ، بەڵام هەرشەوی یەکەم هەمان قسەی بەم ژنەیشی گوتو ئەم ژنەش بەوە ڕازیبوو کە لەگەڵیدا بژی ، ساڵێك بەو جۆرە مایەوە ، پاش ساڵەکەش دیسان پاشا پرسیاری لەژنەکە کرد (واتە: بوکەکەی خۆی کەژنی خضر بوو) دەربارەی منداڵ ، ژنەکەش وەڵامی پاشای خەزوری دایەوەو گوتی: کوڕەکەی تۆ پێویستی بەژن نیە ، ئینجا باوکی داوای کوڕەکەی کرد کە خضر بچێ بۆلای باوکی ، بەڵام خضر (عليه السلام) سەری خۆی هەڵگرت و ڕایکرد ، باوکیشی خەڵکی نارد بەدوایدا تاکو بیدۆزنەوە ، بەڵام نەیاندۆزیەوە .

وتراوە گوایە خضر ژنی دووەمی خۆی کوشتووە ، چونکە نهێنییەکەی ئاشکرا کردووە ، لەبەرئەوەش سەری خۆی هەڵگرت و ڕایکردووە ، بەڵام ژنەکەی پێشوو تەڵاق دا و لە دەوروبەری شارەکە ئەم ژنە خەریکی خواپەرستیبوو [148] ڕۆژێك پیاوێك بەلای ئەم ژنەدا ڕۆیشت ، گوێی لێبوو پیاوەکە دەڵێت: بەناوی خوا ، ژنەکە پرسی ئەم ناوەت لەکوێوە هێنا ؟ گوتی: من لەهاوەڵانی (خضر)م ، ژنەکە شووی پێکردو چەند منالێکیان بوو ، پاشان ویستی خوایی وابوو کە ئەم ژنە بوو بەشانەدار و قژداهێنەری کچی فرعون ، ڕۆژێکیان ئەم ژنە سەری کچەکەی فرعونی شانە دەکرد ، لەناکاو شانەکەی لێکەوتە خوارەوە ، ژنەکە دەستی بۆبرد تاکو هەڵی بگرێتەوە لەو کاتەشدا گوتی: بەناوی خوا ، کچی فرعون گوتی: باوکم دەڵێی ؟ ژنەکە گوتی: نا پەروەردگاری تۆ و باوکت (الله)یە ، کچەکە ئەم قسە و ڕووداوەی بۆ باوکی گێڕایەوە ، (فرعون)یش فەرمانی کرد مسیان تواندەوە ، پاشان فەرمانی کرد کەژنەکە بخەنە ناوی ، کاتێك ژنەکە ئەو دیمەنە ترسناکەی بینی ترسا لەوەی کەفڕێی بدەنە ناوی .

---

[148] لە سەرچەمە دێرینەکاندا ئەوەی کە خۆی تەرخان بکردایە بۆ خواپەرستی تەواو دەبوایە وازی لەدنیا بهێنایە / وەرگێڕ.

بەلاّم ژنەکە منداڵێکی بچکۆلەی خۆی لەگەڵدابوو ، منداڵەکەی بەدایکی گوت: دایەگیان ! مەترسە و ئارام بگرە تۆ لەسەر هەقیت ، ئیتر ژنەکە خۆی فڕێدایە ناو مسە تواوەکەوەو کۆچی دوایی کرد ، خوای گەورە بە بەهەشتی شاد بکات[١٤٩] .

لە (عبدالله کوڕی وەهب)ەوە[١٥٠] دەگێڕنەوە تا دەگاتەوە بە (محمد کوڕی مونکەدر) دەفەرموێت: (جارێك عومەری کوڕی خطاب نوێژی مردوی لەسەر تەرمێك دەکرد ، گوێی لەدەنگێك بوو پەلەمەکەو پێشمان مەکەوە ڕەحمەتی خوات لێبێت ، عومەریش ڕاوەستا و چاوەڕوانی کرد تاکو پیاوەکە گەیشتە ڕیزی نوێژکەران و پیاوەکە نزای ئاوا بۆ مردووەکە کرد و فەرمووی: ئەگەر سزای ئەم مردووە بدەیت ئەوا زۆر سەرپێچی تۆی کردووە ، وە ئەگەر لێی ببوریت ئەوا زۆر هەژارە بۆ ڕەحمەتی تۆ .

کاتێك تەرمەکە بەخاك سپێرا ، پیاوەکە فەرمووی: پیرۆزت بێت ئەی خاوەن گۆڕ (واتە: ئەو کەسەی لەو گۆڕەدایت) ئەگەر فلاّن و فلاّن و فلاّن نەبوویت ، عومەر فەرمووی: ئەو پیاوە بێنن بالێی بپرسین دەربارەی نوێژەکەی و قسەکانی ، ئاخۆ ئەوکەسە کێیە؟ بەدوایدا گەڕان ، شوێنی پێیەکانیان بینی کەهێندەی باڵێك درێژبوون ، لێرەدا عومەر فەرمووی: سوێند بەخوا ئەوە ئەو (خضر)یە کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی باس کردووین ، بەلاّم ئەم گێڕانەوەیە دابڕانی تێدایە و بەڕاست دانانرێت .

گەلێك ڕوودا و بەسەرهات دەربارەی (خضر) (عليه السلام) باس دەکرێت و پشتاوپشت گوتراون و گوتراونەوەو زیادوکەمیان تێداکراوە ، کەڕەنگە زۆر پێویست نەبێ هەموویان باس بکەین، بەتایبەتی زۆربەیان تەمی گومان و هەڵبەستیان لەسەرە ، (ابن عساكر) لەکتێبەکەی خۆیدا (تأريخ دمشق)دا گەلێك لەو ڕووداوو بەسەرهاتانەی هێناوە و وەك مێژوو تۆماری کردوون .

(أبو اسماعيل الترمذي)[١٥١] گێڕانەوەیەکی هێناوە دەیباتەوە سەر (محمد کوڕی یەحیا) کەفەرموویەتی: کاتێك عەلی کوڕی ئەبی طالب تەوافی کەعبەی دەکرد ، پیاوێکی بینی کەخۆی نوساندبوو بە پەردەکانی دیواری کەعبەوەو دەیفەرموو: ئەی ئەو کەسەی کە لەیەك کاتدا چەند دەنگێك دەبیستی و بۆبیستنی یەکێکیان ئەوانیتر سەر قاڵت ناکەن

---

[١٤٩] خوێنەری بەڕێز : لێرەدا چەند فەرموودەیەکی تری جۆراوجۆر هەیە ، بەلاّم لەبەرئەوەی (منکر) یان (موچوع)ن بە پێویستمان نەزانی بیانهێنم ، کە لە نوسخە عەرەبیەکەدا هەن / وەرگێر .

[١٥٠]

[١٥١] ئەگەر عریف و جابی و خازن و کاتب و شرگی نەبێت ، کە هەریەکەیان لەو سەردەمەدا مانای خۆی هەبووە/وەرگێر .

واتا: هەموویان لەیەك كاتدا وەكو یەك دەبیستی ، ئەی ئەو كەسەی كە ئەو كەسانەی داواكارییان بۆلای تۆ هەیە ، هەموویان داواكاری جیاجیایان هەیە و هەرگیز ناكەویتە هەڵەوە ، ئەی ئەو كەسەی زۆر لەسەر پۆشتنی خەڵكی و زۆر داواكردنیان لەتۆ بۆ پێویستەكانیان كارت لێتێك نادا و ئەگەر مەبەستت بێ زۆر داوایی ئەوان فەرامۆش دەكەیت لێبوردەیی خۆت و شیرینی ڕەحمەتی خۆتم پێببەخشە ، دەڵێت: ئەمجا عەلی كوڕی ئەبی طالب فەرمووی: ئەی بەندەی خوا ئەو نزایە دووبارە بكەرەوە ، پیاوەكە فەرمووی: بۆچی گوێت لەو دوعایەبوو ؟ فەرمووی بەڵێ ، فەرمووی دەكەواتە دوای هەموو نوێژێك ئەو دوعایە بخوێنە ، سوێند بەوكەسەی كەگیانی (خضر)ی بەدەستە ئەگەر تاوانەكانت هێندەی ئەستێرەكانی ئاسمان و دەنكە بارانەكان و زیخی سەرزەوی خاكی زەویش بێت ئەوا خوای گەورە لەماوەی كەمتر لەچاو تروكانێك دا لێت خۆش دەبێ . ئەمەش دیسان هەر گێڕانەوەیەكە و پچڕانی تێدایە و لە (اسناد)ەكەیشیدا كەسانی وای تێدایە كە ناسراونین ، خوای گەورە زاناترە .

هەروەها (ابن عساكر)[152] لەهەمان سەرچاوەدا گێڕانەوەیەكی هاوشێوەی ئەم گێڕانەوەیەی هێناوە ، كە دەیباتەوە سەر (یەزیدی كوڕی أصم) ،(الدارقطني) گێڕانەوەیەكی لە (ابن عساكر)[153]ەوە هێناوە كە ئەویش بردو یەتیەوە سەر (علی كوڕی ئەبی طالب )خ بە (مرفوع)ی كەدەفەرموێت: هەموو ڕۆژێكی عەرەفە لەعەرەفات جبریل و میكائیل و اسرافیل و خضر ((علیهم السلام) كۆ دەبنەوە ، هەروەها گێڕانەوەیەكی دورو درێژ كە(موضوع)ە لێرەدا باس كراوەو ئێمە بەگونجاومان نەزانی كە لێرە دا باسی بكەین

دیسان (ابن عساكر)[154] گێڕانەوەیەكی بردۆتەوە سەر (ابن ابی داود) وە دەفەرموێت : (ئیلیاس و خضر لە (بیت المقدس)هەموو ڕەمەزانێك بەڕۆژوو دەبن و هەموو ساڵێك حەجیش دەكەن و لەئاوی زمزم دەخۆنەوە ، كە ئەو جارەی ئاو خواردنەوەكەیان بەشی تا ساڵێكی تر هەمان ڕۆژ دەكاتەوە – واتا تیونیان نابێتەوە-.ئەمانەو گەلێك ڕوداوی لەم جۆرە لەكتێبی (تأریخ دمشق)ی (ابن عساكر)دا هاتوون و باس كراون ، ئیتر تا چەندێك ڕاستن یان چەندێك شتی تری خراوە تە پاڵ وەیان كەموكورتن ئەوەیان هەر خوا

---

[152] ابن عساكر ، تاريخ دمشق (١٦/٤٢٦) .

[153] ابن عساكر ، تاريخ دمشق (١٦/ ٤٢٦ – ٤٢٧)

[154] هەمان سەرچاوە (١٦/ ٤٢٨)

دەیزانێت و ڕەنگە زۆر پێویست نەبێ کەلێرەدا هەموو ڕوداوەکانی ئەو کتێبە مێژووی یە باس بکەین دەقاو دەق هەموویان بهێنن و ئەوەی باسمان کرد بەسە بۆئەوەی دڵنیابین کۆرە (خضر)پیاوچاکێکە و زۆر نزیکە کە پێغەمبەر بێت ، بەڵکو زۆرینەی بۆ چوونەکان . تەنانەت گفتوگۆی موسا (علیە السلام) لەگەڵیداو کارو ڕەفتارەکانی (خضر) خۆیشی (علیە السلام) وەك لەقورئاندا باس کراوە ڕوونی دەکەنەوە کە (خضر)ی یاوەری موسا (علیە السلام) پێغەمبەربووە .

گێڕانەوەکانیش دەربارەی (خضر)زۆربەیان وەك ڕووداوی مێژووی یان حیکایەتی پشتاوپشت و دەماودەم باس کراون و ناکرێن کە دەقی متمانەی تەواویان لەسەر دابڕێژین سەبارەت بەوەی کەبڕیار بدەین (خضر)تا ئێستاش لەژیاندا بێت .

(عبدالرزاق)[155] فەرمودەیەکی هێناوەکە دەیباتەوە سەر (ابا سعید) کە فەرمودەکە دووروودرێژە و دەربارەی (دەجال)ەو پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرمووی (دەجال دێت و حەرامە لەسەری کە بچێتە مەدینەوە ، لەو ڕۆژەدا پیاوێك بۆی پەیدا دەبێت ، کەباشترین کەسە ، یان لەباشترین کەسەکان ، پێی دەڵێت : شایەتی دەدەم کەتۆ ئەو دەجالەی کە پێغەمبەر (ﷺ) بەفەرمودە لەبارەی تۆوە بۆمان دواوە ، دەجالْ بەخەڵکەکە دەڵێت : ئایا گومانتان لەمن دەبێت ئەگەر بەبەرچاوی خۆتانەوە ئەم پیاوە بکوژم پاشان زیندوی بکەمەوە ؟ خەڵکەکە دەڵێن: ناء ، دەجال پیاوەکە دەکوژێت و پاشان زیندووی دەکاتەوە ،کاتێك پیاوەکە زیندوو دەبێتەوە دەڵێت : سوێند بەخوا پێشتر بەقەدەر ئێستا دڵنیا نەبووم کەتۆ دەجالیت ، ئەمجارەش دەجال دەیەوێ بیکوژێت ، بەلاّم ناتوانێت). (معصر) دەفەرموێت : وام پێگەیشتوەکە دەجالْ ئەڵقەیەکی مس دەکاتە ملی ئەو پیاوە بەوە دەیکوژێ .هەروەها پێم گەیشتوە کە ئەو پیاوەی دەجالْ دەیکوژێ و زیندووی دەکاتەوە (خضر)ە ، وە لەهەردوو (صحیح)[156]ەکەدا هاتووە . بەلاّم (مسلم) دەفەرموێت : ڕاستە گوتراوەکە ئەو پیاوە (خضر)ە ، بەلاّم وشەی (پێم گەیشتوە)بەڵگەنیە بۆ ڕاستی ئەو فەرمودەیە ، جگە لەوەش لەفەرموودەی تردا بەجۆرێکی تر باس کراوەو وتراوە : دەجالْ گەنجێك لەناو کۆمەڵێ گەنج دا دەکوژێ و زیندووی دەکاتەوە ، هەروەها وشەی (حَدثنا عنە)بەس نیە بۆ سەلماندنی تەواوەتی شتێك ئەگەر چی بۆلایەنی (تەواتر)ەکەی تەواوە .

---

[155] صحیح : المصنف (٢٠٨٢٤) .

[156] متفق علیه : البخاري (١٨٨٢)مسلم (٧٣٠١ )، الترمذي (٢٢٤٠)

(شيخ ابو الفرج الجوزي) زۆر بە جوانی چەند بەڵگەیەکی بەجێی خستوەتە ڕوو دەربارەی ئەوەی کە (خضر) (علیه السلام) ئێستا لەژیاندا نەماوە [157] ، دەفەرموێت : ئەو فەرمودانەی لەو بارەیەوە باس کراون زۆربەیان (مرفوع)ن و (موضوع)ن وقسەی هاوەڵان و دوای ئەوانن و گەلێك لەوانە سەنەدەکانیان لاوازەو خەڵکانی نە ناسراو لەزنجیرەی گێڕانەوەکەیاندا هەیە ، دەربارەی ژیانی (خضر)یش (الجوزي) و چەندین زانای تر فەرمویانە : لەژیاندا نەماوە ، بەچەند بەڵگەیەك ، لەوانە خوای گەورە دەفەرموێت : (وَما جعلنا لبشر من قبلك الخلد) (الأنبياء : ٣٤)، واتا ئەی محمد- ژیانی نەمریمان پێش تۆ نەداوەبە هیچ کەسێك - واتا ئەی محمد دەبێت بمرێت ، دیارە ئەگەر (خضر) (علیه السلام) مرۆڤ بوبێت ئەوا ئەم ئایەتە گشتی یە دەیگرێتەوە و ئەو جیاناکرێتەوە و خوای گەورە لەو ئایەتەش دا کەسی لەیاساگشتی یەکە جیانەکردۆتەوە و هیچ بەڵگەیەکیش لەم بارەیەوەنیە ، کەواتە تاکو یەکلایی دەکرێتەوە دەبێت باوەڕمان وابێ کەلەژیاندا نیە .

بەڵگەیەکی تر ئەم ئایەتە مبیرۆزەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ ........ وَأَنَا مَعَكُمْ مِنَ الشَّاهِدِينَ﴾ (آل عمران:٨١) ، (ابن عباس)[158] لەمانای ئەم ئایەتەدا بۆ لێکدانەوەی حاڵی (خضر)و پێغەمبەرانی تریش دەفەرموێت : خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ سەرەتا گفت و پەیمانی ئەوەی لێ وەرگرتوەکە ئەگەر مان و لەژیاندا بوون و (محمد) (ﷺ) پەیدا بوو دەبێت باوەڕێ پێ بهێنن و شوێنی بکەون و سەری بخەن بەسەر دوژمناندا پشتگیری لێ بکەن ، ئەمەش (البخاري) لێوەی دەگێڕێتەوە ، جا (خضر)یش ئەگەر پێغەمبەربێ یان وەلی بێ ئەوا ئەم گفت و پەیمانە دەیگێڕێتەوە ، خۆ ئەگەر لەسەردەمی پێغەمبەردا لەژیاندا بووبێت ئەوا دەبوایە هەر زوو باوەڕی پێ بکردایە و پشتیوانی خۆی بۆ دەرببڕیایەو لەدوژمنان بیپاراستایەو ، چونکە ئەگەر وەلی بوبێت ئەوا (صدّیق) لەئەو بەرزتر و گەورەتر بوە ، وەئەگەر پێغەمبەریش بوبێ ئەوا موسا (علیه السلام) لەئەو بەرزتر و گەورەتربوە ، تەنانەت موساش (علیه السلام) هەمان پەیمان دەیگرێتەوە ئەگەر لەژیاندا بوایە هەردەبوایە بهاتایەتە سەر ئایینی ئیسلام و موسڵمان بوایە و دوای پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) بکەوتایە ، هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئێستا موسا لەژیاندا بوایە ، هیچ

---

[157] کتێبی (عجالة المنتظر في شرح حالة الخضر)- ابن الجوزي .

[158] سنده ضعيف : ابن جرير (٣ / ج٣ / ٣٢٣)

ڕێگەیەکی لەبەردەمدا نەدەبوو جگە لەوەی کە شوێنی من بکەوێت)، ئایەتەکەش بەڵگەی تەواوە لەسەر ئەوەی کە دەبێت هەموویان شوێنی پێغەمبەرمان (محمد) بکەون (ﷺ) ، تەنانەت لەشەوی (اسراء)دا پێغەمبەرمان (محمد) (ﷺ) بەفرمانی خوایی پێش نوێژی بۆ هەموو پێغەمبەران کرد لە خاکی (بیت المقدس)، دیارە ئەگەر (خضر) لەژیاندا بوایە دەبوو لەوماوە درێژەی ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) جارێك لەجاران بهاتایەتە خزمەتی ، یان بەشداری جەنگێکی بکردایە ، لەکاتێکدا (جبریل) (علیه السلام) وەك فریشتە بەشداری جەنگی کرد لەبەدرداو چەندین فریشتەی تریشی لەگەڵدا بوون ، دیارە ڕۆژی جەنگی بەدر سەخت ترین ڕۆژی مێژووی ئیسلام بوەو جەنگی یەکلاکەرەوەی ئاینی ئیسلام و بگرە بەندایەتی کردنی خوای گەورە بووە ، هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی (بەدر)دەفەرموێت : خوایەگیان ئەگەر ئەم دەستەیە – واتەی دەستەی موسڵمانان و فریشتەکان – لەناوبەریت ئیتر تۆ لەدوای لەناوچوونی ئەوان لەسەر زەوی ناپەرسترێیت)[١٥٩] ، کەواتە هەموو موسڵمانان بەشداری بەدربوون ، ئەگەر بشکانایە ،هەموو ئیسلام دەشکاو لەناودەچوو ، ئەی چۆن لەو ڕۆژە سەختەدا (خضر)ئامادەنەدەبوو ، ئەگەر لەژیاندا بوایە !

قاضي آبو یەعلای حەنبەلی دەفەرموێت : هەندێ لەهاوەڵانمان پرسیاریان کردوە دەربارەی ئەوەی (خضر)مردوە ؟ فەرمویەتی : بەڵێ . خۆئەگەر نەمردایە ئەبوایە سەردانی پێغەمبەری بکردایە (ﷺ) ،ڕەنگە بوترێ لەهەموو شوێنێکە ،بەلام کەسیش نەدیوە ، ڕاستیەکەی ئەوەیە کەشتی وانیەو زۆر دوورە و ناکرێ شتی گشتی بۆئەو تایبەت بکرێتەوە ، دوای ئەوە چ پێویست ئەکات خۆی بەنادیاری و نەناسراوی بهێڵێتەوە لەکاتێکدا لە دەرکەوتن و ئاشکرا بوونی دا پاداشتی زیاتری دەست دەکەوێ و خێرو چاکەی زۆرتری دێتە ڕێ ؟ بگرە موعجیزەکەیشی لەدەرکەوتنیدا گەورەترە وەك لەشاردنەوەی خۆی دا ، ئەگەر لەژیاندا بوایە هیچ نەبێ ئەبوایە ئەو قسانەی لەناوی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بەناو خەڵکی دا بلاوبوونەوە ڕاست نین ، ڕاستی بکردنایەتەوە و یەکلای بکردنایەوە و چەندین کاری چاکەی تریش .

هەر بۆنموونە سەبارەت بەوەی کەکەس تەمەنی تاسەر نابێت ، لەهەردوو (صحیح)ە کەداو لە (مسند)ی (پێشەوا ئەحمەد)یش دا فەرمودەیەك بەچەند شێوەیەك هاتووە ، کە

[١٥٩] متفق علیة : البخاري (٢٩١٥)، مسلم (٤٥٦٣) .

ئێمە یەکیان بە نمونە وەردەگرین و خوێنەری بەڕێز بۆ وەرگرتنی دەقە جیاوازەکانی تری هەمان فەرمودە دەتوانێت سوود لەو سەرچاوانە وەربگرێ کە لەخوارەوە ناونیشان و ژمارەی فەرموودەکە و جۆرەکەی بەوردی نووسراوە [١٦٠].

(پێشەوا ئەحمەد)[١٦١] فەرمودەیەکی هێناوە کە دەیباتەوە سەر (عبدالله کوڕی عومەر) کە دەفەرموێت : شەوێکیان پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی خەوتنانی بۆ کردین – کە کات ڕۆژگارە دواییەکانی تەمەنی پێغەمبەر بوو (ﷺ) پاش سلاو دانەوە لەنوێژەکەی فەرمووی: (خۆدەزانن ئەمشەو چ شەوێکە [١٦٢]؟ لەسەری هەموو سەد ساڵێکدا هیچ کامێك لەوانەی لەژیاندا بوون لەسەر ڕووی زەوی بوونیان نامێنی) ، واتە : هەرنەوەیەك دوا هەمین سنووری تەمەنی – بەشێوەی گشتی نەك تایبەتی – سەد ساڵە و دوای ئەو هەرە دەبێ بمرێ ، هەموو سەد ساڵ جارێك بەرەی پێشووتر هەموویان دەبڕێنەوەو دەمرن و بەرەی سەد ساڵی داهاتوو دێتە ژیانەوە .

بەڵێ ئەم فەرمودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە هیچ کەسێ لەسنووری تەمەنی خۆی زیاتر ناژی ، ئیتر (خضر) (علیە السلام) چۆن لەسەردەمی موساوە (علیە السلام) تا ئەمڕۆ لەژیاندا دەمێنێ ؟ جالەبەرئەوەی بەهیچ بەڵگەیەك نەسەلمێنراوە کە (خضر)ئێستا لەژیاندا بێ ، کەواتە بارەکەی تری بەهەند وەردەگیرێ کە پێچەوانەکەیەتی ، واتا (خضر) (علیە السلام) لەژیاندا نەماوەو لەم دنیایەدانیە .خوای گەورە زاناترە ،

(الحافظ ابو القاسم السهیلي) لە کتێبەکیدا (التعریف و الأعلام)دا لە (البخاري)یەوە دەگێڕێتەوە کە (خضر)لەژیانی پێغەمبەردا هەبووە و بەلاَم کۆچی دوایی کردوە ، دیسان ئەمەش قسەو باسی تر هەڵدەگرێ ، ڕاست ترین قسە ئەوەیە کە بگوترێ خوای گەورە باشتر دەزانێت .

---

[١٦٠] متفق علیه : النجاري (١١٦)،مسلم (٦٤٢٨)؛ النجاري (٦٠١)، متفق علیه : المسند (٢/ ٨٨)؛ مسلم (٦٤٢١)، المسند (٣/٣٠٥)، صحیح المسند (٣ / ٣٤٥)؛ مسلم (٦٤٣٢)،صحیح :الترمذي (٢٢٥٠).

[١٦١] متفق علیه : المسند (٢/ ٨٨)، النجاري(٣٠١)، مسلم (٦٤٢٦).

[١٦٢] لەکوردەواریدا دەگوترێ :ئەوە ئەمشەو ، شەوەکەیە کە دانیشتوین ، بزانن – وەرگێر–

## پێغەمبەری خوا ئیلیاس (سلاوی خوای لەسەر بێت)

خوای گەورە لەدوای چیرۆکی ژیانی موساو هارون (عليه السلام) دەفەرموێت:﴿وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ............ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ﴾ (الصافات:١٢٢ - ١٣٢) زانایانی شارەزایانی پشت و ڕەگەز ناس گوتویانە: ناوی (ئیلیاس النشبي)یە، وە وتراوە کوڕی یاسین کوڕی فەنحاص کوڕی عیزار کوڕی هارونە(عليه السلام) وتراوە: ئیلیاس کوڕی عازر کوڕی هارون کوڕی عمرانە.

وتوویانە: ڕەوانەکراوە بۆسەر دانیشتوانی (بەعلە بەگ) لەخۆراوای دیمەشق، ئەویش بانگی کردن بۆ خواپەرستی و دورکەوتنەوە لەبت پەرستی،چونکە بتێکیان دەپەرست کەناوی (بەعلا)بوو، وتراوە: ژنێك بووە ناوی (بعل)بووە، خوا دەیزانێت، لەوە دەچیٚ یەکەمیان ڕاستربێت [1]. بۆیە گەلەکەی فەرموو:﴿ألا تتقون... أباءكم الآولين﴾ (الصافات: ١٢٤ - ١٢٦) واتە: ئەریٚ لەخواناترسن، داوا لە بەعل دەکەن و لێی دەپارێنەوە کەچی وازتان لەباشترین بەدی هێنەر هێناوە، (الله)خوای ئێوەیە،پەروەردگاری خۆتان و باوپیرانی بەرابتیانە !، بەڵام ئەو گەلە بەگوێی ئیلیاسیان نەکرد (عليه السلام) و سووربوون لەسەر بەدباوەڕی و بت پەرستیخۆیان، بەوەش نەوەستانەوە بەڵکو ویستیان ئیلیاس لەناوبەرن و بیکوژن، بۆیە لەدەست ئەوان ڕای کردو سەری خۆی هەڵگرت و خۆی شاردەوە، (ابو يعقوب الآذعي)گێڕانەوەیەکی بردۆتەوە سەر (کعب الأحبار)کە وتویەتی: ئیلیاس ماوەی دەساڵ خۆی لەدەست پاشاکەیان شاردەوەو پاش دەساڵەکە هاتەوە ناویان کە پاشاکەیان گۆڕابوو، بانگی کرد بۆ خواپەرستی و موسڵمان بوون، پاشاکەش باوەڕی هێناوە دواییش گەلەکەی وە خوای گەورە پاشاکەی پێشووی لەناو بردبوو، ئەو گەلەی کە موسڵمان بوون تێکڕا هەموویان بوون، جگەلە دەهەزار کەسیان نەبیٚ، فرمانی پیٚ کردن کە جەنگیان لەگەڵ دا بکەن، سەرەنجام دوابەیەکی بیٚ باوەڕەکانیان کوشت، [2] (ابن ابی الدنیا)[3] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوەسەر سەعیدی کوڕی عبدالعزیز کە ئەویش لەهەندیٚ لەگەورە پیاوانی دیمەشقەوە گێڕاویەتەوەکە ئیلیاس ماوەی بیست شەو لە ئەشکەوتی شاخێکدا خۆی شاردوەتەوە، چل شەو، لەوماوەیەش قەل و داڵ خوادنیان بۆ هێناوە !

---

[1] ابن عساكر (٩ ٢٠٥)

[2] ضعيف اليه: ابن عساكر، هەمان سەرچاوەی پێشوو، واتا – تاريخ دمشق –

[3] موضوع: ابن عساكر: (٩ / ٢٠٦ )

(محمد بن سعد) [1] فەرمودەیەکی هێناوە کە هەڵبەستراوە و گوایە: چوار پێغەمبەر تائێستاش لەژیاندا ماون، دوودانەیان لەسەرزەوین و دوانیان لەئاسمانن، (ئیلیاس و خضر)لەسەرزەوین و (إدریس و عیسى) لە دوانیان لەئاسمانن(علیه السلام) پێشتر باسی (خضر وئیلیاس)مان کرد و بەپێی دەقی فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) یەکلامان کردوەوە، (وهب کوڕی منبه)یش کۆمەڵێ باسی هێناوە کە گوایە: ئیلیاس داوای لەخوا کردوە گیانی بکێشێ کاتێك گەلەکەی بەدرۆیان کردەوەو باوەڕیان پێ نەهێناو ئازاریان دا، ئاژەڵێك یان چوارپێ یەك هات کە لەشێوەی ئاگردابوو، ئیلیاس سواری ئەو ئاژەڵە بوو، خوای گەورەش پەڕوباڵی بۆ ئاژەڵەکە کردو نوری بۆلەبەرکردو ئارەزووی خواردن و خواردنەوەی لێ سەندەوەو کردی بەفریشتەیەکی مرۆڤـ شێوەی زەمین ئاسمانی، ئیتر وەسیەتی خۆت بۆ (ئیل یەسەع)کوڕی (اخبوط)بەجێ هێشت، بەڵام ئەو جۆرە قسەو باسانە بێ بناغەو هەڵبەستراون و کاری ئیسرائیلی یە لادەرەکانە، باش وایە نە بڕوایان پێ بکەین نەبەدرۆشیان بخەینەوە، بەڵام ڕوکاری ئاشکرای گێڕانەوەکان لەڕاستی یەوە دوورن، خوای گەورە زاناترە .

ئەو فەرمودەیەش کە (ابوبکر البیهقي) هێناویەتی زۆر زۆر لاوازە،کەگوایە (انس کوڕی مالك) لەسەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەر دا (ﷺ) ڕێیای کەوتۆتە دۆڵێکەوە، لەوێ (انس) چاوی بەپیاوێك کەوتوە کە نزیکەی سێ سەد باڵ باڵای بەرزبوەو لەخوای گەورە پاڕاوەتەوە کە بیکات بەیەکێ لەکەسانی ئومەتی محمد (ﷺ) وەلێی ببورێت، (انس) دەڵێ چوومە دۆڵەکەوە، پیاوێکم دی بەو باڵاو بەرزی یەوە، پێی گوتم: تۆ دەڵێیت ؟ گوتم: من ئەنەسم خزمەتکاری پێغەمبەری خوام، فەرمووی: ئەو لەکوێ یە ؟ گوتم: ئەوەتا لێرەیە گوێی لەقسەکانتە، فەرمووی: بۆم بێنەو سڵاوی منی پێ بگەیەنەو پێی بڵێ ئیلیاسی برات سڵاوت لێ دەکات، ......هتد، دیارە ئەمە ڕووەداوێکی ڕاست نیە، چونکە باسمان لەوە کرد کە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی باڵای بەرز فەرموویەتی: (خوای گەورە کە ئادەمی دروست کرد، وای دروست کرد کە شەست باڵ باڵای بەرز بێ)[2] تا دەگاتە ئەو شوێنەی دەفەرموێت: (لەو ڕۆژەوە خەڵکی هەر باڵایان لەکەم بوونەوەدایە)وەکەس باڵای بەو ناگات، ئیتر چۆن ئیلیاس (علیه السلام) باڵای سێ سەد باڵ و زیاتریش بووە ؟ لەلایەکی ترەوە چۆن ئیلیاس (علیه السلام) فەرمان دەکات کە پێغەمبەر (محمد) (ﷺ) بچێت بۆلای،

---

[1] موضوع: ابن عساکر، هەمان سەرچاوە .

[2] لەباسی ژیانی ئادەم دا (علیه السلام) تەخریجی ئەم فەرمووودەیەمان کردوە .

لەکاتێکدا ئەگەر ئەویش بێ دەبێ ئەو بێت بۆلای سەرداری هەموو پێغەمبەران، وەیان گوایە ساڵی یەك جار خواردن دەخوات، لەکاتێکدا وتراوەکە ئارەزووی خواردن و خواردنەوەی لێ سەندراوەتەوە، هەروەها شتی هەڵبەستراو (موضوع)لەم بارەیەوە کەم تازۆر هەیە، بەلاّم بە پێویستی نازانین باسیان بکەین .

لەهەموویان باشتر لەمانە ئەو گێڕانەوەیەیە کە (ابو بكر بن ابى الدنيا)[1] دەیباتەوەسەر (ثابت) کە دەفەرموێت: ئێمە لەگەڵ (مصعب کوڕی زوبەیر)دابووین لە (کوفە)چوومە ئەودیو دیوارێکەوە تاکو دوو ڕکات نوێژ بکەم،نوێژم دەست پێ کردو ئەم ئایەتەم خوێند: ﴿حٰمٓ،تَنْزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ .......... ذِي الطَّوْلِ﴾ (غافر:١ – ٣) ، تەماشام کرد پیاوێك لەدوامەوە ڕاوەستاوە بەسواری هێسترە بەڵەکەیەوە چەند پارچە قوماشێکی یەمانی لەبەردابوو، پێی گوتم: ئەگەر گەیشتیتە (غافر الذنب) لەو ئایەتەدا . بڵێ: ئەی لێبوردەی گوناهان لێم ببورە، وەئەگەر گوتت: (وقابل التوبً) بڵێ: ئەی تەوبە وەرگر تەوبەم وەربگرە، وە ئەگەر گوتت: (شَديدُ العقابِ) بڵێ: ئەی خاوەن سزای سەخت، سزام مەدە ! وەئەگەر گوتت :(ذي الطَّول)بڵێ: ئەی درێژە پێ دەر، درێژە بەڕەحمەتی خۆت بدە لەسەر من، کاتێك لام کردەوە کەسم بەدی نەکرد، هاتمە دەرەوەوبەدوایدا گەڕام و پرسیارم کرد لەو خەڵکە ئاخۆ پیاوێکی لەوجۆرو ڕەنگەتان دیوە بەسواری وڵاخێکی بەڵەکەوە بوبێت و پارچە بەرگی یەمانی پێوە بێت ؟ وتیان: کەسی بەو جۆرە لێرەوە نەهاتوە، دیار بوو ئەوان نەیاندیبوو، بەلاّم ئیلیاس بوو (علیه السلام)

﴿فَكَذَّبوه فَأَنَّهُمْ لَمُحْضَرُوْنَ﴾ (الصافات: ١٢٧)، واتا:گەلەکەی ئیلیاسیان بەدرۆ دەکردەوەو باوەڕیان پێ نەدەکرد، بەلاّم ئەوانە سازو ئامادەکراون بۆ سزا، جایان لەدنیا و دوا ڕۆژدا سزا دەدرێن، یان لەدوا ڕۆژدا، وادیارە یەکەمیانە، وەکو ڕاڤەکارانی قورئان و مێژوو نووسان فەرموویانە،﴿إِلاَّ عبادالله الْمُخلَصينَ﴾(الصافات: ١٢٨) واتە جگە لەو بەندانەی خوای گەورە، لەناو گەلەدا، کە دڵسۆز و باوەڕداربوون، ئەوانە سزا نایانگرێتەوە، ﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الآخِرِينَ﴾ (الصافات: ١٢٩)، واتا: ئەوانەی مانەوە، یان ئەوەی بۆ چاکەکارو خوانەناسەکانیان مایەوە ئەوەبوو کە هەمیشە بەچاکە باسیان بکرێ لەناو گەلانی زەوی دا، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿سَلامٌ علي إل ياسين﴾(الصافات: ١٣٠)، واتە سلاّو لەسەر ئیلیاس، دەربارەی (ال یاسین) ووتراوە: عەرەبەکان هەندێ جار (نون)دەنووسێنن

---

[1] ضعيف: ابن عساكر (٩ / ٢١٦ ) .

بەناوەوەو بەشتی تر دەیگۆڕن، بۆ نموونە: بە (أسماعیل) دەڵێت: (أماعین)وە بە (اسرائیل)دەڵێن: (اسرائین)، وەبە (ئیلیاس)دەڵێن: (ئیل یاسین)وەبەجۆرێکی تریش خوێنراوەتەوە، کەئەم جۆرەیە: ﴿سلامٌ علي آل ياسِين﴾واتە: سڵاو لەئالی یاسین: سڵاو لەئالی محمد، (ابن مسعود)[1]یش لەگەڵ چەند کەسێکی تر خوێندویانەتەوە بەم جۆرە: ﴿سلامٌ علي إدرِيسِينَ﴾دەگێڕنەوەکە (ابن مسعود) فەرمویەتی: (ئیلیاس)هەر (إدریس)ە . بەڵام ڕاست وایە کە (ئیلیاس)و (إدریس)(علیهم السلام) دووکەسی جیاوازن خوای گەورە زاناترە .

(ابن جریر)[2] لەمێژوەکەیدا دەڵێن: جیاوازی لەنێوان زانایان دانیە دەربارەی هەواڵی ڕابوردوەکان و گەلان و ئومەتی ئێمەش سەبارەت بەوەی کە کاروباری بنی اسرائیل دراوەتە دەست یوشەعی کوڕی کالب کوڕی یوفنا، کەیەکێك بوە لە هاوەڵانی موسا(علیه السلام) هاوکات زاوایشی بوە، واتە مێردی (مەریەم)ی خوشکی بوە، هەر ئەم دوو کەسەبوون کە لەناو بنی اسرائیل دا زۆر لەخوا دەترسان، یەکیان یوشەع و ئەوی تریان (کالب)بوو، هەر ئەوانیش بوون کەهانی بنی اسرائیلیات دەدا تاکو بچنە شارەکەوەو ڕزگاری بکەن، وەکوخوای گەورە لەسەر زاری ئەوان گوتیان :﴿ادخلوا عليهم الباب ان كُنتم مؤمنين﴾(المائده: ٢٣) (ابن جریر) دەفەرموێت: پاش (یوشەع)یش کاروباری بنی اسرائیل درایە دەست (حزقیل کوڕی بوذي).

[1] ضعيف اليه: ابن عساكر (٩ / ٢٠٧ )، ابن ابي حاتم (٧٥٥٦)، الطبري: (٥ / ج° / ٢٦١).
[2] التاريخ: (١ / ٢٧١) .

## ﴿چیرۆکی ژیانی حەزقیل (درود و سەلامی خوای لەسەربێت)﴾

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿أَلَمْ تَرَ الي اللذين....... وَلكن اكْثَرَ الناس لايشكرون﴾(البقرة: ٢٤٣).

(محمد کوڕی اسحاق)[1] لە (وهب کوڕی منبە)وە دەگێڕێتەوە کە کاتێك خوای گەورە گیانی (کالب کوڕی یوفنا)ی کێشا دوای یوشەع (علیه السلام) (حزقیل)جێگەی گرتەوە، ئەم (حزقیل)ە (علیه السلام) لەقورئاندا ڕوداوەکەی باس کراوە بەبێ ئەوەی ناوی بێت، لەم بارەیەوە (ابن إسحاق)[2] دەفەرموێت: ئەوگەلە لەدەست پەتایەك ڕایان کرد،ئیتر لایاندایە سەر لادۆڵێك،خوای گەورەش پێی فەرموون (بمرن)ئەوانیش تێکڕا هەموویان مردن، چەندین دەستەی شێر هاتنە سەریان وگۆشتەکەیانی خواردن و ئێسقانەکانیان بۆ ماوەیەکی زۆر بەوناوەدا بڵاوببوونەوە .

(حزقیل) (علیه السلام) بەوێدا تێپەڕی و سەرنجی لەو ئێسك و پروسکانەدا و بیری لێ دەکردنەوە، پێی گوترا: ئایا حەزدەکەیت خوای گەورە زیندوویان بکاتەوەو تۆش بەچاوی خۆت ببینی ؟فەرمووی: بەڵێ، فرمان کراکە ئەو ئێسقانانە گۆشت بگرن و دەمارەکان لێك ببەسترێنەوە، بەو جۆرە فرمان کرا لەلایەك خوای گەورەوە بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو فرمانە، ئیتر گەلەکە تێکڕا زیندووبوونەوەو هەستانە سەرپێ و بەیەك دەنگ فەرموویان (الله اکبر). (أسباط)[3] دەربارەی مانای ئەو ئایەتە گێڕانەوەیەکی هێناوە کە دەیباتەوە سەر (ابن مسعود) ئەویش لەکۆمەڵێ هاوەڵی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کەئایەتی: ﴿أَلَمْ ترالي اللذين .........ثم أحياهُمْ﴾(البقره: ٢٤٣)دەربارەی دانیشتوانی شارێکە – گوندێکە – کەناوی (داوردان)بووە بەلای (واسط)دا، پەتای تاعونیان تێکەوت، لەبەرئەوە زۆربەی خەڵکەکەی ڕایانکردو لەدەرەوەی شارەکە لەکەنارێکی ترەوە نیشتەجێ بوون، بەڵام ئەوانەی مابوونەوە لەشارەکە هەموویان لەناوچوون، ئەوانی دیکە زۆربەیان دەربازبوون، جاکە تاعونەکە نەما، ئەوانەی دەرەوەی شار گەڕانەوە بۆ شارەکە، ئەوانەی مابوونیشەوە لەشارەکەدا و لەتاعون ڕزگار ببوون،وتیان: ئەمانە هاوڕێمانن کەمەردانەتر لەئێمە فریای خۆیان کەوتن، جائەگەر ئێمەش وەکو ئەوانمان بکردایە زۆربەمان تێدا نەدەچووین، لەبەرئەوە ئەگەر ئەم جارە تاعون بێتەوە ناومان ئەوا لەگەڵ ئێوەدا کۆڕەو دەکەین شار چۆڵ دەکەین، سەرلەنوێ بەو نزیکانە دیسان تاعونەکە گەڕایەوە ناویان، ئەوانیش

---

[1] ضعيف اليه: ابن جرير، التاريخ (١ / ٢٧٢)

[2] ضعيف: ابن جرير، تاريخ (١ / ٢٧٢)

[3] حسن: رواه ابن جرير (١ / ٢٧١)تاريخ .

کەژمارەیان سی و ئەوەندە هەزار کەس بوون ڕایانکرد و خۆیان گەیاندە دۆڵێ (أفیح)، فریشتەیەك لەوسەری دۆڵەکەو ئەوی تریان لەمسەری دۆڵەکەوە هاواریان لێ کردن و پێیان گوتن: بمرن، هەموویان مردن و تەنها ئێسك و پروسکیان لەو دۆڵەدا مابوونەوە، پاش چەند سەردەمانێك (حزقیل)ی پێغەمبەر (علیه السلام) بەو دۆڵەدا ڕەت بوو، کە دیمەنی ئەم هەموو ئێسك و پروسکەی مرۆڤەکانی بینی، هەڵوێستەیەکی کردو لەپی دەست و پەنجەکانی خۆی دەگوشی، وەکو بیەوێت پرسیارێك بکات، خوای گەورە وەحی بۆ نارد و فەرمووی: ئایا دەتەوێ نیشانت بدەم کەچۆن چۆنی ئەمانە زیندوودەکەمەوە ؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەو، واتە حزقیل(علیه السلام) پێشتریش بیری لەکارو توانای خوای گەورە دەکردەوە، ئیتر پێی گوترا: بانگی ئەو ئێسك و پروسکانە بکە،ئەویش فەرمووی :ئەی ئێسك پروسکەکان خوای گەورە فرمانتان پێ دەکات کە کۆببنەوە، ئیتر ئێسقانەکانی هەریەکە لەوکەسانە یەکیان گرتەوە، تەنانەت هەندێکیان هەڵ دەفڕین بۆلای تەواو کەرەکەیان، پاشان فرمانی پێکرا، کەبانگیان لێ بکات و بڵێ: ئەی ئێسقانەکان خوای گەورە فرمانتان پێ دەکات کە بەگۆشت داپۆشرێن، پەیکەرە ئێسقانەکان گۆشتیان گرت، خوێنیان تێ هاتەوە، ئەو بەرگانەیان لەبەر کرایەوە کە کاتی خۆی لەبەریاندا بووە، پاشان فرمانی پێ کرا کە بانگیان بکەو پێیان بڵێ: ئەی لاشەکان خوای گەورە فرمانتان پێ دەکات کە هەستنە سەرپێ،ئەوانیش هەموویان هەستانەسەرپێ و زیندووبوونەوە.

(اسباط)[1] دەفەرموێت: (منصور) لە (مجاهد)وە پێی وایە کە ئەوان لەگەڵ زیندووبوونەوە هەستانە سەرپێ و گوتیان: ﴿سبحانك اللهم وبحمدك لا اله الآ انت﴾، ئیتر بەزیندوویی گەڕانەوە بۆ شارەکەو بۆناوی کەس و کاریان،ئەوان، واتا کەس و کارەکانیان، دەیانزانی کە ئەوانە مردوون، شوێنەواری مردن بەڕوخساریانەوە دیار بوو، کراسیان لەبەرنەدەکرد، مەگەر وەك بۆ نەو نەریت، ژیان تائەو کاتەی کە خوای گەورە ویستی و دیسان مراند نیەوە، سەبارەت بەژمارەیان ڕاو بۆچوونی جیاواز هەیە: (ابن عباس)[2] دەفەرموێت: ژمارەیان چوار هەزار کەس بووە یان هەشت هەزار کەس بوون، [3] ئەویش دەفەرموێت: نۆ هەزار کەس بوون، دیسانەوە لە (ابن عباس)ەوە هاتووە کە چل

---

[1] حسن الیه: ابن جریر (٢ / ج٢ / ٢د٨٧) .

[2] حسن الیه: ابن جریر (٢ / ج٢ / ٥٨٦) .

[3] سنده لا بأس به: ابن ابي حاتم (٢٤١٤) .

هەزار بوون، (سعيد کوڕی عبدالعزيز)[1] دەفەرموێت: ئەوان خەڵکی (ئەزروعات)بون، (ابن جريج)له (عطاء)[2]ەوە دەگێڕێتەوە کە ئەوە نمونەیەکە دەهێنرێتەوە کە (حَذَرٌ مِن قَدَرٍ) نیە، واتا مرۆڤ ناتوانێ خۆی بپارێزێ لەو قەدەرەی لەسەری نووسراوە و هەردەبێ ڕووبدات، دیارە قسەی جمهور لەگەڵ ئەوەدایە کە ڕوداوەکە ڕویداوە.

(پێشەوا ئەحمەد)[3] گێڕانەوەیەکی هێناوە کە دەیباتەوە سەر (أبو عبيده الجراح) کە پێیان وتووە: ئەو پەتای تاعونە لەشام ڕوویداوە،(عبدالرحمن کوڕی عوف)یش دەفەرموێت: من زانیارم لەو بارەیەوە لەلایەو گوێم لێ بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر تاعون لەشوێنێکدا بوو، ئێوەش لەو شوێنە بوون، ڕامەکەن و سەری خۆتان هەڵمەگرن، خۆ ئەگەر بیستتان کەلەشوێنێکی تر – شارێکی تر – تاعون بڵاوبوەتەوە،ئەوامەچنە ئەوشوێنەوە). هەروەها پێشەوا ئەحمەد گێڕانەوەیەکی تری هاو واتای ئەمەیان هێناوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەم دەردە گەلانی تری پێش ئێوەی پێ سزا دراوە، جا ئەگەر بیستتان لەخاکێك دا بڵاوبوە، ئەوا مەچنە ئەو خاکە،وەئەگەر لەشوێنێکا بڵاوبوەوەکە ئێوەی تێدا بوون ڕامەکەن و ئەوجێیە بەجێ مەهێڵن)[4] .

(ابن اسحاق)[5] دەفەرموێت: بەڵام باسی ئەوەی بۆنەکردین کە(حزقيل)(عليه السلام) ماوەی چەند ساڵ لەناو بنی اسرائيل دا ماوەتەوەو ئینجا خوای گەورە گیانی کێشاوە،کاتێك (حزقيل) (عليه السلام) کۆچی دوایی کرد، (بنو اسرائيل)ئەو بەڵێن و پەیمانە یان لەبیرچووەوە کەدابوویان بەخوای گەورە،بۆیە ڕوداوەکانیان لەلاگەورەبوو، دەستیان دایە بت پەرستی، یەکێك لەو بتانەش کەدەیانپەرست ناوی (بَعل)بوو، لەبەرئەوە خوای گەورە پێغەمبەرێکی تری بۆ ڕەوانەکردن کەناوی ئیلیاس کوڕی یاسین کوڕی فنحاص کوڕی عیزار کوڕی هارون کوڕی عمران بوو، کەلەگەڵ ژياننامەی(خضر)دا(عليه السلام) ژیانی (ئیلیاس)یشمان(عليه السلام) باس کرد، پاش ئەویش خوای گەورە کاروباری بنی اسرائیلی سپارد بە پێغەمبەرێکی تر کەناوی (ئیل یەسەع)بوو، (عليه السلام).

---

[1] حسن اليه: ابن ابي حاتم (٢٤١٠) .

[2] حسن اليه: ابن ابي حاتم (٢٤١١) .

[3] متفق عليه: المسند(١ / ١٩٤ )، بخاري (٥٧٢٩)، مسلم (٥٧٢٥) .

[4] المسند (١ / ١٩٣)

[5] ضعيف الأسناد :ابن جرير،التاريخ (١ / ٢٧٣) .

## ﴿پێغەمبەری خوا ئیل یەسەع (درودو سڵاوی خوای لەسەر بێت)﴾

خوای گەورە لەناوەڕاستی پێغەمبەراندا ناوی لەقورئاندا هێناوە و دەفەرموێ:

﴿وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطاً وَكُلّاً فَضَّلْنَا عَلَي الْعَالَمِينَ﴾(الأنعام: ٨٦)، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرْ إِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَذَا الْكِفْلِ وَكُلٌّ مِنَ الْأَخْيَارِ﴾(ص: ٤٨).

(ابن اسحاق) گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (قتادة)[١] ئەویش لە (الحسن)ەوە کە دەفەرموێت: دوای (ئیلیاس) (علیه السلام) (ئیل یەسەع) (علیه السلام) کرا بە پێغەمبەر، ئەوەندەی خوای گەورە ویستی لەناویاندا مایەوەو بانگەوازی دەکردن بۆ خواپەرستی و درێژەدان بەئاینی (ئیلیاس)تاکو خوای گەورە گیانی کێشا، پاشان ئەوگەلە چەندین نەوەو بەرەیان لێ کەوتەوەو دەستیان دایە تاوان و خراپەکاری، گەلێك کەسی ستەمکاریان تێدا پەیدا بوو،تەنانەت پێغەمبەرانیشیان شەهید کرد، پاشایەکی سەرسەخت و ستەمکاریان تێدا پەیدا بوو، تەنانەت پێغەمبەرانیشیان شەهید کرد، پاشایەکی سەرسەخت و ستەمکاریان هەبوو، وتراوە: ئەوپاشایە، ئەوپاشایە بووەکە (ذو الکفل)ی پێغەمبەر (علیه السلام) پێی فەرمووە ئەگەر تۆ تەوبەبکەیت و لەگوناهان بگەڕێیتەوە دەچیتە بەهەشتەوە، لەمەشەوە پێغەمبەرەکەش (علیه السلام)بە(ذو الکفل) ناوبراو ناسرا، چونکە کە فالەتی چوونە بەهەشتی ئەوپاشایەی کرد، ئەگەر تەوبەبکات و پەشیمان بێتەوەو واز لەگوناه بێنێ.

(محمد کوڕی ئیسحاق)[٢] دەفەرموێت: ناوی (ئیل یەسەع)ی کوڕی (أخطوب)ە،(ابن عساکر)یش دەفەرموێت: ناوی (اسباط)ی کوڕی (عەدەی کوڕی شۆتلم)ی کوڕی ئەفرائیم کوڕی یوسف پێغەبمەرە (علیه السلام) وتراوە :ئامۆزای (ئیلیاس) (علیه السلام) بووە، وتراوە: کاتی خۆی لەگەڵیشیدا لەئەشکەوتەکەی ژێر شاخی (قاسیون) دا خۆی شاردوەتەوە لەدەست پاشا ستەمکارەکەی (بەعلەبەگ)، دوایی لەگەڵیشیا ڕۆیشتوە بۆ شارەکە، کاتێك (ئیلیاس)(علیه السلام) بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان (ئیل یەسەع) (علیه السلام) جێگەی ئەوی گرتەوە لەناو گەلەکەیدا و پاشان خوای گەورە کردیشی بەپێغەمبەریان، وتراوە: کەلە(بانیاش)دا نیشتەجێ بوون، هەروەها ناوی (ئیل یەسەع)بەچەند جۆرێك خوێنراوەتەوە کەئەمانەن: (ئیل یەسەع)، (ئیل یەسسەع)، (لیە)سەع کە هەموویان هەر هەمان ناون بۆ هەمان پێغەمبەر (علیه السلام) ژیانی (ذو الکفل)یشمان لەدوای ژیانی

---

[١] منکر: چونکە (اسحاق کوری بشر)ی تێدایە کە تۆمەتی درۆزنی دراوەتە پاڵ

[٢] ضعیف الاسناد: ابن جریر (١/ ٢٧٣).

(أيوبّ)(عليه السلام) باس كرد، چونكه وتراوه: گوايه (ذو الكفل)كوڕی (أيوب)ه، خوای گەوره زاناتره.

ابن جرير و هەندێكی تر گوتويانه :ورده...ورده ...بنی اسرائيلييەكان نقومی گوناهو تاوان بوون،دەستيان دايه بت پەرستی و ئازاردان و شەهيد كردنی موسڵمانان و باوەڕداران و پێغەمبەران، لەتوێڵەی ئەوەش دا خوای گەوره پاشای ستەمكارو خوێن ڕێژی بۆ ناردن، جگه لەمانەش دوژمنی تريشی بۆ ناردن،نەريتيان وابوو كه هەركات دژی دوژمنەكانيان جەنگيان بكردايه، (تابوتی پەيمان)يان لەگەڵ خۆياندا دەبرد كەله (قبه الزمان)دايانابوو، هەروەكو پێشووتر باسمان كرد، بەهۆی بەرەكەتی ئەوتابوتەوه خوای گەوره سەركەوتووی دەكردن بەسەر دوژمنانياندا، ئەوتابووته شوێنەوارو ميراتی (ئال و موساو ئال هاڕون)ی تێدا بوو (عليه السلام)

هەندێ جەنگيان لەگەڵ خەڵكی (غەزه) و(عەسقەلان)كرد، كه ئەوان بەسەر بنی اسرائيل دا زاڵ بوون و زۆر ئازاريان دان و تابوتەكەيان لێ سەندن، ، كاتێك پاشای بنی اسرائيل يەكان ئەو هەواڵەی بيست بەلاداهات ومرد، لەوساتەدا گەلەكەی وەكو مەڕی بێ شوان پەرتەوازه و تاك و لۆ كەوتن، تاكو خوای گەوره ديسان پێغەمبەرێكی بۆ ڕەوانه كردن كەناوی (شمويل)بوو، داوايان لەم (شەمويل)ه كرد، (عليه السلام) كەپاشايەكيان بۆ دابنێ تاكو بەسەرۆكايەتی ئەو پاشايه دەست بكەن بەلەناوبردنی دوژمنەكانيان، كەپاشان بەيارمەتی خوای گەوره باسی دەكەين (ابن جرير) دەفەرموێت ماوەی نێوان كۆچی دوايی يوشەع تاناردنی ئەشمەويل (عليه السلام) چوارسەد و شەست ساڵ بووه وچەندين پاشا لەوماوەيەدا گۆڕاوه .

## ﴿پێغەمبەری خوا شەمویل ( درودو سڵاوی خوای لەسەر بێت )﴾

ناوی (شەمویل)یان (ئەشمەویل)ەو کوڕی بالی کوری عەلقەمەی کوڕی یەرخام کوڕی یەهو کوڕی تەهو کوڕی (صوف)ی کوڕی عەلقەمەی کوڕی (ماحث)ی کوڕی (عموصا)ی کوڕی (عەزریا)یە، (مقاتل) دەفەرموێت: لەنەوەو پشتی (هارون)ە(علیه السلام) وە (مجاهد)یش دەفەرموێت: ناوی ئەشمەویل کوڕی هەلفاقایە، لەمەش زیاتر باس نەکراوە دەربارەی ئەوەی ئاخۆ ڕەچەڵەکی دەچێتەوە سەر کام لەپێغەمبەرانی پێشین(علیهم السلام) خوای گەورە زاناترە .

(السدی)[1] گێڕانەوەیەکی هێناوە کە دەیباتەوە سەر ابن مسعود و هاوەڵان و (الثعلبي) کە فەرمویانە: کاتێك عەمالیقەکان لەخاکی (غەزە)و (عەسقەلان)دا زاڵ بون بەسەر بنی اسرائیلی یەکانداو ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن، گەلێك لەلاوەکانیان لێ بەدیل گرتن، ئیتر پێغەمبەرایەتی لەدەستەی (لاوی) یەوە پچڕا، لەناویاندا، هەرهەموویان کە دەچوونەوە سەر ئەو پشتە لەناوچوون جگەلە ژنێك نەبێ کە دووگیان بوو، ئەم ژنە لەخوای گەورەپاڕایەوە کە خوای گەورە کوڕێکی بداتێخوای گەورەش کوڕێکی پێ بەخشی و ناوی نا (ئەشمەویل)(علیه السلام) کە بەزمانی عبری مانای (اسماعیل)ە، واتا (سمع الله دعائی): خوای گەورە نزاکەی بیستم وەری گرت، کاتێك ئەشمەویل پێگەیشت، دایکی ناردی بۆ مزگەوت تاکو لای زانایەکی خواناس پێبگات، لای ئەو پیاوە مایەوە، کاتێك (ئەشمەویل) (علیه السلام) باڵق بوو، شەوێك گوێی لە دەنگێك بوو لەلایەکی مزگەوتەکەوە بەرەو گوێی ئەو دەهات، ئەشمەویل ڕاپەڕی لەخەو، وایزانی ئەوە پیاو چاکەکەیە بانگی دەکات، بەپیاوەکەی گوت: تۆبووی بانگت کردم ؟ پیاوەکەش وتی: بەڵێ، نەبادا ترسابێت، پاشان پێی گوت: بڕۆنەوە، ئەویش نووست، دیسان بانگی کردەوە، تا سێهەم جار، تومەز ئەمە (جبریل)ە (علیه السلام) بانگی دەکات و ئەویش هات بەلایەوە، پێی فەرموو: پەروەردگارت تۆی کردوەتە پێغەمبەر بۆ گەلەکەی خۆت، خوای گەورەش لەقورئانی پیرۆزدا لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ ........ وَلَكِنَّ اللهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى العَالَمِينَ﴾(البقره: ٢٤٦ – ٢٥١)، خوێنەری بەڕێز دەتوانیت سودلە تەفسیرەکان وەربگری بۆ مانای ئەم ئایەتە پیرۆزانە .

---

[1] حسن الأسناد: ابن جریر (١ / ٢٧٦) .

زۆربەی ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز فەرموویانە: ئەو پێغەمبەرەی کە خوای گەورە لەم باسەدا ڕووداوەکەیان دەگێڕێتەوە(شەمویل)ە(علیه السلام) وتراوە:(شەمعون)ە(علیه السلام) وتراویشە هەردوو ناوەکە هەریەك کەسن، وتراوە: یوشەعە(علیه السلام) بەڵام بۆچوونەکەی دواییان زۆر دوورە،هەروەکو (ابن جریر) لەمێژووەکەیدا دەفەرموێت: لەکۆچی دوایی یوشەعەوە تاکو ناردنی شەمویل (علیه السلام) ماوەی چوارسەدو شەست ساڵ لەنێوانیاندا هەبووە، خوای گەورە زاناترە . مەبەست لەوەیەکە: کاتێك ئەم گەلە جەنگ و کوشتاری ستەمکاران لەسەریان و دوژمنەکانیان تەواو شەکەتیان کردن، لەو سەردەمەدا چوونە لای پێغەمبەرەکەیان و داوایان لێ کرد کە پاشایەکیان بۆ دیاری بکات تاکو سەر پەرشتیان بکات و ئەمانیش بڕیاریاندا گوێ ڕایەڵی بکەن و جەنگ بکەن و بەرگری لەخۆیان و خاك و پەیام و ڕۆڵە کوژراو و بەدیل گیراوەکانیان بکەن، پێغەمبەرەکەیان، واتا: شەمویل (علیه السلام) پێی فەرموون: ﴿هَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلَّا تُقَاتِلُوا قَالُوا وَمَا لَنَا أَلَّا نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِنْ دِيَارِنَا وَأَبْنَائِنَا فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوْا إِلَّا قَلِيلاً مِنْهُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾ واتە: ئەگەر جهادتان لەسەر دابنرێ، گران نابێ بەلاتانەوە و دەیکەن ؟ گوتیان: ئەدی چی شتێ ڕێگەمان لێ دەگرێ ؟ بۆچی نایکەین لەکاتێکدا ولاّتی خۆمان بەجێ هێشتوەو منالْ و کەس و کارمان دیل و دەست بەسەرن ؟ هەقی خۆمانە جەنگ و کوشتار لەپێناو ئەمانە بکەین، ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوْا إِلَّا قَلِيلاً مِنْهُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ﴾، واتە: کاتێك جەنگمان لەسەر دانان – کەبیکەن دژی دوژمنەکانیان – کەچی ئەوان پشتیان هەڵکرد و نەیانکرد، مەگەر کەمێکیان نەبێ، خوای گەورەش ئاگاداری ستەمکارانە –کەچی دەکەن – ئەوان لەگەڵ پاشاکەیاندا لەڕووبارەکە نەپەڕینەوە – واتا نەچوونە ئەو بەرەوە –ژمارەیەکی کەمیان نەبێ ، گەڕانەوە ونکولیان لەجەنگ کرد:﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكاً﴾ واتە: پێغەمبەرەکەیان پێی گوت: خوای گەورە طالوتي کردوە بە پاشاتان (الثعلبي) دەفەرموێت: پاشاکەیان ناوی طالوتي کوڕی قەیش کوڕی ئەفیل کوڕی صارو کوڕی تە حۆرت کوڕی ئەفیح کوڕی ئەنیس کوڕی بنیامین کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاق بووە (علیه السلام) پێشتر طالوت پیشەوەر بووە، (عکرمە)[1] و (السدّي)[2] فەرمویانە ئاوهێن بووە، (وهب کوڕی منبە) یش[3]فەرمویەتی: پێستە خۆشکەر بووە،هەروەها شتی تریش

---

[1] ضعيف الأسناد: ابن جرير (٢ ج٢/ ٦٠٣)

[2] حسن الأسناد: ابن ابي حاتم (٢٤٦١)

[3] ضعيف الأسناد: ابن جرير (١ / ج٢/ ٦٠١)

دەربارەی پیشەکەی طالوت وتراوە، خوای گەورە زاناترە . ﴿ قَالُوا أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِنَ الْمَالِ﴾، واتا: چۆن دەبێ ئەوە بکرێ بەپاشامان لەکاتێکدا ئێمە لەئەو شایستەترین بۆ پاشایەتی و خۆ ئەو خاوەن ماڵ و سامانیش نیە – هێندەی ئێمە، واباس کراوەکە پێغەمبەرایەتی لەتیرەی (لاوی)بوەو پاشایەتیش لەتیرەو دەستەی (یەهوذا)بوە، کاتێك زانییان ئەم پاشایە لەدەستەو تیرەی (بنیامین)ە، بەدڵیان نەبوو، تەشەرو تانەیان لەوپاشایەتیەی دەداو دەیانگوت: ئێمە لەئەو زیاتر شایستەی پاشایەتین، واباس دەکەن کە هەژار بوە، بۆیە دەیانگوت: ئەو هەژارە چۆن دەبێ بەسەرماندا بکرێتە پاشا – کاتێك لەئەو دەوڵەمەندترین؟، ﴿قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ﴾ پێغەمبەرەکەیان (عليه السلام) فەرمووی: ئاخر ئەم پیاوە خوای گەورە خۆی هەڵی بژاردوە لەناو تانداو کردویەتیە پاشاتان، جگە لەوەش لەئێوە زاناترە، وتراوە: زاناترە لەکاروباری جەنگداو لەئێوە زەلامترو بەخۆوە ترە، وتراوە: خوای گەورە وەحی ناردوە بۆ (شەمویل)(عليه السلام) و پێی فەرمووە کە هەرکەسێك لەبنی ئیسرائیلی یەکان درێژی یەکەی هێندەی درێژی ئە داردەستەیە – یان گۆچانەیە – وەهەرکەدێتە لات ئەو شاخەی پێ یە [1] . کەچەوریو ڕۆنی قودسی تێدایە هەڵ دەچێت یان هەڵ دەکفێت، بنی اسرائیلی یەکان کەوتنە پێوانەکردنی خۆیان بەدرێژی ئەو داردەستە، بەڵام جگە لە (طالوت هیچیان درێژی یەکەیان هێندەی درێژی داردەستەکە نەبوو، وە کاتێك هاتیشە خزمەتی (شەمویل)(عليه السلام) شاخە پڕ لەڕۆنەکەی هەڵکفاو ئەویش کردی بە پاشا بەسەریانەوە، وتراوە وشەی (الجسم) لەئایەتەکەدا مەبەستی درێژی بالایەتی کە هێندەی درێژی داردەستەکەبووە، هەروەها وتراوە :طالوت لەهەموویان جوانتربووە، بەڵام ڕوکاری ئایەتەکە وا نیشان دەدات کەلە هەموویان جوانتر و زاناتر بووە لەدوای (شەمویل)ی پێغەمبەریانەوە (عليه السلام) ﴿وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ خوای گەورەش خۆی پلەوپایەوموڵك وسامان بەهەرکەسێ دەدات کەخۆی –واتە خوا دەیەوێت.

﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَنْ يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَى وَآلُ هَارُونَ تَحْمِلُهُ الْمَلَائِكَةُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾، واتە: پێغەمبەرەکەیان پێی گوتن بەڵگە بۆئەوەی بزانن کە ئەوپیاوە – واتا طالوت–پاشایەکی گونجاوە ئەوەیەکە ئەوتابوتەتان بۆ دەهێنێتەوە کەچەند کاتە لێتان براوە مایەی دڵ ئارامیتانە لەلایەن پەروەردگارەوە، وەئەو میراتیەیشی تێدایە کەلەلایەن کەس و کارو شوێنکەوتوانی موساو هارونەوە بۆتان

[1] مەبەست لەشاخی ئاژەڵەکە چەوری ڕۆنی هەسانی تێدەکرا – وەرگێڕ.

ماوەتەوە، ئەو تابووتە فریشتەکان هەڵی دەگرن و بۆتان دەهێننەوە، ئەمەش ئایەتێکی خوایی و بەڵگەیەکی گەورەیە بۆتان ئەگەر باوەڕدارن ، دیارە ئەوەش بەهۆی پیرۆزی ئەوپیاوە باشەوە – واتا طالوت – دەستتان دەکەوێتەوە، وتراوە :لەناو تابوتەکەدا تەشتێکی زێڕینی تێدابووە کە سینەی پێغەمبەرانی لەسەر شۆراوەتەوە، وەوتراوە: نەخێر (السکینە) لەو ئایەتەدا مانای بۆنێکی خۆشە،وتراوە: ئەوتابوتەلە کاتی جەنگدا وەکو پشیلە دەنگێکی لێ هاتووە، بەوەش بنی اسرائیل دڵنیا دەبوون لەسەرکەوتنی جەنگەکەیان، وتراوە: لەناو تابوتەکەدا چەند پلێتێکی گرانبەهای پەیامی تەوراتی تێدابووە، لەگەڵ هەندێ لەو گەزۆیەیەی کەلەکاتی گەمارۆکەدا خوای گەورە بەسەریاندا باراندبووی . (تحمله الملائکة)، واتا: تابووتەکە فریشتەکان بەبەرچاوی خۆتانەوە هەڵی دەگرن و بۆتان دەهێننەوە، تاکو ببێتە بەڵگەی ئاشکرا بۆتان و بەسەریشتانەوە و دڵنیا بن لەوەی کە زۆر لەجێی خۆیەتی طالوت پاشاتان بێ .

وتراوە: کاتێك عەمالیقەکان تابووتەکەیان لەجەنگدا لەبنی اسرائیلی یەکان سەندو بۆخۆیان برد، خستیانە ژێر یەکێك لەبتەکانیانەوە، ڕۆژێك تەماشایان کرد تابوتەکە لەسەرسەری بتەکە دانراوە، دایانگرت و لەژێر بتەکەدا دایاننایەوە سبەی بەیانی تەماشایان کرد دیسان لەسەرسەری بتەکەیە، ئەوانیش ڕقیان هەستاو زانییان ئەم کاری پەروەردگارە،بۆیە لەشارەکەی خۆیان تابوتەکەیان دور خستەوەو ناردیان بۆ گوندێك لەگوندەکانیان، بەمەش خوای گەورە گەردنی دوچاری نەخۆشیەك کردن، کەئەمەش درێژەی کێشا، ئیتر تابلوتەکەیان لەدوومانگا بەست و ڕەوانەیان کردن، وتراوە: فریشتەکان مانگاکانیان بەو ئاراستەیەدا لێخوڕی تاکو هاتنە بەردەم دەستەیەك لەپیاو ماقوڵانی بنی اسرائیل، ئەوان بەچاوی خۆیان تابووتەکەیان دەبینی، هەروەکو چۆن پێغەمبەرەکەیان (ﷺ) بۆی باس کردبوون ئاوەهاش تابوتەکە هاتەوە لایان،خوای گەورە زاناترە چۆن چۆنی تابووتەکە هاتوەتەوە، بەڵام ڕوکاری ئاشکرای ئایەتەکە وانیشان دەدات کە فریشتەکان هەڵیان گرتووە، ئەگەر چی زۆربەی ڕاڤەکارانی قورئان ئەوەی یەکەمیان باس کردووە .

﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُمْ بِنَهَرٍ فَمَنْ شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَنْ لَمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلَّا مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ﴾ واتا: کاتێك طالوت سەربازەکانی جیاکردەوە و بەرەو جەنگ بەڕێکەوتن، پێی گوتن: خوای گەورە بەدەریایەك تاقیتان دەکاتەوە، جاهەرکەس لەناوی ئەو دەریای خواردەوە ئەوە لەمن نیە – واتا لەگەڵ من نیە، ئەوکەسەی لەگەڵ منە ئەوەیە کە لوێچێکی

لیٚ دەخواتەوە . (ابن عباس)[1] دەفەرمویٚت: ئەو ڕوبارە، ڕوباری ئەردەن بووە، طالوت فەرمووی هەرکەس لێی بخواتەوە –مەگەر تەنها لوێچێك ئەوا بۆی نیە لەگەڵ مندا بەشداری ئەم جەنگە بکات، (السدی)[2] دەفەرمویٚت: سوپاکەی هەشتا هەزار کەس بوو، حەفتاو شەش هەزار کەس لەوانە لەئاوی دەریاکەیان خواردەوەو تەنها چوار هەزار کەسی لەگەڵدا مایەوە، بەڵام دیارە ئەمەش جێگەی قسەو باسە چونکە خاکی ئەوسای (بیت المقدس)هەڵی نەدەگرت کەسوپایەکی هەشتا هەزار کەسی جەنگی تێدا بکات . خوای گەورەش زاناترە .

لەڕەوتی ئایەتەکاندا کەباسی (طالوت) و سوپاکەی دەکات، خوای گەورە دەفەرمویٚت: کاتێك طالوت و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لەدەریاکە پەڕینەوە، خۆی و باوەڕداران،گوتیان :ئەمڕۆ ئێمە لەوزەماندا نیە بەرەنگاری جالوت و سوپاکەی ببینەوە، چونکە ئەوان ژمارەیان لەئێمە زۆر ترە، بەڵام لێرەدا ئەوانەی کە بەنیاز بون بەخوای خۆیان بگەن ، گوتیان: زۆرن ئەو گروپ و دەستانەی کەکەم بوون و زاڵیش بوون بەسەر گروپ و دەستەی زۆر دا بەناوی خواو بە یارمەتی خوا،خوای گەورەش لەگەڵ ئارامگرانە، کاتێك ڕووبەڕووی جالوت و سەربازەکانی بوونەوە، گوتیان پەروەردگارا ئارامگریمان پیٚ ببەخشەو پێمان چەسپ بکەو بەسەر گەلانی بیٚ بڕوا دا سەرکەوتوومان بکە،دیارە ئەوان داوای ئارامگرییان کرد لەڕووی لاشەیی و دەروونیەوە، خوای گەورەش نزاکەی وەرگرتن وە بەناوی خواو بەهاوکاری خوای گەورە توانیان تێکیان بشکێنن ئەگەر چی زۆریش لەئەوان کەمتر بوون بەژمارە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرمویٚت بە پێغەمبەرمان محمد و یاوەرانی دەربارەی جەنگی بەدر: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنْتُمْ أَذِلَّةٌ فَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ سەرەنجامی جەنگەکە داود جالوتی کوشت و پاشایەتی و مایەداری و حیکمەتی و زانیاری لەوشتانەدا بەداود بەخشی کەخۆی مەبەستی بوو – واتا خوای گەورە .

لەو ئایەتەدا خوای گەورە ئاماژە بەئازایەتی و جەربەزەیی داود دەکات(علیه السلام)، چونکە توانی سەرکردەو پاشای بیٚ بڕوایان بکوژێ،دیارە هەرکات سەرکردەی سوپا، یان پاشای وڵات لەجەنگدا بکوژریٚ یان بەدیل بگیریٚ ئەوا ئەو جەنگە ئەو پەڕی تێکشکانە بۆ بەرانبەر، هیچ سەرکەوتنێکی جەنگ هێندە گرنگ نیە بەقەدەر ئەو جەنگەی کەسەرکردەی دوژمن بکوژریٚ و پاڵەوانەکانیان بەدیل بگیرێن، بۆیە باوەڕداران سەرکەوتن و ئاینی خوا

---

[1] حسن اليه: ابن جرير (٢ / ج ٢ /٦١٨)، ابن ابي حاتم (٢٥٠) .

[2] حسن الأسناد: ابن ابي حاتم (٢٥٠٢)، ابن جرير (٢ / ج ٢ / ٦٢٢) .

سەرکەوتنی بەدەست هێنا چونکە سەربازەکانی طالوت بۆ خوا کاریان دەکردو بەهۆی تاقیکردنەوەی ئاوی ڕووبارەکەیشەوە دوڕووولاوازەکانیان لێ جیاکرایەوەو وردڵ پڕ لە باوەڕەکان مانەوە .

(السدّي) دەگێڕێتەوە کەداود (عليه السلام) بچووکترین منداڵی باوکی بووە لەناو سیازدەبراکاندا، (طالوت) هانی بنی اسرائیلی یەکانی دەدا بۆ جەنگ کردن و بەسەربازەکانی دەگوت: هەرکەسێك جالوت بکوژێ کچەکەی خۆمی دەدەمێ و دەیکەمە هاوبەشی ماڵەکەم، (داود)(عليه السلام) بە (هەڵدەری بەرد)جەنگی دەکرد و زۆر دەستی ڕاست بوو، لەناو خەڵکەکەدا گوێی لێ بوو بەردێك بەداودی گوت: من بەکاربێنە، چونکەبەمن جالوت دەکوژی، (داود)یش (عليه السلام) بەردەکەی هەڵگرت و فڕێی دا، دیسان بەردێکی تر هاتە قسە، پاشان بەردێکی تر بەم جۆرە هەرسێ بەردەکەی هەڵگرت و کردیە ناو بەرد هەڵدەرەکەوە، کاتێك هەردووبەرەی جەنگ ڕوو بەڕووی یەکتر ڕاوەستان، جالوت سنگی دەرپەڕاندو دوور بەدوور بەداودی گوت: دووربکەوەرەوە من حەزناکەم بتکوژم، داود (عليه السلام) فەرمووی بەلأم من حەزدەکەم بتکوژم، سێ بەردەکەی پێشووی هێناو خستیە ناو دەزگای هەڵدانەکەوەو ئینجا خولاندیەوە،تاکو سێ بەردەکە بوون بەبەردێك [1] ئینجا ڕووبەڕووی جالوت هەڵیدا،سەری جالوتی تەقاند، سوپاکەی پەرتەوازە بوون و بەشکاوی ڕایان کرد، (طالوت)یش پەیمانەکەی خۆی بردە سەر و کچەکەی خۆی لێ مارەکرد و لەماڵەکەیشی دا هاوبەشی کرد،(بنی اسرائیل)یەکان داودیان لەمەوە زۆر خۆش دەویست و بگرە لە(طالوت)یش زیاتر نزیکی دەبوونەوە،واباس دەکەن: گوایە: (طالوت) ئێرەیی پێ بردوەو هەوڵی داوە بیکوژێ، بەلأم تەکتیکەکەی سەرکەوتوونەبوە، زانایانیش ڕێگەیان بە (طالوت)نەدەدا کە داود بکوژێ، بەلأم ئەو جەنگی بەرپاکردو هەموویانی لەناوبرد، کەمێکیان نەبێ، پاشان زۆر پەشیمان بووەوە لەوکارەی و تەوبەی کرد و زۆر دەگریا، تەنانەت سەرزەویشی بەفرمێسکەکانی خۆی تەڕ دەکرد، کاتێك دەچوو بۆ گۆڕستان، ڕۆژێکیان لەپەنمانەوە بانگ کرا و گوترا: ئەی طالوت ئێمەت کوشت بەلأم ئێمە هەرزیندوین، ئازارمان دەدەیت کاتێك کەمردوشین، بەمەش طالوت زۆر زیاتر لە جاران دەگریا و دەترسا، ئینجا کەوتە پرسیارکردن لەزانایان وگوتی: ئایا مافی تەوبەکردنم هەیە ؟ وترا: ئایا هەروا بەزانایی ماویت ؟تاکو توانی ژنێکی خوا پەرست

---

[1] بەردهەڵدەر: قۆچەقانی: مقلاع: قاذفة .

بدۆزێتەوە،ژنەکە(طالوت)ی برد بۆ سەر گۆڕی (یوشەع)(علیە السلام) وتراوە: ژنەکە داوای لەخوای گەورەکرد تاکو یوشەع لەگۆڕەکەی هاتە دەرەوە و فەرمووی: ئەوە ڕۆژی قیامەتە ؟ژنەکە گوتی: نا ...بەڵام ئەوە طالوتە هەواڵت دەپرسێ و ئەیەوێ بپرسێ ئاخۆ مافی تەوبەی هەیە ؟ فەرمووی بەڵێ،بادەست بەرداری ملك و پاشایەتی ببێ و بڕوات کوشتار بکات لەپێناوی خوادا تاکو دەکوژرێت، پاش ئەمە (یوشەع) (علیە السلام) مردەوە، (طالوت)یش هات ملك و ماڵی بۆ داود بەجێ هێشت و ڕۆیشت و سیازدەش لەکوڕەکانی لەگەڵیدا ڕۆیشتن بۆ جهاد، کوشتاریان بەبێ بڕوایان کرد تاکو شەهید بوون؛ وتراوە: هەرلەبەر ئەوەیشە خوای گەورە دەربارەی ئەو دەفەرموێا: ﴿وآتَاهُ اللّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاءُ﴾، (ابن جرير)[1] بەم جۆرە باسی کردوە،گەر چی زۆربەی ئەم گێڕانەوەیە مایەی سەرنج و پرسیار کردنە .

بەڵام (محمد کوڕی ئیسحاق)[2] دەفەرموێت :ئەو پێغەمبەرەی کە زیندو کرایەوەو هەواڵی تەوبەکردنی بە (طالوت)ڕاگەیاند (ئیل یەسەع کوڕی أخطوب)بووە(علیە السلام) (الثعلبي)یش واباس دەکات کەژنە خواناسەکە (طالوت)ی هێنا وە بۆسەر گۆڕی (شەمویل(علیە السلام) ئەویش زۆر هەرەشەی لێکرد دەربارەی ئەو ئاژاوەیەی کە دوای ئەو – واتای دوای مردنی ئەشمەویل –ناویانەتەوە، ئەمەشیان گونجاوترە، ڕەنگە لەخەودا بینیبێتی، نەك لەناو گۆڕەکەی هاتبێتە دەرەوە، ئەوەیان هەرگیز بەموعجیزە ڕوویدا بێ، کەموعجزەش تەنها بۆ پێغەمبەرانە، ئەوژنەش پێغەمبەر نەبووە، خوای گەورە زاناترە .

(أهل التوراة) پێیان وایە کەماوەی کاتی لەپاشایەتی بوونی (طالوت)ەوە تاکو شەهید بوونی خۆی و کوڕەکانی چل ساڵ بووە .خوای گەورە زاناترە

---

[1] التاريخ (١ : ٢٧٨) .

[2] هەمان سەرچاوە (١ : ٢٨٠) .

## ﴿پێغەمبەری خوا داوود (درودوسڵاوی خوای لەسەربێت)﴾

ناوی (داود کوڕی ئیشا کوڕی عوید کوڕی عابر کوڕی سەلمۆن کوڕی نەخشون کوڕی عویناذب کوڕی ئیرم کوڕی حصرون کوڕی فارص کوڕی یەهوذا کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ابراهیم)ە (علیه السلام)

(محمد کوڕی ئیسحاق)[1] گێڕانەوەیەکی هێناوە لە (وهب کوڕی منبه)بەوە کە دەڵێت: داود (علیه السلام) پیاوێکی باڵاکورتی چاوشین مووتەنك ودڵپاك و ڕوخۆش بووە، (جالوت)ی کوشت لە (قصرام حکیم)ی نزیك مێرگی (حضر)و بنی اسرائیلی یەکان لەمەوە داودیان .زۆر خۆش دەویست و بە تەواوەتی ڕوویان لەئەو کردو (طالوت)تاڕادەیەك ئەو خۆشەویستی یەی نەماو فەرامۆش کرا، سەرەنجام موڵك و پاشایەتی و دەسەڵات درابە داود (علیه السلام)، بەمەش بەهرەیەکی گەورە لەلایەن خواوە درابە داود (علیه السلام) ئەویش کۆکردنەوەی پێغەمبەرایەتی و پاشایەتی بوە لەئەودا، چونکە دەبوایە پاشایەتی بۆ دەستەیەك بوایە و پێغەمبەرایەتیش بۆدەستەکەی تر، بەڵام هەردوکیان لە (داود)دا (علیه السلام) کۆکرایەوە، هەروەکو خوا گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿فَهَزَمُوهُمْ بِإِذْنِ اللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُدُ جَالُوتَ وَآتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاءُ وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَفَسَدَتِ الْأَرْضُ وَلَكِنَّ اللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ (البقرة:٢٥١)، لەم ئایەتەدا ئاماژەبەوە دەکات ئەگەر خوای گەورە پاشاکانی نەکردایەتی سەرکردە بەسەر خەڵکی یەوە ئەوا خەڵکی بەهێز خەڵکی لاوازیان لەناودەبرد، لەبەر ئەوە وتراوە: (دەسەڵاتدار – دادپەروەر– سێبەری خوایە لەزەوی خوادا)[2] وە (عثمان کوڕی عفان)یش دەفەرموێت:(خوای گەورە ئەوەی بەدەسەڵاتدارێك لایدەبات بە قورئان لاینابات)، واتا هەندێ جار پاشا دەتوانێ شتی وا خراپ لەناو خەڵکی دابن بڕبکات کەبەقورئان بن بڕ ناکرێ .

(ابن جریر) لەمێژوەکەیدا دەفەرموێت: کاتێك جالوت هات تاکو ڕوبەڕوی (طالوت)بێتەوە،پێی گوت: بۆم وەرە پێشەوە یان من بۆت دێمە پێشەوە و بۆت دادەبەزمە مەیدان، (طالوت)خەڵکەکەی پاڵ پێوەنا بۆ دواوەو (داود) یش بەرەو پێش خۆی کوتاو جالوتی کوشت، لەمەوە خەڵکەکە لایانکرد بەلای (داود)داو زۆر خۆشیان دەویست و (داود)یان کردە پاشایان، وتراوە :ئەمەش بە فرمانی (شەمویل)(علیه السلام) کراوە، تەنانە

---

[1] ضعيف الأسناد: ابن جرير، التاريخ (١/ ٢٨١) .

[2] ضعيف :البيهقي (٧٣٧٢)، البزار (١٥٩٠)،الكامل رابوعدي (٣ / ٣٦١)الالباني –الضعيفة (ح / ٦٠٤ – ١٦٦١ – ١٦٦٤).

هەندیٚ وتویانە: (شەمویل) (علیه السلام) بەرلەو ڕووداوەش (داود)ی کردە پاشایان، بەڵام ڕای زۆربەی جمهوری زانایان وایەکە پاش کوشتنی جالوت پاشایەتی درا بە (داود(علیه السلام) خوای گەورە زاناترە .

(ابن عساکر)[1] لەسعید کوڕی عبدالعزیز دەگێڕێتەوە کە: داود لە (قصرام حکیم)جالوتی کوشتوە و ئەو ڕوبارەش کە لەئایەتەکەدا ناوی هاتوە هەر هەمان ڕوبارە تائێستاش هەر لەو شوێنەی خۆی ماوە، خوای گەورە زاناترە: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُدَ مِنَّا فَضْلاً يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ . أَنِ اعْمَلْ سَابِغَاتٍ وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ وَاعْمَلُوا صَالِحاً إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾(سبأ: ١٠ – ١١) ، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ وَكُلّاً آتَيْنَا حُكْماً وَعِلْماً وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُدَ الْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَالطَّيْرَ وَكُنَّا فَاعِلِينَ . وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَكُمْ لِتُحْصِنَكُمْ مِنْ بَأْسِكُمْ فَهَلْ أَنْتُمْ شَاكِرُونَ﴾(الأنبياء: ٧٩ – ٨٠)، لەم ئایەتانەدا خوای گەورە باسی ئەوە دەفەرموێت کەخوای میهرەبان بەهرەی زیرەکی پیشەیی پیٚ بەخشیوە، لەوانەش دروستکردنی زریٚ لەئاسن، بۆکاتی جەنگ،ئەویش بەجۆرێك زۆر تۆکمەو جۆش دایدەڕشت، بەڕادەیەك کە خوای گەورە لەباسی تۆکمەیی و (زریٚ)یەکانی (داود)دا (علیه السلام) لەقورئاندا دەفەرموێت: (علیه السلام) واتە بزمار نەیدەبڕی،هەروەکو (مجاهد)[3] و (قتادة)[3]و (حکم)[4]و (عکرمە)وایان فەرمووە، لەلایەکی ترەوە (حسن البصری)[5] و (قتادە)[6]و (أصمش) فەرمویانە:خوای گەورە بەجۆرێك ئاسنی بۆ (داود)نەرم کردبوو، کەبەدەستی ئاسایی ئاسنی لوول دەکرد و پێویستی بەگەرمکردن وچەکوش نەبوو، (قتادە)[7] دەفەرموێت: (داود) (علیه السلام) یەکەم کەسە کە زرێی لەماددەی زەرد دروست کردوە، کەپێش ئەو لەپڵێت دروست دەکرا، (ابن شوذب) دەفەرموێت: (داود) (علیه السلام) هەموو ڕۆژێك زریٚ یەکی دروست دەکرد و دەیفرۆشت بەشەش هەزار درهم، وەلەفەرمودەی پێغەمبەریش دا (ﷺ) هاتووە کە دەفەرموێت: ﴿حەڵاڵترین و پاکترین شت کەمرۆڤ بیخوات – پەیدای بکات

---

[1] تاریخ دمشق (١٧ / ٨١) .
[2] صحیح الیه: ابن جریر (١٢ / ج٢٢ / ٦٨)
[3] حسن الیه: عبدالرزاق (٢٣٩٩)، ابن جریر (١٢ / ج٢٢ / ٦٨)
[4] حسن الیه: ابن جریر (١٢ / ج٢٢/٦٨)
[5] السیوطي بۆ (ابن ابي حاتم )پشت ڕاستی کردوەتەوە .
[6] صحیح الیه: ابن جریر (١٢ / ج٢٢ /٦٧)؛ عبدالرزاق.
[7] حسن الیه: ابن جریر (١٢ / ج٢٢/ ٦٧)

– ئەوەیە کەبەرهەمی کاسبی خودیخۆی بێت، وە پێغەمبەری خواش داود بەری ڕەنجی دەستی خۆی دەخوارد – بەوە دەژیا﴾[1].

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَاذْكُرْ عَبْدَنَا .......... وَفَصْلَ الْخِطَابِ﴾(ص:١٧ – ٢٠) لەبارەی واتای ئەم ئایەتەوە (ابن عباس)[2] و (مجاهد)[3] سەبارەت بەوشەی (الید)فەرموویانە :واتە هێزو گوێ ڕایەڵی، واتە: داود (علیه السلام) خاوەن هێزو ئازابوە لەخواپەرستی و کردەوەی چاك دا، (قتادە)[4]ش دەفەرموێت: خوای گەورە توانایەکی باشی داوەتیٚ لەبەندایەتی کردنی خوای گەورەدا وەشارەزایی باشیشی داوەتیٚ لە (ئیسلام)دا، ئەم پێغەمبەرە نازدارە، بەشەو شەو نوێژی دەکردو ڕۆژێ ناڕۆژێکیش بەڕۆژوو دەبوو، لەفەرمودەی پێغەمبەریشداهاتوە خۆشەویسترین ڕۆژوو بەلای خواوە ڕۆژووی داودە، ئەو نیوەی شەوگار دەخەوت سیٚ یەکی شەوگار هەڵدەستایەوە و شەش یەکی دەخەوتەوە، ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو، ڕۆژی دواتر بەڕۆژوو نە دەبوو. )[5]، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا سَخَّرْنَا الْجِبَالَ ............ كُلٌّ لَهُ أَوَّابٌ﴾(ص: ١٨ – ١٩)، وە دەفەرموێت: ﴿يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ﴾(سبأ: ١٠)، واتە: ئێمە فرمانمانی بەشاخەکان کرد کەلەگەڵ داود تەسبیحات و زیکری خوا بکەن، ئەمەش لێکدانەوەی (ابن عباس)[6]و (مجاهد)[7]ە (علیه السلام) دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە کەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا سَخَّرْنَا الْجِبَالَ مَعَهُ يُسَبِّحْنَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِشْرَاقِ﴾،واتە ئێمە شاخەکانمان بۆ پیٚ مل کرد بوو کەلەگەڵ داود دائێوارە و بەیانیان ذکري خوا بکەن، چونکە خوای گەورە دەنگێکی زۆر خۆشی پیٚ بەخشی بوو، تەنانەت وتراوە: کاتێك ذکري دەکردو کتێبەکەی خۆی دەخوێندەوە باڵندەکان بەئاسمانەوە ڕادەوەستان و شاخەکانیش هەموویان بەدوایدا دوبارەیان دەکردەوە ذکري خۆیان دەکرد بەتایبەتیش ئێوارەو بەیانیان، (الأوزاعي)[8] دەفەرموێت: (داود دەنگێکی ئەوتۆی پیٚ درابوو، کەهیچ کەسێکی پێنەدەگەیشتەوە لەخۆشی دا، تەنانەت باڵندەو دڕندەکانیش

[1] صحيح: بخاري (٢٠٧٣)
[2] ابن جرير (١٢ / ج / ١٧٠)
[3] صحيح: ابن جرير(١٢ / ج٢٣ / ١٧٠) .
[4] صحيح: عبدالرزاق (٢٥٨٢)، إبن جرير ( ١٢ / ج ٢٣ / ١٧٠)
[5] متفق عليه: النجاري (١١٣١)، مسلم (٢٧٣١)
[6] صحيح: ابن جرير (١٢/ ج ٢٣ ٦٥)
[7] صحيح اليه: ابن جرير (١٢/ ج٢٣ /٦٥)
[8] ابن عساكر: تأريخ (١٧ / ٩٩)

لەدەوری کۆدەبوونەوە -بۆگوێگرتن لەدەنگەکەی و ذکرکردن - تاکو لەتینواندا و لەبرساندا دەمردن، بگرە ڕووبارەکان ئاویان ڕادەوەستا،(وهب کوڕی منبە)[1] یش دەفەرموێت: هەرکەسێك گوێی لەدەنگی داود بوایە دەکەوتە هەژان و جەزم بوون، ئەو زەبوری بەدەنگێکی وا دەخوێند کە هەرگیزهیچ گوێچکەیەك دەنگی وا خۆشی نەبیستووە،بۆیە مرۆڤ و جنۆکە و ئاژەڵ و باڵندەی لێ کۆدەبوونەوە وگوێیان لێ دەگرت،تەنانەت هی وایان تێدابوو لەبرسانا دەمرد حەزی نەدەکرد لەو دەنگە خۆشەی داود (عليه السلام) دووربکەوێتەوە و بڕوات ئاو و خواردن پەیدا بکات . (عبد الرزاق)[1] لە (ابن جريج)ەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: لە (عطاء)م پرسی دەربارەی خوێندنەوەی شێوە گۆرانی، فەرمووی: مەبەست لەوەچی یە؟ گوێم لێ بوو کە (عبيد کوڕی عمر) دەیفەرموو: داود (عليه السلام) ئامێرێکی ژەنینی دەهێناو بەدەم خوێندنی زەبورەوە لێی دەدا و دەنگەکەی دەگەڕاندەوە بۆلای خۆی، مەبەستی لەوەبوو کەخۆی گریانی بێت و ئەوانەی دەورو بەریشی بخاتە گریان .

(پێشەوا ئەحمەد)[2] فەرمودەیەکی هێناوەکە بردویەتیەوە سەر (عروه) کە دەفەرموێت: (عائشه) فەرمووی: پێغەمبەر (ﷺ) گوێی لەدەنگی (ابو موسای ئەشعەری)بوو کە قورئانی دەخوێندەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەبوموساش لەکەڕەنای ئالی داودی پێ دراوە).

لە گێڕنەوەیەکی تردا کە (پێشەوا ئەحمەد)[3] بردویەتیەوە سەر (ابو هريره) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کاری زەبور خوێندن بۆ داود ئاسان کرابوو، فرمانی دەکردو خۆی بەدەست و پێوەندەکانی وڵاخەکەی بۆزین بکەن دوادیدیش بەرلەئەوە لێدەبووەلە خوێندنی زەبورەکەی - واتا بەر لەوەی و ڵاخەکەی بۆ زین و کۆیان بکرێ داود تەنها بەرهەم و پەیدا کردەی ڕەنجی شانی خۆی دەخوارد)، مەبەست لەوە بووە کە داود زۆر خێراو زیرەك بوە لە خوێندنی زەبوورەکەیدا، وە فەرمودەی تری هاومانای ئەم فەرمودەیەش هەیە، کە بەپێویستی نازانین لێرەدا دوبارەیان بکەینەوە .

مەبەست لێرەدا لەوەیە: کەوشەی (قران)لەو فەرمودەیەدا، مانای (زەبور)ە، کە ئە پەیامە یە خوای گەورە بەوەحی ناردی بۆ داود (عليه السلام) گێڕانەوەیەکی تر هەیە

---

[1] صحيح الأسناد: المصنف (٤١٦٥)

[2] صحيح: احمد، المسند (٦ / ١٦٧)، عبد الرزاق، المصنف (٤١٧٧)، النسائي (١٠٩٣)

[3] صحيح: المسند (٢ / ٣١٤)، النجاري (٣٤١٧)، ابن عساكر، تاريخ (١٧ / ٨٩ )

دەفەرموێت: هاوکات لەگەڵ پێغەمبەرێتی یەکەی دا پاشاش بوە و دەست و پێوەندی خۆی هەبووەو هێندەی ماوەی کەمتر لەو ماوەیەی پێویستە بۆ زین کردنی ولاخ توانیویەتی زەبورەکەی بخوێنێتەوە، ﴿وآتينا داودَ زبوراً﴾ (الآسراء: ٥٥)، واتا کتێبی زەبورمان بۆ داود نارد، پێشتر لەتەفسیرەکەماندا باسی ئەوەمان کرد کەلەمانگی ڕەمەزاندا بۆی دابەزیوە و گەلێك حیکمەت و ئامۆژگاری تێدابووە، وەدەربارەی ئەم ئایەتەش کەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَشَدَدنا ملكه وَآتيناه الحكمةَ وفَصْلَ الخِطاب﴾(ص: ٢٠) ، واتا: موڵك و پایەیەکی گەورەمان بەداود بەخشی لەگەڵ حوکمێکی بەکاردا،(ابن جرير) [1] و (ابن ابى حاتم)[2] لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە کە: دووپیاو کە کێشەیان هەبوو لەسەر مانگایەك و هاتن بۆلای (داود)(عليه السلام) یەکیان مانگاکەی لەوی تریان داگیر کردبوو، ئەوەی تریش نکولی لەوە دەکرد، (دواد) (عليه السلام) بڕیارەکەی هەڵگرت بۆشەو، هەر کەشەوداهات خوای گەورە وەحی نارد بۆ داود (عليه السلام) کەپیاوە شکاتکەرەکە بکوژێ، جاکاتێك ڕۆژبووەوە (داود)(عليه السلام) بەشکاتکارەکەی فەرموو: خوای گەورە وەحی بۆ کردوم کەتۆ بکوژم، منیش دەتکوژم و هیچ ڕێگەیەکی تریش لەبەردەست دا نیە، -واتە بڕیاری خوایە-دەڵێی چی دەربارەی ئەو شکاتەی کەلەم پیاوەی دەکەیت ؟ پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا،سوێند بەخوا من هەقی خۆمە کەشکات لەم پیاوە بکەم و داوای لەسەر بەرزبکەمەوە، بەڵام من پێش ئەمە باوکی ئەم پیاوەم کوشتوە، (داود)(عليه السلام) فرمانی بەپیاوەکە کرد کەئەم پیاوە بکوژێتەوە . (داود)(عليه السلام) لەناو (بنی اسرائیل)دا ناوبانگ و خۆشەویستیەکی زۆری هەبوو، هەموویان بەتەواوەتی گوێڕایەڵیان دەکردو فرمانیان نەدەشکاند، ئەمەش مانای ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَشَدَدنا مُلكَهُ﴾ ، سەبارەت بە (وَآتينا الحكمة) ش واتا: پێغەمبەرایەتیمان بەخشی، دەربارەی (فصل الخطاب)یش . (الشريح)[3] و (الشعبى)[4] و (قتادە)[5] و (ابو عبدالرحمن السلمى)[6] و هەندێکی تر فەرموویانە مانای: خوای گەورە بەهرەی جیاکردنەوەی تاوانکارو تاوانپێکراوی پێ داوەو بەباشی ناسیونییەوەو بەبڵگەو سوێند خواردن نەوەستاوەتەوە .

---

[1] حسن: ابن جرير (١٢ / ج٢٣/ ١٣٨)

[2] ابن ابي حاتم .

[3] صحيح: ابن جرير (١٢ / ج ٢٣ / ١٤٠)

[4] صحيح: ابن جرير (١٢ / ج ٢٣ / ١٤٠)

[5] صحيح: ابن جرير (١٢ / ج ٢٣ / ١٤٠)

[6] صحيح: ابن جرير (١٢ / ج ٢٣ ١٤٠)

(مجاهد) [1]و (السّدی)[2] فەرموویانە مانای پێکان و تێگەیشتن و شارەزایی یە لەکاری دادوەریدا، (مجاهد) دەفەرموێت: (فصل الخطاب)واتە: کورتەی یان پوختەی گفتوگۆی نایاب پڕ لەحیکمەت و هەڵبژاردنی وشەی گونجاو بۆ شوێنی شیاوی خۆیان، ئەمەش ناجۆرنیە لەگەڵ ئەو گێڕانەوەیەی کە (ابو موسی)[3] هێناویەتی لە (وهب کوڕی منبه)[4] ەوە کە دەفەرموێت: کاتێك جەنگ و دزی و درۆ زنی و شایەتی درۆ پەرەی سەند لەناو بنی اسرائیلییەکاندا داود (علیه السلام) زنجیرەیەکی دادوەری پیٰ درا، کەلەئاسمانەوە شۆڕ ببونەوە بۆ بەردێکی بیت المقدس، کەلەزێڕ بوون، جاهەرکات دووکەس شەڕیان بوایە، بۆئەوەی بزانریٰ کەکامیان لەسەر هەقە پێی دەگەیشت و ئەوی تریان پێی نەدەگەیشت، بەوجۆرەش ڕووی نەدەدا هەتا پیاوێك پارچە مرواریەکی بەیەکێکی ترسپاردبوو، لای دانابوو، دوایی حاشای لیٰ دەکرد، ئیتر داردەستێکی هێناو کردیە ناو بەردەکەوە، جاکاتێك هەردووپیاوەکە هاتنەلای بەردەکە پیاوە شکاتکارەکە بۆخۆی ماشییەوە، کەبەوەی تریان وترا: بیگرە بەدەستەوە،دەستی بردبۆ داردەستە کەو دایە دەست شکاتکارەکە، کەمرواریەکەش لەناویدا بوو، وتی: خوایە تۆ خۆت دەزانیت ئەگەر من ئەو مرواریەم بۆ گەڕاندۆتەوە یەکلای بکەرەوە، ئینجا زنجیرەکەی گرت و کاری خۆی لەسەر بنی اسرائیلی یەکان بەپایان هێنا، ئینجا زۆر بەخێرایی زنجیرەکە لەنێوانیاندا بەرز کرایەوە، ئەم ڕوداوەش لە لایەن زیاتر لەیەك ڕاڤەکارەوە باس کراوە بەهەمان واتا.

﴿وَهَلْ أَتَاكَ ............وَحُسْنَ مَآبٍ﴾(ص: ٢١ – ٢٥). ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز گەلێك چیرۆك و ڕووداوی هەمە جۆریان لێرەدا باس کردوە کەزۆربەیان ئیسرائیلیاتن و مەبەستمان بووەکە باسیان نەکەین، چونکە گومانی زۆرو ناڕاستی زۆریان تێدایە، باش وایە پشت بەو چیرۆکانە ببەستین کەلە قورئانی پیرۆزدا باس کراون.

زۆربەی پێشەوایانی ئاینی ئیسلام، ڕاو بۆچوونی جیاجیایان هەیە دەربارەی ئەوکڕنووشەی کەلەسورەتی (ص)دا هەیە، ئاخۆ ئایا لەسوجدەگەورەکانە، یان هەر سوژدەی سوپاسگوزاری یە، لەم ڕووەوە زاناکان بوون بەدوو بەشەوە.

[1] ضعیف: ابن جریر (١٢ / ٢٣ / ١٣٩)

[2] حسن: ابن جریر (١٢ / ٢٣ / ١٣٩ )

[3] ضعیف جدًا: ابن ابي حاتم (١٨٣٣٩)

[4] سنده ضعیف جدًا: ابن عساکر: تاریخ (١٧ / ١٠٣)

(بخاری)[1] دەفەرموێت(محمد کوڕی عبدالله) لە (محمد کوڕی عبيد الطنافسي)ئەویش لە (العوام)ەوە کە دەڵێت: پرسیارم لە (مجاهد)کرد دەربارەی سوجدەی سورەتی (ص)، ئەویش فەرمووی: پرسیارم لە (ابن عباس)کرد لەکام ئایەتەدا سوژدە دەبەیت ؟ فەرمووی ئەی نەتخوێندۆتەوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِهِ دَاوُدَ سُلَيْمَانَ﴾(الأنعام: ٨٤)، ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ﴾ (الأنعام: ٩٠)داود (عليه السلام)لەو پێغەمبەرانەیەکە فرمانی کردوە بەپێغەمبەرتان (محمد)(ﷺ) کەشوێنی بکەوێت، لەبەرئەوە لەم جێگەیەدا داود ☽ سوژدەی بردوە، پێغەمبەری خۆیشمان هەر لەوشوێنەدا – واتە لەو ئایەتەدا – سوژدەی بردوە .

(پێشەوا ئەحمەد)[2] فەرمودەیەکی بردوەتەوە سەر (ابن عباس) کە فەرموویەتی ئەو سوژدەیەی لەسورەتی (ص)دایە لەسوژدەگەورەکان نیە، گەرچی پێغەمبەرم بینیوە (ﷺ) کەسوژدەی تێدا ئەنجامداوە، هەربەم جۆرە (بخاری وأبوداود وترمذی)و (النسّائی)[3] گێڕاویانەتەوە (النسائی)[4] فەرمودەیەکی هێناوە کەبردویەتیەو سەر (ابن عباس) کەپێغەمبەر (ﷺ) لەو ئایەتەی سورەتی (ص) سوژدەی بردوە و فەرموویەتی: (داود سوژدەی تەوبەی تێدا بردوەو ئێمەش وەك سوژدەی سوپاسگوزاری – بۆخوای گەورە – سوژدەی تێدا دەبەین) . (أبو داود)[5] فەرمودەیەکی بردۆتەوە سەر (ابی سعيد الخدری) کە دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر دوانگە سورەتی (ص)ی خوێند، کاتێك گەیشتە ئایەتی سوژدە،دابەزی و سوجدەی برد، خەڵکەکەش بەدوای ئەودا سوژدەیان برد، ڕۆژی دوایی دیسان هەمان ئایەتی خوێند، کەگەیشتە سوژدە،خەڵکەکە خۆیان ئامادەکرد بۆ سوژدەبردن، بەڵام ئەو فەرمووی: (ئەم سوژدەیە تەوبەی پێغەمبەرێك بوە، بەڵام دەبینم خۆتان بۆ سوژدە بردن ئامادە کرد ؟) ئیتر دابەزی و سوژدەی برد .(پێشەوا ئەحمەد) [6] گێڕانەوەیەکی هێناوەکە (ابو سعيد الخدری) خەونێکی بینی، لەخەویا (ص)ی دەنووسی، کاتێك گەیشتە ئەوئایەتەی کەسوژدەی تێدایە بینی کەکەرەسەکانی نووسینەکەی هەموویان سووجدەیان برد، ئەویش ئەم خەونەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە،

---

[1] صحيح: البخاري (٤٨٠٧) .

[2] صحيح: المسند (١ / ٣٦٠) .

[3] صحيح: البخاري (٣٤٢٢)، ابو داود (١٤٠٩)، الترمذي (٥٧٧) .

[4] صحيح بشواهده: النسائي (١١٤٣٨)، الكبرى و المتجبي (٢ / ١٥٨)؛ بيهقي (٢ / ٣١٩)، النسائي (٧١٩)

[5] صحيح ابو داود: (١٤١٠)

[6] پیاوانی بەمتانەگێڕاویانەتەوە: المسند (٣ / ٧٨)، البيهقي(٢ / ٣٢٠) .

ئیتر لەو کاتەوە لەو ئایەتەدا سوژدەی دەبرد . (الترمذي و ابن ماجه)[1] گێڕانەوەیەکیان بردوەتەوە سەر (ابن عباس) کە دەفەرموێت: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من وابینم کە لەخەودام - نازانم خەون بوویان خەیاڵ و ڕاستی - لەپشتی درەختێکەوە نوێژم دەکرد، ئایەتی سوژدەم خوێند؛ درەختەکەش لەگەڵ ئایەتی سوژدەکەدا سوژدەی برد، گوێم لێ بوو دارەکە لەسوجدەکەی دا دەیگوت: پەروەردگارا بەهۆی ئەمەوە لای خۆتەوە پاداشتم بۆ بنووسە، وەلەلای خۆت بۆم بکە بەزەخیرە، بەهۆی ئەمەوە تاوانەکانم لەسەر لابەرە، لێم وەربگرە هەروەکو چۆن لەبەندەی خۆت (داود)وەرت گرت، (ابن عباس) دەفەرموێت: بینیم کە پێغەمبەر(ﷺ) هەستاو ئایەتی سوژدەی خوێندو چوە سوجدەوە، گوێم لێ بوو پێغەمبەر(ﷺ) هەمان ئەو پاڕانەوەیەی دەفەرموو کەپیاوەکە لەو درەختەکەوە گێڕایەوە، گەرچی ئەم گێڕانەوەیە: وەکو (الترمذي) دەفەرموێت نامۆیە و لەیەك لایەنەوە گێڕدراوەتەوە .خوای گەورە دەفەرموێت:﴿فَغَفَرْنَا لَهُ ذَلِكَ وَإِنَّ لَهُ عِندَنَا لَزُلْفَى وَحُسْنَ مَآبٍ﴾(ص: ٢٥)، واتا ئێمە لەسەرئەوەوە لێی بوردین و لەلای ئێمەش نزیك دەبێتەوە لە ڕۆژی دوایی داو لە دەستە پیرۆزو چاکەکان نزیکی دەکەینەوە بەو هۆیەوە هەروەکو لەفەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ) بەم جۆرە ئاماژەی پێ کراوە:(ئەوانەی داد پەروەرن لەسەر مینبەری نورن لەلای ڕاستی پەروەردگارەوە؛ کە هەردوو دەستی پەروەردگار هەر لای ڕاستە، بۆئەو کەسانەیەکە دادپەروەرن لەناو خێزان و کەس وکاری خۆیان وکاروباری حوکمداری وسپاردەیی دا)[2].

هەروەها (پێشەوا ئەحمەد)[3] فەرمودەیەکی هێناوە لە (ابو سعید الخدري)یەوە کە دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: خۆشەویسترین و نزیکترین کەس بەلای خواوە لەڕۆژی دوایی دا ئەوکەسەیە کە پێشەوایەکی داد پەروەرە، وەخراپترین کەس کەخوای گەورە زۆر ڕقی لێی بێت لەڕۆژی دوایی داو سەخت ترین سزای هەبێت ئەوکەسەیە کەپێشەوایەکی ستەمکارە). (ابن ابی حاتم) گێڕانەوەیەکی هێناوە کەدەیباتەوە سەر (مالك کوڕی دینار) دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿وَإِنَّ لَهُ عِندَنَا لَزُلْفَى وَحُسْنَ مَآبٍ﴾(ص: ٢٥)، کەلەو ڕۆژەدا -واتە لەڕۆژی قیامەت دا - داود (علیه السلام) لەلای پایەی عەرشی پەروەردگارەوە ڕادەوەستێ، خوای گەورە دەفەرموێت :ئەی داود ئەمڕۆش گەورەیی من دەربڕەو بەدەنگە

---

[1] ضعيف: الترمذي: (٥٧٩)، ابن ماجة (١٠٥٣)؛ (١ / ٢٤٢؛ رقم ٢٨٩)

[2] صحيح: مسلم (٤٦٩٨)؛ النسائي (٨ / ٢٢١) .

[3] ضعيف جدًا: ابن جرير (١٢ / ج٢٣ /١٥٠)

خۆشەکەت بخوێنە،هەروەکو چۆن لەدنیادا وات دەکرد، داود (علیە السلام) دەفەرموێت: ئەی پەروەردگارا چۆت بتوانم بخوێنم لەکاتێکدا ئەودەنگە خۆشەت لێ وەرگرتوومەتەوە ؟ خوای گەورە دەفەرموێت: ئەمڕۆ هەمان دەنگت پێ دراوەتەوە، ئیتر داود (علیە السلام) بەدەنگە خۆشەکەی گەورەیی پەروەردگار دەردەبڕێ، دەنگی بەرزدەکاتەوە،بەڕادەیەك کەخەڵکەکەی بەهەشت دەست بەرداری هەموو نیعمەتەکانی بەهەشت دەبن و گوێ بۆ ئەو دەگرن . هەندێ لەڕاڤەکارانی قورئان فەرمویانە: (داود (علیە السلام) ماوەی چل ڕۆژ لەسوجدەدا—لەدنیادا —ماوەتەوە)﴿يَا دَاوُدُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ﴾(ص: ٢٦) ، واتا :ئەی داود تۆمان کردە جێ نیشین —لەگەیاندنی پەیامی خوادا —لەسەرزەوی تۆش دادپەروەرانە لەناو خەڵکدا حوکم بدە، حوکمێکی هەق، شوێن ئارەزوومەکەوە، چونکە ئەوەیان سەرگەردان و گومڕات دەکات، ڕێی خواییت لێ ون دەکات، ئەوانەی ڕێی خوایشیان ون کردوە سزایەکی توند دەدرێن چونکە ڕۆژی لێپرسینەوەیان لەیادی خۆیان بردوەتەوە . (داود)یش (علیە السلام) زۆربەجوانی پەیڕەوی فرمانی خوای دەکرد، ئەو لەسەردەمی خۆیدا پێشەواو پێشەنگێکی گەورە بووە کە خەڵکی شوێنی ئەو دەکەوتن و نمونەی داد پەروەری بوە لەسەرزەویدا، بەندایەتی و ذیکري زۆر بوە بۆ خوای گەورە، تەنانەت هیچ سەعاتێك لەژیان و تەمەنی بەبێ عیبادەت و خواپەرستی نەبووە، نەبەشەوو نەبەڕۆژ، چ خۆی و چ خێزان وماڵەکەی، هەمیشە دەم بەسوپاس بووە بۆ سوپاسگوزاری خوای گەورە، هەروەکو قورئانی پیرۆز دەربارەی سوپاسگوزاری خۆی و خێزانەکەی دەفەرموێت: ﴿اعْمَلُوا آلَ دَاوُدَ شُكْراً وَقَلِيلٌ مِنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ﴾(سبأ:١٣)، (ابو بكر کوڕی ابی الدنیا)[1] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (ابی الجلد) کە دەڵێت: دەربارەی پرسیاری داود (علیە السلام) خوێندومەتەوە کەئەو فەرموویەتی: ئەی پەروەردگارا چۆن من بتوانم سوپاسی تۆ بکەم، کەمن بەهۆی نیعمەت و بەخشیشەکانی خۆتەوە نەبێ سوپاسی تۆم پێ ناکرێ ؟ وتی: ئیتر خوای گەورە وەحی بۆ نارد و فەرمووی: ئەی داود ئایا نازانیت کەئەو شتانەی سوپاسی منیان پێ دەکەیت هەر نیعمەت و بەخشیشی منن بۆ تۆ ؟فەرمووی: بەڵێ ئەی پەروەردگار! فەرمووی: دەی من ڕازیم کەبەوانەش سوپاسی من بکەیت . (البیهقی)[2] گێڕانەوەیەکی بردۆتەوە سەر (ابن شهاب) کـە دەفەرموێت: داود(علیە السلام) فەرموویەتی:

---

[1] ضعيف: المسند (٣ / ٢٢)، الترمذي (١٣ / ٢٩)

[2] منكر: الشعب (٤٤١٦)

﴿الحمد لِلّه كما يَنْبَغي لكرمِ وجهه وعزّ جلاله﴾، واتا: سوپاس بۆ خوای گەورە، سوپاسێك كە شایستەی گەورەیی ڕووی ئەوو پایەداری ئەو زاتە بێت، خوای گەورەش وەحی بۆناردو فەرمووی: ئەی داود تۆ شوێن فریشتەكانی (حَفظة) كەوتوویت كەسوپاسی ئەوان دەڵێیتەوە !

(عبد الله كوڕی مبارك)[1] لە (كتاب الزهد)دا هەندێك لەحیكمەتەكانی داودی هێناوە ☉ لەگێڕانەوەی (وهب كوڕی منبه) دا، كەدەفەرمویێت: داود ☉ فەرمویەتی: ماق ژیر ئەوەیە كەلەم چوار كاتە بێ ئاگانەبێ، واتا شەوو ڕۆژی خۆی دابەش بكات بەسەر چوار كات دا – كاتی یەكەم لەپەروەردگار بپارێتەوە، كاتی دووەم لەخۆی بپرسێتەوە، كاتی سێهەم بچێتە لای دۆست و یاوەرو كەسە نزیكەكانی تاكو كەم و كوڕی و ناتەواوی خۆی لەوانەوە ببیستێ و چارەسەری خۆی بكات، كاتی چوارەم تەرخان بكات بۆ سوود وەرگرتن لەنیعمەتەكانی ژیانەوەی بەڕێگەی حەڵاڵ و دروست، ئەم كاتانە دەبنە مایەی بوژانەوەی دڵ و پاكژی دەروون و ئاسودەیی ژیانی دنیاو سەرفەرازی ڕۆژی دوایی، هەروەها ماق ژیرە كەسەردەمی خۆی بزانێت و بناسێت و زمانی خۆی بپارێزێت و پایەداری و شكۆمەندی خۆی – بەهۆی زمانی یەوە – لەدەست نەدات، ماق ژیرە كەلەسێ شت زیاتر بۆ هیچ شتێكی تر سەرقاڵ و ماندوونەبێ: یان تێشوو كۆبكاتەوە بۆ دواڕۆژی خۆی، یان خەریكی كاسبی بێ، یان تام و چێژ لەشتە حەڵاڵەكان وەربگرێ .

(الحافظ ابن عساكر)[2]یش گەلێك لەوتە جوانەكانی (داود)ی (عليه السلام) هێناوە، لەوانەش ئەمانەیە: بۆ منداڵی بێ باوك وەكو باوكێكی دڵنەرم بە، بزانە تۆ چۆن دەچێنی ئاواش دەدوریتەوە، چی بچێنی ئەوەش دەدوریتەوە، ئەی خراپەچێن تۆش سبەی دڕك و داڵ دەدوریتەوە، نمونەی ئەو وتار خوێنەی كەنەزانە –ووتار بۆ خەڵكی دەخوێنی – وەك ئەوكەسەی گوانیبێژەیەكە لەژورسەری مردویەكەوە گۆرانی بۆمردوە كەبڵێ، هەژاری دوای دەوڵەمەندی چەند ناخۆشە، لەوەش ناخۆشتر گومڕایی دوایی باوەڕداری و ڕێنومایی، بزانە ئەگەر باسی تۆ لەناو خەڵك دا بكرێ چەند پێت ناخۆشە تۆش باسی هیچ كەسێ –بەخراپە – مەكە ئەگەر بەتەنها خۆشت بیت، منەت بەسەر كەسێكدا مەكە كەچاكەیەكت لەگەڵدا كردوە، چونكە ئەوە دوژمنایەتیتان لەنێواندا دەنێتەوە .

---

[1] ضعيف: ل: وهب – الزهر لة (٣١٣)

[2] ابن عساكر: تأريخ دمشق (١٧ / ٨٠-١٠٩)

(محمد کوڕی سەعید)[1] گێڕانەوەیەکی کەبردویەتیەوە سەر (عمر مولی عفرە)کە دەڵێت: یەهودیەکان کاتێك پێغەمبەریان بینی (ﷺ) کەژن دەهێنیٚ، گوتیان: تەماشای ئەمەبکەن کە لەخواردن تێر ناخوات – واتە ژن زۆر دەهێنی – بەخوا ئەو پیاوە جگە لە ژن هێنانی هیچی تری بەلاوە گرنگ نیە، بەم جۆرە ئێرەییان پیٚ دەبرد کەژنی زۆرە و هەر بەوەش عەیبداریان دەکرد ڕەخنەیان لیٚ دەگرت و دەیانگوت: ئەگەر پێغەمبەر بێت چۆن دەبیٚ هێندەی ئارەزووی ژن هێنان بکات ؟ بەتایبەتیش (یحیی کوری اخطب) وایدەگوت، بەلاّم خوای گەورە ئەکەسانەی بەدرۆخستەوە و فەرمووی ئەمە بەخشیش و گەورەیی یەکی خوایی یە کەبەم پیاوە – واتە محمد (ﷺ) دراوە، وەکو دەفەرموێت: ﴿أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَي ما أتاهم اللهُ مِنْ فَضْلِهِ﴾(النساء: ٥٤) وەپاشان هەر هەلەهەمان ئایەتەدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَقَدْ آتينا آلَ ابراهيمَ الكتابَ والحِكمَةَ وَآتَيناهُمْ مُلكاً عظيماً﴾ واتە: هەروەها ئالی (ئیبراهیم)یش هەر پەیام و کتێبی ئاسمانیان بۆناردو حیکمەتمان فێر کرد و موڵك و پاشایەتی و دەسەلاّتی گەورەمان پێدان، واتا: موڵك و پاشایەتی و دەسەلاّتمان بەخشی بە (سلیمان کوڕی داود)(علیە السلام) کە هەزار ژنی هەبوو، هەروەها (داود)(علیە السلام) سەد ژنی هەبووە، کەیەکێك لەوانە ە(ئۆریا)ی دایکی (سولەیمان)بووە(علیە السلام) دیارە ئەمانە ژنەکانیان زۆر زیاتر بوون لەژمارەی ژنەکانی پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) .

(الحافظ)[2] لەمێژووەکەیدا گێڕانەوەیەکی هێناوە کە دەیباتەوە سەر (صدقە الدمشقی) کەپیاوێك پرسیاری لە (ابن عباس)کرد دەربارەی ڕۆژوو، فەرمووی: لەوەلاّمدا فەرمودەیەکی پێغەمبەرت بۆباس دەکەم (ﷺ) ئەگەر ویستت ڕۆژووی (داود)یشت بۆباس دەکەم، چونکە ئەو پیاوێکی ڕۆژوە وانی شەو بێدار و ئازا بوو، هەرگیز لەجەنگدا ڕای نەکردوە، ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو ڕۆژێکیش بەرۆژو نەدەبوو، پێغەمبەریشمان محمد (ﷺ)دەفەرموێت: (باشترین ڕۆژوو،ڕۆژووی داود بووە،زەبوری بەحەوت جۆرە دەنگ دەخوێند، شەو ڕکاتێك نوێژی هەبوو، خۆی تیایدا دەگریاو بەو گریانەی خۆیشی هەموو شتێکی دەهێنایە گریان و بەو دەنگ و ئاوازە خۆشەی هەموو خەم و پەژارەیەکی دەرەواندەوە)ئەگەر دەتەویٚ دەربارەی ڕۆژووی (سلیمان)ی کوڕیشی هەواڵت پیٚ دەڵێم کە لە سەرەتای هەموو مانگێك سیٚ ڕۆژو لەناوەڕاستیدا سیٚ ڕۆژو لەکۆتایی دا سیٚ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو، بەم جۆرە بەڕۆژوو پێشوازی هاتنی هەموو مانگەکانی دەکردو

---

[1] ضعيف جداً: الطبقات الكبرى (٨ / ١٦٣)

[2] صحيح بشواهده: ابن عساكر، تاريخ دمشق (٢٧/ ٤٧ )

هەربەڕۆژووش ماڵاوایی لەهەموو مانگێك دەكرد، ئەگەر حەز دەكەیت باباسی ڕۆژووی عیسای كوڕی مریم بكەم كە بەردەوام بەڕۆژووبوو، نانی جۆی دەخوارد، بەرگی لەموو چنراوی لەبەردەكرد، بەهەموو خواردنێك ڕازی بوو، دەیخوارد، نەیدەپرسیەوە لەوشتانەی كەدیار نەدەمان وون دەبوون، منالی نەبوو تاكو منداڵی بمرێت، خانوی نەبوو تابڕوخێت، لەهەرشوێنی شەوی بەسەر بهاتایە بەسەرقاچەكانی خۆیدا لێی دەخەوت، پاشان هەڵدەستایەوە تابەیانی نوێژی دەكرد، دەستی ڕاست بوە و نێچیر لەدەستی دەرباز نەدەبوو، بەردەوام بەناو بەنی ئیسرائیلی یەكاندا دەگەڕاو یارمەتی دەدان، ئەگەر دەتەویٚ باباسی ڕۆژووی (مریم)ی دایكی بكەم، كەڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو، دوو ڕۆژ پیٚ نەدەبوو، ئەگەر حەزدەكەی باباسی ڕۆژووی حەزرەتی (محمد)ت بۆبكەم (ﷺ) كەسیٚ ڕۆژ لەهەموو مانگێكدا بەڕۆژوو دەبوو، وە دەیفەرموو ئەمە (صَومُ الدَّهرُ)ە، ئەم گێڕانەوەیە پێشەوا (ئەحمەد)[1] یش هێناویەتی لەباسی كۆچی دوایی حەزرەتی (ئادەم)دا(علیه السلام) باسی ئەوەمان كرد كە چۆن خوای گەورە هەموو گەلانی نیشانی ئادەم دا (علیه السلام)، لەناویاندا پیاوێكی جوان و گەشاوەی بینی كەداود بوو، پرسیاری لەخوای گەورە كرد دەربارەی تەمەنی داود، فەرمووی: تەمەنی شەست ساڵە، ئادەم (علیه السلام) داوای لەخوای گەورە كرد كەلەتەمەنی ئەم چل ساڵ هەڵبگریٚ بۆ تەمەنی داود، خوای گەورەش داواكەی وەرگرت و تەمەنی داود (علیه السلام) بەهەموویەوە بوو بەسەد ساڵی تەواو [2].

(ابن جریر) دەفەرموێت: هەندیٚ لە (اهل الكتاب)پێیان وایەكە تەمەنی داود u حەفتاو حەوت ساڵ بووە، منیش دەڵێم :ئەوە هەڵەیە وە دەڵێن: ماوەی پاشایەتی كردنەكەی چل ساڵ بووە، ئەمەیان تاڕاددەیەك عەقڵ دەیگرێت، چونكە ئێمە هیچ شتێكمان نیە كەبەر پەرچی ئەم قسەیەیان بداتەوە یان پشتگیری بكات .

سەبارەت بەچۆنیەتی كۆچكردنی داود(علیه السلام) پێشەوا (ئەحمەد)[3] گێڕانەوەیەكی بردوەتەوە سەر (ابی هریرە) كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: داود (علیه السلام) غیرەیەكی زۆری تێدابووە بەرانبەر بەژن و خێزانی خۆی، لەبەرئەوە هەر كاتێك دەچووەدەرەوە دەرگاكانی دادەخست و تاخۆی دەگەڕایەوە كەس نەدەچووە ماڵەكەی، ڕۆژێكیان چووە دەرەوە لەماڵ، دەرگاكەی داخست، ژنەكەی پێشوازی لیٚ كرد بەرەو ماڵەوە – لەكاتی

---

[1] ضعیف الأسناد: المسند (١ / ٣١٤)

[2] بۆزانیاری زیاتر دەربارەی ئەم فەرمودەیە بڕوانە كۆتایی چیرۆكی ژیانی ئادەم لەم كتێبەدا د. خ

[3] منقطع: المسند (٢/ ٤١٩) .

گەڕانەوەیدا کەچی بینی وا پیاوێك لەماڵەکەیانە، ژنەکە بەوکەسەی گوت کەلەماڵەکەیاندایە: ئەم پیاوە لەکوێ وە هاتوەتە ژوورەوە لەکاتێکدا دەرگای ماڵەکە داخراوە ؟بەخوا دەیانەوێ داود تووشی فەتارەیەك بکەن، ئینجا داود هاتەماڵەوە و بینی وا پیاوێك لەناوجەرگەی ماڵەکەیدا ڕاوەستاوە، داود (علیه السلام) لێی پرسی: تۆکێیت ؟ وتی: من ئەوکەسەم دەست لەپاشایان ناپارێزم و لەپەردەو دیواریش سڵ ناکەمەوە –واتا بەری ڕێگەم ناگیرێت – داود (علیه السلام) فەرمووی: دەی سوێند بەخوا تۆ فریشتەی گیانکێشانی، سڵاو لەفرمانی خوا، ئینجا پیاوەکە لەوماڵەدا مایەوە تاکو گیانی کێشا، تاکو شۆراو کفن کراو بەخاك سپێررا خۆرهەڵات – واتا ڕۆژ گەرمای پەیدا کرد – سولەیمان بە باڵندەکانی فەرموو: سێبەر بکەن بەسەر داودەوە، باڵندەکان سێبەریان بۆ کرد، تاکو سەرزەوی بەتەواوەتی – لەو ئاستەدا – بوو بەسێبەرێکی چڕ، سلیمان بەباڵندەکانی فەرموو: باڵتان والأبکەن)، وتراوە: ئەو جۆرە باڵندانە (مضرحي)[1] بوون، (السّدي) فەرمویەتی: داود (علیه السلام) لەناکاو کۆچی دوایی کردوەو باڵندەکان سێبەریان بەسەرتەرمەکەیەوە کردوە، ئەوەش لەڕۆژی شەممەدا بووە، وەلەگێڕانەوەیەکدا کە دەچێتەوە سەر (الحسن)و (قتادة) هێناویەتی کە (داود)(علیه السلام) لەتەمەنی سەدساڵی دا کۆچی دوایی کردوە لەناکاو لەڕۆژی چوارشەممەدا، (أبو السکن الهجری)یش دەڵێت: ئیبراهیم و داود و سولەیمانی کوڕیشی لەناکاو – واتە بەمردنی کوتوپڕ – مردوون .

هەندێك وا دەگێڕنەوە کە فریشتەی گیان کێشان هات بۆلای داود (علیه السلام) بۆ گیان کێشانی، لەو کاتەشدا داود (علیه السلام) لەمیحرابەکەی دەهاتە خوارەوە داود (علیه السلام) پێی گوت: لاچۆ لەسەر ڕێگاکەم بادابەزمە خوارەوە یان بچمە سەرەوە ! فر یشتەکە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ساڵ و مانگ و ڕۆژی شوێنەوار تەواوبوون، داود (علیه السلام) خێرا کەوت بەکڕنووش دا لەمیحرابەکەی خۆیدا فریشتەکەش گیانی کێشا لەکاتێکدا کە داودلە سوجدە دابوو.

(اسحاق کوڕی بشر) دەیباتەوە سەر (وهب کوڕی منبه) کەدەفەرموێت: خەڵکێکی زۆر ئامادەی بەخاك سپاردنی تەرمی پیرۆزی داود بوون،لەبەر هەتاو لەڕۆژێکی هاوین دا،چل هەزار ڕاهبی بڕانس بەسەر و خەڵکێکی زۆر تەرمەکەیان هەڵگرتبوو .

[1] مجرحی: بازێکی باڵدرێژو پانە، کۆیەکەی (مجرحیّە)یە .

مردنی هیچ کەسێك هێندە بنی اسرائیلی یەکانی پەرۆش نەکرد لەدوای کۆچی موساو هاڕون، کۆچی داود نەبێ ‪U‬،دەڵێن: گەرمای ئەو ڕۆژە بەتین بوو، ئازاری خەڵکەکەی دەدا، داوایان لەوسلێمان ‪U‬ کرد کەچەترێك،شتێك دروست بکات بۆیان تالە تینی هەتاو بیانپارێزێ ، (علیه السلام) سلیمان)یش (علیه السلام) بانگی باڵندەکانی کردو هاتن بەدەم داوا کەیەوە و فرمانی پێ کردن کە لەئاسماندا لەپاڵ یەکدا بەسەر خەڵکەکەوە ڕیز ببن، ئەوانیش ڕیز بوون و سێبەریان دروست کرد، بەجۆرێك باڵندەکان هاتن، کەژمارەیان یەکجار زۆر بوو، بەوەش بەری هەواو بایەفینکەکەیان گرت، خەریك بوو خەڵکەکە بێ هەناسە ببوڕێنەوە، دیسانەوە هاواریان کرد لەسلێمان کەفریایان بکەوێت و تەگبیرێکیان لێ بکات، ئینجا (سلیمان)(علیه السلام) بانگی باڵندەکانی کردو فرمانی پێ کردن کەلای بایەکە بەرەلابکەن و تەنها لای خۆرەتاوەکە بگرن،ئیتر باڵندەکان وایانکرد، بەمەش نەرمە بایەکی فێنکیان بۆ دەهات و لەژێر چەتری سێبەری باڵندەکانیش دابوون، ئەمەش یەکەم شتی موعجزە بوو کە خەڵکەکە لە (سلیمان)دا (علیه السلام) بەدییان کرد.

(الحافظ أبو یعلی)[1]فەرمودەیکی بردۆتەوە سەر (أبی الدرداو) کە دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە گیانی داودی کێشا کاتێك کەداود لەناو هاوەڵەکانیدا دانیشتبوو، ئەو هاوەڵانە هیچ شتێکیان بەدەم داودەوە هەڵنەبەست و پەیامەکەی ئەویشیان نەگۆڕی و دەستکارییان نەکرد،هاوەڵانی مەسیحیش (علیه السلام) لەسەر ڕەویەو ڕێنومایی ئەو تادوو سەد ساڵ بەردەوام بوون).

---

[1] وەکو (الحافظ)خۆی دەفەرموێت ئەم فەرمودەیە لاوازە، ابن حبان (٦٢٣٦)ابن عدی ق الکامل (٦/ ٢٦٩)، (٧/٨٩)، ابو حاتم ق مراسیل إبنە (٢٢٦).

## ﴿پێغەمبەری خوا سولەیمان (درودو سڵاوی خوای لەسەر بێت)﴾

(الحافظ ابن عساكر)[٨٢] فەرمویەتی: ناوی سولەیمان کوڕی داود کوڕی ئیشا کوڕی عوید کوڕی عابر کوڕی سلمون کوڕی نەخشون کوڕی عمینا ئەداب کوڕی ئیرم کوڕی حصرون کوڕی فارص کوڕی یەهوذا کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ابراهیم خلیل (علیه السلام) . لەهەندێ (اپار)دا واباس کراوە کە چوەتە دیمەشقەوە، (ابن ماكولا) ش (فارص)ی بە (صاد المهمله) هێناوە و زنجیرەی پشتی داودی هەر بەشێوەیەکی نزیك لەوەوە هێناوە کە (ابن عساكر) هێناویەتی . خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَوَرِثَ سُليمانُ ......الفَضْلُ الْمبينُ﴾ (النمل: ١٦)، واتە سلیمان میراتی داودی باوکی وەرگرت کە پێغەمبەرایەتی و پاشایەتی سبووە، نەك میراتی ماڵ و سامان، چونکە داود U تەنها سولەیمانی نەبوو، بەڵکو کوڕی تریشی هەبوو، لەلایەکی تریشەوە پێغەمبەران U میراتیان ناکەوێ بەڵکو هەرچی لەپاشیان بەجێ دەمێنێ دابەش دەکرێن بەسەر هەژاراندا و بۆنەوەی خۆینابێ.

هەروەکوپێغەمبەرمان محمد (ﷺ) دەفەرموێت: (ئێمە میرات ناگرین و میراتیش بۆ کەس بەجێ ناهێڵێن وئەوەی لەدوامان بەجێ دەمێنی دەکرێن بەخێن)[٨٣]وە بەبێژەیەکی تریش هاتووەکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (ئێمەی پێغەمبەران میراتمان ناکەوێ)[٨٤]. ئەوەش گەورەیی یەکی مەزنە کە خوای گەورە بەسلیمان داودی بەخشیوە،وهەروەکو قورئانی پیرۆز لەسەر زمانی سلیمان (علیه السلام) کە بەخەڵکە دەفەرموێت: ﴿يأيها الناسُ علِّمنا منطقَ الطَّيرِ وَأُوتينا مِنْ كُلِّ شيءٍ انَّ هذا لَهُوَ الفضْلُ الْمبينُ﴾، واتە: خەڵکی نە ! ئێمە فێری زمانی باڵندەکان کراوین و لەبارەی هەمووشتێکەوە زانیاریمان لەخواوە پێ دراوە بەڕاستی ئەوەش گەورەیی و مەزنیەکی فرەیە کە خوای گەورە پێی داوین و گەلێك ئاشکرایشە .

(ابو بكر البيهقی)[٨٥] گێرانەوەیەك دەباتەوەسەر (ابو مالك) کەدەفەرموێت: سلێمان (علیه السلام) کوڕی داودبەلای چۆلەکەیەکی نێردا ڕەت بوو کە بەدەوری چۆلەکەیەکی مێی دا دەسوڕایەوە و جریویان دەکرد، سلیمان (علیه السلام) بەهاوەڵەکانی فەرموو: دەزانن ئەو چۆلەکەیە چی یە چۆلەکەکەی تر دەڵێت ؟ گوتیان :چیٚ پیٚ دەڵێت ئەی پێغەمبەری خوا ؟

---

٨٢ تاريخ دمشق (٢٢ / ٢٣٠).

٨٣ متفق علیه: البخاري (٦٧٢٧)، مسلم (٤٥٥٥) .

٨٤ الحافظ ابو بكر البيهقي –الفتح (١٢ / ١٠)، الكبرى (٦٣٠٩) .

٨٥ ضعیف: ابن ماجة (١٣٣٢)

فەرمووی: دەخوازێ دەکات بۆخۆی و پێی دەڵێت: شوم پێ بکە، هەر ژورێکی دیمەشقت بۆی لەوێ نیشتەجێت دەکەم،سلیمان ∪ فەرمووی: بۆیە وا دەڵێت دەزانێت کەژورەکانی دیمەشق هەموویان لەبەرد دروستکراون و کەس ناتوانێت تیایاندا بژی، بەلام هەموو داخوازێکیش درۆزنە .

(ابن عساکر)[٨٦] گێراویەتەوە، وەوتراوەکە توانای قسە کردن و تێگەیشتی زمانی گیاندارانی هەبووە بە هەموو جۆرەکانیانەوە، بەڵگەشیان ئەم ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿وَأُتِينَا مِنْ كُلِّ شيء﴾، کەئایەتەکە گشتی یەو هەموو ئەوشتانە دەگرێتەوە کە پێویستن لەبەردەستی سلیمان دا هەبن وەك پاشاو پێغەمبەرێك (علیه السلام) .

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿وَ حُشِرَ لِسُلَيمان .........في عِبادِكَ الصَّالِحِينَ﴾(النمل: ١٧ – ١٩)، لەم ئایەتە پیرۆزانەدا خوای گەورە باسی رۆژێك لەو سەر وەری یە مەزنە دەکات کە سلیمان (علیه السلام) تیایدا ژیاوە، دەفەرموێت: رۆژێك سلیمان (علیه السلام) بەخۆی و سوپاکەیەوە لەمرۆڤ و جنۆکەو باڵندەوە بەسەر زەویدا دەرۆیشتن، مرۆڤ و جنۆکەکان لەگەڵیدا دەرۆشتن، باڵندەکان لەژور سەریەوە بەئاسماندا دەفڕین و سێبەریان بۆ دەکردن بەباڵەکانیان و لەخۆرەتاوو شتی تر دەیانپاراستن، لەسەر هەریەکە لەم جۆرە رەگەزانە بجولانیە، – وەك نمایشی رێ رۆیشتن–تاگەیشتنە شارە مێرووڵەیەك –دۆڵی مێرووڵەکان –یەکێك لەمێرووڵەکان بەوانی تری راگەیاندا کەلەو ناوە دورر بکەونەوە نەبادا بکەونە ژێر دەست و پێی سوپای (سلیمان)ەوە (علیه السلام)، (سلیمان)پلەو پایەیەکی بەرزە کە خوا پێی داوە، بۆیە فەرمووی: خوایە یارمەتیم بدە تاکوسوپاست بکەم لەسەر ئەو بەخشیشە گەورانەی داوتە بە خۆم و دایك و باوکم، تاکو کردەوە چاکەی وابکەم کە تۆ لێی رازی بی – لەوکردەوانەم – وەبەرەحمەت و میهرەبانی خۆت بمخەیتە ریزی پیاو چاکانەوە !

مەبەست لەوەیەکە: (سلیمان)(علیه السلام) لەو قسانە تێگەیشت کە مێرولە مێ یەکە بەگەلی لەشارەکەی خۆی دەگوت کەوریای خۆیان بن و بچنە ژورەوە نەبادا لەژێر دەست وپێی سوپاکەدا بپلیشێنەوە و (سلیمان)یش لەخۆشیاندا بزە و خەندەگرتی کە خوای گەورە ئەوبەهرەیەی پێ داوە تابتوانێ لەزمانی گیانداران تێبگات، ئەمە راستیەکەیە نەك ئەوەی کەهەندێ نەزان گوتویانە گوایە گیانداران لەگەڵ خەڵکی تریش دا دواون و دواتر

---

٨٦

(سليمان) (عليه السلام) لێی قەدەغەکردون، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو لێیان تێ گەیشتوەو خەڵکی ترنا، بۆیی داوای کرد کە خوای گەورە سوپاسی لێ وەربگرێ لەسەر ئەو بەخشیش و نیعمەتە گەورانەی پێی داوەو لەگەڵ پیاو چاکاندا لەقیامەتدا کۆی بکاتەوەو بەو رەحمی خۆی بخات بەخۆی و دایك و باوکی یەوە، چونکە جگە لەوەی (داود)باوکی پێغەمبەر بووە دایکشی ژنێکی لەخوا ترس و موسڵمان بوو، هەروەکو پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) لەفەرمودەکەیدا دەفەرموێت: (دایکی سلیمانی کوڕی داود بەکورەکەی خۆی گوت: کوڕەکەم بەشەو زۆر مەخەوە، چونکە زۆر خەوتنی شەوانە بەندە هەژار دەکات لەڕۆژی دوایی دا)[٨٧] ، هەروەها (عبدالرزاق)[٨٨] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (الزهری): کە سلیمان کوڕی داود ﵉ خۆی و یاوەرانی چوون بۆ نوێژە بارانە، مێرووڵەیەکی بینی کە قاچێکی بەرز کردبوەوە بەرەو ئاسمان و لەخوا دەپاڕایەوە بۆ باران بارین، (سولەیمان)یش (عليه السلام) فەرمووی بەهاوەڵەکانی خۆی: بگەڕێنەوە، خوای گەورە بارانمان بۆ دەبارێنێ چونکە ئەم مێرووڵەیەش لەخوای گەورە پاڕایەوە و نزاکەی وەرگیرا، هەروەها (ابن عساکر) فەرموودەیەکی بردوەتەوە سەر (ابو هریرە) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (یەکێك لەپێغەمبەران خەڵکەکەی بردە دەرەوە تاکو نوێژی بارانە بکەن، کەچی مێرو لەیەکیان بینی هەندێ لەقاچەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردبوەوە، پێغەمبەرەکە فەرمووی: بگەڕێنەوە پاڕانەوەکەتان وەرگیرا لەلای خوای گەورە لەپێناو ئەم مێرولەیەدا –یان لەبەر خاتری ئەم مێروولەیەم، هەروەها (السّدی)دەفەرموێت: بێ بارانی و وشکە ساڵی لەسەردەمی سلیمان دا بەرپابوو، سلیمان (عليه السلام) فرمانی بەخەڵ کی کرد بچنە دەرەوە، خەڵکەکەش چوون، چاویان بەمێروولەیەك کەوت لەسەر قاچەکانی وەستابوو، دەستەکانی درێژ کردبوو – بەرەو ئاسمان– و دەیگوت: پەروەردگارا من یەکێکم لەدروستکراوەکانی تۆ، کەسیش لەتۆ دەوڵەمەند تر نیە بەسەر ئێمەدا – بەڵکو لەبەر گەورەیی خۆت بارانمان بۆ ببارێنی – خوای گەورەش بارانی بەسەردا هەڵڕشتن .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَتَفَقَّدَ الطَّيرَ ....................وَهُمْ صاغِرونَ﴾ (النمل: ٢٠ – ٣٧).

لەم ئایەتانەدا خوای گەورە باسی بەسەر هاتی دیار نەمانی پەپوسڵێمانە دەکات کە لەکانی کۆبوونەوەی باڵندەکاندا ئامادەنەبووە لەکات و شوێنی دیاری کراودا و لەناو کۆڕو کۆبوونەوەی سلیمان دا (عليه السلام)، کە هەر هەموویان ئامادەبوون بۆقسەو باس

---

[٨٧] ضعيف: ابن ماجة (١٣٣٢)

[٨٨] صحيح الأسناد الى الزهري: المصنف (٤٩٢١)

دەربارەی ئەو ئەرك و فرمانەی پێیان سپێرابوو، لەوکاتەش دا ئەرکی پەپووسڵێمانە – وەکو ابن عباس [٨٩] باسی دەکات ئەوەبوو کەبگەڕێ بەدوای دۆزینەوەی ئاوی ژێر زەوی دا، چونکە پەپووسڵیانە، توانایەکی گەورەی هەیە لە دۆزینەوە و بینینی ئاو لەژێر چینەکانی ژێر زەوی دا، ، پاش ئەویش تیمی تایبەتی لەو شوێنە دا کەپەپوو دیاری دەکرد بیریان هەڵدەکەندو ئاویان دەردەهێنا، بۆ خواردنەوەو پێویستی ڕۆژانەی ژیانی خەڵکەکە، کاتێك سولەیمان کات و شوێنی بۆ دیاری کرد تاکو ئامادەبێت، بەڵام لەوکاتەدا پەپووسڵێمانە ئامادەنەبوو، بۆیە سلیمان فەرمووی: ئەری ئەوە پەپوو نابینم بزرە، یان من بەدی ناکەم ؟ دەبێ سزایەکی توندی بدەم یان سەری ببڕم چونکە بێ پرس و ڕا دواکەوتوە، ئەمە ئەگەر بەڵگەی ئاشکراو تەواوم نەداتێ دەربارەی خۆی دیارنەبوونەکەی، بەڵام دیارنەمان و بزبوونەکەی زۆری نەخایاند کە دەرکەوتەوەو گەڕایەوە، بەخێرایی بە (سلیمان)ی گوت: هەواڵێکی دڵنیا و تەواوم لە (سَبأ)ەوە بۆ هێناوی، باسی بارودۆخی پاشاکانی یەمەنی کرد، کەوڵاتێکی چەندەپان و بەرین و پڕ لەپاشایە، لەو سەردەمەش دا پاشای گەورەی ئەو وڵاتە ژنێك بوو، کەکچی پاشا بووە، پاش مردنی باوکی ئەوکراوە بەپاشا، چونکە جگە لەئەو پاشای پێشووتر کوڕی نەبووە .

(الثعلبي)[٩٠] و هەندێکی دی وتویانە: پاش مردنی پاشاکەیان خەڵکەکە پیاوێکیان کرد بەپاشای خۆیان، بەڵام خراپەو ناڵەباری لەو وڵاتەدا بڵاو بووەوە، ئەم کچە پاشایە ناردی بەدوای ئەو پیاوەدا – کەلەجیاتی باوکی، پاش مردنی باوکی – پاشایەتی دەکات،پیاوەکەی بانگ کرد، خۆی لێ مارەکرد و بووبە هاوسەری، یەکەم شەو کەچوەلای پیاوەکەی مەی دەرخواردی پیاوەکەداو ئینجا کوشتیو سەری کەللەی پیاوەکەی بەدەرگای ماڵەکەیەوە هەڵواسی، لەمەوە خەڵکەکە ژنەکەیان کرد بەپاشای خۆیان، کەناوی (بەڵقیس)ی کچی (سیرح)بوو، واتا (هەدهاد) وتراوە: شەراحیل ی کوڕی (ذی جدن)ی کوڕی (سیرح)ی کوڕی (حرث)ی کوڕی قیس ی کوڕی (صیفی)ی کوڕی (سبأ)ی کوڕی (یشجب)ی کوڕی (یعرب)ی کوڕی (قحطان)بووە، باوکی لەگەورە پاشایان بووە، هەرگیز ژنی لەخەڵکی یەمەن نەهێناوە،لەبەر ئەوە ژنێکی هێناوە کەجنۆکە بووەو ناوی (ڕیحانە)ی کچی (سەکەن)بووە، لەم ژنەش ئەم کچەی بووە کەناوی (تەلقەمە)بووە و بە (بەڵقیس)ناسراوە .

---

[٨٩] ضعیف: ابن عساكر: تاريخ دمشق (٢٢ / ٢٨٨)

[٩٠] عرائس المجالس.

(الثعلبي)[91] فەرمودەیەکی بردوەتەوە سەر (ابو هریرە)کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (یەکێك لەباوانی – واتا دایکی یان باوکی – بەڵقیس جنۆکە بووە)، هەروەها گێڕانەوەیەکی تریش بردۆتەوە سەر (ابی بکرە) کە دەڵێت: لەخزمەتی پێغەمبەردا (ﷺ) باسی بەڵقیسم کرد، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:(ئەوگەلە لەقازانج ناکات کە کاروباریان بەدەست ژنێك بێت).

پەپوو سڵیمانەکە بەردەوام بوو لەگێڕانەوەی قسەکانیدا لەخزمەتی سلیمان داو(علیه السلام) وتی: ئەم ژنە کەپاشایە، تەخت و کۆشکێکی نایاب و ڕازاوەی هەیە کە بەجۆرەها خشڵ و زێڕ و مرواری ڕازێنراوەتەوە، پاشان هاتە سەر باسکردنی لایەنی پەرستشتیان و گوتی: ئەو گەلە لە خۆردەپەرستن، لەکاتێکدا تەنها خوای گەورە شایستەی پەرستنەو تەخت و عەرشی گەورەش هەر بۆشەوە . پاش ئەوە (سلیمان)(علیه السلام) پەیام ونامەیەکی نووسی و بەپەپوو داناردی بۆئەو (بەڵقیس پاشا) یە، کەتیایدا سلیمان (علیه السلام) نوسیبووی لەسلیمانەوە ئەم نووسراوە هاتووە، بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان،پێویستە خۆتان بەسەر مندا بەزل نەزانن و باش وایە بەخۆشی خۆتان بێنە ژێر دەسەڵاتی منەوەو موسڵمان بن، ئەمەش سێ و دووی ناوێ و پێویست بەهیچی تر ناکات، کاتێك ئەم نووسراوە لەڕێگەی باڵندەیەکەوە بۆ بەڵقیس هات، باڵندەیەك کەبەباشی لەو خەڵکە تێ دەگەیشت و توانی ئەوەشیان تێ بگەیەنێ کەمەبەستی بوو، زیاتر لەیەك کەس لەڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز فەرموویانە: پەپووەکە نووسراوەکەی بردو چووە ناو کۆشکی پاشوەو نامەکەی فڕێدایە خوارەوە، بۆ پاشاکە، لەکاتێکداهەر خۆی بەتەنها دوو، لەژوورە تایبەتیەکەی خۆی، ئینجا پەپوەکە لەلایەکەوە ڕتاوەستاو چاوەڕوانی وەلامەکەی دەکرد، ژنە پاشا، دەست و پێوەندو وەزیر و ڕاوێژکارانی خۆی کۆکردەوە و پیێ ی گوتن کەنامەیەکی گرنگم بۆ هاتوەو لەسەر ناوی نامەکەوە هەموو بۆ خوێندنەوەو کەوتنە ڕاوێژ و گفتوگۆ لەسەر ئەو نامەیەو چۆنیەتی وەگرتنی هەڵوێستیان بەرامبەر ئەو پەیامە ڕەوانەکراوە و پێی گوتن: من سەر بەخۆ هیچ ناکەم تاکو خۆتان نەبیستن و قسەو باسی لەبارەوە یەکلایی نەکەنەوەو سەربەخۆ، بەبێ ئێوە هیچ ڕەت ناکەمەوە، ئەوانیش گوتیان: ئێمە بەهێزین و بەتین و تاوین، جائەگەر جەنگ بەباشی دەزانی، ئەوا ئێمە ئامادەین، لەگەڵ ئەوەش دا دوابڕیار بۆ خۆتە، بزانە، تەماشاکەو

[91] ضعيف: ابن جرير (١١ / ج ١٩ /١٦٩) .

وردبەرەوە، بڕیار بڕیاری خۆتە، کەتەماشای کرد جەنگ ڕێگە چارەیەکی باش نیە، چونکە دیارە ئەم خاوەن نامەیە درۆناکات و چاوبەست ناکات، بۆیە ژنە پاشابە خەڵکەکەی گوت: کاتێك پاشایان شوێنێك داگیر دەکەن، ئەو شوێنە وێران دەکەن و باشترین و سەروەرترین کەسانی دەکەنە ڕیسواترین کەس، خۆ ئەگەر ئەوپاشایە ئێرەش بگرێ هەر ئاواتان لیٚ دەکات، بەکورتیەکەی خەڵکەکەی تێگەیاند کە بەپلەی یەکەم پاشاکەیان – واتا خۆی – ڕیسوادەکرێت و گوشاری هەرە گەورە لەسەر ئەو دەبێ . بۆیە ویستی دیاری و خەڵاتێکی نایاب بنێرێ بۆ نێرەری ئەو نووسراوە – واتا بۆ سلیمان (علیە السلام)، ویستی دیاریەکەش بەدەستی خۆی دروستی بکات لەگەڵ خەڵکی وڵاتەکەی و لەگەڵ هەندێ شتی ئەنتیکەدا، نەیدەزانی کەسلیمان (علیە السلام) خەڵات و دیاری ئەو وەرناگرێ نەك لەبەرنادادی، بەڵکو چونکە ئەوان بێ بڕوان، لەلایەکی ترەوە خاوەن سوپاو دەسەڵاتی باڵایە، دیارە دیاری و خەڵاتەکەشی زۆر نایاب و گرانبەهابووە، بۆیە کاتێك نوێنەر و ڕەوانەکراوانی بەڵقیس پاشا هاتنە خزمەتی (سلیمان) (علیە السلام)، سلیمان (علیە السلام) فەرمووی: ئەگەر دەتانەوێ بەماڵ و سامانی دنیایی هاوکاریم بکەن، ئەوا ئەو ماڵەی خوای گەورە پێی داوم، زۆر چاکتر – وە زۆر ترە – لەوەی کەداویەتی بەئێوە،بەڵام ئێوە بەدیاریەکەتان دڵخۆش – و وادەزانن ئەو شتانەم مەبەستەو گوایە هەڵوێستم دەگۆڕێت یان بەزەییم دەجولێت، بەڵکو لەپێش چاوی خەڵکەکە لەئاشکرا پێی گوت: بگەڕێرەوە بۆلایان و منیش ئەوا بەسوپاوە هاتم، سوپایەکەك کەئەو ناتوانێ بەرەنگاریان بێتەوە، دەبێ هەرە دەسەڵاتدارو پایەدارەکەیان بکەینە ڕیسواترین کەس و زۆر بچوکیان بکەینەوە و بەکەمیان بگرین و ڕیسوایان بکەین .

هەرکە بەو جۆرە پێی گوترا وەڵامەکەی بردەوە بۆژنە پاشا،نەیانتوانی لەفرمانی (سلیمان)لابدەن (علیە السلام) و دەمو دەست چوونە پاڵ قسەی پاشاکەیان و تێکڕا بەو پەڕی مل کەچی و گوێڕایەڵی یەوە هاتن، کاتێك هەواڵی هاتنی ئەوان بە (سلیمان)(علیە السلام) گەیشت بەخۆیان و نوێنەرەکانیانەوە، (سلیمان)(علیە السلام) بەبەردەستەکانی خۆی –جنۆکەکان –فەرمووی: ئەی خەڵکینە ! کیٚ لەئێوە دەتوانێت عەرش و تەختی ئەو پاشایەم بۆ بێنێ و بەرلەوەی کەئەوان بەموسڵمانێتی بگەنەلام، هەریەکە لە بەردەستەکانی ئامادەیی خۆی نیشان دا بۆ هێنانی لەماوەیەکی کەمدا، هەروەکو خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿قالَ یاأَیُّها المَلأُ.......... للّه رب العالَمینَ﴾ (النمل: ٣٨ – ٤٤)، بەڵقیس لەکاتی حوکمڕانی کۆشکی تایبەتی و تەختی خۆی هەبوو، (سلیمان)(علیە السلام)

فرمانی بەبەردەستەکانی کرد کەلەماوەیەکی کەمدا تەختی بەلقیسی بۆ بهێنن، یەکێك لەوانە گوتی: من بۆت دەهێنم بەرلەوەی لەجێی خۆت هەستیت، ئەویش (عفریت)ی جنۆکەبوو، واتا بەرلەوەی کە حوکمداری ئەمڕۆت لەسەر تەختی خۆت تەواو بکەی، وتراوە ڕۆژانە (سلیمان)(علیه السلام) لەسەرەتای ڕۆژگارەوە لەسەرتەخت دادەنیشێت بۆ حوکمداری تاکو نزیك خۆراوا بوون، ئەو جنۆکەیە گوتی: من بەهێزم لەهەڵگرتنی داو بەتوانام لەپاراستنی شتەکانی ناوی و دەست پاکم . بەلام ئەوەیان کەشارەزای پەیامی خوایی و (علم الکتاب)بووە کە واباوە (ئاصف)ی کوڕی (برخیا)بووە کەپورزای (سلیمان)بووە (علیه السلام) گوتی: من تەختی بەلقیست بۆ دەهێنمە ئێرە بەرلەوەی چاکت بتروکێنیٚ، وتراوە: ئەم پیاوە پورزای سلیمان بووە، یان جنۆکەیەکی موسڵمان بووە، وتراوە: (جبریل)بووە (علیه السلام)، سەبارەت بەماوە هێنانەکەیشی وتراوە :بەرلەوەی نێردراوێکی خۆت تاچاوت دەیبینیٚ ڕەوانە بکەیت و ئینجا بگەڕێتەوە بۆلات، وتراوە: بەرلەوەی دورترین کەس کەچاوت لێیەتی بگاتە لات، وتراوە: بەرلەوەی چاوت ماندوبیٚ کاتێك تەماشای شتێکی پیٚ دەکەیت و دەیتروکێنیٚ، واتا: ﴿لەچاوتروکانێکدا﴾، دیارە ئەمەیان شیاو ترینیانە بۆ ماناکەی، جاکاتێك سلیمان (علیه السلام) فرمانی بەیەکیان لەوانە کرد هەرکە ئاوڕی دایە وەبینی تەختی بەلقیس پاشا لەچاو تروکانێکدا لەیەمەنەوە هێنراوە بۆلای ئەم لەولاتی (بیت المقدس)، ئیتر (سلیمان)(علیه السلام) فەرمووی ئەمە لەگەورەیی پەروەردگارمەوەیە کەپێی بەخشیوم تاکو تاقیم بکاتەوە ئاخۆ سوپاسی دەکەم یان سوپاسی ناکەم، دیارە هەرکەسێك سوپاسی بکات سودەکەی بۆخودی خۆیەتی، وەئەوکەسەی سوپاسیشی نەکات ئەوا پەروەردگاری من زۆر دەوڵەمەند و سوپاسکراوەو پێویستی بەسوپاسی کەس نیە،وەناسوپاسگوزاری بیٚ بڕوایان هەژار ناکات و پەکی ناخات .

ئینجا (سلیمان)(علیه السلام) فرمانی کرد کە گۆڕانکاری بەسەر شێوەی تەختەکەی بەلقیس دا بهێنن تاکو بزانێت ئاخۆ بەلقیس توانای زیرەکی ولێهاتوویی و بڕیارو وردبوونەوەی چۆنە، تۆبڵێی عەرشەکەی خۆی بناسێتەوە، ئەوەش پێوەرێکە بۆئەوەی کە بزانین ئاخۆ باوەڕدەهێنیٚ یان نا، جاکە بەلقیس هات پێی گوترا: ئەمە عەرشەکەی تۆیە ؟ بەلقیس پاشا گوتی :لەودەچیٚ، یان وەکو ئەو وایە، ئەم وەلامەشی نیشانەی زیرەکی بەلقیسە، چونکە حسابی ئەوەی کردوە کەئەو تەختەکەی خۆی لەوەلامی یەمەن جیٚ هێشتووە و نەیدەزانی کەئەم موعجیزەگەورانە لەسلیمان دەوشێتەوە، خوای گەورەش دەربارەیتوانای زانستی سلیمان دەفەرموێت:

﴿وَأُتينا العلمَ مِنْ العلمَ مِنْ قبلها وكّنا مُسلِمِينَ﴾وه دەربارەی بەڵقیس و گەلەکەیشی خوای گەورە دەفەرموێت :ئەوان هەروەکو باو باپیرانیان خۆریان دەپەرست و کڕنوشیان بۆ دەبرد، (سلیمان)(علیه السلام) فرمانی کردکە کۆشکێکی نایاب دروست بکرێ لەشووشەو ڕێڕەوەکانیشی ئاوی بەژێردا بڕوات و سەقف و بن میچەکەیشی هەربەشووشە بگیرێ، ناوەکەیشی جۆرەها ماسی و گیانەوەری دەریایی تێ بکرێت، ئینجا (سلیمان)(علیه السلام) چووە ناو کۆشکەکەوە و لەسەر تەختی خۆی دانیشت و فرمان کرا بەچوونە ژوورەوەی بەڵپیس بۆ کۆشکی (سلیمان)(علیه السلام) خوای گەورە باسی ئەو کاتە دەکات کە بەڵقیس چوە ژوورەوە بۆ کۆشك وتەختی (سلیمان)(علیه السلام) دەفەرموێت:﴿فلّما رأتهُ ............ لِلّه ربّ العالمِينَ﴾(النمل: ٤٤)، واتا: کاتێك بەڵقیس ئەوتەختەی سلێمانی بینی وای زانی دەریایە، بۆیە کراسەکەی هەڵکرد —وای زانی تەڕ دەبێ—قاچەکانی دەرکەوتن، سلیمان گوتی: ئەمە کۆشکێکە لەقەواریر دروست کراوە، بەڵقیس گوتی: پەروەردگارا من ستەمم لەخۆم کرد —کەزووتر—لەگەڵ سلیماندا —وەکو ئەو —باوەڕم نەهێنا بەپەروەردگاری جیهانیان. وتراوە: جنۆکەکان ویستیان دیمەنی بەڵقیس لەبەرچاوی سلێمان دزێوو ناکۆك و ناشیرین بکەن، کاتێك کراسەکەی هەڵکردو قاچەکانی دەرکەوت، تاکو توك و مووی قاچی ببینێ و سلیمان قێزو بێزی لێ بکاتەوە، نەبادا سلیمان دڵی پێیدا بچێ و بیخوازێت، چونك دایکی بەڵقیس جنۆکەبوەو ترساون لەوەی تیرەو خێڵی جنۆکەکان لەگەڵ ئەم بەڵقیسەدا یەك بگرن و زاڵ بن بەسەر کۆشك و دەسەڵاتی سلیمان دا، هەندێ کەس واباسی دەکەن کە بەڵقیس قاچەکانی وەکو سمی ئاژەڵ وابووە، بەڵام ئەمەیان لاوازەو ڕێی تێ ناچێ، خوای گەورە زاناترە، بگرە بۆچوونی پێشووتریش هەر جێگەی گومان و تێڕامانە، (الثعلبي)[٩٢] وەهەندێکی تر واباس دەکەن کە سلیمان (علیه السلام) بەقڵیسی مارەکرد و لەسەر وڵاتی یەمەن وەك پاشادانیایەوەو مانگانە یەك جار سەردانی دەکردو سێ شەو لەوێ دەمایەوە، پاشان سواری بەڕەکەی [٩٣]دەبووەوەو فرمانی بەجنۆکەکان دەکرد دەیانبردەوە شوێنی خۆی وە فرمانی بە جنۆکەکان کردبوو کەسێ کۆشکی بۆ دروست بکەن لەیەمەن کە کۆشکەکان ناویان (غەمدان، سالحین، بیتون)بووە، خوای گەورە زاناترە.

---

[٩٢] عرائس المجالس – موضوع

[٩٣] بەڕەی سلیمان پارچە بەڕەیەکی گرنگ بوە کە جنۆکەکان هەڵیان دەگرت و هۆی گواستنەوەی (سلیمان)بووە (علیه السلام)

(أبن اسحاق)[٩٤] گێڕتنەوەیەکی بردوەتەوە سەر(وهب کوڕی منبە) دەفەرموێت: سلیمان بەڵقیسی مارەنەکردوەو نەیهێناوە، بەڵکو لە پاشای هەمەدان مارەی کردوەو وەك پاشاش لەسەر خاکی یەمەن هێشتویەتیەوە، وەپاشای جنۆکەکانی یەمەن کەناوی (زوبعە)بووە ژێر دەستی کردوە بۆ بەڵقیس و ئەو جنۆکەکانی یەمەنیش سێ کۆشکەکەیان بۆ بەڵقیس دروست کردوە، بۆچوونی یەکەمیان لەناو خەڵکی دا باوترەو زیاتریش ڕێی تێ دەچێ، خوای گەورە زاناترە .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَوَهَبنا لِداوُدَ سُليمانَ...........وَحُسْنَ مَآبٍ﴾(ص: ٣٠-٤٠)، لەم ئایەتە پیرۆزانەدا خوای گەورە باسی ئەوە دەفەرموێت کە (سلێمان)ی بە (داود)بەخشیوە (عليه السلام) لەسەر ئەوەش سوپاس وستایش پەروەردگاری کردوە، وە دەفەرموێت: بەندەیەکی زۆر باش بوە بۆخوای گەورەو کەسێکی تۆبەکار و گەڕاوەبوە ولەگوناهو تاوان، ئینجا خوای گەورەباسی ئەو جۆرە ئەسپانە دەکات کە داویەتی بە (سلیمان)(عليه السلام) پێیان وتراوە ئەسپی (صافنە)، واتا:ئەو ئەسپەی کەهەردو قاچ و دەستێکی بەرز دەکاتە وەو لەسەر لایەکی سمی دەستێکی یان قاچێکی دەوەستێ و جەنگ دەکات، لەگەڵ جۆرێکی تر کە (جیاد)ەو بەوە ناسراون زۆرخۆش ڕەوو خێزان ، وەدەیفەرموو من زۆر زۆر حەزدەکەم یادی خوا بکەم تاکو خۆرم لێ ئاوا دەبێت، یان تا ئەسپەکانم دەکەمەوە ژووروشوێنی خۆیان، وتراوە: (سلیمان)(عليه السلام) ئەسپی زۆر خۆش دەویست وزۆر خزمەتی دەکردن وبگرە باس لەوە دەکەن کەخۆی عەرەقی سنگ و ملی ئەسپەکانی بەشمشێرەکەی خۆی دەسڕی، یان کاتێك کە لە پێشبڕێکی دا بەسواری پشتیانەوە عەرەقی سەروگەردنی ئەسپەکانی بەدەم ڕاکردنەکەوە دەسڕی، زۆربەی ڕاڤەکاران و ژیاننا‌سان لەسەر ئەوەن کە (سلیمان)(عليه السلام) زۆر بەدەوری ئەسەپەکانیدا دەهات و خزمەتی دەکردن و نمایشی تایبەتی و پێشبڕکێی بۆساز دەکردن، لەبەیانیەوە تا ئەوکاتەی کە (عصر)دادەهات و خۆرئاوادەبوو)[٩٥] ، بەڵام هەرگیز (سلیمان)(عليه السلام) نوێژی عەسری دوانەخستوە بەئەنقەس بۆ خزمەتەکانی ئەسپەکانی بەبێ هۆی شەرعی، سامەگەر لەشەریعەتی ئەودا دروست بووبێ بۆ جهاد کردن نوێژ دوابخرێ و خزمەتکردنی ئەسپەکانیش – چونکە بۆ جهادبووە –وەك جهاد بووبێ . تەنانەت هەندێ لەزانایان هۆکاری دواخستنی نوێژی عەسری ڕۆژی جەنگی خەندەقیان

---

[٩٤] ضعيف الأسناد: ابن جرير، التأريخ (١ / ٢٩٢)

[٩٥] ضعيف: ابن جرير (١٢ / ج٢٣ / ١٥٥)، علی کوڕی طالب خ. ل گێڕاویەتیەوە .

لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) گەڕاندۆتەوە بۆ ئەوەی کەدروستە لەجهادا نوێژ دوابخرێ یان بگۆڕدرێ بە (نوێژی ترس)، هەندێ گوتوویانە ئەو دواخستنە بۆ بارێکە کە جەنگ و کوشتارەکە زۆرتوندبێ. هەندێکی تر فەرموویانە دواخستنی نوێژی عەسر لەجەنگی خەندەق دا لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) هۆکارەکەی لەبیرچوونەوە بووە، لەوانەیە هۆکارەکەی دواخستنینوێژەکەش لەلایەن (سلیمان)ەوە هەرهەمان هۆکاربێت . وە ئەوانەی کە بۆچونیان وایە ڕاناوی سەرکرداری(تورات) دە گەرێتەوە بۆ ئەسپەکان ئەوە هەڵەیە، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کەلەئایەتەکەی دواتر دایەکە باس لەسڕینی عارەقی گەردن و ملی ئەسپەکانە .

(ابن جریر) بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە کە پێیان وایە(سلیمان) (علیه السلام) بەدەمی شمشێرەکەی ئازاری ملی ئەسپەکانی دابێ و بگرە ئەوەش قسەو باسی تر هەڵدەگرێ و هەروابە سادەیی باوەڕی پێ ناکرێ، گەرچی لەوانەیە لەناو گەلی ئەودا لەو سەردەمەدا شتی وا باوبوبێ، زانایان هەندێکیان بۆ چوونیان وایە کەئەگەر موسڵمانان لەجەنگدا شکان و نەیانتوانی ئەسپ و ئاژەڵ و کەل و پەلی خۆیان دەرباز بکەن، دروستە بۆیان ئەوانە سەرببڕن کەچەقۆیان لەسەرە تاکو دوژمن سوودیان لێ وەرنەگرێ،وتراوە ژمارەی ئەسپەکانی (سلیمان)(علیه السلام) دەهەزار یان بیست هەزار بووە، وتراوە: کەبیست دانەیان باڵدار بوون، (جائایا بەڕاستی باڵدار بوبن کەئەوکاتە هەبوبێت لەو جۆرە، یان زۆر تیژ ڕەو بوبن و خوای گەورە دەزانێ) . (ابو داود)[٩٦] گێڕانەوەیەکی بردۆتەوە سەر عائشە کە دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) بۆ جەنگی (تەبوك)یان (خەیبەر)دەچووە، لەشوێنێکدا پەردەیەك گیرابوەوە، بایەکە هەندێ لەپەردەکەی لادا و لەگۆشەیەکەوە مناڵەکانی عائشە دەرکەوتن کەیاریان بەبووکەڵەیەك دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەوەچی یە ئەی عائشە؟)فەرمووی: کچە کانمە و لەناویاندا چاوی بەشتێك کەوت کەلەپەڕۆ دروستیان کردبوو، فەرمووی: (ئەی ئەوە چیە لەناوەڕاستیاندایە؟) گوتی: ئەسپە، فەرمووی: (ئەی ئەوە چیە لەناوەڕاستیاندایە ؟)گوتی: جووتێك باڵە، فەرمووی: (چۆن ئەسپێکەو دووباڵیشی هەیە ؟)گوتی: ئەی نەتبیستوە کە (سلیمان)(ﷺ) ئەسپێکی باڵداری هەبووە ؟ فەرمووی: پێغەمبەر هێندەبە و قسەیە پێکەنی هەتا ددانە خوێ یەکانی دەرکەوت . هەندێ زانایان فەرموویانە :کاتێك سلیمان (علیه السلام) وازی لەئەسپەکانی هێنا، خوای

---

[٩٦] ضعیف: سنن ابي داود (٤٩٣٢)، النسائي(٨٩٥٠)، ناصر الألباني ص٢٧٥

گەورە (با)ی پێی بەخشی وبەوە بری خستەوە و کەپاشان باسی دەکەین بەویستی خوا گەورە . (پیشەوا ئەحمەد)[97]یش فەرمودەیەکی هێناوە کەدەیباتەوە سەر (ابی قتادة) و (ابی الدهماء) کەزۆر سەفەریان بەرەو کەعبە دەکرد، هەردوکیان گوتیان: هاتینە لای پیاوێکی لادێی، پیاوەکە گوتی: پێغەمبەر (ﷺ) دەستی گرتم و ئەوەی فێر کردم کە خوای گەورە فێری کردوەو و فەرمووی: (تۆ هەرشتێ لەبەر خاتری خوا واز لیٚ بهێنی ئەوا خوای گەورە شتێکی باشتر لەوەت پیٚ دەبەخشیٚ).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيمانَ وَأَلْقَينا عَلى كُرْسِيِّهِ جَسداً ثُمَّ أَنابَ﴾ ابن جریر و ابن حاتم و هەندیٚ لە ڕاڤەکارانی قورئان گەلێك گێڕانەوەیان لەبارەی ئەم ئایەتەوە هێناوە کە زۆربەیان یان هەموویان هەڵبەستراوی ئیسرائیلیاتن و لەتەفسیرەکەماندا ئاماژەمان پیٚ داون کە ئەوانە ڕاست نین، لەوانەش وتراوە: (سلیمان)(علیه السلام) ماوەی چل ڕۆژ لەسەر جێگەکەی دیار نەما، پاشان گەڕایەوە سەر جێگەکەی خۆی و فرمانی کرد بەدروستکردنی (بیت المقدس)، ئیتر زۆر بەتۆکمەیی دروستیان کردەوە، بەڵام ئێمە پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە (سلیمان) (علیه السلام) تەنها تازەی کردۆتەوە، ئەگینا (یعقوب)(علیه السلام) بۆیەکەمجار کردی بەمزگەوت، هەروەکو (ابی ذر) دەڵێت: پرسیم لەپێغەمبەر (ﷺ) کام مزگەوت یەکەم جار دانراوە ؟ فەرمووی: مزگەوتی حەرام —واتا کەعبە—گوتم: ئەی دوای ئەو ؟ فەرمووی (مزگەوتی بیت المقدس)، پرسیم چەند ساڵ لەنێواندا هەبووە؟ فەرمووی: (چل ساڵ)[98]ئەوەش ڕون و ئاشکرایە کەماوەی نێوان (ابراهیم)U کە (مسجد الحرام)ی دروست کرد لەگەڵ داودی کوڕی سلیمان (علیه السلام) لە هەزار ساڵ زیاتریشە نەك چل ساڵ، پرسیارەکەیشی دەربارەی ئەو موڵك و پاشایەتی یە بوو کە درا بە سلیمان (علیه السلام) پاش تازەکردنەوەی مزگەوتەکە، وەکو لەفەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ) کە (عمرو کوڕی عاص)(علیه السلام) هێناویەتی (سلیمان کاتێك بیت المقدس) دروست کرد، سیٚ شتی لەخوا داواکرد، بەڵام خوای گەورە دوانی پیٚ بەخشی، ئێمەش دەخوازین خوای گەورە سێهەم بەئێمە ببەخشیٚ، داوای کرد حوکمێکی پیٚ بدات کە حوکمی خوایی بێت، خوای گەورە ئەوەی پیٚ دا، داوی کرد خوای گەورە موڵك و سامانێکی بداتیٚ کە لەدوای ئەو بەکەسی تری نەدات، ئەوەشی پیٚ بەخشی، داوای کرد کە هەرکەسێك لەماڵەکەی خۆی هاتە دەرەوە بەو نیازەی لەم مزگەوتەدا نوێژ بکات و

---

[97] پیاوانی بەمتمانە گێڕاویانەتەوە: المسند (٥ / ٧٨) .

[98] متفق علیه: لەباسی ژیانی یعقوب دا (علیه السلام) تخریجی فەرمودەکەمان کردووە .

خوای گەورەش لە هەموو گوناهەکانی خۆش ببێ وەك ئەو ڕۆژەی کەتیایدا لەدایك بووە پاکی بکاتەوە –لەگوناه–ئێمە دەخوازین خوای گەورە ئەمەیان بەئێمە ببەخشێ)[99].
سەبارەت بەداواو پاڕانەوەکەی لەخوای گەورە دەربارەی حوکمڕانیەکەی، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَ داودَ وسُليمانَ ............حُكماً وعلماً﴾(الأنبياء: ٧٨ – ٧٩)، لەمانای ئەم ئایەتەدا (شريح القاضي) و هەندێ لەپێشینەکان واباس دەکەن کەئەوگەلە ڕەزی مێویان هەبووە و مەڕی تیرەو گەلێکی تر هاتوونەتە ناو ڕەزەکەی ئەمانەوە لەشەودا، هەرچی گەلایە بەمێوەکانیانەوە نەمێشتووە، ئەوانیش سکالای حاڵی خۆیان بردوەتەوەلای (داود)(عليه السلام) ئەویش وا حوکمی داوەکە خاوەن مەڕەکان پارەی ڕەزی میوەکە بژمێرنەوە بۆیان و بیاندەنەوە، بەڵام کاتێك چوون بۆلای (سليمان)(عليه السلام) فەرمووی: پێغەمبەری خوا – داود – چۆن چۆنی حوکمی کردن و بڕیاری دا ؟ گوتیان: ئاواو ...ئاوا، فەرمووی: ئەگەر من بومایە حوکمم وادەدا کە دەبێت خاوەن مەڕەکان مەڕەکانیان بدەن بەخاوەن ڕەزەکان و دەستیان بەسەردا بگرن هەتاکوخاوەن مەڕەکان ڕەزەکانیان بۆچاك دەکەنەوە و پاشان بیاندەنەوە، ئەم هەواڵە بە (داود) گەیشتەوە، ئیتر ئەویش حوکمی بەو بڕیارە جوانەی (سليمان)کرد (عليه السلام) لەهەردوو (صحيح)[100]ەکەدا فەرمودەیەکی هاوشێوەی ئەمە هاتووە کە (ابو هريره) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (دووژن دووکوڕی خۆیان لەگەڵدا بوو، لەناکاو گورگ پەلاماری دان و منداڵی یەکێکیانی فڕاندو خواردی، کێشە لەنێوان ئەو دوژنەدا دروست بوو لەسەر ئەو منداڵەی کە پێیان ماوە، ژنە گەورەکە دەیگوت: ئەو منداڵەی گورگە کە بردی منداڵەکەی تۆبوو، ژنە بچکۆلەکە دەیگوت: نەء هی تۆبوو، شکاتیان بردەلای داود (عليه السلام) تاکوکێشەکەیان چارەسەر بکات، (داود)(عليه السلام) منداڵەکەی دایەوە بەژنە گەورەکە، ئینجا دووژنەکە چوون بۆلای سليمان (عليه السلام)، (سليمان)(عليه السلام) فەرمووی: چەقۆیەکم بۆ بهێنن منداڵەکەتا بۆدەکەم بەدوو کەرتەوە و هەریەکەتان کەرتێکی خۆی بەردەکەوێ، ژنە بچووکەکە –هاواری لێ بەرزبوەوە–گوتی: شتی وامەکە ڕەحمەتی خوات لێ بێ،ئەو کوڕە منداڵی ئەوە،(سولەيمان)(عليه السلام) منداڵەکەی دایەوەبە بچووکەکەیان و کێشەکە چارەسەرکرا)، وادیارە هەردوو جۆرە حوکمەکە لەیاساو دادگای ئەواندا باوبووە، بەڵام حوکمەی (سليمان)ڕاست تربووە و دروست تر بووە لەم ڕووداوەدا، خوای گەورە باسی

---

[99] صحيح :المسند (٢/ ١٧٦)، النسائي (٢ / ٣٤)، ابن ماجة (١٤٠٨)ابن خزيمة (١٢٣٤)، ابن حبان (١٦٣٣)، حاكم (١/ ٣٠)

[100] متلق عليه: البخاري (٦٧٦٩)، مسلم (٤٤٧٠) .

ئەو توانا حوکمداریەی ئەوان دەکات و باسی ئەوە دەکات کە زانست و زانیاری پێ داون و شاخەکان و باڵندەکان لەگەڵ دەنگی (داود)دا (علیه السلام) دە هەژان و جەزم دەبون و یادی خوایان دەکرد، وە فێری گەلێك شت ترمان کردن، وەکودەفەرموێت :﴿وَكُلاًّ آتَيْنَا حُكْماً ............... فَهَلْ أَنتُمْ شَاكِرُونَ﴾(الأنبياء: ٧٩ – ٨٠)خوای گەورە بەخشیشێکی تری بە (سلیمان)(علیه السلام) بەخشیبوو، ئەویش (با)بووە، کە خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ ...............وَكُنَّا لَهُمْ حَافِظِينَ﴾(الأنبياء: ٨١ – ٨٢). هەروەها دەفەرموێت:﴿فَسَخَّرْنَا لَهُ الرِّيحَ ........ وَحُسْنَ مَآبٍ﴾(ص: ٣٦ – ٤٠)، کاتێك سلیمان(علیه السلام) لەبەر خاتری ڕەزامەندی خوای گەورە وازی لەئەسپەکانی هێنا، خوای گەورەش شتێکی باشتری پێ بەخشی، ئەویش (با)بوو،کەزۆر لەئەسپەکان خێراترو بێ ئەرك تر بوو(تَجْرِي بِأَمْرِهِ رُخَاءً حَيْثُ أَصَابَ)، بەڕەیەکی هەبوو کەلەتەختەدار چنرابوو –دروست کرابوو– کە گەلێك فراوان بوو، بەڕادەیەك جێی هەموو ئەوشتانەی لەسەر دەبووە کەوەك پاشایەك پێویستی پێیان دەبوو، وەك خانوو، کۆشك، چادر، کەل و پەل، ئەسپ، وشتر، تەنە قورسەکان، خەڵك لەمرۆڤ و جنۆکەو ئاژەڵ و باڵندەش،هەرکات دەیویست گەشت و سەیرانێکی بکات، یان بۆ جەنگ بڕوا لەهەروڵاتێك بوویێت بەڕەتەختەکە دەیبرد، فرمانی بە (با)دەکرد دەچوە ژێر بەڕەکە و بەرزی دەکردەوە، بەدابەزینیش دا وردە ... وردە ... خاو دەبوەوە و ئاراستەکەیشی بەویستی خۆی دەگۆڕی،خۆ ئەگەر بیویستایە لەوە خێراتر بفڕێت، ئەوا فرمانی بە (ڕەشەبا)دەکرد تاکو هەڵبکات و بیبات، خێرایی یەکەی بەجۆرێ بوو کەبەربەیان لە (بیت المقدس)ەوە بەرەو (أسطخر)بەڕێ دەکەوت و تا ئێوارە لەوێ دەبوو،ەمەو ئێوارە دەگەڕایەوە و دەگەیشتەوە (بیت المقدس)، کەئەم ماوەیە بەپێ بەیەك مانگە تەواو دەکرێت .

﴿وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ ............الشَّكُورُ﴾(سبأ: ١٢ – ١٣)، (حسن البصری)[١٠١] دەفەرموێت: نانی بەیانی لەدیمشق دەخواردو بۆ ژەمی نیوەڕۆ دەگەیشتە (أصطخر)لەوێشەوە بەڕێ دەکەوت بەرەو (کابل)و بۆئێوارە دەگەیشتە ئەوێ، لەکاتێکدا ماوەی نێوان (دمشق و أصطخر) یەك مانگە، وەماوەی نێوان (اصطخر)و (کابل)یش یەك مانگە ڕێیە.

شارەزان دەربارەی مێژووی ئارو ئاوەدانی دەڵێن (اصطخر) ئەو شارەیە کە جنۆکەکان بۆ (سلیمان)یان دروست کردو کاتی خۆی پایتەختی پاشانشینی تورکی بووە

---

[١٠١] صحیح الیه: ابن جریر (١٢ . ج ٢٢ /٦٩) .

لەکۆندا،هەروەها چەند شارێکی تریش هەریەهەمان شێوە دروست کراون، لەوانەش (تەدمر، بیت المقدس، باب جیرۆن، باب البرید کە لەدیمەشق دابوون، بەپێی یەکێك لەگێڕانەوە مێژووییەکان .

وشەی(قطر) لەئایەتەکەدا مانای (مس)دەگەیەنێ هەروەکو(ابن عباس)[102]و (مجاهد)[103]و (عکرمە)[104]و (قتادة)[105]هێناویانە، کە خوای گەورە کانی مسی لەیەمەن بۆ سلیمان هەڵقولاند، تەنها ماوەی سێ ڕۆژ هەڵقولانەکە بەردەوام بووە، هەرچی پێویستی خۆیان هەبووە لەمس لەماوەی سێ ڕۆژەکەدا تەواویان کردوە و شتی خۆیانیان لێ دروست کردوە و بۆ خانوو داڕشتن کەڵکیان لێ وەرگرتووە، خوای گەورە جنۆکەکانی خستبوە ژێر دەسەڵاتی (سلیمان)ەوە،هەرکار و ئیشێکی بویستایە پێی دەکردن، لەفرمانی دەرنەدەچوون، ئەگەر یەکیان لەفرمانی لایاندایە ئەوا سزای دەدا، ئەوان میحراب و جێ کوڕ و ژووری میوانیان بۆ دروست دەکرد، پەیکەری سەردیوارەکانیان دروست دەکرد، کەئەوسا لەئاینی ئەواندا پەیکەر سازی دروست بووەو حەرام نەبووە، هەروەها حەوزو گۆماوی گەورە گەورەیان بۆ دروسن دەکرد، وەکو (ابن عباس)[106] دەفەرموێت، هەروەها (مجاهد)[107]و (الحسن)[108]و (قتادة)[109]و (الضّحاك)[110]و هەندێکی تریش هەر ئاوایان لێك داوەتەوە، سەبارەت بە (قدور راسیات)لەئایەتەکەدا (عکرمە) دەفەرموێت: مانای قازانجی زۆر گەورەی جێ گیرە کەلابردنیان زەحمەت بێ، (مجاهد)[111] دەفەرموێت: ئەو قازان و مەنجەڵە زلانەش بۆئەوە بوون کە خواردنیان تێدا ئامادەبکرێ بۆ مرۆڤ و ئاژەڵان، ئەوبنە ماڵەیەش –واتا بنەماڵەی سلیمان (علیه السلام)–شایستەی ئەو ڕێزو سەروەریەبوون چونکە زۆر سوپاسگوزاری خوای گەورە بوون، لەکاتێکدا کەمن ئەوانەی سوپاسی خوا دەکەن . خوای گەورە

---

[102] ضعيف اليه: ابن جرير (١٢ / ج[٢٢] / ٦٩)
[103] صحيح اليه: ابن جرير (١٢ / ج [١٦] /٢٦)
[104] حسن اليه: ابن جرير (١٢ / ج[٢٢] /٦٩)
[105] ضعيف اليه: ابن جرير (١٢ / ج /٧١)
[106] صحيح اليه: ابن جرير (١٢ / ج [٢٢] /٧١) .
[107] صحيح اليه: ابن جرير (١٢ / ج [٢٢] /٧١)
[108] حسن اليه: ابن جرير (١٢ / ج [٢٢] /٧١)
[109] فيه ضعف اليه: ابن جرير (١٢ /ج [٢٢]/٧١)
[110] لم اقف عليه من قول عكرمة انما قول ابن عباس.
[111] صحيح اليه: ابن جرير (١٢ / ج[٢٢] /٧١)

دەفەرموێت: ﴿والشَّياطِينَ كُلَّ بَنّاءٍ وغَوّاصٍ واٰخرينَ مُقَرَّنينَ في الأصفادِ﴾ (ص: ٣٧ – ٣٨) . واتە جنۆکە شەیتنەکان هەموویان لەبەردەستی (سليمان)دابوون (عليه السلام) کەئەوانیش دووجۆرە کاریان دەکرد، جۆری یەکەمیان کاری بیناسازی هبّنانی کەرەسەکان بوو بۆ بیناو کۆشکەکان –واتە وەك کاری کرێکاری بۆئەرکە قورس و گرانەکان – جۆری دووەمیش ژێراو گەڕبووم، ئەچوون لەبنی دەریاو قولآیی زەریاکاندا کەرەسەی نایاب و مرواری و کەرەسەی ڕازاندنەوەی کۆشك و تەلارو خانوەکانیان دەهێنا، بەڕاستی ئەمەش مانای گیرابوونی ئەو نزایەی (سليمان)ە (عليه السلام) کەداوای کرد لەخوای گەورە سامان و دەسەلآت و پاشایەتیەکی وای بداتێ کەپێشتر بەکەسی نەدابێ و دواتریش نەیدا بەکەسی تر .

(پێشەوا بخاری)[112] فەرمودەیەکی بردوەتەوە سەر (أبو هريرە) کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (عفریتێکی جنۆکە دوێنێ لەکاتی نوێژدا بووم هات بۆ ئەوەی نوێژەکەم لێ تێك بدات و پێم ببڕێ، بەلآم خوای گەورە زاڵی کردم بەسەریداو گرتم، ویستم بەیەکێك لەپایە دیوارەکانی مزگەوتەوە بیبەستمەوە، بۆئەوەی هەمووتان ببینن، بەلآم نزاو پاڕانەوەکەی سولەیمانی برام هاتەوە یاد، لەبەر ئەوە بەڕیسوایی بەرەلآم کرد)، هەروەها گێڕانەوەی تری هاوشێوەو هاوواتای ئەم فەرمودەیە لەو بارەیەوە هەیە، وەکو فەرمودەی ژمارە (١٢١١)لە (صحيح البخاري)و (٣ / ١٣)ی (النسائي)،وە (٣ / ٨٢)ی پێشەوا (ئەحمەد)و (٦٩٩)ی (سنن ابی داود). (سليمان)U ژنی زۆری هەبووە، وەکو پێشوتر باسمان کرد،لەم بارەیەوە پێشەوا (بخاري)[113] فەرمودەیەکی بردوەتەوە سەر (أبو هريرە) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (سليمان کوڕی داود فەرمووی: ئەمشەو دەچمەلای حەوت سەد لەژنەکانم، کەهەریەکەیان دووگیان دەبن بەشاسوارێك کەلەڕێی خوادا جهاد دەکەن، یاوەرەکەی پێی گوت: بلّێ: انشاء الله، نەیگوت، لەبەر ئەوە هیچ کام لەژنەکانی زگیان نەبوو، واتا دووگیان نەبوون، جگە لەژنێکیانی نەبێ کەمناڵێکی نیوە منداڵی بوو، واتا منداڵەکە لایەکی نەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر سليمان بیگوتایە (انشاءالله) ئەوا حەوت سەد مناڵەکەی دەبینی کەلەڕێی خوادا جهادیان دەکرد) . هەرئەم فەرموودەیە بەچەند گێڕانەوەیەکی هاوشێوە، یان شێوە جیاو هاومانا هاتووە، کە (أبو يعلى)لەسەر

---

[112] متفق عليه: البخاري (٣٤٢٣)، مسلم (١٢٠٩)، النسائي (١١٤٤٠).

[113] صحيح البخاري: (٣٤٢٤) .

زمانی چەند کەسێکی متمانەدار (٦٣٤٧)و (ابن عساکر)لە (٢٢ / ٢٥٨)دا هێناویانە و پێشەوا ئەحمەدیش لە (مسند)ە کەیدا (٢ / ٢٢٩)هێناویەتی .

خوای گەورە داواکەی (سلیمان)ی وەرگرت (علیه السلام) کەبیکاتە پاشاو پێغەمبەر و موڵك و سامانی زۆری پێ ببەخشێ، خوای گەورەش پیی بەخشی و ئازادیشی کرد لەوەدا کەچۆن ئەومالە خەرج بکات لێی ناپرسێتەوەو کەم ناکات، ئارەزووی خۆی بێ ماڵ و سامان بەکێ دەبەخشێ یان نایبەخشێ، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿هذا عطاؤنا فامْنُنْ أَو أَمْسِكْ بِغيرِ حِسابٍ﴾(ص: ٣٩) واتا: ئەوە بەخشیشی ئێمەیە بۆتۆ، جابیبەخشی بەخەڵکی یان نەیبەخشی تۆ ئازادیت و ئارەزووی خۆتەو حسابت لەسەرینە و لەو بارەیەوە لێت ناپرسێتەوە، ئەمەش بڕیارێکی خوای بووە بۆ هەموو ئەو پێغەمبەرانەی کەلەگەڵ پێغەمبەرایەتیەکەیاندا پاشاش بوون، کاتی خۆیشی هەردوو جۆرەکە خراونەتە بەردەمی پێغەمبەری خۆمان (محمد)(ﷺ)، ئەویش بەندەیەکی پێغەمبەری هەڵبژارد،نەك پاشایەکی پێغەمبەر،وتراوە کە پێغەمبەر (ﷺ) کاتی خۆی لەوبارەیەوە ڕاوێژی بە (جبریل)(علیه السلام) کردوە، ئەو یش فەرموویەتی: کەمەکەیان [114]بۆیە پێغەمبەری ئێمە (عبد)و (رسول)ی خوایە (ﷺ)، هاوکات خەلافەت و موڵك و پاشایەتی لەناو ئومەتەکەیشی دا درێژەی هەیە تاڕۆژی دوایی . پاش ئەو هەموو بەخشیشە دنیاییانەی داویەتی بە (سلیمان)(علیه السلام) ئینجا خوای گەورە باسی ئەوە فەرمووە کە لەقیامەتیش دا پلەو پایەی بەرزو نزیکی لای خۆی پێ دەبەخشێ، وەکو دەفەرموێت: ﴿وإنَّ له عندنا لزلفي وحُسن مَآبٍ﴾(ص: ٤٠).

موڵك و سامان و دەسەلات و پاشایەتی تەنها بۆ خوایەو ئەو شتانەی هەرکەسێك بن لەدنیادا هەردەبێ لێی وەربگیرێتەوە، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کە (سلیمان)U کۆچی دوایی بکات و بەرەو بارەگای خوایی بگەڕێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فلَمّا قضَينا عَليهِ الموتَ .............العذابِ المُهينِ﴾(سبأ: ١٤)، سەبارەت بەواتای ئەم ئایەتە فەرمودەیەکی دورو درێژی پێغەمبەر(ﷺ) هەیە کە (ابن جریر)و (ابن ابی حاتم)و (هەندێکی تر)[115]هێناویانەو بردویانەتەوە سەر (ابن عباس)، کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (کاتێك پێغەمبەری وا سلیمان(ﷺ) نوێژی دەکرد لەپێش نوێژەکەی چاوی لێ بوو کە درەختێك دەڕوێت، بەدرەختەکەی دەگوت: تۆناوت چی یە؟ درەختەکەش ناوی خۆی پێ

[114] کەمەکەیان، لێرەدا مەبەست لە (تواضع)ە نەك پلە –وەرگێڕ–

[115] ضعیف الأسناد: ابن جریر (١٢ / ج /٧٤)، الحاکم (٤ / ١٩٧)، الطبراني (١٢٢٨١).

دەگوت، پاشان دەیپرسی: تۆ بۆ چ مەبەستێك ڕوایت ؟ جائەگەر بۆمەبەستی ڕووەکی ڕوابێت یان بۆمەبەستی داودەرمان ڕوابێت پێی دەگوت، ڕۆژێکیان سلیمان نوێژی دەکرد، بینی درەختێك لەبەردەمی ڕوا، لێی پرسی: ناوت چی یە ؟گوتی: ناوم خەڕنوبە، لێی پرسی بۆچی ڕواویت ؟ گوتی: بۆ وێرانکردنی ئەم ماڵە، سلیمان (علیه السلام) لەخوا پاڕایەوەو گوتی: خوایە مردنی من لەجنۆکەکان ئاشکرامەکە تاکو مرۆڤەکان بزانن وەدڵنیابن-کەجنۆکەکان شتی پەنهان نازانن، هات داردەست یان گۆچانێکی دروستکردو لەزەوی چەقاندو خۆی دابەسەریا، جنۆکەکانیش هەرخەریکی کارکردن بوون لەدەوروبەری سلێمان، -نەیانزانی سلێمان مردوە- هەتا مۆرانە گۆچانەکەی ئەویان خوارد -وەتەرمی سلیمان کەوتە سەرزەوی-ئینجا جنۆکەکان زانییان کەسلیمان مردوە، ئەمەش بۆ جنۆکەکان دەری خست کەئەگەر نهێنیان بزانیبایە، بەم جۆرە بەدەوری سلیمان دا هەڵنەدەسوڕان و هێندە سزا چێژو ماندوو نەدەبوون و لەکارکردن ڕادەوەستان

(ابن عباس)[116] دەفەرموێت: جنۆکەکان سوپاسی مۆرانەیان کرد، وەئاویان بۆ هێنان، وە (حافظ ابن عساکر)یش گێڕاویەتەوە و ڕەنگە ڕاست بێت، خوای گەورە زاناترە، هەروەها (السدی)[117]گێڕانەوەیەکی هێناوە کەگومانی ئەوەی لێ دەکرێ ئیسرائیلیاتی زۆر تێدا بێت و بەپێویستمان نەزانی لێرەدا بیهێنین .

سەبارەت بەوشەی (تَبیّنَتْ)لەئایەتەکەدا، وتراوە: مانای ئەوەیە کەبۆ خەڵکی ڕوون بووەکە جنۆکەکان پەنهان (غَیب)نازانن و نزاکەی (سلیمان) یش (علیه السلام) کەدواهەمین نزابوو لەژیانی دنیایی دا وەرگیرا، جارێکی تریش سەیری ئایەتی ژمارە (١٤)ی سورەتی (سبأ)بکەرەوە بەخۆی و واتاکەیەوە . (ابو داود)[118] فەرمودەیەکی بردوەتەوە سەر (خیثمة)، دەفەرموێت: (سلیمان)(علیه السلام) بەفریشتەی گیانی کێشانی فەرموو: هەرکات ویستت گیانم بکێشی ئاگادارم بکەرەوە، فەرمووی: ئاخر من لەتۆ چاکتر نازانم -کەی کاتی مردنی تۆ دێت-بەڵکو لەناکاو نووسراوێکم دەدرێتێ کەناوی ئەوکەسەی لەسەرە - کەکاتی مردنی هاتووە -سلیمان-[119](علیه السلام) فەرمووی: دەباشە کەی فرمانت پێ کرا ئاگادارم بکەرەوە . -کاتێك فرمانی پێ کرا-هاتەلای و فەرمووی: چەند ساتێکی زۆر

---

[116] سنده فيه ضعف: تاريخ دمشق (٢٢/ ٢٩٦)، الحاكم(٤ / ١٩٨)

[117] حسن: ابن جرير: (١٢ / ج ٢٢ / ٧٥)

[118] معضل: ابن عساكر (٢٢ / ٢٨٩)،ابن ابي شيبة (٨ / ١١٧)

[119] صحيح اليه: ابن جرير (١٢ ، ج ٢٢ /٧٥)

کەمت ماوە، سلیمان (علیه السلام) شەیتانەکانی بانگ کرد و فرمانی پێ کردن کەکۆشکێکی تۆکمەو قایمی بەدەوردادروست بکەن لەقەواریر و دەرگایشی بۆ نەکەن، کردیان ئەویش نوێژی کردو سنگی خۆی نایە سەر گۆچانەکەی و فریشتەی گیانکێشان چووە ژوورەوە بۆلای و گیانی کێشا هەربەسەر گۆچانەکەیەوە، ئەمەشی بۆئەوە دروست نەکرد کە لەمەرگ خۆی بشارێتەوە و ڕابکات،. پەیتا .... پەیتا ... جنۆکەکان کاریان دەکردو ئیشی کۆشك و خانووەکەیان دەکردو گەلێك شەکەت و ماندووبوون و کاتێك تەماشایان دەکرد، وایان دەزانی هەر زیندوە لەبەر ئەوە نەیاندەوێرا کارو بارەکانیان دوابخەت، ئینجا خوای گەورە مۆرانەی نارد بۆ گۆچانەکەی دایانکرۆشت، تاکو ناوەکەیشی کلۆر بوو، گۆچانەکە لاواز بوو، قورسایی لەشی سلیمان (علیه السلام) کەوتە سەر گۆچانەکەو شکا، سلیمان (علیه السلام) کەوتە سەر زەوی، جنۆکەکان کەبەمەیان زانی بلاوەیان لێ کرد) وەئەگەر ئەوان پەنها و نهێنی (غَیب)یان بزانیبایە ئەو هەموو ئەرکەیان وەبەرخۆیان نەدەدا، چونکە وەك (اصبغ) دەفەرموێت: سیلمان (علیه السلام) ماوەی سالێك بەمردویی بەسەر گۆچانەکەیەوە مایەوەو جنۆکەکان هەر ئیشیان دەکردو وایاندەزانی زیندووە، سالێك ئیش کردنی بەردەوامیش بۆ مردویەك کەوابزانی بەدیارەتەوە بەزیندوویی وەستاوە هەروا ئاسان نیە و جنۆکەو شەیتانەکان وەك لەئازار و سزادابن وابوو بەلایانەوە و تەواو شەکەت و ماندوو ببوون، خوای گەورە زاناترە .

(ابن جریر) دەفەرموێت :تەمەنی سلیمانی کوڕی داود (علیه السلام) پەنجا سالْ و یەك دوو سالێك بووە، لەسالی چوارەمی دەسەلاتی پاشایەتی خۆیدا دەستی کرد بە دروستکردنی (بیت المقدس)، پاشان (رحبعام)ی کوڕی بووبە پاشا و ماوەی حەڤدە سالْ حوکمڕانی کرد، وەکو (ابن جریر)باسی کردوە، دوای ئەوەش بەنی ئیسرائیلی یەکان پەرتەوازە بوون و دووبەرەکییان تێ کەوت .

خوای گەورە پاداشتی (سلیمان) پێغەمبەرو هەموویان بداتەوە لەگەیاندنی پەیامی خوایی دا، بۆ مرۆڤەکان، درودو سلاوی خوایی بۆسەر گیانی ئەو پێغەمبەرە پایەدار و دەسەلاتدارەو دایکی و باوکی و سەرجەم پێغەمبەران بەگشتی و خۆشەویستی ئێمەو سەرداری هەموو پێغەمبەرانیش محمد المصطفي (ﷺ) .

## ﴿لەماوەی دوای سولەیمان و پێش زەکەریا درووود و سڵاوی خوایان لێ بێت﴾

هەندێك لەو پێغەمبەرانەی کە ڕەوانەکراون بۆ (بنی ئیسرائیل)یەکان لەماوەی دوای سولەیمان و پێش زەکەریا درووود و سڵاوی خوایان لێ بێت:

چەند پێغەمبەرێك لەدوای داود و سلیمان لەپێش زەکەریا و یەحیاد (علیه السلام) ڕەوانەکراون بۆسەر (بنی اسرائیل)یەکان، کە کاتەکەیان و ماوەی ژیان و بەسەرهاتیان بەتەواوەتی نەزانراوە، لەوانەش: (شعیا)ی کوڕی (أمصیا)(علیه السلام) لەم بارەیەوە (محمد)ی کوڕی (ئیسحاق)[1] (علیه السلام) دەفەرموێت: لەپێش زەکەریا و یەحیادا بووە(علیه السلام) یەکێك بووە لەو پێغەمبەرانەی مژدەی هاتنی (عیسا)(علیه السلام) و (محمد)ی (ﷺ) ڕاگەیاندووە لەسەردەمی ئەودا پاشایەك هەبووە بەناوی (حەزیقیا) بووە، پاشای (بنی ئیسرائیل) بووە لەووڵاتی (بیت المقدس)، پاشایەکی زۆر گوێڕایەڵ و بەرفەرمان بووە بۆ (شعیا)(علیه السلام) بەفەرمانی ئەو هەڵسوکەوتی کردووە، گەلێك گۆڕانکاری بەسەر (بنی ئیسرائیل)دا هات و وردە . . وردە لەخوا پەرستی لایاندا، پاشاکەیان برینێکی ترسناك لەقاچی هات، لەو کاتەش دا بابلییەکان بەسەرۆکایەتی (سەنحاریب)ی پاشایان خۆیان ئامادەکردبوو بۆ داگیرکردنی (بیت المقدس)، بەچەندین پۆل و گروپ سوپایان سازدابوو، هەریەکە لەو گروپانە ئاڵای تایبەت بەخۆیان پێبوو، ژمارەی ئاڵاکانیان شەش سەد هەزار ئاڵابوو، خەڵکەکە زۆر ترسان، پاشاکە بە (شیعا)ی پێغەمبەری فەرموو: (علیه السلام) خوای گەورە چی بەوەحی بۆناردوویت دەربارەی (سەنحاریب) و سوپاکەی ؟ فەرمووی: تائێستا هیچی لەوبارەیەوە بۆ ڕەوانە نەکردووم، پاشان وەحی بۆهات و لەلایەن خواوە فەرمانی پێکرا کە بە (حزقیا)ی پاشا ڕابگەیەنێت کەسێکی تر بکاتە جێگیری خۆی و کاروباری بداتە دەست، چونکە ئەو واتە: (حزقیا) مەرگی نزیك بۆتەوە، کە (شیعا)ی پێغەمبەر (علیه السلام) هەواڵەکەی بە (حزقیا) ڕاگەیاند، ئەویش ڕووی لەقیبلە کرد و نوێژی کرد و تەسبیحاتی خوای کرد لەگرنووشدا گریا و پاڕایەوەو فەرمووی: پەروەردگارا ! ئەی پەروەردگاری هەرەباڵا، ئەی پەخشەندە و ئەی میهرەبان، ئەی ئەو کەسەی کەوەنەوز و خەو ناتگرێ، بەیادم بخەرەوە زانست و زانیاری و باشی حوکم ڕانیم بەسەر (بنی ئیسرائیل)یەکانەوە، هەمووی لەتۆ دەناسم و تۆ خۆت پێت بەخشیوم، خۆت لەمن باشتریش دەزانی، بەئاشکرا و نهێنیەکانم ئاگاداری، ئیتر خوای گەورە نزاکانی

[1] ضعيف الاسناد: ابن جرير، تاريخ (٣١٣) .

وەرگرت و بەزەیی پێیداهاتەوەو وەحی کرد بۆ (شعیا) (علیه السلام) کە مژدەی بداتێ کەخوای گەورە نزا و گریانەکەی بەر بەزەیی خۆی خست و ماوەی بیست و پێنج ساڵی تر مەرگی دواخرا، وە لەدوژمنەکەیش ڕزگاری دەکات، کە (سەنحاریب)ی پاشای بابلییەکانە، هەر کە (شعیا) ((علیه السلام) ئەوەی پێراگەیاند، ئازاری قاچی چاك بویەوە، خەم و بێزاریەکەی ڕەویەوە، کەوت بەکڕنووش دا بۆ خواو فەرمووی: پەروەردگارا هەرتۆ موڵك و پایەداری دەدەی بە هەرکەسێك کە مەبەستتە و لەهەر کەسێکی دەسەنیتەوە کە دەتەوێت، هەرکەست بوێ بەزەیی دەکەیتەوە و هەرکەسیشت بوێ دایدەبەزێنی، بینەری دیار و نادیاریت، تۆ یەکەمین و دواهەمینی، دیارو نادیاری، بەزەییت بەداماواندا دێتەوەو وەڵامی داوای لێقەومان دەدەیتەوە، هەرکەسەری لە کڕنووش بەرزکردەوە، خوای گەورە وەحی نارد بۆ (شعیا) ((علیه السلام) کەبچێت ئاوی هەنجیر لەبرینەکەی بدات، چاك دەبێتەوە، ئەویش وایکرد و چاك بوەوە، خوای گەورەش مەرگی ناردەسەر (سەنحاریب) و سوپاکەی و هەرهەموویان تێداچوون و نەمان .

جگە لە (سەنحاریب) خۆی و پێنج کەس لەدەست و پێوەند و یاوەڕانی، کە یەکێك لەو پێنجە (بەختنصر)بوو، پاشای (بنی ئیسرائیل) ناردیەسەر ئەو پێنج کەسە و بەدیل گرتیانن و بە کەلەبچەکراوی بەسەر شاردا گێڕایانن تاماوەی حەفتا ڕۆژ، وەك ڕیسواکردن و سوکایەتی پێکردنیان، هەریەکەیان ڕۆژانە تەنها یەك کولێرەیان پێدەدان کە لە جۆ دروست کرابوو، پاشان خستیاننە بەندیخانەوە، تا ئەو کاتەی خوای گەورە وەحی نارد بۆ (شیعا) (علیه السلام) کە فەرمان بەپاشا بکات تاکو بیانبەنەوە بۆ وولاتی خۆیان تاکو ئەو هەواڵ و بەسەرهاتە بۆ گەلەکەیان باس بکەن .

کاتێك گەڕانەوە (سەنحارب) گەلەکەی کۆکردەوەو هەواڵەکەی پێراگەیاندن، بەڵام کاهن و جادوگەرەکان پێێن گوت: ئێمە پێشتر پێمان وتبویت کە پاروەردگاری ئەوان چەند بەهێز و بەتوانایە و پێغەمبەری ئەوان چەند زیرەك و لێهاتووە، کەچی تۆ گوێت لێنەگرتین، پێمان گوتی ئەوانە گەلێکن کەس پێیان ناوێرێ و پەروەردگاریان دەیانپارێزێ، ئیتر (سەنحاریب) فەرمانیدا کەباسی لەخوا ترسان بەو خەڵکە ڕابگەیەنن، پاش حەوت ساڵ (سەنحاریب) کۆچی دوایی کرد .

(ابن اسحاق) دەفەرموێت: کاتێك (حزقیا)ی پاشای (بنی ئیرائیل)یەکان کۆچی دوایی کرد، ئەوانیش کاروباریان بەسەریەکدا شێواند و دەستیان دایە بەو کاری و خراپەکاری، خوای گەورەش وەحی کرد بۆ (شیعا) (علیه السلام) کە خوایان بەیاد بخاتەوە و

ئامۆژگارییان بکات، بەسزای خوایی بیانترسێنێ، ئەگەر سەرپێچی بکەن کەچی ئەوان نەك هەر گوێیان بۆنەگرت و بەقسەیان نەکرد، هەڕەشەی کوشتنیان لێکرد، ناچار لەدەستیان هەڵات و ڕایکرد و چوو لە قلۆرەدارێکدا خۆی شاردەوە، بەڵام شەیتان پێیزانی و چمکێکی کراسەکەی گرت و خستیە ڕووی دەرەوە، بەوەش خەڵکەکە زانییان کە لەو دارەدایە، مشاریان هێناو دارەکەیان لەسەرەوە تا خوارەوە مشاربڕ کرد و (شەعیا)ی پێغەمبەریش (علیه السلام) لەدارەکەدا دوو لەت کرا و شەهیدکرا، خوای گەورە لەئەویش و ئێمەش خۆش بێت و گەڕانەوەی هەموومان هەر بۆلای پەروەردگارە .

یەکێکی تر لەو پێغەمبەرانە (علیه السلام) (ئەرمیا)ی کوڕی حلقیایە لەدەستەو پشتی لاوی کوڕی یەعقوب(علیه السلام) وتراوە: ئەمە (خضر) بووە، وەکو (الضحاك) لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە، بەڵام ئەم گێڕانەوەیە پشتی پێنابەسترێ و ناڕاستە (ابن عساكر)یش[1] دەفەرموێت: هاتووە کە (ئەرمیا) (علیه السلام) بەسەر خوێنی یەحیای کوڕی زەکەریاوە (علیه السلام) وەستاوە کە لە (دمشق)دا دەپڕژا، پێی گوت: ئەی خوێن خەڵکیت بەفەتارە دا، لەئەزمەنت دان بوەستەرەوە ! ئیتر خوێنەکە وەستایەوە و مەیی و دیار .

(ابوبكر بن ابی الدنیا) [2] گێڕانەوەیەکی بردۆتەوە سەر (عبدالله کوڕی عبدالرحمن) کە دەفەرموێت: (ئەرمیا) (علیه السلام) فەرمووی: پەروەردگارا ! کام بەندەیە بەلاتەوە زۆر خۆشەویستە ؟ فەرمووی: ئەوانەیان کە لەهەموویان زیاتر یادی من دەکات و سەرقاڵن بەیادکردنی من بەسەر یادی دروست کراوەکانم دا، ئەوانەی واتە واتەی تیاچوون و مردنی خۆیان ناکەنە مەبەست و سەرقاڵنین بەوەی کەبیر لەمانەوەی خۆیان بکەنەوە لەدنیادا، ئەوانەی کەژیانی دنیایان پێدەدرێت کەمی لێهەڵدەبژێرن و کە لەدنیاش دەردەچن دڵخۆشن، ئەوانە لەهەمووکەس خۆشەویسترن لەلام و لەسەر داواکاری خۆشیان زیاتریان دەدەمێ .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَآتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَجَعَلْنَاهُ هُدًى لِبَنِي إِسْرَائِيلَ ... وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ حَصِيرًا﴾(الاسراء:٢-٨)، (وهب کوڕی منبه) دەربارەی مانای ئەم ئایەتە دەفەرموێت: خوای گەورە وەحی نار بۆ یەکێ لە پێغەمبەرانی (بنی ئیسرائیل) کەناوی (ئەرمیا)بوو(علیه السلام) کاتێك خراپەکاری لەناویاندا پەرەی سەندبوو، خوای گەورە فەرمووی بە پێغەمبەرەکەی: هەستە و بڕۆرە ناو گەلەکەتەوە پێیا ڕابگەیەنە کە ئەگەر چی

---

[1] تاریخ دمشق (٢٨/٨) .

[2] ضعیف الاسناد: ابن عساكر (٢٨/٨) .

ئەوان (دڵ) یان هەیە، بەڵام هیچ بەو دڵانەیان ڕەوا نابینن و دڵیان ناکەنەوە و نایخەنەکار، وە (چاو) یان هەیە کە ڕاستیەکانیان پێنابینن، وە (گوێ) یان هەیە کە بۆ بینینی ڕاستی بەکاریان ناهێنن، من باوپیرانی ئەوانم بەیاد کردەوەکە چۆن چاکەم لەگەڵدا کردن و چاکم کردن، ئەوەش سۆزی دولاَندم کە بەزەییم بەماڵ و نەوەکانی ئەوانیش دا بێتەوە، لێشیان بپرسە ئەوان چەند لەگوێڕایەڵی من کەم تەرخەم بوون ؟ ئایا هیچ کام لەوانە دڵخۆشە بەوەی کە لەمن یاخی بووە، ئایا هیچ کەس بەگوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی من زیان مەندبووە بەوە بۆتە گوێڕایەڵ بۆم ؟ ئاژەڵەکانیش یادی نیشتمانی خۆیان دەکەنەوەو جەنگی لەپێناودا بەرپا دەکەن، بەلاَم ئەم گەلە ئەوەیان فەرامۆش کردەوە کە باو و باپیرانیان بەلایانەوە خۆشەویست بوون، ئەمانە لە ڕوویەکی ترەوە بەدوای ڕێز سەروەریدا دەگەڕێن کە ڕێگەی گونجاوی خۆی نییە، ئەحبارەکانیان نکولییان لە حەقیقەتی من دەکرد، خوێندەوارەکانیان جگە لەمن شتی تریان دەپەرست، (ناسك) و زانا و نزاگۆکانیان ئەوەی کردیان بێ هۆ بوو، فریایان نەکەوتن و زانستەکەیان کاریان پێنەکرد، دەسەلاَتدارەکانیان درۆیان بەدەم من پێغەمبەرەکانمانەوە هەڵ دەبەست، فێڵ و تەڵەکەیان لەدڵیاندا حەشاردابوو، زمانیا لەسەر درۆ ڕاهێنابوو، سوێندبێ بەجەلال و عیزەتی خۆم: ئەوەو بەرەیەکیان بەسەردا زاڵ دەکەم کە لەزمانیان تێنەگەن، ڕوخساریان نەناسنەوە، بەزەییان بەگریانی ئەواندا نەیەتەوە، پاشای دڵ ڕەق و ستەمکاریان بۆ دەنێرم کە سوپاکەی وەکو پەڵەهەور وابێ، کەژاوەی سەربازەکانی وەك پرتەوی شەپۆل و شەکەشەکی ئالآیان وەك فرتەی باڵی باز وابێ، باری ولاَخەکەیان چەند هێندی باری ئاساییبێ، ئاوەدانیەکان بکەنە کاولگە، شارەکان بە وێرانەیی لەدوای خۆیانەوە بەجێ بهێڵن، وەك دۆڵی (ئیلیا) تان بەسەربێنن کەچۆن بەزەلیلی کوشتیانن، سوپایان بەسەر زاڵ دەکەم، نازی بووکیان لێدەکەمەوە قیژەوهاوار، حیلەی ئەسپیان لێدەگۆڕم بە لوورەی گورگ بەلەکۆنەو بەرزایی کۆشك و تەلارەکانیان دەکەمە بێشەی شێر، ڕۆشناییان لێڵ دەکەم، سەروەریان بەڕیسوایی و نازو نیعمەتیان بەکۆیلەیی دەگۆڕم، ژنەکانیان پاش ئەو هەموو پاکی و جوانیە دەکەمە خاك و خۆڵ کە خەڵکی بەسەریاندا بڕۆن، تەرمەکانیشیان دەکەمە خاشاکی سەرزەوی و ئێسکەکانیان دەکەمە بزوتی بەرهەتاو، بەجۆرەها ئازار دەیانپلیشێنمەوەو سزایان دەدەم، پاشان فەرمان دەکەم ئاسمان لەژور سەریانەوە ببێتە یەك پارچە ئاسن و زەویش ئاوێتەیەکی مس، جائەگەر ئاسمان بارانیشی باراند ئەوا زەوی ڕووەکی لێنەڕوێت، ئەگەر شتێکی کەمیش ڕەوا، ئەوە لەبەر خاتری بێزمانی و

ئاژەڵان بووەو بە ڕەحمەتی خۆم ڕواندومە بۆیان، ئینجا لەکەشی کشتوکاڵ کردندا بارانیان لێدەگرمەوەو لەوەرزی دورینەوەی دانەوێڵەو کۆکردنەوەی بەروبومدا باران دەبارێنم، ئەگەر کەمێك ڕووەکیشیان بۆ بەرهەم هاتبوو ئەوا بەلاّ و خۆشییان بۆ دەنێرم، ئەگەر لەوەش کەمێکیان بۆ ڕزگاربوو، ئەوا پیت و بەرەکەتی لێهەڵدەگرم. خۆ ئەگەر لێم پاڕانەوە وەلاّمیان نادەمەوە، ئەگەر داوای شتیان لێکردم نایاندەمێ، ئەگەر گریان بەزەییم پێیان دا نایاتەوە، خۆ ئەگەر کڕوزانەوە ڕووی خۆمیان لێ وەردەگێڕم)، (ابن عساكر) بەم جۆرە دەقە گێڕاویەتەوە [1] .

(اسحاق کوڕی بشر)[2] دەفەرموێت _ادريس) لە (وهب کوڕی منبە)ەوە فەرموودەیەکی بۆ گێڕاینەوە کەکورتە مانای فەرمودەکە بەم جۆرەیە .

کاتێك خوای گەورە (ئەرما)ی وەك پێغەمبەرێك (عليه السلام) ڕەوانەکرد بۆسەر (بنی ئیسرائیل)، بەلاّم ئەوان وردە وردە لەڕێی ڕاست لایاندا و کەوتنە سەر خراپەکاری و هەڕەشەکردن لە پێغەمبەرانی خواو باوەڕداران و شەهید کردنی ئەوان لەو لاوەش خزای گەورە (بەختنصر) پاشای بۆ زیت کردنەوە کە ئاگربەرست بوون، خوای گەورە بەوەحی بە (ئەرمینا) (عليه السلام) ڕاگەیاند کە من (بنی ئیسرائیل)یەکان تەفرەتون دەکەم، ئەویش لەتاواندا یەخەی کراسەکەی دادڕی و خۆڵەمێشی بەسەر خۆیدا کرد و بەکڕنووشیدا کەوت و گەلێك لەخوای گەورە پاڕایەوە، خوای گەورە باسی ئەوەی فەرموو کە بەرلەدەروست کردنی دانیاوە بیکاتە پێغەمبەرێکی خۆی بۆ کارێکی گەورە ناردویەتی (کە پێغەمبەرایەتی کردنی بنو ئیسرائیلییەکانە) هەستە و لەگەڵ پاشاکەیاندا بە ڕێنمویی بکە، پاشان بەدکاری و خراپەکاری بنی ئیسرائیلیەکان پەرەی سەند، خوای گەورەش فەرمووی پاشاو میرەکانیان نیعمەتی منیان بەکەم بینی لە دەسەلاّتی من بێخەم بوون، دنیا لەخشتەی بردن و کەوتنی دەستکاری کردنی پەیامی من و قسەهەڵبەستن بەناوی پێغەمبەرانمەوە کەهەرگیر هاوەڵدانان لەگەڵ من دا ناگونجێ، خوێندەوارو زاناکانیشیان لەگەڵ زانای خۆیاندا هانی پاشاکان دەدەن لەسەر لادان لەدنیا و گۆڕین، ئەوان چ سوودیان لەو زانیاریە وەرنەگرتووە، ئەوەو وەچەی پێغەملبەرانیش (عليهم السلام) لەگەڵ ئەو خەڵکە نەزان و خراپانە نێوەگلاون و نازانن کەباوانی ئەوان چەندە دڵسۆزی

[1] ابن عساكر (٢٩/٨)

[2] موضوع: ان عساكر، تاريخ (٣٤/٨)، لەبەرئەوەی (موضوع)ە بە گونجاومان نەزانی بەتەواوەتی فەرموودەکە بهێنین، تەنها ماناکەیمان بە کورتی هێناوە و زۆر متمانەی پێناکرێت .

ئەو ئاینە بوون و ئارامیان لەسەرگرتووەو ڕاستگۆبوون و خۆیان لەپێناوی خوادا شەهید کردووە، ئینجا ئەم ئاینە گەیشتوەتە دەست ئێوەو بڵاوبوەتەوە بەسەر زەویدا، ئەو گەلەش بەسەریاندا زاڵ دەکەم تاکو پەنەیان دایدەن و تۆزیّ بەخۆیاندا بچنەوە، گەلێك لێیان بوردم و مەودام دان و سزام لەسەر لابردن و بەخشیشی خۆم بۆگەڕاندنەوە، بەلأم ئەوان لەو بێبڕوایی خۆیان نەکەوتن، سوێند بەگەورەیی و عیزەتی خۆم دەبیّ کوشتار و گێچەڵ و ناڕەحەتیەکی وایان بەسەردابێنم کەسی زۆر بەئارام و ژیرو حەکیم سەرسام ببیّ !

پاشان خوای گەورە باسی تەنگانەکانی داهاتوویان دەکات کەچۆن هەموو خۆشی و شادی نیعمەتەکانیان لیّ هەڵەوگێڕو ئاوەژوو دەکاتەوە، هەروەها (کعب) دەڵێت: (ئەرمینا) (علیه السلام) زۆر بەداماوی و کەساسی کەوت بە کڕنووش دا و لەخوای گەورە هەڵنوزا و پاڕایەوە بۆ خۆیپ و گەلەکەی و لەکۆتاییدا فەرمووی: ئەی خوای گەورە ئایا بەروبەرەچەی ئیبراهیم خلیل و موسای پێغەمبەر (علیه السلام) بەزەلیلی دەخەیتە ژێردەستی کەسانێکی ئاگرپەرست ؟ خوای گەورە وەحی بۆکردو فەرمووی: ئەی (ئەرمینا) باشە ئەوا من سکالأم لەدەست بنی ئیسرائیلیەکان هێناوە بۆلای تۆ، کەداوایان لەسەر تۆماردەکەم و هاوکات زۆر بەبەزەییش دەبم بەرامبەریان و لەهەموو گرانی و ناڕەحەتیە کیش لایاندەبەم و دابەستەیان دەکەم، وەك چۆن بەرانی تێرو دابەستە شەڕە قۆچ دەکەن لەگەڵ یەکتردا، وەیل بۆئەوان .... وەیل بۆئەوان . . من ڕێزی ئەو کەسە دەگرم کەڕێزم دەگریّ، سەرکۆنەی هەرکەسیّ دەکەم کە سەرکۆنەی فەرمانی من بکات، گەلانی پێشوو بەدزیەوە تاوانیان دەکر (واتە لەبەر چاوی خەڵکی نا)، بەلأم ئەمانە خۆیان بۆ تاوانباری و یاخیبوونی فەرمانی من بەخت دەکەن و بەئاشکرا تاوان دەکەن لەمزگەوت و بازاڕ و سەر لوتکەی شاخ و بن سێبەری دارەکان، تەنانەت ئاسمانیش لەدەستیان بۆلای من ڕایکردووە، زەویو شاخەکانیش، بگرەئاژەڵ و گیاندارانیش ڕایانکردۆتە کەنارەکانی زەوی لەدەست ئەوان هێشتا هەر وازناهێنن و کاربەپامی من ناکەن .

کاتێك (ئەرمینا) (علیه السلام) ئەم پەیامە خواییەی بەخەڵکەکە ڕاگەیاند، ئەوان بەدرۆیان دەکردەوەو گاڵتەیان لێدەهات، گوتیان تۆ بەدەم خواوە درۆدەکەیت و دەڵێت خوا زەویو مزگەوت و پەیام و بەندایەتی خۆی پاك دەخات ؟ جاباشە ئەوا کیّ دەمێنیّ کەخوا بپەرستێت ؟ ئیتر (ئەرمینا)یان (علیه السلام) گرت و پەل بەستیان کردو خستیانە بەندیخانەوە .

ئا لەم کاتەدا خوای گەورە (بەختنصر)ی پاشای ئاگرپەرستەکانی بەخۆی و سوپاکەیەوە ناردەسەریان و سەرەتا بەپێرەو هێرشیان هێناو گەمارۆیان دان، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَاداً لَنَا أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا خِلالَ الدِّيَارِ﴾(الاسراء:٥)، کاتێك ئەو گەمارۆیە درێژەی کێشا لەسەریان، بەناچاری خۆیان بەدەستەوەدا و دەرك و دەروازەی ماڵەکانیان بۆ خستنە سەرپشت، ئەویش تێیان کەوت، بەلای ڕاست و چەپدا دەیکوشتن، بەدیلی دەگرتن، سزای دەدان، سێیەکی خەڵکەکەی لەناوبرد، تەنها پیرو ساواکنای هێشتەوە، بەئەسپ یان و پلیشی کردنەوە، (بیت المقدس)ی کاول کرد منالْ و مێرد و منالّەکانی بۆخۆی برد، ژنەکانی داماوو بێنەوا بەڕەلاّی بازاڕەکان کرد، کۆشك و تەلارەکانی ڕوخاند، مزگەوتەکانی ڕماند، تەوراتی سوتاند، هەواڵی ئەو (دانیال)ەی پرسی کەنامەیەکی پێشتر بۆناردبوو، تەرمەکەیان دۆزیەوە بەرمردوویی، (بەختنصر)ی پاشا بەخۆی سوپاکەیەوە سەرایای خاکی شامیشی داگیرکرد خەڵکەکەی تەفروتوانا کرد، سامان و ماڵی بەتالاّن بۆخۆی بردن و گەڕایەوە، نەوەت هەزار منداڵی پاشاو ئەحبارەکانی بەسوپاگرت، گسکەکانی (بیت المقدس)ی فڕێدا بەرازی لەناودا سەربڕی بەهەزاران منداڵ و لاوی لەتیرەو پشت و بەرەی پێغەمبەرانی وەك داودو یوسف و بنیامین و ئیشا و زبالۆن و نەفتالی و دان و زیکۆن و ڕۆبێل و لاوی بەدیل گرت و بۆخۆی بردن و بەرەو خاکی (بابل) گەڕایەوە .

(ابن اسحاق بات بشر) لە (وهب کوڕی منبه)ەوە دەگێڕێتەوە کەفەرمووی: کاتێك ئەوە ڕوویدا کەباسمان کرد، بە (بەختنصر)شا، وترا کەسێك لەناو ئەم گەلەدا هەبوو ئاگاداری کردنەوە کەئاوایان بەسەردێت، وە تۆیشی بۆ وەسف کردبوون و هەواڵی تۆیشی پێڕاگەیاندبوون، کەچۆن تەفروتونایان دەکەیت و ماڵ و مزگەوتیان کاول دەکەیت کەنیسەکانیان دەسوتێنی، بەلاّم ئەوان بەدرۆیان دەکردەوەو تاوانباریان دەکردو لێیان دەداو قوڵ بەست و دیلیان دەکر، (بەختنصەر)ی پاشا فەرمانی کرد کەئەو پیاوەی لەبەندیخانە بۆ بهێننەدەرەوە (ئەرمینا)بوو (علیه السلام) (بەختنصر)ی پاشا لێیپرسی: تۆ بەئەمانەت وتبوو کەئاواتان بەسەردێت؟

فەرمووی: بەڵێ، گوتی منیش شتێکی وادەزانم، واتە بیستومە، فەرمووی: خوای گەورە منی وەك پێغەمبەر ڕەوانەکرد بۆسەر ئەوان، بەلاّم ئەوان بەدرۆیان دەزانیم؟ گوتی: بەدرۆیان دەکردیتەوەو ئازاریان دەدایت و زیندانییان دەکردیت ؟ فەرمووی بەڵێ فەرمووی: خرابترین گەل ئەو گەلەن کەپێغەمبەری خۆیان بەدرۆ دەخەنەوەو پەیامی

**خوایی بەڕاست نازانن، ئایا دەکرێت تۆ لەگەڵمدا بێیت و ڕێزت لێبگرم ودڵنەواییت بکەم؟ یان ئەگەر حەوزدەکەیت لە وولاّتەکەی خۆت دا بمێنەرەوەو منیش دەتپارێزم و چاودێریت دەکەم !**

**(ئەرمینا) (علیە السلام) فەرمووی: من خوای گەورە دەمپارێزێ، ئەوەندەی لەدایك بووم بۆ ساتێك ئەم وولاّتە بەجێنەهێشتووە، ئەگەر بنی ئیسرائیلیەکانیش بەجێیان نەهێشتایە لەتۆ و هیچ کەسێکی تریش نەدەترسان، تۆش دەسەلاّتت بەسەریاندا نەدەشکا، کاتێك (بەختنصر) ئەم قسەیەی لەئەو بیست، وازی لێهێنا، (ئەرمینا)ش (علیە السلام) لەجێگە و وولاّتی خۆی لەخاکی (ئیلیا)دا مایەوە، ئەم جۆرە گێڕانەوەیە ڕەوتێکی (غریب)ی هەیە، بگرە لەوەرگێڕانەوە بۆسەر زمانی عەرەبی.**

**(هشام کوڕی محمد)[1] دەڵێت (بەختنصر ئەصف هەبذا) دەکەوتە نێوان ئەهوازەوە تادەگات بە وولاّتی ڕۆم پاشایەکی لەسەردانابوو لە فارسەکان کەناوی (هراسب)بوو، کە هەرئەو شاری (بەلّخ)ی بنیات ناوە کە بە (خنساء) ناسراوەو هەر ئەو جەنگیشی لەگەڵ تورەکاندا کرد و ئاخنینیە تەنگەبەرترین شوێنەکانی سەرزەوییەوە، (بەختنصر)ی پاشا نوێنەری کەوتەڕێ بۆ جەنگ کردن دژی (بنو ئیسرائیل)یەکان کە لە(شام)دا دەژیان، بەلاّم هەر کەگەیشتە شام خەڵکی دیمەشق لەگەڵی ڕێك کەوتن و جەنگیان نەکرد، وتراوە ئەو نوێنەرەی کە (بەختنصر) ی پاشا ناردی ناوی (یەهمەن)بوو کەپاشای فارسەکان بووە لەدوای (بەشتاسب کوڕی لەهراسب)، چونکە (بنی ئیسرائیل) دەیانویست دەست درێژی و دژایەتی پێغەمبەرەکەی خوا بکەن .**

**(ابن جریر)[2] هێناویەتی تا دەگاتەوە بە (سعید کوڕی موسەیەب) کەکاتێك (بەختنصر) گەیشتە دیمەشق بینی خوێنێك هەڵ دەکفێت.**

**وتراوە: پرسیاریان کردووە ئەو خوێنە چییە ؟ وتویانە لە باووباپیرانمانەوە بیستوومانە کە ئەو خوێنە هەر هەبووە، وتراوە لەسەر ئەو خوێنە حەفتا هەزار موسوڵمان کوژراوە، جگە لە ناموسولمانانیش، ئینجا وەستاوەتەوە خوا دەیزانێ، بەلاّم پێدەچێ خوێنی پێغەمبەرێکی دێرین، یان پیاوچاکان بووە، یان هی ئەو کەسەی کەتەنها خوی دەیزانێت .**

---

[1] سندة ضعیف: ابن جریر (١/٣١٦) .

[2] صحیح الاسناد: تفسیر (٩/ج١٥ / ٢٩-٣٠) .

هەر (هشام کوڕی کەلەبی)[1] دەڵێت: پاشان (بەختنصر)ی پاشا بەرەو (بیت المقدس) کەوتەڕێ و لەگەڵ پاشاکەیاندا ڕێك کەوت، کەپاشاکەیان دەچێتەوە سەر تیرەوپشتی (داود)(علیه السلام) لەسەر (بنی لسرائیل)یەکان، وەك پاشا دایناوەیە، (بەختنصر)یش چەند کەسێکی بەبارمتە لە بنی ئیسرائیلیەکان وەرگرت و لەگەڵ خۆیدا بردنی، وەك مسوگەر کردنێك بۆئەوەی کەپاش بەجێهێشتنی (بەختنصر) ئەوان دەست درێژی نەکەنەسەر پاشاکەیان، بەڵام هەر (بەختنصر) پاشا گەیشتە (طبرية) هەواڵی پێگەیشت کە بەنی ئیسرائیلییەکان لەپاشاکەی خۆیان هەڵگەڕاونەتەوەو کوشتویانە، لەسەرئەوەی کە ڕێککەوتنی لەگەڵ (بەختنصر)ی پاشادا کردووە .

(بەختنصر)ی پاشا هەرلەوێ کەسە بارمتەکانی کوشت و زۆر بەتوندی گەڕایەوە بۆسەریان و تەفروتونای کردن و لەناوی بردن، وتراوە کە لەوکاتەدا (ئەرمینا)ی پێغەمبەری (علیه السلام) لەبەندیخانەکەدا بینیوە و هێناویەتە دەرەوەو بەسەرهاتی خۆی پێگێڕاوەتەوە کە لەگەڵ گەلەکەیدا چیکردووەو چۆن شل و کول بووە لەبانگەوازکردنیان بۆ خواپەرستی، بەڵام ئەوان دیل و زیندانیان کردووە، (بەختنصر) گوتی: خراپترین گەل ئەوانەن کە لەپێغەمبەرانی خوا هەڵ دەگەڕێنەوە، ئیتر (بەختنصر) لەوێدا واز لەئەو دەهێنێ و ئازادی دەکات و چاکەی لەگەڵدا دەکات، ئیتر ئەو خەڵکە هەژارو کەمەی کەمابوونەوە لە (بنی ئیسرائیل)یەکان لەدەوری (ئەرمیا) (علیه السلام) کۆبوونەوە، گوتیان: بەڕاستی ئێمە خراپە و تاوانباریمان دژی تۆ کرد، ئێستا پەشیمانین و تەوبەدەکەین بۆلای خوای گەورە، تۆش لەخوا بپاڕێرەوە لە تەوبەکەمان وەربگرێ، ئەویش لەخوای گەورە پاڕایەوە، خوای گەورە وەحی بۆنارد و فەرمووی: من کاتێك تەوبەیان لێوەردەگرم ئەگەر ڕاست دەکەن با لەم شارەدا لەگەڵ تۆدا بمێننەوە، ئەویش فەرمانی خوای بەوجۆرە پێڕاگەیاندن، کەچی لەوەڵامدا گوتیان: جا چۆن لەم شارەدا دانیشین کەخوای گەورە ڕەقی خۆی پیرشتووەو کاول و وێرانی کردووە ؟ بەم جۆرە ئەوان مانەوەیان قەبوڵ نەکرد

هەر لەو سەردەمەدا بنو ئیسرائیلیەکان پەرتەوازەی شاران و وڵاتان بوون، هەرگروپ و کۆمەڵێك ڕوویان لەشوێنێك کرد و دابەش بوون بەسەر وڵاتی حیجاز و (یثرب) و (وادی القری) و (میصر)، (بەختنصر) نامەیەکی بۆ پاشای شارەکە نارد و داوای لێکرد ئەو کەسانەی بۆبنێرێ کەشاریان بەجێهێشتووە، پاشاکەش ڕازینەبوو بەوە، لەبەرئەوە

---

[1] سندة ضعيف: ابن جرير، تاريخ (١/٣١٦) .

(بەختنصر) پاشا بەخۆی و سوپاکەیەوە پەلاماریدان و تەفروتونای کردن و بەدیلی گرتن، پاشان بەرەو وولاتی (مغرب) کەوتنەڕێ و گەیشتە دوورترین شوێن لەو ڕووکارەوە، پاشان بەخۆی دیلەکانیەوە کە لە (مغرب) و (بیت المقدس) و (فلسطین) و (میصر) و (ئوردون) دەستی کەوتبوون گەڕایەوە، کەیەکێك لەوانەش (دانیال)بوو، منیش دەڵێم: ڕووکاری ڕووداوەکە وا نیشان دەدات کە ئەو (دانیال)ە دانیاڵی کوڕی (حەزقیل)ە بچوکەکەیە، نەك گەورەکەیان، بەو پێیەی کە (وهب کوڕی منبه) باسی دەکات .

.......................................................................

## پێغەمبەری خوا (دانیال) (درووود سڵاوی خوای لەسەر بێت)

(ابن ابی الدنیا)[1] گێڕانەوەیەکی بردۆتەوە سەر (عبدالله کوڕی ابی الهذیل) کە دەفەرموێت: (بەختنصر دوو شێری گرت و کردنیە ژوورێکەوە، دانیالی هێنا و بۆی فرێدانە ژوورەکەوە، دوو شێرەکە هیچ پەلامارێکیان نەدا، ئەوەندەی خوا ویستی لەسەربوو لەگەڵ شێرەکاندا لەو ژوورەدا مایەوە، پاشان دانیال (علیه السلام) وەك هەر مرۆڤێکی ئاسایی برسیبوو، حەزی لەخواردن بوو، خوای گەورەش وەحی کرد بۆ (ئەرمیا) (علیه السلام) کە لەوولاتی (شام)بوو، خوای گەورە فەرمانی بە (ئەرمیا)کرد (علیه السلام) کەخواردن و خواردنەوە بۆ (دانیال) ((علیه السلام) ئامادەبکات، (ئەرمیا) فەرمووی: پەروەردگارا من لەخاکی پیرۆزم (واتە لەخاکی بیت المقدس)وە دانیاڵ لەخاکی (بابل)ە لەعێراق واتە چۆن ئەم خواردنەی من لێرەوە دەگاتە ئەوێ، خوای گەورە وەحی بۆکردو فەرمووی: تۆ ئامادەی بکەو چیت پێگوتراوە جێبەجێی بکە، ناردنەکەی لەسەر ئێمەیە بەخۆت و خواردنەکەشتەوە، ئەویش ئامادەیکرد، خوای گەورەش بەهۆیەکی دیاریکراو خۆی و خواردنەکەیشی گەیاندە شوێنی مەبەست، تاکو (ئەرمینا) فەرمووی: منم ئەرمینام، فەرمووی کێ تۆی گەیاندە ئێرە ؟ فەرمووی: پەروەردگارت، گوتی: بۆچی خوای گەورە منیشی لەبیرە ؟ فەرمووی: بەڵێ، ئیتر (دانیاڵ) (علیه السلام) فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی هەرکەسێ یادی بکات لەبیری ناکات، وە سوپاس بۆ ئەو خوایەی وەڵامی هەرکەسێك دەداتەوە کەتکای لێبکات، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە هەرکەسێ پشتی پێبسپێرێت بەکەسانی تری ناسپێرێت، وە سوپاس بۆئەو خوایەی چاکە بەچاکە پاداشت دەداتەوە، وە سوپاس بۆ ئەو خوایەی پاش ناڕەحەتیمان ڕزگارمان دەکات،، وە

---

[1] سندە ضعیف: ابن ابي الدنیا في الشکر (۱۷۳) .

سوپاس بۆ ئەو خوایەی دەمانپارێزێ کاتێك گومانمان بەرانبەر کردەوەکانمان خراپ دەبێت،، وە سوپاس بۆ ئەو خوایەی تاکە هیواو ئاواتی ڕزگاربوونمانە، کاتێك هۆکاروڕێی ڕزگاری بەدیناکەین و لەوپەڕی نائومێدی داین .

(یونس کوڕی بکیر) لە (أبو العالیە)ەوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: کاتێك پاردەیەکمان کردەوە لەناوماڵێکی (هرمزان)دا جێگەو تەختێکی داخراومان دۆزیەوە کەتەرمی پیاوێکی لەسەر بوو، لەژوور سەریەوە قورئانێك دانرابوو، قورئانەکەمان هەڵگرت و بردمان بۆلای عومەری کوڕی خطاب، ئەویش بانگی (کەعب)ی کرد تاکو بۆی بکاتەوە عەرەبی، من یەکەم کەسی عەرەب بووم کە خوێندمەوە، وەکو ئەو قورئانە خوێندمەوە (کە ئێستا هەیە)، ئینجا بە (ابی العالیە)م گوت: کە چێتێدایە ؟ گوتی: ڕەفتار و کاروبارتان و ئاوازی قسەتان و هەرچی شتێکی تری داهاتوو، گوتم: ئەی تەرمی پیاوەکەتان چیلێکرد ؟ فەرمووی: بەڕۆژ سیانزە کۆڕی جیاجیامان هەڵکەند، کە شەو داهات ئەسپەردەی خاکمان کرد و هەموو گۆڕەکانیشمان وەکو یەك لێکرد، تاکو خەڵکەکە نەزانن کامیان تەرمەکەی تێدایە، گوتم: بۆچی ئەو خەڵکە چییان لەو تەرمە دەکرد؟ گوتی: کەباران نەدەباری خەڵکەکە دەچوونە ژوورسەری تەختی تەرمەکە و داوای باران بارینیان دەکرد !! گوتم: بەگومانە ئێوە ئەو تەرمە تەرمی کێیە ؟ گوتی پیاوێکە پێی دەڵێن (دانیاڵ)، گوتم: بەڕای ئێوە ئاخۆ کەی مەردووە ؟ گوتی: بەر لە سێسەد ساڵ، گوتم: ئەدی هیچی نەکۆڕابوو و تێك نەچووبوو ؟ گوتی: نەخێر مەگەر چەند موویەکی، چونکە گۆشتی لەشی پێغەمبەران خاك نایڕزێنێ و شێر نایخوات، ئەم گێڕانەوەیە کەباس لەپاراستنی لەشی پێغەمبەران دەکات لەڕووی (اسنا)وە ڕاستە، بەڵام دەربارەی ئەوەی کە سێسەد ساڵی ڕەبەقە کۆچی دوایی کردووە، ئەمەیان جێگەی باس و خواسە و هەڵ دەگرێتکە پیاوچاکێك بووبێ نەك پێغەمبەرێك، چونکە هیچ پێغەمبەرێك کە لەنێوان (عیسا) و پێغەمبەری خۆماندا (محمد) (ﷺ) نیە، ماوەی نێوان ئەمانیش (چوار سەد) ساڵە، یان (شەش سەد) سالە، یان (شەش سەد و بیست) ساڵ .

پێدەچێ کەنزیکەی هەشت ساڵێك پێشتر کۆچی دوایی کردووە، کەنزیکە لەگەڵ سەردەمی (دانیاڵ)دا و ئەویش ئەگەر ئەم (دانیاڵ)ە ئەوەبێ کەمەبەستە، ئەگینا ئەم دانیاڵە دانیاڵێکی ترە یان پیاوێکی ترە، جا یان لەپێغەمبەرانە، یان لەپیاو چاکانە، بەڵام گومانەکان لەوەوە نزیکن کە (دانیاڵ)ە(علیه السلام)، چونکە (دانیاڵ)یش (علیه السلام) کاتی خۆی پاشایەکی فارسەکان گرتویەتی و کردویەتی بەندیخانەوە، وەکو پێشتر

باسمان کرد وتراوه درێژی لووتی ئەم تەرمە (بستێك)بووە، بگرە بالأیشی درێژو کەتەبووە، دوورۆ نیە بێت لە پێغەمبەرە زۆر دێرینەکان [1]، خوای گەورە باشتر دەزانێ .

لە کتێبی (أحکام القبور)دا، (ابو بکر ابن ابی الدنیا)[2] دەفەرموێت: لە (ابو بلال)ەوە تادەیگەیەنێتەوە بە (ابی اشعث الاحمری) کە دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (دانیالْ لە پەروەردگار پاڕایەوە کە ئومەتی محمد (ﷺ) تەرمەکەی بەخاك بسپێرن)، کاتێك (ابو موسی الاشعری)ی پاردەکەی هەڵدایەوە لەناو تابووتەکەدا تەرمەکەی دۆزیەوە، وە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمویەتی: (هەرکەسێك دانیالی دۆزیەوە، مژدەی بەهەشتی پێبدەن)، ئەو کەسەی کە بۆ یەکەمجاریش دۆزیەوەو ڕێبەری کرد پیاوێك بوو ناوی (حرقوص)بوو، ئیتر (ابو موسی) عومەری کوڕی خەتابی لەوە ئاگادار کردەوە، عومەریش نامەیەکی بۆ (ابو موسی) نار و فەرمووی: کە بەخاکی بسپێرێ و هەواڵیش بە (حرقوص) بگەیەنێ کە پێغەمبەر (ﷺ) مژدەی بەهەشتی پێداوە، خوای گەورە زاناترە .

(ابن ابی الدنیا) گێڕانەوەیەك دەباتەوە سەر (عەنبەسەی کوڕی سەعید) کە زانایەك بووە، دەفەرموێت: گوتی: (ابو موسی) لەگەڵ تەرمی (دانیالْ)دا (علیه السلام) قورئانێکی دۆزیەوە لەگەڵ گۆزەڵەیەك کەهەندێ ڕۆن و چەوری تێدابوو، بڕێك پارە و موستیلەکەی (ابو موسی) ئەوەیش بۆ (عومەر) نوسیبوو (عمر)یش بۆی نووسیبوو کە قورئانەکەمان بۆبنێرە لەگەڵ چەوریەکەدا، فەرمان بە موسوڵمان بکە کە بۆ دەرمان و شفا بەکاری بهێنن، پارەکەشیان بەسەردا دابەش بکە، موستیلەکەش بەخۆت دەبەخشین .

کاتێك (أبو موسی) تەرمەکەی دۆزیەوە و واباسیان بۆکرد کەتەرمی(دانیال) (علیه السلام) ڕێزێکی زۆری لێگرت و باوەشی پێداکر و ماچی کرد، وە هەواڵەکەی بە ووردی بۆ (عومەر) نووسی کەماڵ و پارەیەکی زۆریشی لەگەڵ تەرمەکەیدا دۆزیوەتەوەو دەگاتە دە هەزار درهەم، کەکاتی خۆی بەقەرز داویەتی بەخەڵکی و ئەو کەسەی قەرزەکەی نەگەڕاندایەتەوە نەخۆش دەکەوت، وە هەمبانەیەکیشی هەبووە (وەك جزدان) عومەر فەرمانی پێ کردن کە تەرمەکە بە ئاو (سدر)بشۆن و کفنی بکەن و لەشوێنێك بەخاکی بسپێرن کەهیچ کەسێك گۆڕەکەی نەزانێ، فەرمانی کرد ماڵ و پارەکەش ببرێت بۆ (بیت المال) بە هەمبانەکەیشەوە، موستیلەکەش کرا بە خەلأت بۆ (ابو موسی)، لە (أبو موسی)ەوە دەگێڕنەوە کەچوار کەسی دیل کەفەرمانی کوشتنیان درابوو فەرمانیان پێکرا

---

[1] ابن الجوزی، سندة المنتظم (١/٢٥٧) .

[2] مرسل ضعیف .

که له کەنار ڕووبارێك گۆڕێك هەڵبکەنن، لەو گۆڕەدا تەرمەکەیان بەخاك سپارد، پاشان چوار گۆڕ هەڵکەنە تاوانبارەکەش کوژران و جگە (ابو موسی الاشعری) کەسی تر نەیدەزانی و نازانێت شوێنی ئەو گۆڕە کوێیە .

(ابن ابی الدنیا)[1] گێڕانەوەیەکی لەباوکی (ابی زناد)ەوە[2] هێناوە کەدەفەرموێت: لەپەنجەی (ابی بردە)ی کوڕی (ابی موسی)دا موستیلەیەکم بینی نەخشی دوو شێری لەسەر هەڵکەنرابوو کەپیاوێك لەنێوانیادا بوو، دوو شێرەکە تێینالأبوون (بەلاَم زیانیان لێنەدەدا) (ابو بردە) دەفەرموێت: ئەمە موستیلەی ئەو پیاوەیە کە تەرمەکەی دۆزرایەوە و خەڵکی شارەکە پێیان وابوو کە ئەوە تەرمی (دانیاڵ)ە(علیه السلام) ڕۆژی بەخاك سپاردنەکەی (ابو موسی) موستیلەکەی پێبەخشراوە، (ابو موسی)ش کاتی خۆی لەزانایانی شارەکە پرسیارکردووە دەربارەی مانای ئەو نەخشە، ئەوانیش لە وەلاَمیدا گوتویانە: ئەو پاشایەی کە (دانیاڵ) لەسەردەمی دەسەلاَتی ئەودابوو، ئەستێرەگرەوەو زانایان هاتوونە لای پاشاکە و پێیان گوتووە: لەفلاَن شەوی فلاَن ساڵ و مانگدا منالێك لەدایك دەبێ کەدەبێتە مایەی تیاچوونی پاشاکە، پاشاکەش دەڵێت: سوێند بەخوا ئەو شەوە هەر منالێك لەدایك بێت دەیکوژم، هەرئەوان لەو شەوەدا (دانیاڵ)یان بردو (بەو ساواییيە) فڕێیان داوەتە ناو جەنگەڵ و بێشەی شێرەکانەوە، شێرو بەچکەکانیان هاشاوڵیان بۆبردووە و پاشان بوونەتە ئاشنای و ئازاریان نەداوە، دایکی منالەکە هاتووەو دیویەتی کەشێرەکان ئازاری نادەن، بەو جۆرە هێندە خوا ویستی پاراستیان تاکو باڵق بوو، ئیتر (دانیاڵ) وێنەی خۆی و شێرەکانی لەسەر ئەو موستیلەیە هەڵکەندووە تاکو هەمیشە ئەو چاکەیەی خوای گەورەی لەبەرچاوبێ کە پاراستویەتی .

## بنیاتنانەوەی ( بیت المقدس )

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَي قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَي عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّي يُحْيِي هَذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْماً أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَلْ لَبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانْظُرْ إِلَي طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ وَانْظُرْ إِلَي حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِلنَّاسِ وَانْظُرْ إِلَي الْعِظَامِ كَيْفَ نُنْشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْماً فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَي كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ **(البقرە:٢٥٩)** . **(هشام بن الکلبی)**[3] **دەفەرموێت:** **پاشان خوای گەورە وەحی کرد بۆ (ئەرمیا)(علیه السلام) وەك من پێم گەیشتووە،**

---

[1] فتوح البلدان (٥٣٣) .

[2] اسنادة حسن: إلی ابي بردة .

[3] اسنادة ضعيف: تاريخ الكبري (١ ٣١٧) .

خوای گەورە پێی فەرمووە: من دەمەوێ (بیت المقدس) تازە بکەمەوە، تۆش بەرەوئەوێ بکەرەوەڕێ، ئەویش بەڕێکەوت تاگەیشتە (بیت المقدس) بینی کەتەواو کاول و وێرانە، لەدڵی خۆیدا بەخۆی گوت: گەورەیی و پاکی هەربۆ خوایە نازانم چۆن خوای گەورە فەرمانی پێکردووم کەبێمە ئەم شارەو پێیشی ڕاگەیاندووم کەدەیەوێ ئاوەدانی بکەمەوە ؟ ئاخۆ کەی ئاوەدانی بکاتەوە؟ ئەیکەی خوای گەورە ئەم شارە پاش مردنی زیندوو دەکاتەوە ؟ ئیتر سەریدانەواند و خەوی لێکەوت گوێدرێژەکەیشی پێبووە، لەگەڵ بەرچنەیەك لەخۆراك بۆماوەی حەفتا ساڵ خوای گەورە خەوی لێخست، تا لەو ماوەیەدا (بەختنصر) پاشای کۆتایی بەدەسەلاتی هات و لەناوچووبوو، دوای ئەویش (لهرساب)ی پاشا ماوەی پاشایەتیەکەی سەد و بیست ساڵ بوو، ئینجا کوڕەکەی کەناوی (پشتاسپ)ی کوڕی (لهراسب)بوو پاشایەتی گرتەدەست، مەرگی (بەختنصر) لەدەوڵەتی خۆیدابوو، لە وولاتی شامەوە پێی ڕاگەیاند کە کاولی و وێرانەیی شاری گرتوەتەوەو شێر لەخاکی فلسطین بلاوبوونەتەوەو کردوویانەتە جەنگەڵی خۆیان و یەك مرۆڤی تێدانەماوە، ئەویش (واتا پاشاکە) لەخاکی بابل دا بانگەشەی بۆ (بنی ئیسرائیل)یەکان ڕاگەیاند کە هەرکەسێ لەوان حەزدەکات بابڕواتەوە بۆ وولاتی خۆی لەشام، کەسێکیشی لەتیرەی (داود) (علیه السلام) کرد بەپاشایان و فەرمانی پێکرد کە (بیت المقدس) ئاوەدان بکەنەوەو مزگەوتەکەیشی دروست بکەنەوە، گەڕانەوەو شارەکەیان دروست کردووە و ئاوەدانیان کردەوە، لێرەدا خوای گەورە (ئەرمینا)ی بەئاگا هێنایەوە، دیسان خەوی لێکەوتەوە تاماوەی (سی)ساڵی تر، ئینجا خوای گەورە جارێکی تر زیندوو بەئاگای کردەوە، وایزانی تەنها سەعاتێك یان کەمتر و زیاتر لەسەعاتێك (خەوی لێکەوتووە) ئەمجارەیان تەماشای کرد) شارەکە بەتەواوەتی دروست کراوەتەوەو ئاوەدانکراوەتەوە، ئیتر فەورمووی: ﴿أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾، ئیتر (بنو ئیسرائیل)یەکان تیایدا نیشتەجێبوون و خوای گەورەش ژیان و گوزارانی بۆ دابین کردن و بەردەوام بوون، تاکو لەئایینەکەی خۆیان لایاندا و خوای گەورەش ڕۆمەکانی بەسەردا زاڵ کردن و ئەوانیش لەوکاتەدا پەرتەوازە و پۆل پۆل بوون و پاشایەکی جێگیرو دامەزراوەیان نەبوو، (ابن جریر) بەم جۆرەی سەرەوە گێڕاویەتەوە، هەروەها دەگێڕێتەوەو دەڵێت: (لهراسب) پاشایەکی چاك و دادپەروەر بوو، زۆر بەچاکی چاودێری کاروباری وولاتی خۆی دەکرد و بیروڕای هەمیشە لەگەڵ ئاوەدان کردنەوەی وولات و شار و پرد و ڕێگەوبان دابوو، بەلام پیربوونی خۆی و دەسەلاتەکەی کەماوەی سەد و پەنجا ساڵێك پاشایەتیکرد، پلەی

پاشایەتی وازلێهێنا و بەخشی بە (پشتاسب)ی کوڕی خۆی، لەسەردەمی ئەویش دا ئاگرپەرستیٚ هاتەکایەوە، بەهۆی پیاوێکەوە کەناوی (زەرادەشت)بوو، ئەم پیاوە هاوڕێی (ئەرمیا) (علیه السلام) بوو، بەلاّم ڕەقی لێهەڵگرت و لێی جیابوەوە، لەدەستی ڕایکرد، بەلاّم لەخاکی (ئەزربیجان) دیسان پێی گەیشتەوەو ئەو ئاینی ئاگرپەرستیەی کەخۆی دایهێنابوو بۆ (پشتاسپ)ی پاشای باس کرد، پاشاش بەئاینێکی باشی زانی و قبوڵی کرد و خەڵکەکەش دژایەتییان کرد، بەلاّم ئەوان ژمارەیەکی زۆریان لەو خەڵکە کوشت و برکرد، دوای (پشتاسپ)یش (بەهەمان کوڕی پشتاسپ) بوو بەپاشایان کە یەکێکە لەپاشا ناودارەکانی فارسەکان و لەڕیزی پاڵەواناندا باس ئەکریٚ، (بەختنصر) جێگری هەریەکە لەو سیٚ پاشایانەی لەکاتی جیاجیایاندا کردووەو تەمەنی گەلێك درێژبووە، بە کورتی: ئەوکەسەی کە (ابن جریر) باسیدەکات کە بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتووەو بەسەرسامی لەخۆی پرسیوە ئاخۆ چۆن خوای گەورە ئەو شارە کاولە ئاوەدان دەکاتەوە ؟ (ئەرمینا)بووە(علیه السلام) چونکە کەسێکی تریش هەرهەمان گێڕانەوەیان هێناوە کەبریتین لە (وهب کوڕی منبە)[1] وە (عبدالله بن عبید بن عمیر)[2]، (علی)[3]، (عبدالله بن سلام)[4]، (ابن عباس)[5]، (الحسن)[6]، بەلاّم هەندێکی تر وا دەگێڕنەوە کە ئەو پیاوە (عوزەیر)بووە (علیه السلام) ئەوانەی بۆچوونیان وایە بریتین لە (قتادە)[7]، (السدی)[8] (سلێمان بن بریدە)[9]، ئەم بۆچوونەی دووەمیشیان باوترە، خوا گەورە زاناترە .

---

[1] حسن الاسناد: ابن جریر (٢٩/٣/٣) .

[2] صحیح: ابن ابي حاتم (٢٦٤٣)، ابن جریر (٣/ج٣/٢٩) .

[3] صحیح / ابن جریر (٢٨/٣/٣)، ابن ابي حاتم (٢٦٤١) .

[4] ضعیف ابن عساكر، تاریخ دمشق (٣٢٠/٤٠) .

[5] ضعیف: ابن جریر (٣٢٠/٤٠) .

[6] ابن ابي حاتم، بێبێ اسناد هێناویەتی .

[7] حسن الاسناد: ابن جریر (٣٢٠/٤٠) .

[8] حسن الاسناد: ابن جریر (٣٢٠/٤٠) .

[9] ضعیف ابن جریر (٣٢٠/٤٠) .

## عوزەیر (درووود و سلاوی خوای لەسەر بێت)

(ابن عساکر)[1] دەفەرموێت: ناوی عوزەیری کوڕی جەروەیە، وتراوە عوزەیر کوڕی سورەیق کوڕی هودیا کوڕی ایوب کوڕی درزنا کوڕی عومەری کوڕی تەقی کوڕی ئەسبوع کوڕی فەنحاص کوڕی عازر کوڕی هاڕون کوڕی عمرانە، وتراوە: عوزەیر کوڕی سەروخایە، لە هەندێ گێڕانەوەدا هاتووە کە گۆڕەکەی لەدیمەشقە، لەگێڕانەوەیەکی تری (ابن عباس)دا بە (مرفوع)ی هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: نازانم ئاخۆ عوزیرە بەیعەتی پێغەمبەرایەتی بەخوای گەورە داوە یان نا، وە ناشزانم ئاخۆ عوزەیر پێغەمبەر بووە یان نا [2].

لە گێڕانەوەیەکی تردا کە دەگاتەوە بە (ابن عباس)[3] دەفەرموێت: عوزەیر یەکێك بوە لەوانەی (بەختنصر) چارەی نەویستووەو جوێنی پێداوە، کاتێك عوزیر لاوبووە، پاش ئەوەی تەمەنی گەیشتۆتە چلْ ساڵ، خوای گەورە حیکمەت و زانیاری پێبەخشیوە، کەسیش نەبووە کە لە ئەو چاکتر تەوڕاتی لەبەربوبێ بە ڕەوانی، بە ڕادەیەك پیاوچاك بووە کەخوای گەورە ناوی ئەوی لەگەڵ ناوی پێغەمبەراندا بردووە، بەتایبەتیش کاتێك پرسیاری لەخوای گەورە کردووە دەربارەی (قەدەر)، بەڵام ئەم گێڕانەوەیە لاواز و پچرپچرە و بەڕاست و دروست دانانرێت، خوای گەورە زاناترە [4].

سەبارەت بە پێغەمبەرایەتی عوزیریش(علیه السلام) واباوە کەیەکێك بوە لەو پێغەمبەرانەی کە خوای گەورە ناردویەتی بە سەر (بنی ئیسرائیل)یەکان کە لەنێوان (داود و سلیمان) و (زەکەریا و یەحیا)دابووە(علیه السلام) جاکاتێك کەس نەما لە بنی ئیسرائیلیەکان کەتەوراتی لەبەربێ، خوای گەورە ئیلهامی بۆکرد کەتەوڕت لەبەر بکات و بۆ بنی ئیسرائیلیەکانی بخوێنێتەوە، (وهب کوڕی منبە) دەفەرموێت: خوای گەورە فریشتەیەکی نارد کە کلۆ نورێکی پێبوو هەڵیدایە ناو دڵی عوزەیرەوە، بەمەش پیت بەپیتی تەوڕاتی لەبەرکرد هەتا تەواوبوو، (ابن عساکر)[5] دیباتەوە سەر (ابن عباس) کە پرسیاری لە (عبدالله کوڕی سلام) کردووە دەربارەی مانای ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت:

---

[1] تاریخ ابن عساکر (٤٠/٣١٧) .

[2] ضعیف: تاریخ ابن عساکر (٤٠/٣١٧)؛ ابو داود (٤٦٧٤)، البیهقي (٨/٣٢٩)، ابي دواد (٢٢١٧) .

[3] ضعیف: تاریخ ابن عساکر (٤٠/٣١٨) .

[4] طیرانتەوەیەکی تري (موضوع) لەدوای ئەم گێڕانەوەیەی سەرەوە هاتووە، کە بەگرنجاومان نەزانی دایبنێنەوە، لە مێژووی ابن عساکر (٤٠/٣٢٢)دا هاتووە، وەرگێڕ .

[5] ضعیف: تاریخ دمشق (٤٠/٣٢٦) .

﴿وَقَالَتِ الْيَهُودُ عُزَيْرٌ ابْنُ اللَّهِ﴾(التوبه/٣٠) كه بۆچی یەهودیەکان وادەڵێن ؟ له وەڵامدا فەرمووی: ئەوان دەیانگوت (موسا) (علیه السلام) لەکتێبی نووسراودا تەوراتی بەسەردا دەخوێندنەوەو نەیدەتوانی لەبەر بۆیان بخوێنێ، بەڵام عوزەیر (علیه السلام) بەبێ نووسراو لەبەر بۆی خوێندن، لەبەرئەوە هەندێ لە یەهودیەکان ئەو گومانە خراپەیان برد و ئاوایان گوت: لەبەرئەوە هەندێ لە زانایان فەرموویانە بەدوایەکدا گەیاندنی تەورات بە شێوەیەکی رێك و پێك لەسەردەمی عوزەیردا پچڕانی تێکەوتووە، ئەمەش تەواوە ئەگەر عوزەیر پێغەمبەر نەبووبێت، هەروەها (مقاتل) گێڕانەوەیەك دەباتەوە سەر (عطاء بن ابی رباح) كە دەفەرموێت: لەو سەردەمەدا (نۆ) ڕووداوی گرنگ ڕویانداوە كە ئەمانەن: پاشایەتی (بەختنصر)، باخچەگەلی (صنعاء)، باخچەگەلی (سبأ)، (اصحاب الاخدود)، ڕووداوی (حاصورا)، (أصحاب الكهف)، (أصحاب الفيل)، شاری (انطاكية)، ڕووداوی (تبع) .

(ابن اسحاق) گێڕانەوەیەك دەباتەوە سەر (الحسن) كە دەفەرموێت: (عوزەیر و بەختنصر لەیەك سەردەم دا ژیاون، لە فەرموودەی پێغەمبەرشیماندا (ﷺ) هاتووە كە فەرموویەتی: (انا لولي الناس بابن مريم، الانبياء أولاد علات، وليس بيني وبينه نبي)[1]

واتە: بەم پێیە هیچ پێغەمبەرێك لەنێوان (عیسا و محمد)دا نیە (ﷺ) (وهب كوڕی منبه) دەفەرموێت: عوزەیر لەنێوان سولەیمان و عیسادا بووە((علیه السلام) (ابن عساكر)یش[2] گێڕانەوەیەك دەباتەوە سەر (أنس) و (عگاو كوڕيالسائب) كە عوزەیر لەسەردەمی موسای كوڕی عمران دا (علیه السلام) بووە، پرسیاری لە ئەو كرددوە دەربارەی (قەدەر) ئەویش سەری خۆی هەڵگرتووە و بەدەم ڕۆیشتنەوە فەرموویەتی: (سەد جار مردن باشترە لەزەلیل بوونێكی یەك ساتی).

بەڵام ئەوەیان كە (ابن عساكر)[3] وهەندێكی تر واباس دەكەن كەگوایە كاتێك عوزەیر پرسیاری كردووە دەبارەی (قەدەر) ئیتر ناوی لەناو ناوی پێغەمبەراندا سڕاوەتەوە، ئەوە ناڕاستەو لاوازەو جێگەی گفتوگۆیەو دیارە لەئیسرائیلیاتەوە وەرگیراوە .

(عبدالرزاق)[4] و قوتەیبە گێڕانەوەیەكیان بردۆتەوە سەر (نوف البكالي) كە دەفەرموێت: عوزەیر لەخوای گەورە پاڕایەوەو فەرمووی پەروەردگارا تۆ خۆت خەڵكی

---

[1] متفق علية: البخاري (٣٤٤٢)، مسلم (٦٠٨٣) .

[2] ابن عساكر: تاريخ دمشق (٣٣٧/٤٠) .

[3] ضعيف: تاريخ دمشق (٣٣٧/٤٠) .

[4] حسن الاسناد: تأريخ ابم عساكر (٣٣٥/٤٠) .

دروست دەکەیت کەچی هەندێکیان گومڕا دەکەیت و هەندێکیان ڕێنومادەکرێت ؟ پێی گوترا: بۆچی لەوە ڕەخنەت هەیە و ناڕازیت ؟ لە قسەکەی پەشیمان بوەوە، ئەم جارە پێی گوترا: یان واز لەو ڕەخنە و پرسیار بێنە یان ناوت لەڕیزی پێغەمبەران دەکوژێنمەوە، من پرس بەکەس ناکەم لەو شتانەدا کە دەیانکەم، ئەو دروست کراوانە خۆیان پرسیار دەکەن)، ئەم قسەیەش پێچەوانە نیە لەگەڵ لێسەندنەوەی پلەی پێغەمبەرایەتیدا، بەلاَم ئەو ڕێگەی تری لەبەردەمدا بووە، کە پەشیمان بوەتەوە، لەبەرئەوەش ئەگەر پێغەمبەر بووبێ ناوی نەسڕاوەتەوە، چونکە پەشیمان بوەتەوە، خوای گەورە زاناترە لە گێڕانەوەیەکی تردا کە گەیشتوەتەوە بە (ابو هريره) دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (یەکێك لە پێغەمبەران لایدایە بن سێبەری دارێك، مێرولەیەك قاچی گەست، فەرمانی کرد شتەکانیان لابرد و لەژێر شتەکاندا مێرولەکەی دەرهێنا و پاشان فەرمانی کرد بەئاگر مێرولەکە بسوتێنن، خوای گەورە وەحی بۆنارد و فەرمووی: تەنها بۆ مێروولەیەك ؟ [1]، واتا: هەر بۆ مێرولەیەك ئاوات کرد ؟ لە (ابن عباس) و (حسن البصري)یەوە دەگێڕنەوە کە فەرموویانە: ئەو پێغەمبەرەش عوزەیربووە(عليه السلام) خوای گەورە زاناترە .

---

[1] متفق علية: البخاري (٣٠١٩)، مسلم (٥٨١٠)، ابو داود (٥٢٦٦)، النسائي (٢١١/٧)، ابن ماجة (٣٢٢٥).

## ﴿زەکەریا و یەحیا (دروود و سڵاوی خوایان لەسەر بێت)﴾

**خوای گەورە دەفەرموێت:** (بسم الله الرحمن الرحيم) ﴿كهيعص ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا .... وَسَلامٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيّاً﴾(مريم:١ –١٥)، **هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِنْدَهَا رِزْقاً قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ .......... وَاذْكُرْ رَبَّكَ كَثِيراً وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾**(ال عمران/٣٧–٤١)، خوای گەورە لە سورەتی (الانياء) ئایەتی (٨٩–٩٠) و سورەتی (الانعام) ئایەتی (٨٥)دا باسی زەکەریا و یەحیای فەرمووە** (عليه السلام)

**(ابن عساكر)[1] لەکتێبی (التأريخ)ەکەیدا دەفەرموێت: زەکەریا کوڕی برخیایە، وتراوە: زەکەریا کوڕی (دان)ە، هەروەها گوتراوە کوڕی لندن کوڕی مسلم کوڕی صدوق کوڕی حەشبان کوڕی دادو کوڕی سلێمانی کوڕی صدیقە کوڕی بەرخیا کوڕی بلعطة کوڕی ناحور کوڕی شلوم کوڕی بەهفاشاط کوڕی ئینامن کوڕی ڕەحبعام کوڕی داودی پێغەمبەرە(عليه السلام) وە لە (بنی ئیسرائیلی)یەکانە چوەتە دیمەشق بۆ دۆزینەوەی (یەحیا)ی کوڕی، وتراوە: لەو کاتەدا لەدیمەشق بووە کە یەحیای کوڕی شەهیدکراوە، خوای گەورە زاناترە .**

**دەربارەی پشت و بن و بنەچەی شتی تریش گوتراوە، ناوەکەیشی بەسێ جۆر خوێندراوەتەوە، (زەکەریا، زەکەریە، زیکری)، مەبەست ئەوەیە: خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) کردووە تاکو هەواڵی ڕوداوی ژیانی (زەکەریا) (عليه السلام) بەخەڵکی ڕابگەیەنێت، کەچۆن خوای گەورە منداڵی پێبەخشی، ئەگەر چی پیر و بەساڵاچووش بوو، ژنەکەیشی نەزۆرك بووە، هەر لەگەنجێتییەوە چ جای ئەوەی کەدواتر پیر بووەو چوەتە ساڵانی نائومێدییەوە لەزگ و زادا، ئەمەش بۆئەوەی کەخەڵکی لەمنداڵ بوونی خۆیان نائومێدنەبن و پشتیان بەڕەحم و بەزەیی خوا ببەستن، خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِدَاءً خَفِيّاً﴾

**(قتادە)[2] خ دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرموێت: خوای گەورە دڵی پاك و بێگەرد دەناسێ و گوێی لەهەموو دەنگێکە ئەگەرچی ئێمەش نەبستین، واتا: ئاگای لەنیازی دڵتانە .**

---

[1] ابن عساكر: تاريخ (١٩/٤٨) .

[2] حسن الاسناد: ابن جرير (٩/ج١٦/٤٥) .

هەندێ لەزانایانی پێشین فەرمویانە: (زەکەریا) (علیه السلام)لەشەودا هەڵدەستایەوەو لەخوای گەورە دەپاڕایەوە، بە پاڕانەوەیەك هەرکەس لەدەوروبەی بوایە دەهاتە جۆش و خروش، فەرمووی ئەی پەروەردگارا ! .... ئەی پەروەردگارا ... ئەی پەروەردگارا .... خوای گەورەش فەرمووی: (لبیك ... لبیك . . لبیك)، ئینجا فەرمووی: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي﴾ واتە: ئێسکی لەشم ناسك بوەتەوە (لەپیریدا) ﴿وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْباً﴾ سەریشم هەڵگەڕاوە لەپیریدا، وەك چۆن ئاگر بەردەیتەدار ئاوها سپیبوونی قژم بڵێسەی داوە، واباس دەکەن هەردوو جۆرە لاوازیەکەی (دەروونی و لاشەیی) لەخۆیدا هەست پێکردووە، ئەوەتا بەلەش پیرو بەسالاچووەو پەککەوتەیە، لەڕووی دەرونیشەوە کەس شك نابات کە میراتگری پێغەمبەرایەتیەکەی بێت و تەمەنیشی بۆ منالْ بوون نابێ و تێپەڕیوەو ژنەکەیشی نەزۆك بووەو ئێستاش بەتەمەنە و ئۆمێدی منالبوونی نەماوە، مەگەر هەر تەنها بەموعجیزەی خوایی منداڵیان ببێ، بۆیە پەنادەباتە بەر پاڕانەوەی بەدڵ و بەکوڵ لەشەودا بۆ پەروەردگاری میهرەبان تاکو فریای بکەوێت و نزاکانی وەربگرێ، تاکو منداڵێکی چاك و خواپەرستی پێبدات کەپاش مردنی خۆی کاروباری ڕێنمایی (بنی ئیسرائیل) بگرێتە ئەستۆی نەبادا بنی ئیسرائیلیەکان لەئاینی لادەن و خواپەرستی بخەنەلاوە، منالێکم پێببەخشە میراتی پێغەمبەراتی و لای تۆش زۆر بەڕێز و خۆشەویستە، خوایە منالێکم بدەرێ کەخۆت لێی ڕازیبی، خواپەرست بێ .

(شیعەکان) باوەڕیان وایە کە (زەکەریا) (علیه السلام) داوای لەخوا کردووە کە کوڕێکی پێبدات کەمیراتگری بێت لەسامان و ماڵەکەیدا، بەلام ئەمە هەڵەیە، چونکە:

**یەکەم:** خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَوَرِثَ سُلَيْمَانُ دَاوُدَ﴾(النمل:١٦)، واتە: (سلێمان) میراتی داودی گرت لە پێغەمبەرایەتی کردندا، نەك لەماڵ و سامان دا، وە ئەو فەرموودەی پێغەمبەریشمان (ﷺ) هێنا کە فەرموویەتی: (ئێمەی پێغەمبەران میراتمان ناکەوێت، ئەوەی لەپاشمان بەجێدەمێنێ دەکرێتە خێر)[1] .

هەروەها لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (ئێمەی پێغەمبەران میراتمان ناکەوێ)، واتا: میراتی خۆمان بۆ کەس و کارمان نیە و خۆشمان بۆمان نیە میراتی پێغەمبەرانی تر وەربگرین، جگە لەمیراتی مەعنەوی کە پێغەمبەرایەتیە، ئەمەشیان خاڵی دووەمە .

---

[1] لەژیانی (سلیمان) و (داود)دا ئەم فەرموودەیەمان (تخریج) کردووە .

**سێهەم:** دنیا لای پێغەمبەران زۆر کەمتر و بێبەهاترە لەکاری قیامەتی و پێغەمبەرایەتی، نایانەوێ گەنجینەو سامانی دنیایی کەڵەکە بکەن بۆ خۆیان یان بۆ دوای خۆیان، بەڵکو داوای منداڵ و میراتگریشیان لەخوا کردووە بۆ میراتی مەعنەوی بووە، کەوکەسێك هەبێ لەدوای خۆی کاری پێغەمبەرایەتی ئەنجام بدات و شەریعەتی خوایی بەردەوام بی لەسەر زەویدا .

**چوارەم:** (زەکەریا) (عليه السلام) خۆی پیاوێکی دەوڵەمەند نەبووە تاکو میراتی هەبێت، بەڵکو ئیشی دارتاشی دەکرد وەبەوە خۆی و خێزانەکەی دەژیاند، هەروەها (داود)یش (عليه السلام) هەربەدەستی خۆی کاسبی دەکردو ژیانی خۆی و خێزانەکەی مسۆگەر دەکرد

پێشەوا (أحمد)[1] فەرمودەیەکی بردۆتەوە سەر (ابو هريره) كه پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (زەکەریا دارتاش بووە)، لێرەدا واتای ئەو ئایەتانە دەهێنین کەباس لە (زەکەریا) دەکەن، خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەی زەکەریا ئێمە مژدەی ئەوەت دەدەینێ کە کوڕێکت دەبێ ناوی یەحیایە، پێش ئەو کەس ئەو ناوەی نەبووە)؛ هەر خوای گەورە بەئایەتێکی دواتر تەفسیری ئەو ئایەتی کردووەو فەرمویەتی: (فریشتەکە بانگی زەکەریای کرد، کاتێك زەکەریا لەمیحرابدا نوێژی دەکرد، فەرمووی: خوای گەورە مژدەت دەداتێ بە لەدایکبوونی یەحیا، کەسێکە لەلایەن خواوە لەدوی دەدرێ، واتا: پشتیوانی ڕاستێتی ئەو دەکرێ کە بەڕێز و پایەدار و بێتاوانەو یەکێکە لەپێغەمبەرە چاکەکان)، کاتێك ئەم مژدەیەی پێدرا لەو ڕووەوە سەرسام ماو ویستی دڵنیاتربێ، بۆیە فەرموی: (پەروەردگارا چۆن من منداڵم دەبێ لەکاتێکدا بەگەنجیش هاوسەرەکەم نەزۆرك بووەو خۆیشم پیربووم و بەساڵا چووم ؟)، وتراوە: (زەکەریا) (عليه السلام) لەو کاتەدا تەمەنی حەفتاو حەوت ساڵ یان زیاترە بووە، خوای گەورە زاناترە .

کاتی خۆیشی (ابراهيم خليل(عليه السلام) مژدەی پێدرا کەخوای گەورە کوڕێکی پێئەبەخشێ کە (ئیسماعیل) بوو، بەڵام (ابراهيم) (عليه السلام) تەمەنی گەورەبوو، بۆیە بەسەرسامی و سوپاسەوە فەرمووی: (ئایا مژدەی ئەوەم پێدەدەی کە منالم دەبێت، وێڕای ئەوەی بەساڵاچووم، چۆن و بەچی مژدەم پێدەدەی ؟)[2]، وە ساراخانی هاوسەریشی فەرمووی: (ئەیەڕۆ، ئایا بەم سەری پیرییە، کە پیرەژنێکم منالم دەبێت ؟ خۆ ئەوە پیاوەکەشمە کە پیرەمێردێکە، بەڕاستی ئەوە شتێکی سەیرە . . . گوتیان ئەی سارا

---

[1] صحيح: المسند (٢/٢٩٦)، مسلم (٦١١٢)، ابن ماجه (٢١٥٠) .

[2] سورەتی (الحجر) ئایەتی (٥٤) .

ئایا فەرمانی خوات بەلاوە مایەی سەرسامییە ؟ ڕەحمەت و بەرەکەتی خواتان لەسەربێ ئەی (ئەهلی بیت) خۆ خوای گەورە سوپاسکراو و گەورەیە [1] .

(زەکەریا)ش (علیه السلام) هەر لەو ڕوانگەیەوە سەرسامانە پرسیاری کرد و فریشتەکەش بە فەرمانی خوای گەورە وەڵامیدایەوە و فەرمووی: (لەگەڵ ئەوەشدا کەخۆت پیرو ژنەکەیشت نەزۆك پیرەژنە هێشتا ئەوە بەلای خواوە کارێکی زۆر سانایە)، خوای گەورە بۆ دڵنیاکردنەوە و بیرهاتنەوەش پێی فەرموو: (ئەدی پێشتر من تۆیشم دروست کردووە کەهیچ نەبوویت واتا: نەبووبوویت) ئیدی بۆچی ئەوەیان ئاسان نیە کە منداڵت پێبدەم، بەبێئەوەی حساب بۆ تەمەن و نزۆکیتان بکەم .

(وەڵاممان)دایەوە (واتا: نزای زەکەریامان وەرگرت)، وە یەحیامان پێبەخشی، وە ژنەکەیشمان بۆ چاك کرد (واتا: ژنی زەکەریا) ئەوان کەسانێکی خێرومەند و خێرابوون لەکاری خێرخوازیدا، وە بەهانی ئێمە و لەترسی ئێمە هەمیشە دەم بەنزابوون، ئەوان جاران و ئێستاش زۆر بەرانبەرمان خاشع بوون)[2] .

دەربارەی چاك کردنی ژنەکەی ئەوەیە کەخولی بێنوێژی بەسەردا نەدەهات و هەمیشە هەرپاك بووە، خوای گەورە خولی بێنوێژی بۆ گەڕاندەوەو چاکی کردەوە، وتراوە: زمانی تەواونەبووە لە قسەکرندا و کەمێك گیراوی تێدابووە، بەڵام کاتێك مژدەی منال بوونی پێدرا، پاڕایەوە لەخوای گەورە کە دڵنیایی بکات و دڵی خۆش بکات بەنیشانە و نهێنییەکی پێش وەخت، کە هێمابێت بۆ دیاریکردنی ئەو کاتەی کە بچێتە لای هاوسەرەکەی و کاتەکەش لەباربێ بۆ دروست بوونی مندالەکەیان، وە فەرمووی: ﴿قَالَ رَبِّ اجْعَلْ لِي آيَةً﴾ (مريم:١٠)، خوای گەورەش وەڵامیدایەوە (بە وەحی) فەرمووی: نیشانە و بەڵگە ئەوەیە کە سێ ڕۆژی دوایەك قسە لەگەڵ کەسدا ناکەیت)، واتە: نیشانەکە ئەوەیە کە نابێ سێ ڕۆژی لەسەریەك لە ئاماژە بەولاوە قسە نەکەیت و بەوەش باری تەندروستیت لەو ماوەیەدا بەتەواوەتی چاك دەبێتەوەو مەزاجت ساخ و بێ لەکە دەبێ، پێکهاتەی لەشت ڕێك دەبێتەوە، لەو ماوەیەدا بەدل زۆر یادی خوا بکە و بەدەروون و دلێکی بێگەردەوە ئێوارەو بەیانیان خواپەرستی بکەن (بەتایبەتی و بەچڕوپڕی) جا کە ئەم نیشانە و مژدەیەی پێدرا لەمیحرابەکەی بەدل خۆشی هاتە خوارەوە (هاتە دەرەوە) بۆناو خێزان و کەسەکانی .

---

[1] سورەتی (هود) ئایەتی (٧٢-٧٣) .

[2] سورەتی (الانبیاء) ئایەتی (٩٠) .

وادیارە وەحییەکە لێرەدا بەشێوەی نهێنی و شاراوە بووە، یاخود بە نووسراو بووە لەلایەن خواوە، هەروەکو (المجاهد) و (السدی) [1] وایان فەرمووە، یاخود بەئاماژە بووە، هەروەکو (مجاهد)[1] ئەوەشیانی فەرمووە لەگەڵ (وهب) و (القتادە)[1] وتویانە: زمانی گیراوە بەبێئەوەی هیچ نەخۆشییەکی لەگەلدا بوبێت، وە (زید)[1] فەرموویەتی: ئەو دەیخوێندەوە و تەسبیحاتی خوای دەکرد، بەلام نەیدەتوانی لەگەڵ کەسدا (نطق) قسە بکات .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا يَحْيَى خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيّاً﴾(مریم:١٢)، بەو پێیەی خوای گەورە مژدەیدا بە (زەکەریا) ((علیه السلام) هەرواش منداڵێکی پێبەخشی کە ناوی (یەحیا)یە، هەر ئەو خوایەش هونەری نوسین و حیکمەتی فێری یەحیا کردووە(علیه السلام) لەکاتێکدا کە (یەحیا) هێشتا منداڵ بووە .

(عبدالله کوڕی مبارك) [٢] دەفەرموێت: (معمر) خ دەفەرموێت: منداڵان هاتن بە یەحیای کوڕی زەکەریایان گوت: وەرە یاریمان لەگەڵ بکە، ئەویش فەرمووی: یاری رەوشتی ئێمە نییە، دەلێت: ئەوەیە مانای ئەو ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيّاً﴾، بەلام دەربارەی ﴿وَحَنَاناً مِنْ لَدُنَّا﴾ش (ابن جریر)[٣] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (ابن عباس) کە فەرموویەتی: نازانم (الحنان) لەو ئایەتەدا مانای پیە ؟ وە دەگێڕنەوە لە (ابن عباس) و (مجاهد) و (عکرمە) و (قتادە) و (الضحاك)ەوە، کە ئایەتەکە مانای ئەوەیە: ڕەحمەت لە ئیمەوە بوو، کە ڕەحممان کرد بە (زەکەریا) و ئەو کوڕەمان پیبەخشی، لە (عکرمە)[٤]ەوە (الحنان) مانای خۆشەویستی بۆدەربڕینە، بەجۆرێك کە دایکی و باوکی زۆر خۆشیان بوێ و ئەویش وابێت و گوێڕایەڵییان بکات، وە (الزکاة) لەئایەتەکەدا مانای پاکی و دووری مەخلوقەکانە لەکەم و کورتی و ناتەواوی، (التقوی)ش واتا: گویڕایەڵی خوای گەورەو دورکەوتنەوە لەو شتانەی کەخوا پێی ناخۆشە .

ئینجا خوای گەورە باس لەوە دەکات کە (یەحیا) (علیه السلام) هند گویڕایەلی باوك و دایکی بووەو ئەفەرمویت: ﴿وَبَرّاً بِوَالِدَيْهِ وَلَمْ يَكُنْ جَبَّاراً عَصِيّاً﴾، پاشان دەفەرمویت: ﴿وَسَلامٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيّاً﴾، خوای گەورە باس لەو سێ کاتە گرنگە دەکات کە سلاوی

[١] حسن الاسناد: ابن جریر ( ٩، ج١٦، ٥٤ ) .
[٢] ضعیف إلیه: ابن جریر ( ٩، ج١٦، ٥٦ ) .
[٣] ابن جریر ( ٩، ج١٦، ٥٥ )، بدالرزا (١٧٤٧) .
[٤] ضعیف الاسناد: ابن جریر ( ٩، ج١٦، ٥٦ ) .

خۆی له (یەحیا)(علیه السلام) دەکات، ئەو سێ کاتە دەروازەی چوونی مرۆڤە لە جیهانێکەوە بۆ جیهانێکی تر تاکو یەکلایی کردنەوەی دواهەمین چارەنووسی مرۆڤ، پیردەبێ و دەمرێ، نازانێت چارەنووسی بەرەو کوێیە، تاکو دەمرێت، مردنەکەی دەروازەیەکی ترە بۆ جیهانی بەرزەخ، کە ئەمەش هەر کەپرێکی حەوانەوەی کاتییە و دیسان جێهانێکی نوێی لە بەردەم دایە، لەناو خزم و کەوس و کارو دۆست و برادەرو لەناو کۆشك و خانووبەرەی ڕازاوەو ئاوەدان کردنەوە بەرەو گۆڕستانی پڕ لەتەرم و ئێسك و پروسك و ترسناك بەڕێ دەخرێت، جا گریاوبێت یان دەم بەخەندە، ڕەزیل بوبێت یان بەخشندە، هەژاربوبێت یان ساماندار، بێناوبوبێ یاخود ناودار، لەش ساغ بوبێ یان دەردەدار، ئازابوبێت یان لەش بەبار، هەردەبێ لەگۆڕەوە بچێتەوە لای پەروەردگار، دەبێت چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بکات بۆ کەرەنالێدانی زیندووبوونەوەو ئامادەیی بەردەمی خوای بەخشندەو میهرەبان، کەواتە هەر سێ قۆناغی هاتنە دنیاو مردن و زیندووبوونەوە سێ قۆناغی زۆر گرنگن، لەهەرکام لەو سێ قۆناغەدا خوای گەورە سڵاو لە (یەحیا) دەکات (علیه السلام) دیارە سڵاوی خوای گەورەش لەو کاتانەدا گەورەترین بەخشیشە بۆ ئادەمیزاد و بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و پاکژی و پیرۆزی ئەو پێغەمبەرە مەزنە کە (یەحیا)یە .

(سعید کوڕی ابی عروبە)[1] گێڕانەوەیەك دەباتەوە سەر (الحسن) کە دەفەرموێت: یەحیا و عیسی (علیه السلام) بەیەکتری گەیشتن، (عیسا) (علیه السلام) لە (یەحیا) (علیه السلام) داوای کرد کەداوای لێخۆشبوونی بۆبکات لەلای خوای گەورەو فەرمووی: تۆش لەمن باشتری، بەڵام (یەحیا) (علیه السلام) فەرمووی: تۆ داوای لێخۆش بوونم لەلای خوای گەورە بۆبکە، چونکە تۆ لەمن باشتریت، (عیسا) (علیه السلام) فەرمووی: تۆ لە من باشتری، چونکە من خۆم سڵاوم لەخۆم کردووە، بەڵام تۆ خوای گەورە سڵاوی لێکردویت، بەخوا ئەو (فضل)ی ئەوی زانیوە .

وە دەربارەی ئایەتەکەی تریش کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسَيِّداً وَحَصُوراً وَنَبِيّاً مِنَ الصَّالِحِينَ﴾، واتراوە: (الحصور)، واتا: ئەو کەسەی ناچێتەلای ژن، وەك گەمارۆی خستبێتەسەر خۆی، وە مانای تریشی بۆ وتراوە، بەڵام ئەم مانایە هەڵبگیرێت، بەپێی دەقی ئەو پاڕانەوەیەی کە خوای گەورە (سەرزمانی ئەو دەفەرموێت: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾(ال عمران:٣٨)

---

[1] حسن الاسناد: ابن جرير ( ٩، ج١٦، ٥٩ ) .

پێشەوا (احمد)یش [1] گێڕانەوەیەك بردوەتەوە سەر (ابن عباس) كە پێغەمبەر دەفەرموێت: (هیچ ئادەمیزادێك نییە كە هەڵەو تاوانێكی نەبێ‌. یان گومانی بۆ تاوانێك نەچووبێ‌، جگە لە یەحیای كوڕی زەكەریا، هیچ كەسێكیش بۆی نییە بڵێ‌ من لەیونسی كوڕی مەتی باشترم) .

(ابن وهب)یش[2] گێڕانەوەیەك دەباتەوە سەر (ابن شهاب) دەفەرموێت: ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دەرەوە گوێی لێبوو كە هاوەڵەكانی باسی پلەوپایەی پێغەمبەرەكانیان دەكرد، یەكێكیان دەیگوت: موسی گۆیندەی خوایە، ئەویدی دەیگوتن: عیسا ڕۆحی خودا و گوێندەیەتی یەكێكی تر دەیگوت: (ابراهیم) خەلیلی خوایە، لێرەدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەی شەهید لەكوێیە ؟ شەهید لەكوێیە ؟ كەبەرگی مووی لەبەردەكرد و گەڵای دارو درەختی دەخوارد لەترسی ئەوەی نەبادا تووشی گوناه ببێت)، (ابن وهب) دەفەرموێت: مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) لە شەهید (یەحیا)یە(علیه السلام) وە (محمد كوڕی ئیسحاق)یش گێڕاویەتەوە [3] .

لەگێڕانەوەیەكی تردا كەبراوەتەوە سەر (ابن العاص) كەدەفەرموێت: گوێم لێبوو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەریەكە لە ئادەمیزادەكان لەڕۆژی دواییدا دێن و هەریەكەیان گوناهی هەیە، بەڵام ئەوە لەیەحیای كوڕی زەكەریادا نییە، وە (عبدالرزاق)یش[4] دەیباتەوە سەر (ابن عساكر)[5] تا دەگاتەوە بە (عبدالله كوڕی عەمرو) كە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هیچ كەسێك نیە كەخوای گەورە بەگوناه و تاوانێكەوە نەیبینێ‌، جگە لە یەحیای كوڕی زەكەریا)، پاشان ئەو ئایەتەی خوێند ﴿وَسَيِّداً وَحَصُوراً﴾، ئینجا هەندێ‌ لەخوڵی سەرزەوی بەرزكردەوەو فەرمووی: (هیچ شتێكی لەگەڵ‌ خۆیدا نەبرد مەگەر شتێكی وەك ئەمە (بێ‌ بەهاو كەم) كەرچی دوایش بەسەربڕین سەربڕرا) .

وە لەگێڕانەوەكەش ناوی (ابن البشر) هاتووە كە هەموو گێڕانەوەیەك ئەم پیاوەی تێدابێ‌ بەلاواز دەدەنرێ‌، چونكە درۆی دراوەتە پاڵ‌، وە لەڕێگەی (ابی داود الطیالیسي)یەوە گێڕانەوەیەك براوەتەسەر (ابی سعید) كە دەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

---

[1] ضعيف: المسند (١/٢٥٤)، (٧/٤٦٨) .

[2] ضعيف: ابن عساكر .

[3] ضعيف الاسناد: ابن جرير ( ٩، ج١٦: ٥٨ ) .

[4] رجالة ثقات: ابن جرير ( ٩، ج١٦، ٥٨ )، عبدالرزاق (١٧٥١) .

[5] صحيح: موقوفاً: ابن جرير تاريخ دمشق ( ٩، ج١٦، ٥٨ ) .

(حسن وحسين گەورەی لاوانی بەهەشتن، جگە لەدوو پورزاکانیان یەحیاو عیسا(علیه السلام)[1] .

(ابو نعیم الحافظ الاصفهانی)[2] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (احمد کوڕی ابی الحواری) کەدەڵێت: (ابا سلیمان) گوتی: عیسای کوڕی مەریەم و یەحیای کوڕی زەکەریا پیاسەیان دەکرد لەناو یەحیا بەر ژنێك کەوت، (عیسا) (علیه السلام) فەرمووی: پورزاکەم ئەمڕۆ تاوانێکت کرد باوەڕناکەم خوای گەورە لێت ببورێت هەرگیز، (یەحیا) (علیه السلام) فەرمووی: پورزاکەم تاوانەکەم کامەیە ؟ فەرمووی: بەر ژنێك کەوتیت ! فەرمووی: دە بەخوا ئاگام لێنەبووەو هەستم بەخۆم نەکردووە، فەرمووی: (سبحان الله) لەشت لەگەڵ مندایە، ئەی گیانت لەکوێیە ؟ (واتا هۆش و گۆشت)، فەرمووی: بەعەرشی خواوە بەستراوە، ئەگەر تۆزێك دڵم بەلای (جبریل)یشدا بڕوات (واتە: جگە لەخوای گەورە بەیەك لای تردا بڕوات) وادەزانم کە بۆ ماوەی چاوتروکانێکیش خوام نەناسیوە)، بەڵام ئەم گێڕانەوەیە زیاتر لەقسە و هەڵبەستراوی ئیسرائیلیات دەچێت، خوای گەورە زاناترە .

(اسرائیل)یش [3] دەیباتەوە سەر (خیپمە) و دەفەرموێت: عیسای کوڕی مەریەم و یەحیای کوڕی زەکەریا دوو کوڕە پووری یەکترین بوون، عیسا بەرگی خوری و یەحیاش بەرگی بوزوویان[4] لەبەردەکرد، هیچکامیان دینارێك، درهەمێك، بەندەیەك، ژنێك، مەئوایەکیان نەبوو لەتەنگانە پەنای بۆبەرن، لەکوێ شەویان لێدەهات دەمانەوە، کاتێك ویستیان لەیەکتری جیاببنەوە (یەحیا) بە (عیسا)ی فەرموو: ئاموژگاریم بکە، (عیسا) (علیه السلام) فەرمووی: توڕە مەبە ! فەرمووی: ئەی ئەگەر نەمتوانی و (خۆم پێڕانەگیرا) توڕەبووم، فەرمووی: ماڵ و سامان کۆمەکەرەوە، فەرمووی: ئەی ئەوەنییە وام کردووە ! .

زانایان ڕاوبۆچوونی جیاجیایان هەیە دەربارەی ئەوەی ئاخۆ (زەکەریا) (علیه السلام) بەمردنی ئاسایی خۆی مردووە یان کوژراوە ؟

(وهب کوڕی منبە) دەفەرموێت: زەکەریا (علیه السلام) لەترسی گەلەکەی سەریخۆی هەڵگرت و لەقەدی کلۆرەدارێکدا خۆی شاردەوە، گەلەکەی دارەکەیان دۆزیەوەو دایانهێنا بەمشار، کاتێك دەمی مشارەکە لەناو مشارەکەدا گەیشتە پەراسووەکانی(زەکەریا)

---

[1] ضعیف: رواه الحاکم (٣/١٦٧) .

[2] معضل: الحیلة (٩/٢٦٨) .

[3] معضل: رواه ابو نعیم، الحیلة (٤/١١٧) .

[4] بوزوو: بەرگی دروست کراو لەمووی ئاژەڵ و بزن .

(عليه السلام) ناڵەیەکی لێهات ، خوای گەورە وەحی بۆناردو فەرمووی: ئەگەر ناڵەت نەوستێنی ئەوا زەوی و هەرچی لەسەر زەوییە هەڵیدەگێڕمەوە، ئیتر ناڵەو نوزەی لێوەنەهات هەتا کردیان بەدوو کەرتەوە .

لە گێڕانەوەیەکی تردا کەهەر براوەتەوە سەر (وهب کوڕی منبه) دەفەرموێت ئەو کەسەی کەقەدە دارەکە باوەشی بۆکردووە (شعیا)بووە(علیه السلام) بەڵکو (زەکەریا) (علیه السلام) بەمردنی ئاسایی کۆچی دوایی کردووە و نەکوژراوە، خوای گەورە زاناترە .

پێشەوا (أحمد)[1] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوەسەر (الحارث الاشعری) کەدەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خوای گەورە پێنج شتی بەزەکەریا ڕاگەیاند کەکاریان پێ بکات و فەرمانی بە بنی اسرائیلیەکانیش بکات کەکاری پێبکەن، خەریك بوو (زەکەریا) (علیه السلام) خاوەخاو لەگەیاندنی ئەو پێنج فەرمانەدا بکات، تاکو عیسا (علیه السلام) پێی فەرموو: یان ئەو فەرمانە بەبەنی ئیسرائیلییەکان ڕابگەیەنە یان من ڕایدەگەیەنم، فەرمووی: براکەم ئەترسم ئەگەر پێش من پێیان بڵێی من ئازار بدرێم لەلایەن خواوە یان بەزەویدا ڕۆبچم)، پاشان پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) فەرمووی: (یەحیا بەنی ئیسرائیلییەکانی لەبیت المقدس کۆکردەوە هەتا مزگەوتەکە پڕبوو، لەسەر سوێبانەکەوە دانیشت و سوپاس و ستایشی خوای کرد و فەرمووی: خوای گەورە پێنج شتی پێڕاگەیاندووم کەخۆم بیانکەم و بەئێوەشی ڕابگەیەنم کەبیانکەن، یەکەمیان ئەوەیە کە خوا بپەرستن و هاوەڵی بۆدامەنێن، نموونەی ئەمەش وەکو ئەوە وایە کەسێك بەماڵ و سامانە ناوازەکەی خۆی پارەبێت یان ئاڵتون بەندەیەك بکڕێ، ئەم بەندەیە ئیشی بۆ بکات و دانەوێڵەی بۆ کەلاڵە بکات، بەلام بیدات بەکەسێکی تر، جگە لەخاوەنە بنەڕەتیەکەی خۆی ئایا کێ لەئیوە حەزدەکات بەندەیەکی بەو جۆرەبێت ؟ خوای گەورەش ئێوەی دروست کردووەو ڕۆزیتان دەدات، وە ئێوەش ئەو بپەرستن و هاوەڵی بۆ دامەنێن، وە فەرمانتان (لەخواوە) پێدەکەم کە نوێژبکەن، چونکە خوای گەورە بەر لەبەندەکەی خۆی ڕوودەکاتە بەندەکەی، ئەگەر ڕوو بەملادا نەگێڕێ (واتا: بەندەکە ڕووی خۆیبانادا) جا ئەگەر چوونە نوێژەوە بەملاولادا چاوەگێڕن و لامەکەنەوە، وە فەرمانتان لەخواوە پێدەکەم کە بەڕۆژووبن، خوای گەورە نموونەی ڕۆژووانی بەوە هێناوەتەوە کە وەك ئەوە وایە پیاوێك پریاسکەیەکی پێبێ، پڕ لەمسك بێ و لەپەڕۆیەکی ئاڵاندبێ، دیارە هەموو

---

[1] صحیح: المسند (٤/١٣٠)، ابویعلی (١٥٧١)، الترمذي (٢٨٦٧) .

شتەکانی ناو پرسیاسکەکە بۆنی مسك دەگریّ، وەبۆنی دەمی ڕۆژووان بەلای خواوە لەبۆنی مسك خۆشترە، وە فەرمانتان لەخواوە پێدەکەم کەخێر بکەن، نموونەی ئەوەش وەك نموونەی پیاوێك وایە کە دوژمن بەدیل گرتبێتیان و دەستیان بەستبێتەوە تاکو بیبەن لەگەردنی بدەن و بیکوژن، پیاوەکە بەدوژمنەکانی دەڵێت: دەکرێت سەرانەیەك بدەم و لەبری ئەوە ڕزگارم بکەن ؟ ئیتر زۆر تا کەم پێدادێتە خوارەوە دەربارەی ئەو بریانە و سەرانەبە و سەرنجام خۆی دەکاتەوەو خۆی لەکوشتن ڕوگار دەکات (بەو سەرانەیە)، وە لەخواوە فەرمانتان پێدەکەم کە زۆر زیکرو یادی خوا بکەن، نموونەی ئەوەش وەك ئەوە وایە کەکەسێك کە دوژمنەکەی بەخێرایی بەدوایدا بگەڕێت، ئەویش خۆی دەگەیەنێتە قەلآیەکی تۆکمەو قایم و خۆی تێدا حەشار دەدات، بەندەش شوێنی لەو قەلآیە قایمتری گرتووە بەرانبەر بەشەیتان، ئەگەر زیکرویادی خوای کردەوە)، پاش ئەمەش پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوامە لە فەرموودەکەیدا و باس لەو پێنج شتە دەکات کەفەرمان بەئەو کراوە لەلایەن خواوە بیکات و ئێمەش بیکەین، ئەوانیش بریتین لە کۆکبوونی موسوڵمانان و گوێڕایەڵی و بەرفەرمانی و کۆچ و خەبات لەڕێی خودا) (ابن ماجه/١١٣٤٩) و (الحاکم/١/١١٧)، (الطبراني/٣٤٢٧)یش ئەو فەرموودەیان گێڕاوەتەوە .

(ابن عساکر)[1] گێڕانەوەیەکی هێناوە کە لەدەمی زانایانی (بنی ئیسرائیل)ەوە وەریگرتووە، کە یەحیای کوڕی زەکەریا (علیه السلام) زۆر دوورە پەرێز لەخەڵکی دەژیا و زیاتر لەگەڵ گیاندارانی کێویدابوو، گەڵای داری دەخوارد، لەئاوی ڕوبارەکانی دەخواردەوە، هەندێ جار بەخواردنی کوللە خۆی تێر دەکرد، کەچی بەخۆیشی دەگوت: کێ لەتۆ باشتر دەژی ئەی یەحیا ؟ دایکیو باوکی بەدوایدا دەگەڕان، لەلای دەریاچەیەك لەئوردون دۆزیانەوە، کاتێك پێکەوە دانیشتن بەقسەو باسەکانی دایك و باوکی خستە گریانێکی زۆرەوە سەبارەت بەو خواپەرستیەی کە ئەو دەیکات و ئەو لەخواترسانەی کە ئەو کاری پێدەکات . (ابن وهب) گێڕانەوەیەك دەباتەوە سەر (مجاهد) کەدەفەرموێت: خۆراکی یەحیای کوڕی زەکەریا گرژوگیابووە، هەمیشە لەترسی خوای گەورە دەگریا، تەنانەت ئەگەر قیر لەسەر چاوانی بوایە دەیدڕاند .

(محمد کوڕی یەحیای الذهلي)[2] گێڕانەوەیەك دەباتەوە سەر (ابی ادریس الخولانی) کەدەفەرموێت: ئایا هەواڵتان بدەمێ کە چ کەسێك پاکترین خۆراکی خواردووە ؟ خەڵکەکە

---

[1] ضعيف الاسناد: تأريخ دمشق .

[2] صحيح: ابن مبارك (١٧٨) .

گوێیان لەو قسەیەی بوو چاویان تێبڕی و ئەویش فەرمووی: یەحیای کوڕی زەکەریا پاکترین خۆراکی خواردووە، چونکە لەگەڵ دڕندەکان خۆراکی دەخوارد لەترسی ئەوەی نەبادا خەڵکی هاوبەشی بکەن لەگەڵیاندا، مەبەست لەوەیە (یەحیا) (علیه السلام) بۆچوونی وابووە کە مرۆڤەکان هەر چۆنێك بن هەر خراپن و بەتەواوەتی فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ ناکەن، کەواتە گوناهبارن، ئەوکەسەی لەگەڵ گوناهبارانیش دا هاوڕێیان بێت گوناهبار دەبێ، جا لەبەرئەوە واباشە لەو خەڵکە دابڕێ، لەو سەردەمەشدا لەڵکەکە دابڕان باوبوە ئەو کەسانەی کەویستویانە خوا پەرەستیەکەیان تەواوبێ لەکە و کەم و کوڕی بێ

(ابن مبارك لە وهیب کوڕی الورد)ەوە [1] دەگێڕنەوە کە زەکەریا ماوەی سێ ڕۆژ یەحیای کوڕی ون بوو، لەبەرئەوە لەو دەشتەدەرە بۆی دەگەڕا، بینی کە گۆڕێکی بۆخۆی هەڵکەندووەو لەناویدا پاڵ کەوتووەو بەکوڵ دەگری، فەرمووی: کوڕم من سێ ڕۆژە بەدوای تۆدا دەگەڕێم کەچی ئەم گۆڕەت هەڵکەندووە دەگریت ؟ فەرمووی: باوکەگیان ! ئەی تۆ خۆت پێت نەگوتم کە لەنێوان بەهەشت و دۆزەخدا شوێنێك هەیە بەفرمێسك نەبێ (لەترسی خوا) نابڕێت؟ فەرمووی: دەی کوڕم بگری ...! ئیتر هەردووکیان دایانە قوڵپی گریان .

(ابن عساکر) دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: فەرمووی: بەهەشتیەکان لەبەهەشت دا ناخەون تاکو دانبڕێن لەو تام و چێژەی نیعمەتەکانی بەهەشت، بەهەمان شێوە پێویستە باوەڕدارانی ڕاستەقینەش نەخەون تاکو دانەبڕێن لەو تام و چێژەی کە لەدڵیاندایە و لەخۆشەویستی خواوە دەستیان دەکەوێت، پاشان فەرمووی: نێوان ئەو دوو نیعمەتە چەندەو لای ئێمەش چەندە ؟ دەگێڕنەوە کە (یەحیا) (علیه السلام) هێندە گریاوە (لەترسی خوای گەورە) هەتا شوێنەواری فرمێسکەکانی بەسەر ڕوومەتەکانیەوە دیاربووە .

گەلێك هۆکار باس کراوە دەربارەی هۆی کوشتنی یەحیا(علیه السلام) بەناوبانگترینیان ئەوەیە کەگوتراوە: هەندێ لەپاشاکانی ئەو سەردەمەی دیمەشق دەیانویست ئەو کەسانە بخوازن کەپێیان ناشێن وەکو خوشك و برازاو،،، هتد یان ژنەکان حەرام بوون بۆ پاشاکان بەهۆی خزمایەتی نزیکیانەوە، (یەحیا)ش (علیه السلام) ڕێی ئەوەی لێدەگردن، ڕقیان لە (یەحیا) (علیه السلام) هەڵگرت و بۆدەرفەت دەگەڕان، یەکێك لەوانە ویستی کە (یەحیا) بکوژێت، بۆئەو مەبەستە پیاوکوژێکی راسپارد و ناردیە سەر (یەحیا)(علیه السلام)

[1] ضعیف: رواه البیهقي (٨٠٩) .

پیاوکوژەکەش یەحیای شەهید کرد و کەللەسەر و خوێناوەکەی لەدەشتێکدا هێنایە بەردەمی ژنەکە، کە ئەم ژنە حەزی لەپاشا دەکرد، وتراوە: هەر ئەو ساتە ئەو ژنە مرد، وتراوە نەخێر بەڵکو ژنی پاشاکە حەزی لێکردووەو بەیاوەری لەگەڵیدا چووە، ژنەکەش ڕێگەی پێنەداوە، جاکاتێ لێی نائومێد دەبێ فێڵ و تەڵە و پلان دادەنێ بۆئەوەی ڕووی بداتێ، پاشاکەش ناهێڵێ و ڕێگەی پێنادات، ئینجا وەڵامی بۆ دەنێرێتەوە، ئەویش ئەو کەسەی کە یەحیای کوشتووە بەخۆی و تەشتە خوێن و کەللەسەری پیرۆزی یەحیاوە ڕەوانەی لای ئەو دەکات، ئەم گێڕانەوەیەش دیسانەوە زۆر لاوازە، چونکە (ئیسحاق کوڕی بشر)[1] لەوگێڕانەوەیەدا بەشدارە کە تاوانبارکراوە بەدرۆ، دەگێڕنەوە لە (یەعقوب)ەوە تادەگات بە (ابن عباس) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەو شەوەی کە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان پێغەمبەر (ﷺ) لەئاسمان دا زەکەریای بینی و ەسڵاوی لێکرد و پرسی: ئەی باوکی یەحیا پێم بڵێ چۆن کوشتیانیت ؟ وەبۆچی بەنی ئیسرائیلییەکان کوشتیانیت (واتە: لەبەر چیبوو) ؟ فەرمووی: ئەی محمد پێت دەڵێم یەحیا (علیه السلام) باشترین کەسی سەردەمی خۆی بوو، وە جوانترین و گەشترین ڕوخساری هەبوو، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسَيِّداً وَحَصُوراً﴾ پێویستی بە ژن نەبوو، ژنی پاشای بەنی ئیسرائیلییەکان ویستی پیسی بکات، کەژنێکی دەست درێژکار بوو، کەسێکی نارد بۆلای یەحیا، بەلام خوای گەورە پاراستی و یەحیاش پەرچی دایەوەو ڕەتی کرکردووە، لەبەرئەوە پێك هاتن لەسەرئەوەی کە یەحیا بکوژن، ئەوان جەژنێکی ساڵانەیان هەبوو کە تیایدا کۆدەبوونەوە، دەستوری پاشاش وابوو کە نابێ هیچ کەسێ پەیمان و گفتی بەدرۆ بدات و نابێ کەس پەیمان دوابخات و نابێ کەس درۆ بکات .

پاشاش چوو بۆ ئاهەنگی جەژنەکەیان، ژنەکەی پاشا هەستایە سەرپێ، کە زۆر حەزی لە (یەحیا) دەکرد، وە لەوەوپێش شتیوای نەکردبوو (واتە: ئەم ژنەی پاشا)، پاشا گوتی بەژنەکەی چیت لێم دەوێ داوای بکە پێت دەدەم، ژنەکەی گوتی: خوێنی یەحیای کوڕی زەکەریام دەوێت، پاشا گوتی: جگە لەوە شتێتر داوابکە ! ژنەکەی گوتی: هەر ئەو داواکاریەم هەیە، پاشا گوتی: ئەوەت دەدەمێ (واتە: خوێن و سەری یەحیا)، ئیتر پاشا پیاوکوژ و پاسەوانی ناردەسەر (یەحیا) (علیه السلام) کە لەوکاتەدا لەناو میحرابەکەیدا نوێژی دەکرد، وە منیش (واتا: زەکەریای باوکی) لەتەنیشت ئەوەوە نوێژم دەکرد،

---

[1] ضعيف جداً: رواة ابن عساكر (١٩/٥٥) .

پەلاماری یەحیایان دا و سەریانبڕی و کەللەسەریان خستە خوێناوەکەی خۆیەوە لە تەشتێکدا و بردیان بۆ ژنی پاشا، پێغەمبەر (ﷺ) لەزەکەریای پرسی: تا چەندێك ئارامت گرت ؟ فەرمووی: لە نوێژەکەمدا لام نەکردنەوەو نەمبڕی، سەروکەللەی یەحیایان بردە بەردەمی ژنەکە، هەرئەو ڕۆژە کەئێوارە داهات خوای گەورە پاشاو خێزان و ماڵ و ژن و دەست و پێوەند و پاسەوانەکانی بەزەویدا بردە خوارەوە، کەڕۆژ بووەوە بنی ئیسرائیلیەکان گوتان: خوای زەکەریا لەزەکەریا توڕەبووە، وەرن بابچین ئێمەش لەلای پاشاکەمان لەزەکەریا توڕەبین و بیکوژین، ئیتر بلاْوبوونەوە بۆئەوەی من بگرن و بمکوژن، منیش هەواڵم پێگەیشت و لەدەستیان ڕامکرد، شەیتانیش لەپێشیانەوە دەهات و شوێنی منی پێنیشان دەدان، کاتێ زانیم خۆم پێدەرباز ناکرێ، درەختێك سینەی قەدی خۆی بۆکردمەوەو بانگی کردم و گوتی: وەرە بۆلام،، بۆلام، منیش چوومە قلۆرەدارەکەوەو شەیتانیش پێم گەیشتەوەو میك و شاکەلی کراسەکەی (عاباکەی گرتم)، دارەکە هاتەوەیەك منیش لەناو دارەکەدابووم و شاکەلی عاباکەم لە دەرەوەبوو، دیاربوو بنو ئیسرائیلەکان هاتنەلای دارەکە، شەیتان گوتی: نابینن چۆتە ئەم دارەوە، ئەوەنیە شاکەلەکەی دیارە، بەجادووەکەی خۆی چوەتە ناودارەکەوە !!

ئەوان بڕیاریان دا دارەکە ئاگر تێبەردەن، شەیتان گوتی: ناء وەرن بەمشار دارەکە دووکەرت بکەن، ئیتر منیان بەدارەکەوە بەمشار دووکەرت کرد، پێغەمبەر (ﷺ) لێیپرسی: ئایا ئازار و ئێشت پێگەیشت ؟ فەرمووی: نا، بەڵکو ئەو ئێش و ئازارە بەدرەختەکە گەیشت کەخوای گەورە ڕۆحی منی بەبەری ئەودا کردبوو لەو کاتەدا، ئەو فەرموودەیە زۆر نامۆیە، چونکە لەو فەرمودانەی باسی (اسراء ومعراج) دەکەن ناوی زەکەریا و یەحیا (علیه السلام) نەهاتووە، تەنها ئەوەندە نەبێ کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (بەلا دوو کوڕە پورەکەدا (پورزاکان) ڕۆیشتم کە یەحیا و عیسایە و هەردووکیان دوو کوڕە پورزان) لەشەوی (اسراء)دا .

دایکی یەحیاش ناوی ئەشیاع کچی عمرانە و خوشکی مەریەمە، وتراوە: ئەشیاع ژنی زەکەریا و دایکی یەحیابووە و خوشکی (حنە)ی ژنی (عمران)بووەو بەمەش (یەحیا) (علیه السلام) دەبێتە پورزای مریم، خوای گەورە زاناترە .

زانایان ڕای جیاوازیان هەیە دەربارەی شوێنی شەهیدکردنی (یەحیا) (علیه السلام) ئاخۆ لەمزگەوتی (الاقصی)بووە یان لەشوێنی تر ؟ لەم بارەیەوە دووجۆرە بۆچوونیان هەیە، کۆمەڵی ڕای یەکەم دەڵێن: لەسەر ئەو بەردەی لە (بیت المقدس)دایە حەفتا

پێغەمبەر شەهیدکراوە و یەکێك لەوانەش یەحیای کوڕی زەکەریایە(علیه السلام) (ابو عبیدە القاسم بن سلام)یش دەباتەوە سەر (سعیدی کوڕی موسەیەب) کەفەرمویەتی: کاتێك بەختنصر پاشا چوو بۆ دیمەشق خوێنی یەحیای کوڕی زەکەریا هەڵ دەکفا، بەپاشایان ڕاگەیاند ئەویش بەسەر خوێنەکەی ئەودا (واتا لەتۆڵەی ئەو) حەفتا هەزار کەسی لێکوشت ئینجا خوێنەکە دامرکایەوە، گرنگ ئەوەیە کە شەهیدکردنی (یەحیا) (علیه السلام) لەدیمەشق بووە، بەڵام چیرۆکی بەختنصر پاشا دوای (مسیح) (علیه السلام) بووە، وەکو (عصاء) و (الحسن البصري) فەرموویانە .

(ابن عساکر)[1] لە (زید کوڕی واقدەوە) دەگێڕێتەوە کەدەڵێت: کەللەیسەری یەحیای کوڕی زەکەریام (علیه السلام) کاتێك کەدەیانویست مزگەوتی دیمەشق دروست بکەن و لەیەکێك لەکۆشەکانی لای قیبلەدابوو، ئەو کۆشەیەشیان بوو کە لەدوای میحرابەکەوەیە بە ڕوکاری خۆرهەلاّت دا، پێستی دەم و چاوی و مووی سەری تێك نەچووبوو، بەڵکو وەك ئەوەوابوو ئەو کاتە شەهیدکرابێ، وا باس دەکرێت کە لەژێر ئەستونگی (سەکاسکە)ی مزگەوتەکەدایە، خوای گەورە زاناترە .

(ابن عساکر) لەکتێبی (المستقصي في فضائل الاقصي)دا دەیباتەوە سەر (قاسم کوڕی مەولی معاویە) دەڵێت: پاشای شاری دیمەشق (هداد کوڕی هدار)بوو، کچی برازاکەی خۆی هێنابوو بۆ کوڕەکەی خۆی، ئەم برازایەی پاشا ناوی (ئەریل) بوو کە پاشای (صیدا)بوو، یەکێك لەو موڵك و سامانەی لەبەردەستیدابوو بازاڕگەی (پاشایان)ی دیمەشق بوو، کەدوکانی زێڕەنگەرەکانی شاربووە، ئەم کوڕە سێ بەسێ تەلاّقی ژنەکەی خۆیداوە، پاشا ویستویەتی ژنەکەی بهێنێتەوە و بۆ ئەم مەبەستە چوەتەلای یەحیای کوڕی زەکەریا (علیه السلام) و ویستویەتی فەتوای بۆبدات (یەحیاش) (علیه السلام) فەرمویەتی: دروست نیە ئەو ژنە بهێنیتەوە هەتا مێردێکیتر نەکات، لەمەوە ڕقی لێهەڵگرت و ژنە پاشاکە داوای لەپاشاکرد کەسەری (یەحیا)ی کوڕی زەکەریای بۆبێنن، ئەمەش بەئاماژەی دایکی، ئەویش سەرەتا ڕازینەبوو، بەلاّم دوایی ڕەزامەندی دەربڕی و پیاوانی خۆی نارد بۆ شەهیدکردنی (یەحیا) (علیه السلام) کە لەمزگەوتی (جبرون)دا نوێژی دەکرد، پیاوکوژەکان کەللەسەری یەحیایان لەسەر سینییەك هێنایە بەردەم شاژن، کەللەسەرەکە دەیفەرموو: دروست نیە ئەو ژنە بهێنیتەوە هەتا مێردێکی تر نەکات، ژنەکە

[1] قلت: ضعیف، فیه عبدالله بن صالح .

کەللەسەری پیرۆزی یەحیای خستە قاپێکەوەو خستیە سەرسەریو بردی بۆلای دایکی، کەللەسەرەکە هەر دەیفەرموو: دروست نیە ژنەکە شوویەکی تر نەکات، کاتێك کەللەسەری پیرۆزی یەحیا (علیه السلام) هێنرایە بەردەمی دایکی قاچەکانی بەزەویدا ڕۆچوون، پاشان زیاتر ڕۆچوون، تاگەیشتە سەرووئەژنۆکانی، ژنەکە واوەیلاوهاواری دەکرد کچە کارەکەرەکانی بەردەستی کەوتنە قیژەقیژ و هاوار هاوار و لێدان و پیاکێشان بەدەم و چاوی خۆیاندا، ئیتر ژنەکە وردە . . وردە . . بەزەویدا ڕۆچووە خوارەوە، هەتاوەکو سەرشانەکانی نقوم بوو .

لەم کاتەدا ژنەکە فەرمانی بەشمشێر بەدەستان کرد کەکەللەی بپەڕێنن (واتە: کەللەی ژنەکە خۆی) ئەوانیش کەللەیان پەڕاند و لاشەکەش زەوی قوتیدا، لەم کاتەدا زەلیلی و ڕیسوایی و تیاچوون هەموویانی گرتەوە، هەر لەوکاتەوە کەللەسەری پیرۆزی (یەحیا) (علیه السلام) خوێنی لێهەڵقولاوە هەتا ئەو کاتەی (بەختنصر) پاشا چوو بۆئەویَ و لەتۆڵەی ئەودا حەفتا هەزار کەسی لێکوشتنەوە، (سەعید کوڕی عبدالعزیز) دەفەرموێت: ئەوە خوێنی هەموو پێغەمبەرەکانە کە بەردەوام هەڵقولاوە هەتا ئەو کاتەی (ئەرمینا)(علیه السلام) بەخوێنەکەی فەرمووی: ئەی خوێن (بەنی ئیسرائیل)یەکانت لەناوبرد بەفەرمانی خوا بوەستەرەوە، ئیستر خوێنەکە گیرسایەوەو شمشێریش وەلانرا، ئەوەی ڕایکرد ڕایکرد لەخەڵکی دیمەشق بۆ (بیت المقدس) ئەوانی دیکەش بەرەوئەویَ ڕۆیشتن شوێنیان کەوتن، خەڵکێکی زۆریان لێکوشتن، بەڕادەیەك کە لەژمارە نایەن و گەلێکی زۆریشیان لیَ بەدیل گیران، ئینجا (بەختنصر) پاشا گەڕایەوەو وازی لیَ هێنان .

## ﴿پێغەمبەری خوا (عیسا درودو سڵاوی خوای لەسەر بێت)﴾

خوای گەورە لەسورەتی (ال عمران) داو لەناوەڕۆکی هەشتاو سێ ئایەت دا بەرپەرچی گاورەکان دەداتەوە دەربارەی ئەو تۆمەت و قسەو باسانەی کە خستوویانەتە پاڵ (عیسا)(علیه السلام) وە وایان بڵاو کردۆتەوەکە گوایە (خوای گەورە) کوڕی هەیەو کوڕەکەیشی (عیسا)یە، خوای گەورەش پاك و دوورە لەو قسەوباسانە، ئەوەبووکاتی خۆیشی نوێنەری گاورەکان (نەجران) هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) وە باسی ئەوەیان کرد کەئەوان لەهەڵەیەکی گەورەدان کە بیرو بڕوایان لەسەر (سیانە)دامەزراندوە، کەبریتین لە (ذات المقدسة، عیسی مریم)وەلەسەرئەوەش جیاوازییان هەیە، خوای گەورەش ناواخنی ئەم سورەتەی دابەزاند بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە ڕوونی کردەوە کە (عیسا)ش وەك هەر مرۆڤێکی تر بەندەیەکە لەبەندەکانی خوای گەورە، هە رئەو خوایە خۆی لەزاماڵی دایکی دا[180] وێنەی کێشاوەو دروست کردووە، هەروەکو چۆن مەخلوقەکانی تریش وێنەکێش کردووەو، وە بێ باوك دروستی کردووە، هەروەکو چۆن (ئادەم)یش هەربێ باوك و دایك دروست کرد، وەخوای گەورە بفەرمووێ (ببە)یەکسەر، (بوو)، واتا دروست بوو، وەخوای گەورە هەرلەوسورەتەدا چۆنیەتی لەدایك بوونی (مریم)ی دایکیشی باس کردوە، کەچی بەسەر هاتووەو چۆن بە (عیسا)دوگیان بووە، هەروەها لەسورەتی (مریم) یش دا خوای گەورە هەر ئەوباسانەی دوبارە کردوەتەوە .

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى ....... . إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ (ال عمران:٣٧)، خوای گەورە باسی ئەوە دەفەرموێت کە ئادەمی بەدەستە بژێر و پاکژ دروست کرد، پاشان شوێنکەوتوانیشی چەندین دەستە و بەرەی پاك و چاکیان لێکەوتۆتەوەو ژمارەیەکی یەکجار زۆر پێغەمبەر و زاناو دانایان تێدا هەڵکەوتووەو هەمووشیان درێژەپێدەر شوێنکەوتەی شەریعەتی ئەوبوون، ئینجا لەناو ئەوانیشدا بەتایبەتی باسی (ال ابراهیم) دەکات کەدواتر (اسماعیل) و (اسحاق)یان لێکەوتووە، دواتر خوای گەورە باسی گەورەیی و پیرۆزی مزگەوتە پیرۆزەکانی (کەعبە) و (بیت المقدس) دەکات کە (ال عمران) دروستیان کردووە، مەبەست لەوەیە کە (عمران) باوکی (مریم)بووە (علیهم السلام)

---

[180] زاماڵ: رحم الام .

(محمد كوڕی ئیسحاق) دەفەرموێت: ناوی تەواوەتی (عمران) کوڕی هاشم کوڕی میشیا کوڕی حزقیا کوڕی (احریق) کوڕی (موثام) کوڕی (عزازیا) کوڕی (امصیا) کوڕی (یاوش) کوڕی (ئەحریهۆ) کوڕی (یازم) کوڕی (بەهفاشاط) کوڕی (ئیشیا) کوڕی (ئیان) کوڕی (جبعام) کوڕی (سلێمان) کوڕی (داود)ە (علیهم السلام)

(ابن عساکر) دەفەرموێت: مەریەم کچی عمران کوڕی ماپان کوڕی (العازر) کوڕی (ئەلیود) کوڕی (ئەخنەن) کوڕی (صادوق) کوڕی (عیازوز) کوڕی (ئەلیاقیم) کوڕی (ابیود) کوڕی (زریابیل) کوڕی (شالتال) کوڕی (یوحنا) کوڕی (برشا) کوڕی (ئامون) کوڕی (میشا) کوڕی (حزقیا) کوڕی (احاز) کوڕی (موثام) کوڕی (عزریا) کوڕی (یورام) کوڕی (یوشافاط) کوڕی (ئیشا) کوڕی (ئیبا) کوڕی (رحبعام) کوڕی (سلیمان) کوڕی (داود)ە(علیهم السلام)ئەگەرچی ئەم دووجۆرە خوێندنەوەی پشتە جیاوازیان تێدایە، بەڵام لەهەدوو ڕێگەوە (مریم) (علیه السلام) هەردەچێتەوە سەر پشتی (داود)(علیه السلام) (عمران)ی باوکیشی لەسەردەمی خۆیدا خاوەن مزگەوت و میحراب بوو، دایکیشی ناوی (حنه) کچی (فاقود) کوڕی (قبیل)ە، وە یەکێکە لەژنە خواپەرستەکان و (زەکەریا) پێغەمبەری (علیه السلام) ئەو سەردەمە بووەو ژنەکەیشی خوشکی (مەریەم) بووە، کەناوی (ئەشیاع)بووە، بەلای جمهوری زانایان وتراوە: مێردی پورەکەی (ئەشیاع) بووە، خوای گەورە زاناترە .

(ابن اسحاق)[181] و کەسانی تریش وتویانە: دایکی مریم سك وازی نەدەکرد، ڕۆژێکیان باڵندەیەکی بینی کەبەچکەکەی بەخێودەکرد، لەمەوە ئەمیش ئارەزووی منداڵبوونی کرد و لەسەر خۆی نەزری کرد کەئەگەر خوای گەورە منداڵی پێببەخشێت ئەوا دیکاتە زێوان و خزمەتکاری (بیت المقدس)، وتراوە: هەرهەمان کات زگی ئامادەبوو بۆ منداڵ بوون، پاش ماوەیەك دووگیان بوو بە (مریم)، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنْثَى وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ﴾(آل عمران: من الآیه٣٦)، وە بەشێوەی (وضعت)ش خوێنراوەتەوە، واتا: پیتی تاء بۆری هەبێت، واتا کاتێك منداڵیبوو، گوتی: پەروەردگارا خۆمن کچم بووە، خوای گەورە زاناترە بەوەی کەکچی بووە، چونکە وایدەزانی نابێ کچی زێوانی مزگەوت بێت و لەو سەردەمەدا خەڵکی لەسەرخۆیان نەزریان دەکرد کەتەنها کوڕ بکەنە زێوانی مزگەوت .

---

[181] ضعیف الاسناد (٣/ج٣/٢٣٠) ابن جریر .

ئایەتی ﴿وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ﴾ بەڵگەیە لەسەرئەوەی کەهەر یەکەم ڕۆژەوە ناوی لێناوە (مریم)، (پێشەوا احمد)[182] فەرمودەیەکی بردوەتەوە سەر (ابو هریرە) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هیچ مندالێکی تازبوو نیە کەشەیتان دەستێکی نەگەیەنێتیّ لەکاتی لەدایک بوونەکەیدا، منالەکەش لەتاواندا دەقیژێنیّ و هاوار دەکات بەهۆی ئازاردانەکەی شەیتانەوە بۆی تەنها مریم و کوڕەکەی نەبیّ کەشەیتان نەیتوانی توخونیان بکەوێت)، پاشان (ابو هریرە) دەفەرموێت: گەرویستتان ئەم ئایەتە بخوێننەوە ﴿وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾، (ابن جریر)یش[183] هەر وایهێناوە .

هەروەها (پێشەوا احمد)[184] بەدەقێکی هاوتای تر هەر لە (ابو هریرة)ەوە هێناویەتی کەدەفەرموێت: (کل مولود من بنیآدم یمسه الشیکان باصبعه الا مریم بن عمران وابنها عیسي)، لەگێڕانەوەیەکی تردا هێناویەتی کەدەفەرموێت: (کل انسان تلده امه یلکزه الشیطان في حضنیه الا ماکان من مریم وابنها، الم تر إلي الصبي حین یسقط کیف یصرخ ؟)[185]، وە دوو گێڕانەوەی تریش هەر لەلایەن پێشەوا (أحمد)ەوە[186] براونەتەوە سەر (ابو هریرە) کە هاوشێوەی ئەم فەرمودانەن، وە هەرهەموویان ئەوە دەردەخەن کەشەیتان توخنی منالّی تازبوو دەکەویّ و ئازاری دەدات و دەیگریەنێت، بەلاّم هەرگیز نەیتوانیوە توخنی (مریم) و (عیسا)ی کوڕی بکەوێت[187]، مەگەر خۆیدابێت لەو پەردەی کەبەدەوریدا دادرابوەوە . ﴿فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنْبَتَهَا نَبَاتاً حَسَناً وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِنْدَهَا رِزْقاً قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾(آل عمران:٣٧)، دەربارەی ئەو ئایەتەی سەرەوە، ڕاڤەکارانی قورئان زۆربەیان دەفەرمون: کاتێك دایکی مریم مەریەمی بوو، مەلۆتکەی کرد و لەپەڕۆو پاڵی ئاڵاندو بردی بۆ مزگەوتەکەو دایەدەست ئەو کەسانەی لەمەزگەونەکەدا دادەنیشتن جا لەبەرئەوەی کچی پێشەواکەیان (مەلا)بوو کەپێش نوێژو خاوەنی مزگەوتەکەبوو، ئەوانەی لەوێبوون پێشبەرکێیان دەکرد بۆ وەرگرتنی ئەم مەلۆتکەیە .

---

[182] متفق علیه: المسند (٢/٢٧٤)، البخاري (٤٥٤٨)، مسلم (٦٠٨٦) .

[183] صحیح لغیره .

[184] صحیح: المسند (٢/٢٨٨)، مسلم (٣٢٦٦) .

[185] صحیح المسند (٢/٣٦٨)، ابن جریر (٣/ج٣/٢٣٨) .

[186] ابن جریر: (٣/ج٣/٢٣٨) .

[187] صحیح: المسند (٢/٥٢٣) .

وادیاره ئەم کارەی دایکی دوای تەواوبوونی خولی شیرپێدانی بووەو، بەڵام لەمناڵیشیدا شتێکی لەو جۆرە ڕوویداوە، ئەوانەی لەوێبوون کەوتوونەتە کێبڕکێ و هەریەکەیان ویستوویەتی خۆی کەفالەتی (مریم) بکات، (زەکەریا)ش (علیه السلام) لەوکاتەدا پێغەمبەریان بووە، دەیویست بۆخۆی کەفالەتی بکات، چونکە ژنی زەکەریا (علیه السلام) خۆشکی یاخود پوری ئەم منداڵە (واتە: مریم)بووە، بەڵام خەڵکەکە کەزۆریان لێکرد کەهەروا کەفالەتی نەگرێتە ئەستۆی خۆی و بائەوانەی لە مزگەوتەکەش دان ئەو مافە هەڵگرتنەوەو کەفالەوتیان هەبێ، وە داوایان لە(زەکەریا) کرد (علیه السلام) کی بەتیروپشك بێ وایان کردو زۆرینەی تیروپشکەکە بەلای (زەکەریا)دا هاتەوە (علیه السلام) چونکە پوور لەئاستی دایکدایە، واتا دەبێ ژنەکەی (زەکەریا) (علیه السلام) چاودێری و کەفالەتی بکات کەدەبێتەوە بەپوری لەهەندێ بووچوندا خوشکی مەریەم .

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَامَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ﴾(آل عمران:٤٤)، دەربارەی چۆنیەتی تیروپشکەکە واباس دەکەن کە بەم جۆرەبووە، هەریەکە لەبەشدابوانی تیروپشکەکە قەڵەمی خۆیان لەیەخەیان لێکردەوەو لەشوێنێك دایاننا و بەمنداڵێکی پێنەگەیشتویان گوت: کەیەکێك لەو قەڵەمانە هەڵبگرێت، مناڵەکەش قەڵەمێکی هەڵگرت کەتەماشایان کرد قەڵەمی (زەکەریا) (علیه السلام) بوو، داوایان کرد کەجارێکی تر تیروپشکەکە دووبارە بکەنەوە، بەڵام ئەم جارەیان بەم جۆرە، هەموویان قەڵەمەکانیان کۆبکەنەوە و بیانکەنە ناو ڕوبارێکەوە، جا قەڵەمی هەرکەسێك پێچەوانەی ئاراستەی ئاوەکەوە ڕۆیشت ئەوا ئەوکەسە براوەیە و بۆی هەیە کەفالەتی (مریم) بگرێتە ئەستۆی خۆی .

کاتێك ئەمەیان کرد، بینیان کەتەنها قەڵەمی (زەکەریا) (علیه السلام) بەئاراستەی پێچەوانەی ئاوەکەوە ڕۆیشت، داوایان کرد کە بۆجاری سێهەم تیروپشکەکە دووبارە بکەنەوە، بەڵام بەو مەرجەی کەقەڵەمی هەرکەسێك بەئاراستەی ڕۆیشتنی ئاوەکەوە ڕۆیشت ئەوا ئەوکەسە براوەیە، ئەم جارەشیان دیسان هەر قەڵەمەکەی (زەکەریا) (علیه السلام) بەو مەبەستە ڕۆیشت و سەرەنجام مافەکە درا بە (زەکەریا) (علیه السلام)خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقاً قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ إنَّ اللّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾(آل عمران: من الآیه٣٧)، ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز فەرموویانە:

(زەکەریا) (علیه السلام) شوێنێکی پیرۆز و تایبەتی لەمەزگەوتەکەدا تەرخان کردبوو بۆ (مریم) کە جگە لەخۆی کەسیتر نەدەچووە ئەو شوێنە، (مریم) لەو شوێنەدا بەتەواوەتی خۆی تەرخان کردبوو بۆ خواپەرستی بەڕادەیەك کە خواپەرستیەکەی (مریم) لەناو (بنی ئیسرائیل)دا بەنموونە باس دەکراو دەهێنرایەوە، ناوبانگی دەکرد بەکەسێکی نموونەیی و بەڕەوشت و خاوەن سیفەتی نایاب، ئەوەش بەڕادەیەك بوو هەرکات (زەکەریا) (علیه السلام) سەردانی بکردایە خواردن و میوەی لەلا دەبینی کە هێشتا وەرزە نەبوو، میوەی هاوینەی لەوەرزی زستاندا لەلادەبینی و بەپێچەوانەیشەوە (زەکەریا)ش (علیه السلام) لێی دەپرسی: ﴿أَنَّى لَكِ هَذَا﴾، واتا: ئەمەت لەکوێبووە ؟ ئەویش لەوەڵامدا دەیفەرموو: ﴿قَالَتْ هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ﴾، واتە: لەلایەن خواوەیەو خوای گەورەش هەرخۆی ڕۆزی دەبەخشێنێ بەهەرکەسێك دەیەوێت .

لەم کاتەدا (زەکەریا) (علیه السلام) ئومێدی ئەوەی خواست کەخوای گەورە منداڵێکی لەم کچە پێببەخشێ، کەهەر دەچێتەوە سەر پشتی (ئەم) واتا: زەکەریا(علیه السلام) ئەگەر چی بەتەمەنیش بوو بۆیە لەخوا پاڕایەوەو فەرمووی: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُ قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾(آل عمران:٣٨) ، هەندێ لە ڕاڤەکارانی قورئان فەرمویانە: زەکەریا (علیه السلام) فەرموویەتی: ئەی ئەو پەروەردگارەی کەمیوەو بەرووبووم دەبەخشیێ بە (مریم) لەوەرزێکدا کەوەرزی ئەو میوەیە نیە، مناڵێکم پێببەخشە ئەگەر چی لەکاتی خۆیشیدا نیە، واتە پیرم و داوای مناڵت لێدەکەم، ئەوەش ئاساییە بەلای تۆوە، چونکە چۆن ئاساییە بەلاتەوە لەناکاتدا بەروبوم و میوە بە (مریم) ببەخشی، بۆ داواکەی منیش هەربەلاتەوە ئاساییە و دەتوانیت پێشتر ئەم نزاو ڕووداوو بەسەرهاتەمان باس کردووە .

﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ ...إِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ﴾ (آل عمران:٤٢-٥١)، لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە باس لەچەند شتێك دەکات لەوانە مژدە بە (مریم) دەدات کەباشترین و پاکترین و هەڵبژاردەترین ژنی سەردەمی خۆی بووە، تایبەتی کردووە بەوەی کەببێ باوك منداڵێکی پێببەخشێ، وە ئەو منداڵەش مژدەت لێبێ پێغەمبەر دەبێت، هەر لەناو بێشکە و لەمنداڵیەوە بانگەوزار بۆ خەڵکی دەکات تاکو خوای تاك و تەنها بپەرستن، هەروەها لەتەمەنی پیریشیدا هەمان بانگەواز دەکات . ئایەتەکەش بەڵگەیە لەسەرئەوەی ئەم منداڵە سێدەگات و دەگاتە تەمەنی پیری و کامڵ بوون، وەخوای گەورە فەرمان بە (مریم) دەکات کە سووربێ لەسەر خواپەرستی و کڕنووش بردنی پڕ لەسوپاس

بۆ پەروەردگار و بەردەوام لەئەژنەوین [١٨٨] و کڕنوش و یادە خوادابێت، تاکو ئامادە و شیاوبێت بۆ ئەو ئەرکە گەورەیە کەدایکایەتی کردنی پێغەمبەرێکی بێباوکە، ئەویش بەردەوام بوو لەسەر خواپەرستەکانی هەتا قاچە پیرۆزەکانی ئاوسا .

دەربارەی پاکژی و هەڵبژاردەیی (مریم) بەسەر ژنانی تردا، دەشێت بۆ ژنی سەردەمی خۆی بوویێت، بەڵام ئەگەر (مریم) پێغەمبەر بوبێت و وەحی بۆهاتبێت لەلایەن خواوە و فریشتەکان مژدەیان بۆهێنابێ، هەروەکو (ابن حزم) پێیوایە، لەو بارەشدا دوورنیە گەورەترین ژنی سەردەمی خۆی و دوای خۆی و بگرە پێش خۆیشی بووبێت، تەنانەت هەندێ پێیان وایە کە (سار) و (دایکی ئیسحاق) و (دایکی موسا)ش پێغەمبەر بوون، بەبڵگەی ئەوەی کە فریشتە قسەی لەگەڵدا کردوون، وە بەبەڵگەی ئەم ئایەتەش کەدەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاءِ الْعَالَمِينَ﴾(آل عمران:٤٢)، خوای گەورە زاناترە .

بەڵام بۆچوونی زۆربەی جمهوری زانایان لەگەڵ ئەوەدایە کە پێغەمبەرایەتی تایبەتە بەپیاوان، وە (مریم)یش بەرزترین پلەی ژنانی ڕاستگۆبووە کە دووەم پلەی دوای پێغەمبەرایەتییە لەپیاوان و ژنانیشدا[١٨٩]، لەو بارەدا ئاساییە کە (مریم) بەرزترین پلەی ڕاسگۆیان بێت هەموو ژنانی هەموو سەردەمەکان و بەڵگەشیان ئەم ئایەتەیە پیرۆزەیە ﴿مَا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلَانِ الطَّعَامَ انْظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ الْآيَاتِ ثُمَّ انْظُرْ أَنَّى يُؤْفَكُونَ﴾(المائدە:٧٥)، خوای گەورە زاناترە .

ناوی (مریم) لەگەڵ هاوشانی ناوی (ئاسیە، خەدیجە، فاطمة)دا هاتووە، خوای گەورە لەهەموویان ڕازی بێت .

(پێشەوا احمد)[١٩٠] و بخاری و مسلم وترمژی و نسائی بردویانەتەوە سەر (علی کوڕی ابی طالب) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (باشترین ژنیان مریم کچی عمران بووەو و باتشترین ژنمان خەدیچەی کچی خوەیلدە)،دیسان (پێشەوا أحمد)[١٩١] فەرموودەیەکی بردوەتەوە سەر (أنس) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (چوارکەس لەژنانی جیهان بێتە ئەژمار، مریم کچی عمران، ئاسیا ژنی فرعون، خەدیجەی کچی خوەیلد،

---

[١٨٨] ئەژنەوین: رکوع، کڕنوش: سجدە .

[١٨٩] ڕاستگۆ: مەبەست لەو کەسەیە کەسوورە لەسەر پەیمانی خۆی لەگەڵ خوادا بۆ خواپەرستی تەواوەتی .

[١٩٠] متفق علیە: احمد (المسند ٨٤/١)، البخاري (٣٤٣٢)، مسلم (٦٢٢١)، الترمذي (٣٨٧٧)؛ النسائي (٨٣٥٤).

[١٩١] پیاوانی متمانەدار: المسند (١٣٥/٣)، الترمذي (٣٨٧٨) .

فاطمەی کچی محمد)، هەروەها چەند فەرموودەیەکی تری پێغەمبەر (ﷺ) هەیە دەربارەی ژنە پایەدار و سەروەرەکانی جیهان و بەزۆریش ئەو چوار پێنج ژنەن (مریم، ئاسیە، خدیجە، فاطمة، عائشه)ن، گرنگ ئەوەیە (مریم) (علیه السلام) یەکێکە لەو ژنە ناودارو پایەدارانەی کە بێهاوتایە لەسەر ئاستی جیهانی، ئیتر کام لەوانە لەئەوانەی تریان سەروەرتر و پایەدارترە، ئەوەیان زۆر گرنگ نیە بگرە هەریەکەیان لەئاستی خۆیانەوە پشتیوانێکی گەورەو دایکێکی دڵسۆزو خواناسێکی مەزن بوون بۆ پەرەپێدانی پەیامی خوایی و پشتیوانی کردنی دڵسۆزانە لەپێغەمبەرانی خوا، ئێمەش لێرەدا باسەکەمان تایبەتە بەپاکی و بێگەردی و سەروەری و دڵسۆزی (مریم)ە [١٩٢](علیه السلام)، باسمان لەوە کرد کەخوای گەورە (مریم)ی دەست بژێرو پاکژ ناوبردووە بەبەراوورد لەگەڵ هەموو ژنانی سەردەمی خۆی بەلایەنی کەمەوە، لەفەرموودەی پێغەمبەریشدا هاتووە کە (مریم) (علیه السلام) لەگەڵ (ئاسیە)ی ژنی فرعەواندا دەبنە هاوسەری پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) لەبەهەشت دا و لەتەفسیرەکەشماندا و لەکۆتایی سورەتی (التحریم)دا باسمان کردووە، خوای گەورە زاناترە .

ئەوان بەڵگەیان ئەوەیە کەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثَيِّبَاتٍ وَأَبْكَاراً﴾(التحریم: من الآیە٥)، وتراوە (ثیب) مەبەست لە (ئاسیە)ی ژنی فیرعەونە و (مریم)یش یەکێکی لە (ابکار)ەکان، ئەم فەرموودەیەو چەند فەرموودەیەکی تریش لە (موضوع) دەچن و جێگەی سەرنج و گومانن .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذِ انتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَاناً شَرْقِياً ...فَاخْتَلَفَ الْأَحْزَابُ مِن بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِن مَّشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾(مریم:١٦-٣٧)، خوای گەورە چیرۆك و بەسەرهاتی (زەکەریا)(علیه السلام) باسی بەسەرهات و ژیانی (مریم و عیسای کوڕی) ئەکات بۆ محمد (ﷺ)، وەك سەرەتاو ئامادەکاریەك، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَزَكَرِيَّا إِذْ نَادَى رَبَّهُ رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْداً وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ ........ .... وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلْنَاهَا وَابْنَهَا آيَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾(الانبیاء: ٨٩-٩١)، پێشتر باسمان لەوەکرد کەدایکی مریم، مەریەمی تەرخانکرد بۆ زێوانی و خزمەتی مزگەوتی (بیت المقدس)، وە مێردی خۆشکەکەی یان پورەکەی گرتیە ئەستۆی خۆی و کەفەلەتی کرد، کە پێغەمبەری ئەو

---

[١٩٢] هەرکەسێك زانیاری دەوێت دەربارەی گەورەیی و سەروەری ئەو ژنانە با بروانێتە دەقی کتێبە عەرەبییەکە، لاپەڕە (٥١٣-٥١٦) .

سەردەمە (زەکەریا) (علیه السلام) بوو، ئەویش محرابی تایبەتی بۆ دروست کرد، جگە لەئەوو خۆی کەش نەدەچووە ئەو میحرابەوە، کاتێك باڵق بوو، خۆی تەرخان کرد بۆ خواپەرستی بەڕادەیەك کەهاوشانی نەبوو لەو سەردەمەدا لەڕووی هونەری خواپەرستییەوە، شتیوای لێدەبینرا کەمایەی دڵخۆشی و گەشیبوو بۆ(زەکەریا )(علیه السلام) فریشتەکان قسەیان لەگەڵدا دەکرد و مژدەیان پێ دا کەمریم هەڵبژاردەی خوای گەورەیەو خوای گەورەش منداڵێکی پێدەبەخشێ کەگەلێك ناوازەو زرنگ و چالاك و خاوێن و خواپەرست و پێغەمبەر دەبێت و باوەڕ بەموعجیزەکانی دەکرێت، ئەویش سەرسام بوو لەوەی کەچۆن بەبێبوونی باوك کەهێشتا مریم شووی نەکردووە منداڵی دەبێ، بەڵام فریشتەکان پێیان ڕاگەیاد کەخوای گەورە بەتوانایەو هەرچی بویێ بە (کن) فەرمان دەکات بە (یکون) ئەنجام دەدرێو دواناکەوێ، ئەویش سەرلەنوێ پشت بەخوابەست و کاروبارەکانی بەپەروەردگار سپاردەوەو زانیشی کەئەو جۆرە منداڵبوونە بەشێوەی نارەحەتیەکی گەورەی بۆ دروست دەکات، خەڵکی دەمی خۆیان ناگرن و قسەوباسی لابەلایی دەکەن، چونکە ئەوان حیکمەتی ئەم موعجیزەیە ناوانن و لێی تێناگەن و تەنها ڕووکاری ئاشکرای ڕووداوەکە دەخوێننەوە .

جا کاتێك بەهۆی سوڕی بێنوێژیەوە یان بۆ هەرکارێکی تایبەتی خۆی لەمزگەوت هاتەدەرەوە، ڕەنگە بۆ دەستکەوتنی ئاوو خۆراکی پێویست بوویێ بۆخۆی، گرنگ ئەوەیە ڕۆژێك بۆ کاروباری خۆی لەمزگەوت هاتەدەرەوە (وانتبذت) جیابوەوەو کەوتەلاوەو پەنایەکی گرت بەتەنها لەلای خۆرهەڵاتی مزگەوت (الاقصی)ەوە، لەوێدا خوای گەورە فریشتەی (روح الامین)، واتە: (جبریل)ی ناردە لای لەشێوەی مرۆڤێکی تەواودا هەرکەبینی، مریم فەرمووی: ﴿قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا﴾(مریم:١٨)، (ابو العالیە)[١٩٣] دەفەرمویێت: واتا: من پەنا بەپەروەردگاری خاوەن بەزەیی دەگرم لەتۆ، فریشتەکەش قسەی لەگەڵدا کرد و فەرمووی: ﴿إنما أنا رسول ربك﴾، من مرۆڤ نیم و لەلایەن خواوە ڕەوانەکراوم بۆلای تۆ، تاکو منداڵێکی زیرەکت پێببەخشم (لەلایەن خواوە) فەرمووی: ئاخر چۆن منداڵم دەبێ ؟ کە من هاوسەرم نیە و خۆیشم داوێن پاکم و خراپەکار نیم، فریشتەکە فەرمووی سەرسام مەبە لەکاری خوایی ئەوە فەرمانی خوایەو ئەو فەرموویەتی کەمنداڵێکی پاك و بێگەردت دەبێت و توش پاك و داوێن پاکی بەلای خواوە

[١٩٣] رواه ابن ابي حاتم .

ئەوە كارێكی ئاسانە . ﴿وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِنَّا وَكَانَ أَمْراً مَقْضِيّاً﴾، واتە: ئەوەدەكەین بۆئەوەی دروست كردنی منداڵەكەی تۆ (عیسا) (علیه السلام) ببێتە یەكێك لەموعجیزەكان، تا خەڵكی بزانێ كەخوای گەورە توانایەكی تەواوی هەیە بەسەر هەموو دروستكراوەكانی خۆیدا، هەروەكو چۆن خوای گەورە ئادەمی دروست كرد بەبێ دایك و باوك، وە (حواء)ی دروست كرد بەبێ دایك (واتە: بەبێ ڕەگەزی مێ)، وەعیسای دروست كرد بەبێ باوك، ئیتر هەموو گیانەوەرانی تر دایك و باوكیان هەیە .

﴿وَرَحْمَةً مِنَّا﴾ واتە: ئێمە بەزەییمان بەبەندەكانی خۆماندا دێتەوە، هەروەكو چۆن عیسا لەقۆناغی ساوایی و منداڵی و لاویو پیریدا بانگەواز بۆ خواپەرستی دەكات ﴿وَكَانَ أَمْراً مَقْضِيّاً﴾، ئەوەش فەرمانێكی یەكلاكراوەیە، لەوەدەچێ تائیرەش هەر قسەی (جبریل)بێ(علیه السلام)، وەك (ابن جریر)[194] هێناویەتی، لەوانەیە فەرموودەی خوای گەورە گەورەش بێت، وەك كینایەك دەربارەی فووپیاكردنی جبریل بە (مریم)دا، هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهَا مِنْ رُوحِنَا وَجَعَلْنَاهَا وَابْنَهَا آيَةً لِلْعَالَمِينَ﴾(الانبیاء:٩١)، زیاتر لەیەك كەس لە پێشینەكان فەرموویانە كە (جبریل) (علیه السلام) فوویكردووە بەدەم و چاویدا و لەوێوە فوەكە دابەزیوەتە خوارەوە بۆ لەشی (مریم) و هەرهەمان كات زگی بووە، ئەوە كەسانەی كەپێیان وایە (جبریل) (علیه السلام) فووی بەدەمی (مریم)دا كردووە یان ئەو كەسەی قسەی لەگەڵدا كردووە فریشتەیەكی تایبەتی بووەو لەدەمییەوە لەشێوەی (روح)دا چووەتە ناو لەشیەوە، ئەمانە هەموویان هەڵەن و پێچەوانەی ڕەوتی ئایەتەكەن، چونكە ناوەڕۆكی گێڕانەوە قورئانیەكە بەڕوونی باسی ئەوەی كردووە كە ئەوكەسە یەكێك بووە لەفریشتەكان و (جبریل)یش بووە، فووی پیاكردووە، هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَنَفَخْنَا فِيهَا مِنْ رُوحِنَا﴾ كەبەڵگەیە لەسەرئەوەی كەفووەكەی پێداكراوە، نەك كرابێت بەدەمیدا یان بەسكیدا، (السدي)[195] و هەندێكی تریش هەر وا گێڕاویانەتەوە . (مریم) (علیه السلام) منداڵە جوانەكەی هەڵگرت و ڕوویكردە شوێنێكی لاچەپەك، چونكە دەیزانی كەخەڵكی لە حیكمەتی خوایی تێناگەن و ڕووداوەكەش واكەم نییە، چەند كەسێك لەزاناو ڕاستگۆپێشینەكان، لەوانەش (وهب كوری منبه) دەفەرموێت: كاتێك نیشانەكانی دووگیانی لە (مریم)دا دەركەوت گەلێك

---

[194] ضعیف الیه: تفسیر (٩/ج٦٢/١٦) .

[195] حسن الاسناد: ابن جریر (٣٥٢/١)، التاریخ .

لەگێچەڵباوز بەدکارانی (بنی ئیسرائیل) کەوتنە قسەوباسی خراپ و تاوان خستنە پاڵ مەریەمی داوێن پاك(علیها السلام) لەوانەش یەکەم کەس کەقسەی خراپ و گومانی بڵاوکردەوە پیاوێك بوو ناوی (یوسف کوڕی یەعقوبی دارتاش) بوو، کەپورزای مەریەم بوو، زۆر سەرسامانە ڕووداوەکەی بینی، چونکە ئەو هەمیشە مەریەمی وادەبینی کەخەریکی خواپەرستییەکی تێروتەسەل و بەردەوامە، کەچی وادەبینیٚ کەسگی هەیەو دووگیانە، لەگەڵ ئەوەشدا کەشووی نەکردووەو مێردی نیە .

ڕۆژێکیان بەقسەوباسەوە گرتی و لەمەریەمی پرسی: ئەی مریم ئایا دەشێت ڕووەك بەبیٚ تۆو بڕوێت ؟ مریم فەرمووی: بەڵیٚ: ئەی کیٚ ڕووەکی یەکەمجار دروست کرد ؟ ئینجا پرسی: ئەی دەشێت درەختێك بەبیٚ ئاووباران گەشە بکات ؟ فەرمووی: بەڵیٚ ئەیکیٚ یەکەمجار یەکەم ڕووەکی دروست کرد ؟ ئینجا گوتی: ئایا دەشێت منداڵێك دروست ببێت بەبێبوونی ڕەگەزی نێر (واتا: باوك) ؟ فەرمووی: بەڵیٚ نەوەنیە خوای گەورە ئادەمی دروست کردووە بەبیٚ ڕەگەزی نێرومیٚ ! پێی گوت: دەهەواڵی خۆتم بۆباس بکە ! (مریم)یش (علیه السلام)فەرمووی: خوای گەورە مژدەی پێداوم ﴿بِكَلِمَةٍ مِنْهُ اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَجِيهاً فِي الدُّنْيَا...... وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَمِنَ الصَّالِحِينَ﴾(آل عمران:٤٥-٤٦)، وە دەگێڕنەوە کە (زەکەریا)ش (علیه السلام) هەمان گفتوگۆی لەگەڵدا کردووەو ئەویش بەهەمان وەڵام وەڵامی داوەتەوە، خوای گەورە زاناترە .

هەروەها (السدی)[١٩٦] گێڕانەوەیەکی هێناوە کە ڕۆژێکیان مریم چوو بۆسەردانی خۆشکەکەی، خۆشکەکەی پێی گوت: هەستت بەوە کردووەو زانیوتە کە دووگیانم ؟ مەریەمیش فەرمووی: ئەی تۆ زانیوتە کەمنیش دووگیانم . لەوێدا خۆشکەی دەستی کردەملی و دایکی (یەحیا) فەرمووی: وادەبینم کە منداڵەکەی ناوزاماڵی [١٩٧] من کڕنووش دەبات بۆ (منداڵەکەی) ناوزاماڵی تۆ، ئەوەیە مانای ئەو ئایەتەی کەدەفەرموێت: ﴿مُصَدِّقاً بِكَلِمَةٍ مِنَ اللَّهِ﴾، مەبەست لەو کڕنووشە کڕنووشی سوپاس و ڕێولێنانە، کە لەوسەردەمەدا باوبووەو لەئاینی ئەوکاتەش دا دروست بووە، هەروەکو چۆن فریشتەکانیش کاتی خۆی کڕنووشی ڕێزلێنانیان بۆ (ئادەم) (علیه السلام) برد .

---

[١٩٦] حسن: ابن جریر (٣٥٢/١) .

[١٩٧] زاماڵ: الرحم .

(ابو القاسم) دەفەرموێت: مالك پێی ڕاگەیاندم کە عیسای کوڕی مەریەم و یەحیای کوڕی زەکەریا (علیه السلام) دایکیان خوشك بووە، واتا خۆیان پورزای یەکتری بوون، دایکیشیان پێکەوە هاو دووگیان بوون، هەروەها ڕۆژێك دایکی یەحیا بەمەریەمی فەرموو: من وادەبینم کە بەچکەکەی ناوزگم کڕنووش بۆ بەچکەکەی نازگت دەبات (واتا زامالّت) (مالك) دەفەرموێت: واهەست دەکەم ئەوە پێشاندانی گەورەیی و سەروەری عیسا، چونکە بەهرەی زۆری پێ داوە، لەوانە زیندووکردنەوەی مردوو، چاککردنەوەی کوێری و کەروالّی زگماکی .

لە(مجاهد)یشەوە دەگێڕنەوە کە (مریم) فەرمووی: کاتێك بەتەنها دەبووم (عیسای کوڕم دا لەناو زامالّمەوە) لەگەلّمدا قسەی دەکرد، کەلەناو خەلّکیشدا دەبووم (واتە: عیسا) تەسبیحاتی خوای دەکرد (لەزامالّمدا) . ڕوالّەتی ئاشکرا بەم جۆرەیە: (مریم) (علیه السلام) ماوەی نۆ مانگ دووگیان بووە، وەکو هەموو ژنێکی ئاسایی، خۆنەگەر وانەبوایە باس دەکرا، (ابن عباس و عکرمە) واباس دەکەن کە (هەشت مانگ) دووگیان بووە، لەگێڕانەوەیەکی تری (ابن عباس)دا[198] هاتووە کە هەر دووگیانبووەو خێرا منالّەکەیشی بووە، بگرە لەم بارەیەوە هەندێك فەرموویانە: تەنها ماوەی (نۆ) سەعات دووگیان بووەو بەلّگەشیان ئەم ئایەتەیە ﴿فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَاناً قَصِيّاً فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْياً مَّنسِيّاً﴾، بەلاّم ڕاستتر وایە کەهەموو شتێك بەپێی سروشتی خۆیەتی، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَتُصْبِحُ الْأَرْضُ مُخْضَرَّةً إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾(الحج:٦٣)، وەیان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَاماً فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْماً ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقاً آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾(المؤمنون:١٤)، ئەوەش ئاشکرایە کەنێوان هەریەکە لەو قۆناغانە چل ڕۆژە، وەك لەفەرموودەی پێغەمبەردا[199] (ﷺ) هاتووە .

(محمد کوڕی ئیسحاق) فەرموویەتی: ئەم قسەوباسە لەناو (بنی ئیسرائیل)دا بلاّوبوەوە، ئەو تومەتانەی دەخرایە پالّ مەریەم و کەسەکانی دەخرانەپالّ (زەکەریا) و خێزانەکەیشی(علیه السلام) تەنانەت هەندێ بەدبڕوای وەکو (یوسف) تاوانەکەی خستبووەپالّ (زەکەریا)ش کە لەناو مزگەوتەکەدا لەگەلّیا خواپەرستی دەکردو کەفالەتی

---

[198] متفق علیه: البخاري (٣٢٠٨)، مسلم (٦٦٦٥) .

[199] ضعیف الاسناد: النسائي .

دەكرد، لەبەرئەوە مریم سەریخۆی هەڵگرت لەدەست قسەوباسی ئەوان و خۆی ڕۆیشت و چووە شوێنێکی پەناو بن قەدی دارخورمایەك لە (بیت لحم)[٣٠٠]، کەدواتر هەندێ لەپاشانی ڕۆمەکان خانوویەکی گەورەیان تیادا دروست کردووە .

دیارە مریم زۆر خەمی بەوە خواردووە و هەراسان بووە، بۆیە ئاواتی مەرگی خواستووە یان خۆزگەی خواستووە کەهەر نەبوایە، ئەم ئایەتەش بەڵگەیە لەسەرئەوەی کەمرۆڤ لەکاتی تەنگانەدا بۆی هەیە داوای مەرگ بکات لەخوای گەورە لەپێناو سەلامەتی ئیمانەکەیدا ﴿قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنْتُ نَسْيًا مَنْسِيًّا﴾ ئەوان بەدرۆیان دەکردەوەو باوەڕیان پێنەدەکرد، کاتێك بەخۆی و مناڵەکەیەوە هاتە ناویانەوە ئەگەرچی گەلێك چاك و خواپەرستیشیان تێدابوو کە دراوسێی مزگەوتەکەبوون و لەگەڵیدا و لەپاڵ خانەوادەی پێغەمبەران و پەرستگە پیرۆزەکەیدا بەندایەتی خوایان دەکرد، جا کاتێك ئەوکەسە دراوسێ و خواپەرست و نزیکانەش گومانیان هەبێ، (مریم) ناهەقی نیە کەخەم و پەژارەیەکی زۆری هەبێ و نزای مەرگ لەخۆی نەکات .

﴿فناداها من تحتها﴾ بەدوو شێوە خوێندراوەتەوە، واتا: لەباری خوارەوە بانگی مریم کرا، هەندێك فەرموویانە (جبریل) (عليه السلام) بانگیکردووە، ئەوانەی کەلەگەڵ ئەم چوونەشدان بریتین لە (عوفي) لە (ابن عباس)ەوە[٣٠١]، وە دەڵێت: (عیسا) تەنها لەناو خەڵکەکەدا قسەی کرد و پێشتر قسەی نەکردووە، (سعید کوڕی جوبەیر)یش [٣٠٢] وای فەرمووی لەگەڵ (عمرو کوڕی میمون)[٣٠٣]، (الضحاك)[٣٠٤]، (السدی)[٣٠٥]، (قتادە)[٣]، بەلاّم (مجاهد)[٣] و (الحسن)[٣] و (ابن زید)[٣٠٦] و (سعید کوڕی جبیر)[٣٠٧] فەرموویانە ئەوکەسەی بانگی کردووە (عیسا)ی کوڕی بووەو (ابن جریر)یش ئەوەی هەڵبژاردووە .

﴿فَنَادَاهَا مِنْ تَحْتِهَا أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا﴾(مریم:٢٤)واتە: ئەی مریم خەمبارو دڵتەنگمەبە خوای گەورە ڕووبارێك لەژێرپێت هەڵدەقوڵێنێ، جمهوری زانایان لەسەر ئەو

---

[٣٠٠] في سنده ضعف: البيهقي – دلائل (٣٥٥/٢) .
[٣٠١] ضعيف اليه: ابن جرير (٦٨/١٦/٩) .
[٣٠٢] ابن ابي حاتم (١٣٠٩٥) .
[٣٠٣] صحيح إليه: ابن جرير (٦٨/١٦/٩) .
[٣٠٤] ضعيف إليه: ابن جرير (٦٨/١٦/٩) .
[٣٠٥] حسن إليه: ابن جرير (٦٨/١٦/٩) .
[٣٠٦] حسن إليه: (٦٨/١٦/٩) .
[٣٠٧] ضعيف إليه: (٦٨/١٦/٩) .

بۆچوونەن و لەفەرمودەیەکی لاوازیشدا هەروا (الگبرانی)[٢٠٨] هێناویەتی و (ابن جریر)یش هەڵیبژاردووە کە ڕاستەکەیە و هەروەها لە (الحسن)[٢٠٩] و هەندێکی تریشەوە واباس دەکەن کە ئەوە (عیسای کوڕی مریم)بووە، ڕاستەکەشیان بۆچوونی یەکەمیانە بەبەڵگەی ئەوەی کەفەرمووی: ﴿وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَباً جَنِيّاً﴾(مریم:٢٥) کەتیایدا باسی خواردن و خواردنەوە هاتووە، لەبەرئەوە فەرمووی:﴿فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْناً﴾، واتە: بخۆو بخۆرەوە چاوودڵت ڕوون بێ، وتراوە: دارخورماکە ووشکبووە، وتراوە: بەرداربووە، خوای گەورە زاناترە دەشێت دارخورماکە لەوکاتەدا بەری پێوەنەبووبێت، بەڵام ووشك نەبووە، بەتایبەتیش (عیسا) (علیه السلام) لەوەرزی سەرماو زستاندا لەدایك بووە کەئەو وەرزە خورما بەری پێوە نیە، مانایەکی تریش هەڵدەگری کەخوای گەورە لەڕووی منەتی نیعمەتەکانییەوە پێی دەفەرموێت: ﴿تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَباً جَنِيّاً﴾، (عمرو کوڕی مەیمون)[٢١٠] دەفەرموێت: هیچ شتێك لەخورمای تەڕوتازە بەسوودتر نیە بۆ ژنی زەیستان، پاشان ئەم ئایەتەیش خوێندەوە .

(ابن أبی حاتم)یش[٢١١] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوەسەر (علی کوڕی ابی گالب) کەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (ڕێزی خورما بگرن، لەو گڵە دروست کراوە کەئادەمی لێدروست کراوە لەدرختەکاندا درەختێك نیە جگە لەخۆی متوربە بکات)، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ژنە زەیستانەکانتان خورمای تازەو تەڕیان دەرخوارد بدەن، ئەگەر ئەوەش نەبوو با خورمایی ئاساییبێ، لەناو درەختەکانیشدا هیچ درەختێك هێندەی ئەو درەختە بەڕێز نیە کەمەریەمی کچی عمران چووە بن قەدەکەی، واتا: دارخورما) .

﴿فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَداً فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْماً فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيّاً﴾(مریم:٢٦)، دیارە ئەم دەستەواژەیەش هەر قسەی ئەوکەسە بووە کەباکی کەریەمی کرد و فەرمووی: بخۆو بخۆرەوە لەسێبەری ئەو دارەدا، جائەگەر کەسێك تۆی بینی ویستی پرسیارت لێ بکات بڵێ: من لەسەر خۆم داناوە کە بەڕۆژووبم (ئەوەش بەئاماژە) لەبەرئەوە ناتوانم قسە بکەم، دیارە لەشەریعەت و ئاینی ئەو سەردەمەدا هەرکەس بەڕۆژوو بوایە، ئەبوایە قسەیشی

---

[٢٠٨] ضعيف: الطبراني الكبير (١٣٣٠٣) .

[٢٠٩] صحيح الاسناد: ابن جرير (٧٠/١٦/٩) .

[٢١٠] صحيح الاسناد: ابن جرير (٧٢/١٦/٩) .

[٢١١] منكر: ابن ابي حاتم (١٣١١٣)، (ابي يعلي (٤٥٥)، ابن عدي (٤٣١/٦) .

نەکردایە، هەروەکو (قتادە)[٢١٢] و (السدی)[٢١٣] و (ابن اسلم)[٢١٤] فەرموویانە و بەڵگەیان خودی ئایەتەکەیە کەدەفەرموێت: ﴿فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا﴾، بەڵام لەئاینی ئێمەدا ئەوە باش نیە کە ڕۆژووشکاندن دوابخرێت بۆشەو . ﴿فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا﴾ (مریم:٢٨)، واتا: (منداڵەکەی هەڵگرت و هاتنەناو گەلەکەی، پێیان گوت: ئەی مەریەم شتێکی خراپت کرد، ئەی خوشکی هارون، خۆتۆ باوکێکی خراپەکار و دایکێکی بەدکارت نەبوو؟) .

هەندێ لەپێشینەکان لە (اهل الکتاب)ەوە وەریانگرتووەو دەڵێن کاتێك مریەم دیارنەما لەناویاندا، بەدوایدا گەڕان و بیدۆزنەوە، بەڵکو خۆی منداڵەکەی هەڵگرت و هەر خۆیشی هاتەوە ناو گەلەکەی، دوای چلەچوونی منداڵەکەی، (یا اخت هارون)، وتراوە گوتویانە: ئەی مەریەم تۆ وەك خوشکی هارونی کە (هارون) پیاوێکی خواپەرستی ئەو سەردەمەبووە، وتراوە: (هارون) پیاوێکی بەدکار و بەدڕەوشت بووە لەو سەردەمەدا ژیاوە، وەکو (سعید کوڕی جوبەیر)[٢١٥] وایفەرمووە، واتراوە مەبەستیان ئەوەبووە کەبلێن تۆ لەبەندایەتی و خواپەرستیدا لەئاستی (هارون)ی برای (موسا)دابویت، بەڵام (محمد کوڕی کعب) بەهەڵەداچووە کە پێیوایە (مریم) بەڕاستی خوشکی (هارون)ی برای (موسا)بوو(علیه السلام) چونکە چەندین چاخ و سەدە لەنێوان (هارون)ی برای (موسا) و سەردەمی (مریم)دا هەیە، لەوەدەچێ ئەو قسەیە کاری تێکردبێ کەجولەکەکان دەڵێن لەتەوراتدا واباس کراوە کەئەو ڕۆژەی خوای گەورە (موسا)ی لەدەست فیرعەون ڕزگارکرد و خراپەکانی نقوم کرد، (مەریەم) لەخۆشیاندا دەف لێدەدا، کەئەو پێ یوایە ئەم مەریەمە ئەو مەریەمەبووە، بەڵام ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە، لەفەرموودەیەکیشدا کە پێدەچێت برایەکی هەبووبێت ناوی (هارون) بووبێت، بەڵام ڕەوتی ئایەتەکەو شێوازی گێڕانەوەی چیرۆکەکەی لەقورئاندا هیچ ئاماژەیەکی وای تێدا نیە کە برایەکی هەبووبێت، خوای گەورە زاناترە .

لەگێڕانەوەیەکدا کەپێشەوا احمد هێناویەتی کەدەیباتەوە سەر (المغیرە کوڕی شعبە) دەدەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) منر نارد بۆ (نەجران) لەوێ پێیان گوتم: چۆن ئێوە ئەمە

---

[٢١٢] رجاله ثقات: ابن جریر (٧٤/١٦/٩) .

[٢١٣] حسن الاسناد: ابن جریر (٧٤/١٦/٩) .

[٢١٤] صحیح الاسناد: (٧٤/١٦/٩) .

[٢١٥] ابن ابی حاتم پشتگیری کردووه (١٣١٢٠) .

دەخوێننەوە (یا اخت عارون) لەکاتێکدا (موسا) ئەوندە ساڵە پێش (عیسا) ژیاوە ؟ دەڵێت: منیش گەڕامەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەم بۆگێڕایەوە، فەرمووی: ئەی هەواڵی ئەوەت پێڕانەگەیاندن کەکاتی خۆی ئەوان مناڵەکانیان بەناوی پێغەمبەر و پیاوچاکە پێشینەکانی خۆیانەوە ناو دەنایەوە؟ [٢١٦]، گێڕانەوەیەکی تری هاوواتای ئەمەش (قتادە)[٢١٧] و هەندێکی تر هێناویانە کەدەفەرموێت: ئەوان کەسانێکی زۆریان تێدابووە کەناویان (هارون)بووە، تەنانەت وتراوە: کەهەندێ ئەسپەردەکردنی تەرم هەبووە چوارهەزار کەسی تیایدا ئامادەبوون کە ناویان (هارون)بووە، خوای گەورە زاناترە .

بەکورتی: ئەوان گوتیان: (یا أخت هارون) فەرموەدەکەش واباس دەکات کەپێدەچێ برایەکی ڕاستەقینەی هەبووبێت ناوی (هارون)بووە، کەسێکی چاکەکارو خواناس و خێرخوزابووە، گرنگ ئەوەیە بەو وشەیە دەیانەوێ زیاتر زامداری بکەن، بگرە لەوە زیاتریان کردووە، هەروەکو (ابن جریر)[٢١٨] لەمێژووەکەیدا دەفەرموێت: ئەوان (زەکەریا)یان بەوە تاوانبار دەکرد، لەلەرئەوە بەتەمای کوشتنیبوون، بۆیە لەدەستیان ڕایکردو خۆی لەناو کلۆرەدارێکدا شاردەوەو پاشان دۆزیانەوەو شەهیدیان کرد، هەروەها یەکێکیتر لەوانەی کەتۆمەتی دەخستە پاڵ (مەریەم) (علیە السلام) بریتیبوو لەخاڵۆزاکەی خۆی کەناوی یوسف کوڕی یەعقوبی دارتاش بوو، بەلأمك لەوەلأمی ئەو هەموو هەڕەشەو قسە دزێوو بێسەرەوبەرانەیاندا (مریم) (علیە السلام) بەئاماژە تێیگەیاندن کە بۆ وەلأمی پرسیارەکانتان ڕووبکەنە کوڕیەکەم، کەسەتوڕەو گازەندەکارەکەی ئەوان بە (مریم)ی گوت: ﴿فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَنْ كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا﴾؟، واتە چۆن بەئێمە دەڵێی: با ئەو کوڕە وەلأمبداتەوە کەهێشتا زمانی نەگرتووەو لەسەر بێشکەیەو شیرەخۆرەیە، خۆئەو جارێ دۆو ڕۆنەکە جیاناکاتەوە، دیارە تۆ سوکایەتیمان پێدەکەیت و پێمان ڕادەبوێری، ئەگینا وەلأمەکەمان نادەیتەوە دەست مناڵێکی ساوا ! ئیتر بۆیەکەم جار مناڵەکە واتە: عیسا (علیە السلام) هاتەقسەو فەرمووی﴿قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ... وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا﴾، سەرنج لەم یەکەم قسەیەی (عیسا) بدەین (علیە السلام) کەهێشتا منداڵە ئەوەدەگەیەنێت، کە

---

[٢١٦] صحيح: أحمد (٤/٢٥٢)، مسلم (٥٥٦٣)، النسائي – الكبير (١١٣١٥)، الترمذي (٣١٥٥) .

[٢١٧] حسن الاسناد: التاريخ (١/٣٥٢) .

[٢١٨] حسن الاسناد: التاريخ (١٣٥٢) .

(عیسا) (علیه السلام) پێش هەمووشتێ بەندەیەکی خوای گەورەیە، پاشان پەیامی خوایی بۆدێت و دەبێتە یەکێك لەپێغەمبەرە سەروەرەکان، ئەمە یەکەم شایەتمان و دان پیانانی ئەوە بەتاك و تەنیایی خوای گەورە، وە بەرپەرچی ئەوەشیان دەداتەوە کەتەنها چاکەکار و پاکژان دەبنە پێغەمبەری خواو ئەو قسانەی دەیکەن و تاوان دەخەنەپاڵ دایکی، هەموویان بوهتانن، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَى مَرْيَمَ بُهْتَاناً عَظِيماً﴾ (النساء:١٥٦)، چونکە هەندێ لەجولەکەکان دەیانگوت (پەنا بەخوا) مریم بەزنا لەکاتی بێنوێژیدا منالیبووەو زگیبووە، خوای گەورەیش پاکانەی ئەو ڕادەگەیەنێ لەسەر زمانی منالێکی ساوا، کەمنالی خۆیەتیو هێشتا لەبێشکە شیردەخوات، هەواڵی ئەوەشی دانێ کەئەو جگە لەوەی دایکی بێتاوانە، خۆیشی بێگەردەو وێڕای ئەوەش گەلێك پیرۆزیشە، جاڕوو لەهەرکوێ بکات ﴿وَجَعَلَنِي مُبَارَكاً أَيْنَ مَا كُنتُ﴾، چونکە لەهەموو شوێنێ بانگەوازی یەکتاپەرستی خوادەکات و تاما لەژیانیش دابێ سپاردەی خوایی بەجێ دەهێنێ کەنوێژکردن و زەکات دانە ﴿وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيّاً﴾ ئەم ئایەتەش ئاماژەی نوێژکردنی تێدایە کەکڕنووش اونوێژدایەو پێشاندانی ئەوپەڕی زەلیلی و بجوکی مرۆڤە بەرانبەر بەخوای گەورە، زەکاتیش پاکەرەوەی دەروون و ماڵە .

﴿وَبَرّاً بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّاراً شَقِيّاً﴾، وە خوای گەورە وای دروست کردووم کە چاکەکاربم بەرانبەر دایکم (چونکە باوکم نیە) هەرگیز من سەرکەش و یاخینابم، بگرە هەرگیز من لەخوای خۆیشم یاخینابم نەبەگوتە و نەبەکردار ﴿وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيّاً﴾، واتە: خوای گەورە سلاوی لێکردووم لەو ڕۆژەی تیایدا لەدایك بووم، وە لەو ڕۆژەی تیایدا دەمرم و لەو ڕۆژەی تیایدا زیندوودەبمەوە، ئەم سێ کاتەش گەورەترین سێ کاتی گۆڕانی جیهانەکانی ژیانی مرۆڤو قۆناغەکانیەتی، ئەوەی لەوسێ کاتەدا سلاوی خوای لەسەربوبێت، دیارە هەموو تەمەن و ژیانی هەردوو دنیای لەژێر سایەی سلاوی خوادابووە .

﴿ذَلِكَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ الْحَقِّ الَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ،مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَانَهُ إِذَا قَضَى أَمْراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ (مریم:٣٤-٣٥)، لێردا خوای گەورە باسی چۆنیەتی دروست کردنی (عیسا) دەکات(علیه السلام) وەباسی ئەوە دەفەرموێت کەخوای گەورە دوورە لەزاوزێ و زۆربون و منالداری .

دیسان خوای گەورە هەر لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ذَلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ مِنَ الآيَاتِ وَالذِّكْرِ الْحَكِيمِ ....... ... فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِالْمُفْسِدِينَ﴾ (آل عمران:٥٨-٦٣)، لەبەرئەوە کاتێك نوێنەری گاورەکانی نەجران هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ کە بریتیبوون لەشەست کەس ولاّخسوار، ئەوانیش کاروبارەکانی خۆیان سپاردەوە بە چواردەکەس لەخۆیان، دیسان ئەو چواردەکەسەش لەنێوان خۆیاندا سێکەسیان هەڵبژاردو کردیانن بەنوێنەری و سەرکردەی نوێنەرایەتی خۆیان، ئەو سێکەسە بریتیبوون لە (العاقب)، (السید)، (ابو حارثە بن عقلمە)، ئەو سێکەسە لەگەڵ موسوڵمانان کەوتنە گفتوگۆ دەربارەی حەزرەتی مەسیح(علیه السلام) خوای گەورەش ناوجەرگەی سورەتی (ال عمران)ی لەم بارەیەوە دابەزاند، تیایدا هەموو ئەو لایەنانەی ڕوون کردەوە کەپەیوەندی بە (عیسا)وە (علیه السلام) هەبوو، هەر لەدروستکردنی خۆی و دایکییەوە تاکۆتایی هەنگاوەکانی تر، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد کەنەفرەتیان لێبکەن و فەرامۆشیان بکەن ئەگەر بەباشی وەڵامی فەرمانی خواییان نەدایەوە، کاتێك ئەوان بارودۆخەکەیان وابینی گەڕانەوە بۆ جەنگ نەکردن و ماڵاوایکردنی ئاشتییانە، بەڵام قسەکەر بەناوی گاورەکانەوە (العاقب عبدالمسیح) ڕووی لەپێرو دەستەکەی خۆی کردو پێی گوتن: ئەی نەصاراکان ! خۆ زانیتان کە (محمد) (ﷺ) پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوەو زانیاریشی تەواویشی پێدان دەربارەی (عیسا) (علیه السلام) و جیاوازیەکانی لەگەڵ ئەوەدا، وە زانیتان پێغەمبەر بۆ هەرگەلێك ڕەوانەکرابێ، هەرخۆی بەگەورەی ئەوان ماوەتەوە، هەرگیز بچوکەکانی ئەوگەلە پێناگەن بەهۆیئەوەوە ئەو هاتووە بۆ بن بڕکردنی ئێوە، ئەگەر بچنە سەر دینەکەی، خۆئەگەر نەچنەسەر قسەکانی ئەویش، ئەوا لەسەر ئاینی خوپێگرتووی خۆتان دەمێننەوە دەربارەی (مەسیح) ئەگەر بەقسەی من دەکەن واز لەم پیاوە (واتە: محمد) (ﷺ) بهێنن و بگەڕێنەوە وولاّتی خۆتان، ئەوان ئەم داواکاریەیان لەپێغەمبەر (ﷺ) کرد و جەنگیان پەسەندنەکردو داوایان کرد کیسەرانەیان لەسەردابنرێ، وە پیاوێکی دەست پاکیشیان لەگەڵ بنێرێت، پێغەمبەریش داواکەی پەسەندکردن و (اباعبیدە الجراح)ی لەگەڵدا ناردن، ئەم ڕووداوەش لەتەفسیری سورەتی (ال عمران) ڕوونمان کردوەتەوە [٢١٩]

ناوجەرگەی سورەتی (مریم) کەباسی سەرەکیەکانی چیرۆك و ڕوداوی (عیسا)ی کوڕی مەریەمی تێدایە(علیه السلام)، ئەم ئایەتانەیە کەژمارەکانیان نووسراوە:

---

[٢١٩] تەفسیري (تفسیر القران العظیم)ی (ابن کثیر) .

(٣٤,٣٥,٣٦)، ئەم ئایەتانەش دەقی قسەکانی (عیسا)بوو (علیه السلام)کاتێك لەسەر بێشکەبووە .

﴿فَاخْتَلَفَ الْأَحْزَابُ مِنْ بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ مَشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾(مریم:٣٧)، واتە: خەڵکی سەردەمی لەدایك بوونی (عیسا) و خەڵکانی دواتریش گەلێك قسەوباسی جیاجیایان هەبووە لەسەر (مریم) و (عیسا)(علیه السلام) مەبەست لەجولەکەکانە: کەسی وایان تێدابوو دەیگوت: (عیسا) (علیه السلام) بێژەیە [٢٢٠] و بەردەوام بوون لەسەر کەللەڕەقی و بێبڕوایی خۆیان، هەندێکیتر بەپێچەوانەوە بەجۆرێکیتر

بێبڕوایی خۆیان سەلماند کەدەیانگوت (عیسا) خۆی (خوا)یە، دەرتەیەکی تر دەیانگوت: (کوڕی خوا)یە، بەڵام باوەڕدارەکانیان دەیانگوت، یان باوەڕداران دەیانگوت: عیسا بەندەی خواو ڕەوانەکراوی ئەوە و کوڕی دایکی خۆیەتی و گۆیندەی [٢٢١] خوایەو کردویەشیە زامالّی مەریەمەوەو ڕۆحێکە لەخواوە، دیارە ئەم دەستەیە ڕاستن و سەرفەراز و باوەڕدارن، ئەوانی دیکەش خوای گەورە هەڕەشەی سزای لێکردوون، وەك دەفەرموێت: ﴿فَاخْتَلَفَ الْأَحْزَابُ مِنْ بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ مَشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (مریم:٣٧)، واتە: سزاو وەیل بۆئەو کەسانەی باوەڕیان نیە بەخواو بەدیمەنە ترسناکەکانی ئەو ڕۆژە گەورەیە (قیامەت) کەدێتە ڕێیان .

(پێشەوا بخاری)[٢٢٢] فەرمودەیەکی بردوەتەوە سەر (عوبادەی کوڕی صامت) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (هەرکەس شایەتمان بێنێ بەوەی کە جگە لە الله پەروەردگاری تر نیە و هاوەڵیشی نیە، وە محمد بەندەو ڕەوانەکراوی خوایە و عیساش بەندەو نێردراوی خوایە، گوێندەیەتی و خستویەتیە لەشی مەریەمەوە و ڕۆحێکە لەخواوە، وە باوەڕی بەوە هەبێ کەبەهەشت و دۆزەخ هەیە، ئەوا خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە، جا هەرکردەوەیەکی کردبێت)، وە لەگێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کەدەچێتە بەهەشتەوە لەهەرکام لەهەشت دەرگاکانەوە بیەوێت .

خوای گەورە لەسورەتی (مریم) ئایەتی (٨٨-٨٩) باس لەوە دەکات کەئەو کەسانە قسەیەکی خراپ و تاوانێکی گەورەیان کردووە کاتێك دەڵێن: (عیسا) (علیه السلام) کوڕی

---

[٢٢٠] بێژی: بێژوو: باب نەزانراو .

[٢٢١] گۆیندە: کلیم .

[٢٢٢] متفق علیه: بخاری (٣٤٣٥)، مسلم (١٣٩) .

خوایە، یان قسەکانی تریان، وە لەئایەتی (٩٠-٩٥)دا باسی ئەوە دەفەرمویت کەخەریکە ئاسمانەکان کەرت و پەرت و زەوی شەقار شەقار ببیٚ و شاخ و کێوەکان بەسەریەکا بڕمێن کاتێك ئەوان ئەو قسە پوچ و ناشایستەو کوفرانەدەکەن و منالٚ بۆخوا بڕیاردەدەن، ئەگینا هەموو ئاسمانەکان و زەویش بەندەی خوای گەورەن و لەفەرمانی ئەو لانادەن و هەرهەموویشی لایئەو هاتۆتە ئەژمارو پەیمانی بەرپەرستنی خواداوەو لەڕۆژی دواییش دا هەرکەسە و بەتەنها دێتە بەر بارەگای خوای گەورە، وە لەسورەتی (الانعام) ئایەتی (١٠٠-١٠٣)دا دەفەرمویت: ﴿وَجَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ الْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ وَخَرَقُوا لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ ........ لا تُدْرِكُهُ الْأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ﴾ ئەوە ڕوون دەکاتەوە کەخوای گەورە بۆخۆی بەیهێنەری هەموو شتەکانە هەمووی لەژێر دەسەلاتی ئەودایە، ئیتر چۆن منالی ئەبێت و چ پێویستی بەمنالٚ هەیە، منالیش پێویستی بەدایك و باوك هەیە، خوای گەورەش لەو شتانە پاك و بەدوورەو هاوتاو هاوشێوەی نیە، دیسان سورەتی (الاخلاص) بەتەواوەتی ئەوەی دەرخستووە کەخوای گەورە تاك و بێهاوتاو بێهاوەلە چ لە (ذات) و چ لە (صفات)دا، وە چ لە کردەوکار و فەرماندا و هەرگیز (لم یلد) منالی نابیٚ و نیەتی، وە (ولم یولد) خۆیشی لەکەسێکی پێشترەوە نەبووە، هەرخۆی سەرەتاو کۆتایە و بێسەرەتاو بێکۆتایشە .

وە خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ وَلا تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللَّهِ ...................أَمَّا الَّذِينَ اسْتَنْكَفُوا وَاسْتَكْبَرُوا فَيُعَذِّبُهُمْ عَذَاباً أَلِيماً وَلا يَجِدُونَ لَهُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلِيّاً وَلا نَصِيراً﴾(النساء:١٧١-١٧٣)، لەم ئایەتە پیرۆزانەدا خوای گەورە فەرمان بە (اهل الکتاب) دەکات کە لەسنوری خوایی لانەدەن و (عیسا)ش لەوە گەورەتر نەکەن کەخوای گەورە بۆی ڕوون کردونەتەوە، ئەویش ئەوەیە کە (عیسا)(علیه السلام) بەندەی خوایە، پێغەمبەرێکی خوایە، خوایگەورە بەپاکی لە (مریم) دروستیکردووە، پاش ئەوەی (جبریل) (علیه السلام) بەفەرمانی خوایی فوی پیاکرووەو ڕۆحی ڕەوانەکراوی لەخواوە بەبەردا کردووە، وە وشەی (روح الله)ش ڕێزلێنانێکە بۆ (عیسی)(علیه السلام) چونکە بەبیٚ باوك دروستی کردووە، هەروەها هەموو شتەکانیتر کەگوتراوە (ناقە الله، عبدالله، بیت الله)، هەروا بەوجۆرەش بۆ ڕێزلێنانی وتراوە (عیسا) (علیه السلام) (روح الله)یە، وە موساش (علیه السلام) (کلیم الله)یە، هەروەها خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِنْدَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ﴾، واتە: دروستکردنی عیساش هەروەهو

دروستکردنی ئادەم وایە بەلای خواوە، کەلەگڵ دروستی کردووەو فەرمووی ببە، ئەویش (بوو)ە .

خوای گەورە لەچەند سورەت و ئایەتێکی پیرۆزدا بەجیاو تێکەڵی باسی ڕووداوی دروستکردنی (عیسا) و بەسەرهاتی دایکی و گەلەکەی دەکات لەکاتی خۆی و لەدوای خۆی کەچۆن قسەوباسی خراپ و تەفسیرو لێکدانەوەی نابەجێ دەکەن بۆ چۆنیەتی ڕووداوەکە، پاشان دەربارەی نەزانیی ئەوان دەدوێ کەئەوان بەئارەزووی خۆیان پێیان لەسنور لاداوەو باسی عەقڵیەتی یەکەم و دووەم و گەردونەکان دەکەن و دابەشیان دەکەن، ئەو هەوڵدانەرانەی عەرەبیش بیریان کردوەتەوەو بگرە باسیان لەنێرومێی فریشتەکان کردووەو جۆرەها قسەو لێکدانەوە بێمانایان داڕشتووە و هەڵبەستووە کەدورن لەڕاستییەوە، بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە دەکریچت بچیتە خزمەتی تەفسیری ئەم ئایەتانە بەزمانی کوردی کەلێکدانەوەی سورەتەکان و ژمارەی ئایەتەکان دەخەنە ڕوو: (الزخرف/١٩)، (الصافات/١٤٩-١٦٠)، (الانبیاء/٢٦-٢٩)، (الکهف/١-٥)، (یونس/٦٨-٧٠)، (النساء/٨٢)، (المائدە/١٧)، (المائدە/٧٢-٧٥) .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾، واتە هەرکەسێك هاوەڵ بۆخوا دابنێ، خوای گەورە بەهەشتی لێ حەرام کردووە و شوێن ماوەی ئاگری دۆزەخەوەو ستەمکارانیش هیچ کەسێك پشتیوان و ڕزگارکاریان بێت، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ إِنَّهُ مَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾(المائدە:٧٢)، (ابن جریر) و هەندێکی تر دەربارەی مانای ئەم ئایەتە فەرمویانە: مەبەست لەو سێ کارە بێ بڕواکان بناغەی کوفریان لەسەر داڕشتووە و بەلای ئەوانەوە بریتین لەمانە: (باوك، کوڕ، وشەی دەرچوو لەباوکەوە بۆ کوڕ)، ئەمەش چەند جیاوازیەکیان لەنێوان خۆیاندا بۆ دروست کردووە لەنێوان (مەلیلی و یەعقوبی و نەسگوری)دا، نەفرەتی خوایان لێبێ، دواتریش بەپشتیوانی خوای گەورە بەووردی باسی ئەو کوفرەیان دەکەین کەبوونەتە سێ کۆمەڵی جیاجیا لەسەردەمی (قسطنتین کوڕی قسطس)دا، کە سێ سەد ساڵیش پێش پێغەمبەرایەتی محمد بووە (ﷺ) .

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿وَإِن لَّمْ يَنتَهُوا عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، واتە: ئەگەر ئەوان دەست بەرداری ئەو قسانەیان نەبن کەدەیکەن دەربارەی خوای گەورە و

هاوەڵ بۆدانانی ئەوا بێ بڕواکانیان سزا بەئازاریان پێدەبڕێ، دوایئەوە لە ڕووی ڕەحمەتی خۆیەوە دیسان دەروازەی پەشیمان بوونەوەیان بۆدەکاتەوە کەپاشگەزببنەوەو تەوبە بکەن، لەو قسانەیان، چونکە خوای گەورە بەبەزەیی و لێبوردەیە بەرامبەریان و لێیان خۆش دەبێ، وەك دەفەرموێت:

﴿أَفَلا يَتُوبُونَ إِلَى اللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾، واتە:ئەدی هەر تەوبە ناکەن بۆلای خوا، خۆ خوای گەورە لێبوردە و بەبەزەییە، پاشان خوای گەورە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کەماڵ و گوزەرانی حەزرەتی (مەسیح) (عليه السلام) چۆن بووەو چۆن چۆنی لەدایك بووەو، دایکیشی وەك هەرمرۆڤێکی تر مرۆڤە و پێغەمبەر نیە، هەروەها (عیسا)ی کوڕیشی هەر مرۆڤە، بەڵام پێغەمبەرە، کەواتە بەناڕاستەوخۆ وریایان دەکاتەوەو تێیان دەگەیەنێن کە ئەو دایك و کوڕە مرۆڤن، نە (خوا)ن و نەکوڕو کچی خوان .

ئەی ئەوە نیە (كانا يأكلان الطعام) س، واتە پاشەڕۆژیان، ئەمانەش خەسلەتی مرۆڤن خوای گەورە خواردنی پێویست نیە، وەکو ئەو نەفام و ناحاڵیانە گومانی وایان بلاوکردۆتەوە، (السدی) دەفەرموێت خوای گەورە مەبەستی لەئایەتی ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلاثَةٍ﴾ ئەوەیە کە ئەو بێبڕوایانە دەیانگوت (الله) یەکێکە لەسێ خواکان، کە بریتین لە (عیسا، مریم، الله)، ئینجا خوای گەورە دیمەنی ئەو کاتەیان بۆباس دەکات کە (عیسا) (س،خ) ل دواڕۆژدا زیندوو دەکرێتەوەو خوای گەورەش بۆ شەرمەزارکردنی ئەو بێبڕوایانە لە (عیسا) دەپرسێ، ئایا تۆ بەو خەڵکەت گوتووە کە من و دایکم بکەنە دوو خوای تر جگە لە (الله) ؟ ئەویش دەفەرموێت: پاکی و بێگەردی بۆتۆیە، من چۆن دەتوانم قسەیەك بکەم کەمافی من نیە، خۆ ئەگەر شتی واشم گوتبێت ئەوە خۆی لەمن باشتری دەزانیت و هەرتۆ دەزانی چی لەناخ و دەروونی من دا هەیە و من هەرگیز نازانم چی لەدەروونی تۆدایە، خۆ خۆت زانای بەهەموو نهێنییەکانی، من جگە لەوەی خۆت فەرمانت پێکردووم هیچی ترم پێ نەگوتوون، کەپێم گوتوون خوای گەورە بپەرستن، ئەو خوای من و ئێوەیشە و هەرخۆشم شایەتم بەسەریانەوە کەئەوەم پێڕاگەیاندوون، ئەوەندی کە لەناویاندابووم، جا کەمن لەناویاندا هەڵگرت خۆت چاودێر و ئاگاداربوویت بەسەریانەوەو هەرخۆشت بەسەر هەمووشتێکا بەئاگایت، جا ئەگەر لەسەر ئەو تاوانەیان سزایان بدەیت بەندەی خۆتن، وەئەگەر لێشیان ببوریت هەر خۆت بەتوانا و بەحیکمەتیت، ئەمەش تەفسیری ئایەتی (١١٦-١١٨)یە لەسورەتی (المائدە) .

سەرنج بدەین لەکۆتایی ئایەتەکەدا (عیسا) (علیه السلام) نەیفەرمووە (غفور الرحیم)، بەڵکو فەرموویەتی (عزیز حکیم)، واتا ئەوانە شایستەی ئەو سزایەن، بەلاّم بڕیاریش بڕیاری خۆتە، (پێشەوا احمد)[٢٢٣] گێڕانەوەیەکی بردۆتەوە سەر (ابی ذر) کەپێغەمبەر (ﷺ) شەوێکیان تابەیانی هەر ئەو ئایەتەی دووبارە کردوەتەوە ﴿إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾، وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (من داوای تکام کرد بۆ ئومەتەکەم، خوای گەورە پێی دام، ئەمەش بەپشتیوانی خوای گەورە بۆ هەموو ئەوکەسانەیە کەهیچ هاوەڵێکیان بۆ خوا بڕیارنەداوە)، وە لەچەند سورەت و ئایەتی دیکەدا خوای گەورە باسی گەورەیی و تەنهایی و بێهاوەڵی خۆی کردووە و دەکرێت بۆ مانا و تەفسیرەکەیان سوود وەربگیرێت لەتەفسیرە کوردیەکان، کەئەمەش ناوی سورەت و ژمارەی ئەو ئایەتانەیە: (الانبیاو/١٦-٢٠)، (الزمر/٤-٥)، (الزخرف/٨١-٨٢)، (الاسراء/١١١)، (الاخلاص/١-٤) .

(پێشەوا بخاری)[٢٢٤] گێڕانەوەیەکی لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) هێناوە کەدەفەرموێت: (خوای گەورە دەفەرموێت: ئادەمیزاد جنێوی پێداوم کەوانەبووم، پێی وایە من منالّم هەیە، بەلاّم من تاك و تەنهام، بەجۆرێك نەکەسم لێبووەو نەلەکەس بووم، وەکەس هاوتای من نیە)، وە لەگێڕانەوەیەکی تردا کە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەفەرموێت[٢٢٥] (هیچ کەسێك نیە بتوانێت ئارامبگرێت لەسەر ئەو ئازارەی کە لەخوای گەورەوە بیستومەتەوە و دایناوە بۆ ئەو کەسانەی منالّ بۆخوا بڕیار دەدەن و کەچی هەر ئەو خوایەشە ڕۆزیداون و پاراستوونی)، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:[٢٢٦](خوای گەورە جڵەو بۆ ستەمکار شل دەکات تاکو لەناکاو وادەیگرێت کەدەربازبوونی نەبێت)،

پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:﴿وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾ وە خوای گەورە لەچەند ئایەتێکی تردا ئاماژەی بەسزادانی ستەمکاران و بێ باوەڕان و بەدکاران کردووە کە لەناکاو دەیانگرێت، وەکو ئەم سورەتانە: (الحج/٤٨)، (لقمان/٢٤)، (یونس/٦٩-٧٠)، (الطارق/١٧) .

---

[٢٢٣] ضعیف: رواه النسائي (٢/١٧٧)؛ احمد (٥/١٥٦)؛ المسند وحسنة الالباني .

[٢٢٤] صحیح: البخاري (٣١٩٣) .

[٢٢٥] متفق علیه: البخاري (٦٠٩٩)، مسلم (٧٠١١)

[٢٢٦] متفق علیه: البخاري (٤٦٨٦)، مسلم (٦٥٢٤) .

سەرەتا بەسمان لەوە کرد کە (عیسا) (علیه السلام) لە (بیت لحم)ی نزیك (بیت المقدس) لەدایك بووە، (وهب کوڕی منبە)یش پێی وایە کە لە (مصر) لەدایك بووە، وە (مریم) (علیه السلام) لەگەڵ (یوسف کوڕی یەعقوبی دارتاش)دا بەسواری گوێدرێژێك کۆچییان کردووەو هیچ شتێك لەنێوانیاندا نەبووە لەسەر پشتی وولاخەکە . . ! بێگومان ئەمەش ڕاست نیە، چونکە ئەو فەرموودەیەی پێشووتر بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە لە (بیت لحم) لەدایك بووەو هیچ بەڵگەیەکیش ئەو ڕاستیە هەڵناوەشێنێتەوە.

(وهب کوڕی منبە)[٢٣٧] دیسان واباس دەکات کەکاتێك (عیسا) (علیه السلام) لەدایك بووە، هەموو بتەکانیسەرڕووی زەوی لەخۆرهەلأت و خوراوادا بەدەمدا کەوتن و شەیتانەکان سەرسام و پەراکەندەبوون (عیسا)ی (علیه السلام) پێڕاگەیاندن و (عیسا)یان لە ژوورەکەی دایکیدا دۆزیەوە کە فریشتەکان چاویان لەسەری بوو، واتا: چاودێری عیسایان دەکرد هەر ئەو کاتە ئەستێرەیەکی پڕشنگدار و گەورە لەئاسماندا دەرکەوت، پاشای فارسەکان لەو دەرکەوتنی ئەستێرەکە داچڵەکی و پرسیاری لەجادوگەر و کاهنەکان کرد دەربارەی ئەو ڕوداوە، ئەوانیش گوتیان: ئەمە لەدایك بوونی مرۆڤێکی گەورەیە، پاشان نوێنەرو نێردراوی خۆی ڕەوانەکرد کەزێڕو دیارییان پێبوو بۆ ئەوکەسە لەدایك بووە، کاتێك گەیشتنە شام، پاشای شام هەواڵی کارەکەیانی پرسین و ئەوانیش ڕووداوەکەیان بۆباس کرد، ئەویش پرسیاری لەوکاتە کرد، بۆی دەرکەوت ئەو کاتەیە کە (عیسا) (علیه السلام) لەدایك بووە، لە (بیت المقدس)، دەنگ و باسی لەدایکبوونی (عیسا)ش زۆرباو بووە لەو کاتەدا، چونکە لەسەر بێشکەبووە کەقسەی کردووە، پاشاش نوێنەرەکانی پاشای فارسەکانی بەخۆیان و دیاریەکانیانەوە نارد بۆلای مناڵەکە (واتە: عیسا(علیه السلام) وە کەسێکی شارەزایشی لەگەڵدا ناردن تاکو دوایخۆی تەکتیك دابنێ بۆ کوشتنی ئەو مناڵە (واتە: دوای گەڕانەوەی نوێنەرەکان)، کاتێك گەیشتە لای (مریم) (علیه السلام) بەخۆیان و دیاریەکانیانەوەو گەڕانەوە، بە (مریم) ڕاگەیەنرا کەپیاوانی پاشای شام بۆئەوە هاتبوون کەمناڵەکەت بکوژن، ئەویش مناڵەکەی هەڵگرت و بەرەو (میصر) کەوتنەڕێ، لەوێ مایەوە تاکو تەمەنی (عیسا) ((علیه السلام) گەیشتە دوازدە ساڵأن، نیشانەکانی موعجیزەکانی داری و کەراماتی هەر لەمناڵیشیەوە تێدا دەرکەوت، لەوانەش

[٢٣٧] حسن الاسناد: ابن جریر .

واباس کراوە کە ئەو لێپرسراو هەرێمەی [٢٢٨] کەئەوان لایاندایە ماڵەکەی، کەتەنها هەژار و داماوو کەم ئەندام ڕویان تێدەکرد، بڕە پارەیەکی لێبرابوو نەیدەزانی کێ بردویەتی، ئەو هەواڵە درا بەگوێی (مریم)دا(علیه السلام) ئەویش (واتە: خاوەن ماڵەکە) ڕووی نەدەهات ئەوە بەسەر (مریم)دا بسەپێنێ .

کاتێك (عیسا) (علیه السلام) بەوەیزانی بەپیاوێکی کوێری گوت: ئەو کورسیە هەڵبگرە لەگەڵ دواهەمین پیاوی ئەو ڕیزەداو هەستەرەسەرپێ، پیاوەکە گوتی: ناتوانم ئەوەبکەم، پێی گوت: ناو، دەتوانیت هەروەکو توانیتان لەگەڵ ئەم پیاوەی یاوەرت دا بەرزی بکەنەوە و پارەکەی کە لەو کونە دیوارەدا شاردرابوەوە بیبەن، کاتێك (عیسا) ((علیه السلام) ئەو قسەیەی کرد، دوو پیاوەکەش ئۆباڵیان کێشاو باوەڕیان بەقسەکەی کرد، ماڵە دزراوەکەشیان گەڕاندەوە جێی خۆی، (عیسا)ش ((علیه السلام) لەچاوی خەڵکەکەدا زۆر گەورەتربوو، لەکاتێکدا هێشتا منداڵیش بوو .

هەروەها ڕووداوێکی تر لەوبارەیەوە دەگێڕنەوە کەکوڕی لێپرسراوی هەرێم، داوەتێکی گەورەی بۆخەڵکی کرد بەبۆنەی خەتەنەکردنی کوڕەکانیەوە، کاتێك خەڵکەکە نانیان خوارد ویستیان مەیبخۆنەوە، کە لەوسەردەمەدا واباوبوەو حەرامیش نەبووە، ئەمەش بەلای کوڕی لێپرسراوەکەوە گران بوو، چونکە مەی شك نەبرد لەماڵەکەی خۆیدا، کاتێك (عیسا) (علیه السلام) ئەو بێزاربوون و وەرسییەی بەکوڕی پاشاوەبینی، هەستاو بەسەر کوپە بەتاڵەکاندا گەڕاو دەستی بەسەر زارکەکانیدا دەگێڕا، دەستی بەسەر هەر کوپێکدا بهێنایە پڕدەبوو لەمەی، بەڵام باشترین جۆری مەی، خەڵکەکە زۆر لەوە سەرسام مان، زۆر قەدریان گرت و بەگەورەیان داناو ماڵ و دیارییەکی زۆریان بۆهێنان، بەڵام خۆی و دایکەکەی دیاریەکانیان وەرنەگرتن و بەرەو (بیت المقدس) کەوتنەڕێ، خوای گەورە زاناترە .

(اسحاق کوڕی بشر) گێڕانەوەیەکی (موضوع)ی هێناوە کەباسی یەکەم وشەو ڕستەو وتار دەکات کە بۆ یەکەم جار (عیسا) (علیه السلام) دەریبڕیوە، جا لەبەرئەوەی فەرمودەکە هەڵبەستراوە وامان بەباش زانی کە لێرەدا باسی نەکەین [٢٢٩] .

---

[٢٢٨] لێپرسراوی هەرێمێکی دیاریکراوی پاشانشینی لەزمانی فارسی دا پێی دەوترێت (دهقان) .

[٢٢٩] ئەوەندە بەسە کەخوای گەورە دەفەرموێت (عیسا) فەرمووی: (انی عبدالله)

(ابن هلعيه) دەیباتەوەسەر (عبدالله کوڕی عومەر) کەدەڵێت: (عیسا)(علیه السلام) منداڵ بوو، لەگەڵ منداڵاندا یاریدەکرد، بەیەکێك لەمنداڵەکانی دەگوت: دەتەوێ پێت بڵێم کەدایکت چی بۆشاردویتەوە لەماڵەوە ؟ منداڵەکەش دەیگوت: بەڵێ پێم بڵێ، ئەویش پێی دەگوت: فلان شت و فلانە شتی بۆ داناویت و بۆی شاردویتەوە، منداڵەکە دەرچووەوە بۆلای دایکی خۆی و دەیگوت: جاچیم بۆهەڵگرتویت ؟ منداڵەکەش ناوی شتەکەی دەبرد، بە سەرسامییەوە دەیگوت: ئەوە کێ پێی گوتویت ؟ ئەویش دەیگوت: عیسای کوڕی مەریەم، ئیتر خەڵکەکە گوتیان: بەخوا ئەگەر واز لەمنداڵەکانتان بێنن و لەگەڵ عیسای کوڕی مریم دابن، ئەواتێکیان دەدات، ئیتر منداڵەکانیان لەماڵێکی کۆدەکردەوەو دەرگایان لێدادەخستن، عیساش دەهاتە دەرەوەو بۆیان دەگەڕا، نەیدەدۆزینەوە، ڕۆژێك گوێی لەدەنگ و گەرەلاوژەی منداڵەکان بوو لەیەکێك لەماڵەکانەوە، پرسیاری دەربارەی منداڵەکان کرد، ئەوانیش وایان پێگوت: کەئەوانە مەیمون و بەرازن (واتە: بەحساب سەریان لێ تێك دەداو نەیاندەویست بڵێن: ئەمانە منداڵن) (عیسا)ش (علیه السلام) فەرمووی: خوایەگیان وابێت (واتە: خوایە قسەی ئەوان بێت و مەیمون و بەرازبن) ئیتر بوون بەمەیمون و بەراز، (ابن عساکر)یش[230] هەروا گێڕاویەتەوە .

(اسحاق کوڕی بشر) گێڕانەوەیەکی بردۆتەوە سەر (ابن عباس) کە (عیسا)(علیه السلام) هەر لەمنداڵییەوە موعجیزەو شتی سەیری لێ بینراوە، ئەم شتانەش لەناو یەهودیەکاندا بڵاوبوەوە، عیسا گەورەبوو، (بەنو ئیسرائیل)یەکان ترسیان لێ نیشت، دایکی ترس دایگرت (کەشتێك بەسەر کوڕەکەی بێت) خوای گەورە وەحی خستە دڵی مریم تاکو هەڵیبگرێت و بڕۆن بۆ (میصر)، ئەوەیە مانای ئەوئایەتە کەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ آيَةً وَآوَيْنَاهُمَا إِلَى رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾ (المؤمنون:٥٠) .

زانایانی تەفسیر چەند بۆچون و ڕای جیاوازیان هەیە دەربارەی (ربوە) کە بەواتای تەپۆڵکەی بەرزایی دێت، وە لێرەدا ئەو تەپۆڵکەیە، واباس کراوە کە وەستاوو پڕ لەکانیاوە، ئەم باس کردنەش بەم جۆرە مایەی سەرسامییە، چونکە مانای ئەوەیە شوێنێکی بەرزەو سەرکەیشی دەشتێکی پان و بەرینە کانیاویشی تێدایە، کەئاوەکەی هەڵدەقوڵێ و دەڕوات، کەم شتی وا ڕێ دەکەوێ لەدەشتایی سەر لوتکەی تەپۆڵکەیەکی بەرزدا ئاو هەبێت، بۆیە وتراوە: ئەم شوێنە هەمان شوێنە کەکاتی خۆی دارخورماکەی

---

[230] قصة عیسی: تاریخ دمشق، غیر مطبوع .

تێدابووە کە مریم (علیه السلام) پەنای بردەبەریو لەوێدا (عیسا)ی بووە کە (بیت المقدس)ە، بۆیە خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿فَنَادَاهَا مِنْ تَحْتِهَا أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا﴾ کە جمهوری زانا پێشینەکان بۆچوونیان وایە (سریا) مانای ڕوبارێکی بچووکە . وە لە (ابن عباس)یشەوە هاتووە کەئەوە ڕوبارەکانی دیمەشق بووە، لەوانەیە وێکچواندنی ئەو شوێنەبێ بە ڕوبارەکانی دیمەشق، وتراوە: ئەو شوێنە لە (میصر)بووە، وتراوە ئەو شوێنە (ڕەملە)یە .

(اسحاق کوڕی بشر) دەیباتەوە سەر (وهب کوڕی منبە)[٣٣١] کەدەڵێت: عیسا کەتەمەنی گەیشتە سیازدە ساڵان، خوای گەورە فەرمانی پێکرد کە لە (میصر)ەوە بگەڕێتەوە بۆ خانووی (الیا) بۆ ئەم مەبەستە یوسفی خاڵۆزای دایکی لەگەڵیدا هات، ئەویش سواریِ ولاخێکی کردن و لەگەڵیاندا هات بۆ (الیا) و لەوێدا نیشتەجێبوون تاخوای گەورە (ئینجیلی)ی بۆنارد و فێری (تەوڕات)یشی کرد، تا خوای گەورە زێندوکردنەوەی مردووی پێبەخشی لەگەڵ چاککردنەوەی نەخۆشی و بەڵەکی و زگماکی و پێزانین بەو شتانەی کەخەڵکی لەماڵەکانی خۆیاندا حەشاری دەدەن، خەڵکی خۆبەخۆ باسی گەڕانەوەی (عیسا)یان دەکرد و سەرسام ببون لەو کارو موعجیزە سەیرانەی لێیان دەبینی، ئەویش بانگیکردن بۆ خواپەرستی و کاروباری پێغەمبەرایەتیەکەی دەقی گرت و فەرمانی لەناویاندا بلاوبوەوە . (أبو زرعه)ی [٣٣٢] دیمەشقی دیباتەوەسەر (معاویە) کوڕی (صالح) ئەویش لەکەسێکی ترەوە دەگێڕێتەوە کە (تەوڕات) دوای شەش شەوی مانگی ڕەمەزان دابەزیەسەر (موسا)(علیه السلام) وە (زەبور)یش لەدوازدەشەوی دوای ڕەمەزاندا دابەزیەسەر (داود)، ئەوەش پاش تێپەڕبوونی چوارسەد و دوو ساڵ بەسەر دابەزینی (تەوڕات)دا، وە (ئینجیل)یش لەماوەی هەژدە شەوی دوای مانگە ڕەمەزان دابەزیەسەر (عیسا)ی کوڕی مەریەم(علیه السلام) دوای تێپەڕبوونی هەزار و پێنج سەد ساڵ بەسەر دابەزینی زەبوردا، وە قورئان دابەزیەسەر محمد (ﷺ) لەبیست و چوارەمی ڕەمەزاندا، ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ﴾ .

(ابن جریر) لە (تأریخ)ەکەیدا وایاس دەکات کە(ئینجیل) دابەزیەسەر (عیسا)(علیه السلام) لەکاتێکدا تەمەنی (سی)ساڵ بووەو هەتا بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان بەردەوام بووە

---

[٣٣١] حسن الاسناد: ابن جرير، تاريخ (١/٣٥٢) .

[٣٣٢] ضعيف: ابن ابي حاتم (١٦٤٩)، احمد (٤/١٠٧) .

لەگەیاندنی پەیامی خواییدا، کە ئەوکات ئەمەنی سیوسێ ساڵ بووە. بەپشتیوانی خوا دوایی بەدرێژی باسی دەکەین .

(اسحاق کوڕی بشر) گێڕانەوەیەك دەباتەوەسەر (ابوهریرە) کەدەفەرموێت: خوای گەورە وەحی نارد بۆ عیسای کوڕی مەریەم و فەرمووی: ئەی عیسا بەچاکی فەرمانی من جێبەجێ بکەو کەم تەرخەمی تێدامەکە، ببیستەو گوێڕایەڵم بە، ئەی کوڕی کچە داوێن پاکەکە، تۆ بەبێباوك دروست کراویت، من وام دروست کردویت کەوەك بەڵگەو نیشانەیەك وابیت بۆ خەڵکی، تەنها من بپەرستەو تەنها پشت بەمنیش ببەستە، ئەم پەیامە (نوسراوە) بەهێزەوە وەربگرە، بۆ سریانیەکان لێکیبدەرەوە، لەلایەن خۆتەوە ڕایبگەیەنە، وەمنیان پێبناسێنە کە من هەم و هەقم و زیندوو بەردەوامم و هەرگیز لەناوناچم، بڕوابکە بەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە عەرەبەی کەدواتر بۆتان دەنێرم و خاوەنی وشتروتاجە، عەمامە و زرێ و نەعل و جزداشەی لەبەردایە، بالاْشمشاڵییەکی بڕۆکەوانەیی برژانگ درێژە، سەرکوڵمەکانی گەش و دیارن و قژی لوولە، ڕیشی پڕە، دووبرۆکانی لێك دراوەتەوە، لوتی چەماوەو سنگی بەرزو قوڕقوڕاگەی وەك بۆری زێڕین وایە، زێڕ بەپەراسوەکانیدا دەگەڕێ، مووەکانی ڕەش و درێژن و ڕیشی دەگاتە سەرناوکی و لەسنگ و گەردی مووی پێوەنیە جگە لەوەی ڕیسی نەبێ؛ چالاْیی قاچ و دەستی نیەو تەختن، کەلا دەکاتەوە بەهەموو لایەکدا دەتوانێت، کە دەشڕوات چالاکە و دەڵێی بەردهەڵدەکەنێ، کە دادەنەوێتەوە تکەی ئارەقی لێدەچۆڕێ کە وەك دەنککۆڵەی مرواری دادەوەرنە سەرزەوی، بۆنی (میسك)ی لێ دێت، هەرگیز پێش ئەو یان دوای ئەو هاوشێوەی ئەو وێنەو نەبووە، بالاْیەکی نایاب و ڕێکی هەیە، بۆنێکی خۆشی لێدێت، ژن زۆردەهێنێ و منالی کەم لێدەکەوێتەوە، چونکە پشتی ئەو پیرۆزو بەنرخە و ماڵێکی لەبەهەشتدا بۆدانراوە کەلەقامیش دروست کراوەو هیچ هەراوزانایەکی تێدانیە، ئەی عیسا لە (اخر زمان)دا تۆ کەفیلی ئەم پێغەمبەرە (واتە: محمد)(ﷺ) بکە هەروەکوچۆن زەکەریا(علیه السلام) کەفالەتی دایکی تۆی کرد، لەلای من شوێن و پایەو پلەیەکی ئەوتۆی هەیە کە هیچ کەسێکی تر ئەوەی نیە، پەیامەکەی قورئانە، ئایینەکەی ئیسلامە، وەمن خۆیشم (سلام)م، خۆشی لەوکەسەی لەسەردەمی ئەودا دەژی و ڕۆژگاری ئەو دەبینی و قسەی ئەو دەبیستێ .

(عیسا) (علیه السلام) پرسی: ئەی پەروەردگارا (طوبی) چیە ؟ فەرمووی: درەختێکە بەدەستی خۆم ڕواندومە، بۆهەموو بەهەشتیەکانە، ڕەگ و ڕیشەی لەبەهەشتدایە و ئاوی (تەنسیم) دەخواتەوە، وەکو کافور فێنکە و تامی (زەنجەبیل) دەدات و بۆنی (میسك)ی لێدێت، هەرکەسێك جارێك لێی بخواتەوە هەرگیز تینووی نابێتەوە، (عیسا) (علیه السلام) فەرمووی: خوایە لەوئاوە تێراوم بکە ! فەرمووی: حەرامە هیچ پێغەمبەرێك لێی بخواتەوە هەتاکو ئەو پێغەمبەرە (واتە محمد) (ﷺ) لێی نەخواتەوە، وە حەرامە لەسەر ئومەتتان هەتا ئومەتی ئەو پێغەمبەرە لێی نەخواتەوە، فەرمووی: ئەی (عیسا) بۆلای خۆم بەرزت دەکەمەوە، فەرمووی: ئەی پەروەردگارا بۆچی بەرزم دەکەیتەوە ؟ فەرمووی: بەرزت دەکەمەوە بۆئەوەی لە (اخر زمان)دا داتبەزێنمەوە تاکو ئومەتی ئەو پێغەمبەرە گەورەیە ببینی و هاوکارییان بکەیت لەکوشتنی (دەجال)دا، لەکاتی نوێژدا داتەبەزێنم، بەڵام نەکەیت پێش نوێژییان بۆبکەیت، چونکە ئەو ئومەتە لێخۆشبوون و لەدوای پێغەمبەرەکەیانەوە هیچ پێغەمبەرێکی تر نیە .

(هشام کوڕی عەمار)[٢٣٣] دێباتەوەسەر (ابن زید) ئەویش لەباوکییەوە کە (عیسا)(علیه السلام) فەرمووی: ئەی پەروەردگارا هەواڵم بدەرێ دەربارەی ئەو ئومەتە لێخۆشبووە، فەرمووی: ئەوە ئومەتی ئەحمەدە واتە: (محمد) (ﷺ)، ئەوان زاناو حەکیمن، وەك ئەوەوان پێغەمبەربن، بە بەخشیشێکی کەمی من ڕازین کە بیاندەمێ، وەمن بەوە لێیان ڕازیدەبن کەهەنگاو هەڵگرن

بۆ کردەوەی چاکە، بەوتنی (لا إله إلا الله) دەیانخەمە بەهەشتەوە، ئەی عیسا ... ئەی زۆرترین کەسی بەهەشتن، چونکە هیچ گەلێك هێندەی ئەوان زمانی خۆیان زەلیل نەکراوە بۆ وتنی (لا اله إلا الله)، وە هیچ گەلێك هێندەی ئەوان گەردن کەچ نەبوون بۆ کڕنوش بردن بۆ خوای گەورە .

لە گێڕانەوەیەکی تردا کەهەر (ابن عساکر) هێناویەتی و دەیباتەوەسەر (عبدالله کوڕی عوسجە) دەڵێت: خوای گەورە وەحی کربۆ عیسای کوڕی مەریەم و فەرمووی: من زۆر بەگرنگی بگرە، زەخیرەی خۆت لەلای من دابنێ بۆ ڕۆژی دواییت، بەنوێژەکانت (واتە: نەوافل) خۆتم لێنزیك بکەرەوە تاکو خۆشم بوێیت، پشت بەکەسیتر مەبەستە جگە لەمن ئەگینا ڕیسوات دەکەم، ئارام لەسەر بەڵاکان و بەقەزاوقەدەری خوایی ڕازیبە، شادم بکە

---

[٢٣٣] ضعیف الاسناد .

شادکردنی من بەوەدەبێ کەگوێڕایەڵم بیت و لێم یاخی نەبیت، زۆر لێمەوە نزیك بە، یادی من بەزمانت زیندوو ڕابگرە، هەمیشە باسۆزی منت لەسنگدابێت کە لەکاتی بێئاگاییدا هۆشتیارت دەکاتەوە، ژیرانە حوکم بکە، بەخۆشیبێ یان بەزۆر لەگەڵ منداب‌ە و بۆمن بە، دڵت تەرخان بکە بۆ ترسان لەمن، وریاداری شەو بکەو هەقی شادکردنی منی تێدا ڕەوابببینە، ڕۆژگارت تینوویکە بۆئەو ڕۆژەی کەلەلای من تێراو دەبێت، پێشبڕکێ بکەو هەوڵ بدە بۆچاکە خوازیی، دان بەخێردابنێ لەهەر شوێنێك بێت، لەناو دروستکراوەکانمدا بەئامۆژگاری من بجوڵێرەوە، بەدادگەریی من حوکم بکە لەنێوان بەندەکانمدا، چارەسەری وەسوەسەم بۆناردویت لەدەست نەخۆشی لەبیرچوونەوە، وە چاوڕوونیم بۆناردویت لەدەست کول بونی پەردەکانی چاو (واتە: ڕوون بینی) بێهۆش و گۆش مەبە، وەك ئەو کەسەی کەگیانی دەکێشرێت لەکاتێکدا زیندویت و هەناسەش دەدەیت .

ئەی عیسای کوڕی مەریەم . . ! هیچ دروستکراوێك نیە کەباوەڕی بەمن هێنابێ و بەرانبەرم (خاشع) نەبووبێت، وە کەسیش نیە کە (خاشع)ی من بێ و پاداشتی منی پێنەدرابێت، دەتکەمە شایەت کەهەر دروستکراوێکم وابێت، لەسزای من بەدوورە ئەگەر خۆی نەگۆڕێت، یان سونەتی من نەگۆڕێت و لێی لانەدات، ئەی عیسای کوڕی مەریەمی بێگەرد بۆخودی بگری لەڕۆژگارەکانی ژیانتدا، بگری بۆ ماڵاوایی کردنت لەکەس و کارت و کەمی ماوەی دنیاو واز لەحەزوئارەزوەکان بێنە بۆ کەسانی خۆیان (باشە) بۆئەوانەی ئارەزویان بەلای ئەوانەدا زیاتر دەڕوات تائەوەی لای پەروەردگار بۆیان دانراوە، لەوبارەیەوە قسەت نەرم بێ، سڵاو لەخەڵکیبکە، بۆ بەئاگابە لەو کاتانەدا کەچاوی چاکەکارانیش خەودایگرتوون، بترسەو وریابە لەو شتانەی کەبەرێوەیە لەکاروباری ڕۆژی (مەعاد)دا، لەگەڵ ئەو بومەلەرزە بەهێز و کاولکەرەی دێتە ڕێتان بەرلەوەی کەس و کارو سامان بەفریات بگات، چاوت بەکلی دڵتەنگی برێژە لەودەمانەدا کەبێکاران پێدەکەنن، هەرلەوکاتەدا خۆڕاگربە، لێت پیرۆزبێت ئەگەر بەرئەوانە بکەویت کەئارامگرن و پەیمانی یاداشتی چاکم پێداون، ئەوە لەدنیا چاوەڕوان بکە کەدەتداتە دەست ڕۆژگارێك تیایدا لەبەردەمی پەروەردگارا زیندوو کراویتەوە، هێندە لەدنیا بچێژە کەبەشی مانەوەت تیایدا بکات، تۆنازانی تامی ئەو ئارامگریە لەکوێدایە ؟ وە ناشزانی ئەو چێژو بۆن و بەرامەیەی لەکوێوە بۆت هاتووە ؟ بە کامڵییەوە لەدنیا بچۆرەدەرەوە، ئەوەندەت بەسە کەژیانێکی

زبری تێدا بگوزەرێنی، دوایی دەزانیت کەبەرەو کوێیە، وا کاریکە کەتۆ بەرپرسیت، گەرچاوت ئەوە ببینێ کەبۆ وەلی و پیاوچاکانم ئامادەکردووە لەتاوانا دڵت دەتوێتەوەو دەرونت دەپوکێتەوە .

(أبو داود)[٢٣٤] لە (کتاب القدر)دا بردویەتیەوە سەر (ابن طاوس) ئەویش لەباوکیەوە دەگێڕێتەوە کەدەڵێت: جارێکیان عیسای کوڕی مریم (علیه السلام) شەیتانی، پێی گوت: ئەی نەتزانیوە کەهیچ شتێکت بەسەرنایات ئەوەنەبێ کەخوای گەورە لەچارەی نووسیویت ؟ شەیتان گوتی: دەست بگرە بەلوتکەی ئەو شاخەوەو ئینجا خۆت فڕێدە خوارەوە، جا بزانە دتخۆ دەژیت یان نا ؟ (عیسا) (علیه السلام) فەرمووی: ئەدی نەتتزانیوە کە خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکەم ناتوانێت زۆرم لێبکات بۆ ئیشێك، من هەرچیم بوێت دەیکەم .

(الزهری)ش دەفەرموێت: بەندە خوای خۆی تاقیناکاتەوە، بەڵکو خوا خۆی بەندەکانی تاقیدەکاتەوە . (أبو داود)[٢٣٥] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوەسەر (طاوس) کەدەفەرموێت: شەیتان هاتەلای عیسای کوڕی مەریەم و پێی گوت: ئەگەر تۆ خۆت بەڕاس دەزانیت، لەکونێکەوە خۆی فڕێدەرە خوارەوە، فەرمووی: وەیل بۆتۆ، ئەی خوای گەورە نەیفەرمووە کە (ئەی ئادەمیزاد داوای تیاچوونی خۆتم لێمەکە، چونکە خۆم چیم بوێت وادەکەم .

هەروەها (أبو التوبه بن النافع)[٢٣٦] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوەە سەر (خالد بن یزید) دەڵێت: ماوەی دە ساڵ یان دوو ساڵ شەیتان بەفێڵ لەگەڵ (عیسا)دا (علیه السلام) خواپەرستی کرد، ڕۆژێکیان شەیتان چووەسەر لوتکە شاخێك و بەعیسای گوت: تۆ دەڵێی ئەگەر من لێرەوە خۆم فڕێدەمە خوارەوە ئەوەم بەسەردێت کە لەچارەم نووسراوە ؟ (عیسا) (علیه السلام) فەرمووی: من پەروەردگاری خۆم تاقیناکەمەوە، بەڵکو خوا من تاقیدەکاتەوە، هەرکاتێ بیەوێت، لەمەوە (عیسا) (علیه السلام) زانی ئەوە شەیتانە و ئیتر لێی جیابوەوە . جگە لەم ڕووداوە گەلێك ڕووداویتر باس دەکرێن دەربارەی گفتوگۆی (عیسا) لەگەڵ شەیتان دا لەو ماوەیەدا کەشەیتان بەدرۆ خۆی کردبووە هاوەڵی ئەو بۆ

---

[٢٣٤] اسنادة صحیح: ابن أبي الدنیا، مکائد الشیطان (٥٥) .

[٢٣٥] صحیح: رواه ابو نعیم في الحلیة (١٢/٤) .

[٢٣٦] لە (اسناد)ەکەیدا ناوی نەناسراوێك کە (حسینی کوڕی طلحة)یە

خواپەرستی، وە چەندین جار خوای گەورە لەفێڵ و تەڵەکەی ئەو شەیتانە ڕزگاری کردووە، بەپێویستمان نەزانی دەقی هەموو ڕووداوەکان لێرەدا باس بکەین بەتایبەتیش کە زۆربەیان لاوازن و جێگەی پشت پێبەستن نین .

حەزرەتی (عیسا) (علیه السلام) جگە لەچاکەو پیاوەتیە گەورەکانی بۆ (بنی ئیسرائیل) چەندین موعجیزەیشی تێدابوو، لەگەڵ ئەوەش دا بێبڕواکان بەوانەی بێبڕواترو باوەڕداران باوەڕداتردەبوون، وێڕای هەمووشیان هێشتا (عیسا) (علیه السلام) شوێنێکی خۆی لەسەر زەویدا نەبوو کەتیایدا بحەوێتەوە، دەگێڕنەوە کەیەکەم کەسی مردوو کە بەفەرمانی خوایی زیندوو کردەوە، کچێك بوو، ڕووداوەکەیشی بەم جۆرەبووە: ڕۆژێکیان (عیسا) (علیه السلام) بەلای گۆڕستانێکدا تێپەڕی بینی واژنێك لەسەر یەکێك لەو گۆڕانە دەگری، (عیسا) (علیه السلام) لێیپرسی ئەوە ژنەکە بۆچی دەگریت ؟ گوتی: لەدنیا تاقە یەك کچم هەبوو، ئەویش مرد (کە ئەمە گۆڕەکەیەتی) وەمن داوام لەخوا کرد کەلەم جێگەیەی خۆم هەڵنەستم هەتا وەکو ئەو منیش دەمرێنێت یان زیندووی بکاتەوەو تەماشایەکی بکەم، (عیسا) (علیه السلام) فەرمووی: ئەگەر بەزیندوویی بیبینی، واتە: تەماشایەکی بکەیت دەگەڕێیتەوە دواوە، واتە: واز لەگۆڕەکەی دەهێنی ؟ گوتی: بەڵێ، وتراوە:(عیسا)(علیه السلام) چوو دوورکات نوێژی کرد و هات لەسەر گۆڕەکەی دانیشت و بانگی مردوەکەی کردو فەرمووی: ئەی فلان کەس بەفەرمانی خوا هەستە لەگۆڕەکەت وەرە دەرەوە، گۆڕەکە جوڵەیەکی لێهات، بۆجاری دووەم بانگیکردەوە، ئەم جارەیان گۆڕەکە کرایەوە، جاری سێهەم بانگیکرد، کچەکەش لەگۆڕەکە هاتەدەرەوەو گڵی سەرسەری تەکاند، (عیسا) (علیه السلام) بەکچەکەی گوت: ئەوە چیبوو وا بەخاوی هاتی بەدەم داواکەمەوە ؟ کچەکە گوتی: کەیەکەم جار بانگت کردم، خوای گەورە فریشتەکانی ناردەلام و لەشی ڕێکخستمەوە، ئینجا بانگی دووەمم پێگەیشت و بەوەش گیان گەڕایەوە بۆلاشەم، ئینجا بانگی سێهەمم پێگەیشت، کەوام زانی زیندووبوونەوەی ڕۆژی دواییە، بۆیە لەترسانا سەروبرۆ و برۆژەڵەکانی چاوم سپیبوون، ئینجا ڕوویکردە دایکی و پێی گوت: دایە بۆچی دەتەوێ دووجار چێرۆکی مەرگ بنۆشم، دایەگیان ئارامگر و خۆڕاگربە و من هیچ کارێکم بەدنیاوە نەماوە، ئەی عیسا داوابکە لەخوای گەورە کە بمگەڕێنێتەوە بۆ ژیانی دواییم (واتە باری پێشووی)؛ وە مەرگم لەسەر ئاسان بکات، (عیسا)ش (علیه السلام) نزای بۆکرد کچەکە

مردەوە، دایکەکەش گۆڕەکەی بۆتەخت کردەوە، ئەم هەواڵە بەیەهودیەکان گەیشتەوەو هێندەیتر ڕقیان لە (عیسا) (علیه السلام) هەڵگرت .

لەبەشی کۆتایی ژیانی (نوح)دا (علیه السلام) ئەوەمان باسکردووە کە (بنی ئیسرائیل)یەکان داوایان لێکرد کەخوای گەورە لەسەردەستی ئەو (سام)ی کوڕی (نوح) (علیه السلام) زیندوو بکاتەوە، ئەویش لەخوا پاڕایەوەو نوێژیکرد، خوای گەورەش ناوبراوی بۆ زیندووکردنەوە ڕووداوی کەشتیەکەی بۆ گێڕایەوە، پاشان لەخوای گەورە پاڕایەوە و دیسان کردیەوە بەخاك .

(السدی)[٢٣٧] گێڕانەوەیەکی بردۆتەوەسەر (ابن عباس) کەتیایدا دەفەرموێت: یەکێك لەپاشاکانی (بنی ئیسرائیل) مرد و خستیانەسەر جێوشوێنی خۆی (واتا: شوێنی دوایی مردوو) لەم کاتەشدا (عیسا) ((علیه السلام) هات و لەخوا پاڕایەوە بۆی و زیندووی کردەوە (بەفەرمانی خوا) خەڵکەکەش ئەوەیان بەلاوە سەیربوو .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ اذْكُرْ نِعْمَتِي عَلَيْكَ وَعَلَى وَالِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ الْقُدُسِ تُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَإِذْ عَلَّمْتُكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ بِإِذْنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْراً بِإِذْنِي وَتُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ بِإِذْنِي وَإِذْ تُخْرِجُ الْمَوْتَى بِإِذْنِي وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ إِنْ هَذَا إِلَّا سِحْرٌ مُبِينٌ، وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى الْحَوَارِيِّينَ أَنْ آمِنُوا بِي وَبِرَسُولِي قَالُوا آمَنَّا وَاشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ﴾ (المائدە:١١٠-١١١).

لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە باسی ئەو بەخشیش و نیعمەتە گرنگانە دەکات کەخوای گەورە بەخشیویەتی بەحەزرەتی (عیسا و دایکی) (علیه السلام) کە لەڕێگەی (روح القدس)ەوە (واتە: جبریل)ەوە خراویتە ناوزامانی دایکتەوەو هەر لەسەر بێشکەو بەگەورەیی (لەهەردوو بارەکەدا) قسەی کردووە بۆ گەیاندنی پەیامی خوایی و خوای گەورە فێری کتێب و حیکمەت و تەورات و ئینجیلی کردویت و توانای ئەوەی پێداویت کە پەیکەری باڵندە دروست بکەیت و بەفوی تر بەفەرمانی من بوە بەباڵندەی ڕاستی وەنەخۆشیە زگمایەکانت چاك کردوەتەوەو مردوەکانت لەگۆڕستان زیندووکردوەتەوەو منیش لەدەستی (بنو ئیسرائیل) ڕزگارم کردیت کە (دەیانەویست لەجاخت بدەن) وام لەحەواریەکان کرد کە باوەڕت پێبێنن و شوێنت بکەون .

---

[٢٣٧] حسن: صححة الشيخ احمد شاكر .

دیاره باوەڕهێنانی خەڵکەکەش بەئەو، بەشێکە لە بەخشیشەکانی خوای گەورە بۆ ئەو، هەروەکو بۆ پێغەمبەری خۆشمان (محمد) (ﷺ) هەر بەخشیشە لەلایەن ئەوەوە کەموسوڵمانانی بەسەر بێبڕوایاندا زاڵ کردو خۆشەویستی لەنێو دڵیاندا چاند کەهەرگیز ئەو شتانە بەسامانی هەموو دنیا نایەنەدی،هەروەکو لەسورەتی(الانفال)ئایەتی(٦٢-٦٣) دا دەفەرمونێت:﴿هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ، وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً مَا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (الانفال:٦٣)، دووبارە خوای گەورە هەر لەوبارەیەوەو لەگەڵێك ڕووكاری ترەوە باسی (عیسا)ی کردووە لەقورئانی پیرۆزدا، وەکو دەفەرمونێت: ﴿وَيُعَلِّمُهُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ .... . وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾(ال عمران:٤٨-٥٤)

فەرمانی خوایی بووە کە موعجیزەی هەرپێغەمبەرێك لەپێغەمبەران (علیه السلام) شیاوی سەردەم و باوی خۆیبووە، واباس دەکەن کە بۆ نموونە: موعجیزەی (موسا) (علیه السلام) شیاوبووە لەگەڵ خەڵکی سەردەمی خۆیدا کە خەڵکەکەی ئەو سەردەمە جادوگەرێکی شارەزاو زیرەك بوون، گەلێك بەتوانابوون لەهونەری جادوگەریدا، بۆیە خوای گەورە موعجیزەی ئەوتۆی پێبەخشی کەجادوگەکانی ماشیەوەو لەناویبردن .

هەروەها لەسەردەمی (عیسا)ش داسسس باوباوی سروشتزانی و حەکیمی و پزیشکیبووە، بۆیە خوای گەورە توانایەکی ئەوتۆیدا بە ئەو کەپێش هەموویان بداتەوە، بەڕادەیەك کەنەخۆشیە درێژخایەن و زگماکییەکان خۆش بکاتەوە، جگە لەمەش هەر بەفەرمانی خوای گەورە مردووی زیندوو دەکردەوە، کەئەمانەش بەڵگەیەکی پتەوو بەرچاوو ئاشکران بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستیەی کەڕەوانە کراوەو پێغەمبەری خوایە .

هاوکات موعجیزەی پێغەمبەری خۆشمان (محمد) (ﷺ) شیاوی خەڵکی ئەم سەردەمەیە، کە قووڵ بوونەتەوە لەبواری زمان و ئەدەب و زانستدا، قورئانیش تاکە سەرچاوەی ئەم تەوەرە سەرەکیانەیە، قورئانێك کە هەرگیز شتی ناهەق و ناڕێکی تێدا بەدیناکرێ و هەردەقەکەیشی مایەی سەرسامییە و موعجیزەیە کەبۆخۆی کەخوای گەورە تەحەدای مرۆڤ و جنۆکاکانی پێدەکات کەهەرگیز ناتوانن هاوشێوەی قورئان بهێنن، گەرچی قورئان هەر لەوپشت و شانەش پێك هاتووە کە ڕۆژانە پێی دەدوێن، نەك هەر قورئانی تەواو دە سورەتی، یان یەك سورەتی واشیان پێناهێنرێ و بۆیان دانارێژرێت و بگرە نەیانتوانیوەو ناشتوانن، چونکە فەرموودەی بەدیهێنەرێکە کە لە (ذات) و (صفات) و (فعل)دا هیچ هاوتاو هاوشێوەی ئەو نیە .

**مەبەست لەوەیە کە (عیسا) (علیه السلام) بەڵگەو سەلماندنی خۆی لەسەر جێکردن و هەموو ڕاستیەکی پێڕاگەیاندن کەچی زۆربەیان هێشتا هەر سووربوون لەسەر بێبڕوایی و هاوەڵ بۆ خوادانان و تاوانکردن، تەنها لەناویاندا یەك دەستە چاك و بۆخوا سوڵحاو دەرچوون، ئەوانیش بە (انصار الله) ناسراون، چونکە پشتیوانیخۆیان لەگەڵ (عیسا) (علیه السلام) دەکرد و دەیانپاراست و چاودێرییان دەکرد لەکاتێکدا کە (بنی ئیسرائیل)یەکان بە هاوپشتی هەندێ لەپاشانی ئەوسەردەمە تەکتیکیان دادەنا بۆ گرتن و سزادان و کوشتنی، بەڵام خوای گەورە (عیسا)ی بەرزکردەوە لەنێوان ئەواندا و کەسێکیان لەخۆیان گرت کەشکڵ و شێوەی (لەبەر چاوی ئەوان) لە (عیسا)دەچوو(علیه السلام) دیارە ئەوان کەوتنە هەڵەوەو بەهەڵەی خۆشیان تێکەوتن، گەرچی تائێستاش لەو هەڵەدا دەژین .**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ **(ال عمران/٥٤)، واتە: ئەوان فێڵ تەڵەکەیان کرد، خوای گەورەش فێڵی لێکردنەوەو دیاری خوای گەورەش سەرکەوتووبووە لەکارەکەیدا، هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ ......يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ **(الصف:٦-٨)تاکو هەر لەهەمان سورەتدا دەفەرموێت:** ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا أَنْصَارَ اللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّينَ مَنْ أَنْصَارِي إِلَى اللَّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنْصَارُ اللَّهِ فَآمَنَتْ طَائِفَةٌ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَكَفَرَتْ طَائِفَةٌ فَأَيَّدْنَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَى عَدُوِّهِمْ فَأَصْبَحُوا ظَاهِرِينَ﴾ **(الصف:١٤) .**

**بەڵێ (عیسا) (علیه السلام) کەدواهەمین پێغەمبەری (بنی ئیسرائیل)یەکانە وەکو وتارخوێنێك لەناویاندا ڕاوەستاو مژدەی ئەوەی پێدان کە لەدوای خۆی پێغەمبەرێکیتر دێت و دەبێت شوێنی بکەون، ئەو پێغەمبەرەش نەخوێندەوارە و پێشتریش هەردەربارەی هاتنی ئەو پێغەمبەرە لەتەورات و ئینجیل دا پێیان گوتراوە، پاش باس لەسیفەتەکانی ئەو پێغەمبەرەدەکات لەگەڵ هەندێ لەسیفەتە گشتییەکانی شوێنکەوتوەکانی، وەکو خوای گەورە لەم بارەیەوە لەگەڵ هەندێ لەسیفەتە گشتییەکانی شوێنکەوتوەکانی، وەکو خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێت:** ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ **(الاعراف:١٥٧) .**

(محمد کوڕی ئیسحاق)[٢٣٨] دەیباتەوەسەر کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کەفەرمویان: ئەی پێغەمبەری خوا دەربارەی خۆت قسەمان بۆبکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بوونم گیرابوونی نزای ئیبراهیمی باوکم و مژدەی عیسا، دایکم کاتێك من لەزامالّیدابووم وا خەونی پێوە بینیوم کە لەخەویدا وەك نورێکی لێهاتبێتە دەرەوەو کۆشکەکانی بوصرای خاکی شامی ڕوناك کردەوەتەوە)، چونکە کەکاتی خۆی ئیبراهیم (علیه السلام)مزگەوتی کەعبەی دروست دەکرد، فەرمووی: ﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ (البقره:١٢٩)، جاکاتێك زنجیرەی پێغەمبەرایەتی لەناو (بنی ئیسرائیل)یەکاندا بە (عیسا) (علیه السلام) تەواوبوو، (عیسا) (علیه السلام) لەناو گەلەکەیدا هەستایە سەرپێ و وەك وتار خوێنێك وتاری بۆدان و هەواڵی پێدان کەئیتر پێغەمبەرایەتی لەناو ئەواندا کۆتایی هات و پێغەمبەرێکی عەرەبی نەخوێندەوار دوای (عیسا) دێت کەناوی (ئەحمەدە) (ﷺ)، وەناوە تەواوەکەیشی (محمدی کوڕی عبدالله کوڕی عبدالمطلب کوڕی هاشم)ە، ولەپشتی (ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم)ە(علیه السلام) خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَاءَهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُبِينٌ﴾ (الصف: من الآیه٦) ئەو ڕاناوەی لەم ئایەتەدا هەڵدەگرێت بگەڕێتەوە بۆ (عیسا) یان بۆ (محمد) (ﷺ) .

خوای گەورە هانی موسوڵمانان دەدات کە بەردەوام بن لە سەرخستنی ئیسلام و باوەڕداراندا، وە سەرخستنی پێغەمبەر و هاوکاریکردن و پشتگیری کردنی لەبلاّوکردنەوەی پەیامی ئیسلامداو بانگەوازکردن بەسەر ڕێگەی خواناسی، لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا أَنْصَارَ اللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ لِلْحَوَارِيِّينَ مَنْ أَنْصَارِي إِلَى اللَّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنْصَارُ اللَّهِ﴾ ئەوان لەگوندێك پشتیوانی خۆیان دەربڕی بۆ حەزرەتی (عیسا) (علیه السلام)کەگوندەکە ناوی (الناصره)بوو، لەوەوە ناوەکەی گۆڕا بۆ (النصاری))، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَآمَنَتْ طَائِفَةٌ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَكَفَرَتْ طَائِفَةٌ﴾ (الصف:١٤)، واتە: (عیسا) (علیه السلام) بانگەوازی خەڵکیکرد بۆلای خواپەرستی، خەڵکەکە بوون بەدوو بەشەوە، بەشێکیان باوەڕیان هێنا و بەشەکەی تر باوەڕیان نەهێنا، خەڵکی (ئەنطاکیە) بەتەواوەتی هەموویان باوەڕیان هێنا، وەك مێژوونووس و شارەزایان فەرموویانە، پاشان سێ

---

[٢٣٨] حسن: ابن جریر (١/ج/١/٥٥٦)، الحاکم (٢/٦٠٠)، البیهقي (١/٨٣)، أحمد (٤/١٢٧–١٢٨)، احمد (٥/٢٦٢)، البیهقي (١/٨٤)، الشیخ ناصر (١٥٤٥) .

ڕەوانەکراویان بۆناردرا، یەکێکیان (شمعون الصفا)بوو، ئەوانیش باوەڕیان پێهێنا و وەڵامیان دایەوە .

ئەمانە ئەوسێ ڕەوانەکراوانن کە لەسەرهاتی (أصحاب القريه)دا لەسورەتی یاسیندا باسمان کردن، سەرەنجام زۆربەی زۆری یەهودیەکان بەبێ باوەڕی مانەوە، ژمارەکە مەکەش کە باوەڕیان هێنابوو، خوای گەورە پشتیوانی لێکردن و هێشتنیەوەو زاڵیکردن بەسەر بێباوەڕەکاندا، وەکو خوای گەورە لەباسی ئەواندا دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ (آل عمران:٥٥) .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَنْ يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ قَالَ اتَّقُوا اللَّهَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ............ قَالَ اللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ فَمَنْ يَكْفُرْ بَعْدُ مِنْكُمْ فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَاباً لا أُعَذِّبُهُ أَحَداً مِنَ الْعَالَمِينَ﴾ (المائده:١١٢-١١٥) لەتەفسیرەکەماندا ئەو فەرمودانەمان هێناوە کەدەربارەی دابەزینی سفرەکەن و لە (ابن عباس)[٢٣٩] و (سەلمانی فارسی)[٢٤٠] و (عمار کوڕی یاسر)ەوە [٢٤١] گێردراونەتەوە لەگەڵ کۆمەڵێك گێڕەرەوەیەکی تردا، ناوەڕۆکی ڕوداوەکە بەم جۆرەیە: (عیسا) (عليه السلام) فەرمانی بەحەواریەکان کرد کە سێ ڕۆژی تەواو بەڕۆژووبن، جاکاتێك سێ ڕۆژەکەیان تەواوکرد داوایان لە (عیسا) (عليه السلام) کرد کە داوابکات لەخوای گەورە تاکو سفرەیەکی پڕ لە خۆراکیان لەئاسمانەوە بۆ دابەزێنێ و دواهەمیان کەسیان بەدەوڵەمەند و هەژارەوە لەو سفرەیە ڕۆژووەکەیان بشکێنن و بیکەنە جەژن و دڵنیاش بن کەخوای گەورە ڕۆژووەکەی لێوەرگرتوون، (عیسا) (عليه السلام) زۆر ترسا لەوەی کەنەیانتوانیبێ سوپاسی خوا بکەن و ئەرکەکەیان بەتەواوەتی بەجێ نەهێنابێ، لەبەرئەوە زۆر ئامۆژگاری کردن کەداوای شتیوا لەخوا نەکەن، بەڵام ئەوان هەر سووربوون لەسەر داواکەیان، بەناچاری (عیسا) (عليه السلام) چووە شوێنێ نوێژ کردنەکەی و مەسحی سەریکرد و قاچەکانی ڕێك کرد و کێشای بەسەری خۆیدا و چاوەکانی سێلاوی فرمێسکیان لێ ڕژا و دەستی کرد بە پاڕانەوە لەخوای گەورە بۆ وەڵامدانەوەی داواکەیان، خوای گەورەش داواکەی قبوڵ کرد و لەئاسمانەوە سفرەیەکی بۆ دابەزاندن، خەڵکەکەش تەماشای سفرەکەیان دەکرد کە لەنێوان دووپەڵە

---

[٢٣٩] ابن ابي حاتم (٧٠١٦)، ابن جرير (٥/ج/٧/١٣٠) .

[٢٤٠] سنده لاباس به: ابن ابي حاتم (٧٠١٧) .

[٢٤١] موقوف: ابن ابي حاتم (٧٠٢٣)، ابن جرير (٥/ج٧/١٣٤)، الترمذي (٣٠٦١)

هەوردا لایدەدا و وردە . . وردە . . نزیك دەبوەوە لەزەوی، تانزیکتریش دەبوەوە (عیسا) (علیه السلام) زیاتر لەخوا دەپاڕایەوە کەبیکاتە مایەی ڕەحمەت بۆیان نەك مایەی نەگبەتی، وەبیکاتە مایەی فرِو بەرەکەت و سەلامەتی لەگەڵدابێت، وردە . . وردە سفرەکە دابەزی تاکو هەتا بەردەمی حەزرەتی (عیسا)(علیه السلام) سفرەکە بەپەردەیەکی نایان داپۆشرابوو، (عیسا)ش (علیه السلام) دەستیکرد بەلابردنی پەردەکە لەسەری و دەیفەرموو: بەناوی ئەو خوایەی کەباشترین ڕۆزیدەرە، سفرەکە حەوت نەهەنگی گەورەو حەوت کولێرەی لەسەربوو، وتراوە: سرکەیشی لەسەربووە، وتراوە: هەنارو بەروبوومی تری لەسەربووە، بۆن و بەرامەیەکی زۆرخۆشی لێدەهات، خوای گەورە فەرمووی: (ببە)، سفرەکەش یەکسەر دروست بوو، ئینجا فەرمانی کرد کەلێی بخۆن، گوتیان ئێمە لێی ناخۆین، هەتاوەکو تۆ نەیخۆیت، فەرمووی: ئاخر ئێوە یەکەم کەس بوون کەداوای ئەمەتان کرد، بەڵام ئەوان هەر ڕازینەبوون بەوەی کە لەپێش ئەودا دەست درێژبکەن بۆ سفرەکە، ئینجا (عیسا) (علیه السلام) فەرمانیدا کە لەپێشدا هەژار و کەم دەست و نەخۆش و توشبوان بەنەخۆشیە درێژخایەنەکان لێی بخۆن، نزیکەی هەزارو سێسەد کەس لەخواردنی ئەو سفرەیان خوارد، ئیتر هەموو ئەو کەسانە لەنەخۆشیەکانیان چاك بوونەوە کە پەڵەو دەردو نەخۆشی ئاسایی و درێژخایەنیان هەبوو، ئەوانەی بەشدارییان نەکرد دوایی زۆر پەشیمان بوونەوە، کاتێك بینیان ئەوان چاك بوونەتەوە، وتراوە هەموو ڕۆژێ جارێك ئەو سفرەیەیان بۆ دادەبەزی و خەڵکەکە لێیان دەخوارد، لەیەکەم کەسیانەوە تا دواهەمین کەسیان هەتا وتراوە تێکڕا نزیکەی حەفتا هەزار کەس لەخواردنی ئەو سفرەیەیان خواردووە، ئینجا وردە . . وردە،، بوو بەدوو ڕۆژجارێك، پاشان خوای گەورە فەرمانی کرد کەتەنها بیدات بەهەژاران، یان داماوەکان و دەوڵەمەندەکان ناگرێتەوە، ئەوەش بەلای زۆربەیانەوە زۆر سەخت و گران بوو، دوڕووەکان کەوتنە قسەوباسی نابەجێ، ئیتر سفرەکە بەتەواوەتی پێچرایەوەو لابرا و ئەو دوڕووە بەدگۆو بەدنەمەکانەش لەلایەن خوای گەورە کران بەبەراز .

لەگێڕانەوەیەکی تردا کە (ابن ابی حاتم و ابن جریر)[٢٤٣] هێناویەتی لە (عمار کوڕی)ەوە کەپێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: سفرەکەیان لەئاسمانەوە بۆدابەزی و نان و گۆشتی لەسەربوو، وە فەرمانیان وا پێکرا کەخەیانەت لەو سفرەیە نەکەن، هیچی

[٢٤٣] رواه ابن ابي حاتم (٧٠٢٢)، ابن جرير (٥/ج/٧/١٣٤) .

لێلانەدەن و بۆ سبەینێ نەیخەنەلاوە، بەلاّم ئەوان خەیانەتیان کرد و خستیانە ئەولاوەو بۆ سبەینێشیان هەڵگرت، خوای گەورە کردنی بەمەیمون و بەراز .

ڕوکاری ئاشکرای ئایەتەکە (اني منزلها عليكم) وانیشان دەدات کەسفرەکەیان بۆ دابەزێنراوە، وەکو (ابن جرير) باسی کردووە، ڕەوتە قورئانیەکەش وا دەریدەخات، خوای گەورە زاناترە.

(ابن جرير)[٢٤٣] دیسان وادەگێڕینەوە لە (ابو الحسن البصري)یەوە کە سفرەکەیان بۆدانەبەزی و لەو داواکاریەیان پاشگەزبوونەوە، کاتێك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَالَ اللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ فَمَنْ يَكْفُرْ بَعْدُ مِنْكُمْ فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَاباً لا أُعَذِّبُهُ أَحَداً مِنَ الْعَالَمِينَ﴾ (المائدە:١١٥)، لەبەرئەوە وتراوە (النصاری) هیچ دەنگ و باس و هەواڵێکیان لەلانیە دەربارەی ئەو سفرەیە و لەکتێبی ئەوانیشدا باسی شتیوا نەکراوە، کە دەبوایە زۆرچاك هەواڵیان بزانیبایە، خوای گەورە زاناترە، بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم سفرەیە سوود وەربگرە لەتەفسیری ئەم ئایەتە.

(ابوبكر بن ابی الدنیا)[٢٤٤] دەیباتەوەسەر (بكر كوڕی عبدالله المزني) کەدەڵێت: حەواریەکان (عیسا)ی پێغەمبەری خۆیان لێوون بوو، پێیان گوترا: بەرەولای دەریا ڕۆیشتووە، ئەوانیش بەشوێنیدا گەڕان و چوونەسەر دەریا، کاتێك گەیشتنە ئەوسەری دەریاکە بینیان کە لەسەر ئاوی دەریاکەیەوە شەپۆلەکان جارێك بەرزی دەکەنەوەو جارێك دایدەبەزێنێنەوەو بەدەم ئەو شەپۆلانەوە دەڕوات، بەرگێکی تاناوك و پشتپۆشتێکی تاناوکی لەبەردایە، خەڵکەکە گەیشتنە لای و یەکێکیان گوتی: بێم بۆلات ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی: بەڵێ ئیتر قاچێکی خستە ئاوەکەوەو قاچەکەی تریشی بەرزکردەوە تاکو هەنگاوبنێ، گوتی: ئاه . . خۆخەریکە نقوم بم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: دەستت بێنە، ئەی ئیمان لاواز، ئەگەر ئادەمیزاد هێندەی دەنکە جۆیەك یەقینی هەبێت بەسەرئاودا دەڕوات .

لەچیرۆکی یەحیای کوڕی زەکەریادا (علیه السلام) باسمان کرد کە (عیسا) (علیه السلام) بەرگی لەموو دروستکراوی لەبەردەکرد (واتە: بوزوو) وە گەڵای داری دەخوارد و هەرگیز گوێنەدەدایە خانوو، سامان و کەس و کار و هەرگیز شتی گەڵاڵە نەدەکرد بۆ سبەینێ .

---

[٢٤٣] صحيح اليهما: التفسير (٥/ج٧/١٣٥) .

[٢٤٤] ضعيف الاسناد: ابن ابي الدنيا في اليقين (١١) .

(ابن عساکر)[٢٤٥]یش لە (الشعبی)یەوە دەگێڕێتەوە کە هەرکات لای (عیسا)(علیه السلام) باسی ڕۆژی دوایی بکرایە (واتە: الساعه) هاواری لێبەرز دەبووەو دەیفەرموو: ناشێت باسی دواڕۆژ بکرێ لەلای کوڕی مەریەم و کەچی ئەویش بێدەنگ بێت، هەروەها دەگێڕنەوە کە هەرکات لای (عیسا) (علیه السلام) باسی ئامۆژگا ری بکرایە هاواری دەکرد وەکو منالْ دەلالایەوە و نالەنالی دەهات .

(عبدالرزاق)[٢٤٦] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (جعفر کوڕی بلقان) کەدەڵێت: (عیسا) (علیه السلام) دەیفەرموو: خوایەگیان وامن ڕۆژێکم کردەوەو ناتوانم ئەو شتە لەخۆم لابدەم کە ڕقم لێیەتی، وەناتوانم ئەو سودەش دەست خۆم بکەم کەدەمەوێت، کارەکانم بەدەست کەسێکی ترە (جگە لەخۆم) بووم بەبارمتەیەکی وابەستەبە کردەوەکانمەوە، هیچ کەسێکیش لەمن هەژارتر نیە، (لەکردەوەی چاکەدا)، خوایە دوژمنەکەم بەسەرمدا زالْ مەکە، هاوڕێکەم والێبکە خراپەم بەرانبەر نەکات، کۆست بەسەر ئاینەکەم دامەهێنە، ئەوکەسە بەسەرمدا زالْ مەکە کە بەزەیی پێمدایەتەوە .

(عیسا) پێغەمبەر (علیه السلام) کەسێکی زاهد و لەخواترس بووە، هەربۆیە حیکمەت و توانایەکی گەورەی هەبووە لە وتەی بەنرخ و ئامۆژگاری پڕ لەحیکمەت دا، کەتاکو ئێستاش هەندێ لە وتەو فەرمایشت و کارو ڕەفتارەکانی دەگوترێنەوەو سودیان لێ وەردگیرێت، وا بۆ نموونە چەند دانەیەکیان دەهێنینەوە .

(اسحاق کوڕی بشر)[٢٤٧] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوەسەر (الحسن) و دەفەرموێت: (عیسا(علیه السلام) سەردەستەی هەموو زاهیدەکانە لەڕۆژی قیامەتدا، ئەوکەسانەی سەری خۆیان هەڵگرتووە لەدەست گوناهوتاوانیان لەڕۆژی دوایی دا لەگەڵ (عیسا)دا کۆدەکرێنەوە، هەروەها دەڵێت: ڕۆژێکیان (عیسا) (علیه السلام) لەسەر بەردێك سەرینایەوەو کەمێك خەوت، تام و چێژی خەوتنی کرد، شەیتان بەلایدا تێپەڕی و پێی گوت: ئەی عیسا تۆ وات بلاوکردۆتەوە کەهیچ شتێکی دنیات ناوێ، کەچی ئەو بەردە یەکێکە لەشتە دنیایەکان ؟ واتە ئەو بەردەی لەسەری خەوتوویت ! (عیسا)ش (علیه السلام) هەستا بەردەکەی هەڵگرت و فڕێیدایە لای شەیتان و پێی گوت: ئەوەش بۆتۆ لەگەڵ دنیادا .

---

[٢٤٥] حسن الاسناد: ابن مبارك في الزهد (٢٢٩)، ابن ابي شيبة (١١٤/٨) .

[٢٤٦] صحيح الاسناد: المصنف (١٩٨٣٦) .

[٢٤٧] اسنادة موضوع .

(معتمر كوڕی سليمان) دەفەرموێت: ڕۆژێكيان (عيسا) (عليه السلام) هاتەلای هاوەڵەكانی كەجبەيەكی خوری و پۆشاكێكی زبرو ساكاری لەبەردابوو، پێپەتی و چاوپڕ لەگريان و سەر ئاڵۆزكاوبوو، ڕەنگی لەبرسانا زەرد هەڵگەڕابوو، لێوەكانی لەتينوانا وشك هەڵاتبوون، فەرمووی: سڵاوتان لێ بێ ئەی (بنی ئيسرائيل)يەكان ! من ئەوكەسەم كەبمەوێ هەموو دنيا هی من دەبێ (بەفەرمانی خوا) بەفەخر و خۆبەزلزانييەوە وانالێم، بەڵام ئايا دەزانن كامەيەماڵەكەم ؟ گوتيان كامەيە ماڵەكەت ئەی (روح الله) ؟ فەرمووی: ماڵەكەم مزگەوتەكان و پێچ و لوولی شەپۆلەكانی ئاوەو پێخۆرم برسێتی يە و چراكەم مانگەشەوەو جێ نوێژەكەم خۆرهەڵاتە و ڕيحانەكانم پاقلەمەنی زەوييە و پۆشاكم خوريە، دروشمم لەخواترسانە و هەژارو دەست كورتەكان هاونشينمن، ڕۆژدەكەمەوەو هيچ شك نابەم، شەو دەكەمەوەو هيچم نيە، دەروونم چاك و پاكە و هەرگيز گرژوو توڕەنيم، دەيكەواتە كێ هەيە لەمن دەوڵەمەندتر بێت ؟(عبدالله كوڕی مبارك) گێڕانەوەيەك دەباتەوەسەر (خلف كوڕی حەوشەب)[٢٤٨] كەدەفەرموێت: (عيسا) (عليه السلام) بە حەواريەكانی فەرموو: هەروەكو پاشاكان حيكمەتيان بۆ بەجێ هێشتوون، ئێوەش دنيايان بۆ بەجێ بهێڵن .

(قتادە)ش[٢٤٩] دەفەرموێت: (عيسا) (عليه السلام) فەرمووی: پرسيارم لێبكەن، من دڵم نەرمەو نەفسم لای خۆم زۆر بچوكە (واتە: بەفيزنيم)، (اسماعيل كوڕی عەياش)[٢٥٠] لە (ابن عمر)ەوە دەگێڕێتەوە كە (عيسا) (عليه السلام) فەرموويەتی بەحەواريەكان: نانی جۆ بخۆن و ئاوێكی سادە، لەدنيادا بەسەلامەتی و دڵنيايی يەوە بڕۆنە دەرەوە، دەربارەی ئەو شتانەی پێتان دەڵێم، شيرينی دنيا تاڵی دواڕۆژە و تاڵی دنيا شيرينی دواڕۆژە، بەندە خواپەرستەكانی نگرۆی نازونيعمەت نين، هەق بەئێوە دەڵێم: خراپترينتان ئەوكەسەيە كە ئارەزووەكانی خۆی زاڵ كردووە بەسەر زانستەكەيدا و حەزدەكات هەمووتان وەكو ئەو وابن. (ابو مصعب) لە (مالك)ەوە [٢٥١] دەگێڕێتەوە كە (عيسا) (عليه السلام) ئەی بەنی ئيسرائيلييەكان ئاوو پاقلە كێويلكەو نانی جۆ بخۆن، ووريابن نانی ئاسايی مەخۆن، چونكە سوپاسی ئەو نيعمەتەناكەن .

---

[٢٤٨] صحيح الاسناد: احمد (١٧٢) .

[٢٤٩] ضعيف الاسناد: احمد (١٦٦) الزهد (ج/١) .

[٢٥٠] ضعيف الاسناد: احمد (١٧٣) الزهد (ج/١) .

[٢٥١] مالك: الموطا – صفة النبي، باب (١٠) ص٧١٠ .

(ابن وهب)یش[٢٥٢] دەیباتەوەسەر (یەحیای کوڕی سعید) کەدەفەرموێت: (عیسا) (علیه السلام) دەیفەرموو: بەسەردنیادا ڕابوون و ئاوەدانی مەکەنەوە، خۆشەویستی دنیا سەرتۆپی هەموو گوناهەکانە، تەماشاکردنی نابەجێ (نظر الحرام) ئارەزووی خراپ لەدڵدا دەڕوێنێ .

هەروەها دەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: ئەی ئادەمیزای لاواز، لەخوا بترسە لەهەر شوێنێك بیت، لەدنیادا لاوازبە و مزگەوتەکان بکەرەماڵی خۆت، چاوت فێری گریان و لەشت فێری ئارامگری بکەو دڵت فێری بیرکردنەوەی چاك بکە، بایەخ بەزۆری سبەینێت مەدە، چونکە ئەوە هەڵەو تاوانە، هەروەکو چۆن هیچ کەس لەئێوە ناتوانێ لەسەر شەپۆلی دەریا خانوویەکی جێگیر بۆخۆی دروست بکات، دنیاش هەروایە، نائارام و نەچەسپاوە[٢٥٣] .

(سفیان الثوري)[٢٥٤] دەفەرموێت: (عیسا) (علیه السلام) فەرموویەتی: خۆشەویستی دنیاو قیامەت پێکەوە لەیەك دڵی باوەڕدارا کۆنابێتەوە، هەروەکو چۆن ئاگرو ئاو پێکەوە لەیەك قاپ دا کۆنابنەوە . (ابراهیم الحربی)[٤] گێڕانەوەیەك دەباتەوەسەر (ابی عبدالله الصوفی) کەدەفەرموێت: (عیسا) (علیه السلام) فەرموویەتی: کەسی دنیاویست وەکو ئەوکەسە وایە کە لەئاوی دەریا دەخواتەوە، هەتا زیاتر لێی بخواتەوە زیاتر تینووی دەکات _چونکە سوێرە) تاکو دەیکوژێت، هەروەها فەرموویەتی:[٢٥٥] شەیتان لەگەڵ دنیادایە، فێڵەکانی لەگەڵ سامان دایە، جوانکردنی لەگەڵ حەزەکاندایە، لێوەشاوەیی لەگەڵ ئارەزوەکاندایە .

(اعمش کوڕی خثیمة)[٢٥٦] دەفەرموێت: (عیسا) (علیه السلام) خۆراکی بۆ هاوەڵەکانی خۆی دادەنا و لەبەریان هەڵدەستاو دەیفەرموو: ئاوا ڕەفتا لەگەڵ نزیکەکەنتان دا بکەن، لەمەوە ژنێك پێیگوت: ئافەرین بۆئەو زگەی تۆی هەڵگرت و بۆئەو مەمکانەی شیریان پێداویت، (عیسا) (علیه السلام) فەرمووی: ئافەرین بۆئەو کەسانەی کتێبی خوای گەورە دەخوێننەوەو کردەوەی پێدەکەن، هەرلەئەوەوە دەگێڕنەوە کە (عیسا) (علیه السلام)

---

[٢٥٢] سنده لابأس به: ابو نعيم في الحلية (٨/١٤٥) .

[٢٥٣] صحيح الاسناد الى مكحول: رواه أحمد في الزهد (١٦٥) .

[٢٥٤] لم اقف عليه .

[٢٥٥] ضعيف الاسناد / زيادات الزهد (١٧٤) .

[٢٥٦] ضعيف الاسناد: ابن مبارك – الزهد (١٢٤) .

فەرمووی: ئافەرین ... پیرۆزتبێت لەوچاوانەی دەخەون کاتێ دەترسن بەئاگابوونیان تووشی گوناهیان دەکات وە لەکاتی تاوان نەکردندا بە ئاگان .

(مالك کوڕی دینار)[٢٥٧] دەفەرموێت: (عیسا) (علیه السلام) لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵەکانیدا بەلای تەرمێکی مردارەوەبوودا ڕەتبوون، گوتیان: چەند بۆنی ناخۆشە . . ! ئەویش فەرمووی: چەند دانەکانی سپیو سۆڵە، بۆئەوەی فێرنەبن غەیبەتی کەس بکەن .

(ابوبکر بن ابی الدنیا)[٢٥٨] دەیباتەوەسەر زەکەریای کوڕی عەدەی کەدەفەرموێت: (عیسا) ((علیه السلام) فەرموویەتی: ئەی حەواریەکان بەکەمی دنیا ڕازیبن لەپێناو سەلامەتی ئاینتاندا، هەروەکو دنیاویستەکان بەکەمی ئاینیان ڕازیین لەپێناوی سەلامەتی دنیایاندا

(أبو مصعب) لە (مالك)ەوە [٢٥٩] دەگێڕنەوە کەحەزرەتی (عیسا) (علیه السلام) فەرموویەتی: زۆر قسەمەکەن کەیادی خوای تێدانەبێ، چونکە دڵتان ڕەق دەکات، دڵی ڕەقیش لەخواوە دورە، بەڵام ئێوە نایزانن وەکو پەروەردگار سەیری گوناهی خەڵکی مەکەن، بەڵکو واسەیری بکەن کەئێوەو ئەوانیش مرۆڤ و بەندەن، خەڵکی وەکو دوو پێ وان، یەکیان ساخ و ئەوی تریان نەساخ، بەزەییتان بەوانەدا بێتەوە کە بەڵایان زۆر بەسەردێ، وەسوپاسی خوابکەن لەسەر ئەو لەش ساخیەی پێی بەخشیون .

(عبدالله کوڕی مبارك)[٢٦٠] دەیباتەوە سەر (سالم کوڕی أبی الجعد) کە دەفەرموێت: (عیسا) (علیه السلام) فەرمووی: بۆ خوا کاربکەن نەك بۆ گەدەتان، تەماشایەکی ئەو باڵندەیە بکەن کە هەڵدەفڕێ و دەڕوات، نەجووت دە کات و نەدرەو، کەچی خواش ڕۆزی بۆ داناوە، جائەگەر بڵێن :ئێمە گەدەمان لەهی باڵندە گەورەتر، دەتەماشایەکی ئەو مانگاڕل و ئاژەڵە کێویانە بکەن کەدێن و دەڕۆن، نەجوت دەکەن و نەدرەو کەچی خوای گەورە ڕۆزیان دەدات، ... خۆتان لەدنیا بپارێزن ... چونکە زۆر گوێدانە دنیا بەلای خواوە تاوانە . (صفوان بن عمرو)[٢٦١] دەیباتەوەسەر (یزید کوڕی مسیرە) کەحەواریەکان بە (عیسا)یان گوت (علیە السلام): تەماشایەکی ئەو مزگەوتە بکە چەندە جوان و ڕازاوە دروست کراوە! فەرمووی: ئامین ......ئامین ......، بەڕاستی پێتان بڵێم: خوای گەورە

---

[٢٥٧] ضعيف الاسناد: ابن ابي الدنيا – الغيبة (١٥٨) .

[٢٥٨] ابن ابي الدنيا في ذم الدنيا (٤٤٩) .

[٢٥٩] مالك: الموطأ – كتاب الكلام، باب (٣/٧٥٣) .

[٢٦٠] صحيح الأسناد: رواه في الزهد (٨٤٨)

[٢٦١] ملك، الموطأ –كتاب الكلام–باب (٣/ ٧٥٣) .

تەنهایەك بەردی ئەو مزگەوتەوە بەپێوە ناهێڵێ و هەر دەیروخێنێ بەهۆی گوناهی خەڵکەکەوە، -واتە خەڵکی ناوی-خوای گەورە بەزێڕ و زیوو هیچ شتێکی تر کەبەلاتانەوە جوانە هیچ شتێکی دروست ناکات -نەبەو بەردەجوانانەت کە سەرسامی کردون-بەڵکو خوای گەورە دڵێکی باشی پێ لەوانە باشترە، هەربەوەش زەوی ئاوەدان دەکاتەوەو دیسان هەربەوەش زەوی کاول دەکات -واتە کاتێك ئەو دڵانە پێچەوانەی دڵی چاك و چاکەکاران بن.

(ابن عساکر)[٢٦٢] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (ابن عباس) کەپێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (عیسا، (علیه السلام) بەلای شارێکی کاول وێرانەدا تێپەڕی، چۆنیەتی خانو بەرەکانی بەلاوە سەیر بوو، فەرمووی: پەروەردگارا فرمان بەم شارە بکە کەوەڵامی پرسیارەکانم بداتەوە، خوای گەورەش وەحی ناردبۆ شارەکەو فەرمووی: ئەی شارە کاولەکە وەڵامی (عیسا)بدەرەوە! شارەکە بانگی کردو گووتی: عیسا .... ! ئەی خۆشەویت چیت لێم دەوێ ؟ فەرمووی: ئەوە دارو درەخت و ڕوبار و کۆشك و تەلار و خەڵکەکەت چی بەسەر هات ؟ شارەکە گوتی: خۆشەویستم فرمانی پەروەردگار بەڕاستی هات، دارەکانم وشك بوون، ڕووبارەکانم چۆڕاییان لێ بڕا، کۆشك و تەلارەکانم ڕوخان س، خەڵکەکەش مردن، فەرمووی: ئەی سامان وماڵەکەیان لەکوێ یە ؟ گوتی ئەوەی بەحەرام و حەڵاڵ کۆیان کردبوەوە هەمووی لەناو گەدەی من دایە، میراتی ئاسمانەکان وزەویش هەر بۆلای خوا دەگەڕێتەوە، لێرەدا (عیسا)(علیه السلام) بانگی کردو بەدەنگی بەرز فەرمووی: سەرم سوڕدەمێنێ لەسێ جۆرەکەس ئەو کەسەی دنیای مەبەستەو مەرگیش چاوەڕێی دەکات، ئەوکەسەی کۆشك و تەلار دروست دەکات و گۆڕیش شوێنەکەیەتی، ئەوکەسەی پڕ بەدەمی پێدەکەنێ و دۆزەخیش لەپێشیەتی، ئەی ئادەمیزاد نەبەزۆر تێر دەبی و نەبەکەمیش ڕازی دەبی، ماڵ و سامان بۆ کەسێك کۆدەکەیتەوە کەسوپاست ناکات، وەدەچیتە خزمەتی پەروەردگارێك کەبیانووت لێ وەرناگرێ، چونکە تۆ بەندەی گەدەو ئارەزووەکانی خۆتیت، بەڵکو کاتێك گەدەت پڕ دەبێ (لەگڵ) کەخرایتە ناو گۆڕەکەی خۆتەوە، وەتۆش ئەی ئادەمیزاد ماڵ و سامان کۆ دەکەیتەوە -بۆ خۆت -کەچی لەتەرا زووی کەسێکی تردا بەدی دەکەیت . (سفیان الثوري)[٢٦٣] دەیباتەوە سەر (ابراهیم

---

[٢٦٢] ضعیف الأسناد: الجزء غیر مطبوع، جۆری فەرمودەکە (غریب )ة، بەڵام چونکە ئامۆژگاری جوانی تێدابوو هێناومانە.

[٢٦٣] صحیح الأسناد: احمد (١٦٣) في الزهد .

التميمي) كەدەفەرمویْت: (عیسا) (علیه السلام) فەرمویەتی: ئەی حەواریەکان گەنجینەی خۆتان لەئاسمان دابنێن، خۆ دڵی مرۆڤ گەنجینە کەیەتی، هەرکەسێك شتێك فێربێ،[٢٦٤] وە خەڵکی فێر بکات و کاریشی پێ بکات لەئاسمانەکاندا بەمەزن ناوی دەبرێت، ئەو زانستە سوودی نیە کەلەشیوو دۆڵ -تەنگانە-نەتپەڕێنێتەوە و فڕێتبداتە یانەکانەوە[٢٦٥].

(ابن عساکر) گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (ابن عباس) بە (مرفوع)ی، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: عیسا لەناو بنی اسرائیلی یەکاندا هەستایە سەرپێ و پێی فەرموون: ئەی حەواریەکان ...! حیکمەت بۆ کەسێك باس مەکەن کە شایستەی نیە چونکە ستەمیان لێ دەکەن -ئەگەر واتان کرد-وەلەو کەسانەشی مەگرنەوە کەشایستەن، چونکە ستەمیان لێ دەکەن -ئەگەر واتان کرد-کاروبارە کانیش سێ جۆریان هەیە: کارێك کەبەتەواوەتی کامڵ و ئاشکرایە -کەچاك و حەڵاڵە-ئەوەیان شوێنی بکەون، وەکارێك کەخراپەکەی ئاشکرایە، ئەمەیان خۆتانی لێ لابدەن، وەکارێك کە جیاوازیتان تیایدا هەیە دەربارەی، ئەوەیان بۆلای مخوا بگەڕێننەوە -جل جلالە) [٢٦٦]

(عبالرزاق) گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (عکرمە) کە دەفەرمویْت:(عیسا)(علیه السلام) فەرمووی: مرواری بە بەراز مەبەخشن، چونکە بەراز ناتوانێت هیچ لەمرواری دروست بکات، وە حیکمەت بەکەسێ مەبەخشن کەنایەوێت، حیکمەت لەمرواری چاکترە، ئەو کەسەش کەنایەوێت لەبەراز خراپترە)، (وهب)[٢٦٧]و هەندێکی تریش هەروایان باس کردوە، هەر لە (عبدالرزاق) ەوە دەگێڕنەوە کە (عیسا) (علیه السلام) بەهاوەڵەکانی خۆی فەرموو: ئێوە خوێی سەر زەوین، خۆ ئەگەر بۆ گەنتان کرد ئەوا دەرمانتان نیە: ئێوە خوێی سەرزەوین، خۆ ئەگەر بۆ گەنتان کرد ئەوا دەرمانتان نیە، کەبریتیە لەم دوو سیفەتە خراپەی نەزانینی، پێکەنین لەکاتێکدا شتێك نەبێکە شایستەی ئەو پێکەنینەبێ، وەڕۆژ کردنەوە بەبێ شەو نخونیەك .

هەر لەئەوەوە دەگێڕنەوە کە پرسیار لە (عیسا)(علیه السلام) کرا کێ خراپترین کەسە، یان خراپترین بەلا چی یە؟ فەرمووی پێ هەڵخلیسکانی زانا، چونکە ئەگەر زانا پێی

---

[٢٦٤] رواه احمد – في الزهد (١٦٦)، البيهقي (١٧٩٩)

[٢٦٥] یانە: شوێنی کۆبوونەوەی خەڵکی بوە لەو سەردەمەدا – وەرگێڕ.

[٢٦٦] ضعيف جداً: رواه الحاكم (٤/ ٢٧٠)، الطبراني (١٠٧٧٤)، العقيلي قفي الضعفاء (٤/ ٣٤٠).

[٢٦٧] ضعيف الأسناد: العصنف (٢٠٤٨٢)، عبدالله بن احمد (١٧٢).

هەڵخزا، ئەوا خەڵکێکی زۆریش پێیان هەڵ دەخزێ . وە (عیسا)(علیه السلام) فەرموویەتی: ئەی زانا خراپکارەکان دنیاتان خستوەتە سەر سەرتان و دوارۆژتان خستۆتە ژێر پێتان قسەکانتان دەرمانەو کردەوەکانتان دەردونەخۆشی یە، نمونەتان وەك داری (دوفلا)یە، ئەو کەسەی ببینێ بەجوانیەکەی سەرسام دەبێت، بەڵام هەرکەسێك لێی بخوات پێی دەمرێت خوای گەورە دەفەرموێت :﴿وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ .......... فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾(آل عمران:٥٥)، هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِمْ............... . شهيداً﴾ (النساء:١٥٥) . لەم ئایەتە پیرۆزانەدا خوای گەورە باس لەوە دەکات کە کاتێك (عیسا)(علیه السلام) لەخەودا بوە مراندویەتی و دوایی بەرزیشی کردۆتەوە بۆ ئاسمان و ڕزگاری کردوە لەدەست ئەو خەڵك و پاشا بێ بڕوایانەی کەدەیانەویست ئازاری بدەن، (حسن البصری ومحمد کوڕی ئیسحاق)[٢٦٨] دەفەرموون: پاشای ئەو سەردەمە، بێ باوەڕو خراپکاربووە هەوڵی داوەبۆ کوشتنی (عیسا)(علیه السلام) ناوی (داون کوڕی نورا)بووە، فرمانی کوشتن و لەخاچدانی دەکردوە، بۆئەم مەبەستە لەیەکێك لەخانوەکانی (بیت المقدس) گەمارۆیاندا،کاتەکەش کاتی خەوتنانی شەوی هەینی لەسەر شەممە بوو، کاتێك دوژمنەکان بۆی هاتنە ژوورەوە، شێوەی خۆی بەخشی –بەفرمانی خوایی–بەهەندێ لەهاوەڵەکانی، (عیساش)(علیه السلام) لەکلاوڕۆژنەیەکی ئەوماڵەوە بەرەو ئاسمان بەرزکرایەوەو خەڵکی ماڵەکەش تەماشایان دەکرد، هاتنە ژوورەوە، ئەو گەنجەیان بەدی کرد ك شێوە عیسای تێدا بوو، گرتیان و بردیان لەخاچیان سدا، وایانزانی عیسایە، وەدرك و داڵیان لەسەرسەری دانا، بۆ سوکایەتی پێ کردنی، تەنها ئەوانە لەسزای خوایی ڕزگاریان بوو کەلەو (النصاری)یانە بوون کە ڕووداوە کەیان نەدی و بەشدارییان تێدانەکرد، لەمەوە خراپکاران گومڕاو ڕیسوابوون، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَ إِنْ مِنْ ......... قَبْلَ مَوْتِهِ﴾ (النساء: ١٥٩) لەوئایەتەدا (قَبْلَ مَوتِهِ)، واتا: (بعد نزوله الي الآرض في آخر الزمان)واتە: مردنی یەکجارەیی کە لە (ئاخرزەمان دا) دێتە خوارەوەو بەراز دەکوژێ و خاچ دەشکێنێ و سەرانە دادەنێ و تەنها شوێن ئاینی ئیسلام دەکەوێ. ئەوەشمان بەدرێژی لەتەفسیرەکەماندا باس کردوە و لەکتێبی (الفتن والملاحم)یش دا بەوردی لێمان کۆڵیوەتەوە، هەروەها دەربارەی کارەکانی و لەناوبردنی دەجاڵ لەسەر دەستی ئەو .

---

[٢٦٨] ضعیف الآسناد: ابن جرير (٤ / ج٦ / ١٤) .

(إبن أبى حاتم)[٢٦٩] گێڕانەوەیەك دەباتەوە سەر (إبن عباس) کەدەفەرموێت: کاتێك خوای گەورە ویستی (عیسا) (علیه السلام) بەرز بکاتەوە بۆ ئاسمان، لەکلاو ڕۆژنەکەی ژورەکەوە لەو کاتەدا دوازدەکەسی حەواریەکان دانیشتبوون لەو ماڵەدا، هێشتا (عیسا)(علیه السلام) سەری تکەی دڵۆپە ئاوی لێ دەهات، فەرمووی: ئێوە کەسی واتان تێدانیە کە دوازدە جار بەمن بڕوانەکات، پاش ئەوەی بڕوای بەمن هێنابێ، پاشان فەرمووی: کێ لەجێگەکەی من دەبێت و شێوەی بخرێتە سەر شێوەی من و بکوژرێت واتا کێ بۆ ئەوە ئامادەیە؟ -ئەوا ئەو کەسە پلەو پایەی وەکو من دەبێت -لەقیامەتدا-؟ یەکێك لەلاوە تازە پێگەیشتوەکان کەلەهەموویان گەنج تر بوو، هەستایە سەرپێ و ئامادەیی دەربڕی، (عیسا)ش(علیه السلام) فەرمووی: تۆ دانیشە.. ئینجا هاتەوە لایان و داواکەی دوبارە کردەوە، دیسان لاوەکە هەستایەوە، فەرمووی: دانیشە . . ! بۆ جاری سێهەمیش بەهەمان جۆر، ئینجا (عیسا)(علیه السلام) فەرمووی: تۆ هەر هەمان لاوی پێشوویت، خوای گەورە شێوەی عیسای خستە سەر ئەولاوەو عیساش لەکلاو ڕۆژنەکەوە بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان، ئینجا پیاوانی یەهودی هاتن و ئەو کوڕەویان بردو کوشتیان و لەخاچیاندا، هەندێ لەوانە دوازدەجار بێ بڕوابوون بە (عیسا) (علیه السلام) لەجیاتی جارێك-پاش باوەڕ هێنانیشیان، وەبوون بەسێ کۆمەڵەوە، کۆمەڵێ کە بەیەعقوبیەناسراون گوتیان: خوا ئەوەندەی ویستی لەلامان مایەوە و پاشان بەرزبوەوە بۆ ئاسمان، کۆمەڵێ کی تر کە (نەسگۆریەکان)بوون گوتیان: کوڕی خوا لەناو ماندا بوو، ئەوەندەی کەویستی پاشان خوا بردیەوە بۆلای خۆی و بەرزی کردەوە، کۆمەڵی سێهەم کە موسڵمانەکان بوون گوتیان: بەندە و پێغەمبەری خوا - ئەوەندەی کەخواویستی لەناوماندا بوو، پاشان خوای گەورە بەرزی کردەوە بۆلای خۆی، دوو گروپە بێ بڕواکە کەوتنە جەنگ و کودەتا دژی کۆمەڵە باوەڕدارەکە و هەربەو شێوەیە مانەوە، هەتا خوای گەورە (محمد)ی نارد (ﷺ) بەخۆی و ئاینی ئیسلامەوە، ئەم جارەیان باوەڕداران سەرکەوتن -واتا موسڵمانان (ابن عباس) دەفەرموێت ئەمەش مانای ئەو ئایەتەیەکە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿فَأَيَّدْنَا .... ظَاهِرِينَ﴾(الصف:١٤) .

(محمد کوڕی اسحاق کوڕی یەسار) دەفەرموێت: (عیسا)(علیه السلام) دەستی کرد بە پاڕانەوە خوای گەورە کەمەرگی دوابخات، بۆئەوەی پەیامەکەی بەتەواوەتی ڕابگەیەنێ و

[٢٦٩] صحيح الأسناد: ابن ابي حاتم (٦٢٣٣)، النسائي البكري (١١٥٩١).

بانگەوازی خەڵکی بکات بۆی و زۆر ترین کەس موسڵمان بکات، وتراوە: دوازدە پیاوی حەواریەکانی لەدەوروبەربوو، کەبریتی بوون لەئەمانە :بطرس، یعقوب کوڕی زبدا، یەحنەی برای یەعقوب، ئەندراوس، فلێپس، ئەبرثما، مەتی، تۆماس، یەعقوب کوڕی حەلقەبا، تەداوس، غەتاتیا، یۆدس، کریا یوطا، وە کەسێکی تریشیان تێدابوو کەماوی (سەرجس)بوو، کەگاورەکان بەئەنقەس ئەو ناوەیان وون کردووەو ئەم کەسەش بوو کەکاتی خۆی شێوەی خرایەسەر شێوەی (مەسیح)(علیە السلام) هەندێ لەگاورەکانیش پێیان وایە کە ئەوکەسەی لەجیاتی (مەسیح) (علیە السلام) گرتیان و لەخاچیاندا و شێوەی خرابوەسەر شێوەی (عەیسا) (علیە السلام) بریتیبووە لە (یۆدس کوڕی کریاموطا)، خوای گەورە زاناترە.

(الضحاك) لە (ابن عباس)ەوە [٢٧٠] دەگێڕێتەوە کەفەرمووی: (شەمعون) لەجێی (عیسا) دانیشت، گاورەکانیش ئەو (یۆدس)ەیان گرت کەشێوەی (عیسا)ی تێدابوو، وە (ئەحمەد بن مروان) دەفەرموێت: (محمد کوڕی جەهم) دەفەرموێت:: گوێم لێبوو (الفراء) دەربارەی مانای ئەم ئایەتە ﴿وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ (آل عمران:٥٤)، فەرمووی: (عیسا) (علیە السلام) ماوەیەك لەپووری دابڕا و پاشان هات بۆسەردانی لەڕێگەدا سەری جالوتە گاورەکە لوتی بوو بەلووتیەوە، گاورەکان هەموویان هاتن و لەبەردەگای ئەو ژوورە کۆبوونەوە کە (عیسا)ی تێدابوو، دەرگاکەیان شکاند، جالوت سەری بردە تاکو (عیسا)(علیە السلام) بگرێت، خوای گەورە چاوەکانی ئەوی لەئاستی (عیسا)دا کوێر کرد، ئینجا هاتە دەرەوە بۆلای هاوڕێکانی و پێی گوت: نەمبینی، لەوکاتەدا جالوت شمشێرێکی ڕوتی بەدەستەوە بوو، هاوڕێکانی وایان زانی ئەوە عیسایە، چونکە خوای گەورە شێوەی ئەوی خستبووە سەر شێوەی (عیسا)(علیە السلام) گوتیان: تۆ عیسایت پەلاماریان داو گرتیان و کوشتیان و لەخاچیان دا، خوای گەورەش لەم بارەیەوە دەفەرموێ ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِنْ شُبِّهَ لَهُمْ﴾ (النساء:١٥٧)

(ابن جرير)[1] گێڕانەوەیك دەباتەوە سەر (وهب کوڕی منبە) کە دەفەرموێت: (عیسا) هات و حەڤدەکەسی لە حەواریەکان لەگەڵدا بوو، گاورەکان دەورەیاندان، کاتێك لێیان نزیك بوونەوە، خوای گەورە شێوەی حەڤدەکەسەی خستە سەر شێوەی (عیسا)(علیە السلام) گاورەکان پێیان گوتن: ئەوە جادوتان لێ کردوین،یان خێرا (عیسا)مان بۆ جیابکەنەوە

---

[٢٧٠] ضعيف الأسناد: رواه ابن جرير (٤ / ٦/ ١٤ – ١٥)

لەناو خۆتاندا – یان هەر هەموتان دەکوژین، لەم کاتە (عیسا)دا(علیه السلام) بە هاوەڵەکانی فەرموو: کێ ئەمڕۆ گیانی خۆی بەبەهەشت دەفرۆشێ؟ یەکێك لەو پیاوانەی لەگەڵی بوون فەرمووی: من، ئیتر هاتە دەرەوە بۆناو گاورەکان خوای گەورەش شێوەی خستە سەر شێوەی (عیسا)(علیه السلام) وە فەرمووی: من عیسام، ئیتر گرتیان و کوشتیان و لەخاچیاندا، دوایی گومانیان بۆ دروست بوو کە ئاخۆ ئەو کەسە (عیسا)بووە یان نا ...؟ ! تەنانەت گاورەکان خۆشیان گومانیان بۆ دروست ببوو، چونکە هەمان کات و ڕۆژ (عیسا)(علیه السلام) بۆ ئاسمان بەرز کرایەوە .

(ابن جریر)[271] گێڕانەوەیەك دەباتەوە سەر (وهب) کە دەفەرموێت: (عیسای کوڕی مریم)(علیه السلام) کاتێك لەلایەن خواوە پێی ڕاگەیەنرا کە لەدنیا دەبرێتە دەرەوە، زۆر خەم و پەژارەی مەرگی لێ نیشت و بەلایەوە گران بوو و بۆیە حەواریەکانی داوەت کردو خواردنی بۆ ئامادە کردن و فەرمووی: ئەمشەو لەلام بن، چونکە پێتان هەیە، جاکاتێ مانەوەو نانی ئێوارەیان لا خوارد، دەستی کرد بە خزمەتکردنیان، کەلەنان خواردن تەواو بوو، هەستا دەستی کرد بەشۆردنی دەستیان و بەدەستی خۆی دەستنوێژی پێ گرتن و بەکراسەکەی خۆی دەستی بۆ وشك کردنەوە، ئەوانیش ئەو کارەیان زۆرە گەورەگرت کە (عیسا)ئاوا بێ خێزانە خزمەتیان دەکات و نەیاندەهێشت، (عیسا)(علیه السلام) فەرمووی: هەرچیم کرد ئەمشەو ئەگەر بەرپەرچتان دامەوە ئەوە نەئێوە لەمنن و نەمنیش لەئێوەم، ئەوانیش گوێیان بۆ گرت و دانیان بە خۆیاندا گرت هەتا تەواو بوو، پاشان فەرموی :وەکو من ئەمشەو خزمەتم کردون، خواردنم بۆ ئامادە کردون و بەدەستی خۆم دەستم بۆ شۆردن، دەی ئێوەش چاکەم بەرانبەر بکەن ؟ خۆتان دەزانن من باشترین کەستانم –بەبێ شاناز–ئێوەش خۆتان بەسەر یەکتریدا بەگەورەمەگرن، هەندێکتان خۆتان ببەخشن لەپێناو ئەوانی ترتاندا–واتا لەنەفسی خۆتان ببورن–هەروەکو من لەخۆم بوردم لەبەرئێوە، پێویستەکەی منیش ئەمشەو بەئێوە ئەوەیە کە لەخوای گەورە بۆم بپاڕێنەوە تاکو خوای گەورە مەرگم دوا بخات، جاکاتێك ئەوان خۆیان بۆ نزاکردن ئامادەکرد، خەودایگرتن و نەیانتوانی نزای بۆ بکەن، ئیتر لەخەو ڕایدەپەڕاندن و پێی دەگوتن سبحان الله ...ئەوە چیتانە ئەرێ شەوێك لەخەوی خۆتان نابورن بۆمن تا نزام بۆ بکەن ؟ گوتیان: بەخوا خۆشمان نازانین چیمانەو بۆچی وامان بەسەر هاتووە، بەخواشەوانی تر

---

[271] ضعیف الأسناد: رواه ابن جریر (٤ / ٦/ ١٤ – ١٣) .

دادەنیشتین و قسەمان دەکرد، بەڵام ئەمشەو لەوێزە ماندانیە و هەرکەدەمانەوێ نزا بکەین خەو داماندەگرێ و دێتە نێوان خۆمان و نزاکانمانەوە، فەرمووی: شوانەکە ڕۆیشت و مەڕەکان بڵاوبونەوە، بەم جۆرە قسانە نمونەی خۆی بەناڕاستەو خۆ پێ دەگوتن، ئەم گێڕانەوەیە لەدروست و ڕاست ناچێت و هەڵبەستی خەڵکی یە بۆ ناو ئینجیل .

لەگێڕانەوەیەکی تردا کە (ابن عساکر) هێناویەتی لەڕێگەی یەحیای کوڕی حەبیب، دەفەرموێت: مریم پاش تێپەڕبوونی حەوت ڕۆژ بەسەر کەسە لەخاچ دراوەکەدا بەداوی ماڵی پاشادا دەگەڕا، تاکو داوای لێ بکات تەرمەکە لێ بکەنەوە، کەوای دەزانی (عیسا)ی کوڕیەتی، پاشاش هێنانەدی و هەرلەوشوێنەدا بەخاك سپێردرا، مەریەم بە دایکی یەحیای گوت: نایەیت بچین سەرێکی لەگۆڕەکەی مەسیح بدەین ؟ ڕۆیشتن، هەرکە لەگۆڕەکە نزیك بوونەوە مریم بەدایکی یەحیای گوت: خۆت دانا پۆشیت؟ فەرمووی: جا لەکێ خۆم داپۆشم ؟ فەرموو: لەو پیاوەی کە لەلای گۆڕەکە دانیشتوە ! دایکی یەحیا فەرمووی: کوا من کەس نابینم ! مریم زانی کەئەوە (جبریل)ە، لێرەدا دایکی یەحیا وەستاو مریم چووە پێشەوە، (جبریل)(علیە السلام) فەرمووی :ئەی مەریەم بۆ کوێ دەچیت ؟ فەرمووی: سەردانی گۆڕی مەسیح دەکە م و سلاوی لێ دەکەم و پەیمانی لەگەڵدا نوێ دەکەمەوە، (جبریل)(علیە السلام) ئەی مریم ئەوە گۆڕی مەسیح نیە، خوای گەورە مەسیحی بەرز کردۆتەوەو پاکی کردوەتەوە لەو کەسانەیبێ باوەڕن، بەڵکو ئەمە گۆڕی لاوە هاو شێوەکەیەتی کە کوشتیان و لە خاچیاندا، بەو ناونیشانەی کەکە سو کارەکەی لێیان ون بوەو نازانن چی بەسەر هاتوە ! تا ئێستاش بۆی دەگریەن، لەبەرئەوە فلانە ڕۆژوکات وەرەوە بۆ ئێرە مەسیح دەبینی –بەزیندوویی–مریم گەڕایەوە بۆلای خوشکەکەی و جبریل بۆ ئاسمان بەرز بویەوە، مریم خوشکەی تێگەیاند لەو ڕوداوە دەنگوباسەی جبریل، لەڕۆژی دیاریکراودا مریم چوەوە بۆ پاردەی گۆڕەکەو لەوێ عیسای بینی، خێرا ڕایکر بۆلای و باوەشی پێدا کردو سەری ماچ کردو ئەویش دەستی کر بەنزا کردن بۆ دایکی – هەروەکو جاری جاران خووی وابوو، فەرمووی :دایە گیان گەلەکەم منیان نەکوشتوە، بەڵکو خوای گەورە بەرزی کردومەوە بۆلای خۆی و ئێستا مۆڵەتی داوم تابێم بۆ لای تۆ، بەم زوانە تۆش کۆچی دوایی دەکەیت، ئارام بگرەو زۆر یادی خوا بکە، ئینجا عیسا (علیە السلام) بۆ ئاسمان بڵند کرایەوەو ئیتر لەو جارە زیاتر نەیدیەوە تا کۆچی دوایی

کرد، (مریم)(علیه السلام) لەپاش (عیسا)(علیه السلام) پێنج ساڵ مایەوە و لەتەمەنی پەنجاو سێ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

(حسن البصری)دەفەرموێت: ئەو ڕۆژەی کە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان (عیسا)(علیه السلام) (تەمەنی سیو چوار ساڵ بوو، لەفەرموودەی پێغەمبەریش دا هاتووە کە دەفەرموێت: (بەهەشتیەکان کاتێك دەچنە بەهەشتەوە ڕەجاڵ و سەر ڕووتن و چاویان یەکلەو لەتەمەنی سی و سێ ساڵیدان). [٢٧٢]

لەگێڕانەوەیەکی تردا فەرمودەکە ئەمەیشی لەگەڵدایە: (لەسەر لەدایك بوونی عیسا (واتە هاوتەمەنی ئەو) وجوانی یوسف)[٢٧٣]، وەلەگێڕانە وەیەکدا کە براوەتەوە سەر (سعید کوڕی مسَیب) هاتووە کە (عیسا)لەتەمەنی سی و سێ ساڵیدا بەرز نەکراوەتەوە .

فەرمودەیەکی تر کە (الحاکم) هێناویەتی لە (مستدرك)ە کەیدا دەیباتەوە سەر (عائشة) کە دەفەرموێت: (فاطمة) پێی ڕاگەیاندم کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ پێغەمبەرێك بەدوای پێغەمبەرێکی تردا نەهاتوە، مەگەر ئەوەی دواییان تەمەنی نیوەی پێغەمبەرەکەی پێش خۆی بووە)، وە دەفەرموێت: پێی گوت –واتە پێغەمبەر (ﷺ) کە (عیسای کوڕی مریم سەدو بیست ساڵ تەمەنی بوە، وادەبینم منیش بچمە سەروو شەست)[٢٧٤].

(ابن عساکر) دەفەرموێت: ڕاستیەکەی ئەوەیە (عیسا) (علیه السلام)تەمەنی ئەوەندە نەبووە، بەڵکو مەبەستی ماوەی مانەوەیەتی لەناو گەلەکەیدا هەروەکو (سفیان کوڕی عینیە) گێڕانەوەیەکی بردوەتەوەسەر (فاطمە) کەپێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (عیسا کوڕی مریم چل ساڵ لەناو بنی ئیسرائیلەکاندا مایەوە)[٢٧٥]،لەگێڕانەوەیەکی (علی کوڕی ئەبی طالب)دا کە (عیسا)(علیه السلام) شەوی بیست و سێی مانگی ڕەمەزان(عیسا)(علیه السلام) بەرزکرایەوە، هەر هەمان شەو (علی) بریندار کراو پاش پێنج ڕۆژ کۆچی دوایی کرد. (الضَحاك)[٢٧٦]یش لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوەو کە کاتێك خوای گەورە ویستی (عیسا)(علیه السلام) بەرزبکاتەوە، هەورێك لەئاسمانەوە هات بۆلای و (عیسا)ش چوو

---

[٢٧٢] حسن بمجموع طرقه: احمد (مسند ٢/ ١٩٥)، ابن ابي شيبة (٨/ ٧٥ )، الترمذي (٢٥٣٩)احمد (٥/ ٢٤٣)، الترمذي (٢٥٤٥).

[٢٧٣] في اسناده ضعف: ابن ابي الدنيا في صفة الجنّة (٢١٥).

[٢٧٤] ضعيف: الطبراني في الكبير (٢٢ح/ ١٠٣١ )، (١٠٣٠)

[٢٧٥] ضعيف: رواه ابو يعلى: (٦٧٤٢) .

[٢٧٦] ضعيف: ضونكة (الضحاك) ڕاستەو خۆ لە (ابن عباس)ەوە وەری نەگرتووە.

لەسەری دانیشت، مریم هات بۆلای و مالآوایی لیّ کردو گریا، ئینجا بەرزکرایەوەو دایکشی بۆی دەڕوانی، (عیسا) (علیه السلام) شانپۆشێکی دا بەدایکی و فەرمووی: ئەومە نیشانەیەك بیّ لەنێوان من و تۆدا تا ڕۆژی دوایی (القیامة)وە مێزەرەکەی کردە سەری (شەمعون)، دایکی بەپەنجە ئاماژەو خوا حافیزی لیّ دەکرد، تاکو لەچاوی ون بوو، دایکی زۆر زۆر خۆشی دەویست، تەنانەت لەهیچ گەڕان و کۆڕێکیش دا لێی جیانەدەبوەوە .

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿مَا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ﴾ (المائده:٧٥) وتراوە ناوی (مەسیح) ی بەسەربڕاوە چونکە بەردەوام بەسەر زەویدا گەڕاوە و لەدەست گەلەکەی شوێنی دیاری کراوی نەبووە، لەوسەردەمەدا فیتنەو گێچەڵ لەناو گاورەکاندا زۆر زۆربووە و گەلیّ قسەو باسی خراپیان بۆ خۆی و دایکی هەڵبەستوو، وتراوە هێندە دە گەڕا بەریّ پێی ساف ببوو، لەوەوە قساچەکانی ڕێك ببوونەوە – واتا بەریّ پێی و دووبەرزایی کە و بە (ممسوح القدمين)ناسرابوو.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِمْ بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنْجِيلَ﴾ (الحدید:٢٧)، وە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَقَفَّيْنَا مِنْ بَعْدِهِ بِالرُّسُلِ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ﴾ (البقره:٨٧)، هەروەها گەلێك ئایەتی تری قورئانی پیرۆز باسی (عیسا)و پێغەمبەرایەتی ئەویان کردووە .

لەفەرمودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) وەك پێشتر باسمان کرد ئەوە باس کراوە کە هەموو منالێکی ساوا لەلایەن شەیتانەوە زیانی پیّ دەگات جگەلە (عیسا)(علیه السلام) وەباسی ئەوەیشی فەرمووە کە –وەك پێشتر باسمان کرد– کەهەرکەس بڕوای بەتەنهایی خواو پێغەمبەرایەتی محمد و عیسا هەبێت و باوەڕی بەبونی بەهەشت و دۆزەخ هەبێت ئەوا خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە جا کردەوەی هەر چۆنێك بووبێت .

(مسلم و بخاری)[٢٧٧] فەرموودەیەکی پێغەمبەریان هێناوە (ﷺ) کە دەفەرموێت: (ئەگەر کەسێك دایکی بەباشترین شێوە پەروەردەی بکات، وە بە باشترین شێوە فێری بکات، پاشان بیگرێتە خۆی و ژنی بۆ بێنیّ و ئەوا دوو پاداشتی هەیە، وەئەگەر باوەڕی بە عیسای کوڕی مەریەم هێنابیّ و ئینجا باوەڕی بەمنیش هێنا بیّ ئەوا دوو پاداشتی هەیە، وەئەگەر کەسێك لەخوای بترسیّ و گوێڕایەڵ گەورەکەی خۆی بکات ئەوا دوو پاداشتی هەیە)، هەروەها لەباسی شێوەی باڵاو ڕووخساری (موساو ابراهیم و محمد)دا

---

[٢٧٧] متفق عليه: البخاري (٩٧)، مسلم (٣٨٥).

باسی ئەو سیفەت و ڕوخساری (عیسا)ش کراوە U کەلەشەوی (معراج)دا پێغەمبەر (ﷺ) ئەوانی دیوە، وەباسی (حەج)ی ئەوانیش کراوە .

(بوخاری)[٢٧٨] فەرمودەیەکی بردوەتەوە سەر (ابو هریرە) کە لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) دەفەرموێت: ئەو شەوەی بۆ ئاسمان بەرز کرامەوە[٢٧٩]، چاوم بە موسا کەوت کە پیاوێکی چوارشانەی بەسەرو شەوکەت بوو، وەچاوم بە (عیسا)ش کەوت کە پیاوێکی سوورو سپی ڕوخسار ڕوناك بوو وەکو ئەوەوابوو کەئەو کاتە لەگەرما و هاتبێتە دەرەوە، وە ئیبراهیمم بینی کە لەهەموو منالەکانی دا زیاتر لە هەموویان من شێوەم دەچوەوە سەر ئەو)، هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: (عیسا و موسا وئیبراهیم بینی، عیسا، پیاوێکی سورکاری قژ لوولی سنگ پان بوو، .... ) فەرمودەکە إبراهیم کوڕی (منذر) گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (عبدالله کوڕی عومەر) و دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ) باسی جیاوازی نێوان (مسیح)و (مسیح الدّجال)ی بۆ کردین و فەرمووی: (خوای گەورە یەك چاونیە، بەڵام دەجال چاوی ڕاستی کوێرە، چاوی دەرپۆقیوبوو ئەمشەوە لەخەومدادیم، هەروەها پیاوێکم بینی لەهەموو مۆرقەکان جوانتر بوو قژی و توکی ڕیشی دابەزیبوەسەر ناوکی، تنۆکەئاو لەسەریەوە ئەوەری، دەستەکانی لەسەرشانی دووپیاو دانابوو بەدەوری کەعبەدا دەگەڕاو وە دەسوڕایەوە، پرسیارم کرد ئەو پیاوەکێ یە ؟ گوتیان: ئەوە مەسیحی کوڕی مەریەمە، پاشان پیاوێکی قژ لوول و چرچی ناقۆڵام بینی کەچاوی مڕاستی دەرپۆقیو بوو و شێوەی لە (ابن قطن)[٢٨٠] دەچوو، دەستی خستبووە سەر شانی پیاوێك و بەدەوری کەعبەدا دەگەڕاو وەردە سوڕایەوە، پرسیم ئەمەیان کێ یە؟ گوتیان مەسیحی دەجاڵە: بەم جۆرە پێغەمبەر(ﷺ) هەردوو جۆرە مەسیحەکەی بۆ ڕوون کردوینەوە تاکو کاتێك لەئاسمان دابەزی، بیناسین، هەروەها (مسیح الدجال)یش بناسین و خۆمانی لێ لابدەین[٢٨١].

(پێشەوا البخاری)[٢٨٢] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (ابو هریرە) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ڕۆژێك عیسای کوڕی مەریەم چاوی لێ بوو کە پیاوێك دزی دەکرد، پێی

---

[٢٧٨] پێشتر تەخریجی ئەو فەرموودەیەمان لەباسی ژیانی (عیسا)دا (علیه السلام) کردووە .

[٢٧٩] واتە شەوی شەو ڕەوی .

[٢٨٠] پیاوێکی بێ براوی هۆزی خوزاعەبووە .

[٢٨١] بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی دەجاڵ، بڕوانە کتێبی (القیامە الصغری)د. احمد سلیمان الأشقر .

[٢٨٢] متفق علیە: البخاري (٣٤٤٤)، مسلم (٦٠٨٩).

فەرموو: ئەوە دزی دەکەیت ؟ گوتی: نا ... نابەو خوایەی جگە لەئەو پەروەردگاری ترنیە دزی ناکەم، عیسا(علیه السلام) فەرمووی: من باوەڕم بەخوا هەیە، کەچی چاوم درۆی کرد ؟ هەمان گێڕانەوەش بەهەمان مانا لەلایەن پێشەوا (ئەحمەد)[٢٨٣]ەوە هێنراوە، ئەم ڕووداوە بەڵگەیە لەسەر پاکی و باوەڕبەرزی عیسا(علیه السلام) چونکە کاتێك ئەو پیاوە دزە سوێندی بەخوای گەورە خوارد، (عیسا)(علیه السلام) وای زانی کەس نیە کە بەدرۆ سوێند بخوات، بۆیە گومانی لەباوەڕەکەی خۆی کرد، هەڵبەت من باوەڕم لاوازە بۆیە چاوم درۆم لەگەڵ دەکات و وام زانی ئەو پیاوە دزە کرد، پەیتا پەیتا بەخۆی دەگوت من باوەڕم بەخوا هەیە کەچی چاوم درۆی لەگەڵ کردم .

هەروەها (البخاری)[٢٨٤] گێڕانەوەیەك دەباتەوە سەر (ابن عباس) کە دەفەرموێت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ڕۆژی دوایی بەڕوت و ڕەجاڵی سەر قۆتینی زیندوو دەکرێنەوە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند ﴿كما بدأنا أوّل خلق نُعيدهُ وَعْداً علينا، أنّ كُنّا فاعلين﴾[٢٨٥]، یەکەم کەس کەبەرگی لەبەر دەکرێ ئیبراهیمە، ئینجا بەلای ڕاست و چەپدا هاوەڵەکانم دەهێنرێن و قسە یان لەگەڵدا دەکەم، لەم کاتەدا پێم دەگوترێ: کە ئەو هاوەڵانەم لەدوای کۆچی دوایی خۆم پشتیان لەئاینەکەم هەڵکردوە و هەڵگەڕاونەتەوە، منیش وەکو قسەی پیاوچاکە واتا عیسای کوڕی مەریەم- دەڵێم :﴿وَكُنْتُ عَلَيْهِمْ شَهِيداً ...............عزيزُ الْحَكِيمُ﴾(المائده:١١٨ -١١٧)

هەروەها(بخاری)[٢٨٦] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (ابن عباس) کە دەفەرموێت: گوێم لێ بوو (عومەری خطاب) لەسەر دوانگە فەرمووی گوێم لێ بوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (زیاتر لەخۆم گەورەم مەکەن هەروەکو چۆن گاورەکان عیسای کوڕی مەریەمیان لەخۆی گەورەتر کرد، بەڵکو من بەندەیەکی خوام – کەناوتان بردم – بڵێن: بەندەو پێغەمبەری خوا).

(پێشەوا بخاری)[٢٨٧] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (ابی هريره) کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (هیچ منالێك لەسەر بێشکە قسەی نەکردوە، جگە لەسێ منالّ، کەیەکێك لەوانە (عیسا)یە (علیه السلام) وەفەرمودەکەش دوورو درێژەو زۆربەمان بیستومانە .

---

[٢٨٣] صحيح لغيره: المسند (٣/ ٣٨٣) .

[٢٨٤] صحيح: البخاري (٣٤٤٧) .

[٢٨٥] سورةتی (الأنبياء)، ئایەتی (١٠٤).

[٢٨٦] صحيح، البخاري (٣٤٤٥) .

[٢٨٧] صحيح: البخاري (٣٤٣٦)

(پێشەوا ئەحمەد)[٣٨٨] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (أبو هريرە) کە دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: پێغەمبەران برای یەکترین لەمەبەستیاندا، ئاینەکەیان یەك ئاینەو دایکە کانیان جیاوازن، من نزیکترین کەسم لەعیسای کوڕی مەریەمەوە، چونکە لەنێوان من و ئەودا پێغەمبەری ترنیە، ئەو دادەبەزێتە سەر زەوی ئەگەر دیتان بەوەدا بیناسنەوەکە پیاوێکی چوارشانەی سوورو سپی یە، سەری وادیارە کەتازە شۆرابێ و ئاوی لێ دەتکێ، بەڵام ئاویشی بەرنەکەوتوە، خاچ دەشکێنێ و بەراز دەکوژێ و سەردانە دادەنێتەوەو هەموو میللەتەکان -واتا ئاینەکانیان- یەك دەخات لەسەردەمی خۆیدا جگە لەئاینی ئیسلام، هەر لەسەردەمی ئەودا خوای گەورە دەجاڵ لەناو دەبات، بەڕادەیەك ئاشتی و ئاسایش دێتە کایەوە کە وشتر و شێر پێکەوە دەلەوەڕێن و پڵنگ و مانگاش پێکەوە و گورگ و مەڕیش هەر لەگەڵ یەکتردا دەبن، منالْ و ساوایان یاری بەمارەکان دەکەن و هیچ کامیان زیان بەوی تریان ناگەیەنێ، ئەوەندەی خوای گەورە بیەوێت و عیسا دەمێنێتەوە، پاشان کۆچی دوایی دەکات و موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن و ئەسپەردەی خاکی دەکەن) وە دەفەرموێت: (ماوەی چل ساڵ دەمێنێتەوە، ئینجا کۆچی دوایی دەکات و موسڵمانان نوێژی لەسەر دەکەن). بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی کات و شوێنی دابەزینی (عیسا)(علیه السلام) لەکۆتایی دنیادا بڕوانە کتێبی(الملاحم)ی(ابن کثیر) یان مانای ئایەتی ژمارە (١٥٩)لە سورەتی (النساء و ئایەتی (٦١)ی سورەتی (الزحرف).

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: (عیسا لە منارەی سپی دیمەشق دادەبەزێتە سەرزەوی کەلەو کاتەدا قامەت کراوە بۆ ئەوەی نوێژی بەیانی بەکۆمەڵ بکەن، پێشەوای موسڵمانان پێی دەڵێت: فەرموو ئەی (روح الله)پێشنوێژیمان بۆ بکە، ئەویش دەفەرموێت: نا...هەندێکتان بەسەر هەندێکی ترتاندا ئەمیرن، ئەوەش بە خشیشی خواییە بۆ ئەم ئوممەتە)، وە لە گێڕانەوەیەکی تردا (عیسا (علیه السلام) دەفەرموێت: قامەت کراوە بۆئەوەی تۆ پیشنوێژی بکەیت، ئیتر لەدوایەوە نوێژ دەکات، ئینجا خۆی و موسڵمانان سوار دەبن و بەرێ دەکەون و دەڕۆن بۆ دۆزینەوەی دەجاڵ، لەدەروازەی (لوددی)دا پێی دەگەن و (عیسا)(علیه السلام) بەدەستی پیرۆزی خۆی دەجاڵ دەکوژێت)[٣٨٩]. باسمان لەوەش کرد کەبە ئاواتێکی گەورەوە ئەم منارە یە لەخۆرهەڵاتی دیمەشق دا دروست کراوە کەکاتی

---

[٣٨٨] صحيح: المسند (٢/ ٤٣٧)، (٢/ ٤٠٦ )، ابو داود (٤٣٢٤)

[٣٨٩] صحيح: رواه مسلم (٧٢٩٩)، ابو داود (٤٣٢١)، الترمذي (٢٢٤١)،. ابن ماجة (٤٠٧٥).

خۆی ئەوەیان سوتاند کە تێك ڕوخابوو، بەخۆی و دەوروبەرەکەیەوە، ئیتر سەرلەنوێ (عیسا) (علیه السلام) دادەبەزێتە سەر ئەو منارەیە و بەراز دەکوژێت [٢٩٠]وخاچ دەشکێنێ و جگە لە ئیسلام هیچ ئاینێکی تر پەسەند ناکات و بەرەو حەج یان عەمرەیان هەردوکیان دەکەوێتە ڕێ، وە ماوەی چڵ ساڵ دەژی و پاشان کۆچی دوایی دەکات و گوتراوە: لەژوورەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) بەخاك ئەسپێردرێت لەلای گۆڕی پیرۆزی هاوەڵی خۆی پێغەمبەر (ﷺ) وە ئەبو بکری صدیق و عومەری کوڕی خطاب هەرچەندە (اسناد)ی ئەم گێڕانەوەیە ڕاست نیە .

(ابو عیسی الترمذي)[٢٩١]گێڕانەوەیەك دەباتەوە سەر باپیری (عبدالله ی کوڕی سلام)کە دەڵێت: لەتەوڕاتدا نووسراوە کە عیسا U لەتەنیشتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بەخاك دەسپێردرێت، (ابو داود)یش دەفەرموێت: لەژوورەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) جێگەی گۆڕێك ماوەتەوە .

(پێشەوا بخاری)[٢٩٢] گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (سەلمان) کە دەڵێت :ماوەی نێوان عیساو محمد (ﷺ) شەش ساڵ بووە، (القتادة) دەفەرموێت: پێنج سەدو شەست ساڵ بووە، وتراویشە: پێنج سەدو چل ساڵ بووە، (الضّحاك) دەفەرموێت: چوارسەدو سی و ئەوەندە [٢٩٣] ساڵ بووە، بەڵام شەست سەد ساڵەکە باوترینیانە، دیسان لەسەر ئەم شەست سەد ساڵەش مشتوومڕهەیە، هەندێك فەرمویانە شەش سەد ساڵی قەمەری یە، هەندێکی تر دەفەرمون (شەمشی) یە خوای گەورە زاناترە.

(ابو حبان)[٢٩٤] لە (صحیح)ە کەیدا گێڕانەوەیەکی بردوەتەوە سەر (ابی الدّرداء) کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (خوای گەورە گیانی داودی کێشا لەناو هاوەڵەکانیدا، ئیتر نەفیتنەیان نایەوەو نەئایینەکەیان گۆڕی، وە هاوەڵانی مەسیحیش ماوەی دوسەد ساڵ بەردەوام بوون لەسەر سوننەت و ڕێبازە کەی).

(ابن جریر) لە (محمد کوڕی اسحاق)ەوە دەگێڕێتەوە کە عیسا (علیه السلام) بەر لەوەی بۆ ئاسمان بڵند بکرێت ئامۆژگاری حەواریەکانی کرد کە خەڵکی بانگ بکەن بۆ

---

[٢٩٠] ضعیف، الترمذي: (٣٦١٧).

[٢٩١] صحیح: البخاري (٣٩٤٨) .

[٢٩٢] صحیح: البخاري (٣٩٤٨) .

[٢٩٣] ئەوەندە :لێرەدا مەبەستمان لە (بضع)ە. کەلەنێوان (٣- ٩)دایە

[٢٩٤] ضعیف: لە ژیانی (داود)دا (علیه السلام) تەخریجەکەیمان هێناوە.

یەکتاپەرستی خوای گەورەو هەریەکەشیانی دانا لەسەر هەریەکە لەدەستەی دانیشتوانی شارەکان و هەرێمەکانی وڵاتی شام و خۆرە هەڵات و (مغرب)، وای دەگێڕنەوەکە هەریەکە لەو کەسە دانراوانە بەزمانی ئەو خەڵکەی ئەویَ دەدوا کەحەزرەتی مەسیح (علیه السلام) داینابوون، واباس دەکەن کە (ئینجیل) لەچوار کەسەوە گواستراوەتەوەو گەیەنراوە لە (عیسا)ەوە بۆ خەڵکی ئەو چوار کەسەش (لۆقاو مەتی و مەرقەس و یۆ حەننا)بوون، ئەم چوار جۆرە (ئینجیل)ە ش جیاوازی زۆریان لەنێواندا هەیەو کەم و زیادیان تێدایە، لەو چوار کەسەش دوانیان (مەسیح)یان دیوەو لەسەردەمی ئەودابوون، کە (مەتی و یۆحەننا)بون وە دوانەکەیتریش هاوەڵی (عیسا)(علیه السلام) بوون و بریتی بوون لە (مرقس و لوقا)، خوای گەورە زاناترە،

یەکێك لەو پیاوانەی کە باوەڕی بەمەسیح هێنابوو لەدانیشتوانی دیمەشق ناوی (ضینا)بوو، بەڵام باوەڕهێنانی خۆی ئاشکرا نەکردبوو،بۆیە لەئەشکەوتێکی (باب الشرقی)لەنزیك کەنیسەی (المصلبە)دا خوا پەرستی دەکرد، لەترسی (پۆلس)ی یەهودی کە پیاوێکی دڵ ڕەق و ستەمکار بوو، زۆر ڕقی لە (مەسیح)و ئاینەکەی دەبوەوە، هەرئەم ستەمکارە کاتێك زانی برازاکەی خۆی باوەڕی بە (مەسیح) (علیه السلام) هێناوە سەری تاشی و بەشاردا گێڕای و پاشان بەردبارانی کرد تاشەهید بوو، دیسان کاتێك (پۆڵس) زانی کە(مەسیح)U بەرەو دیمەشق کەوتۆتەڕێ، خۆی و وڵاخەکانی ئامادەکرد بۆ جەنگ و کوشتار و لەناوبردنی ئەو، کاتێك لە(کوکبا)بە هاوەڵەکانی (مەسیح)گەیشت و ڕووبەڕوویان بووەوە، لەم کاتەدا خوای گەورە فریشتەیەکی ناردو بەلابالێك کێشای بەڕوخساریداو چاوی کوێر کرد، کاتێك (پۆڵس) ئەوەی بەسەر هات، بەخۆیدا چوەوە و هاتە دڵی یەوە کەباوەڕ بە (مەسیح)(علیه السلام) بکات، ئەوەبوو هاتە خزمەتی و پەشیمانی خۆی دەربڕی لەو کارەی کەکردی، (مەسیح)یش (علیه السلام) پێشوازی لیَ کردو لێی خۆش بوو، ئینجا (پۆڵس)داوای لە (مەسیح)(علیه السلام) کرد کە دەستی پیرۆزی بەسەروچاویدا بهێنیَ تاکو چاوی چاك ببێتەوە، (عیسا)ش (علیه السلام) پێی فەرموو: بڕۆ بۆلای (ضینا)ی لای خۆتان لە دیمەشق، کەلەکەناری بازاڕگەی (مستطیل)دایە بەڕوکاری (مشرق) دا بائەو نزات بۆ بکات، ئەویش چوو بۆلای و نزای بۆ کردو خوای گەورە چاوی چاك کردەوە، بەمەش (پۆڵس)چاکتر لەجاران باوەڕی بە (مەسیح) (علیه السلام) تۆکمەتر بوو، وە دڵنیا بوو کە ئەو بەندەو ڕەوانەکراوی خوایە، پاشان کەنیسەیەکی بەناوی

خۆیەوە بۆ دروست کرد لەدیمەشق داو ناسرابوو بە (کەنیسەی پۆڵس)بەتایبەتیش لەسەردەمی هاوەڵانی(عیسا)دا(علیه السلام) باوی هەبووە کەدیمەشقیان ڕزگارکرد،دواتر ڕوخا

(قسطنطین)پاشا کانی خۆی (بیت لحم)یان دروست کرد لەو شوێنەی کە (مسیح)(علیه السلام) تیایدا لەدایك بوو، وە دایکیشی (هیلانە القیامە)ی دروست کرد لەسەر گۆڕی کەسە لەخاچ دراوەکە، کە وایان لەگاورەکان تێگەیاندوەکە گوایە لەخاچدراوەکە (مەسیح)خۆی بووە(علیه السلام) دیارە ئەوانە کەوتونەتە بێ بڕواییەکی ئاشکراوە، هەروەها لەگەڵ ئەوانیش دا ئەوانەی کە یاساو حوکمی ئەو تۆیان داڕشتوە کە بەدەقی (تەورات)یش حەرام کراون،لەوانەش خواردنی گۆشتی بەراز، ئەوان بەرەو ڕۆژهەڵات نوێژیان دەکرد، لە کاتێکدا (مەسیح)(علیه السلام) هەرگیز شتی وای نەکردوەو ڕووی کردوەتە لای بەردەکەی (بیت المقدس)، هەروەها هەموو پێغەمبەرەکانی تریش لەدوی (موسا)ەوە ﷺ هەر بەرەو ئەوێ نوێژیان کردوە، تەنانەت پێغەمبەری خۆشمان محمد (ﷺ) پاش کۆچکردنی بۆ (مەدینە)ماوەی شازدەیان حەڤدە مانگ لەنوێژدا ڕووی دەکردە ئەوێ، پاشان بۆی گۆڕدرا–بەفرمانی خوایی–بۆ ئەو کەعبەیەی کە (ابراهیم خلیل) (علیه السلام) دروستی کرد، هەرئەوان دیوارو بن میچی کەنیسەکانیان پڕ کردوە لەنیگارو وێنە، کەپێشتر لە (عقیدە)ی ئەواندا شتی وانەبوە، بگرە جۆرە عەقیدەیەکی داڕێژراوی دەستکاریکراوی خۆیان هێناوەو منالەکانیان و ژن و پیاویان لەسەر ئەوە گۆش دەکەن، کەناویان لێناوە سپاردەو ئەمانەت، کەچی لەڕاستیدا فێر کردنیانە بەبێ بڕوایی و هاوەڵدانان بۆ خوای تاك و بێ هاوەڵ، مەلەکیەو فەسطۆري و هاوەڵانی نسطۆرس کەکۆمەڵێ دووەمن و یەعقوبیەت کە هاوەڵانی یەعقوبی بەرادعین و کۆمەڵی سێهەمن، ئەم جۆرە عەقیدەیان هەیەو جیاواز یشیان هەیە لەنێوان خۆیاندا لەراڤەکردنی ئەو عەقیدە دەستکار یکراوە ئاڵۆزەدا بەداخەوە ئەوان دەڵێن: باوەڕمان بەپەروەردگارێکی تاك هەیە، کەڕێکخەری هەموو شتێکەو ئاسمانەکان و زەوی و شتە دیارو نادیارەکان ئەو بەدی هێناوە، وەباوەڕمان بەو پەروەردگارە تاکە هەیەکە یەسوع (مەسیح)کوڕی تاقانەی خوایەو هەرزوو لەباوکی بوەو وەك نورێکی پەروەردگاری هەق هەبووە، لەدایك بوەو دروست کراونیە، یەکسانە بەباوکی لەجەوهەری ئەوشتەی هەموو شتێکی بەدەستە لەپێناوی ئێمەی مرۆڤ و لەپێناوی ڕزگار کردنماندا لە ئاسمانەوە دابەزیوەو لە (ڕوح

القدس)و (مريم العذراء)دا بەرجەستەبووە، وردە .... وردە .... هۆگری مرۆڤايەتی بوەو لەخاچ دراوە لەسەردەمی (ملاطس)ی (نبطي)دا و گەلێك ئازاری چەشتوەو پاشان خراوەتە گۆڕەوە، بەڵام لەڕۆژی سێهەمدا هەستاوەتەوە و چوەتەوە بۆ ئاسمان و لەلای ڕاستی باوکی یەوە دانیشتوەو و دیسان جارێکی تر بەهەمان لەشەوە –واتە بەرجەستە– دێتەوە خوارەوە تاکو کاروباری مردوو زیندوان ڕاپەڕێنێ، کەخۆی و موڵکی تەواو بونیان نیە، (روح القدس)یش ئەو پەروەردگارە زیندو کەرەوەیەکە لەباوکەوە پژاوە و هەرلەگەڵ (باوك)یش دایە، وە کوڕەکەش کڕنووشی بۆ دەبات . ئەمانە ئەو کوفرو بێ بڕوایی و هاوەڵدانانەیە کە هەرگیز لەگەڵ عەقیدەی پاکژو لۆژیکداناگونجێن و بێ باوەڕیەکی ئاشکران و نەخشەیەکی ترسناکن بۆ بێ بڕواکردنی ڕۆڵە پاکو بێگەردەکان بەناوی عەقیدەی ئاینی و پەیامی ئاسمانیەوە .

ئێمەش لێرەدا سەر لەنوێ دەڵێن: پاکی و بێگەردی بۆ خوای تاك و تەنهایە، کەبەدیهێنەری هەموو شتێکەو هەبوەو هەر دەبێت، نەلەکەس بوەو نەکەسی لێ دەبێت، خوایەگیان تۆش لەڕوی بەزەیی و میهرەبانیتەوە لێمان ببورەو کار و گفتاری چاکەمان قەبوڵ بفەرموو ... خراپەکانمان بگۆڕە بەچاکە، سوپاس بۆ خوای گەورە کە مۆڵەت و دەرفەتی تەمەنی پێداین تاکو ئەم کتێبە بەنرخ و پیرۆزە بگۆڕینە سەر زمانی شیرینی کوردی، بەندەش وەك وەرگێڕی ئەم کتێبە داواتان لێ دەکەم کە لە نزای خێر بێ بەشمان نەکەن .

خوایە نزاو کارو گفتاری هەموومان وەربگرەو لەڕەحمەتی خۆت بێ بەشمان مەکە ... ئامین .... أمين .... . يارب العالمين.